

# بەم هەمووە تاوانەوە

# لێبووردنی چی




- نووسەر: جاناتان ڕەندڵ
- وەرگێڕ: سەلاحەددین ئاشتی

# بەم هەمووە تاوانەوە لێبووردنی چی؟!

## ئاشنایەتیم لەگەڵ کوردستان

نووسەر: جاناتان ڕەندڵ
وەرگێڕ: سەلاحەددین ئاشتی

# پێشەکی

گەلـێ جار مرۆی لاوەکی لەسەر شکڵی ڕێبوار، ڕاسپاردە، توێژەرەوە، دینپەروەر، کارنــاس و هــەواڵنێر هاتوونــە کوردســتان. گــەڕاون، وردبوونــەوە، بارودۆخیــان هەڵــسەنگاندووە و چــی پێویــست بــێ کردوویانــە. خــەڵکیان بــۆ ڕاپــەڕین یــا خــۆ دووبەرەکایەتی هان داوە؛ هەزاران داویان ناوەتەوە و خڕ کردۆتەوە. بە شــادی بــەرەو ماڵ بوونەوە یان سەریان بە فەتەڕات چووە. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ هــەر ئــەم کەســانە توانیویانە زانیاری یەکجار ورد و بــەپێز کــۆ بکەنــەوە. پاشــان هــەر هێنــدەی کرابــێ و سنووری بەرژەوەندی خۆیانی نەبەزاندبێ، بۆ ئێمەشیان گێڕاوەتەوە. ئێمەش زۆر چــەلان بە تووڕەیی لە ماڵی خۆمان و لێر و لەوێ بە دەمیاندا چــووینەوە و ئــەوەی شــایانیان نەبووە پێمانگوتــوون. هەندێ جاریش بە ڕووی خۆشەوە پێــشوازیــمان لێکــردوون و هەزاران دوعای بەخێرمان بۆ ناردوون و دانــمان بــە هــەق داهێنــاوە، جــا بــا تــاڵیش بووبێ ...

جاناتان ڕەندڵ، هەواڵنێری چاوکراوەی ئەمریکایی و نووسەری ئــەم کتێبــە، یــەکێ لەم کەسانەیە کە شایانی ڕێزگرتن و بە پــیرەوە چــوونە. وتــەکانی ڕەنــدڵ هەڵــدەگرێ شیکــردنەوە و لێکدانەوەیان لەسەر بکــرێ و کامــەیان ڕاســت و هــەقن ئۆباڵیــان بــۆ بکێشرێ و کێهەیان وانەبوون بە بەڵگەوە بەرەو پاش سەرەوخوار کرێنەوە. ئازایــەتی و دەقودۆغربێــژی ئــەم ئینــسانە لــە بابــەت درکانــدن و لــە قــاودانی دەوری دزێــو و نامرۆڤانــەی تــەواوی غــەوارانی دوور و نیزیــك و دوژمنانــــی گــەل و نیــشتمان و لــێنەزانیــن و خەیانەتی تاقمێ لــە ڕێبــەران و ســەرکردەکانی کــورد جێــی ســەرنج و خوردبوونەوەیە. بەڵێ ڕاستە بەشێك لە زانیارییــەکانی لــە زمــان دوژمــن و خــەنیمانی یەکتــــرەوە وەرگرتــوون، بــەڵام ڕوونــە کــە زۆربــەیان ڕاســتــن و خۆمــان هەســتمان پێکردوون و بە چاو دیتوومــانن. کەچــی زۆر بەداخــەوە بێتــوو ئــەم وتانــە لــە زمــان ڕووناکبیــر و خاوەن شعوورێکی نیشتمان بێنەدەر، ئالای بۆ هەڵدەگرن و تەنەکەی لــە دوو دەکوتن و تەرەکەمەی دەکەن.

بەحەقیقەت ڕەنگە کەسی وا نەبێ کە لە ژیانیدا کردەی وا نابەجێی لــێڕوونەدابێ کە لێی پەشیمان نەبووبێتەوە، بەتایبەت لە نێو بەرەی سەرجەلە و سەرۆك و ڕێبەراندا. جا ئەوەی وێراویەتی و پێی لە هەڵەی خــۆی نــاوە، هــەم ئۆخــژنی خــستۆتە دەروونــی خۆی و هەم تۆزێــك ئاوپرێــشکێنی دڵــی خــەڵکی کــردووە و تیــشکی خــستۆتە ســەر هەتڵەرێیان، بەڵام ئەوەی نەوێراوە و فیز و دەماری لێینەگەڕاوە بیدرکێنێ، لەسەر دڵی

خۆی و جەمــاوەر بۆتە ناسۆر و پەردەی بە سەر چەوتییەکاندا کێــشاوە. هــەر بۆیــە پێداچــوونەوە و پــشکنیــن و لێکدانــەوەی مێــژوو دەتوانــێ زۆربــەی کونوکەلەبــەرە تاریـك و ونــەکان وەدرەبــخاو خــواروژوور پەنـدیان لــێوەربگیــرێ و هێنــدێك لــە گرێکان بڕەون. هیوادارم ئادەمیزادی کورد ئەوەندەی ئازایەتی هەبێ کـە بـە ڕەخنـەی روون و بە ڕێوجێ دەرهەڵنەبێ، بەڵکوو بە مەبەستی ڕاست کردنەوەی هەڵـەکانی بــە خۆیدا بێتەوە. هەڵبەت مرۆڤــ هــەتا گــەورەتر و بــەکردەوەتر بــێ، لــە تلاســابوون و هەڵەی زلتــر نیزیکتــرە و لێرەدا پای سەرۆك و سەرکردەکانــمان دێتــە گــۆڕێ؛ ئــەو کەسانەی بە هەق یا بە ناهەق، لـە ڕووی ساکاری و کاڵی و نەکوڵیوی کۆمەڵ یان بــە گوێرەی چەشنێك لێکدانەوەوە جڵەوداران؛ بۆیە دەبێ ئـەوان سـینگیان لــە هــەموان فرەوانتـر بێ و خەڵك هان بدەن بۆ ڕاست و ڕەوابێژی ...

پێمخۆش بوو لـە کوردستانێکی ســەربەخۆدا لــە دایـك بووبـام، کوردســتانێك کــە نــموونەی ئازادی و دێموکراسی بوایە. کارم بە سیاسەتــمەداران نــەداوە دەڵــێن چــی، کەیفی خۆیانە، بەڵام هەتا ئەو ڕۆژەی سێبەردەکەم بە سەر ڕایەڵ دەکــەن چـاوەڕوانی ئەو ڕۆژەم ...

لـە ئاخریدا با ئەوەتان وەبیــر بێنمەوە کە ناوی ئەم کتێبە بە پێــی نووســینی ڕەنــدڵ دەبوو "پاش ئەم هەمووە زانیارییە لێبووردنی چی؟" بوایە، بەڵام بــەڕێز دوکتــۆر "بــرایم یۆنسی" کە کردوویەتە فارسی و منیش لـە فارسیڕا کردوومەتـــە کـــوردی، ئـــاوای لــێ بەسەر دەهات: "بەم هەمووە ئابڕووتکانەوە لێبووردنی چی؟"، بــەڵام هیــچیانــم بــە دڵ نەبوو، بۆیە ناوم نا: "بەم هەمووە تاوانەوە لێبووردنی چی؟". بەڕاستی زۆر خــۆم بــە ئەمــەگداری ڕێزدار کــاك "ئەحــمەد مەولانی" دەزانــم کە بە وردی پێیداهاتـــــەوە و هەڵە و پەڵەی بۆ هەڵگرتــمەوە و ڕاستەوپاستەی کرد.

سەلاحەددین ئاشتی – مەهاباد ٨١/١٠/١٧
2003/1/7

# بەشی ١

## وەسیەتی خۆت کردووە؟[1]

*بۆ ئەم کەسانەی لە هەرێمێکی ڕازاوەی کۆمەڵایەتیدا*
*پێیان ناوەتە جەغزی ژیان، هیچ شتێك*
*ئۆقرەووروژێنتر لە بەرەبەری سەفەر بۆ مەڵبەندێکی فرە سەخت و سەرکەش نیە.*
گێرتروودبێل، سارا و ئاوایی (١٩٠٧)

بیری نووسینی کتێبێك سەبارەت بە کوردان و کوردستان، پاشنیوەڕۆیەکی تاووساوی مانگی ئووتی ١٩٨٦ لە پلاژی تەواو تەنکەخەڵکی "ساوس بیچ"، لە لێواری "مارتا وینیارد" زەینی ئەنگاوتم. تەنانەت ئێستاش گوێم بە وتەکانی ئەوسای

1- Have you notified your next of kin? بە کەسوکارت گوتووە؟

خۆم دەزرینگێتــەوە و لــە بیرمــە لــەو دەمەیــدا بــادەی ڕوونــم, بــە پــەرداخی پــڕی پەلاستیکی فڕ هەڵدەدا, خێزانــم کە لەم بابەتەوە دوودڵ بوو، ئاوای لــێدەبیستم: "ئەم کارە دەکەم: سەرنــجم داوێمە سەر سووچێکی لە بیراننەماوی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاســت و بە دابی سەدەی نۆزدە, سێ مانگێك ئەم ولاتەی لە بــوون بێبەرییــە, تێیدەگــەڕیم." ئەم گەلاڵەیە, خەیاڵاتێکی مەودای ڕۆژانی پشوودان بــوو. دەبــوو بــــمزانیبا. بەڕاســتی زانیارییەکی زۆر کەمم لە بارەی کوردانەوە هــەبوو. کــەم بــوون ئــەو ڕۆژاوایییانــەی زانیارییەکی دروستیان لەسەر ئەم خەڵکە هەبوو. یەکەم ئەزموونەکانــم بە ڕواڵەت چێ وا لە دڵان خۆش نەبوون, بەڵام لــە گــەڕیانی ڕووداوەکــانی بــەیرووتا هەســتی قــوڕبن پشکنیان بزاوتبووم: ئەوان سەردەمان لە بەیرووت هەواڵنێری "واشینگتۆنپۆســـــــت" بووم. لە ڕۆژانی دەسپێکی شەڕی نێوخۆی لوبنــان, یــانی ســاڵی ۱۹۷۵, چــەکدارانی کوردی ئەو کەســانەی خۆیــان بــە مائۆئیــست دەزانــی بــە زەبــری تفــەنگ منیــان لــە ئاپارتــمانی شوێنی کارەکەم وەدەرنابوو.

بڕاویەکی خراپی تایبەتییان سەبارەت بە من نــەبوو, لــەوان دەوروبــەران پــەلامار و چالاکییان دەس پێکردبوو و من بۆیان "سەر و دڵگر" بووم. ئــەوەی هــەمبوو بــە تــالاّن چوو و ئیتر لە خێروبێری هەمووی چوومە دەر. چــەند مانگێــك دواتــر خــۆم شــایەدی ڕەپاڵنانی ئەم کوردانە و فەلەستینی و شیعەکانی لوبنان لە لایەن چەکدارانی مەسیحیی مارووننییەوە بووم, کە بۆ "دابین"ی بنکــەی ســەرکردایەتی خۆیــان ئــەم خەڵکــەیان بــە زەبری چەك لە کۆخەکانی گەڕەکی هەژارنشین و لاپەڕی شار دەرپەڕاند. ئاخرییەکەی لە بەرەبەری هێرشی ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان لە ۱۹۸۲دا, تاقمێك کوردی تر کە لــە خزمەت ئەربابانی نەناسراوا بوون, ماڵی ئەو دۆستانەی کە پەنایان دابــووم, دایایــە بــەر خۆمپارە. ئەمە ڕاست ئەو دەمە بوو کە من خــەریکی نووســینی کتێبێــك بــووم لەســەر قەیرانی لوبنان.

ئەوەی کە بە ناوی زانیاری قووڵتر لە بابەت کوردانەوە زارەوزار دەگەڕا, دەکــرێ لــە چــەند ڕســتەی پــووچ و بێتامــا ئــاوا کــورت کرێتــەوە: ســەدەیەك لێرەوبــەر

ئوروپاییەکان کوردستانیان بە شوێنێکی لاپەڕی مەترسیدار دەزانی, جێیەکی چەشنی ڕۆژاوای وەحشیی ئەمریکا, (بە شێوەیەك کە کارۆل مەی ئەلمانی, نووسەری گەلەچیرۆکی خەیالاوی و پڕ کارەسات, تەنانەت هێندێك چیرۆکی لەمەڕ گالەوەڕێن و سووریێستان و ئەم شێوە شتانەوە نووسی, کە خۆی پێیدەگوت "کوردستانی وەحشیی".) یەکێ لە کەسایەتییەکانی سازکراوی ترولۆپ[١] لە ڕۆمانێکدا بە ناوی." داخوا دەتوانی لێی ببووری؟" وەها باسی کوردستان دەکا هەر دەڵێی شوێنێکە و کەوتۆتە بنەبانی جیهان و کوێی لێ کێویتر نیە. لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا, چواردە بەندی "ڤود ویلسۆن" سەرکۆماری ئەمریکا بەڵێنی پێکهاتنی ولاتێکی دا بە کوردان, کە بڕیار وابوو لە هەرێمی ئیمپراتۆرییەتی تێکشکاوی عوسمانیا بگوورێ. سنووری ئەم ولاتەی گفتی لەسەر درابوو بە وردی دیاری نەکرابوو. گەلێ دواتر کە تورکیای مستەفا کەمال لە ژێر هەرەسی عوسمانیا سەری قوت کردەوە, لە پێشدا کوردانی بە دژی دوژمنانی دەرەکی وەخۆخست و هانی دان و پاشان ئاوات و ئامانجی نەتەوەیی پێخوست کردن و تێکوپێکی هەڵشێلان. بریتانیا کە لە لایەن کۆمەڵی نەتەوەکانەوە کرابوویە سەرپەرستی ولاتی تازەسازی ئێراق هیچ مەیلی لە وەدیهاتنی ئاواتی نەتەوەیی خەڵکی کورد نەبوو. ئەو خوازیاری چەسپاندنی دەسەلاتی بەسەر هەرێمێکا بوو کە کوردان بە ئی خۆیان دەزانی و بە زەبری تفەنگ ئەم خەڵکەی بۆ یەکێتییەکی خوێناوی لەگەڵ ولاتێکی تازەساز و دەسکردی خۆی ناچار کرد، ئەم ولاتەی کە دەسەلات و حکوومەتی لە دەس کەمەنەتەوەی عەرەبی سوننی مەزەبا بوو.

لەو سەردەمەوە بەرەو ئێستا دەوڵەتانی هەمەڕەنگی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست بۆ تێکشکاندنی شۆڕشی پەیتاپەیتای کوردان و بە دەرفەت هێنان لە شێوە بۆچوونی ئوروپاییەکان لەسەر مانای "ولاتێکی پێشکەوتوو و کۆدەسەلات" لە کاتی خۆیا بە دژی کورد پاڵیان وێکداوە, لە ترسی ئەوەی نەکا کوردانی ژێردەستەی سەربزێویان

---

١- Trollope (ئانتۆنی), نووسەری ئینگلیسی, ١٨١٥ – ١٨٨٢.

لەمبەروبەری کەوشەنی سیاسی دەسکرد, خۆ ڕێكبخەن ... چونکە کوردان چوارەمین کۆمەڵی فرەی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست و ڕەنگە گەورەترین دۆڕاوانی شانۆی سیاسی ئەم مەڵبەندە بن. کەسێ حاشا لەمە ناکا کە ئەم خەڵکە فرەترین کۆمەڵی نەتەوەیین کە بێ ولاتی سەربەخۆن. ترسی دەسەلاتدارانی لاوەکی لەم خەڵکە بە ڕادەیەك بووە و هەیە کە بە درێژایی دەیان ساڵ سەرژمێرییەکی جێ متمانەیان لێوەدەست نەهاتووە و ڕێژەی نفووسیان تەنیا لە ڕووی بۆچوون و گومانەوە دەکرێ دیاری بکرێ. زۆر وێدەچێ ڕێژەی نفووسی ئەم خەڵکە ٢٥ میلیۆن کەس بێ. بۆ کۆڵینەوە و پرس و توێژینەوە لە دەرەوەڕا [ سەبارەت بە جەماوەری کوردان] ڕووی خۆش نیشان نادرێ.

کوردان کە بەڕاستی لە ولاتی خۆیان غەوارەن و لەم سەدەیەدا تەنیا دەتوانن بە سەرسوڕمانەوە لەم سەروەت و سامانە ڕامێنن کە کۆمەلانی عەرەب لە ڕێی ناسیۆنالیزمی فەلەستینییانا بەختی دەکەن, هەر بەڕاستی منالانی بێ‌ئەنوا و تێماو و لێقەوماوی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستن. ئەم خەڵکە کە لە نەوتی خۆیان بێبەش کراون و لە ولاتێکا نەمرنەژی دەیانژێن و لەوی ترا جلوبەرگی نەتەوەیییان لەبەر دادڕنن و لە ولاتی سێهەما پەیڤین بە زمانی زگماکییان لێ بەربەست کراوە و لە بنەڕەتیترین مافی ئینسانی بێبەهرەن, لە سەردەم و شوێنی جیاوازا کەوتوونە ژێر تەوژمی چەوسانەوەی توند و تیژ ... سەرەڕای ئەمانە, بەم خۆڕاگرییەی لە بەرامبەر توانەوە و قاڵ بوون لە نێو فەرهەنگی دەسەلاتدارا کردوویانە, "ئاغاکانیان" خستۆتە گێژی گێژەوێ. قورسایی یەکەمین بۆمبارانی ولاتانی جیهانی سێهەم, کەڵك وەرگرتن لە گازی ژاراوی، خاپوور کرانی بە ئانقەستی گوندان لە ئێراق[1] و ڕاگوێزران و دوور خرانەوە بۆ ناوچەکانی

١– لە تورکیاش.

ڕۆژاوای وڵات لــە تورکیــا کەوتۆتــە سەرشــانیان و لێــی خەڵەســتوون و کــوژرانی ڕێبەرانیان لە لایەن ئێرانەوە بە چاوی خۆیان دیتووە.

هێــزی ئاســـمانیی پاشــایەتی بریتانیــا لــە ژانوییــەی ١٩١٩دا کوردەکــانی ئێراقــی بۆمباران کرد. ئەمە یەکەم کەلك وەرگرتنە لە هێزی ئاســمانیی بۆ سەرکوتی شۆڕشان. بە بڕوای ئینگلیسییەکان بۆمبارانی ئاســمانیی هەرزانتر بوو لە هێــزی زەمینــی. دواتــر, هەر لەو ســاڵەدا – یــانی لــە سـێهەم شــەڕی بریتانیــا لەگــەڵ ئەفغانــستانا – هێــزی ئاســمانیی پاشایەتی کە بنکە و فڕگەی لــە هیندووســتان بــوو, شــارەکانی ئەفغانــستانی بۆمباران کرد و "ئەمیر ئەمانوڵلاخان"ی بۆ پێکهاتن ناچار کرد. وینستۆن چرچــیل, لــە پلەی وەزیری موستەعمەراتا, لە ساڵی ١٩٢١دا بەرپرســایەتی چەســپاندنی هێــوری و تەکووز و یاسای لەو ناوچانەی کە بریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا سەرپەرســتیان بــوو بە تــەواوی دایــە دەس هێــزی ئاســـمانیی پاشــایەتی. یــەکێ لــەم ئەفــسەرانەی هێــزی ئاســمانیی بریتانیا کە لە ئێراق کــاری دەکــرد "ئــاتوور هــریس" بــوو کــە لــە شــەڕی دووهەمی جیهانیدا لەبەر دڵڕەقی و بێبــەزەیی لــە کــاتی بۆمبــارانی ئامانـــجە غــەیرە سەربازییەکانی ئاڵمان بە "هریس بۆمبی" ناوبانگی دەرکردبوو.

کوردەکانی دانیشتووی بەغدا و دەمیشق و ئیــستامبووڵ و تــاران, هــەروا ڕووحــی کوردێتی خۆیــان دەگەشــێننەوە و ســەرەڕای کاردانــەوەی "وە یەکــسان گێڕانــی" ئــەم ناوەندە جەماوەرییانە, دەیپارێزن.

وەچەیەك پێشتر, یەکێك لــە هاوکــارانی ڕۆژنامەنووســی فەڕانــسەویم ســەری لــە هەستی "کوردێتی" لاوێکی دیلمانــجی سەردەمی شەڕی کوردستانی ئێراق ســوڕمابوو: ئەم لاوە لە بەغدا هەڵیدابوو و زمانی کوردیشی بە چاکی نــەدەزانی. بــەڵام ســەرەڕای ئەوەش لەسەر کورد بوونی پێداگربوو و لــەم بابەتــەوە گــوتی: "لــەم بــارەوە چــم بــۆ ناکرێ, بە دەس خۆم نیە." مــن خــۆم لــەم هێــزی نەتەوەخوازییــەی لــە نــاخی لاوانــی کوردی تورکیادا سەری هەڵداوە, سەرم سوڕماوە. ئەم لاوانە بێگرێ بە تــورکی دێنــە ئاخافتن و نووسین, بەڵام ئامادەن بۆ ئەم کوردستانەی زمانەکەی بە باشی نازانن گیانیــان

بەخت کەن. تەواوی کوردان, تەنانەت ئەوانەی کەوتوونە دوورترین مەڵبەندەکانی چەشنی ئوستڕالیاش, هەر ئەوەن.

وا مەنشوورە کە مێژوو بە دەستی سەرکەوتوان دەنووسرێ, یانی دوژمنانی خەڵکی کورد. کوردان لە سای سەری چیا و دوور بوون لە ناوەندەکانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی تاران و قوستەنتەنییە جارناجارێك, بە گوێرەی لاوازی و بەهێزی ئاغاکانیان، تامی ئازادییان چێشتووە. بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی وێڕای تەفروتونا بوونی ئیمپراتۆری عوسمانی، کە زۆربەی کوردان لە هەرێمی ئەوا دەژیان, بیروبۆچوون لەسەر "نەتەوەخوازی نوێ" کورد و عەرەبی وەخۆ هێنانەوە, بەڵام تامەزرۆیی توند و تێژی کوردان بۆ وە دەس هێنانی ئازادی و داڕنینی نیری کۆیلەتی بێگانەکان لە ئەستۆ, قەت نەیتوانیوە هاوسەنگ و هاوهەنگاوی مرخ و توانستی سیاسییان بێ بۆ جیا بوونەوە. ئەو کوێرەوەری و چەرمەسەرییەی کە ئەم گەلە, تەنیا لەم سەدەیەدا لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست تووشی هاتووە و خۆی لەبەر ڕاگرتووە، ناخرێتە تای تەرازووی هیچ دەرد و چەوسانەوەیەك لە هیچ کوێی دنیا. ئەم "نوێخوازییە" کە وەها زەبرێکی لە کوردان وەشاند, دەس‌کیسی و چاوەدزکەی ئاشکرای تەواوی هێزەکانی دەرەکی — لە هاوسێی شان بە شانەوە بگرە هەتا ئیسرائیل و ئەمریکا — ی پێوە دیارە. دەس‌تێوەردانی دەرەکی قەت بە خۆڕایی نەبووە. کوردستان لە بەختی باشی و — بە بڕوای تاقمێك لە بەختی ڕەشی — خاوەنی گەورەترین کانگا و سەرچاوەی نەوت و ئاوە لەم ناوچە ویشك و قاقڕەی جیهانا.

پێشینەی ڕاپەڕینی نەپساوە و سزادانی پەیتاپەیتای کوردستان لە سەدەی ڕابردووشا لە دنیادا وێنەی بۆ پەیدا نابێ. مخابن, یەکی دیش لە چارەڕشییەکانی خەڵکی کورد نەبوونی ڕێکخراوە و ڕێبەرایەتی لێوەشاوەیە.لە سەردەمی باڵەفڕە و چەکی دژی سەرهەڵدان, ئەم ئیستلاحەی کوردی کە دەڵێ: "تەنیا چیا دۆستی کوردانە!" تازە وەك جاران نرخی نەماوە, چونکە تەنانەت چیاکانیش پارێزگاری ئەو سەردەمانەیان لێناکەن کە کوردستانیان بە ناوی "سەرزەوی گەردن‌کەشان" بە جیهان دەناساند.

گەیشتنە کوردستان بۆ من — چ کوردستانی ئێران و چ کوردستانی ئێـراق — تـەنیا سەرەدای کێشە و گیروگرفتان بوو. لە ڕابردوودا کوردسـتان شـتێ نـەبوو جگـە لـە ئاخروئۆخری سەفەرێکی دوور و درێژی تر بە سواری ئوتۆمبیل یا لە ناخۆشترین دۆخا, سەفەرێکی چەند ڕۆژە بە سواری یەستر. بەڵام لە گەرمـەی شـەڕێکی شـەش ساڵەدا, هیچکام لەم دوو وڵاتە تێکهەڵچووە میوانداریی غەوارانی نەدەکرد. بەر لە ئێستا, بێ ئیزن چوونە کوردستان, بە هەڵبواردنی سنووری تورکیا بووزی دەخوارد. بـەڵام ئێستا ئیدی ئەوەش نەدەکرا. ئەم شۆڕشەی لە سـاڵی ١٩٨٤ەوە لـە نێـو کـوردانی تورکیـا هەڵگیرسابوو ئانکارای وا لـێ کردبوو کە چـەند هێزێـك بـۆ باشـتر تـەنینی کەوشـەنی بەستراوی لەگەڵ ئێراقا بەرێ بکـا و ئەمـە پەڕینـەوە لـە سـنووری سـامناك دەنوانـد. پەڕینەوە لە سووریارا لەمەش دژواتر بوو. بۆ ئەم کارە دەبوو شەوانە لە دیـجلەوە بـە سواری "کەڵەك" و "تیووب"ی با کراوی ئوتۆمبیل وەپەڕی. ئەم کردەیە بۆ خۆ پاراستن و لادان لە یاساولانی ئێراقی و تێلەدڕوی چەك لە پشت پێویست بوو. دیارە ئەم شـێوە سەفەرانە دەبوایە بەر لە تاوهەڵات کۆتایی پێ‌هاتبا. مـن ئـەو کـات ٥٣ سـاڵم تەمـەن بوو و پاش ئەم سی سـاڵەی کـە بـە نـاوی هـەواڵنێری شـەڕ چـالاکیم نوانـدبوو ئـیتر توانستێکی ئەوتۆم نەبوو کە بتوانـم لەم هات و نەهاتانەدا دەکاری بێنم.

جا بەڵام ئێران. پاش ئەو هەمووە هاتوچۆیەی لە سەردەمی ڕووخـانی حکوومـەتی شا و دەسپێکی حکوومەتی ئیسلامی‌دا بۆ ئەم وڵاتـەم کردبـوو, دیـار بـوو کەوتوومـە سیایی سیای حکوومەتەوە. ئەگەر بەختم هێنابای و ویزایـەکی سـێ ڕۆژەم وەرگرتبـا — ئەو کات لە ئێران وایان دانابوو — ئەمـجار لەبەر شەڕ لەگەڵ ئێراق، ئیزنیان بـە هـیچ هەواڵنێرێکی لاوەکی نەدەدا پێ بنێتە کوردستان.

سەرەرای ئەوانەش, ئەم مەبەستە زەینی وەها ورووژاندبووم کە بەر لە وەرێ‌کەوتنم لە "مارتا وینیارد" بەرەو بنکەی پاریسم, جووتێکم پێڵاوی ئیتالیایی تایبەتی شاخەوانی و برێکم کەلوپەل کڕی. جاری وایە بە خۆسەلـماندن بە ڕادەی خودی شانس, بۆ کـاری هەواڵنێری پێویستە و ئەم شانسە لەرێوە ڕووی تێکردم یا من خۆم هەرچـۆنێك بـێ وام دانـا" هـەر گەیـمە پـاریس تـوانیم سرنـجی عەبدوڕڕەحـمان قاسـملوو, ڕێبـەری

پێگەیشتوو و بەڕاستی ئازادیخوازی خەڵکی کورد, ڕاکێشم. قاسملوو بۆ ئەنجامی سەفەرێکی دەرەوەی کوردستان لە پاریسەوە تێدەپەڕی" لە شۆڕشی ئیسلامیڕا بەرەوخوار — یانی لە نیزیك دەساڵ لێرەوبەرەوە — یەکترمان دەناسی. لە تاران و بەتایبەتی لە کوردستانی ئێرانا پێکەوە بووینە دۆست. ئەو لەم دیدارەدا, سەرەڕای بەربەست کرانی مەیخۆشی لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئایەتوڵڵا خومەینییەوە, بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی کە میوانەکانی بە ویسکی میوانداری بکا. بڕیارمان دا لە چایخانەیەکی سەر لێواری چەپی "سێن" یەکتر بگرینەوە. کاتێك چوومە شوێنی دیاریکراو, نوێنەرەکەی داوای لێبووردنی کرد و سواری "پێژۆ"یەکی کۆنی کردم, لە دەوری باڵەخانەکە قۆرتی دایەوە و لە "کلۆزری دێ لیلا" پیادەی کردم. قاسملوو لەوێ چاوەڕێم بوو. من ئەو کاتە ئەم کردەیەم بە کردەیەکی "مێلۆ دراماتیك" لێکدایەوە, بەڵام زۆر بەر لەوەی کە ئەم دووە[1] لە ساڵی ۱۹۸۹دا لەبەر کەمتەرخەمی ئەم خۆپاراستنانە وەلا بنێن و بە دەس پیاوەکانی ئێران بکووژرێن, ئەم بۆچوونەم وەلایەکی نابوو.

قاسملوو گوتی هەوڵ دەدا بە ئێراق بسەلمێنێ کە ناوم لە لیستەی ڕەشی گۆڕین دەرباوێ و پسوولەیەکی هاتوچۆم بدەنێ, کە وەرەقەیەکی کەم بایەختر لە ویزا و ڕێی بۆ خۆش دەکردم لە جیاتی ئەوەی لە بەغدا وەمێنم، بچمە سنووری ئێران و ئێراق. ئەوەش لەم سەیرە و سەمەرە کۆنانەی ژیانی خەڵکی کورد بوو کە دەوڵەتی ئێراق لە خەبات دژی ئێران, هاوپشتی قاسملووی دەکرد. قەرار وابوو قاسملوو لەوێ, یانی لە ناوچەکانی سەرسنوور, بمداتە دەس هەڤاڵانی جەلال تاڵەبانی. تاڵەبانی لەگەڵ ئەو — نەك لەتەك بەغدا — نێوانی خۆش بوو. بەڵێن وابوو ئەوانیش بە پێی پێویست بمدەنە دەس تاقمێکی تری کوردەکانی ئێراقی, واتە هەڤاڵانی پارتی

---

۱- دوکتۆر عەبدوڕڕەحمان قاسملوو و عەبدوڵڵا قادری. "وەرگێڕ"

دێموکراتی بارزانی. دوودڵی قاسملوو لەم بابەتەوە دەگەڕایەوە سەر دڵمەند بوونی لە بارزانییەکان کە لە شەڕی لەگەڵ ئێراقا لانی ئێرانیان گرتبوو و بە دژی کوردەکانی ئێران کەوتبوونە شەڕ. نێوانی تاڵەبانی و بارزانی ئەشتەکی وا بوو.

بە گوێرەی ئەم کۆسپانە, دەرکەوتنم لە کوردستان دژوار دەبوو, چونکە مادام ئێراقییەکان زانیبایان پێم لەو جەغزەی قاسملوو باسی کردبوو ناوەتە دەر, تازە گەڕانەوەم قسەی لێنەدەکرا. قاسملوو بە ڕاشکاوی گوتی دەبێ وای دابنێم کە سیخوڕەکانی دەزگای پاراستنی ئێراق و ئێران دەکەونە پێ و شوێنم و تەواوی جووڵە و جووڵانەوەم دەخەنە ژێر چاوەدێری.

ئەگەر ئەو کات بمزانیبا ئەم بۆچوونە چەند ورد و دروستە بێونەبێ پەلەم نەدەکرد. سیخوڕانی ئێراق شوێنی غەوارانیان هەڵدەنا و بە کاربەدەستانیان ڕادەگەیاند و نرخێکی باشیشیان بۆ سەریان دادەنا.

هەرچۆنێك بێ, سبەی ئەو ڕۆژە لە پاریس چوومە نووسینگەی قاسملوو و بەرگەی پێویستم بۆ خۆم و هاوڕێیەکی وێنەگرم پڕ کردەوە و وێنەی خۆشمانم ڕەگەڵ خست. وتیان ئەم بەرگانە دەدەنە دەس کاربەدەستانی ئێراق و ئەوە ئەوانن کە تەما دەگرن داخوا ئەوەندەی دێنێ ڕووی خۆش نیشان بدەن یان نا. چەند ڕۆژێك دواتر بە شەمەنەفەری شەوانە چوومە بێرلەن و لە وێندەرێ چوومە کۆنفرانسێکی کە لە لایەن خوێندکارانی لایەنگری بارزانییەوە لە هۆتێلی گچکەی کروتسبێرگ, لە نیزیك دیوارەوە پێکهاتبوو. جگە لە دیپلۆماتێکی لیبی کە لە بێرلەنی ڕۆژهەڵاتییەوە هاتبوو، من تەنیا کەسی غەیرە کورد بووم. لەم تاقمە دەیان کەسییەی بەشداران تەنیا چەند کەسێکیان تەمەنیان لە چل ساڵ بەرەژێر بوو. زۆربەیان قەڵەو و بەساڵاچوو بوون و هێندێکیشیان تووکی سەریان وەریبوو.

دوو ڕۆژ مامەوە و گوێم دایە قسەی چالاکانی بارزانی. ئەوان ئەم مەبەستەیان شی دەکردەوە کە بۆ چی بوونی نەوت و ئاوی ئەم ناوچە ژێئۆپۆلۆتیکە بۆتە هۆی پشتیوانی نەکردنی گەورە هێزانی ڕۆژاوایی و تەنانەت ناوچەییش لە مافی خەڵکی کورد, جا چ بگا بە خودموختاری یان سەربەخۆیی. لەسەر ئەم بڕوایە بوون کە ڕەنگە تەنیا

یەکێتیی‌سۆڤیەت یارمەتی کوردان بکا. هەڵبەت ئاسۆی ئەم بۆچوونەش روونی نەدەنواند. سەرەنجام لە بۆ ورە وەبەرخۆ نان ئاماژەیان بۆ رێژەی لەسەری زا و زێی کوردان دەکرد. (ئەمە هەر ئەو شتە بوو کە هەر کات فەلەستینییەکان لە گشت لاوە تووشی تەنگ و چەڵەمە دەبوون, قامکیان لەسەردا دەنا.) بەم هیوایە کە هەر چەشنە بەدگومانییەکی ئەم شۆڕشگێڕە کۆنەکارانە سەبارەت بە ڕۆژاواییەکان – بە تایبەت ئەمریکاییان – ڕامالم, تووشی هەر کەسێ بووم کە حازر بوو گوێ ڕابگرێ, باسی ئەوەم کرد کە دەمهەوێ کتێبێك سەبارەت بە کوردستان بنووسم. کوردەکان, وەك هەمیشە, زۆر بە ڕێزەوە بەڵێنی هاوکارییان دا, بەو مەرجە خۆم توانیبام بگەمە کوردستان.

گەڕامەوە پاریس و لە "ئەنستیتۆی کورد" دەستم کرد بە خوێندنەوە و وە دەس هێنانی زانیاری لە بابەت کوردانەوە ... چەند حەوتوویەك پێچوو, بەڵام لە نووسینگەی قاسملوو لە پاریس هیچ باس و هەواڵێکم بۆ نەهاتەوە. ئاخرییەکەی وەختێك کەوتمە پرسیاران گوتیان "بەرگە"یەکیان بە دەست نەگەیوە. سەریان سوڕمابوو لەوەی دەبێ بەرەو کوێ چووبم, بەڵام زەحمەتیان وەبەر خۆیان نەنابوو کە تەلەفۆنێك بکەن. داکۆکیم کردە سەر نیازپاکیی خۆم ... ئەمە سەرەتای ئاشنایەتیم لەگەڵ دەزگای ئیداری کوردان بوو.

گیرە و دمەوەری بێفایدە بوو. "بەرگە"کانم سەرلەنوێ پڕ کردنەوە و وێم دان. مانگێکی تریش پێچوو و سەرەدای مانگی نوامبر کاتێك "چرای سەوز" هەڵبوو, دۆستە کوردەکان منیان لە چوونی ئەم سەفەرە دڵسارد کردەوە.

زستانی کوردستان زۆری بە بەرەوە و زۆر ساڵانیش یەگجار سەخت و ساردە. منیش هیچ مەیلم لەوە نەبوو کە لە کوێستانان بکەومە گەمارۆی بەفر و هەتا بەهاری داهاتوو ڕاوەستم. بە گەشبینییەوە لام وابوو کە "پسوولەی هاتوچۆ"م لە ئێراقەوە بۆ دەنێرنەوە" هەڵبەت ئەم هیوادارییەم پووچەڵ دەرچوو.

بەرەبەری كریسمەس لە واشینگتۆن, ویلیام ئێگلتۆن, كارناسی بالآی وزارەتی دەرەوەم دۆزییەوە. گەلی كورد لەبەر نووسینی مێژووی كۆماری مەهاباد خۆیان بە قەرزداری دەزانی. لەگەڵ ئێگلتۆن دۆستایەتی لەمێژینەم هەبوو, چاكی گوێ دایە قسەكانم, بەلآم ڕوون و ڕاشكاو نارەزامەندی دەربڕی. تەنیا ئەوەندەی گوت: "وەسیەتی خۆت كردووە؟" من لەم گوتەیەی دڵمەند بووم, چونكە دەمزانی لە داهاتوویەكی چاوەڕوان كراوا بۆ چوونە كوردستان هەر كارێك پێویست بێ دەیكەم.

وەك ڕوون بوویەوە تەنیا دەبوو لێیدانیشم و چاوەڕێ بم. سەیر و سەمەرەی ژیانی هەواڵنێریش ئاوان, یانی وەختێك ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ساڵی ١٩٩١ حەوت مانگ پاش داگیركرانی كووەیت ڕێبەرایەتی هێزە هاوپەیمانەكانی بۆ ڕەپاڵ نانی سەدام لە وێندەرێ وە ئەستۆ گرت, ڕاسپێرام هەواڵەكانی سەبارەت بە كوردستان بنێرمەوە! دەتگوت دوعام گیرابوو. كوردستان سەرەڕای تەواوی دیاردە خۆش و ناخۆشەكانی, چەشنی كێشندەیەكی نەمر و پتر ناباو, خۆی بۆ نواندم.

چەند سالآن بە پێیان زنجیرە چیای زاگرۆسم بڕی بێ هیچ ویزا یا بەڵگەنامەی هاتوچۆ, یان تەنانەت بە بێ پارێزگارێكی چەكدار سنوورم پەڕاند و زۆریشم پەڕاند" ئەویش لە ناوچەیەكی كە چەند ڕۆژ پێشتر لە یەكێ لەم هاتوچۆیانەدا, هەر لەو ئارامانە سێ هەواڵنێری ئینگلیسییان بۆ خاتری پووڵەكانیان كوشتبوو.

لەگەڵ پەناخوازانی شەكەت و ماندووی كورد كە ناچار بوون زارۆك و باپیرە و داپیرەكان لە پەنا ڕێیان بنێژن, ڕێگای زۆرم بڕیوە. خەڵك بۆ ناشتنی مردوان, لە ترسی تەقینەوەی مین بە پارێزەوە دەگەڕان و نەیاندەوێرا لە ڕێیان كلا بن. بە سواری باڵەفڕ بە سەر كوێستانەكانی سەخت و هەڵەمووتی سنووری ئێراقا هاتوچۆم كردووە و بە جوانی دەشت و دۆڵ و زەویوزاری تاقەوە كەوتوو و دەرەی بەردەلآن و شەپۆلی ئاوی مەیلەو شیری دیجلەی خوڕی كەفچەرێنم دیوە, كە بە دەشتی كاكیبەكاكیدا بەرەو دیاربەكر – پێتەختی غەیرە ڕەسمی كوردستان – دەخوشی. بەرزەفڕی باز و زڕەچێرگ و هەڵۆیانم بینیوە كە بەسەر لێڕەواری چڕ و تەپك و كێوی ڕووتەندا باڵیان ئەنگاوتووە هەتا لە دەرفەتێكا دابێنە نێچیر.

دۆستانی کوردم بە مەبەستی پارێزرانـم ناچاریان کـردم کـە بـۆ برینـی ڕێ و بـانی کوردستان پارێزەری چەکدار بە کرێ بگرم و تـەنیا بـە ڕۆژ بـەم شـوێنانەدا هاتوچـۆ بکـەم" کۆخیـوم و بەڵغـەمی تـەپ و تـۆزاویم لـە سـینەوە دەرداوە و لـە گـەرمای تاقەتپڕووکێنا برژاوم. شانبەشانی ئەو کـوردە ڕووت و بێئەنوایانـەی کـە لـە نزیـك یەکێك لـە گەورەترین سەرچاوە نەوتییەکانی جیهانا لەتکە قیلەتاویان بۆ دابـین کردنـی گەرما دەسووتاند, سڕ بووم. لەگەڵ سـەرۆك عەشـیرەتەکانی کـوردی ئێـران و ئێـراق چا و ویسکیم خواردۆتەوە" گوێم داوەتە وتەی چالاکانی کـوردی مـافی مـرۆص لـە تورکیـا کـە مـەرگ دەم لەسـەر پـشت هەڕەشـەی لـێدەکردن. لـە گـش شـوێنێ, گەیشتوومە کوردی هەر تاقم و چینێ کەوتوومە وتوویژی سیاسی. لە ئێراق تووشـی گوندییانێك بووم کە بە کەرەسەی سەمەرەی وا کە تەمـەنیان دەگەیـشتەوە سـەردەمی کەونارای بەر لە مێژوو درووپان دەدروو؛ لەگەڵ جووتیارانی خاوەن تـەراکتۆر باسـی قیمەتی گەنـمم کردووە" جەرگم سووتاوە بۆ چینی مامناوەندی شارنشین کە بۆ زیندوو مانەوە ناچار بوون زەوی, زێڕ و جـەواهێرات, ترۆمبیـل, ڕادیـۆ و تلـەفیزیۆن, دەرك و پەنـجەرە, نوێن و بان و خانووبەرەکانیان بفرۆشن.

بە بیـستنی بەسـەرهاتی ڕۆژەڕەشـی کـوردان گریـاوم. نـەقڵ و نەزیلـەی گەلـێ تاڵوتوونتـر لەم پەندانەی ڕێبەرانی وڵات بە سەریان هێنـاون. نەزیلـەی خـاپوورکرانی هەزاران گوندی بچووکی کورد کە سەردەمانێك هەوێنی هـەبوونی کوردسـتان بـوون. لە کۆنە میوانـخانەی یەکێ لە شارەکانی کوردسـتانی تورکیـا بەریبـەیانی بـە تەقـەی تفەنگ لە خەو ڕاپەڕیوم کە سەت گەزێك لـەولاترەوە دەهـات, پاشـان لـە چـالاکی کاربەدەستانی دەزگای ئاساییش ڕاماوم کە بـە لێهـاتوویی و تونـد و تیـژی تاقمـەکانی وڵاتانی کۆلەدار دەور و بەری خۆیان دەپشکنی و سەریان وەبەر هیچ مقامێـك نـەدێنا. ڕچەی بەفری کوێرەڕێی قاچاغم بڕیـوە هـەتا گـوێ بـۆ مـەیل و تامـەزرۆیی شـاراوەی ڕاوێژی کاڵ و خاوی مارکسیستیانەی لاوانی کوردی تورکیـا ڕادێـرم. ئەمانـە لاوانـێ بوون کە حازر بوون هەزار هـەزار لـە ڕێـی پێکهـاتنی وڵاتێکـی سـەربەخۆدا بـمرن.

هەروەها لە ئێران و ئێراقا لە ئامانجی سنووردارتر, یانی خودموختاری, فێدرالیسم, لە چوارچێوەی کەوشەنی ئەم هەرێمانەدا کە هەن, حاڵی بووم. ئەو مەبەستەی کە کوردەکانی ئێران و ئێراق پاش تێکشکانی پێکهاتنی خەیاڵ و ئاواتی دوور و درێژ و هەڵگرتنی باری قورسی چەند دەیەی پڕ لە کوێرەوەری و وێرانی, پێملی بوون.

لەگەڵ زۆر کوردان لە هۆتێلی ولاّتانی ڕۆژاوایی, لە ژێر خێوەتان, لە بن کەپری بابردەڵەی بە چرپی و چاڵ و لە مەودای سەفەری دوور و درێژ بە ئوتۆمبیلی شڕ و تەنگەشکاوا قسە و وتوویژم کردووە. لە گەڕیانی ئەم وتوویژ و باسانەدا, ڕەنگە لەبەر بەسالاّچوونم بووبێ کە جگە لە ڕێز و حورمەت چی ترم نەدیوە. من زۆر جار سەرم لە تێکەلاّیەتی لەسەرەخۆیی و ڕەقەوەنی سەیری ئەم خەڵکە سوڕماوە. بەتایبەتی کاتێ دیمەنێکی ساڵی ١٩٩٢ کە لە دوای بارینی بەفرێکی قورس لە بڵندان ڕووی دا دێنمەوە یاد: دوو ئوتووبووسی پڕ لە کورد کە بەرەوڕووی یەك دەهاتن لە باریکەڕێیەکی کە تەنیا بەفرخۆرکەی ئەو ناوچەیە ماشتبووی تێکهەڵەنگووتن. من سواری لەندرویێرێك ببووم. ئەو دوو ئوتووبووسە هیچیان حازر نەبوون بکشێنەوە یا خۆ کلا بن. ڕێ ئەوەندە تەنگەبەر بوو ئاوا دەرچوونیان نەبوو. چەند پشوویەك پێچوو. لە پڕ موسافیرەکان دابەزین و لەم بەفرەدا یەکتریان دایە بەر شەپ و مست. وە بیر سووکایەتی پێکرانەکانی پێشوو کەوتبوونەوە یان وایان دەنواند کە کەوتوونەوە یادی. تێکهەڵدان بەرەو ڕۆمرکان نەدەچوو, هەمووشیان چەشنی کوردانی دلاّوا کەڵەشینکۆفیان لە خۆیان شەتەك دابوو. من لە ترسی ئەم خوێنڕژانە لە نەکاوەی هەستم پێدەکرد ئاخرییەکەی دەستم دایە پێمەڕەیەکی نێو ئوتۆمبیلەکەمان و ئەوەندەم ڕێ درێ هەتا ئوتۆمبیلەکەی خۆمان و یەکێك لە ئوتوبووسەکان تێپەڕ بێ. هاوارم کردە کوردان کە من بە پەلەم. ئەوان تەنانەت لە قسەیەکیشم حاڵی نەبوون.

بێ گومان بە لای ئەوانەوە من مرۆیەکی تەواو شێت بووم, چونکە لەپڕ لێکبوونەوە و هێدی و هێمن گەڕانەوە لای ئوتووبووسەکانیان و سوار بوونەوە. من بوومە ڕێنوێن, یەکێك لە ئوتووبووسەکانم کلا کردە ئەو شوێنەی کە مالّیبووم و ئەوی تر تێپەڕی.

ئەم ڕووداوەم بۆیە لا خۆشەویستە چونکە بـۆ جـارێکیش بـێ بێگانەیـەك لــە بـری ئەوەی گرفتەکە پتر بابدا, ڕەهای کرد, گرفتێکی کـوردی, جـا بـا ئەشـتەکی ئـەوتۆش نەبێ. هەروەها ئەم ڕووداوە نیشان دەدا کە بـۆ چـی مـن هــەبوونی "کرۆمـۆزۆم"ێکـی زیت و بزۆزم لـە ڕەگەزی کورداندا پێشك دێ کە دەبێتە هۆی هەمان شتێ کە ڕەنگە سووڕپێستانی وردبین و خاوەن چێژە بە مەیلی "Fissiparous"[1]ی ناودێر بکەن.

١– لە ژینەوەرناسیدا وەدیهاتنی بەرهەم لە ئاکامی کەرت بوون, لێكدابڕان (؟) مەیلی کەرت بوون, لێكدابڕان (؟)

# بەشی ٢

## بەم هەمووە زانیارییەوە لێبووردنی چی؟

لە کلکەی سەدەی نۆزدەهەمدا عوسمانییەکان بە پێی دابێکی لەمێژینە تەواوی هۆزی "هەمەوەند"یان بە تاوانی سەربزێوی و ڕێگریی هەوسارپساو، لەم مەڵبەندەوە کە دەبێتە ئێراقی ئەمڕۆ، دوور خستەوە بۆ لیبی. ئەم هۆزە لە ماوەی حەوت ساڵاندا بە قوونەشەڕ تەواوی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی تەقاندەوە و گەڕایەوە زێدی خۆی و شەڕوەنی جارانی دەس پێکردەوە. هەموو کوردێك تۆزێك لەم خدە"هەمەوەندی"یەی تێدایە، ئەویش لایکەم کاتێك دەگاتە دژکردەوە لە بەرامبەر ئەم نەهامەتییانەی کە لە لایەن هۆکارێکی غەوارەوە داسەپاوە. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەوەی کە چاوەدێرێکی دەرەکی خەمبار دەکا ئەم زامە تازانەن کە دەگەڕێتەوە سەر بەڵای بە پێچ و دەور کە چەشنی میراتێکی نەبڕاوە بەسەر ئەم خەڵکەدا دەسەپێ. لە شێعرێکی کۆندا گوتراوە، بەش و

چارەنووسی كوردان "هەزاران ئـاخ, هـەزاران ئەسـرین, هـەزاران شـۆڕش و هـەزاران هیوایە."

لـە یەكەم نیگادا, خۆڕاگری و بوێری كـوردان خـۆی لــە خۆیـا زۆر سـەیر شـوێن لـەسەر بینەر دادەنێ, بەڵام زۆر جاران كاتی پێداهاتنەوەی دوور و درێژی ڕووداوەكان, توێژەر دەبینێ كە هێڵـەكانی, شەق بردن و لـێكدابڕان لـە سەرەتاوە شۆڕشـی كوردیـان

لەگەڵ تێكشكان بەرەورووو كردووە. نەتەوەخوازانی كورد, چ لە ولاتێكا یا تـەواوی ئەم وڵاتانەی كوردستان دەگرنەبەر, سەریان لە سەرنەكەوتن سـوڕماوە. كـوردان كـە هیچ كاتێ گەلێكی "یەكگرتوو" نەبوون, هەمیـشە گـیرۆدەی نـاكۆكی قـووڵ بـوون و مەیلی خەیانەتكاری لە ریزی خۆیانا تووشی خەساری كردوون. ئەم خەڵكە كە لەتـەك حكوومەتە چەكدار و بێبەزە و زاڵمەكان بەرەورووو بوون, چ كردەوەیەكی وا نـانوێنن كە نیشانەی پەند وەرگرتن بێ لە هەڵەكانی ڕابردوو, جگـە لـەوەی خـەم بـــخۆن بـۆ لووزەوی ڕوو لە زیاد بوونی شەپۆلی خـوێنی ئینـسانی كـە لـە بابـەت شۆڕشـانەوە, بەتایبەت لە ئێراق و توركیادا, دراوە و دەدرێ, كارێكی تریـان نـەكردووە. لـەم دوو وڵاتەدا پێكهاتەی كۆمەڵی گوندنشینی كۆن تەواو بنەبڕ كراوە.

لە كۆمەڵی كوردەواریشدا چەشـنی كۆمـەلانی گەشـە نـەكردوو ناشـییەتی و لـێنەزانینی سیاسی نیشانەی كاریگەر بوونی سەركوت و چەوسـانەوەی بێپـسانەوەی نەتەوەییە. كـوردان گەلـێ ڕێبـەریان بـەخۆە بینیـوە, بـەلام هیـچكامیان نـەیتوانیوە "نەتەوەخوازی" ئەم خەڵكە بگەیەنێتە سەربەستی یا خۆ خودموختارییەكی سەقامگیر, جا ئەمە لە كاتێكایە كە تەنانەت دوڕگەی بـچووك بـچووك شـاندازی بەمـە دەكـەن كـە ئەندامی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكانن. نەتەوەخوازانی كورد زۆر جـاران لـەگـەڵ حكوومەتانی دەرەكی دەستیان تێكەڵ كردووە و ئەم حكوومەتانەش بە ڕووی خۆشـەوە وەریانگرتوون و وەكوو داردەستێك بە دژی وڵاتانی دراوسێ یا خـۆ تەنانـەت خـەڵكی كورد كەلكیان لـێوەرگرتوون.

ئەربابان و دەسەلاتدارانی بێگانەی كوردستان بە درێژایی مێـژوو كەوتوونـە شـوێن سیاسەتی "زمانبڕ كردنی" ئەم خەڵكە, كە ئەویش دەبێتە خاشەكێشانی هەر شتێكی كە نیـــشانەی گـــووران و ســـەرهەڵدانی توێـــژێكی هەڵبـــژێراوی پێـــوە بـــێ و بتوانـــێ "ڕێبەرایەتییەكی" لێوەشاوە بێنێتەڕوو. ئەم "دەسەلاتدارانە", خوێندەواران و چاوكراوانی كوردیان كێشاوەتە نێـو ڕیـزی خۆیـان, لـە بەندیـخانەیان تونـد كـردوون, دووریـان خستوونەتەوە و كوشـتوویانن و بـەم شـێوەیە خـەڵكی كوردیـان لـە بـوونی ڕێبـەرانی خۆڕسكاو و سیاسەتزان و بەئەزموون بێبەری كردووە. لەم سەدەیەدا جگە لە چەند كەسی دەگمـەن, ڕێبـەرانی كـورد هـەموویان خـەڵكێكی لـێنەوەشاوەی بیرتەسـكی

گونـدەکی بـوون و لـەم جیهانـەدا کـە چارەنووسـی گـەلان لـە دەرەوەی هـەرێمی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دیاری دەکرێ, بۆ هەڵس‌وکەوت لەتەك جیهان و داب و نەریتی جیهانی دەرەوەدا دوور لە ڕاهاتن و پەروەردە کرانی شیاو بوون. سـەردەمێك ڕێبـەری جووڵانەوەی کورد ڕێبەرێکی سوننەتی بووە, هەروەك لە ئێراقا وابوو, جاری واشە لـە داوێنی چینی بێ‌ڕیشە کراوی خوارەوە سەری هەڵداوە, هەروەك لە تورکیـای ئـەمڕۆدا دەیبینین.

لەم دوایی‌یانەدا کوردەکانی ئێران و ئێراق و تورکیا هەموویان هاوکـات خـەریکی شۆڕش بوون, بەڵام بە بێ هاوکاری و هاوهەنگاوی لەگەڵ یەکتر. هەر کە لە وڵاتێکـا تاقمێك بە پەند وەرگرتن لە هەڵەکانی ڕابردوو و هەڵسەنگاندنی ئـەو نرخـە قورسـەی بۆیان دراوە ڕوو دەکەنە بەرژەوەندی و لانی پارێز دەگرن, دەبینی ئەوانەی لە پـەنایانن ڕوودەکەنە زێدەخوازی و لانی زۆری ویستەکان دیننە گۆڕ و بەم شێوەیە بەسەر کـاری بەرژەوەندخوازنەوە هەڵدەوێستن و قوت دەبنەوە. تەنانەت ئەوانەی لـە مـاوەی دەیـان ساڵدا لانی پارێزیان گرتبوو, تەنیا بە مەبەستی وە دەستهێنانی سەرکەوتن لـە شـەڕ و بەرزەخوازی پووچی خۆکەسیدا لانی بەرژەوەندییان بەردا. لـە ١٩٩١دا پـاش حـەفتا ساڵ چەند کوردێك وەك نوێنەری ڕاستەقینەی قازانـجەکانی خەڵك چـوونە پارلـەمانی تورکیا. بەڵام ئەمانە لەبەر لـێ‌نەزانیی سیاسی لەم بـوارەدا نـەیانتوانی خۆیـان لـە تـاق بوونەوە و گیران و زیندانی حکوومەتی ژێر ڕکێفی هێزە چەکدارەکانی ترك بپارێزن. بێ ئەزموونیی ئەم نوێنەرانە خود بە خود یارمەتی درێژەدرانی ئەم شەڕ و کێـشەیەی دا کـە لە کوردستانی تورکیا گەڕی دەدا, ئەم کێشەیەی ئەمانە هیوادار بوون دوایی پێ‌بێنن.

بە سرنجدان بە نەبوونی وڵاتێکی کورد و پێشینەی گەلـێ ڕاپەڕین و جووڵانـەوەی سەرنەکەوتووی تێك‌شـکاو, هـەر ئەوەنـدەی کـە زۆربـەی کـوردان هێـشتاش لـە ناوچەیەکی جوغرافیایی پان و بەرینا نیشتەجێن و وەك کۆمەڵێکی نەتـەوەیی بـۆ ناسـین دەشێن, خۆی جێی سەرسـوڕمانە. وتـەی "شـیاوی ناسـین" پێویـستی بـە لێکدانـەوە و تێگەیشتنی باڵایە, بەڵام هەرچۆنێ بێ کوردان دەزانن کە کێن.

کۆمەڵی کوردەواری ئەگەرچی خاوەنی چەندین زمان[1] و تۆرەمە و مەزەبی جیاوازە, دیسانیش خەڵکەکەی لە ئەزموون و ئاوات و یەکئامانجیدا هاودەنگ و بەشدارن. لە پێشدا و لە هەموان گرینگتر ئەمەیە کە کوردان دەزانن عەرەب نین, ترك نین و فارسیش نین. کوردان سەرەڕای ئەم هەمووە گۆڕین و چەواشەکارییەی حکوومەتان بۆ تێدا بردنی "کوردستان" دەیکەن, لێیان سوورە کە کوردستان کوێیە.

تورکیای نوێ پتر لە حەفتا ساڵە کە بە ڕێبازی تواندنەوەی پێناسەی فەرهەنگی و سیاسی کورداندا دەئاژوێ. لە مارسی ١٩٢٤ەوە, بڕێ کەمتر لە ساڵێك پاش دامەزرانی کۆمارێتی لە تورکیای مستەفا کەمالا, فەرهەنگ و زمانی کوردی و تەنانەت ناوی کوردی شوێنەکانیش یاساغ کرا. لە تورکیای نوێدا ڕەوشتی ڕاکێشان و تواندنەوە هەتا ڕادەی "حوکمی ئاقیدەیی" پێهەڵاچوو. ئەمەش بەم مانایە بوو کە هەر کوردێك لە دەرەوەی هەرێمی "کوردستان"دا دەبێ ئامانجی سیاسی "وە ترکگێڕانی" وڵات بسەلمێنێ و ئیتر یان کورد نەبێ یام لای کەم هەستی کوردایەتی نەمابێ. ئێران و ئێراق قەت حاشایان لە بوونی کوردان نەکردووە, بەڵام بە وریایی تێکۆشاون ژمارەی جەماوەریان کەمتر لە ڕادەی ڕاستەقینە بنوێنن.

تەنانەت ئێراق – هەر جینایەتێکیشی دەرهەق کوردان کردبێ دیسانیش خودموختاری کوردستانی سەلماندووە – بۆ ناساندنی "ناوچەی شیمال" کە خودموختاری وێداوە لە بە کار هێنانی وشەی "کورد" خۆ دەپارێزێ. دەیان ساڵ تورکیا لەسەر ئەم مەبەستە پێیدادەگرت کە کوردان "ترکی کێوی"ن کە لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتا – نەك لە کوردستان – دەژین. ئەم شێوە زمانبازییە تۆزێکە لەم فەرامۆشییەی حکوومەت بە خۆی دەسەلمێنێ. بەم شێوەیە ئەگەرچی لە سەدەی سێزدەی زایینی بەم لاوە وشەی "کوردستان" ئیستلاحێکی جوغرافیایی ناسراو و بنەگرتوو بوو, ئەمڕۆ تەنیا لە ئێرانا ئەم پلە و ناوە ماوە و جوغزی یەکێك لە پارێزگاکان دەگرێتە بەر – هەڵبەت ئەم پارێزگایە تەنیا بەشێك لە

---

١– کورد خاوەنی چەند زمان نیە, بەڵکوو خاوەنی چەند زاراوەیە.

کوردەکانی وڵات دەگرێتەوە. کوردستان لە ئێراقا بریتییە لەم مەڵبەندەی کە هەمان ناوچەی خودموختاری سەر و کلك پەڕیوە.

بۆ هەرکەس جگە لە دیوانداران, هەرێمی کوردستان دەبێتە ناوچەیەکی دووسەت هەزار میلی چوارگۆشە یانی نیزیك ڕووبەری وڵاتی فەڕانسە یا کۆی ئەیالەتەکانی کالیفۆرنیا و پێنسیلوانیا. ئاو و هەوای کوردستان لە ناوچەکانی بنار و دەشتەکانی "دووچۆمان" خۆش و فێنکە و لە کوێستانەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا ساردە. ناوچەکانی سەخت و کێوپارەی زۆر ساڵان هەتا پێنج مانگان بەفریان ناچێتەوە. لە زۆربەی خاکی کوردستانا, بە پێچەوانەی ناوچە قاقڕ و کەم ئاوەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست, ئاو زۆرە و ڕۆژایەکی لێرەوارێکی پڕ و چغور بووە. ئێستا زۆربەی کوردستان بێ دار و دەوەنە, ئەم ڕووتەنییە نیشانەی خەسارێکە کە سەردەمی شەڕ و دەورانی ئاشتی, سروشت بە خۆیەوە بینیوە؛ بێپێز بوونی خاك بە هۆی بۆمبای ناپاڵم و ژاری شیمایی گەڵاوەرێن و لەوەڕانی لە ڕادەبەدەر تێکرا دەستیان تێك‌گرتووە و ئەم بارەیان برەو پێداوە. بێجگە لە لووتکەی بەفرگری چیاکانی کوردستانی تورکیا, کوردان خۆیان بە خاوەنی دوو شوێنی تریش دەزانن کە کەشتی "نووح" لەنگەری لێ‌گرتووە و یەکیان چیای جوودییە لە ناوچەی باکووری ناوچەی هاوسنووری تورکیا و ئێراق و ئەوی تر بەرزترین نووچکەیەتی کە دەبێتە ئارارات. بەرزایی ئەم چیایە لە ڕێکی دەریاوە ١٦٩٤٦ پایە و کەوتۆتە سەر کەوشەنی تورکیا و ئەرمەنستان.

ئەم نەخشانەی بە دەستەوەن, نیشتمانی کوردان لە سێ سووچێکی ناتەواوی بەراوەژوودا نیشان دەدەن کە قۆڵەکانی لە سنووری تورکیا و ئازەربایجانەوە بەرەو باکووری ڕۆژاوای ئێران ڕادەکشێن و لە درێژەی زنجیرە چیای زاگرۆسدا دەچێتە پێش هەتا دەگاتە مەدارێکی تۆزێك لە شانی مەداری بەغداوە کلا. لە ئێراقا ئەم هێڵە لە کەوانەیەکی بەرینا و لە درێژەی سنووری ئێران و تورکیادا دێتە پێش و هەتا بنەبانی گۆشەی باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا دەڕوا و لە باشووری ڕۆژاوای تورکیادا دەبێتە تاشە و بەردەڵانێکی سەخت کە وردە وردە لە دامێنی باشووری و ڕۆژاوای ئەوێدا گرێ و گەوەی لێك ڕەها دەبێ و شانەوشانی کەوشەنی ئێران لەگەڵ ئەرمەنستان هەتا ڕۆژاوای فورات سەر تێك‌دەنێ. مەڵبەندی پان و بەرینی کوردنشین, بەتایبەت لە قۆڵی

ڕۆژهەڵاتی ئێران یانی خوراسان و شانبەشانی سنووری تورکەمەنستان هەن. هەروەها لە بلووچستان, نیزیك پاکستان, لە باشوور, لە دەر و دەشتی ئاناتۆلی تورکیا, لە ڕۆژاوا و باکووری ڕۆژاوای ئانکارا و لە سووریاش, لە باکووری حەلەب و باشووری چیای عەفرین – لە نزیك سنووری تورکیا – بە مەودای چەند میلێك لە دەریای مەدیتژانەوە, کورد نیشتەجێن.

لە تورکیادا جگە لەمە, تاقم و کۆمەڵی بچووك و تاك و وازی کورد لەسەر کەوانەیەکی گرێ گرێ و پچڕ پچڕ و دروست لە لای باکووری ئەم مەڵبەندە پەڕاگەندەن. هەر وەها کۆمەڵی تری کوردان لە ئەرمەنستان و گورجستان و بەتایبەت ئازەربایجانی سۆڤیەت و چەند مەڵبەندی تری یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو وەبەر چاو دێن. هۆی پەرەمپەرەم بوونی ئەم خەڵکە دەگەڕێتەوە سەر ترسی شێتانەی ئیستالین لە غەیانەتی کورد بەو وڵاتە. لە لێواری دەریای خەزەر لە ئێرانا تاقمی بچووکی کورد وەبەر چاو دێن. شارە گەورەکانی ڕۆژاوای تورکیا وەك ئانکارا, ئەدەنە, ئەنتالییە, ئیستامبووڵ و ئیزمیر پڕن لە کۆمەڵانی کورد. زۆرێك لەم کەسانە نوێپەڕەوازە کراوی دەستی هێزە چەکدارەکانی تورکیان کە لە گوندەکانیان ڕەتێنراون. ئەم هێرش و ڕاماڵینە هەر لە سەرەتای دەسپێکی شۆڕشی کوردان لە ١٩٨٤ەوە گەلێك ناوچەی هەراوی کوردستانی تورکیای بە دانیشتوانی چۆل کردووە. لە دەمیشقی پێتەختی سووریادا گەڕەکێکی کوردنشین, لەسەر شانی گرد و باسکانەوە چەند سەدەیە دەڕوانێتە ناوەندی شار. تاران, تەورێز و ناوەندە نەوتییەکانی باشووری ئێران کۆمەڵانێکی فرەی خەڵکی کوردیان تێدا نیشتەجێیە. بەغداش هەروەتر. لە ئەڵمان و سوئێد و وڵاتانی تری ئورووپاش کۆمەڵانی فرەی کورد دەژین.

ئەم شێوە ناوەندە جەماوەرییانە بە گوێرەی ڕێسا دەبێ کاری سەرژمێری کوردان هاسان کەنەوە, بەڵام سەرەڕای ئەوانەش ژمارەی نفووسی باوەڕ پێکراو لە هیچ شوێنێ نیە. بێگومان نەتەوەخوازانی کورد لەمەڕ ڕێژەی جەماوەری خەڵکی خۆیانا زۆری فوو لێدەکەن, هەروەك وەچەکانی ڕابردوویان بە گوێرەی نەخشەکەی کە ساڵی ١٩٤٥دایانە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان, لەسەر یەکگرتوویی خاکی کوردستان, لە دەریای مەدیتەرانەوە تا کەنداوی فارس, سوور بوون. کوردان کە

ولاتێکیـان نـەبووە, کەرەسـە و ئـامرازی پێویـستی سـەرژمێرییان بـە دەسـتەوە نیـە. حکوومەتانی تـر (مەبەسـت داگیرکـەرانی کوردسـتانە – وەرگێـر) سـەردەمانێك کـە دەیانویست بە باشی کورد و نەتەوەکانی تری ولاتەکەیان سەرژمێری بکەن, وردە وردە وایان بە باش زانی تازە باسی ژمارە و ڕێژەی نفووسیان نەکەن یا خۆ زانیـاری چەواشـە کراو لەم بارەوە بلاو کەنەوە. بەم شێوەیە ڕێژەی بەرەو سـەری جـەماوەری کوردیـان شاردەوە. ئەم هەڵدانی ڕێژەی نفووسە زیاتر تۆڵـەیەکە کە ئەم خەڵکە لە ئەربابەکانیانی دەستێننەوە. بایـخی کەم و زۆری ڕێژەی نفووسی کوردان لــە بەرامبـەردا بۆتـە هـۆی ئەوەی کە دەوڵـەتان ئەوان لە بەشە داهاتی نەوت و پەرەپێدانی ئابووری بێبەش کـەن, چونکە بە بێ هەڵاواردن و جوێ کردنەوەی ژمێران بە گوێرەی تێکەڵایـەتی ڕەگـەزیی, دەوڵـەتانی داگیرکەر دەیانتوانی دەهۆڵ و زوڕنا بۆ ڕێبازی قاڵ بوونیـان هـەڵبگرن. لــە ئێراقا سەددام حوسێن زۆر جاران خۆی لــە سـەرژمێری بـوارد, چـونکە نەیدەویـست داهاتی نەوت بە گوێرەی نفووسی ولات دابەش بکا, لە حاڵێکا بەشی زۆری ئەم نەوتە هی خودی کوردان بوو. بە نەبوو دانانی ڕەگەزی کوردان لــە تورکیـادا, بــە پێـی ئـەم بەڵگانەی نیشاندەری بێهەڵاچوونی ڕێژەی بەرچـاوی نفووسـیانە لــە ڕێـی زا و زێـوە, ڕەنگە تەنیا خۆ فریودانێکی نەفامانە بێ. لە ساڵی ١٩٨٩ ئامـارە ڕەســمییەکان وایـان دەنواند کە پلـەی مامناوەندی پاکنــەکردەی زیــاد بــوون و هەڵــدانی زا و زێ لــە کوردستان ٢/٧٥ و لـە پاشـماوەی تورکیادا لـە سەتا ١/٤٩ بووە, یانی لـە جـەماوەری ژێر ١٥ ساڵا بە ڕیز, نزیك لـە سەتا ٥٠ و ٢٥ بووە.

لـەبەر بە دەستەوە نەبوونی چ ئامارێك, کارناسانی ڕۆژاوا بە تێکڕای دەنگ ڕێـژەی نفووسی کوردان بە ٢٥ میلیۆن کەس و جاری وایە بــە برێـك زیاتریـشی دەقـەبڵێنن. ئێستا کە کوردان – پاش عەرەب و ئێرانی و ترکـان – چـوارەمین کۆمـەڵی نەتـەوەیی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستن, بێتوو ئەم پێشوەچوونەی هەڵدانی جەماوەرییە تووشی ئـاڵوگۆڕ نەبێ, زۆر وێدەچێ لـە ماوەی پەنـجا ساڵی داهاتووا هەم لـەم هەرێمە و هەم لـە خـودی تورکیادا پێشاوبرکەی ترکان دەنەوە. بەڵێ ئەوەیە هێزی زا و زێی کوردان, پاش تێپـەڕ کردنی سەدەیەکی ئاوها کاولـکەر.

هێندێك زیاتر لە نیوەی خەڵکی کوردستان لە تورکیا دەژین. ناوەندی جەماوەری کوردان لەم وڵاتەدا زیاتر بەرەو ڕۆژاوای وڵات دەکشێ. کۆچی کوردان لە کوردستانەوە بۆتە هۆی پێکهاتی جەماوەری بەرچاوی کوردان لە شارەکانی ڕۆژاوای تورکیادا کە لە سەردەمی حکوومەتی "بیزانس"ەوە — کە ئەوانی دەرپەڕاند — بێوێنە بووە. ئەگەر — هەر وەك بڕوای گشتی لەسەر ئەوەیە — کوردان پتر لە ٢٠٪ نفووسی شێست میلیۆنی تورکیا پێك‌بێنن، هەر ئێستا نیزیك بە سێزدە میلیۆن کورد لە تورکیا دەژین. نیزیك نیوەی ئەمەش لە ئێران نیشتەجێن کە دەبێتە ١٠٪ی ڕێژەی نفووسی ئەم وڵاتە. ٤/٢ میلیۆن کەس بە هێندێك ژێر و ژوورەوە دانیشتووی ئێراقن, کە دەبێتە ٢٣٪ نفووسی وڵاتی ١٨ میلیۆن کەسی وێندەرێ. دیارە ئەمە دەبێتە زیاترین ڕێژەی جەماوەری کورد بە گوێرەی ڕادەی نفووسی ئەم چوار وڵاتە کوردنشینەی ناوچە. ڕێژەی باڵای ئەم جەماوەرە, هەروەها شاخاوی بوونی ناوچە و دەس تێوەردانی دەرەکی و ناکۆکی نێوان کەمینەی عەرەبی سوننی مەزەب و زۆرینەی عەرەبی شیعە مەسەب کە لەم وڵاتەدا بە شێوەیەکی ساختەکارانە ساز کراوە, یارمەتی شی کردنەوەی ئەم مەبەستە دەدا کە بۆچی و لەبەر چی لەم وڵاتەدا سەرهەڵدانی پەیتاپەیتا و نەپساوەی کوردان زیاتر لە وڵاتانی تر بەهرەوەر بوون.

ڕێژەی نفووسی کوردەکانی سووریا دەگاتە میلیۆنێك یان نیزیکەی ٩٪ی تەواوی جەماوەری ١٣ میلیۆنی ئەم وڵاتەیە. جەماوەری کوردانی ئازەربایجان و ئەرمەنستان لەسەر یەك دەگاتە نیزیکەی سێسەد هەزار کەس. نزیکەی حەوسەد هەزار کورد لە ئورووپای ڕۆژاوایدا دەژین؛ تەنیا جەماوەری کوردەکانی دانیشتووی ئەڵمان دەگاتە چوارسەد هەزار کەس.

لە ڕاستیدا ڕێژەی نفووسی کوردان دەگاتە لە سەتا پازدەی جەماوەری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست, کە لە درێژخایەندا لە باری جەماوەرییەوە, دەتوانێ بۆیان ببێتە ئامرازێکی سەرکەوتن. تەنیا لە مابەینی سەدەی هەژدەدا بوو کە جەماوەری کوردان لە ڕەوتی هەڵدانی ساڵەکانی بەر لە سەردەمانی ئەفسانەیی نزیك بۆوە, یانی ساڵانی بەر لە کاول

بوونی ولات لـه سای سەری شەڕی پەیتاپەیتا, تاعوون و گەڕانی "واسکۆ دێ گاما"[1] بە دەوری قەپۆزەی "ئومیدنیك" لـه ١٤٩٧دا. ئەم سـەفەرە ڕێـی گواسـتنەوە و گەیانـدنی دەریایی نێوان ئورووپا و ڕۆژهەلاتی دووری کردەوە و کۆتایی بـە گرینگایـەتی ڕێگـای ویشکایی مەنشوور بە "ڕێی ئاوریشم" هێنا کە لـە کوردسـتانەوە تێدەپـەڕی. ئـەم کـارە وێڕای تەواوی کوێرەوەرییەکان یارمەتی دابەزینی چۆنیەتی باری ڕامیاری و ئابووری ئەم ناوچەیەی دا کە ڕۆژگارێك بە شێوەیەکی باش کشتوکـالی لـێدەکرا و لـە بـاری ئابوورییەوە دەولـەمەند بوو. ئێستا کە بازەرگانییەتی بە ڕێی ویشکانیدا برەوی نەمابوو, ئیتر نیازێك بە کێـشانی ڕێ و بـان و دامـەزرانی دام و دەزگـای پێویـستی ئیـداری بـۆ بێڕاگەیشتن و ڕاگرتنیان نەبوو. لـە ئاکـامی شـەڕانی لـە پەسـتا, کۆمـەڵی سـەکنیو و نیشتەجێی کوردستان کە بە دەوری کشتوکالەوە گیرسابۆوە, لێكبـــلاو بـــوو و دەوارنشینی جێی گرتـەوە. جێـی گومانـە کـە کـوردان بـەم بارودۆخـە تـەواو وەخـۆ هاتبنەوە. کوردان لـە سەدەی نۆزدەدا بە ڕادەیەك دواکەوتوو بوون کە پەیوەندی نێـوان خۆیان و ڕووسیای ڕووەو گەشەیان بە لاوە چەشنی وە دەست هێنانی کۆمەڵێکی هـەرە پێشکەوتووی خاوەن ژیار بوو, لـە حاڵێکا ڕووسـیا خـۆی لـە هەڵـسەنگاندنی لـەگـەڵ ولاتانی ئورووپای ڕۆژاواییدا ولاتێکی دواکەوتە بوو.

کوردستان گرفتاری دابڕانێکـی "چـیایی" هـات و پەیوەنـدیی لـەگـەڵ دەورووبـەری هەڵبڕی. ئەم تاق کەوتنەوە و دابڕانە هەتا لێكهەڵوەشانی ئیمپراتۆرییەتی عوسـمانی لـە کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیا نەپسایەوە. کوردەکان نە تەنیا باشترین دەرفەتی وە دەس هێنانی سەربەخۆیییان لـە درێژایی مێژوودا دۆڕاند, بەڵکوو لـەبـەر بەشـدار بـوون لـە کوشتاری پتر لـە میلیۆنێك ئەرمەنی لـە ساڵی ١٩١٥دا کەوتنە بەر لۆمە و سەرکۆنەی جیهانی؛ لـە حاڵێکا بە واتەی سەرچاوە کوردییەکان خۆیان تەنیا لـە شەڕەکانی نێوخـۆی عوسـمانی چوارسەد هـەزار کەسـیان لـێکوژرا بـوو؛ دیـارە ڕۆژاوا بـە ئاشـکرا ئـەم مەبەستەی خستە پـشت گـوێ. لـە جەنگـەی شـەڕی عوسـمانی و ڕووسـیادا – لـە

---

١- دەریاوانی پورتەغالی (١٤٦٩؟ – ١٥٢٤).

ڕۆژهەڵاتی توركیا – خودی تركان لە گەرمەی ئاڵۆزبڵۆزی شەڕا و بەڕێوە بردنی ڕێبازی "زەوی سووتاو" حەوسەت هەزار كوردیان لە مەوتەنی خۆیان ڕاگواست و دووریان خستنەوە. لەم تاقمە نیوەیان تێدا چوون. زۆری تریان لە ئێران كە بە ناو بێلایەن بوو و هەروەها لە ئەیالەتەكانی پێشووی عوسمانی كە ئێستا وڵاتی ئێراق پێكدێنن لەبەر قاتی و قڕی شەڕ سەریان نایەوە. كاتێك لە ١٩١٨دا ئاشتی گەڕایەوە ناوچە "كوردستان ئیتر هەرێمێكی ژێرخان تێكچـمیو و خاوەن جەماوەرێكی تەواو لێكدابڕاو بوو, توێژی خوێندەوار و پەروەردە كراوی پەرانپەران ببوو و ئەوەی مابۆوە بە گشتی كەتبووە ژێر دەسەڵاتی سەرۆك عەشیرەت و شێخان."

ئێران و ئێراق, بەتایبەتی توركیا – یانی ئەم وڵاتە كۆدەسەڵاتەی بە پێودانی ئورووپایی ساز كرابوون – ڕێبازی حاوانەوەی ئیمپراتۆرییەكانی پێشوویان لە پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی فرەنەتەوەدا بە قازانجی نەتەوەخوازییەكی بیرتەسكانە وەلا نا. كوردان لە بەرامبەر ئەم حكوومەتانەدا كە یەكبین تێدەكۆشان دڵخۆشی و ئۆگرییان بە زمان و جلك و فەرهەنگی نەتەوەیی تەفروتونا بكەن, تەنانەت ئەو دەمانەی هەزار میل یا زیاتر لە تۆرەمە و زێدی بەردەڵان و كێوپارەی جەغزی خەیاڵاتی خۆیان دوور بوون, پێشانیان داوە كە هەروا كورد ماونەوە.

ئەم خەڵكەی كە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە لە بلووچستان و توركەمەنستان و لە قۆڵی ڕۆژاوا هەتا تەنەكاواكانی ئیستامبووڵ و باژێرەكانی ئەڵمان و سوئێد پرژ و بڵاون, سەرەڕای تەواوی ئەم قڕ بوونانەی لە جەنگەی دوورخرانەوە یا كۆچی ئابووریا تووشی هاتوون, بە درێژایی سەدان ساڵ نەختۆكە گومانێكیان سەبارەت بە پێناسەی خۆیان ڕێ نەداوەتە دڵیان. وڵاتانی ناوچە بە بیر و بۆچوونی جیاوازەوە – لە ئیستالینەوە بگرە هەتا سەددام حوسێن, هەتا توركیای ئەمڕۆ و سووریای دەیەكانی ١٩٦٠ و ئێرانی سەردەمی ١٩٢٥ تا ١٩٤١ – ئەم خەڵكەیان لە زاگەی خۆیان هەڵكەندووە و پۆلپۆل بەرەو گوندانی دوورەدەست ڕەتاندوویانن, بەم هیوایەی كە بێتوو لە كۆسار و دەر و دەشتی خۆیان دوور كەونەوە ئیتر كورد یان لانیكەم نەتەوەپەروەر نابن. بەڵام بەڕێوە بردنی ئەم گەڵاڵانە بە ڕواڵەت چ سەركەوتنێكی بە دواوە نەبووە.

کوردان بە پێچەوانەی خەڵکێکی پــڕ کـێش کــە پێیانخۆشــە شــکۆ و مەزنایــەتی ڕابردوو بۆ سەلــماندنی داهاتووی باشتر بێننە کایــەوە, زۆر هــۆگری تێکۆشــانی زەینــی نــین. فەرهــەنگی ئــەوان لــە پێکگــرتن لەگــەڵ فەرهــەنگی گــەلانی تــری ڕۆژهــەڵاتی نێوەڕاستا, فەرهەنگێك نیە کە ڕیشەی بــچێتەوە نێــو دەقــان و – چەشــنی جوولــەکان بشتەوە "سەردەمی کۆن"[1] و وێنەی ئاسۆرییەکانی مەسیحی دابەزێتــە ســەر "ســەردەمی نوێ"[2] یــا وەك ئەرمەنییــەکان بگەڕێتــەوە ســەر پێــشینەی دەوڵــەمەنــدی کلیــسا – بــە پێچەوانەی ئاوماڵە مسوڵمانەکانیان شتێکیان نیە کە پێك‌بگــیرێ لەگــەڵ قورئــان بــۆ عەرەبان.

کوردان ئەو هاوبەندییە فەرهەنگی و ئیدارەیی‌یــەی ئێرانــی و ترکانیــشیان نیــە کــە بتوانێ هەستی کەسایەتی مێژوویی‌یان بپارێزێ. بەلاَم وەکــوو زۆرێــك لــە بــەجێ‌ماوانی مێژوو, دەبێ ڕابردوویان لە درێژەی مانا و واتایەکا بگونــجێنن کە لــە پــێچ و گــەوەی یەك دوو قوژبنانەوە نەکەوتوونە بەرچاوی ســەرکەوتووان. خوێنــدەوارانی کــورد لــەو ماکە ڕووناکبیرییەی دیتران دۆزیویاننەوە بۆ بردنەوەی مێــژووی کــورد بــۆ ســەردەمانی کۆن, کەلك وەردەگرن. یەکێك لە توێژەوانان بە پەژارەوە دەڵــێ: "ســاز کردنــەوەی مێژووی کورد کارێکی دژوارە؛ ئەم کارە زیــاتر پێویــستی بــە گــەڕان و پــشکنینی ئــەو دەقانەوە هەیە کە نە بۆ کوردان و نە لەمەڕ ئەوانەوە نووسراوە."

تەنانەت کاتێ سەرچاوەکانی ئیلهامیش کوردین, دیسان پەیامی پەیوەندیدار هەمیشە دوورە تەپ‌ومژ نین. زۆرێك لە فەرهەنگەکان بۆ ڕاڤە و شیرۆڤەی سەرینچاوەی خۆیــان خاوەنی کۆمەڵێك ئەفسانەن. کوردان لانی‌کەم لەم بارەدا دوو ئەفسانەیان هەیــە. بــە گوێرەی یەکێ لەم ئەفسانانە بنەچەکەی ئەم خەڵکە دەچێتەوە سەر ڕەگەزی ئەو کچ و کوڕانەی کە لە ژێر چنگی داگیرکەری تــانج و تــەختی پاشــایەتی ئێــران یــانی زوحــاك گیانیان دەرباز کردووە. ئەو مارانەی کە لەسەر شانی ئەم زاڵمە ڕوابــوون بــە مێــشکی سەری لاوان بەخێو دەکران. وەزیرێکی بە مشوور لێرا هەتا ڕەگەزی لە تێدا چــوون و

---

١و٢– وەسێتەکانی کۆن و وەسێتەکانی نوێ (کتێبی پیرۆزی جوولەکان و مەسیحییان).

برانەوە ڕزگار بکا, مێشکی گوێلکی لە جێی مێشکی لاوان دانـا و ئـەو تاقمـە کیـژ و کوڕەی ئاوها لـە مەرگ خەلـەستبوون بە دزی بەرێی کردنە چیا و کوردان لـەم کـچ و کوڕانە کەوتنەوە. ئەفسانەیەکی تر سولـەیـــمان پێغەمبـەر تێـوە دەدا کـە فـەرمانڕەوای هەرێمی سەرووی سروشت و جنۆکەی وێندەری بوو. ئەو دەسـتووری دا بـە جنۆکـان بەرەو ئورووپا "هەڵفڕن" و پێنسەد کچی جوان بێنن بۆ حەرەمخانـەی. جنۆکـە کاتێـك گەڕانەوە کە سولـەیـمان پێغەمبـەر مردبـوو, جـا بۆخۆیـان کیـژانیان بـە دەس گـرت, زارۆکی ئەم جندۆکانە و کچانی ئورووپایی بە کورد دەرچوون.

کـوردان سـەبارەت بـەم دوو ئەفـسانە جیـاوازە تووڕەیـیـەکی ئـەوتۆ دەرنـابڕن, هەروەك لە بابەت ئەم هـۆز و نەتەوانـەی لــە کوردسـتانەوە تێپـەڕیون یـان خـۆ لێـی نیشتەجێ بون و لە پێکهێنانی دەسـمایەی ژیانی وێندەرێدا بەشدار بوون خـۆ شـلـوێ ناکەن. بەڵگەی "فیزیکی" زۆرن لەسەر ئەوەی کە گەلــێ تۆرەمە هاتوونە کوردستان یا لێیەوە ڕابردوون. کوردانی ڕیزەڵە و گەنـمڕەنگ (لە باری ڕواڵـەتی قەڵافەتـەوە) لــە خەڵکی باشووری ئورووپا و مەڵبەنـدەکانی لێـواری مەدیتەرانـە و عـەرەب و فارسـان لێكهەڵناوێردرێن. کەمینەیەکی بەرچاوی کوردی باڵابەرزی قژکاڵی چاوشین و مـەڕی کە دانیشتووی دەوروبەری گۆلی ورمـێن لــە ڕۆژاوی ئێـران و بـاکووری ئێـراق هـەتا سنووری سووریا, بێگومان تۆرەمەی هۆزەکانی باکوورن کە لە سـەدەکانی پێـشوودا, لە ئورووپاوە بەرەو ناوچە ئاژاوتوویانە. سەرەڕای تەواوی ئەمانـە نیوسـەدە لێرەوبـەر, ویلیام لین وێستێرمان, بە پێی ئەوەی کە کوردان لــە ٢٤٠٠ سـاڵ بـەر لــە زایینـەوە شوان و دەوارنشین بوون, وتی: "کوردان دەتوانن پتر سوور بن لەسەر یەکڕەگـــەزیی و درێژەی ڕەوتی مێژوویی, بۆ ماوەیەکی زیاتر لەوەی هەر کام لە نەتەوەکانی دانیشتووی ئورووپا بتوانن خۆی لـێ بە خاوەن بکەن."

تاقمێکی تر لـە زانایان شـانازی سـەرڕەوی کـشتوکاڵ دەدەنـە کـوردانی چـیایی (لـە ١٢٠٠٠ ساڵ بەر لە زایینەوە.) ئەوانە بوون کە مـەڕ و بـزن و بـەرازیان کـەوی کرد و چاندنی دانەوێڵەی چەشنی گەنـم و جۆ و چێودان و پـەڕش و نیـسکیان کـردە باو. دەستەیەك لەسەر ئەم باوەڕەن کە یەکەم جار لە هەزارەی حەوتەمی بەر لــە زایـین تواندنەوەی مز لـە دەوروبەری دیاربەکر (لـە کوردستانی تورکیـا) کـراوە و کەرەسـەی

برونزی لە سەرەتای هەزارەی چوارەمی بەر لە زایینەوە لەوێ خۆیان نواندووە. سەرەڕای ئەم دەسکەوتە مەزنانە ناوەندی ژیاری کەوتە دەشتەکانی دووچۆمان. لەم دەشتانەدا تەختایی زەوی پێویستی بە دامەزرانی بنکە و ئامرازی بەڕێوەچوونی دەزگایەکی حکوومەتی ڕێكوپێك بوو بۆ مانەوە. ئەویش بریتی بوون لە داهاتی باج, سازدانی هێزی چەکداری بەربڵاو, دەزگای ئیداری و نووسین ... کە بۆ سەربەخۆیی لە چیادا پێویست بە بوونیان نەبوو.

گەلێ پەلاماردەر لە کوردستانەوە تێپەڕین. کۆچی دەوارنشینانی هیند و ئورووپایی لە ١٢٠٠–٩٠٠ بەر لە زایین کوردستان و بەشی زۆری ئاسیای ڕۆژاوای ئاڵۆز و وێران کرد. یەکێ لەم ملۆزمانە "کی ئەخشارش"ی گەورە بوو, کە ساڵی ٦١٢ی بەر لە زایین "نەینەوا"ی گرت و حەیاتی لە ئیمپراتۆرییەتی ئاشۆر و ١٥٠٠ ساڵ دەسەڵاتی چیانشینانی دووچۆمان بڕی. ئەوان سەردەمان کوردان بە ئازایەتی شەڕی پارتیزانی مەنشوور بوون. لە درێژایی سەدە و سەردەمانێدا زۆر کورد لە ڕیزی سپای بێگانەدا – جگە لە سپای خۆیان – خزمەتیان کردووە, بۆ وێنە لە یەکێك لە هەنگەکانی تایبەتی سپای سوور[1]دا کە لە جەنگەی شەڕی دووهەما شاری "مینیسك"ی لە ژێر چەکمەی سپای نازی دەرکێشایەوە.

گزنفۆن لە شوێنەواری خۆیا بە ناوی ئاناباسیس (لەشکرکێشی سەرنەکەوتوو)دا باسی هونەرنوێنی کوردان یا خەڵکێ دەکا کە بە "کاردووخوی" ناودێر کردوون و وەك شەڕکەرانی ترسێنەر کراسی مەنشووری و هەرمانی بە باڵای بڕیون. ئەم بەرهەمە ڕاپۆرتی کشانەوەی دەهەزار بەکرێگیراوی یۆنانییە لە ساڵی ٤٠١ی بەر لە زایین بەرەو دەریای ڕەش. ئەم دەستەیە لە خزمەت خوازەری تانج و تەختی ئێرانا بوون. گزنفۆن دەنووسێ: "یۆنانییەکان شەوێکی خۆشیان ڕابوارد. خواردن بە پێی فیلان بوو. باس باسی ئەو شەڕانە بوو کە دیبوویان و لێی خەلەستبوون, چونکە بە وڵاتی

---

١– سەرهەنگ سەمەند سیابەند کە کوڕی کوێکۆلێکی کورد بوو بە پاداشی ئەو ئازایەتییانەی بۆ پارێزگاری لە مەسکەو و شەڕی مینیسكدا کردی, بوو بە قارەمانی یەکێتی سۆڤیەت. یەکی تر لە کوردە بەناوبانگەکانی سپای سوور فەریق پۆلا بەگۆف بوو کە بە دەستی سپییەکان کوژرا.

كاردووخییاندا تێپەڕیبوون و بێ پسانەوە شەڕیان كردبوو, ئەو خەسار و مەرەدەی كاردووخوورییەكان بەسەریان هێنابوون زۆر لە هی شای ئێران و سەركردەكەی "تیسافرێنس" زیاتر بوو."

هێندێك دواتر مێژوونووسێكی یۆنانی تر بە ناوی "دیئۆدۆروس" گەیشتە ئاكامێك كە گەلێ كەس بە درێژایی مێژوو هەتا ئێرە ئۆباڵیان بۆ كێشاوە. ئەو دەنووسێ: "كوردان لە قەڵا سەختەكانیانەوە زۆر بەرهەڵستی سپا و ئیمپراتۆرییەكانی بێگانەیان دەكرد. دەبوو بە زۆرەملێ یا بە مۆر كردنی پەیمان لەگەڵیان بەری بەرهەڵستبوونەوەیانت لە دەشتەكانا گرتبا." بەڵام وەك "وێستومان" دەنووسێ: "لەبەر ئەوەی كوردەكان هۆگری تیرهاویشتن بەرەو ئامانجی بزۆك بوون — بە تایبەتی بەرەو ئادەمیزادان — هەمیشە [پێكهاتن لەگەڵیان] هاسان نەبوو. ئەمە هەرهەمان ئۆگری و مەیلەیە كە لە سەردەمی گزنفۆنەوە تا ئێستا ئەشتەكی وا كەم نەبۆتەوە." هەروەها دەنووسێ: "كوردان لە بەرامبەر دانی باج و سەربازگری حاكماندا بۆ مەبەستی نیزامیی سەربزێوییان دەكرد."

چارەنووسی كوردان زیاتر بەم سەركەوتنەوە گرێ درابوو كە لە ڕەتاندنی هێزە پەلاماردەرەكانەوە وە دەستیان دێنا. ئەم پەلامارانە بە ڕیز لە زەمانی "شەلمانسەر"ی سێهەم و "سارگێن"ی دووهەم, لە سەدەكانی هەشت و نۆی بەر لە زایینەوە دەستی پێكرد. ئەم دوانە هێزی سەركوتیان ناردە كوردستان. سەردەمایەكی كە وڵات هێور و بارودۆخەكە بەكاو بوو, كوردان لە هەموو شوێنێ بوون, یانی لە ڕۆخی مەدیتەرانەوە هەتا نیزیك كەنداوی فارس. لەم دەورانەدا كە كوردان جارناجار پێیان دەگوتن سەدەكانی ئیسلامی كوردی — یانی لە سەدەی دەهەم تا دوازدەهەمی زایینی — سنووری دەسەڵاتی سیاسییان, یا ئەوەی كوردان پارێزگارییان لێ دەكرد, ئاسیای ناوەندی هەتا هیلالی خەسیب و لیبی و یەمەنی دەگرتەوە و لە سۆنگەی دەستوبرد و لێزانینی شەڕ و كۆچاوكۆچی بەجێ, جەرگەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستیان لە بەرامبەر هێرشی پەلاماردەران, بە تایبەت خاچپەرەستانا, پاراست. ئەو دەورەی دەیانگێڕا وەك دەوری ئیسكاتلەندییەكانی ڕیزی سپای ئینگلیس دەچوو. كوردان لە بواری نژیارڤانی, ئەستێرەناسی, مێژوو, ڕیازیات, فەلسەفە و مووسیقیشا درەوشانەوە. بە ناوبانگترین

کوڕی کورد, سەلاحەددین, لە باژێری تکریت لە مەڵبەندی سەر لێواری دیجلە پێی نایە ژیان, کە زێدی سەددام حوسێنیشە. بنەماڵەی ناو بە دەرەوەی سەلاحەددین لە خزمەت ئەمیرانی غەیرە کوردا بوو. مێژوونووسان لەوەی کە هەر ڕێوڕێ سەلاحەددین خۆی بە کورد زانیبێ و نەزانیبێ دڕدۆنگن و لایان وایە قەت پێی نەناوەتە کوردستان. بە کرێگیراوی بۆ هەندەران پیشەی باب و باپیری بوو, هەر چەند تاقمێک لە مێژوونووسان لایان وایە کە ئەو زیاتر خۆی بە گیانبازی ئیسلامپارێز دەزانی تا کورد.

سەلاحەددین و باوك و مامی هەر لە بنەڕەتەوە خزمەتکاری حاکمانی ترکی سووریا بوون و زۆرێك لە پیاوەکانی سپای سەلاحەددین ترك بوون. خانەدانی حاکمانی ئەییووبی کە سەلاحەددین بە ناوی باوکییەوە کرد, کۆتایی بە دوو سەدە حکوومەتی شیعەکانی فاتمی لە میسر هێنا و خەلیفەی سوننی بەغدای گێڕایەوە سەر دەسەڵات. سەلاحەددین خاچپەرەستانی لەساڵی ١١٨٧, لە شەڕی "حوتتەین"دا بەزاند و ساڵێك دواتر "ئوورشەلیم" [قودس]ی لێ ئەستاندنەوە و ڕیچاردی شێردڵی تێكشکاند. سەلاحەددین لەبەر کردەوەی مرۆڤانەی کە لەگەڵ مەسیحییانی بەزیو و بەدخوازانی جوولەکەدا نواندی بە "میری جوامێران" ناوبانگی دەکرد ولە ١١٧٤ تا ١١٩٣حکوومەتی کرد و سنووری دەسەڵاتی ئەییووبیانی بەرین کردەوە. ئەم حکوومەتە هەتا کۆتایی سەدەی پازدەی زایینی هەروا بە شێوەیەك دەسەڵاتی خۆی پاراست. خانەدانەکانی تری کورد لە قەوقاز و کوردستانی باشووری و ناوەندیدا حکوومەتیان کرد.

لە سەرەتای سەدەی سێزدەوە تورکانی دەوارنشین وردە وردە پەلاماری ئاسیای ڕۆژاوایییان دا. هێرشکەرانی مەغوول وەها خەسارێکیان گەیاندە کشتوکاڵی کوردستان کە سەدەیەك دواتر کوردستان تەنیا دەیتوانی دەیەکی بەر لە پەلامار بێنێتە بەرهەم. کوڕی تەیمووری لەنگ لە ١٣٩٣دا دیاربەکر و ماردین و تەواوی ناوەندە کوردییەکانی کە ئێستا کەوتوونە خاکی تورکیا, تالان کرد. دوابەدوای ڕاپەڕینێکی کوردان, تەیمووری لەنگ بۆخۆی لە ١٤٠١دا شارەکانی هەولێر و مووسڵ و جزیرەی تالان کرد.

کەمتر لە سەدەیەك دواتر شەڕەکانی نێوان ئیمپراتۆرییەتی ئێران و عوسمانی, لە دوای شەڕی چاڵدران لە ١٥١٤دا, زۆربەی خاکی کوردستانی تاپۆ کرد. (لە شەڕی چاڵدراندا, عوسمانییەکان شای سەفەوی ئێرانیان لە نزیك گۆلی وان, لە ڕۆژهەلاتی تورکیا, بەزاند.) شەڕ و ماڵوێرانی بەربلاوی ئەم ڕووداوانە بۆ ماوەی سەدەیەك لە کوردستانا درێژەی کێشا. لە درێژەی ئەم ماوەیەدا عوسمانییەکان لە پەستا ئێرانییەکانیان زۆر زیاتر بەرەو ڕۆژهەلات ڕاماڵی, هەتا سەرەنجام لەسەر هێڵی سنوور پێکهاتن و بۆ ماوەی ٣٠٠ ساڵ ئەم پەیمانە پێخوست نەکرا. هەردوو ئیمپراتۆری هەر بە وەندە ڕانەوەستان کە کوردستانیان کردبووە شەرگەی خۆیان, بەڵکوو بۆ کورت کردنەوەی دەستی یەکتر لە وە دەسهێنانی هێزی چەکداری [کوردی], هەڵوێست و ڕێبازی "زەوی سووتاو"یان گرتە پێش و هاتنە سەر دەرکردن و دوورخستنەوەی کوردان.

کۆچ پێکردن لە زەمانی کۆنەوە یەکێك لە شێوە باوەکانی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست بووە. سەرکەوتووی چاڵدران سوڵتان سەلیمی خوێنمژ, هۆزە کوردەکانی بۆ ئاناتۆلی ناوەندی و باکووری, بەتایبەت بۆ ناوچەکانی خوارووی ئانکارا دوورخستەوە؛ زۆرێك لە تۆرەمەی ئەم دوورخراوانە ئێستاش هەروا لەم ناوچانە نیشتەجێن. درێژەی دوور خرانەوە هەتا بولغارستان پەلی هاویشت. بەلام ئەم کردارە لە چاو کردەوەی سەفەوییان نموودێکی وای نەبوو. سەفەوییەکان سەدان هەزار کورد — هەروەها ژمارەیەك ئازەری و ئەرمەنی و تورکمانیشیان — بە زۆرەملی ڕادایە جەرگەی ئیمپراتۆرییەتی خۆیانەوە. لە ساڵەکانی ١٥٣٤–١٥٣٥ کە چەکدارانی سەفەوی لە بەرامبەر هێزەکانی عوسمانیا ڕایاندەکرد, لە ڕووی لێکدانەوە و بە هەڵبژاردنی ڕێبازێکی دیاری کراو گەلێك شار و گوندی کوردستانیان خاپوور کرد, تەرمی کوژراوانیان ئاگر دا, کانی و کارێز و بیرەکانیان کوێر کردەوە و بەند و بنەوانەکانی ئاوداشتنیان تێكوەمەکان دا.

هێندێك دواتر هەر لەم سەدەیەدا, "شاعەبباس"ی یەکەم ئەم ڕێبازەی توند و تیژتر درێژە دا و ئەو کوردانەی کە لە زێدی خۆیان هەڵقەنرابوون, بەرەو ڕۆژهەلاتی ڕەتاندن؛ لە پێشا بۆ ئازەربایجان و پاشان لە بۆ خوراسان و لە بەرابەر تورکمانان کە

هێشتاش لە وێندەرێ ماون ڕایگرتن؛ یانی هەزار میلێك لە زێدی خۆیان ئەولاتر. بەم شێوەیە سەفەوییەکان هۆزە سەرکێشە کوردەکانیان لە سنووری ڕۆژاوای خۆیان هەڵکەند و سەیر ئەوەیە ئەوانیان کردە پارێزەری کەوشەنە ئاڵۆزەکانی تری وڵات. هۆزەکانی تری دوورتر خستەوە، واتە بۆ هیندووکوش لە ئەفغانستان و بلووچستانی ئێستا.

دەسەڵاتی دەوارنشینان بەسەر جەماوەری نیشتەجێی کوردا بوو بە هۆی ئاڵوگۆڕی زمان و زاراوەکانی کوردستان. زمانی کوردی سەر بە لکی ئاریایی زمانەکانی هیندوئورووپاییییە و زۆر لە زمانی فارسی نیزیکە. بە گوتەی کارناسان ئەم نیزیکایەتییە چەشنی وێکچوونی زمانی دانمارکی و ئاڵمانییە. کوردانی پێشوو بە زمانێك بە ناوی "پەهلەوانی" دەهاتنە ئاخاوتن، کە لە زنجیرە چیای زاگرۆس، واتە جەرگە و ناوەندەی کوردستانا کە ئێستا بەشێکە لە خاکی ئێران و ئێراق، باو بوو. بە درێژایی سەدان ساڵ، کۆچی بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات، ئەو شوێنەی ئێستا بە کوردستانی تورکیا ناودێر کراوە، هەرێمی دەسەڵاتی ئەو زمانەی بەرین کردەوە. بەڵام بە دەسپێکی لێكهەڵوەشانی کۆمەڵی نیشتەجێی کورد لەسەر سنوورەکانی ئێران و عوسمانی و ناوچەکانی ئەولاتر لە سەدەی شازدەدا، زمانی پەهلەوانی ڕۆژ بە ڕۆژ پتر لە بەرەو کەوت و کوردی کرمانجی جێی گرتەوە، یانی ئەم زمانە [زاراوە]ی کوردانی دەوارنشینی چیاکانی هەکاری لای ڕۆژاوای گۆلی ورمێ پێیدەدوان.کرمانجی و پەهلەوانی هەرتکیان دوو زاراوەی هەراوی تایبەت بە خۆیان هەیە. زمانی پەهلەوانی ئێستا لە دوو جەمسەری بەرەوڕوودا برەویان هەیە. نزیك بە میلیۆن و نیوێك کورد بە ڕاوێژێکی کە پێیدەگوترێ گۆرانی و بە گشتی دەکەوێتە باشووری کوردستانی ئێران، داخێون. زاراوەیەکی تری "زازا"یە لە کوردستانی تورکیا و بە گشتی لە تونجلی و بینگول و سیوەرەك و دەوروبەری ئەوێندەری قسەی پێدەکەن. جگە لەوەش لە ناوچەکانی لای مەلاتیە و ئادیامان و "مەرعەش"یش پێیدەدوێن. عەلەوییەکانی تورك و کورد و تەنانەت هێندێك لە کوردانی سونني مەزەبیش قسەی پێدەکەن. عەلەوییەکان فیرقەیەکی مەزەبین کە خاوەنی ماکەی ئیسلامی و پێشتریشن. زمانی گۆرانی لە لایەنی مێژووییەوە زمانی ئەدەب و کۆمەڵی ئاکارپاکی تەواوی کوردستان بووە.

كرمانجیش بۆته دوو لكی باكووری و باشووری. لكی باشووری بە سۆرانی ناسراوە و زۆربەی كوردانی ئێران و ئێراق قسەی پێدەكەن. لكی باكووری, یانی بادینانی راوێژی كوردەكانی لای سەرووی ئێراق و ئێران و زۆربەی كوردانی كوردستانی توركیایە. وای دادەنێن كە سێ چوارەمی كوردان ئێستا بەم زاراوەیە دەئاخێون. ئەم خەڵكەی بە كرمانجی و پاڵەوانی دەدوێن بە لای زۆرەوە لە نیوەی قسەی یەكتر حاڵی دەبن. كارناسان خزمایەتی ئەم دوو زمانە [دووزاراوەیە] بە پەیوەندی و نزیكایەتی زمانەكانی فەرانسەوی و ئیتالیایی دەشوبهێنن.

تەنیا بەشێك لە نووسراوەكانی بەر لە سەدەی حەوتەم لە خەسارۆمەنی و ئالۆزبلۆزی دەور و زەمان پارێزراون. كرمانجی لە سەدەی شازدە و حەڤدەدا وەها جێی خۆی كردبۆوە كە بۆ رۆنانی سێ حیماسەی نوێی كوردی هاتە كایەوە. شەرەفنامە, نووسراوی "ئەمیر شەرەفەددین بتلیسی" بە یەكەم مێژووی سەرانسەری كوردستان دەزانن. خاوەنی ئەم كتێبە گلەیی لە "تووك"ێ دەكا كە پێغەمبەری ئیسلام بۆ یەكانگیر نەبوونی هەتاهەتایی دەرهەق كوردان كردوویەتی لە ترسی ئەوەی نەكا بوێری و ئازایەتییان خەڵكی جیهان بخاتە ژێر ركێفیان. قورسایی و نرخی ئەم یەك نەبوونە لە شوێنەواری "ئەحمەدی خانی" بە ناوی "مەم و زین"دا خۆی دەردەخا و مەبەستی سەرەكی چیرۆكەكەیە. "مەم و زین" شێوەیەك "رۆمیو و ژولیت"ی كوردییە كە باسی ئاوات و ئامانجی خەڵكی كورد دەكا. "دم دم" حیماسەی خۆراگری "ماسادا"یانەی حەسەنخان [ئەمیرخان]ی لەپ زێرین لە بەرامبەر شاعەبباسدا بە هۆنراوە دەگێڕێتەوە. حەسەنخان [ئەمیرخان] لە سەرۆكانی عەشیرەتی برادۆست بووە كە ئێستا نیشتەجێی باكووری ئێراقن.

لەم سەدەدا سۆرانی لەبەر نەبوونی زاراوەیەكی بەربڵاوی تر بۆتە زمانی گێڕانەوە و ئامرازی راوێژی فەرهەنگیی خەڵكی كورد. كەترەخەمی ئێراق لە هەر بارێكەوە هەر چەندیش بێ دیسانیش ئاشكرایە كە ئەم وڵاتە لە سەردەمی سەرپەرستێتی بریتانیا و دەورانی دەسەڵاتی عەرەبانیشدا هەر چۆنێك بێ – با دڵنیگەرانیش بووبێ – هێندێكی ئازادی رۆشنبیری داوە بە كوردان.

ئەگەرچی بەغدا بە وردی بلاوکراوە کوردییەکانی قەڵتوبڕ دەکرد, دیسانیش زمانی کوردی لە رۆژنامە و گۆڤار و کتێب و رادیۆ و تلەفیزیۆندا دەسەڵماند. هەروەها لە پەروەردەدا, لە سەرەتایی‌را بگرە هەتا زانکۆ. لە ئاکاما پتر لەسەتا هەشتای کتێبە بلاوکراوەکانی ئەم سەدەیە بە زمان [زاراوە]ی سۆرانین. ئەم رووداوە لە هیچ کام لە ولاتانی رۆژهەلاتی نێوەراستا پێشینەی نیە. بۆ وێنە لە تورکیادا هەتا ساڵی ١٩٩١ کە سەرکۆمار تورگوت ئۆزەل قانوونی گۆڕی, نیزیکەی حەفتا ساڵ کە لە دامەزرانی کۆماری ترك تێدەپەڕی بلاڤۆکی کوردی تەنیا ئەوانە بوون کە لە ئورووپا چاپ دەکران و بە یاساغی سنووریان دەپەڕاند و دەهاتنە ولاتەوە.

لەم پەیوەندییەدا زیاترین گوناه دەگەڕێتەوە سەر ئەستۆی ولاتانی ئورووپایی. لە ژووئیەی ١٩٢٣دا ئاتاترك بۆ راکێشانی سرنجی ولاتانی رۆژاوایی و کۆتایی هێنان بە داگیرکرانی ئیستامبووڵ لە بەندی ٣٨ی پەیمانی لۆزاندا بەڵێنی دا کە "هیچ چەشنە بەرگیرەوە و جەغزێك بۆ کەلك وەرگرتن لە زمانە خۆماڵییەکانی تورکیا, چ لە وتوویژی تایبەتی, بازەرگانی, مەزەبی یا بلاڤۆك و بلاوکراوە و هەروەها کۆبوونەوە گشتییەکانا، دانانلرێ." بەلام شەڕ توانستی هێزە رۆژاواییەکانی بریبوو و بەتایبەت بریتانیا پێی‌خۆش نەبوو پووڵ و پیشتیوانییەکی دیپلۆماتیکی زیاتر بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ ئاتاترك کە ساڵی پێشوو یۆنانییەکانی هاوپەیمانی تێك‌شکاندبوو, بدا و بکا. هەروەها لەندەن پێی‌خۆش بوو هاریکاری ئاتاترکی بە دژی یەکێتی سۆڤیەت لە پشت بێ و تەمای وابوو کە لەسەر دیاری کردنی سنووری تورکیا لەگەڵ ئێراقی ژێربالی کە دەبوو هەرێمە نەوتییەکانی بپارێزێ, نەوی بکێشێ و پێك بێ. ئاتاترك کە بە دروستی لە بێ‌مەیلی رۆژاوا بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ خۆی حاڵی ببوو, هەر ئەو ساڵە, لە مانگی ئۆکتۆبردا دامەزرانی کۆماری راگەیاند و پاش چەند مانگێك خەلافەتی تێکەوەپێچا و تەواوی فێرگە و رێکخراو و بلاڤۆکە کوردییەکانی وێڕای تەریقەتە بەهێزەکانی سۆفیایەتی و دەروێشایەتی و ناوەندە دینییەکانی کۆ کردەوە و دەرگای لە روو داخستن ... بەڵێ ئەوەش مافی رۆشنبیری کووردانی تورکیا!

لە سووریادا, لە سەردەمی سەرپەرستێتی فەرانسەوییەکانا, بلاوکراوە کوردییەکان برەویان پێ‌دەدرا, بەلام وێڕای وەرگرتنی سەربەخۆیی سووریا لە ١٩٤٦دا ئەم

بلاڤۆکانەش بەربەست کران. فەرمانڕەوایانی ئێران لە "ڕەزاشـا"وە – لـە مابـەینی دوو شەڕا – بگرە هەتا ڕێبەرانی مەلای کۆماری ئیسلامی زمانی کوردییـان لـە پـەروەردە و بلاوکراواندا یاساغ کرد,[1] هەڵبەت بێجگە لە دوو هەڵکەوتی بەرچاو و کەم تەمـەن: یەکەم سەردەمی کۆماری مەهاباد لە ١٩٤٦ و چوار ساڵی سەرەتای شۆڕشی ئایەتوڵڵا ڕووحوڵڵا خومەینی لە ١٩٧٩دا. لە یەکێتی سۆڤیەتا, لە کۆمارەکـانی ئەرمەنـستان و ئازەربایـجانا کە جەماورێکی زیاتری کوردییان لـێبوو, فێر کردنی زمانی کـوردی لــە قوتابـخانەکاندا ئـازاد بـوو, بـەڵام ئـەم کردەیـە ئـەم کۆمەڵـە بـچووکە کوردانـەی نەدەگرتـەوە کـە سـەردەمی شـەڕی دووهـەمی جیهـانی بـە فـەرمانی ئیـستالین بـە سەرکۆمارەکانی تری ئاسیای ناوەندیا دابەش کرابوون.

ئەگەر بۆ هەڵبژاردنی زمانێکی یەکگرتوو یا ئیستاندارد, بە مەبەستی فێرکاری, ئـەم جیاوازییانە کەندوکۆسپێکی تەواو نـەبن، دیـسانیش کێـشەی چـەن چەشـنی ڕێنـووس کوردانی لێكترازاندووە. گۆرانی لە ئێرانا ڕێنووسی فارسی دەکار دەکـا, سـۆرانی لــە ئێران و ئێراقا لــە ڕێنووسـی چـاك کـراوی فارسـی و عـەرەبی کـەلك وەردەگـرێ و بادینانیش لە ئێراق هەروەتر. بەڵام کوردەکانی پەڕەوازەی تورکیا بـەم ڕێنووسـە لاتینـە دەنووسن کە ئەمیر کـامران بـەدرخان سـەردەمی سەرپەرسـتێتی فەرانـسە لـە سـووریا دایهێنا. ئەو کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤارانەی کە قاچـاغ دەچـنە تورکیـا, بـەم ڕێنووسـە نووسراون. کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بە ڕێنووسی سیریلیك دەنووسن.[2]

تـەواوی ئـەم هۆکارانـە, وێـڕای تـاق کەوتنـەوە و دابڕانـی مەڵبەنـدە سـەخت و شاخاوییەکان تەواو بۆتە هۆی نیگەرانی ئەم نەتەوەخوازانەی لەسەر ئەم بڕوایەن کە بـە وەگەڕ خستنی ئەلف‌وبێ و ڕێنووسێکی یەکگرتوو کە تێگەیشتنی بـۆ هـەموو کـوردان بلوێ, هەڤگرتن باشتر دابین دەکـرێ. ئـەم خەڵکـە بـە دەرد و پـەژارەوە دەبیـنن کـە سەرەڕای ئەوەی عەرەبی هـەموو وڵاتـان لــە زمـانی یـەکتر حـاڵی نـابن, زۆر لـەمێـژە زمانێکی ئیستانداردی عەرەبییان بەسەر هەموانا سـەپاندووە. بێ‌گومـان کـێش و ڕێـزی

١– لە کۆماری ئیسلامیدا زمانی کوردی لە بلاوکراوە و بلاڤۆکاندا ئازادە. "یۆنسی"

٢– "ئەلف‌وبێ"ی ڕووسی, داهێنانی سەن سیریل (سەدەی نۆیەمی زایینی). "یۆنسی"

زمانی قورئان پشتیوانی ئەم کارە بوو. لە کەو دان و هەڵپەرتاوتنی زمان لە لایەن ئاتاترکەوە لە دەیەی ١٩٢٠ و ١٩٣٠دا ئەلفوبێی ترکی وە لاتین گێڕا و گەلێکی وشەی عەرەبی و فارسی لێ‌دەرهاویشت. ئەدەبیاتی کۆنی ئێران هێشتاش وەك هۆکارێکی بەهێز بۆ یەکێتی لە وڵاتا دەور دەگێڕێ.

تەنانەت لە بواری مەزەبیش‌دا کوردان پێکەوە ناکۆکن. هەروا نیزیکەی لە سەتا حەفتا و پێنجی ئەم خەڵکە سوننی مەسەبن و بە کرمانجی دەئاخێون, بەڵام کەمایەتییەکی یەك هەتا یەك و نیومیلیۆنیش هەن, ئەوانە لە کلکەی باشووری کوردستانی ئێران, لای هەمەدان و کرمەشان و ناوچەی کوردنشینی ڕۆژاوای ئێران, یانی خوراسان نیشتەجێن. سروشتی سەختی کوردستان چەشنی چیای لوبنان لە کۆنەوە پەناگای ئەم کەمینە دینییانە بووە کە پەیڕەوانیان لە ترسی ئازار و ئەشکەنجەی حاکمانی دینە دەسەڵاتدارەکان وایان بە باش زانیوە کە مەزەبی خۆیان ئاشکرا نەکەن. لە ژێر ئاسمانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا ئەشتەکی زۆر نوێی لێ نیە: بەم کردارە دەڵێن "تەقیە", بەم مانایە کە فیرقەی وەك "دەرووز"ی و "عەلەوی"یەکان کە لە لایەن دوو مەزەبی خاوەن دەسەڵاتی سوننی و شیعەوە بە دانانی ڕێ‌وشوێنی چەواشە تاوانبار کراون, بە ڕواڵەت پەیرەوی لە مەزەبی دەسەڵاتداری شوێنی ژیانیان دەکەن و بە دزی بە مەزەبی خۆیانەوە خەریك دەبن. خەڵك کە خوویان بە ئاڵوگۆڕی لەنەکاوی دەسەڵاتی سیاسی گرتووە, فێر بوون کە لە وەختی خۆی‌دا ئایین بگۆڕن یا بە دۆزینەوەی ڕێ‌چارەیەك بکەونە بەربەرەکانی و ڕەنگی باوی ڕۆژ و شوێن لە خۆ بگرن. بە درێژایی سەدەکانی ڕابردوو جەماوەرێکی بەرچاوی کورد بوونە جوولەکە و مەسیحی و مسوڵمان. (زۆربەی جووەکانی کوردستان کە لە ئێراق دەژیان ماوەیەك پاش دامەزرانی دەوڵەتی ئیسرائیل لە ١٩٤٨دا, کۆچیان کرد و ئەو چەندسەت کەسەی مابووشنەوە لە نێوەڕاستی دەیەی ٩٠دا وڵاتیان بەجێ هێشت. مەسیحییەکانیش ڕۆژ بە ڕۆژ پتر ڕوو دەکەنە ئورووپای ڕۆژاوایی.)

هەروەها جەماوەرێکی گەورەی کوردی غەیرەمسوڵمان بریتین لە پەیڕەوانی دینێکی زۆر کۆن کە بە گشتی بە ئایینی پەرستنی "فرشتەکان" ناسراوە. ئەم ئایینە کە بروای بە "ڕزگاری" دنیایی‌یە و گەلێ لە ئیسلام کۆنترە, هێشتاش لە نێو سێ فیرقەی تەواو دیار

و لێك جیاوازی یەزیدی [ئیزەدی]، ئەهلیحەق و عەلەویدا لە كوردستان هەرماوە. هەڵبەت جگە لە بڕوا بە "ڕزگاری" دنیایی لایەنی هاوبەشی تریان نیە. ژمارەی پەیڕەوانی ئەم ئایینانە ڕوو لە كەمین, هێندێك لە كارناسانی ئەم بوارە ڕێژەی نفووسیان بە چوار یەك – یا تەنانەت سێ یەك – ی تەواوی جەماوەری كوردستان دادەنێن, هەر چەند ڕەنگە ئەم حیساباتەش وەك تەواوی ئەو شتانەی سەبارەت بە كوردستانن, پێهەڵاچوونی تێدا بێ. ئەم سێ ئایینە وێكڕا لەسەر یەك بڕوای بنەڕەتی هاوبەشن و جارجار لە كتێبە پیرۆزەكانیاندا نووسراوە, ئەگینا مەبەستەكانی تر پشتاوپشت و زارەوزار گەڕاون و بڕیتین لە: درەوشانەوەی حەوت شێوەی پەیتاپەیتای پەروەردگارەكە كائینات لە بەرامبەر هێزەكانی حەوتەوانەی ئاوێزان و زۆر تاریك و سیای ماددەدا دەپارێزێ.

جیهانی پەروەراندن بە گوێرەی ئافراندنی "مرواری" یا "تۆوی جیهان" باسی لێوەدەكرێ كە سەردەمانێك ڕووح یا جەوهەری پاك كردەی تێدا بووە. بۆ وێنە "مەسحەف", كتێبی ئایینی یەزیدییەكان تیا نووسراوە: "لە پێشا خواوەند مروارییەكی سپی لە ڕوونترین جەوهەری هەبوونی خۆی پەروەراند. پاشان مەلێكی بە ناوی "ئەنفار" ئافراند, پاشان مروارییەكی خستە سەر پشتی مەلەكە و "خۆی" چل هەزار ساڵ تیا مایەوە." ئەم ئایینە بڕوای بە تەناسوخی ڕووح هەیە لە ڕێی خۆ نواندنەوەی پەیتاپەیتای لەسەر شێوەی زاتی پەروەردگار كە لە پێكهێنەری بوونەوەری گەورە و بچووكە. پەیڕەوانی ئەم ئایینە لەسەر ئەم باوەڕەن كە پێكهاتنی جیهانی ماددیدا خێر و شەڕ بە قەد یەك گرینگن.

تەواوی ئەم ئایینانە لەپەستا كەوتوونە بەر شاڵاوی ئازار و ئەشكەنجەی ڕێبەرانی سوننی و جاری واشە شیعە و زۆربەی ئەم ئازار و ئەشكەنجانە هەر بە دەستی هاوڕەگەزە كوردەكانیان ئەنجام دراوە. ئازاردەران, پەیڕەوانی ئەم ئایینانەیان بە داهێنانی دابی دزێو لە دنیا هەتا دەگاتە ژن گۆڕینەوە لە جێژن و لە پەنادا تاوانبار كردووە. ئەم ئایینە بە سانی ڕاهێنان و ڕێبەرانی دینەكانی تر قبووڵ دەكا و بەتایبەت ڕێز بۆ مەزنی دینەكانی یەهوود, مەسیحایەتی, ئیسلام و زەردەشتی دادەنێ. هەروەها بۆ گەورەكانی بەر لە ئیسلام و وەرگیراو لە ئایینی "شەمەنی"یش كە هێرشكاران لەگەڵ

خۆیان لە ئاسیای باکوورییەوە هێناویانە حورمەت دادەنێن. ئەم "ڕێککەوتن و پێکهاتنە" زۆر جار هەروا سادە و ساکار نەبووە, بەڵکوو لە ڕاستیدا قانێك بووە کە بە مەبەستی فریودانی دژدینان و پاراستن و ڕاگرتنی هەڵومەرجی خۆیان و شوێن تێکردنیان, داویانە.

بۆ وێنە عەلەوییەکان کە لە سەدەکانی پازدە هەتا حەڤدەوە زیاترین دەسەڵات و پێشکەوتیان هەبوو, زۆر توند شوێنیان لەسەر مەزهەبی شیعە دانا و بە بڕوای هێندێك لە مێژوونووسان تەنانەت ئەم مەزهەبەیان تەواو لە خۆیانا توانەدەوە. تەنانەت یەزیدییەکان کە ئێستا بچووکترین ئایینی ئەم شێوەن لە سەردەمی سەلاحەددیندا خاوەن جەماوەرێکی تێر و تەسەل بوون و هەرێمی دەسەڵاتیان هەتا ئەو کێوانەی کە دەڕواننە ئەنتاکیە و مەدیتەرانە پەلی هاویشتبوو. لە سەدەی سێزدەدا هێز و دەسەڵاتیان هێندە بوو کە زۆر ناوچەی پان و بەرینیان لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست – چ هەرێمی مەسیحینشین و چ مسوڵماننشین – لە مەدیتەرانەوە هەتا تورکیای ناوەندی و کەرکووك و گۆلی ورمێیان وەسەر دینی خۆیان گێڕا. بە پێی گوتەی "شەرەفنامە" لە بنەبانی سەدەی پازدەدا لە سی عەشیرەتی کورد, حەوتیان سەروبەر یەزیدی بوون.

عوسمانییەکان لە پلەی فەرمانڕەوایانی دینی و دنیایی جیهانی سوننی مەزهەبا, ئەم ئایینانەیان جارێك لەبەر پاراستنی وڵات و ڕایەك بە خاتری چەواشەکاری لە دینا ئازار و ئەشکەنجە دەدا. بەر لە هەموان عەلەوییەکان کەوتنە بەر گەڕ و گەف؛ ئەویش ئەو زەمانەی کە سوڵتان سەلیمی خوێنڕێژ دوای شەڕی چاڵدران ئەو بەشە خاکەی ئێرانی کە لە ڕۆژهەڵاتی ئاناتۆلی هەڵکەوتبوو, خستە سەر عوسمانی. سوڵتان سەلیم چلهەزار عەلەوی بە تاوانی نەسەلماوی "ئێراندۆستی" کوشت. چوارسەد ساڵ دواتر کۆماری لادینی کەمال ئاتاترك لە ساڵی ١٩٣٧ تا ١٩٣٨ هەر ئەم شێوەیەی بۆ سەرکوتی "بەرگێڕەوانە" و دوور خستنەوەی عەلەوییەکان درێژە پێدا و بەمجۆرە ڕقی وەچەکانی داهاتووی عەلەوییانی قووڵتر کردەوە. چاکی مەزهەبی عەلەوی لەمە دایە ئەوەندەی پەیڕەوی کوردی هەیە بەم ڕایەدەیەش پەیڕەوی ترکی هەیە؛ ئەگەر ترك پتر نەبن. ئەم خەڵکە پتر لە دەورووپشتی تونجلی و مەلاتیە (لە ئاناتۆلی ناوەندی)

نیشتەجێن. هێندێك لە خاوەنڕایان لایان وایە ڕێژەی نفووسی عەلەوییەکان دەگاتە لە سەتا بیستی سەرجەم جەماوەری کوردستان.

یەزیدییەکان کە پتر لە هەموان کەوتوونە بەر گەف و گەڕ و بە هەڵە پێیان دەڵێن "شەیتانپەرست", پەیڕەوی دینێکی تێکەڵاون کە ماکەی دینی زەردەشتی و دووخودایی ئێرانی و هەروەها یەهوودایەتی و مەسیحایەتی و ئایینی ئیسلامی پێوە دیارە. ئەم خەڵکە لە کەندوقوولّی لێكدابڕاوا, بەتایبەت لە باشووری تورکیا و نیزیك سنووری سووریا و ئێراق, لە ناوچەکانی جزیرە و عەفرین لە باکووری سووریا, لە باکووری ڕۆژاوای ئێراق, یانی لە دەوروپشتی چیای ژەنگار و باکووری مووسڵ نیشتەجێن. بە پێی ئەو بەڵگانەی بە دەستەوەن, دەوڵەتی عوسمانی بۆ مسوڵمان کردنی ئەم خەڵکە لە مابەینی سەدەی حەڤدە هەتا بیست, نیزیك بیست جار پەلاماری داون و لەشکری کردوونە سەر و ئەم پەلامارانە هەمیشە قەتڵ و تالان و بڕۆ و دەسدرێژی و داگیرکردنی ژن و کیژانی بە دواوە بووە. ئاخرییەکەی ئەم هێرشانە زۆربەی ئەم خەڵکەیان بەرەو باکوور و قەفقاز ڕادا. لەم سەدەیەدا زۆرێك لەوان بەرەو ئورووپا بەتایبەت ئاڵمان کۆچیان کرد. ئەم خەڵکە بە پێی بڕوای ئایینی خۆیان پۆشینی جلی شین و وتنی وشەی "شین" لە ترسی ئەوەی نەکا شەیتان بێنێتەوە یاد و هەروەها خواردنی کاهوو بە حەرام دەزانن. لە ئێراقا کە ٦٠/٠٠٠ کەسێك دەبن بە پێی ڕێژەی جەماوەری خۆیان کەوتوونە بەر پەلاماری حکوومەتی سەددام حوسێن.[1] ئەهلیحەق کە زیاتر بە ئەهلی باتن (باتنییە)ش مەنشوورن لەسەر سنوورەکانی ئێران و ئێراق نیشتەجێن.

بێتوو جوان ورد بینەوە دەبینین کە ئەم بیچم و چۆنیەتییە تایبەتییانە بە گشتیی تایبەمەندیی زۆربەی جەماوەرانی سەر چیان و لەگەڵ کوردان بە ڕواڵەت خۆیان ڕێك دەخەن: لە شوێنێك دنەی ڕووحی نەتەوەیی و نەتەوەخوازی دەدەن و لە جێیەکی تر دەبنە یاریدەدەری کاری چاوەدێری و سەقامگیر بوونی دەسەڵاتی حکوومەت.

---

١– چونکە ئامادە نەبوون حاشا لە کوردێتی خۆیان بکەن و بڵێن عەرەبن و بە ڕەگەز دەچنەوە سەر یەزیدی کوڕی موعاویە.

ڕقەبەرایەتی و گێرە و کێشەی عەشیرەتی گەلێ جار جوولانەوە نەتەوەخوازییەکانی کوردی پشووبڕ کردووە و کاری دەوڵەتانی پەلاماردەریان هاسان کردۆتەوە. شەڕ و کێشە و دوژمنایەتی کوردان پێکەوە تەنیا وێنەی ڕۆژهەلاتیی دوو بنەماڵەی "هەت فیلد" و "مەك کۆی" نیە کە بە ڕق و دوژمنایەتی تاقمێك خەڵکی هەژاری گوندەکی مانا بکرێتەوە.

دوژمنایەتی کۆنەباوی عەشیرەتی هێندە توند بوو کە تەمای هۆزێك بۆ هاتنە نێو ریزی جوولانەوەی نەتەوەخوازی زۆرجار دەبوو بە هۆی ئەوەی هۆزێکی تر خۆی وەکێشێ یان تەنانەت پووڵ و چەكوچۆڵ لە حکوومەت وەربگرێ و شانبەشانی دەوڵەت دژایەتی شۆڕش بکا و تفەنگی پێوەبنێ. تەنانەت تایفەی نێو عەشیرەتێکی هەڤگریش دەگژ یەك ڕاچوون. مەلامستەفا بارزانی کە لەم سەدەیەدا تەنانەت توانی هەستی نەتەوایەتی خەڵك لەوبەری سنوورەکانی ئێراقیش بزوێنێ, گەلێ جار لەگەڵ تاقمێك لە هێزەکانی عەشیرەتیی دەوڵەتخوا شەڕی بوو کە ڕادەیان هاوتای شەرکەرانی ئەو بوون.

خەیانەت لە مێژووی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستا پێشینەیەکی زۆر دوور و درێژی هەیە. لە حیماسەی بابلی بە ناوی "گیلگەمیش"دا کە چوارهەزار ساڵی بەسەرا تێدەپەڕێ, "ئەنکیدۆ" کە پیاوێکی ساکاری ناوچەی زاگرۆسە, دەکەوێتە داوی ئەوینی کیژێکی چاومەستی عیبادەتگای ئەوینی پێدەشتان و بەم شێوەیە خەیانەت بە بوونەوەرانی کێوی دەکا کە بوونە دۆست و ئاواڵی. چیرۆکێکی لەم چەشنە بەسەرهاتی "فەرهاد"ی پەیکەرتاشی کورد دەگێڕێتەوە کە ئەوینداری "شیرین" هاوسەری خوسرەوی دووهەم, پاشای ئێران لە سەدەی حەوتەمی بەر لە زایین دەبێ. شیرین لێیدەخوازێ و دنەی دەدا چیای زێدی خۆی برووخێنی, بەڵام هەر وەك خووخدەی خەڵکی دەشتەکییە سەرەنجام خەیانەتی پێدەکا.[1] فەرهاد لە حەیبەتی نائومێدی خۆی لەم کێوەڕا هەڵدەدێرێ.

---

۱– ئەوە لەگەڵ "شیرین و فەرهاد"ی کوردی یەکتر ناگرنەوە. "وەرگێڕ"

بەڵام مێژووی كورد تەژیشە لە غەدر و خەیانەتی كورد بە كورد. "قارەمانی" حیكایەتی ئەم خەیانەتانە جاری وایە سەرۆك عەشیرەتی نەخوێندەوار بوون كە دەكەوتنە بەرەورووی خوێندەواران و پەروەردەكراوانی شار. هەروەها ناكەس‌بەچە و نەفامان لە هەردوو تاقمدا كە ئامادە بوون لە بۆ پاراستنی قازانج و ئامانجی تیژتێپەڕ بە سازی حكوومەتان بكەونە چەقڵەسەما. لەم سەدەدا سەرۆك عەشیرەتانی چیانشین كە توانستی كۆ كردنەوە و ڕێكخستن و سەركردایەتی هێزی خاوەن تەكووزیان هەبوو بە شوێن ویست و مەیلی خۆیانەوە كەوتنە تالان و برۆ و ئامانجی بەرچاوتەنگانەی خۆجێیی و بەرەورووی كەسانی وریا و هەڵكەوتەی شارەكی، كە پشتیوانییان لە ئاوات و ئامانجی نەتەوەپەروەرانە دەكرد بەڵام هێزی بەكاو گەیاندیان نەبوو، ڕاوەستان.

ئەم گێرە و كێشە و تێكهەڵچوونانە ڕەنگدەرەوەی ئەو بارگرژییانەن كە هەر لە كۆنەوە لە نێوان چیانشینانی شەڕكەر و خەڵكی نیشتەجێ و ژیارمەندی دەشتەكیدا هەبووە. بە دەسپێكی ئەم سەدە سامناكە (لە بۆ كوردان) ئەم هەڵتەزینەوە و ناتەبایی‌یانەی كوردانی لە بەرامبەر دەوڵەت و بەتایبەت بەرەورووی یەكدا ڕاست دەكردەوە زۆری تەنییەوە. دابڕان، نەزانی، پیلان و لێك تیژ كردنی حكوومەتان و سەركوتی چاوەڕوان نەكراو، نابەختەوەری، دڕدۆنگی و خەیانەتی بە ئاشكرا ... بەڵێ، هەموو وێكڕا خۆیان نواند. كۆچ پێدان و دوورخستنەوەی سیاسی هاتە ئاراوە و گەشە نەكردوویی و دواكەوتوویی ... وێكڕا یەكگرتوویی نەریتی كۆنیان لاواز كرد. كاتێك كوردان لەگەڵ پەروەردە و ژیاری ئاشنا بوون عەشیرەگەری كەوتە سەرەولێژی فەوتان، هەتا پاشان لە دەیەكانی ١٩٨٠ و ١٩٩٠دا دەوڵەتانی توركیا و ئێراق بە كەلك وەرگرتن لە دەربەگانی ڕووەو نەمان و بێ‌پشتیوان بۆ چەكدار كردنی چریكی كورد بە دژی نەتەوەخوازان، عەشیرەگەرییان بە شێوەیەكی دەسكرد زیندوو كردەوە.

مۆجزەی ساڵی ١٩٩١، ئەو كاتەی وا عەشیرەتانی كۆنە دەوڵەتخوای كورد، چەشنی سوورچی و برادۆستی كە بەختی خۆیان لە بەختی برایانی نەتەوەخواز گرێ دا، ڕووداوێكی ناوازەی لەسەر ڕێسابوو. لە ڕابردوودا هێندێك مەكۆی خوێندكاری كردبوویانە باو كە بارزانی و "حیزبی دێموكرات"ەكەیان بە ناوی خەڵكێكی شەڕخواز و دەرەبەگ و حیزبێكی تەواو گوندەكی بێننە ناسین و جەلال تاڵەبانی و یەكێتی

نیشتمانی ئەویان بــە خــاوەن خوووخــدەی شارســتانییانە و پێــشکەوتوو و هێمنیخــواز دەناساند و تاریفیان دەکرد. چالاکی بەربلاوی سەددام حوسێن لەسەر ڕێبازی تێکدانی پێکهاتەی جەماوەری کۆن وەها لــە زەبــر بــووە کــە زۆربــەی جیاوازییــەکانی لاواز و بێبایخ کردووە. ئەم دوو تاقمە نەتەوەخوازە — واتــە پــارتی دێمــوکراتی کوردســتان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان — کە گەورەترین ڕێکخراوە نەتەوەخوازەکانی ئێراقن, لــە مەودای شەڕی ١٩٩١دا یەکتریان یاریدە دا و لە بەهاری پاشی بە کەڵك وەرگرتن لە چەتری ئاســمانیی هاوپەیــمانان هەڵبژاردنێکی بەڕاستی ئازادیان — گەرچی لە هێنــدێك بارەوە نوقسانی هەبوو — بەڕێوە برد. چون ئاکامی هەڵبژاردن زۆر لێــك نیزیــك بــوو, یەکێتی و پارتی لێبڕان دەسەلات بە نیوەونیوە لە نێو خۆیانا دابەش کەن. لــە ژووئیــەی ١٩٩٢دا پارلەمان و دەوڵەتی هەرێم لــە ناوچــەی خودموختــاری پێــشوودا دامــەزرا. "ولاتی پەنامەکی" ئێستا وەك ڕاستەقینەیەکی ژیان خۆی دەنواند, ئەگەرچی کوردان بــۆ خۆ پاراستن لــە ڕەخنــەی غــەواران ســەبارەت بەمــەی کــە دەوڵــەتێکی ســەربەخۆیان پێکهێناوە, هەروا ئالای ئێراقیان هەڵدەدا و هێزەکانی پۆلیسیان جلــی ڕەســـمی ولاتــی ئێراقیان دەپۆشی.

بەلام لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٤دا, ئەوە نەك عەشیرەتان, بەڵکوو پێــشمەرگەکانی دوو ڕێکخراوی نەتەوەخواز, یانی پــارتی دێمــوکرات و یــەکێتی نیــشتمانی کوردســتان بوون کە تێکهەڵچوونەوە و ئــەم ڕووداوە ئاکــامی گەلــێ پــەژارەهێنی لــێکەوتەوە. کەموزۆر هەموو دەیانزانی کە سێ هۆکاری جوغرافیایی و زمانی و کۆمەلایــەتی بوونــە هۆی هەڵگیرسانەوەی شەڕ و لێك تەوەلا بوون. یەکێتی نیشتمانی شارەکانی هــەولێر و سلێمانی لە ناوچەکانی سۆرانی لەهجــەی ڕۆژهــەلاتی زێــی گــەورەدا خــستبووە ژێــر دەسەلات, کەچی پارتی دێموکراتی کوردستان لــە مەڵبەنــدەکانی ســنووری تورکیــا و ئێراق لە ناوچــەکانی کرمانــجی لەهجــەی بــاکوور و ڕۆژاوای زێدا, کــە زۆربــەیان گوندەکی بوون, خاوەن دەسەلات بوو.

هەڵوێــستی "هاوپەیــمانان" یاریــدەی تەنینــەوەی ئــەم گرژییــەی دا. بەرپرســانی "دەوڵەتی هەرێم" ئەو داهاتەیان نەبوو کە بتوانن دەزگای ئیداری خۆیانی پێدابین بکەن و مووچــەی کارمەنــدان بــدەن. زیــادە لــەوەش گــەمارۆی ڕێکخــراوی نەتــەوە

یەکگرتووەکان لەسەر ئێراق و گەمارۆی ئابووری سەددام حوسێنیش لەسەر باکووری ئێراق, ئەوەندەی دیکەی بارەکە ناخۆش کردبوو. هەروەها دەکرێ ترسی ڕۆژاواش بۆ یارمەتیدانی ناوچەی خودموختاری بخرێتە سەر. ئەگەرچی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەڵێنی ڕووخاندنی حکوومەتی سەددام حوسێنی دابوو و بەم مەبەستە خەرج و بەرجی "کۆنگرەی میللی ئێراق"ی کە بنکەی لە کوردستان بوو, دابین دەکرد, بەڵام هیچکام لە زلهێزەکان قازانجێکی لەمەدا نەدەبینی کە یارمەتی خۆنواندنی زیاتری کوردان بکا. بەڵام کوردان دەیانزانی کە لە بابەت ئەم شەڕ و گەڕەی کە خەڵکی ئاسایی و لە فرەکەوتوو پێیاندەگوت "خۆکوژی", جگە لە خودی کوردان کەس بۆ سەرکۆنە ناشێ.

لە سەرەتای ١٩٩٥دا دەزگای پاراستنی ئەمریکا (سیا) لە پێشا کۆنگرەی میللی ئێراقی دنە دا هەتا پشتیوانی دوو ڕێکخراوی گەورەی کورد یانی پارتی دێموکرات و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ بەشداری کردن لە چالاکی سەربازی دژی سپای ئێراق لە کەرکووك و مووسڵ ڕاکێشێ. ئامانجی ئەم کردەیە یارمەتیدانی پیلانێکی لە پێشا دارڕژاوی نێو سپای ئێراق بوو بە دژی سەددام حوسێن. ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئاخر ساتەکانا بە ئاگادار بوونەوە لە پەیامگەلێك کە لە نێوان ڕیزەکانی سپای ئێرانیدا ئاڵوگۆڕ دەکرا و باسی چاوپۆشی ئەمریکای لە بەرامبەر هێرشی هێزەکانی ئێرانی لە زەلکاوەکانی باشووری ئێراق دەکرد, دەستی ڕاگرت و پەشیمان بۆوە. پەلاماری کۆنگرەی میللی ئێراق دریژەی کێشا و دوو لەشکری لە هێزەکانی سەددام تێكشکاند, بەڵام حیزبی بارزانی لە خۆی تەوەلا کرد و نەیتوانی حکوومەتی سەددام بڕووخێنێ. ئەم ناکامییە لە چارەنووس و داهاتووی ناسیۆنالیزمی کوردا هەنگاوێکی زۆر مەترسیدار بوو. ساڵێ دواتر بارزانی بە دژی تاڵەبانی داوای یارمەتی لە سەددام حوسێن کرد و ئەم کردەیە بوو بە هۆی ئاڵۆزی و سەرلێشێواوی گەلاڵەدارێژانی سیاسەتی ئەمریکا و سەرسوڕمان و پەشۆکانی دۆستانی دەرەوی کورد.

## بەشی ٣

# هەڵخەڵەتاوەکان

بـەیانی ڕۆژی جێـژنی "پـاك"ی سـاڵی **١٩٩١** بـوو. کـاروانی بـچووکی ئێمـە — هەواڵنێران — لـە گەوەیـەکی ئاسـتەمی ئـەم ڕێیـەی لـە شارۆچـکەی هاوینەهـەواری سەلاحەددینەوە بەرەوخوار دەخوشیّ لـە ڕێبەنـدانێکی پاڵـەوپاڵ و دەم لـەسـەر پـشت گیری کردبوو. سەلاحەددین بنکـەی سـەرکردایەتی هێزەکـانی کـورد بـوو کـە ئێمـە دەمانویست لێی دوور کەوینەوە و خۆمان بگەیەنینە شوێنێکی پـەنا و نەمانـدەزانی ئـەم خواستەمان چەندە وەدی دێ. لـە پێشمانەوە بە سەدان ئوتۆمبیل و ئوتووبووس و لـۆری و تاکسی و ترێلێری پڕ لـە حەشیمەت پاڵیان وێكدابوو. لـە دۆڵی بەرپێمانەوە, لـەسـەر ئەو باریکەڕێیەی بەرەو لامان دەکشا, ئەم ڕەوەیە تێك‌گیرابوون. هیچکام لـەم دوو ڕیزە خۆی بۆ ئەوی تر کلا نـەدەکرد. کۆسـپی سـەرەکی ئێمـە ڕێ‌گـیران نـەبوو, بـەڵکوو هەندێك لـەولاتری سەلاحەددین, دوور لـە هەتەری چاو, باڵـەفڕە تۆپـدارەکانی ئێراقـی خەریکی تەقوتۆق بوون. لـە گرمەیانڕا دیـار بـوو کـە ئـەو ڕیـز ئوتۆمبیلانـەی دوو سەعات درەنگتر لـە هەولێرەوە دەرباز ببوون, دابوویاننە بەر تـۆپ و مووشـەك. کـەی یەکەم باڵـەفڕ لـەم تەپکەوە خۆی دەنوێنێ و نۆرەمان دێ؟

وا ئێستا دوای چەند ساڵ خوێندنەوە و توێژینـەوەی کـەلێن و قـوژبنی کتێبـان بـە دوای فێڵێك‌دا کە بتوانێ بـمگەیەنێتە کوردستان, تێگیرابووم و نائومێدانە هـەوڵم دەدا بە شێوەیەك لـەم هەرێمە دەرباز بـم, هەڵبـەت وێـڕای ئـەم هاوکارانـەی هاتبوونـە لام.

لەخۆوە بیرم لــە لایــەنی جۆراوجــۆر و نەفامانــەی ئــەم خیــــرەسەرییە کــردەوە. خــۆم دەهاتەوە بەرچاو کە چەند ساڵ پێشتر بە جووتێ پێڵاوی ئیتالیایی تایبەتەوە ڕێی بــەفر و

سەهۆڵی "ڤۆژ"[1]م دەبڕی؛ ئەوەندەم باسی گرینگایەتی کوردستان کردبوو کە تەنگم بە سەرنووسەرانی ڕۆژنامەکانی واشینگتۆن هەڵچنیبوو. هێندەم گوت و گوتەوە کە دامـان و تکایان لـە ڕێبەرانی کوردی سەرقاڵ بە کاری گرینگترەوە کرد, من بەرنە کوردستان. وا ئێـستا تێدەگەیـشتم کـە بـە شـێوەیەك واقعییەتـە تونـد و تیـژ و مەترسـیدارەکانی کوردستانـم وەبەرچاو نەگرتووە.

بێتوو ئێوەش چەشنی کوردان هێندە سیابەخت بن کە خوازیاری هەبوونی دەوڵـەتی خۆتان بن, ئـەو کـات جێـی سەرسـوڕمان نیـە ئەگـەر شـۆڕش و شـەڕ و شـێواوی و لێكهەڵوەشـانی حکوومـەتوو مـەزن بێتـە بەرچـاو, وەك ئـەو هەڵکەوتـەی دە فریـای خەڵکی لەهێستان هات, چونکە سێ ئیمپراتۆریی لـە ئـاخری سـەدەی هـەژدەدا هـەتا کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی ولاتی لەهێستانیشیان داگیرکردبوو. ئاوماڵە چـنۆکەکان سەرەڕای گەلـێ ڕاپەڕین ناوی لەهێستانیان لەسـەر نەخـشەی جوغرافیـایی سـڕییەوە. کوردانیش هەروەتر, ئازادی ڕاپەڕاندنی کاروباری نێوخۆیان لـە دەس دەرچـوو و قـەت بە شێوەی ڕەسـمی نەبوونە خاوەنی ولاتێکی سەربەخۆ. ئەوەندەی بۆیان کرا پاڵیان وەو میرنشینانە دا کە ئیمپراتۆریی ئێـران و عوسـمانی دەیانبوغزانـدن و جـاری وایـە هـەتا وەختایەکی هێزی سزادەر لـە پایتەختەوە گەیـشتۆتێ و تێکیـشکاندوون زۆر ناوچـەی بەربلاوی کوردستانیان لـە ژێر ئالای ئەمیرێکا یەكخـستووە. بەڵام مێـژووی نەتەوەخوازی نوێ و هیوا بە پێکهێنانی ولاتێکی کورد تەنیا دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی لێكهەڵوەشانی ئەم ئیمپراتۆرییانە لـە سەرەتای سەدەی بیستەمدا. شـەڕی یەکـەمی جیهانی کوردانی لـە ژێـر دەسـەڵاتی ئیمپراتـۆریی عوسـمانی ڕزگـار کـرد و بـەڵێنی سەربەخۆیی پێدان, بەڵام پاشـان ئـەوانی دایـە دەس تـەوژمی دەوڵـەتانی "نەتـەوەیی و کۆدەسەڵات" کە لەگەڵ هیچ حاوانەوە و ڕێككەوتنێك ئاشنا نەبوون. کوردستان کـە ولاتێکی دەورگیراوە و سەری ناگاتەوە دەریا, سەرەڕای بوونی کانگا و کانیاوی نەوت و ئاو، فرە دواکەوتووە و دوو جۆر ئیسلام و پێنج سنوور و سێ زمـان [سـێزاراوە] و

---

١- vosges, زنـجیرە چیایەك لـە باشووری ڕۆژهەلاتی فەرانسە, ڕۆژاوای ڕاین.

ئەوەندەش ڕێنووس بەشبەشی کردووە؛ بەڵام ئەوەندەی بە هۆی حەشـیمەتی کـوردەوە زیندووە، ئەوەندەش بە ویستی وانەوە قیت ڕاوەستاوە. چـونکە کـوردان جـەماوەرێکی گیانسەخت و دۆڕاوانێکی خۆڕاگرن. لـەبەر گـەرموگوڕی و قـسەخۆشی و بـوێری و کێشندەیی خۆیـان کـە تێکـەڵاوی ڕق و هەڵـچوونێکی چـاوەڕوان نـەکراوە, شـیاوی خۆشەویستیـن. سەرکردەی لەشکری ڕەگەزە غەوارەکان, چەشنی گزنفۆن لـە سەدەی چوارەمی بەر لـە زایین و فیلد مارشاڵی داهاتووی پرۆس, "هێڵمۆت فۆن مۆڵتکە"[1] لـە ساڵەکانی دەیەی ١٨٣٠دا باسیان کردوون. مۆڵتکەی لاو تێگەیی کە کورد و عەرەب هەرتك "ئیشتیا و مەیلی ڕێگرییان هەیە", بەڵام ئەوەی هەیـە کـە مـەیلی عـەرەبان پـتر دەگەڕێتەوە سەر باندۆری دزی و سەرچاوەی مەیلی کوردان لـە ورەی شـەڕکەرانەوە هەڵدەقوڵێ.

بەڵام تەنانەت هەڵکەوتەیەکی "پرۆس"یش دەکرێ بـە پێـچەوانە لـە ڕووداوەکـان حاڵی بێ. سەت و پەنـجا ساڵ دواتر تاقمی ئێمە شایەدی سزادانێ بوو کـە بـە دەسـتی عەرەبان و لـە قەوارەی سپای تێكشکاو بەڵام "مەرگهێنی" سەددام حوسێنا بەسەر ئـەم خەڵکەدا داسەپا. تاقمی ئێمە بریتی بوو لـە دە دوازدە هـەواڵنێر کـە بـۆ چارەڕەشـییان لەرێوە لـە تێكشکان و ڕاکردن حاڵی دەبوو. وەچەیەك بەر لـە ئێـستا کێـشەی وێتنـام یەکەم شەڕ بوو کە من وێڕای "مەك کالین"ی وێنەگر و "مارتین ڤولاکۆت", هەواڵنێری "گاردییەن" دیبووم و ئەم دووە لێرەش بوون. "جوولی فلینت" لـە "ئـابزێروێر", "مـارك کراوتس" لـە "لیبراسیۆن", "چارلێز گلاس" و گرووپی "بیبیسی" هـەموو وەك مـن پاشـماوەی شەڕۆچـکەی بێبڕانـەوەی سـاڵەکانی ١٩٧٠ و ١٩٨٠ی لوبنـان بـوون. "گۆڤین ڕۆبێرتس" لـە بیست ساڵ پێـشترەوە خـەریکی سـازکردنی فیلـمی بەڵگـەداری تلەفیزیۆنی بوو بۆ "ڕۆیتێر" و ئێستاش هەر خەریکی ئەو کارە بوو. نوێنەرانی بەرەی لاو بریتی بوون لـە "جراڵدین برووکس" لـە "وال ئیـستریت جورنـاڵ", "ئـایوز هارتـە" لـە "سووداودێستێ", "بوردوو" و "ئیسکات پیتێرسۆن" لـە "دیلی تێلگراف".

---

١– هێڵمۆت یوهانس مۆڵتکە ١٨٤٨ – ١٩١٦, سەرکردەیەکی ئاڵمانی بوو.

هەروا کە گوێمان دەدایە فڕکەی باڵەفڕە تۆپدارەکان, لەوپەڕی ترسا وێنایەکی کـە "ئاندرێ مالرۆ"[٢] لـە ترس و خۆفی خۆی دەکا, ئـەو کاتـەی لـە ١٩٤٠دا تانکەکـەی دەکەوێتە قوڵکەیەك و تۆپی ئەڵـمانی سێرەی لـێدەگرن, لـە بیرگەمدا سـەری هەڵـدا. لـە نزیك ئێمەوە پیاوێك دڵنوایی منالێکی دەکرد کە بە ئاوری مووشەکی بـالآفڕ تـەواو سووتابوو. چوار پێشمەرگەی کورد کە چەند نەخشەی گلۆڵەکراوی دەسکەوتیان لـە سپای ئێراق وە ژێر هەنگڵ دابوو, لـە پێشماندا بـــە غــار دەرۆیــشتن, ئـــەم چـــوارە ڕایاندەکرد و پتر لـە میلیۆنێك کورد بە شوێنیانەوە بوون. شۆڕشی کورد جارێکی تر بە سەرڕەو تەفروتونا دەبوو. ئەمریکا ڕایەکی تر کوردانی لـە تەنگەژەدا بە جێهێشتبوو.

من لـە ڕۆژی هەینی پیرۆزا[١]– ٢٩ی مارس – لـە شـاری سـلێمانی هـەروا کـە بـە چڕوچاوێکی خـەوالۆوە گـوێم دەدایـە هەواڵـەکانی سـەعات پێنجـی پـاش نیـوەڕۆی بیبیسی, لـە ڕووداوی کارەساتی بێگەڕانەوە حـاڵی بـووم؛ بیبیـسی تـەنیا ئـامرازی پێوەنـدیم لـەگـەڵ دنیـای دەرەوە بـوو. وێـژەری ڕادیـۆ وتـەکانی وتەبێـژی وەزارەتـی دەرەوەی ئەمریکای گێڕایەوە کە دەیسەلـماند سپای ئێراق دوێشەو شاری کـەرکووك, ناوەند و کانگای گەورەی نەوتی لــە بـاکوور, گرتۆتـەوە. بـەم ئاکامـە گەیـشتم کـە واشینگتۆن پێـشتر بـە یارمـەتی وێنـەی هـەوایی لــە ڕووداوەکـان ئاگـادار بـووە. زۆر وێدەچوو پتری ئەم وێنانە لـە لایەن ئەو فڕۆکانەوە هەڵگیـرابنەوە کە ڕۆژی سێشەمـمۆ بەسەر کەرکووکـەوە دیبوومـانن. گومـانی تێـدا نـەبوو کـە ڕێکخـستن و دامـەزرانی هێزەکانی ئێراقیان خستبووە ژێر چاوەدێری. داخوازی ڕوون و ئاشکرای ڕێزدار بـووش لـە پازدەی فێوریەدا کە ڕایگەیانـد "دەبـێ تاقمـەکانی سـپای ئێـراق و خـەڵك خۆیـان کارەکان وە دەس بگرن," بوو بە ئەوەی کە ئەمریکا دەس لـەسـەر دەس دابنـێ و تـەنیا خەریکی "بەڵگە سازکردن" بێ لـەمەڕ ئەم چورتە لـێبڕانەی. ئیزگەی ڕادیۆی سەر بـە دەزگای پاراستنی ناوەندی (سیا) کە بنکەی لــە عەرەبـستانی سـعوودی بـوو بێوچـان

---

٢ –Andre malraux، نووسەر و دەوڵەتداری فەرانسەوی ١٩٠١ –؟

١–Good Feiday، ئەو هەینییەی کە یادگاری چوارمیخەکێشانی حەزرەتی عیسایە, هەینی بەر لـە چێژنی پاك.

هەتا ڕۆژی سێهەمی مارس – یانی سێ ڕۆژ پاش ئەو ئاگربەسەی کە چالاکی سەربازیی "تۆفانی سارا"ی هاوپەیمانانی کۆتایی پێهێنا – داوای لە خەڵکی ئێراق دەکرد کە حکوومەتی سەددام حوسێن بڕووخێنن.

پەك کە پەتپساوی ئەم ڕادیۆ نهێنییە چەندەی وتەکانی بووش وە بیر دێنایەوە! لە ساڵی ١٩٥٦ من لە ئورووپا سەرباز بووم, ئەوکات واشینگتۆن بەوە تاوانبار کرا کە بە بڵاوکردنەوەی قسەی نەجووراوی هەڵنەسەنگاو لە ڕادیۆ "دەنگی ئازادی ئورووپا"وە کە "سیا" خەرجوبەرجی دابین دەکرد, شۆڕشی مەجارستانی هەڵگیرساند و کاتێك تانکەکانی سۆڤیەت ڕاپەڕینیان تێكدەشکاند, ئەوان بێشەرم و متەق خۆیان کەنار دا. ئەمە پەندێك نەبوو کە هیچ ئەمریکایییەکی هاوتەمەنی من لە بیری بردبێتەوە. بەڵام ئەمجار ئەم دنەدان و پاڵپێوەنانە لە لایەن دەزگایەکی ڕادیۆیی لە جەرگەی شەڕی ساردا نەبوو, بەڵکوو لە لایەن سەرکۆماری ئەمریکا و بە قەولی پڕوپاگەندەکەرانی, لە لایەن تەنیا گەورەهێزی جیهانەوە بوو.

سەرباقی ئەوانەش دەسەڵاتی کوردان بەسەر ناوچە ئازادکراوەکانیاندا گەلێ لەرزۆك و متمانە پێنەکراو بوو. ئێمە هەر لە حەوتوویەك پێشترەوە کە هاتبووین لەم بارودۆخە حاڵی ببووین. تەنانەت ئەو دە ڕۆژەی کە کوردان کەرکووکیان بە دەستەوە بوو – پاش حەفتا ساڵان ئەمە یەکەم جار بوو ئەم شارەیان دەکەوتە ژێر دەسەڵات – نەیانتوانی تەواوی مەتەرێزەکانی پارێزەری بنکەی گرینگی زەمینی و ئاسمانیی "خالیدی بنی وەلید" داگیر بکەن. شەوی چوارشەممۆ ئەوکاتەی گلاس و تاقمی "بیبیسی"یەکەی و مەككالین لە کەرکووکەوە بەرەو هەولێر گەڕانەوە لە قەراخ جادە تەقە و لێكدانیان دیبوو. بۆ سبەی تانکەکانی ئێراقی توانیان شاری گرینگی ئاڵتوون کۆپری لەسەر زێی بچووك و نێوان هەولێر و کەرکووك داگیربکەنەوە. هەر چۆنێکت چاو لێدەکرد لەم شارێ زۆر باشەوە [ئاڵتوون کۆپری] کەرکووك و سلێمانی ئێستا سەعاتێکیان پتر مەودا نەبوو, جا هەر کات ئێراقییەکان ویستبایان هێز و ئامرازی تێكشکاندنی بەربەرەکانی کوردانیان بە دەستەوە بوو. تەنیا مانگێك پاش ئەوەی کە هێزە هاوپەیمانەکانی دژی سەددام بە ڕێبەرایەتی ئەمریکا لە بیستوهەشتی

فێوریەدا و لـە شەڕێکی زەمینی سەت سەعاتەدا کۆتاییان بە داگیرکرانی کووەیت هێنا, پاشـماوەی سپای خوێڕیکراوی سەددام کە هەر چەند ڕۆژێك پێشتر دەسەڵاتی خـۆی لـە ناوچەکانی شیعەنشینی باشوور وە دەس هێنابۆوە, ئێستا ئامادەی تێکشـــــــــکاندنی ڕاپەڕینی کوردستان بوو.

لـە هوتێل "سەلام"ی سلێمانی لـە پێخەفەکەما بـیرم لــە بـارودۆخی تـاڵی خۆمـان و کوردان کـردەوە. زگـچوونی بـە خـوێنم بـوو, ئـەو نەخۆشـییەی گەلــێ سـاڵ بـوو شـوێنەواری نـەمابوو. تاقـەتی ئـەوەم نـەبوو هەسـتم و بـچمە نێـو شـار و بـە دوای هاوکارەکانـمدا بگەڕێم کە بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ چـووبوون. بـە ڕوونـی مەترسـیم هەست پێدەکرد. هەر سێ ڕۆژ پێشتر سەروسۆراغی سێ وێنەگری لاو و لــەزۆقمان ون کردبوو کە لــە سـووریاوە وێرامـان هـاتبوون. تـەواو نیگـەرانیان بـووین.[1] سـەرەڕای پاڕانەوە و پێداگریـمان بۆ ڕۆیشتن, ئەوان سوور بوون لـە کـەرکووك وەمێـنن. کاتێـك "ڤۆلاکوت" گەڕایەوە میوانـخانە, هەواڵەکانی کەرکووکم بۆگێڕایەوە. گـوتی: "دەی, ئەوەش چوونە بەغدامان بە یەکەم زرێپۆشەکانی کورد!" هـەواڵمان دا بـە هاوکـاران و پاشان خێرا بە ئوتۆمبیل بەرەو سەلاحەددین لـە باکوور کەوتینە ڕێ کە لـە سـلێمانییەوە سێ سەعات ڕێیە. بوولێڵی ئێـوارێ لــە دەوروبـەری سـلێمانی هێنـدێك ڕاوەسـتاین و دەستمان کرد بە وتوویژ لـەگەڵ ئەو پەناخوازە ترساو و شەکەتانەی حەفتا میل نێـوان کەرکووك و سلێمانی بە پێیـان هـاتبوون. گوتیـان باڵــەفڕە تۆپـدارەکان لــە پێـشا لــە کەرکووك داویاننە بەر بۆمبی فۆسفۆریی سپی و پاشـان لــە شـارێ وەبـەر مووشـەك و ڕەشاشیان داون. ئەوەندە دینارە ئێراقییەی پێمانبوو وێمان دان. خـەڵکێکی خانـەخراپ بوون و پێداویستییان بە پووڵ بوو.

دەبوو هەرچی زووتر لـە ئێراق دەرباز بووباین و بەسەرهاتی ئەم خەڵکـە خـۆ لــێ بێخاوەن کراوەمان گێڕابایەوە و خۆمان لـەم ئاوربارانە ڕزگار کردبا.

---

[1]- جاد گروس Jad gross, دەرچووی هاروارد کە یەکەم ساڵی ڕاسپێراوی خۆی تێپـەڕ دەکـرد, بـە دەس هێزەکانی داگیرکەرەوەی کەرکووك کوژرا. دووەکەی تر بە دیل گیران و دواتر ئازاد کران.

هەر لە دەسپێکەوە تێکشکانی شۆڕشی کورد خۆی دەنواند, بەڵام لێکهەڵوەشان و دەس لێکبەردانێکی وەها خێرا, ئەشتەکی چاوەڕوان نەکراو بوو. ئێمەش هەموو دەمانزانی کە چوونە باکووری ئێراق کارێکی مەترسیدارە. ڕەشبینی ئێمە بەرهەمی ئەزموونی ڕابردووە لە ئیشێکدا کە پتر خوازیاری شك و گومانە هەتا خەیاڵات. ئەوەی مابووین یەکتر گیر ببووینەوە. زۆربەمان ئەوەندەمان شەڕ دیبوو کە بە پێی ڕێسا زۆر شتان بێنینە حیساب، وەك: بەدشانسی, درۆ, ڕووداوی تاڵی چاوەڕوان نەکراو، دواکەوتن بە هۆی کەترەخەمی, هەوای ناخۆش, نەخۆشی لەپڕ، برۆکراسی و ڕێوشوێنی لەخۆوە, پاشەکشەی لەنەکاو, فیفی بوونی باڵادەستانی ڕەسمی، لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی هەڵەی سەربازی, ئامۆژگاری خراپ و زیاتر پڕ لە بەدخوازی, ڕێنوێنە تێنەگەیوەکان, دوژمنایەتی, ڕانندە بێ دەسوپلەکان، ئوتۆمبیلی ناتەیار, بەتایبەت ئەو ئوتۆمبیلە متمانە پێنەکراوانەی تورمزێکی ئاوهایان نەبوو, کەم بوونی بێنزین, تەگەری سواو و پواو و ویسکی خراپ.

کاتێك ئەو دوو هێڵە تەلەفۆنە ئاسمانییەمان کە قەرار وابوو سەرەڕای تێکدانی ناوەندەکانی تەلەفۆنی ئێراق لە لایەن هاوپەیمانانەوە پەیوەندی ئێمە لەگەڵ دنیای دەرەوە دابین بکەن, هەر لە ئەوەڵەوە دابڕان, ناڕەحەتێکی ئەوتۆمان هەست پێنەکرد. ناڕەحەتی زیاترمان تەنینەوەی تاڵوتوونی و شێواوی ناوچەکان بوو: لێکهەڵوەشان و تێکشکانی بە سەرڕەوی خۆڕاگری شیعەکان لە باشووری ئێراق, کۆبوونەوە و لێکهاڵانی هێزەکانی سەربازی لە باشووری کەرکووك, کشانەوە و خۆ لادانی تاقمەکانی "سپای یارمەتیدەر"[1] کە هاتبوونە ڕیزی شۆڕشەوە و دیسانەوە بەرەو کۆشی حکوومەتی بەغدا گەڕابوونەوە, پێشڕەوی موجاهیدینی خەڵق کە بە چەکی قورس تەیار کرابوون. (موجاهیدینی خەڵق هێزی دژ بە کۆماری ئیسلامی بوون و ئێستا بۆ دابین کرانی بنکە و ئامرازیان لە لایەن ئێراقەوە ببوونە گوێ لەمستی بەغدا) هەروەها دیدارێك لە وێستگەی گەورە و پێشکەوتووی شەمەنەفەری کەرکووك لە بەشی

---

١- سپای بەکرێگیراوانی خۆماڵی. [جاش]

پێشەوەی بەرەکانی شەڕ, کۆلان و شەقامەکانی چۆڵوهۆڵی بێجریوەی منالّ و ترپەی پێی ڕێبواران, بە دیارەوە نەبوونی ئامرازی هاتوچۆ, ئەو بێدەنگییەی کە تەقەی تاکوتەرا و لێرولەوێ دایدەسەپاند و شریخەی لە نەکاوی خۆمپاران, تێکڕا نیشانەی ترسیان سەلماندبوو.

بە درێژایی حەوتوو سەبارەت بەم مەبەستە ئەگەر هاتوو ڕاپەڕینی کوردان تووشی تێشکان هات چلۆن خێرا شار جێبێلّین, باس و ڕاوێژمان کردبوو. ئێراق لە باشترین کات و دۆخی خۆیا بە بەدکرداری مەنشوور بوو لەگەڵ ئەم غەوارانەی بە بێ ئیزن دەچوونە وێنەدەرێ و دەگیران و ئێمەش بێ هیچ بەرگە و بەلّگەیەك سنوورمان پەڕاندبوو. گەڕانەوە بۆ سووریا بە ڕێی پێشوودا بێبواری دەنواند. بۆ چوونە کەرکووك و هەولێر سێ ڕۆژی بارانی لە قوڕ و زەلەقدا مابووینەوە, بە ڕێی کەندوقووڵ و کوێرەڕێی سەرسەوز و جلّیتاو تەنیوی گونداندا کە "دێلتا"ی "مێکۆنگ"ی وێنەی دێنایەوە یاد تێپەڕیبووین. تەنانەت ئەو کاتەی کە وێدەچوو کوردان خەریکن دەسەلاتیان لە ناوچەدا سەقامگیر کەن, دەسەلاتیان بەسەر ئەم ڕێیانەدا نەبوو. چوون بەرەو باکوور و تێپەڕین لە بەشی ڕۆژاوا بەرەو کەوشەنی تورکیا لە ڕێی مەنشووری بارزانەوە وێدەچوو دەس بدا, بەلام وەك دەیانگوت ئەم ڕێگایەی لە ڕۆژهەلاتەوە بەرەو ڕۆژاوا دەخوشی, لەبەر ئەوەی لەمێژ بوو کەس خۆی تێنەگەیاندبوو, تەنیا ترۆمبیلی دوو دیفرانسییەل دەیتوانی لێی باژوێ و ئێمەش نەمانبوو.

تەنیا ڕەوگەی ڕەسمی لەم سنوورە بەردەلانە دووسەتوشەش میلییە لەگەلّ تورکیا, پردێك بوو لەسەر ڕووباری خابوور لە قولینچکی باکووری ڕۆژاوا, نزیك زاخۆ. یانی نیزیك ئەو شوێنەی کە وەختی هاتن لە سووریاوە بە سواری کەلّەکی پەلاستیکی لە دیجلەی لافاوییەوە پەڕیبووینەوە و لە "پێشخابوور" هاتبووینە خاکی ئێراق. تەنانەت ئەو کاتیش لە وێزەی خۆمپارەهاوێژانی ئێراقا بووین. لە سەرەتای مانگی مارسدا ئێراقییەکان وەختی پاشەکشە پردەیان تەقاندبۆوە, ترکانیش بە گشتی تەقەیان لە تەواوی ئەو کەسانە دەکرد کە دەیانویست بچنە خاکی تورکیاوە. لەسەر کاخەز, ئێران باشترین ڕێ بوو. لە هەموان نیزیکتر بوو و پاش چەند سەعات

ڕێکوتان بە ئوتۆمبیل بە جادەیەکی خاکیدا دەستی وێرادەگەیشت و هەموو ڕۆژێ فڕینێکی نەوەد دەقیقەیی، فڕۆکەخانەی لای سنووری بە تارانەوە دەبەستەوە. بەڵام هیچمان بەڵگەی هاتوچۆی ئێرانیمان پێنەبوو و دوژمنایەتی ئێران لەگەڵ ڕۆژاوییەیان, بەتایبەت ئەمریکایییەکان بە ڕادەیەك بوو کە دەترساین لە سنوور بکەوینە دەس یەکێك لە پاسدارانی مرچومۆنی شۆڕش و بمانگێڕنەوە.

چاك دە گەرداوێ کەوتبووین و من هەستم دەکرد کە بۆ ئەم مەبەستە خۆم تاوانبارم. من بەر لەوەی یەکەم فیشەك بۆ ئازاد کردنی کووەیت لە شازدەی ژانویەدا هاویژرابێ, کەوتبوومە شوێن کوردان, بەتایبەت شوێن مەسعوود بارزانی ڕێبەری پارتی دێموکراتی کوردستان کە کۆنترین حیزبی نەتەوەخوازی کوردە. لەمە گرینگتر, ئەو ئێستا یەکێ لە سەرۆکانی "بەرەی یەکگرتووی کوردستان" بوو کە لە هەشت حیزب و ڕێکخراو پێکهاتبوو. بە پێکهێنانی ئەم بەرەیە کوردان سەرەنجام ڕق و کەڵەوەکێشی و دووبەرەکایەتی نێوخۆیی, کە هێزی لە جووڵانەوەی کورد بڕیبوو, وەلانا بوو. لە سەرەتای فێوریە بەخت باڵی گرتبووم و توانیبووم ویزای ئێرانم نوێ کەمەوە, بەڵام ماوەی ئەم بەڵگەیەش هەر ئەوەندە بوو کە من لە تارانەوە بگەیەنێتە بنکەی بارزانی لە سنووری ئێران و ئێراق لە نزیك ورمێ.

بێشك سەفەر بە فڕۆکە ئەم کارەی هاسان دەکردەوە. بەڵام پیاوەکانی بارزانی نەیانتوانیبوو بلیتی فڕۆکە وەگیربێنن. لە جیاتیان دوو ڕانندەی لاوی کورد لەگەڵ دیلمانجی بەر سرنجی بارزانی – سیامەند بەننا – بە سواری ئوتۆمبیلێکی پەیکانی مۆنتاژی ئێران پەیدا بوون, ئەویش پاش دانێك دوا کەوتن. لەم کاتەدا کە خەریك بوو ماوەی ویزاکەم تەواو دەبوو دەمویست لەم کارە پاشەگەز ببمەوە, زۆر وەڕەز و گرژ و تاڵ بووم. لە دیداری جارانی پێشوومڕا دەمزانی کە سەفەر بە سواری پەیکان جگە لە گەڕانی نێو شاران دەبێ چەندە ناخۆش بێ. تەنیا زەمانێك چاك حاڵی بووم کە لە ڕێی کوێستانان لەسەر سەهۆڵ هەڵدەخلیسکاین. بەڵێ شازدە سەعات ئاژوانی بێوچان بە ڕێی پڕ ترس و خۆفا, سێ سەعات خەوتن, سێ سەعات وتوویژ لەگەڵ بارزانی و شازدە سەعات گەڕانەوە بۆ تاران ئاکامی ئەم هاتوچۆیە بوون.

لە سۆنگەی شریتەکانی دەنگی سیروان پەروەر [شوان پەروەر], بەتایبەتی چەمەری پەژارەبارێنی کە بە بۆنەی مەرگی هەزاران ئینسانی ئاسایی بێچەك‌وچـۆڵی هەڵەبجە تۆماری کردبوو, نەمانهێشت خەومان لـێبکەوێ. سەددام حوسێن لە مارسی ١٩٩٨ [١٩٨٨]دا هەزاران مرۆڤی بە گازی شیمیایی لەم شارە خنکاند. ئەمە یەکەم جار بوو لە مێژوودا کە دەوڵەتێك دژی خەڵکی بێچەکی خۆی لە رووبەرێکی وەها فرەواندا, لە گازی کوشندەی شیمیایی کەلکی وەردەگرت. (ئێراق پێشتر لە زنجیرەیەك چالاکی سەربازیدا دژی کوردان لە گازی شیمیایی کەلکی وەرگرتبوو و کۆمەڵی جیهانی لە رووی ئاگاداری و زانینەوە – هەروا بە تێکڕایی– چاوی لە حاند قووچاندبوو.) من و بەننا کە لە سەندەڵی دواوەدا لە باڵیەك‌ڕاچـووبووین کەوتبووینە دەمەتەقەیەکی بێکۆتایی کە لە ڕاستیدا دەرسێکی بایەخدار بوو لەسەر ناسیۆنالیزمی کورد. شەکەتی ئەم سەفەرە دوور و درێژانە بە ڕێگیرانی لە پەستا کە لە کوردستانی ئێران تووشیان دەهاتین, دەرەوین. کوردان کەیفیان بە نارەحەتی کاربەدەستانی دەزگای ئاساییشی ئێران دەکرد کە تێمابوون: لە لایەك بەدگومان لە ئەمریکایی بوونی من و لە لایەکی ترەوە لە بەڵگەی هات‌وچۆم کە سپای پاسداران, یەکە دەسەلاتداری ولات بۆی دەرکردبووم.

وت‌وویژی گەڵ بارزانی کە لە حەشارگەیەکی دژی بۆمب لە چیای بەفرگری سامالْ سپیدا ئەنجام درا, وت‌وویژێکی چڕ و پڕ بوو. ئامانجی ئەو بە گشتی لەم وت‌وویژە هەناردنی پەیامێك بوو بۆ ترکان کە لایان وابوو کوردان لە جێی خودموختاری لە چوارچێوەی ئێراقا, خوازیاری سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردن. بارزانی وتی: بەم شێوەیەی کە دنیا بۆ پاراستنی سنوورەکانی کووەیت هاتۆتە شەڕ, کوردان تێگەیون کە هیچ کەس پێیخۆش نیە کوردستانێکی سەربەخۆ لە ئێراق ... یان ئێران و بەتایبەت تورکیا جیا بێتەوە. ئەمە ڕاسپاردەیەك بوو کە بارزانی و ڕێبەرانی تری کوردی ئێراق هەمیشە بۆ باوەڕ بێهێنان و مرزەم کردنی ولاتانی دڕدۆنگی ئێران و سووریا و تورکیا چەن‌پاتیان دەکردەوە و چشیان وەگیر نەدەکەوت و ئەمریکاش بە تەقەی دەهۆڵ و زوڕنا پێویستی پاراستنی تەوایێتی خاکی ئێراقی

ڕادەگەیاند. بارزانی گوتی کوردان هەقیانە وڵاتێکی سەربەخۆیان هەبێ، بەڵام دەبێ بە ئامرازی سیاسی بگەنە ئەم ئامانجە نەك بە چالاکی چەکدارانە. جا ئەم ویستە بە سرنج دان بە هەڵوێستی سەرەتایی و کردەوەی پڕ توند و تیژی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست ڕەنگە یەك سەدەی پێبچێ.

چەند ساڵێك بوو بارزانیم نەدیبوو، پێی وردیلە و خاڵی ڕوخساریم لە بیر چووبۆوە، هەر چەند گلە و گازندەییم لەسەر چەوسانەوەی ئاشکرای نەتەوەکەی لە بیر مابوو. بە بڕوای وی هەستی سڕی ئەمریکا بەتایبەت و کۆمەڵی جیهانی و دەسەڵاتەکانی ناوچە بە گشتی بوونە هۆکاری ئەم مەرەدانە. وێنەیەکی ژێنێراڵ بارزانی مەزنی باوکی کە بۆ ماوەی نیوسەدە شێوەی قەڵافەتی ڕێبەرێکی نەتەوەخوازی ئەمڕۆیی کورد بوو، لەسەر دیوارەوە تێمان ڕامابوو. ڕوخساری هەڵۆیانەی بارزانی مەزن وەبیر مەسعوودی دێنایەوە کە چۆن ئەمریکایییەکان؛ بەتایبەت هێنری کیسینجێر لە ساڵی ١٩٧٥دا کوردیان فریودان و پێیانسەلماندن کە واشینگتۆن یارمەتی ئێران دەستەبەر دەکا و پاشان کاتێ محەممەد ڕەزاشای پەهلەوی بە ئێراقی فرۆتن، متەقی لە خۆ بڕی و دەسی لە سەریەك دانا و سووك و چرووکی کردن.

مەسعوود گوتی: دەوڵەتی "ڕێگان"یش لە وان باشتر نەبوو. ئەو ئاماژەی کردە سەرکەوتنی ئێراق لە بابەت شکاندنی ئەم گەمارۆیەی بە زۆربەی دەنگ و بە مەبەستی سزادانی ئێراق بە خاتری کەڵك وەرگرتن لە گازی شیمیایی لە ١٩٨٨دا بە دژی کوردان لە لایەن مەجلیسی "پیران"ەوە خرابووە سەری. هەروەها باسی یارمەتی درانی ئێراقی لە لایەن دەوڵەتی ڕێگانەوە کرد کە ڕێی بۆ وەرگرتنی وامی هەڵومەرج هاسان و تێکنۆلۆژی سەربازی خۆش کرد. دیسان ڕوونی کردەوە تا ئێستا کە نیزیکەی چل هەزار گوندی کوردان خاپوور کراون و سەدان هەزار کورد لە شارۆچکەی بە ناو "سەرکەوتن" خزێندراون و تەواوی خەڵك لە هێرشی شیمیایی تۆقیون، ئەو نایەوێ لەم جەنگەی شەڕی ڕزگاری کووەیتا بەرەیەکی دیکەی دژی سەددام بکاتەوە.

هەر چۆنێك بێ، لە ڕۆژی دووی ئووتی ١٩٩٠ەوە کە ئێراق پەلاماری کووەیتی دا، دەوڵەتی سەرۆك بووش کەمترین مەیل و ئۆگری خۆی سەبارەت بە ڕاوێژ

لەگەڵ کوردان, چ بە جۆی یان وەك پاژێك لە تێکڕای "بەرەی دژی سەددام" نیشان نەدابوو, جا چ بگا بە هاواهەنگی لەگەڵیان. چەند ڕۆژ پاش "پەلامار" جەلال تاڵەبانی, سەرۆکە هاوبەشەکەی تری "بەرەی کوردستانی" و ڕێبەری ڕێکخراوی ڕقەبەری بارزانی, بەم باوەڕەوە کە ئاخری سەددام حوسێن بەرگەی مەرگی خۆی ئیمزا کردووە و ئێستا لە کۆڕ و کۆمەڵی نێونەتەوەیدا بە ڕووی خۆشەوە پێشوازی کوردان دەکەن, بە پەلە خۆی گەیاندە واشینگتۆن. بەڵام وەزارەتی دەرەوی ئەمریکا ڕوویەکی وای نیشان نەدا. کەوایە بۆچی دەبێ کوردان خۆیان بدەنە دەس پێشهات؟ بارزانی بە دووپات کردنەوەی هێندێك لە وتەکانی تاڵەبانی کە دوو حەوتوو پێشتر, هەر لەم زستانەدا, لە دەمیشق کردبوونی و من بیستبوومن, گوتی: "سەددام دەسەڵاتی لاوازە, بەڵام ئێمە لاوازترین." کوردان کێشەکەیان دەبردەوە باری ئەخلاق و بەڵێنییان دەدا لەبەر ئەوەی سەددام لەگەڵ دوژمنانی دەرەکی, لە قالبی کۆمەڵی جیهانیدا دەستەویەخەیە, ئەوان بە دژی چ کردەوەیەك نانوێنن.

ئەم بۆچوونە، ئاقڵانە دەهاتە بەرچاو. ڕێبەرانی بەرەی کوردستانی تێگەیبوون کە ڕێبەرانی هەڤگری دژی سەددام ناتوانن و نابێ لە کوردانی ئێراق بخوازن پتر خۆیان بخەنە مەترسی, مەگین ئەوەی بە شێوەی ڕەسمی خۆیان دەستەبەر بن. ڕێبەرانی کورد بە ورد بوونەوە لە هەڵەکانی ڕابردوویان کە کوردستانی بە قوڕ گرتبوو, دەیانزانی کە ناتوانن خەڵك بۆ جووڵانەوە هان بدەن. پاشماوەی ئەم ڕێبەرایەتییە خەساربارە ئێستا لە مەترسیدا بوو. سەردەمی کەینەوبەینەی ئاڵوگۆڕی پەنامەکی زانیاری بە سەرچوو بوو و هەڵبەستنی پێوەندێتی ڕامیاری لەگەڵ گەورەهێزانی دەرەکیش – ئیتر جگە لە دەستەبەر بوون – پتر خەون و خەیاڵێکی پڕ مەترسی بوو. کوردان ئەم ڕوونبینییەیان بە نرخێکی گران وە دەس هێنابوو. دە ساڵ پاش تێکشکانی مەلامستەفا, مەسعوودی کوڕی و تاڵەبانی بەختی خۆیان و مەلاکانی کۆماری ئیسلامییان تێکخستبوو و ئەمانەش لە ماوەی شەڕی ئێران و ئێراق لە ١٩٨٠ تا ١٩٨٨ەوە کەلکیان لێوەرگرتبوون و فریویان دابوون.

لە ڕاستیدا تۆڵەی ئێراق سنووری بۆ نەبوو. کەلك وەرگرتن لە چەك‌وچۆڵی ژاراوی دژی خەڵکی کورد لە ڕاستیدا شێوەی جووڵانەوەی سەددام حوسێن لەگەڵ خەڵکێ بوو کە بە خەیانەتکار و خراپکاری تاوانبار کردبوون. سەددام ئەم چەکە ژاراوییانەی لە پێش‌دا ساڵی ١٩٨٧ و پاشان ١٩٨٨ لە هەڵەبجە دەکار هێنا و هێندێك دواتر لە زنجیرە هەڵمەتی ڕاونان و پشکنین و شوێن‌گێران و پلێشاندنەوە بە ناوی "ئەنفال"دا کەلکی لێ‌وەرگرتن. ئەم کردەوە دزێوانە شتێ نین کە لەسەر پەردەی بیر و زەینی خەڵك وەشۆڕێن. بێ بانگەوازی بووش لە بۆ شۆڕش, چەن کورد بە پیر هەڵگیرسانەوەی شەڕەوە دەچوون؟ وەك ئەوەی بیرگەی خەڵکی کورد پێویستی بە وە بیر هێنانەوە بێ, لە پایزی ١٩٩٠دا عیززەت ئیبراهیم, یارمەتیدەری سەرکۆماری ئێراق چووبووە سلێمانی هەتا ئاوا هەڕەشە بکا: "ئەگەر ڕووداوی هەڵەبجەتان لە یاد بردۆتەوە, پێم‌خۆشە وە بیرتان بێنمەوە کە ئێمە حازرین دووپاتی کەینەوە."

وت‌وویژم لەگەڵ مەسعوود بارزانی کۆتایی پێهات. هەستام بڕۆم, بەڵام فراوین چێ کرابوو و داوای کرد نەڕۆم. ڕاوێژمان گۆڕا. کاتی خواردنی مریشك و پلاو, وت‌وویژمان خۆشتر بوو. ئەو بە ئاشکرا گوتی کە بە پێچەوانەی ڕواڵەتی ئەوەندەش بێ‌لایەن نیە کە هەتا ئاخری هەروا دانیشێ: "ئەوەی کە بە ئاشکرا بەڵێنیمان داوە لە کێشەی کووەیتا حازر نین لە پشتەوەڕا خەنجەر لە ئێراق بوەشێنین, تاکتیکە." ئەم مەبەستە ڕەنگدانەوەی ترس و پارێزی ڕێبەرایەتی بوو لە تۆڵە ئەستاندنەوەی سەددام, بەڵام لە بەرامبەردا بەغدای وەها دڵنیا کردبۆوە کە چەن تیپ و ئامرازی شەڕی لە کوردستانەوە بۆ کووەیت ڕاگوێزتبوو. مەسعوود بێ ئەوەی من چیم پرسیبێ گوتی ئەوەندەی بووز دەخوا پیاوەکانی هەر زانیارییەك سەبارەت بە خەسارەت و زەرەدی بۆمبارانەکان یان مەبەستە تاکتیکییەکان وە دەسی دێنن دەیدا بە هاوپەیمانان. زۆربەی ئەم زانیارییانە سەبارەت بە کوردستان بوون, بەڵام بەشێکی لە لایەن ئەم کوردانەوە وە دەس دەهات کە لە ڕیزەکانی سپای ئێراق لە کووەیت بنەگر ببوون. لە کووەیت ئەم کوردانەیان کردبووە بەشە گۆشتی بەر دمی تۆپ و ئەوانیان لە پڕ مەترسیترین شوێنەکانی شەڕگە دامەزراندبوو.

لــە تــەواوی مــاوەی ئــەم وتوویــژەدا کۆگایــەك کاخــەزی بــچووکی نوشــتاوەی هەڵڕیژراوی سەر مافوورە زەینی منی لـە خۆی شـەتەك دابـوو. ئـاخری پرسـیم ئەوانـە چین؟ مسعوود گوتی, ئا, بـەڵێ ئەمانـە نامـەی کاربەدەسـتانی بەعـسی سووسیالیـستی عەرەبی, ئەفسەرانی سپا و جاشانە. (کوردی بەکرێ گیراوی چەکداری حکوومەتی بـۆ پەست کردن پێیدەگوترێ جاش.) ئەم نامانـە نیـشانیان دەدا کـە لایـەکـەم جاشـەکان پێیانخۆشە بەر لـە زیان و زەردەی زیاتر بگرن. نیگەران بوون کە سـەددام لـە شـەڕدا تێبشکێ و ئەوان بۆ پێشمەرگان بـەرەڵلا بکـا. مەسـعوود گـوتی تـەواوی ئـەم نامانـە بەیعەت کردنە بە پێشمەرگان و نووسندەکانیان بەڵێن دەدەن کـە لــە وەختـی خۆیـدا یارمەتی پێویست دەکەن. وا دیاربوو کە ئەو, ئەم دەربڕینانە — ئەگەر زۆریش جێباوەڕ نەبن — بە شتێکی ئاسایی دەزانێ. گوتی ئەمە کـردەی بەرژەوەندخوازانەیـە دەیکـەن و نەخشەیەکە بۆ داهاتوو, بۆ ئەو کاتەی ئەگەر هات و سەددام ڕووخا, دایدەڕێژن.

لـە ڕاستیدا ئەم نامانە ئاکام و دەسکەوتی چەند مـانگ چـالاکی ورد و پەنامـەکی بوو. لـە دەسـپێکی هێرشـی ئێراقـەوە بـۆ سـەرکووەیت, کادرەکـانی پـەروەردەکراوی نەهێنیکار بە مەبەستی نەرم کردن و هێنانە سەر ڕێی کاربەدەستان, خزانە شارەکانەوە. تێکۆشانی سەخت و شێلگیرانە و پڕ مەترسی ئەم کادرانە لـە پایز و زستانا بوو بە هـۆی پێکهاتنی بواری ئەوبارەوبار بوونی جاشان و ڕوو وەرگێڕانیان لـە حکوومەتی ناوەندی و داگیرکردنی هاسان و بێ لـەمپەر و بەرگری بنکـە و قـەڵاکانی سـپای ئێـراق و شـار و شارۆچکەکان, ئەویش بە جۆرێ کە تەنانەت بـارزانی و گەڵاڵەرێـژانی سـەرکردایەتی لـەم سەرکەوتە کوتوپڕ و سانایە تەواو سەریان سوڕما. بە سرنجدان بــە هــەڵگران و تەنینەوەی ئەو ئاورەی داگیـرسان و بڵاوبوونەوەی یەكبــوو, ڕادەی قازانــجی ئــەم چالاکییە نەهێنییانە بە دروستی دیاری ناکرێ. بانگەوازی یەکێتی نیشتمانی کوردسـتانی تاڵـەبانیش بۆ "ئاشتی نەتەوەیی" کە شتێکی زیاتر لـە لـێخۆش بوونی گشتیی دەگرتەوە, کردەوەیەکی زیرەکانە بوو و بێشك ڕێی زیاتر بۆ ئەم کارە خۆش کرد. ئەم ڕاپەڕینە لـە شارۆچکەی ڕانیە لـە نیزیك سنووری ئێرانەوە دەستی پێکرد و کـوردان لــە مـاوەی دە دوازدە ڕۆژاندا بە دانی کەمترین خەسارەت, زۆربەی کوردسـتانیان گرتـەوە, ئـەویش

زۆر زیاتر لە پێشوو. لێرەدا ئەوە جاشەکان بوون کە بە داگیرکردنی خێرای ڕانیە ئاورگی ڕاپەڕینیان هەڵگراند. جاشەکانی تەواوی کوردستان کەوتنە شوێن ئەم کارە, لە حاڵێکا هێزەکانی پێشمەرگە بە سرنجدان بە ناخۆش بوونی لەپڕی ئاو و هەوا لەم وەرزەدا, ١٠ تا ١٥ی مارسیان دیاری کردبوو بۆ ڕاپەڕین.

جگە لە چەند هەڵکەوتی بەرچاو, تەنانەت لە شارەکاندا هاسانتر لەوەی کە بیری لێدەکرایەوە ڕووداوەکان قەومان. سلێمانی کە پێتەختی ڕووناکبیریی کوردستانی ئێراقە, بە ڕاپەڕینێکی لەپڕ گیرا؛ ئەگەرچی دوو ڕۆژی پێچوو هەتا خەڵك و پێشمەرگە توانیان بەسەر تاقمەکانی موجاهیدینی خەڵقدا کە بە توندی بۆ پاراستنی حکوومەتی ئێراق شەڕیان دەکرد, زاڵ بن. ئەوکات خەڵك بەوپەڕی لەسەرەخۆیی نیزیکەی چوارسەد کەسیان لە کاربەدەستان و پۆلیسی نەهێنی کە لە بنکەی پاراستنا پەنایان گرتبوو, کوشت.[1] وە هەر حاڵ, هەر لە سەرەتای مارسەوە سەدان پۆلیسی نەهێنی و پیاوی بەعسی کە نەیانتوانیبوو دەرباز بن دە داو کەوتن و بە دیل گیران و بە دەستی ئەو خەڵکەی ڕێز و شەرافەتیان بە پای ئەوانەوە پێخوست کرابوو کوژران. بێگومان سلێمانی تەنیا شارێك نەبوو کە کوردان بێ ئەنجام دانی ڕێ و ڕەسمی یاسایی ئازاردەرانی خۆیان دەگوشت. لە هەولێر و دهۆکیش وەها تۆڵە ئەستاندنەوەیەکی گەلیی ڕوویان دا.

چوونە سوێی بنکەی پۆلیسی نەهێنی سلێمانی ئەم مەبەستەی باشتر ڕوون و شی دەکردەوە کە بۆچی کوردان خۆیان بەڕێوەبردنی دادپەروەرییان گرتە دەست. دەرانەی سامناکی ئەم ناوەندە کە بە وێنەی چاوێکی درنجاوی و چاوەدێر ڕازاوەتەوە, بە مانایەکی قووڵ, وەك یادگاری خراپەکاری, پاك نەکرابوویەوە. ئەم بنکەیە گەلێ

---

١– نامەی یەکێك لە شاهیدانی ڕووداوەکانی سلێمانی تیا هاتووە: "جەماوەر لە ٨ی مارسی ١٩٩١دا لە سلێمانی قوربانییەکانیان بە تۆڵەی ئەوەی لە هەڵەبجە و شوێنەکانی تر ڕووی دابوو ونجڕ ونجڕ کرد، هاواری قوربانییەکان دەگەیشتە تەشقی ئاسمان, بەڵام خەڵك ڕوحم و بەزەیی سەبارەت بەم تاقمە لاڕێیە نیشان نەدەدا. ٧٠٠ کاربەدەستی پاراستن و ئەندامی حیزبی بەعس لە ئاخرین پەلامارا بۆ سەر بنکەی پاراستن کوژران. ئەوان کە گیانیان لە شەڕ قوتار کردبوو, لەڕێوە بە دەستی ئەو کەسانەی بۆ کوشتنیان چەقۆ و مشاریان هێنابوو, کوژران, لە حاڵێکا دەگریان و دەیانزیڕاند."

ژوورۆچکەی بێرۆچنەی لێ‌هەڵخرابوو, دار و دیوار شەتلانی شۆڕاوگەی خوێن و جەڵتە بوو, ئاسنی تێژکراوی چەقیو, چنگڵەی قەسابی, کابل و ئامراز و کەرەسەی ئەشکەنجە خۆیان دەنواند. بینایەکی تایبەت کە دەیانگوت بۆ دەسدرێژی بە کیژانی کورد تەرخان کرابوو, دەهاتە بەرچاو. دەربیچەگەلێ لە تەرکی ژوورەکانا کە بەرەو دیوەکانی ژێرخان دەکرانەوە, دیار بوون. لەم دیوانەدا, ئەو کەسانەی وێنەدەرێیان گرتبوو, تاقمێ ژن و منالی ڕووت کراوەیان بە خنکاوی و نیوەماوی دۆزیبۆوە. دەستەیەك لەم زیندانییانە پتر لە دە ساڵ بوو کە لەم سیاچاڵانەدا بەند کرابوون.

بارزانی دواتر وەبیردێنێتەوە: "خەریك بووین نەخشەی گیرانەوەی هەولێرمان دادەڕشت, کە یەکێك گوتی: خۆ هەولێر گیراوەتەوە." وەها ڕووداوێك لە بازنە و دەسەڵاتی کۆنی چالاکی سەربازیی کوردانمدا نەبوو. تەنیا لە کەرکووك پێشمەرگە شەڕیان کرد و بەڕاستی چاکیشیان دەس وەشاند و ئەم کانگای نەوتەیان, کە لەمێژ ساڵ بوو مشت و مڕی لەسەر بوو, لە ٢٠ی مارسا بە دانانی سێ‌هەزار کوژراو گرتەوە. جێی سەرسوڕمان نیە کە لە چڵەپۆپەی ئەم شەڕە "بەراوەژوو"وەدا, تەنانەت مەسعوود کە پیاوێکی لەسەرخۆیە, وەها تووشی هەستبزووتن و ئۆقرەورووژاوی ببێ کە لە شاری کۆیە بەرەورووی خەڵکێکی شادمان بڵێ: "چرکەیەکی ئەمڕۆ تەواوی سامانی دنیا دێنێ." چەند ڕۆژ دواتریش هەر لە جەغزی ئەم هەستەدا بوو کە پێی‌گوتین: "ئاکامی حەفتا ساڵ خەبات ... ئێستا لەبەر دەستایە. ئەمە گەورەترین شانازی منە, ڕاست ئەو شتەیە کە بە درێژایی ژیانم چاوەڕوانی بووم."

ئەم فراوینەی کە لە مانگی فێوریەدا لەو بنکە کوێستانییە خواردبووم, ئەم دەرفەتەی لێی‌دەگەڕام بۆی ڕەخساندبووم. کاتێك شەڕی زەمینی دەستی پێکرد لە بارزانیم پرسی داخوا یارمەتیم دەکا بێمە کوردستان و هەواڵەکانی سەبارەت بەوێ بنێرمەوە؟ دەمزانی کە کوردەکانی ئێراق, بەتایبەتی ئەندامانی پارتی, بۆ یارمەتی‌دان و پاراستنی هەواڵنێران بەناوبانگن و ئامادەن سەریان بکەنە بەردەباز. سەرەڕای ئەمانە گەرچی نێوەڕاست مانگی زستان بوو, بەڵام داواکەم ئەشتەکی کەم نەبوو. مەسعوود لەوپەڕی شادمانی منا وڵامی دڵخوازی دامەوە. من قەت نەمپرسی بۆچی, لام وایە ئەمە

پێزانینێك بوو سەبارەت بەم سەفەرە سەختەی بۆ دیداری ئەو وە ڕێی خۆم هێنابوو. وەك من تێیگەیوم, کوردان هەر عەیبێکیشیان هەبێ, خەڵکێکی گەرموگوڕن و سەبارەت بەو کەسانەی حازرن لەبەر ئەوان و شانبەشانیان خۆ بخەنە مەترسی هەستێکی سەیریان هەیە.

بەم شێوەیە کاتێ شەڕی زەمینی لە ٢٤ی فێوریەدا هەڵگیرسا, من لە خاکی تورکیادا بە فرۆکە چوومە وان. لەوێ یەکێ لە کادرەکانی بارزانی هاتە دیدارم. وا دیار بوو بارزانی لە هەموو شوێنێ دەستی هەیە – پۆلیسی تورکیاش هەروەتر. شەو لە هوتێلێکی هەرزانبایی بنەگربووم و شەوەکی بە نێو بەفر و کرێوەدا بە سواری ئوتووبووس بەرەو باشوور کەوتمە ڕێ. پۆلیس پەیتاپەیتا چاوی لە پەساپۆرتی من و بەرگەی موسافیران دەکرد. ئەمە کارێکی ئاسایی و ڕۆژانە بوو. ئێمە ئێستا لە ناوچەیەکی بارناسکی نیزیك سنووری ئێران و ئێراق بووین کە پارتی جودایخوازی کرێکارانی کوردی تورکیا[1] – کە پتر بە ناوی پ‌ك‌ك ناسراوە – بنکەی پەروەردە و ڕاهێنان و تاقمی پشتیوانی لەوێ بوو. من تەنیا موسافیری غەوارەی ئوتووبووسەکە بووم و ڕوحم پێنەمابوو کە نەکا ڕامگرن و هەڵمپێچن و بمگێڕنەوە یان لەوی خراپتر.

تەنیا ئومێدم ئەمە بوو کە هەمیشە هەنگاوێك لە پۆلیس لە پێشتر بم. پۆلیسێ کە هەمیشە لە ڕۆژنامەنووسانی بەرەو کوردستانی تورکیا دووشکە. لە چلەی زستاندا خۆ بازەرگان و گەڕۆکی دەرەکی سەر و سۆراغیان نیە, من هیچ بیانوویەکی ئاوالەم بە دەستەوە نەبوو. پاش سێ سەعاتان گەیشتینە "یوکسەکوا" کە شارۆچکەیەکی خەمبار و دڵگیراوە و لەبەر ئەوەی کە ناوەندی قاچاغە ناوبانگێکی هەیە. لێرەش پیاوەکانی بارزانی بردیانمە میوانخانەیەکی بچووك و تێریان کردم و پاشان درگایان لەسەر گاڵە دام و گوتیان وەحەسێ هەتا دێینەوە. قەرار بوو شەو بکەوینە ڕێ و بە شاخاندا بچینە کوردستانی ئێراق. لێم ڕوون بوو کە پۆلیس ناسیومی و بە درەنگ گەڕانەوەی بارزانییەکان نارەحەت بووم. لای ئێوارە بە چەند هەواڵی ناخۆشەوە هاتنەوە: "لە

---

[1] – پارتی کرێکارانی کوردستان, (P.K.K). "وەگێڕ"

بەرزاییەکانی چیای زاگرۆس دوو گەزونیو بەفر باریوە, کە وابوو سەفەر پەکی دەکەوێ." وام هەست پێکرد بێتوو چاوەڕوانی ئوتووبووسی دواتر بم لەگەڵ پۆلیس تێكدەگیرێم, هەر بۆیە لێی سواری تاکسییەك بووم و خێرا لە شارۆچکە دەرباز بووم. کارێکی بەجێم کردبوو. لە گەڕانەوەمدا بۆ "وان" پۆلیس هەر نیوسەعات جارێك ئوتۆمبیلەکەی ڕادەگرت و دەیپرسی داخوا من هەواڵنێرەکەی تایمز نیم؟ چونکە من بە مانای ڕاستەقینە ئەوەی ئەوان دەیانویست هەو نەبووم, متەقم نەدەکرد و ئیزنی ڕۆینیان دەدام. دواتر بارزانی قەولی دا ئەم ڕووداوە لە پەیوەندی لەگەڵ خۆم و هاوکارانی هەڵبژاردووەمدا قەرەبوو کاتەوە. بارزانی بەڵێنی خۆی بردە سەر و وای کرد کە ئێمە یەکەم دەستەی هەواڵنێرانی ڕۆژاوایی بین کە لە سووریاوە بچینە خاکی کوردستانی ئێراق. بارزانی گفتی خۆی بردەسەر و وەفای پێکرد, بەڵام ئێستا کە لە پەنامانەوە شۆڕش پەرانپەران دەبوو, ئەو لوتفە دڵخۆشییەکی وەهای لە دوا نەبوو. تا ئەو کاتەی کە هەواڵی "بیبیسی"م لە سلێمانی بیست, سەفەرەکەمان بۆ کوردستان وەك تەواوی ئەو شتانە نەدەچوو کە تا ئەو کاتە دیبوومان: تێکەلاوێك لە مەترسی, ئازادی و ڕزگاری مەسیحایی و شادمانی. وام هەست پێدەکرد. ئەوەی کە ڕۆژهەلاتیەنیۆەڕاست بتوانێ بینوێنێ, دیتوومە. وەچەیەك پێشتر ژنانی سعوودیم لە فرۆکەی بەرەو ڕۆژاوادا بینیبوو کە بە چارشێوی ڕەش و درێژەوە دەچوونە ئاودەستی فرۆکە و بە مینیژۆپ و کراسی چەسپی لەشنوێنەوە دەهاتنەوەدەر. بەلام ئەم مەبەستە لە چاو شەوق و شادمانی عومەرسیندی لە کاتی گەڕانەوەی بۆ نیشتمانی, ئەشتەکی ئەوتۆ نەبوو. (عومەر سیندی کرێکاری ڕستوورانێکی بچووکی قەراخ شاری واشینگتۆن بوو.) عومەر کاتێك دوولینگەی بۆری لە پێی خۆی دامالی و کراواتی ئاوریشمینی لە ئەستۆ داڕنی و فانیلەی سپۆرتی دانا و لە باتیان پاتۆلی هەڵکێشا و جامانەی کردە سەر و پشتێندێکی لە پشتی هالاند کە لە تافی لاویدا و کاتی تێك شکانی ١٩٧٥ و هەلاتن لە کوردستان لە ماڵەوە جێی هێشتبوو, شادی و شادمانییەکەی وەها لێوەگری نواند کە ئێمەش لە وەختی پەڕینەوەمان بە سواری کەڵەکی پڕ لە بار و موسافیر بە ڕووباری خوڕێنی دیجلەدا و چوونمان لە سووریاوە

بۆ ئێراق, مەترسی خۆمپارەهاوێژەکانی ئێراقمان لـە بـیر بـردەوە. بـۆ لـێخورینی ئـەم کەڵـەکە, دوو تابلۆی ڕێنوێنیی سەر جادانیان کردبوویە سەوڵ.

بۆ ئاشنایەتی لـەگەڵ کوردستان چ شتێك لـەمە سرنجڕاکێشتـرە کە هەر بەریەبەیانی ڕۆژی گەیشتنە زاخۆ, لـە ماڵی یەکێك لـە سـەرۆك عەشـیرەتەکان بـە قرمـەی تـەپڵ و گۆرانییان کە هەر دەهات و نیزیك دەبۆوە, وە خەبەر بێی؟ ئەم بـەزم و ڕەزم و شـادییە بە بۆنەی هاتنی جێژنی نەورۆز, سەری ساڵی تازەی کوردانە و ڕێوڕەسـمێکی بەر لـە ئیسلامە و پێشوازییە لـە بەهار و هیوا.

بە چاوی خۆت هەوێنی مانەوەی کوردانت لـە ڕوخساری خانـەخوێ و کوڕانی‌ـدا بەدی دەکرد. "ئاغا"ی خانەخوێ, پیاوێکی بە قەڵافەت بوو کـە زۆر بـە بێخەیاڵییـەوە گوتی خاوەنی ١٢١ گوندە. ئەم پیاوە کوڕێکی نـاردبووە ڕیـزی سـپای ئێـراق, یـەکی دیکەی کردبوو بە جاش و یەکیشی کردبوو بە پێشمەرگە. هەرسێکیان لـە ماڵ بوون و لـە دیوەخانی گەورەی فەرشکراوا کە لـەم شـوێنانە هـەم ژووری شـێوخواردنە و هـەم هۆدەی دانیشتن و میوانان, لێی ڕۆنیشتبوون.

لـە ماڵ بوونی کوڕان بۆ ڕوون بوونەوەی ئەم مەبەستە یاریدەی دایـن و تێگەیـشتین کە بۆچی لـە زاخۆ سەدان کوردی چەکداری کەڵـەشینکۆف لـە شـان و دەمانـچە لـە قەد, بە شێوەیەکی سەرخۆش و شاد بە دەوری قوتابـخانەیەکی ناوەندی‌دا کـە بنکـەی سەرکردایەتی پێشمەرگە بوو, ڕاوێچکەیان دەکرد و بە چەپڵەڕێزان پێشوازییان کردین. زۆرێك لـەمانە ئەوجاشانە بوون کە کەوتبوونە ڕیـزی ڕاپـەڕین و بـەم کردەیـە شانـسی سەرکەوتنی ڕاپەڕینیان پێهەڵابردبوو, یانی بێتوو بە پێـچەوانە بوایـە بـەختی سـەرکەوتن زۆر کەم بوو. ئەوەی لێرە گرێوی لـەسەر کرابوو زۆر لـە "ئینتیفازە" گەورەتر بـوو کـە لـەبزێکی عەرەبییە بە مانای "لـەرزاندن" و کوردان بۆ پەسنی ڕاپـەڕین خواسـتبوویانەوە. لـە ڕاستی‌دا یەکێك لـە ماکە سـەرەکییەکانی سیاسـەتی "ئـاژاوە نانـەوە و حکوومـەت کردن" کە بە درێژایی سەدان ساڵ ئامرازی حکوومەتی حاکمان بوو, لێكهەڵوەشـــا بوو. کوردان و مێژوونووسان, هەرتك لـە کۆنەوە پاڵ وێكنـــەدان و دووبەرەکایـــەتی

نێوخۆیی بە هۆی چارەڕەشی خەڵكی كورد دەزانن و مەیلی ساز كردنی هاوبەندی لەگەڵ دوژمنانی دەرەكیشی لێ زیاد دەكەن كە بارتەقای خۆكوژییە.

هەر كوردێك دەتوانێ ئەم چەند شێعرەی حیماسەی "مەم و زین"ی ئەحمەدی خانی كە لە سەدەی هەڤدەهەمدا هۆنراوەتەوە, وەخوێنێ, كە شاعیر دەس دەكا بە گلە و گازندان لە دەس پرژ و بڵاوی و هەڤنەگرتن:

حاسل كو دنێ ب شویر و ئیحسان — تەسخیر دبت ژ بۆی ئینسان

ئەز مامە د حێكمەتا خودێ دا — كورمانج د دەولەتا دنێ دا

ئایا ب چ وەجهی مانە مەحرووم — بیلجوملە ژ بۆچی بوونە مەحكووم

***

ئەڤ ڕۆم و عەجەم بوان حسارن — كورمانج هەمی ل چار كنارن

هەردوو تەرەفان قەبیلێ كورمانج — بۆ تیری قەزا كرینە ئامانج

***

لەو پێكڤە هەمێشە بێ تفاقن — دائم ب تەمەررود و شقاقن

گەر دێ هەبوویا مە ئتفاقەك — ڤێكرا بكرا مە ئنقیادەك

ڕۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی — هەمیان ژمەڕا دكر غولامی

تەواو ڕوونە كە سەركەوتنی دەوڵەتانی هاوسا بۆ بە چۆك داهێنانی شۆڕشی كوردان دەگەڕێتەوە سەردابین كردنی پووڵ و چەكوچۆڵ و پشتیوانی سیاسی بۆ عەشیرەتان و ڕاست كردنەوەیان بە دژی یەكتر. لە كوردستانی ئێراق ئەم دوژمنایەتی و عەداوەتانە هێندە قووڵ و ڕیشەدار بوون كە تەنانەت پاش زەماوەندی عەشیرەتیش كە بە مەبەستی "خوێن‌كوژانەوە" دەكران, نەدەبڕانەوە. بۆ وێنە دایكی مەسعوود بارزانی كە خاتوونێكی تەواو جێی‌ڕێزە, زێبارییە. تەواوی عەشیرەتی زێباری جگە لە تاك‌وتەرایەك, بەردەوام و شێلگیرانە دژایەتی بارزانییان دەكەن و هاوپەیمانێكی توند و تیژی سەددامن. بەر لە ئێستاش هاوكار و هاودەستی حكوومەتی پاشایەتی و هێزەكانی بریتانیا بوون كە لە لایەن كۆمەڵی نەتەوەكانەوە بە دەمڕاستی ئێراق دەناسرا. زۆر پێشتریش پیاوی حكوومەتی عوسمانی بوون.

بارزانی و تەواوی ئەندامانی "بەرەی کوردستانی" خۆیان بە ئەمەگداری جاشان دەزانی و لێی حاڵی ببوون کە پێویستە دڵنوایی بکرێن و ڕابردوویان وەڕوو نەهێننەوە. هەر ئەو ڕۆژەی کە دژەهێرشی ئێراق بۆ گرتنەوەی کەرکووک دەستی پێکرد, بارزانی کۆبوونەوەیەکی یەکڕۆژەی لە باشترین هوتێلی هاوینەهەواری شەقڵاوا پێکهێنا. گردبوونەوەیەك بوو بە مەبەستی وە خەبەر هێنانی ویژدانی گشتیی و سەرۆك عەشیرەتەکانی بانگێشتن کرد. سوورچی, برادۆستی, هەرکی و تەواوی هۆزەکانی هاوپەیمانی پێشووی بەغدا پۆل پۆل بە دووی یەکدا جەللە بوون و هاتن و بە ئامێزی گەرم و ئاوەڵاوە پێشوازییان لێ‌کرا. تاوانەکانی پێشوویان چاوپۆشی لێ‌کرا و پەسنی کردەی ئێستایان درا و هیوایان خواست کە بۆ پاراستنی کەرکووك یاریدەی شۆڕش بکەن. وایان دانا لەوی بەولاوە لە جیاتی جاش بە "شۆڕشگێڕانی چەکدار" ناودێر بکرێن. عومەر سوورچی بەڵێنی دا شەش هەزار تفەنگداری بنێرێتە بەرەی بەرگری کردن لە کەرکووك: "پیاوەکانم بە سەرکردایەتی کوڕەکەم دەنێرم."

پرسیم چلۆنە توانیویەتی وەها وەرسووڕانێکی گرینگ بکا؛ خۆ هەتا ئەم ئاخرییانە چەکدارەکانی هاوپەیمانی پتەوی سەددام بوون و چەشنی چاووگوێی سپای ئێراق خزمەتیان دەکرد و پێشمەرگەیان دەگرت و دەیانگوشت!؟ ئەو وڵامێکی تێکەڵ پێکەڵی سەبارەت بە شەڕی سارد تێك‌خستەوە. وا دیار بوو نەیتوانیبوو لە چۆنیەتی سەرکەوتنی "هاوبەندی" هاوپەیمانان بۆ ئازاد کردنی کووەیت حاڵی بێ, کە دەگەڕایەوە سەر تێك‌شکانی یەکێتی سۆڤیەت لە شەڕی ساردا. ڕووس ئەوەندەی پێویست بە پاڵپشتی ڕۆژاوا بوو کە پشتی ئێراقی هاوپەیمانی بەردابوو. وڵامێکی ئەو دایەوە نیشانەی بێ‌خەبەرێکی قووڵ بوو کە زۆربەی کوردانی گوندەکی بە جاش و پێشمەرگەوەی دەگرتەوە. ئەم کۆمەڵانە هێندە لە چیا و چۆلان ماونەوە کە ئیدی گوێیان بەوە نابزوێ بێن و خۆیان لەگەڵ ئاڵوگۆڕی ڕووداوەکانی دنیای دەرەوە ڕێك خەن. دیار بوو سوورچی بێ‌باوەڕی منی سەبارەت بەم وتانە هەست پێکردووە و هەر بۆیە باسەکەی گۆڕی. وتی: "ئێمە دەزانین ڕۆژاوا پاڵپشتی کوردانە نەك ڕۆژهەڵات. ئیدی ئێمە هەڵەی ڕابردوومان دووپات ناکەینەوە." بەڵام چونکە زانی شی‌کردنەوەکەی لێڵ و

ناتەواوە, لە کاتێکا وێڕای پارێزەری شەنگ و خۆشقەلافـــــەتی کۆبوونـــــەوەی جێدەهێشت, بە دەنگی بەرز پەیامی خۆی ڕاگەیاند: "ئێمە پێویستمان بە یاریدەی وڵاتی ئەمریکایە." تاوێك پێشتر مەسعوود پەیامی خۆی دووپات کردبۆوە و داوای لە تەواوی دژبەرانی ئێراق کردبوو, بێنە کوردستان و دەوڵەتی ئەمریکای بە خاتری ئەوەی باڵەفڕە تۆپدارەکانی ئێراقی بەرناداتەوە, بە توندی مەحکووم کردبوو.

لە سەرانسەری کوردستاندا هەست و بیرێکی وەها و هەندێك جار جیاواز لەمە لە زانیاری ڕێبەران و خەڵکی ئاساییەوە هەڵدەقوڵی. یـەکێك لــە شـاعیرانی دهـۆك لــە هۆنراوەیەکا بەڵێنی دەدا کە "ئاغای بووش لــە بنجـی موویـەوە ڕامووسـێ" ئەگەرچـی ناسکی و جوانی ئەم خوازەیە لە وەرگێڕاندا تێدا دەچێ, بەڵام هەرچۆنێك بـێ شـۆر و شەوقی شاعیر بـە جـوانی دەردەخـا. نووسـەرێکی خوێنـدەواری سـلێمانی دەیگـوت, ئۆگریی هاوبەشی نێوان ئەمریکایی و کوردان "زەماوەندێکە" کە "مارە"یان لە ئاسـمانان بڕیـوە. چـونکە ئێمـە نەوتـــمان هەیـە و دیموکراسـیمان دەوێ و ئێـوە لــە ئـەمریکا دیموکراسیتان هەیە و نەوتوو دەوێ." وێنەی ڕێبەرانی نەتەوەیی کوردستان کـە لـەمێـژ بوو دیتنیان بەربەست کرابوو, لە ئاوێنەبەندی شەقامەکانی سلێمانیدا ڕیز کرابـوون و خەڵکێکی زۆریان بۆ لای خۆیان ڕاکێشابوو. پلەی شانازی تایبەت درابوو, بە ژێنێـراڵ بارزانی مەزن, باوکی مەسعوود. لە یەکێك لە سـینەماکانی هـەولێر بینـەرانی تامـەزرۆ ڕۆژێ شەش جار تەماشای فیلمێکی ویدۆیی هێرشی بۆمبارانی شیمیایی ئێراقیان بۆ سـەر هەڵەبـجە دەکرد کە فیلمبەردارێکی ئاسـایی هـەڵیگرتبۆوە. لـەم سـەردەمەدا فیلمـی ئاگاداربوون لە کردەی "بەربەند کراو"ی سەرکوتی دەوڵـەتان مەبەسـتێکە و دیتنیـشی مەبەستێکی تر. بەڵگەی بەرچاوی ئەم شەڕەنگێزییەی لە گێڕانەوە نایا, لەو ڕادەیەشدا شتێکی خەیاڵاوی و بێبنەڕەت نەبوو, چ بگا بەوەی کە بڵێن لە گێڕانەوەی پەیتاپەیتادا زۆرشتیان پێوە ناوە.

ئــەم فکــرەی کـــە لایـــەنی سەرنـــجی دابـــووە ســـەر سڕینەوەیـــشوێنەواری چەوسانەوەکانی ڕابردوو, هەنووکە ترس بۆ ژیـان و مـان لــە گـەڕیانی ئـەو ماوەیـەی خراپترین ڕەوین لە درێژەی تێکشکانە مێژووییەکانی کورداندا خـۆی دەنوانـد, لـــە

نـموودی خست. شتێ کە تاڵایی ئەم سەرلـێشێوانەی پتر دەکرد هەر ئەم بێدارییە بـوو کە لـەم سێحەوتووە ئازادییەڕا سەری هەڵدابوو. ئـیتر هـاواری "حـاجی بـووش!" کـە هەواڵنێرانیان پێ بەخێرهاتن دەکرد, بنـەی براـوو. ئـەم تامەزرۆییـەی کـە کـوردان سەبارەت بە بووش دەیاننواند, ببوو بە هۆی سەرسـوڕمانی هـەواڵنێران. بـووش داوای لەم خەڵکە کردبوو شەڕ و گەڕی سـەددام خاشـەبڕ بکـەن و پاشـان بـۆ سـەرکەوتنی ڕاپەڕینیان چی نەکردبوو. ئێستا کوردان بە قەڵسی غەوارە سـست و بێخاسـیەتەکانیان تاوانبار دەکرد کە دیسانەوە ئەوانیان بە هەویای هەوا و هەوەس و تۆڵە ئەسـتاندنەوەی بەغدا خۆڕایی کردووە. ئێـستا لـەپڕ هـەموو دەیـانتوانی قـسە نـەجووراوەکانی ڕۆژی پازدەی فێوریەی بووش, وشە بە وشە دووپات کەنەوە و دەیـانکردەوە کـە ئـەوانی بـۆ ڕاپەڕین هان دەدا. تاقمی ABC کە تێکۆشا بوون پـاش گیرانـەوەی کـەرکووك لـەو شارە نیزیك بنەوە, ڕووداوی تاڵ, بـەلاَم شـیاوی لـــێ حـاڵی بـوونی نێـوان خۆیـان و شەرکەرانی کوردیان دەگێڕایەوە کە هەتا دوێنێ دۆستیان بوون.

تەنانەت ئەگەر کوردان خۆشیان پێیاننەگوتباین — هەڵبەت یەکێ لـە دڵبزوێنتـــرین تایبەتـمەندییان ئەمە بوو کە هیچیان لـێنەدەشاردینەوە — هیچ پێویست نەبوو تا کلاوز ویتس (ژێنێراڵی پرۆسی، ١٧٣٠ – ١٨٣١) کەسـێکی وابـێ کـە تێبگـا پێـشمەرگە شەرکەرانی خۆفناکن, هەڵبەت تەنیا کاتێك لـەگـەڵ دوژمنێکـی ورە دۆڕاو بـەرەوڕوو بن. پێشمەرگە چەکی پێشکەوتە و دژیتانك و فڕوکەیان نەبوو. ئەم تانکانەی لە سپای ئێراق بە خەنیمەت گیرابوون, تەقەمـەنییان نـەبوو, کەسـیش نەیـدەزانی سـپای ئێـراق تەقەمەنی لـە کوێ حەشار داوە. تۆپچی ئێراقی لـە ماوەی پاشەکشەدا دەرزی تۆپەکانیان دەرهێنابوو. کوردان ناچار بوون بۆ بەربەرەکانی لـەگـەڵ تانـك و زرێپۆشـان هـەر لــە نارنـجۆکهاوێژی کۆنی خۆیان کەلك وەرگرن. چەند مووشەکی سـام ٧ی دەسـکاری یەکێتی سۆڤیەتیشیان هـەبوو, بـەلاَم قـەت لـەگـەڵ ئـەو مووشـەکە "ئیـستینگێر"انـەی ئـەمریکا, کـە دابـوونی بـە ئـەفغانیان و فڕۆکـە و باڵــەفڕی یـەکێتی سـۆڤیەتیان پـێ بەردەدانەوە, بۆ پێکگرتن نەدەبوون.

هێزەکانی پیادەیان نەیاندەتوانی کار بەم چەکە قورسە بـە کەلکانـە بکـەن کـە لــە سپای ئێراقیان بە خەنیمەت گرتبوو. ئەمەش ئاکامی سیاسەتی لەمێژینەی ئێراق بوو کـە کوردی لـە فێربوونی کـارکردی چەكوچـۆڵی سـپا دوور ڕاگرتبـوو. گۆیـا یـەکێ لــە سەرکردەکان پێشنیاری کردبوو کە لـەم کادرانەی لـەشکریی کە هاتوونە ڕیزی شۆڕش بۆ ڕاهێنانی کوردان و فێرکردنیان لـەم بوارەدا کەلك وەربگیرێ, بـەڵام ئـەم ئیـشە لــە پلـەی یەکەما نەبوو. کوردان خاوەنی ئەزموونی بەڕێوەبردن و ڕاگرتن نـەبوون. خۆیـان پێیان لـێدەنا کە پێـشمەرگە پـسپۆڕی شـەڕی چـیا و چـۆڵن و بـۆ شـەڕی نێـو شـار ڕانەهاتوون؛ دیارە ئەگەر ڕاهاتبان ڕەنگە توانیبایان شارەکانی دەرە و دۆڵان کە گـەلێك جار بە بێ کوێرەوەری دەستیان بە سەردا گرتبوونەوە, ڕاگیر بکەن.

بـەڵام لاوازی هێـزی پێـشمەرگە لــە جێیـەکی تـر بـوو, کوردەکـان سـەرەڕای هەڵێنانەوەی هەنگاوی بەپارێز لـە دەسپێکەوە, هێزی دوژمنیـان بـە کـەم دانـابوو, زۆر کـەمتر لــەوەی کـە هــەبوو. هێزەکـانی ورە دۆڕاوی سـپای ئێـراق و تەنانـەت تیپـە هەڵبژاردەکانی گاردی کۆماری, هەر لـە داگیرسانی شەڕ و ڕوووەرگێڕانـی جاشـەکان لـە سەددام, لێكهەڵوەشابوون. بە قسەی خودی کوردان پەنـجاهەزار کەسیان بە دیـل گرتبوو کـە زۆربـەیان ئـەو سـەربازانە بـوون وا چـەکیان دانـابوو و هاتبوونـە ڕیـزی پێشمەرگان. کوردەکان هەندێك ئەفسەر و دەرجەداریان ڕاگرتن و هـەروەك ڕابـردوو زۆربەی دیلـەکانیان ئازاد کرد و سەریان لـە پـلاو و گۆشـت نـەگرتن. بـەڵام هەرکـە سەرخۆشی سەرکەوتن کۆتایی هات, ڕوون بۆوە خەڵکێ ئاسایی کە لـە کەرکووکـەوە ڕایانکردووە, سەبارەت بە هێـزی یارمەتیـدەر کـە بـەرەو بـاکوور بـەڕێوە بـوون, لــە سەرکردەکانی هاونیشتمانیان زانیارییان زۆرترە و بەم پێیەش نیگەرانترن. چوار ڕۆژ بـەر لـە گیرانی کەرکووك, کاربەدەستانی غەیرە نیزامی دایاننابوو کە نیزیکەی بیست هـەزار کەس لـە هێزەکانی ئێراقی بـە گـاردی کۆمارییـەوە بـەڕێوەن هـەتا خـۆ بگەیەننـە ئـەو چاردەهەزار کەسەی هەروا لـە چەند بەشی بنکەی خالیدی بنی وەلید مابوونەوە.

هەر ئەو شەوە لـە ناوەندی سەرکردایەتی لـە سەلاحەددین, نۆشیروان مستەفا ئەمین, جێگری سەرکردایەتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان, گوتی ئـەم بـەراوردەی خـەڵکی

زۆریان پێوەناوە و جێی باوەڕ نیە و دەگەڕێتەوە سەر ڕەشبینـــی. ئـــەو لەســـەر ئەمـــە پێداگربوو ئەگەر تەنانەت کەرکووکیش لە دەس بدەنەوە, هێزی پێشمەرگە دەتوانن لە مەتەریزەکانی داوێنی گرد و لاباسکی باکووری شارەوە – کە شانبەشانی ڕێی هەولێرە – پێشی تانکەکانی ئێراق بگرن. (ئەو زۆر دواتر لە لەندەن بە منی گـوت: بـە ڕاسـتی من هیچ لام وانەبوو سەددام حوسێن بتوانێ هێزێك بـە قەدرایـە لەشـکرێکیش بنێرێتـە کەرکووك.) ئەمریکایی گوتبوویان کە هێزە چەکدارەکانی ئێراقیان تەفروتونا کـردووە. کورد ئەوەندەی بۆیان کرابوو لە بنکەی نوێنەرایەتی دەرەوەیانەوە لەم بارەوە تویێژینەوە و لێکۆڵینەوەیان کردبوو. نۆشیروان وە بیری دێنایەوە کە: "ئێرانی, سووری, سعوودی, فەڕانسەوی و ئینگلیسی تێکڕا دەیانگوت کە هاوپەیـمانان ٤٢ لەشکری ئێراقیـان, بـۆ وێنە گاردی کۆماری و هێزی ئاسـمانییان تێك‌وپێك شکاندووە." ڕایەڵـەی سـیخوڕانی کورد لە نێو هێزە چەکدارەکانی ئێراقیش‌دا, تێك‌شکانی سپای ئێراقیان زیاتر لـە ڕادەی ڕاستەقینە بەراورد کردبوو.

حەقیقەت ئەمەیە کە سەددام حوسێن تـەواوی هێزەکـانی کـە پاڵپـشتی دەسـەڵاتی بوون, نەیبردنە سەر کووەیت و ڕێکخستنی پۆلیسی‌نەهێنی و گـاردی کۆمـاری هـەروا مانەوە. سێ ڕۆژ بەر لە گیرانەوەی کەرکووك لە لایەن سپای ئێراقـەوە کاربەدەسـتانی لەشکریی ئەمریکا دانیان بەمەدا هێنا کە "ژمارەی تانك و زرێپۆشەکانی ئێراقـی کـە بـە ساغی دەرچوون, زۆر زیاتر لـەوەن وا لە پێشا ڕاگەیەندراوە ..." ژێنێراڵ ئـێچ, نۆرمـەن شوارتسکۆف, سەرکردەی ئەمریکایی هێزەکـانی هاوپەیـمان دوو ڕۆژ دواتـر گـوتی: "ئەگەر شەڕ بیست و چوار سەعاتی زیاتر درێژە کێشابا, دەمانتوانی خەسارەتی قورسیان لـێ بدەین." هەڵبەت بڵێی داخوا مەیل بۆ تێداچوونی سپای ئێراق ڕەنگدانەوەی شـێوە بیرکردنەوەی ئەمریکا بووبێ یان نا, قسەی لەسەرە. شـێوەی لـەرزۆك و بێ‌دەربەسـتی هەڵوێستی دەزگای دەولـتیی ئەمریکا لە مـانگی مارسـا, تەنانـەت گریـمان چـش لـە گۆڕێ‌دا نەبووبێ, دیسانیش قسەی ئەو کەسانە دەسەلـمێنێ وا بەم ئاکامە گەیبوون کە واشینگتۆن – سەددام حوسێن بە یەکێك لـە هۆکـارە گرینگـەکانی هێمنایـەتی ناوچـە دەزانێ – گەڕاوەتەوە سەر سیاسەتی بەر لە ساڵی ١٩٩٠.

تەواو هەروەك مەسعوود بارزانی پێشبینـی کردبـوو, سـەددام حوسـێن لاواز بـوو, بەڵام کوردان لاوازتر بوون. تەنانەت ڕاپەڕینی شیعەکان کە دروست پـاش ئاگربەسـتی یەكلایەنەی هاوپەیـمانان لـە ٢٨ی فێوریە, لـە خوارووی ئێراق هەڵگیرسا, بە قازانـجی سەددام حوسێن تەواو بوو. نیزامییەکانی ئێراقی کـە لـە پرکێـشی و تونـدڕەوی سـپای "بەدر" تۆقیبوون, لـە بەسرە بۆ پشتیوانی سەددام حوسێن ڕاست بوونەوە. (سـپای بـەدر بریتی بوو لـەم دیلـە ئێراقییانەی لـە ماوەی شەڕی نێوان ئێران و ئێراقا بۆ ماوەیـەکی زۆر لـە ئێران مابوونەوە و لـە درێژەی مانەوەیاندا کەوتبوونـــە ســـەر ڕێبـــازی ئیـــسلامی بنیاتـخواز و پاشان لـە سنوورەوە ئاودیوی ئێـراق کرابـوون.) دیـــمەنی پـەلاماردەرانی سپای بەدر کە وێنەی خومەینییان ڕادەوەشاند, ئەو ئەفسەرە ئێراقییانەی کە زۆربەشـیان شیعە بوون و چووبوونە ڕیزی خۆپیشاندەران, وەخۆ هێنایەوە. قەت تەواوی شیعەکانی ئێراق هاومەراقی ئیسلامی شۆڕشگێڕی هاومەزەبانی ئێرانییان نەبوون. هەر لـە سـەرەتای ساڵی ١٩٨٠وە ئەم خەڵکە لـە شەڕ دژی ئێران هەزاران کەسی کردە قوربانی سـەددام حوسێن. ئێستا زۆرێك لـەم ئێراقییانەی هەرگیز نەبوونە ئەندامی لیژنەی دەسەڵاتدارانی کەمینەی سوننی مەزەبی وڵات, هەرچـەند بـە نابـەدڵیش, بـەڵام لـە ترسـی ڕاپـەڕینی شیعەکان و داهاتووی ئاڵۆزی ئەم هەڵوێستە, پشتیوانییان لـە سەددام حوسـێن دەکـرد. لـە نێوەڕاستی مانگی مارسا ئیدی ئەوەندەی ڕێ دەس هەبوو کە باداتەوە سـەرکوردان. پاشـماوەی هێزەکانی ئێراق لـە ماوەیەکی کەمتر لـەوەی کوردسـتانی تێـدا ئـازاد کـرا, سەرلـەنوێ وێندەرێیان گرتەوە.

کوردەکانی ئێراق تێشکان و — کۆڕەوە — ی خۆیان دەخەنە ئەستۆی تەمای ورد و باریکی ئەمریکا بۆ نەخستنە خوارەوەی باڵەفڕە تۆپدارەکانی ئێـراق. پێـنج سـاڵ دواتـر جۆرج بووش لـە دیـمانەیەکی تلـەفیزیۆنیدا کە خۆی ناوی نا "کەپـەنکی پـاش بـاران" وتی: "هاوپەیـمانان دەیانتوانی بۆ بێهێز کردنی سەددام حوسێن چـالاکی پـتر بنـوێنن." بووش ڕێوڕاست پێی لـێنا کە دەبوو ئەمریکا حەسـار و گوشـاری زیـاتری خـستبایە سەر فڕینی باڵـەفڕەکانی ئێراق. ئەم شێوە بیر کردنەوەی کوردان ڕەنگە بگەڕێتەوە سـەر سـافیلکە بـوون, بـەڵام هەرچـی بـێ، بـوو بـە "بڕوایـەکی" پتـەو. خـودی ژێنێـڕاڵ

شوارتسکۆف گوتی لە دەسپێکی وتووێژەکاندا ئێراقی "فریو"یان داوە و ئیزنی فڕینی باڵەفڕیان لێخواستووە. فڕینی باڵەفڕی بێچەك لە چوارچێوەیەکی دیاری کراوا و تەنیا بە مەبەستی دابین بوونی پەیوەندی. کوردان دەپرسن باشە وەختێك سەرکردەی هێزە هاوپەیمانەکان زانی فریو دراوە, بۆچی نەیویست تۆڵەی ئەم فریوە بکاتەوە و باڵەفڕە تۆپدارەکانی ئێراقی کە خەڵکی بێچەك و پێشمەرگەی کوردیان بێجیاوازی دەدا بەر دەسرێژ, بخاتە خوارەوە؟ ئەگەر ئەو جۆرە بووبێ کە ئەم کەسانە دەڵێن, زۆر سروشتییە کە ئاکامی ئەم خەڵەتان یان هەڵەیە – ئەگەر هەڵەیەك کرابێ – خێرا پێیان گەیوەتەوە لایان: ئێمەی هەواڵنێر کە دەسمان بە دنیای دەرەوە ڕانەدەگەیشت و تاق کەوتبووینەوە, بۆ حاڵی بوون لە چۆنیەتی ئەو چالاکییانەی لە واشینگتۆن و پایتەختی هاوپەیمان لەم بوارەدا دەکرا, تەنیا دەمانتوانی سەر بەرین بۆ شك و گومان و هەواڵەکانمان بە تەتەردا بنێرینە ئێران بەو هیوایەی ڕەوانەی شوێنی مەبەست بکرێن.

ئەوەی بە بڕوای ئێمە ڕوون و بێگرێ دەهاتە بەرچاو, ئەمە بوو کە ژێنێڕاڵ شوارتسکۆف یا هەر کەسێکی تر لە واشینگتۆن کە دڵەخورپەی کوردانی بوو, بێشك دەیزانی کە باڵەفڕە تۆپدارەکان خراپترین هۆی ترس و خۆفن و دەتوانن خەسارێکی گەورە بگەیەننە خەڵکی ئاسایی و شاران وە سەر چۆڵی بگێڕن و جەماوەر بتۆقێنن. باڵەفڕەکان کە گرینگترین چەکی دژی پارتیزانین, لە نێو "دیمۆنۆلۆژی[1]" کورداندا خاوەن شوێنێکی تایبەت بوون. چونکە هەر ئەم باڵەفڕانەیان زۆرجاران لە مەودای شەڕ لەگەڵ ئێرانا و پاشان شانبەشانی فڕۆکە و مووشەکهاوێژە چەند لوولەکان لە هێرشی شیمیایی دژی کوردان دەکار هێنابوون. هەڕەشەی ئەمریکا لە فڕۆکەکانی ئێراقی کە "مادام بفڕن دەخرێنە خوارەوە." بۆ سڕینەوەی ئەم بیرەوەرییانە ناتەواو بوو. شوارتسکۆف و ژێنێڕاڵەکانی هاوپەیمانان هەمیشە دڵەڕاوکەیان بوو کە نەکا ئێراق لە چەکی ژەهژاوی دژی هێزەکانیان کەڵك وەربگرێ; ئەگەرچی سپای هاوپەیمانان بە ئامرازی دژی شیمیایی تەیاریش کرابوون. گەلاڵەڕێژانی لەشکریی و غەیرە لەشکریی

---

١- Demonology، دێوناسی، (هۆی خۆف).

هاوپەیمانان, زۆر بە هاسانی چاویان لە حاند وێنەی ترسێنەری ئەو خەڵکەی لە هەڵەبجە کەوتبوونە بەر پەلاماری شیمیایی و مردبوون نووقاند؛ هەروەها گۆڤار و ڕۆژنامەکانی تەژی لە وتەی ئەو شێستوپێنج هەزار کوردەی لە ترسی هێرشی شیمیایی ئێراق لە ئووتی ١٩٨٨دا بازرە ببوون و پەنایان بردبووە بەر تورکیا, خستە پشتگوێ. ئەو سەردەمی کۆمەڵی نێونەتەوەیی هەر چەشنە تێکۆشانێکی بە مەبەستی ڕاگرتنی ڕشتنی خوێنی کوردان یا هەڵپێچان و لێپرسینەوە لە سەددام حوسێنی لەگەڵ تێکشکان بەرەوڕوو کردبوو. (هەر چەند ئەم هەڵوێستە نەیتوانی ڕێ لە بووش بگرێ کە لە گەرمەی هەڵبژاردنی ١٩٨٨دا وێنەی قوربانیکراوانی هەڵەبجە لەبەرچاوی دەنگدەران ڕاوەشێنێ.) هەڵبەت ئەم سستییەی ڕۆژاوا بەر لەمە بوو کە بووش لە ١٩٩٠دا سەبارەت بە نەوتی کووەیت, بە بێ ئەوەی هیچ تەمایەك لەسەر سەددام حوسێن بگرێ "شەقڵی هاویشتە سەر ڕەڵمی بیابان."

لە سەر ئەرد, لە کوردستان, لە بابەت چالاکی باڵەفڕەکانەوە ئێمە چ پێویستمان بە بێسەلمان نەبوو. ئێمە لەگەڵ بەسەرهاتی ئەم گەڕیانە ئاشنا بووین. تەنانەت ئەگەر ئاشناش نەبووباین, هەر لەم هەوەڵ ڕۆژەی کە پێمان نایە کوردستان, تووشی هەر کوردێك دەهاتین بێپسانەوە ترسی خۆی دووپات دەکردەوە. لە دهۆك دیمان کە کوردان بە ڕەشاش و نارنجۆكهاوێژی مووشەکی تەقەیان لە باڵەفڕێك دەکرد و پاشان بیستمان کە چەند سەعاتێك بەر لە چوونمان یەکیان بەرداوەتەوە. هەروەها لە کەرکووك چوار باڵەفڕمان دیبوو کە پەلاماری هێزەکانی کوردیان دەدا. بەر لە دژەهێرشی ئێراقییەکان نۆشیروان و ڕێبەرانی دیکەی لەشکری کورد باسی توانایی باڵەفڕانیان لە تۆقاندنی خەڵکا, بۆ کردبووین، بەڵام هەروا پێداگر بوون کە پێشمەرگە دەتوانن خۆڕابگرن و خۆش ڕادەگرن.

کوردان هەتا ئاخرین ساتەکانی بەر لەم کۆڕەوەی کە لەم دنیا نوێیەدا خێرا وڵاتی دەتەنییەوە, وایاندەنواند کە باشترین هەلی جیهانییان وە دەس هێناوە. هەر نەبێ دەیانویست وەها شوێنێك لە بینەرا بەدی بێنن. کوردستان لە دوایین ساتەکانی بەر لە تێکچوونی, هێشتا بە شێوەیەکی غەریب لە پاکی و سەفایەکی قووڵا تلاوتلی دەکرد,

یان ڕەنگە ئەم کوردانەی ئێمە دەماندواندن, بە ئەرکی خۆیان دەزانی کە لە بەرامبەر یەکەم پۆلی ئەم ڕۆژاوایی‌یانەی پاش گەلێ ساڵ ئازادانە ویلدەکەوتن, خۆ شلۆی نەکەن ... بەڵێ ئاوان ئەو کوێرەوەرییانەی دەچنەوە سەر ڕزگاریی ناکاو لە پێدزکە و هەنگاوی بەپارێز لە ولاتێکی پۆلیسیدا.

هەر لە سەرەتای چوونمان بۆ زاخۆ, بەرەوڕوو بوونی کوردان لە هەر تاقم و چینێك لەگەڵمان, وەك ڕووبەڕوو بوون لەگەڵ کەسانێ بوو کە لە ئەستێرەی دیکەوە هاتبن یا ئەوەی کە کاراکتێری سینما یان قارەمانی وەرزشی بن.

– "دەتوانن بچنە هەر شوێنێکی کە پێتانخۆشە. هەرچێکی لە هەر کەسێ دەتانهەوێ بپرسن, بپرسن." ئەم تەکیەکەلامە غللوورانەیەی خەڵك لە بارودۆخێکا بوو کە پێیاندەگوت "پرۆستریکا"ی کوردی.

ئێمە ٢٨ی مارس, یانی لە هەینی پیرۆزا, بەر لە جێژنی پاك (ڕابوونەوە) گەییووینە سلێمانی. پێنج شەشێکمان لەگەڵ ئەندازیاران و بازەرگانانی پەروەردەبووی ڕۆژاوا شێومان خواردبوو کە لایان لە پەرۆشی ئێمە, سەبارەت بە لێكهەڵوەشانی ڕاپەڕین نەدەکردەوە. لە جیاتیان دوایین قودوولە ئابجۆی شاریان کۆ کردەوە و کردیانە جێژن و ژن و کچانیان هان دا کە باشترین جلوبەرگ بکەنە بەریان و زێڕ و زەمبەریان وە خۆ هەڵاوەسن. بە شەرمەوە ویستمان ئەوان لەم پەرۆشییەی خۆماندا سەبارەت بە "جەگەنات"[١]ی ئێراق کە بەرەو باکوور دەهاتە پێش و ئێمە لە کەرکوك هەواڵیمان بیستبوو, بەشدار کەین. پرسیمان داخوا کورد کاری چاکیان کرد کە پشتیان لە چیا کردەوە و دارڕژانە دەشتان و شارەکانی دهۆك, هەولێر, کەرکوك و سلێمانی و کوێ و کوێیان گرتەوە؟

خانەخوێیەکانمان دەیانزانی کە سەددام حوسێن لە سەرکوتی ڕاپەڕینی شیعەکانی باشوور بۆتەوە, بەلام بە ڕواڵەت ئەمە زەنگی مەترسی بۆ وەدەنگ نەهێنابوون. ئەمانە

---

١– Jagannath: لە خوایانی هێندوو, بتی جەگەنات کە زیاتر بە عارەبانەیەکی سەنگین ڕادەگوێزرا و گۆیا گیانبەختکەرانی ئەو خوایە خۆیان لە ژێر تەگەری عارەبانەکەدا دەپلیشاندەوە.

وەها گیـرۆدەی دابین کردنی ئاو و کارەبای شـاران و خـستنە گـەڕی ئـابووری وڵات بوون کە هەلی دەربڕینی دڵپەرۆشـییان نـەبوو. هەڵبـەت یـەکێك لـە حـازران گـوتی: "ئەگەر کەرکوك بگیرێتەوە قەڵاچۆکردنێك دەس پێـدەکا." بـەڵام ڕاوێـژی زاری ئـەم ئیمکان و ئەگەرەی وەك ئەگەرێکی تەواو ئاماریی لەسەر خـۆی وە لا دەبـرد. نـا, ئـەم کوردانەی چینی مام ناوەندی بـە ڕادەیـەك پەرۆشـی کـاری خۆیـان بـوون و ئەوەنـدە خاترجەم بوون کە زەحـمەتیان وەبـەرخۆ نـەدەنا بـۆ شـاردنەوەی دەوری کۆمەڵایـەتی گرینگیان. کردەوەی پارێزگارانەی بەرچاویشان نەدەکرد. بۆ بیکەن؟ لە کرداریانڕا وا دەهاتە بەرچاو ... خۆ تـازە سـەرکەوتبوون و داگیرکرانـی خاکیـان لـە لایـەن سپای ناخۆشەویستانەوە کۆتایی پێهاتبوو. دەیانگوت بریـا جەللـەی بـێ جەمـسەری تـانکی زنـجیرپساو و زرێپۆشی تێکشکاو و کامیۆنی وەستاو و ناوەندەکانی بـەعس و بنکـەی ئاگردراوی پۆلیستان دیتبا.

ئێمە ئەوانەمان بینیبوو. قەڵای بەردینی سازکراوی سەددام حوسێنیشمان لەبەر چاو بوو کە ئێستا بە دووکەڵ ڕەش هەڵگەرابوون. ئەم بنکانەیان لە مەوادی دیاری کراوی شارێیان بنیات نابوو, لە مابەینی قەڵایاندا, بنکۆکەی چیمەنتۆ بە مەودای میلێك کەمتر و زیاتر خۆیان دەنواند. ئەگەرچی گەڵاڵـە و دیـمەنی قەڵاکان ڕووسی بوون, بەڵام ئـەو کۆنەقەڵا و مەتەرێزە کۆڵـەداریانی وەبیـــر دێنایـەوە کـە لـە ئەلـــجەزیرە هـەتا ویێتنـام دیبوومن. سەرەڕای ئەمانە گەلێك کۆگا دیار بوون کە بە شێوەیەکی یەکدەســــــــت هەڵدرابوونەوە. ئەم کۆما گەورانە زەمانێکی گوند و باغ و ڕەز بوون. ئەمە مەرگێ بوو کە سەددام حوسێن لـە ساڵی ١٩٧٥ەوە بەرەوخوار بـە ئاشـکرا بـۆ گەلـــێ ناوچـەی کوردستانی کردبووە دیاری. کوردان بـیرەوەری تـاڵی ئـەم پلێـشانەوە و سـووکایەتی پێکرانـــەی ڕابردوویـــان بـــە شـــێوەی تایبـــەتی خۆیـــان لـــە خـــۆ دوور دەکـــردەوە. لەم سەرەوسەری کوردستان وێنەی بە پێوەی سەددام حوسـێنیان کـە لـە چوارچـێوەی چیمەنتۆدا و لـە هەموو شوێنان دەهاتە بەرچاو, دەدایە بـەر دەسـرێژی کەڵەشـینکۆف. فیشەك یەك لـە دوای یەك خەت و کووزی قەڵافەتی سەددامیان ون دەکـرد. هـەر وەك ئەوەی ئێستا لـە ئاشپەزێك دەچوو بە کڵاوی تایبەتەوە. ئەم وێنانە لـە هـەموو چەشـن و

ڕەنگی بوون: لە جلی نیزامییدا و بە قایشق و قووروش و میدالیاکانی سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانەوە, لە بەرگی بازەرگان و بانکداری سوننی مەزەبدا و لێو بەبزە, لە لۆتکەی چۆماواندا, بە کڵاوی پاناما و لیباسی سپێوە و لە هەر جلێکی تردا, بەتایبەت لە بەرگی کوردیدا, بە ڕانك و چۆغە و شەدەوە, کە تەواو سووکایەتی بوو بە کوردان.

هەناو پڕی ئاور دەگرت وەختێك دەمانبینی خانەخوێیانمان هیچ شکیان نیە کە لەمە بە دوا ئیتر مافی مرۆص دەپارێزرێ و دێموکراسی سەقامگیر دەبێ. بەم لێبوردنە گشتییەی ڕێبەرانیان ڕایانگەیاندبوو و ئیزنی دابوو بە کرێگیراوانی بەغدا بە ئازادی لە نێویانا ڕاوێچکە بکەن, بە خۆیان دەنازین. ئەم خەڵکە سزایەکی کە سەددام حوسێن بە گرتنەوەی شارەکان تووشی دەکردن, لەبەرچاو نەدەگرت.

کوردان هەر بەو جۆرەی کە هەزاران دیلی ئێراقییان ئازاد کرد, هەرواش ڕایانگەیاند هەر کەسێکی بە ئاشکرا دژبەریان نەبێ لەگەڵ ئەوانە. ئەم "بەخۆ سەلماندنە" زیاتر بە خورد بوونەوە لەم سزادانە تووند و تیژ و خۆفناکەی بەغدا بە درێژایی دەیان ساڵ کوردی پێ چرووساندبۆوە, ببوو بە هۆی سەرسووڕمان. جا ئەم مەبەستە بێخەیاڵی بوو یان بە پێچەوانە, زەمانێك گیرانەوەی سەرلەنوێی کەرکووك خانەخوێیەکانمان و خەڵکی ئاساییان لەناکاو ڕاچڵەکاند و لەسەر لێکدانەوەی چەواشەی چەند حەوتوو ئازادی وە خۆی هێنانەوە, بوو بە هۆی بزووتن و کۆڕەوی بە کۆمەڵ. ئەمە لە خەو هەستانێکی ترسێنەر بوو و کەسی وە پاش نەدا؛ ترس و یەك نەگرتوویی کۆمەڵی کوردەواری — کە چەندین ساڵ دەسەڵاتی بەعس دایسەپاندبوو — پتر پێهەڵابرد.

فەرماندەرانی باڵای هێزی پێشمەرگە ڕەنگە لەبەر ئەوەی بنەماڵەی خۆیان و کادرەکانیان لە دەرەوەی ئێراق بوون, بایەخێکی ئەوتۆیان بۆ گرێ و گرێژەنەی بنەماڵەیی دانەنا بووبێ, هەر کە کۆڕە و دەستی پێکرد هیچ کوردێك — لە پێشمەرگەڕا بگرە هەتا جاش و خەڵکی ئاسایی — حازر نەبوو کە ئەم مەترسییە وە سەر خۆی بگێڕێ و خاوخێزان و خزمانی لە جەغزی تەمای تۆڵە ئەستاندنەوەی سەددام حوسێندا

جێبێڵێ. کوردەکانی چینی مامناوەندی ترس هەڵیگرتن, ئەمانە لەمێژ بوو دەیانزانی کە کاربەدەستانی بەعس هەموو چەشنە هـەل و دەرفـەتێکیان بـووە هـەتاکوو هاتوچـۆ و هەستان و دانیشتنیان بە دوور و درێژی بـخەنە ژێر چاوەدێری و بەغدا بۆ ئەم مەبەسـتە خاوەنی سیخوڕی ورد و وریایە. ئێستا جاشەکان لەم کەسـانە بـوون کـە ڕایانـدەکرد, چـونکە ڕوویـان لـــە ســەددام حوســێن وەگێڕابـــوو و بـــەختی خۆیـــان بـــە ڕاپـــەڕینی نەتەوەپەروەرانی کوردەوە بەستبۆوە. بنەماڵە و چەکدارەکانی سەرۆك عەشیرەتانیش لـە ترسی سزادان و تۆڵە ئەستاندنەوەیەکی توند و تیژ کە چارەنووسـی کەسـانێکە بـەرەی خۆیان دەگۆڕن, ڕەوین. هیچ کوردێك نیازی بـە وە بـیر هێنانـەوە نـەبوو کـە لـەبزی "خائین" — وشەی خۆشەویستی سەددام حوسێن — نەك هەر پێشمەرگە, بەڵکوو هەموو کوردان دەگرێتەوە. ڕیزی ئەم پێشمەرگانەش کە بە ژمارە لەوانی تر کەمتر بوون, بەڵام وا دەهاتە بەر بیر کە خاوەن ڕێكخستنێکی پتەوترن, لێكهەڵوەشان. ئەم تاقمانـەش بـە ئەرکی سەرەکی خۆیان دەزانی کە ئێستا بنەماڵەکانیان بەرنە پەنا و پەسیوێکی هێور لـە تورکیا یان ئێران. سەرکردەکانی پێشمەرگە کە سەردەمێ فەرماندەری هـەزاران کـەس بوون, زۆر دواتر گوتیان بەختەوەر بوون ئەگەر توانیبایان, دڵیـان بـە چـەند پـارێزەری خۆیان خۆش بێ. تەنانەت کەمینەی مەسیحییانیش کە دەوڵەت کـەم و زۆر لێـی تونـد نەدەکردن, بازرە بوون. ئەم خەڵکە تا ڕادەیەکی زۆر لە ترسی ئەوەی کە لە سەردەمی ڕاپەڕیندا دەستیان لەسەر دەست داناوە و متەقیان لە خۆ بڕیوە و هێندێکیش هاوپـشتی خۆیان بۆ کوردان دربڕیوە, سەددام تۆڵەیان لـێدەکاتەوە یا لـە خـۆفی ئـەوەی ئەگـەر وەمێنن کوردان بە لایەنگری بەغدایان تاوانبار دەکەن, نەمانەوە.

ترسان لە باڵـەفڕ و گـازی شـیمیایی بـە ڕادەیـەکی وا پنجـی لـە گیـانی کوردانـا داکوتابوو کە سەددام ئەمـجار کەڵك وەرگرتن لە چەکی شیمیایی بە پێویست نەزانی. لە ڕاستیدا لە ترسی تۆڵەی هێزە هاوپەیـمانەکان نەوێرا دەس بۆ کردەی ئـاوا بـەرێ, بەڵام کوردان بە هیچ چەشنێ لەم بابەتەوە دڵنیا نەبوون. هێزە چەکدارەکانی ئێـراق بـە وردی دەیانزانی چ دەکەن, هەروەك چـەن حـەوتوو دواتـر "نزارحەمـدوون" بـاڵوێزی ئێراق لە واشینگتۆن ئەم مەبەستەی بە من گوت. تۆقاندنی خەڵکی ئاسـایی کردەیـەکی

ورد و زیرەکانە بوو. دیارە ئامانجی سەرەکیش گێڕانەوەی دەسەڵاتی سەددام بوو بۆ باکووری ئێراق بە شێوەیەکی هاسان و خێرا. زۆر باشتر بوو کە ئەم چەشنە تاکتیکانە توانیبایان دەسەڵاتی سەددام لە کوردستانی چۆڵ کراوا سەقامگیر و دابین کەنەوە. دیارە ئەمەش ئامانجی لەمێژینەی سەددام بوو. بە بەربەست کرانی هەستانی فڕۆکە لە لایەن هاوپەیمانانەوە, ئێراقییەکان بە دروستی و بە پاڵپشتی ئەم ترس و خۆفەی باڵەفڕان بەسەر زەوی دڵی خەڵکا پڕژاندبوویان, هەڵیانفڕاندن و کەلکیان لێوەرگرتن.

کاتێ کوردان کەرکووکیان لە چنگ دەرهاتەوە, سەرەدای شەپۆلی پەناخوازان گەیشتە هەولێر و سلێمانی و زاخۆ. کوتوپڕ وەها کۆڕەوێك دەستی پێکرد کە هیچ کەس لە واشینگتۆن و لەندن و پاریسا پێشبینیی نەکردبوو, جا چ بگا بە بنکەی سەرکردایەتی ژێنێراڵ شوارتسکۆف. ئەم گەڕیانە چ جێی سەرسوڕمان نەبوو, بەڵام مەبەستێکی ڕاچڵەکێن بوو. بە گوێرەی ئەم بەڵگانەی دیارن دەوڵەتی بووش, چ بەر لە داگیرکرانی کووەیت, چ لە وەختی داگیرکرانا و چ پاشتر تەواو لێبڕابوو کە خۆ لە کێشە ئاڵۆزبڵۆزەکانی ئێراق وەرنەدا, هەر بۆیە بوو کە لە بەندیواری لەتەك تاقم و دەستەکانی دژبەری ئێراقی, لە شیعە و سوننیڕا بگرە هەتا کورد کلا دەبوو و لە هەر کردەیەکی پێی بگوترێ کردە، خۆی پاراست. لە مەودای مێژووی گێرە و کێشەی ئینسانیدا بە هەڵکەوت دیتراوە کە هێزێکی وەها گەورە ئەم گشتە هاوپەیمانە لێك گرد کاتەوە و ئەم هەموو کەرەسە و چەكوچۆڵ و حەشامەتە وەکۆ و تەیار بکا, بەڵام سەبارەت بە ناسینی سرشت و کاکڵ و داڕشتی کۆمەڵی دوژمن و مێژووی بە خوێن شەڵاڵی ئەوها کەترەخەم بووبێ.

لە سەرۆك بووشەوە بگرە هەتا خوارخوارەوەی کاربەدەستانی دەوڵەت ئەم حەقیقەتەیان نەشاردەوە کە یەکەم مەبەستی گرینگ دوای ئازاد کردنی کووەیت, ڕاگەیاندنی سەرکەوتن و گێڕانەوەی هێزکانە بۆ نیشتمان. هەر کە بووش لەپڕ کۆتایی بە شەڕ هێنا, ژێنێراڵ کالین, ئێل, پاوێل, سەرکردەی هێزە هاوبەشەکانی ئەمریکا لێبڕا کە هەرچۆنێك‌بێ, نەهێڵێ هێزەکانی ئەمریکا بکەونە داوی گێرە و کێشەی ئێراقەوە. ئەم ڕووداوانەی کە لە بەغدا و شوێنەکانی تری ئێراق دەقەومان پووش بەسەر کران

هەتا ڕەوت و ڕەوگەی "سروشتی" خۆیان بپێون, ئەگەرچی دەوڵەتی بـووش بـە ئیمـا و ئیشارە دەریـخستبوو کـە سـوننییەکی "بـە دەسـەڵاتی" دیکـەی لـە سـەددام حوسـێن بێباشترە. یانی ئەگەر سەددام حوسێن بە بێ خۆتێوەردانی هاوپەیـمانان لـە کار لادرابـا, واشینگتۆن وای پێ باشـتر بـوو کـە ژێنێڕاڵێکـی دی بێتـە سـەر دەسـەڵات. هـەر لـە دەسپێکی ئاگربڕەوە, قوت بوونەوەی ئەمریکا لە کەنـداوی فـارس بـوو بـە گرێیـەکی نێوخۆی ئەمریکا. بووش تەنانەت ئەو زەمانەی لە بەر ئازادی کووەیت, لە چـڵەپۆپەی خۆشەویستیدا بوو, تێگەیشت کە بۆ هەڵبژێرانەوەی دووبارەی لـە سـاڵی ١٩٩٢دا, دەبێ بە باری لاوازی ئابووریدا بێتەوە و تـەنیا سـەرکۆمارێکی تایبـەت بـە سیاسـەتی دەرەوە نەبێ. لە ڕوانگەی بووشەوە تەمای پاوێل کە سوور بوو لەسەر تێوەنـەگلان لـە کێشەی نێوخۆی ئێراق, هەڵوێستێکی بە جێوڕێ بوو, چونکە بە پێـچەوانە هـیچ دوور نەبوو کە شەڕ و گەڕی وێتنام و خوێڕی کرانی هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا لە دەیـەی ١٩٦٠دا و گیرۆدەی بوونی ساڵەکانی دەیەی ١٩٧٠ی بەیرووت دووپات ببنەوە.

دەوڵەتی بووش کە گیرۆدەی ئەم کێشە سیاسی و نیزامییانە بوو, بۆ بەرەوڕوو بوون لەگەڵ وەها کۆڕەوێك لە کوردستانی ئێراقا چ خۆی حارز نەکـردبوو. لـــە ئـاکـامدا بووش بە دەستی خۆی پەڵەی هاویشتە سەر سەرکەوتنی مەنـشووری کووەیـت. وا تـۆ بڕوانە گەمەی ڕۆژگار کە بەم کردەوە دەوڵەتی خـۆی و پـاش خۆشـی بـۆ ماوەیـەکی دوور و درێژ خستە داوی کێشەیەك کە هەوڵی دابوو خۆیان لـێ بپارێزێ, کەچی هەر پێداچوونەوەیەکی سەرسەرەکیش, لە شەوی دەسپێکی شەڕ و گـەڕەوە, دەوڵەتەکـەی لەم تێمانە ڕزگار دەکرد و تاوانی "تەما بۆ نەبوونی هیچ هەڵوێستێك" لـە ئێراقـی پـاش شەڕی دەخستە ڕوو.

زۆر نیشانەی بەرچاو لەم بوارەدا خۆیان دەنواند. بۆ وێنە لە کلکەی ڕۆژانـی بـەر لە دەسپێکی شەڕ لە ژانویەی ١٩٩١دا سەدان هەزار کـوردی تورکیـا لـە باشـووری ڕۆژهەڵات لە ماڵوحاڵی خۆیان تەرەکەمە ببوون. خاوخێزانـە تـەقیو و تۆقیوەکـان لـە بەریبەیانیڕا هەتا شەقەی نیوەشەو لە وێـستگەی ئوتووبووسـی دیاربـەکر, کـە هـەتا سنووری ئێراق چەند سەعاتەڕێیەك دەبێ, کۆزیان دەبەسـت. شـەریکەی گواسـتنەوە و

گەیاندن ئوتووبوسی زیاتریان دەخستە ڕێ, سەرەڕای ئەوەش وڵامـدەرەوەی داخـوازی خەڵك نەبوون بۆ چوونە ئانکارا و ئیزمیـر و ئیـستامبووڵ و شـارەکانی تـری ڕۆژاوای تورکیـا کــە جــەماوەرێکی فــرت و فراوانــی کوردیــان لــێنیــشتەجێ بــوون. مــن شەودەرنگانێ لە وێستگەی ئوتووبووس بە چاوی خۆم پۆلــێ پیاوی تێماوی پەرێـشانـم دیت کە ژن و زارۆکیان بەرێ دەکردە شوێنی دی. بۆ هەر شوێنێ, هەر ئەوەنـدەی لــە هەرێمی کوردستان بەدەر بوایە, کە وێدەچوو لەمەترسیدا بێ. تەنانەت ئەگەر سـەرنج بدرێتــە کــردە و جووڵانــەوەی دوورەئــاوەز و نابــەجێ لــە ناوچــەدا دیــسانیش ئــەم سەرشێواوییە خۆی وەك شێوەیەك شێتی دەچوو.

وێڕای ئەمەش دەوڵەتی تورکیا کـە هێـزە کـۆك و تـەیارەکانی تانـك و تۆپخانـە و هەزاران سەربازی کە زیاتر لە بەرامبەر یەکێتی سۆڤیەتا لە دەوروبەری سنووری ئێـراق مۆڵ دەدا, هێنابوویە ئەم ناوچەیە, ئەگەرچی هەم ئانکارا و هــەم بەغـداش بــە کــردەوە دەریانـخستبوو کە مەیلیان لــە کرانــەوەی بەرەیــەکی تـر لــەم مەڵبەنـدە نیـە. بـەڵام هەرچـۆنێك بــێ ئــەم کــرداره نــەیتوانیبوو بــڕوا بــە کوردەکــانی تورکیـای نیـشتەجێی سەرسنوور بێنێ لە شوێنی خۆیان بازرە نەبن. تەنیا خەڵکی زۆر هەژار و نەدار بوون کە لە شارۆچکە سنوورییەکانا مابوونەوە، چونکە هیچ کوردێك پەندی ساڵی ١٩٨٨ی لە بیر نەبردبۆوە. وشەی "هەڵەبـجە" ئێستا تەنیا ناوی شارۆچکەیەکی کوردسـتانی ئێـراق بە لای سنووری ئێرانەوە نەبوو. ئەم ناوە پێشاندەری "ماکەی تۆوبڕکردن"ێك بــوو کــە تەواوی جەماوەری کوردی دەگرتەوە, چونکە هەڵەبـجە شوێنێ بــوو کــە حکوومــەتی ئێراق لە وێندرێ خەڵکی بە گازی ژاراوی پەلامار دابوو.

کوردەکانی تورکیا لە دواین ڕۆژانی بەر لە دەسپێکی شەڕی کووەیت بە ڕادەیـەك ترسابوون کە دەوا فرۆشەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی وێندەرێ دەیانگوت کە خەڵك بۆ کڕینی "ئاترۆپین" بڕەم بڕەمێکیانە هەر مەپرسە. ئاترۆپین دەوایەکی ژارکوژە لە بەرامبەر گازێکی زۆر کوشندەدا بە ناوی "سارین." لــە هــیچ شــوێنێك دەمــامکی دژی گــاز بـۆ دابەشین بە دەستەوە نەبوو. کوردەکانی تورکیا لە جیاتی دەمامك توورەکەی مشەمایان دەکڕی و بە سەر خۆیان هەڵدەکێشا (لە ڕاسـتیدا یەکـەم قوربـانی کراوانـی شـەڕی

کووەیت ژنێکی کورد و منالەکانی بوون. ئەوان بەر لەوەی یەکەم بۆمبی هاوپەیمانان داباریێتە سەر هێزەکانی ئێراقی, وەها خزابوونە ژێر ئەم مشەمایە کە خنکابوون.) دیپلۆماتەکانی رۆژاوایی لە ئانکارا تاوانی ئەم سەرشێواوییەیان دەخستە ئەستۆی نووسراوەکانی رۆژنامە و بلاڤۆکانی تورکیا کە بۆ بێدەربەستی بەناوبانگن. ئەم جەماوەرە بۆ هەڵسەنگاندنی رادەی ترس و خۆفی کوردان لە چەکی شیمیایی, تەنانەت لە تورکیا – چ بگا بە ئێراق – دامابوون.

***

هیچ شتێك چاوەروان نەکراوتر و مەترسیدارتر لەو کاتانە نیە کە خەڵك خۆیان لە گێژاوی خەیانەت پێکرانا دەبیننەوە. لەپڕ نیشانەی شوم خۆیان نواند. خەڵك لە پێشا بەم بارودۆخە پێکەنین و پاشان کاتێ رووداوەکان وەراستگەران بە رق و قینەوە دەرد و پەژارەیان قووت دایەوە. ئەو هەینییەی بەر لە جێژنی پاك, کاتێك لەگەڵ "ڤولاکووت" گەراینەوە سەلاحەددین, تاقمی ABC گوتیان لە دوو رۆژی رابردوودا کە ویستوویانە لە رۆژاواوە لە کەرکوك نزیك ببنەوە بە کوێرەوەری توانیویانە خۆیان لە دەس پێشمەرگەی توورەی گڕ گرتوو رزگار بکەن. ئەم دوو شەو و رۆژەی ئاخری مانەوەمان لە ئێراق, لە حاڵێکا مێشکی خۆمان رێك‌دەکوشی و سەرمان دێنا و دەبرد کە رێگایەك بۆ دەرباز بوون لە چنگ کوردانی قەڵس و دەرهەڵبوو و هێزکانی تۆڵەئەستێنەوەی ئێراق بدۆزینەوە, زەمان بوو بە فیلمێکی "نەرم خول"ی خوێندنەوەی دوژمنایەتییەکان. نێوان سەلاحەددین و هەولێر بە ئوتۆمبیلێکی خۆش ئاژۆ, نیو سەعاتێك زیاتر نابێ. هاوکارەکانمان لەوێ مابوونەوە و ترس باڵی بەسەر شارا کێشابوو, جا بۆیە دەبوو بە ترۆمبێلی پێشمەرگە و پارێزوانانی چەکدار لەم گەرداوەمان رزگار کردبان. ئەم تاکسییەی بۆ حەوتەیەکمان بەکرێ گرتبوو و بە شوێنیانا چووبوو, وەك ئاو بەخۆیەوە لەبەر چاوان ون بوو. تاقمی ABC[1] بەشی زۆری رۆژی شەممۆی لە سەلاحەددین بە شوێن ئەم و ئەو راننده و دۆزینەوەی ئوتۆمبیلدا

١– (بنکەی هەواڵنێری ئەمریکا) ABC = Americaen Broadcasing Company

بردەسەر. هیوادار بووین بەیانەی جێژنی پاك لە ناوچە دەرباز بین. تاقمێك لە هەواڵنێران پێشتر فیزماڵکیان دابوویە. ڕانندەکانی ABC لە ئاخرین ساتەکانا پێیان چەقاند و گوتیان ئوتۆمبیلەکانیان بۆ ڕاگوێزتنی خاوخێزانی خۆیان پێویستە و تەنیا فەرمانی مەسعوود بارزانی بوو کە ئەوانی لەم کردەیە پەشیمان کردەوە. بارزانی لە پاشەکەوتی خۆی بێنزینی ڕێیەی بۆ دابین کردین. وێڕای ئەمەش وەرەقەی هاتوچۆی بۆ کردین. ماڵاوایی لێ‌کردین, ڕوخسارێکی تەنیا, کە ئاخرین وتەکانی هاوار بوو لە کوردان هەتا "لە کوردستان وەمێنن و چەشنی ئەرمەنییەکان پەرەوازە نەبن", کە بە بڕوای ئەو خەڵکێکی دەرکرابوون لە نیشتمانی خۆیان.

لەو تەنگاوتەنگ بوون و ڕێبەندانەڕا پاش جیابوونەوە لە [بارزانی] تووشی هاتین وا دیار بوو کە کەس گوێ بۆ بانگاوازی ناگرێ. من کە هێشتاش پاش نەخۆشی زگچوونی خوێنی بناوبێر بووم و هێزێکی وام لەبەردا نەمابوو لە ئوتۆمبیلەکە دابەزیم و پاڵم وە کورتە کەندێکی قەراخ ڕێیە دا. باڵەفڕە تۆپدارەکان لەوپەڕ کێوەکان خەریکی کاری خۆیان بوون و من هەستم دەکرد لێرە زیاتر جێم ئەمینترە هەتا نێو ئوتۆمبیلەکە. بۆ کەم کردنەوەی ترس و خۆفم دەستم کرد بە هەڵدانەوەی پەڕی یادداشتەکانم و ڕیزێکم لە وشە و ڕستەی کوردی هاتەوە بەرچاو کە بەر لە هاتن بۆ کوردستان لە ڕووی نامیلکەی فێربوون ڕوونووسم کردبوون. دەرفەتێکی وام وەگیر نەکەوتبوو هەتا زۆر بیر لەم وشانە بکەمەوە. جگە لە ژمارە و وشەگەلی وەك نان, ئاو و شتی لەم چەشنە سرنجم نەدابوویە چی تر. بەرەوڕووی Friend نووسیبووم "دۆست"؛ You are our friend "دۆستی مەی". بۆ ئەوەی بڵێم فیشەك مەتەقێنە, نووسیبووم "تەقە مەکە". ئەمەم بە پیتی درشت نووسیبوو و جەغزم لە دەوری دابوو. بە گوێرەی ئەو دەسخەتە شەقلەوبەقلەیەم لە جیاتی "هاوکاری" نووسیبووم "هاریکاری"[1] دیسانیش بەم وشەدا هاتمەوە. بەلای خۆم گوتم بێ‌گومان دروست نیە, بەڵام دیسانیش هەر

---

١- هەردووکیش هەر دروستن. "وەرگێڕ"

٢- خۆکوژی بە دابی ژاپۆنی, زگی‌خۆدڕین.

ئەوە بوو کە دەمبینی: "هاریکاری", زۆر لـە "هـاراکیری"[٢] دەچـوو. کـاتی نووسـینەوە سرنـجم نەدابوویە تام و چێژی ئەم مەبەستە. پێکەنیم و پتر هەستم بە تەناهی کرد.

وەختایەکی – لە واز و حاڵێکا نەبووم کە بزانـم کەنگێ – پێنج شەش پێـشمەرگە پەیدا بوون و لە ڕاننده سەرکێشەکانیان خوڕی ... لەپڕ کەوتینە ڕێ, هەروا سـووك و سادە. تیژ بەسەر جادەی "هامیلتۆن"دا تێمانتەقاند. بە گشتی هامیلتۆن ڕێیەکی نیزامییـە کە ئینگلیسی لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٠ – ١٩٣٠ بۆ هێـور کردنـەوەی هۆزەکـان, کێشابوویان و لە هەولێرەوە یەکراست دەچتە سنووری ئێران. بارزانی مانگی فێوریە لە ڕایان پێیگوتبووم: "نازانـم داخوا ئەم هەلە باشتـرین هـەلی کوردانـە یـان نـا, بـەڵام دەزانـم کە ئەمە ئاخرین هەلی ئێمە نیە. هەر چەند مانگێك لێرەوبـەری کـێ دەیتـوانی هەر بیریش لە وەها بارودۆخێ بکاتەوە." بیرم لە تاڵی ئەم وتەیەی بارزانی کردەوە. بـە پێی مێژووی کورد ئەم دۆخە تاڵوتوونە زۆریش چـاوەڕوان نـەکراو نـەبوو. سـەرەڕای تەواوی ئەمانە پاش ئەوەی هێندێکمان ڕێ بڕی پترمان لانكولۆرکی دابەسـتراوی سـەر باربەند و بانی ترۆمبیلان هاتە بەرچاو. پاشان وە پێش نەوتکێـشێکی قـوڕاوی کەوتیـن کە بە قامك ئەم بانگەوازە شۆڕشگێڕانەیەی بە ئینگلیسی لەسـەر نووسـرابوو: "کـەس نەڵێ کورد مردووە!" ئەگەرچی ڕێنووسی نووسراوەکە هەڵەی تێدابوو, بەڵام پەیامەکـە بە ڕوونی هاواری دەکرد.

پتر لە نیوسەعاتی پێنەچوو کە گەیشتینە دیانا. نووسراوەی مەسعوود ئیعجـازی بـۆ کردین و عەبدولـموهەیـمەن کـە ئـەفرەبای مەسـعوود و بەرپرسـی بنکـەی جیزبیـی وێندەرێ بوو, پێی کەوتە هەڵسووڕداسووڕ و بە دەورداهاتنمـان. ئێمـە هێـشتا دوودڵ بووین کە داخوا بچینە تورکیا یان ئێران ... کە بە ئوتۆمبیل سەعاتە ڕێیەك بوو. یـەکێك لە ئەندامانی گرووپی ABC دەیگوت کە سـمێڵی ئێرانییـانی لەسـەر سـنوور چـەور کردووە, بەڵام ئێمـە زۆرمـان بـڕوا بـەم وتەیـە و دەزگـای ئیـداری ئێرانییـان نـەبوو. عەبدولـموهەیـمەن تەمای بۆ گرتین: ئەو گوتی هیچ چارەیەکتان نیە و ئێران هەر ئەمڕۆ دەرگای سنووری گاڵە دا. ئوتۆمبیلەکانی بـە کرێمـان گرتبـوون, بـۆ دەربـاز کردنـی خاوخێزانیـان گەڕانـەوە سـەلاحەددین. عەبدولـموهەیـمەن وانێتێکـی وێ دایـن و

شرِوشالاّتـمان لـێ بار کرد و بەرەو کانیٚڕەش کەوتینە رِێ. ئەم شوێنە لـەسەر نەخـشە دروست دەکەوتە سنووری تورکیا. تاریك داهاتبوو کە گەیشتینە دەشـتێکی سەرسـەوز و زەنوێر و دەبوو بارگەی لـێ بـخەین. وانێتەکـە رِۆیـی. رِووناکـایی مانگەشـەو هـەر ئەوەندە بوو کە بـۆ بـەکرێگرتنی چـەند سـەر ولاّخ لـەگـەڵ قاچاخـچییەکانی ناوچـە قسەیەك بکەین و شتێك بـخۆین و کیسە خەوەکانـمان رِاخەین.

لـە ناکاو جرِاڵدین برووکس, لـە وال ئیـسترِیت ژوورنـاڵ, گـوتی دەترسـێ و لـێـی سووره کە ئەمشەو هەموومان لـە خەوا دەکووژن. بەلاّم هەموومان لـەمە پـتر شـەکەت بووین کە گوێمان بە وەها وتەیەك ببزوێ, ئەویش بەتایبەت بە وتـەی ئـەو: ئـەم کیـژە بەژنباریکە ئازاترین ئەندامی گرووپەکە بوو و بـۆ ئـەوەی هەڵوێـست و دژکـردەوەی خاوخێزانە کوردەکان لـە بەرامبەر تۆپبارانی سپای ئێراق وەك هەواڵ بنێرِێتەوە, شەو لـە کـــەرکووك مـــابۆوە. لـــە رِاســـتیدا شـــانس رِووی تێکـــردین و چ نەقـــەوما. ئـــەم کوێستانەرِێیەی بەرەو تورکیا دەچوو یەکێ لـەم رِەوگە دەگمەنانە بوو کە میـنرِێـــــــژ نەکرابوو. باران نەدەباری, ئەگەرچی ئەوەندە ئاونگ کەوتبوو کـە لـەوسـەرانە هـەموو خەریك بوو لـە سەرمان کەسیرە دەبووین.

شـــەوی مانگیــچاردە بـــوو. چـــەند جارێـــك وەخەبـــەر هاتـــم و هـــەموو جـــارێ رِێچکەیەکی نەپساوەی پەناخوازانـم بینی کە ملی کوێرەرِێی پرِ هەواز و لێژی رِەوگەی کەلێکی بەرزیان گرتبوو, کە دەچۆوە نێو تورکیا. بەربەیانی لـەسـەر یـالّی چـیا, پۆلــە بەرزایکی هەشت جووتی چەقیبوون و لـەم خەڵکەیان دەرِوانی. "بیبیسی" هـەوالّی دا کە هەولێر و دهۆك و زاخۆ کەوتوونە دەس هێزەکـانی دەولّـەتی. ئـەم هەوالّـە بـەجێ بوونی تەمای ئێمەی بۆ هەڵبژاردنی ئەم رِێیەی گرتبوومانە بەر نیشان دا. بە پێـچەوانەی بەڵێنی شەو ولاّخ سەر و سۆراغیان نەبوو. کەلوپـەل و شرِوشالاّتـــمان تێکـەوە پێـچا, لـەسەر ئەم برِوایە کە ناچارین چەمەدان و شتە قورسەکانـمان بەجێ بێڵین. چوومە سەر جۆگەیەك و دەس و چاوم شۆرد و رِدێنم تاشی. پاش چەند حەوتە نەخۆشی بـۆ یەکـەم جار هەستم بە نەخۆشی و نارِەحەتی نـەکرد, ئەگەرچـی پێـنج کیلۆیـەك کـز ببـووم و هەستم بە بێتاقەتی دەکرد.

سەرەنجام دوو کوڕی مێرمنداڵی چاردە پازدە ساڵانە بە خۆیان و سێ ئەسپ و گوێدرێژێکەوە پەیدا بوون. بارمان لێنا و وەڕێ کەوتین. لە پێهەڵاچوون بەم توولە ڕێیەدا کە خێرا پڕ دەبوو لە لینگە کەوش و چەمەدان و شڕوشاڵاتی فڕێدراوی پەناخوازان, جرالْدین کیسەخەوی منی دەس دابوویە. نێوە نێوە بۆ پشوودان و سەیرانی دەرودەشتی بە گوڵ و سەوزە خەملێوی بەهاری و لووتکەی بەفرگری دەوروبەرمان و گوێ هەڵخستن بۆ ڕەخنەی ڕەپ و ڕاست و بێباوەڕانەی پەناخوازان لە جۆرج بووش و کارەکانی, ڕادەوەستاین. دەیانپرسی: "بۆ خاشەی سەددامتان نەکێشا؟ بووش دۆستی سەددامە." ئەوانە هەڵبژاردەی کۆمەڵی کورد بوون, لەم یەکەم کەسانە بوون کە تێگەیبوون تێك‌شکاون و دەبێ هەڵێن. زۆریان کارمەندی خانەنشین و ئەندازیارانێك بوون کە کۆت و شاڵوار و جلیتقەی لەباریان لەبەر دابوو؛ ئەو دایکانە بوون کە منالْیان لە ئامێز کردبوو.

ئەمە یەکەم جار نەبوو کە لە ماوەی تەمەنی کارمدا, لەبەر ئەمریکایی بوونم هەستم بە ناڕەحەتی دەکرد. بەڵام هیچ کات بەجێ بوونی ئەم ڕەخنەیەم هێندە هەست پێنەکردبوو. پێنج سەعات دواتر گەیشتینە ئەستوونێکی چیمەنتۆ کە دیاردەی سنوور بوو. سێچارەگ دواتر لە بنکەیەکی سەربازیی ترکان بووین لە "یەسیلۆڤا" و لە ژێر وێنەی لە هەموو شوێن هەڵزەقاوی مستەفا کەمال, بناغەدانەری تورکیای تازە و سەرکوتکەری خەڵکی کورد, خۆمان گەرم دەکردەوە. ئەفسەرێکی لاو کە ئینگلیسی دەزانی, سەری لەم تاقمەی ئێمە کە بریتی بووین لە هەواڵنێرانی ڕۆژنامە و تەلەفیزیۆنەکانی ئینگلستان و فەڕانسە و ئەمریکا, سوڕمابوو؛ هەر لەرێوە بە بێتەل ئەم مەبەستەی بە بنکەی سەرکردایەتی خۆی ڕاگەیاند. ماوەیەك دواتر باڵەفڕێکی "هوویی", هی سەردەمی شەڕی "وێتنام", سەرۆکی ژاندرمەری و سەرکردەی سپای ناوچەی هێنا و نیشت.

کابرای سەرتیپ بە ڕووی ساردەوە لە قەڵافەت و بەژن و باڵای قوڕ و چڵپاو گرتووی هەڵڕوانین و فەرمایشتی فەرموو: "من دەتوانم ئێوە بە تاوانی سنووڕپەڕاندنی بێ ئیجازە گوللەباران بکەم, دەتوانم دەو دیوی سنوورتان کەمەوە و دەشتوانم ئیزنی

تێپەڕبوونتان بدەمێ." پاشان لـە قاقای پێکەنینی دا, قاقـای لــە زگـی زلـیـرا دەهـات و ئێمەی ئیزن دا. پاشان داوای باڵەفڕێکی تری کـرد کـە دوکتۆرێـك و دوو پەرسـتار و چەند نردوو نان بێنێ. ئەم یارمەتییە پزیشکییە و خـورد و خۆراکـە بـۆ ئـەو چەندسـەد کەسە پەناخوازە بوو کە لـە ماوەی سیوشەش سەعاتی ڕابردوودا گەیبوونە وێنـدەرێ و بەشی زۆری ئەم ماوەیە بێ خـورد و خـۆراك و پـەنا و پەسـیو بـاران خووسـاندبوونی. لانیکەم لـەوێ بوونی ئێمە بوو بە هۆی ئەوەی کە نیزامییانی دڕدۆنـگ و جارجـار دڕ و تووڕەی ترك لـەتەك ئەم پەناخوازانەدا تۆزێك مەیلـەو مرۆڤانـە بـــجووڵێنەوە. ترکـان هیچ نەیاندەزانی کە ئەم پەناخوازانە سەرەدا و پێشەنگی نیزیك دوو میلیۆن کوردن کە لـە ترسی تۆڵـە و سزای سەددام ڕایانکردووە.

## بەشی٤

# مرد و چووە بەهەشت

*ئێمە کوردان چاك دەناسین ... هەموو ساڵێ*
*هاوینان لەگەڵیان تێکهەڵدەچووین.*

**"فریا ئێستارك" گەشتنامەنووس و کاربەدەستی حکوومەتی لە "سەفەری سوارە (١٩٥٨)دا بۆ دیجلە."**

"جگە لە چیاکان دۆستێ شك نابەین", ئەمە پەندێکی کۆنی کوردییە. بەڵام لە ئاوریلی **١٩٩١**دا هەر ئەم چیا و کێوانە هەزاران کوردیان کوشت و کوردان لە دژوارترین ڕۆژانی پڕنیازی خۆیاندا تێگەیشتن کە لە واشینگتۆن و لەندەن و پاریس و زۆر شوێنی دی دۆستی گەرموگوڕ و بەدەسەڵات و فیداکاریان هەیە. لەمانە: سەرکۆماری تورکیا, هاوسەری سەرکۆماری فەڕانسە و یەکێ لە وەزیرانی فەڕانسەوی, یەکێك لە یاریدەدەرانی خاوەن دەسەڵاتی مەجلیسی پیران لە واشینگتۆن, یەکێ لە ئەندامانی ئیرلەندیی مەجلیسی مەزنانی ئینگلستان و گەورە دیپلۆماتانی ئینگلیسی و فەڕانسەوی و زۆرێك لەم دیپلۆماتانەی کە لە شوێنی بالاّ کاربەدەست بوون و هەروەها ڕۆژنامەنووسانی قسەڕۆیشتوو ... بەڵێ، هەمووی ئەوانە هەرکام لە

شوێنی خۆیان بۆ دەربڕینی پشتیوانی لە کوردانی ئێراق خەریکی کار و چالاکی بـوون. لەگەڵ ئەوەشدا کوردەکان بۆ ڕزگاری, بەر لە هەموو شـتێ قـەرزدار و ئەمەگـداری تەلەفیزیۆن بوون, چونکە هەر ئەم دەزگا دوورەهەست و سۆزە خێـرا بـیروڕای گـشتی جـــــــــــــــــــــــــــەماوەری فەرانـــــــــــــــــــــــــــسە

و بریتانیای بەرەو ئاوات و ئامانجێك ڕاكێشا كە لەوە پێش زۆرتر بە نەناسراوی مابۆوە و هەر ئەم جەماوەرە هەراوەی كۆمەڵانی خەڵك دەوڵەتانی لەندەن و پاریسی بۆ هەڵوێست گرتن پاڵ پێوەنا.

سیاسەتوانانی ئوروپایی سەریان لەم شەپۆلی هەست و سۆزە سوڕمابوو كە تەلەفیزیۆن بزاوتبووی و بە واتەی یەكێ لە هاوكارانی ڕەش‌بینی ئەمریكایی بۆ یەكەم جار ئوروپاییەیانی وا لێ‌كرد كە كردەوەیەكی ئینسانی و مرۆڤ‌دۆستانە بنوێنن. یەكێ لە ئەندامانی واقماوی دەفتەری فرانسوا میتران كە سەرەدەری لە مێژوو دەردەكرد پێی سەیر بوو كە خەڵك لە جیاتی ئەم ئاواتە پشتیوانی لەو ئامانجە دەكەن و بە سوڕماوی دەپیرسی: "باشە بۆچی خەڵك ئەم هەمووە بۆ كوردان خۆیان دەچۆقێنن, خۆ نە جوولەكەن و نە مەسیحی, جگە لەمەش لە شەڕی یەكەمی جیهانی‌دا دەستیان لە كوشتاری مەسیحییانی ئەرمەنیش‌دا بووە!" لەگەڵ ئەوەش‌دا سەرەڕای پێداگری دەوڵەتانی ئینگلیس و فەرانسە كە خوازیاری كردەوە بوون و وێڕای دەربڕینی نارەزامەندی و ڕاگەیاندنی ڕەخنەی پەرەئەستێنی كەسانی چاوناسی باڵی دژبەری دەوڵەت ــ یانی دێموكراتەكان ــ هەروەها پاش ئەم هەمووە تەبلیغاتەی تەلەفیزیۆنەكان كردیان, دەوڵەتی بووش دوو حەوتوو خۆی گێل كرد و ئەم‌پێ و ئەوپێی كرد.

خۆشییەكەی لەوەدابوو, كوردان لەوپەڕی سەرسوڕمان‌دا خۆیان لە بارودۆخێكا بەدی كرد دەتگوت هەر بۆ هێنانە سەر شاشەی تەلەفیزیۆن خوڵقابوون. جا ئەم هەڵكەوتە هەموو لە سۆنگەی ئەو چلۆنایەتییە بوو كە هەم ئەوانی باش نیشان دەدا و هەم هەستی تاوانی لە بینەرانی ڕۆژاوایی‌دا دەبزاوت كە پاش ئەم گشتە شادمانییەی بە خاتری وەدەرەنانی ئێراق لە كووەیت دەریانبڕیبوو, ئێستا ئەم خەڵكە تووشی وەها دەرد و مەرەدێك هاتبوون. ئەم كارەساتە ــ لەو پەڕی دڵناخۆشی و سەرشێواوی دەزگا ڕامیارییەكانی ڕۆژاوادا ــ مێژووی تەڵەكەبازی ڕۆژاوای سەبارەت بە كێشەی كورد, كە پتر لە حەفتا ساڵ بوو لەبەر چاوان بزر كرابوو, كردە ناوەندی سەرنجی گشتی.

زۆرێك لـە ئینگلیسییەكان سەبارەت بە كـوردان هەسـتیان بـە گوناهێـك دەكـرد كـە یەكێك لـە سیاسەتوانان بە "گرێی گوناهی مێژوویی" ناودێر كـرد. ئـەم گرێیـە ڕیـشەی قووڵ ڕۆیوە و دەگەڕێتەوە سەر بـەڵێنی بـێ‌كردەوە و وەفـا پێنـەكراوی پـاش شـەڕی یەكەمی جیهانی بۆ دامەزراندنی وڵاتێكی سەربەخۆی كورد. پاشـان خودموختـاری لـە چوارچێوەی ئێراقێكی ژێربالٚدا, یانی ئەو سەردەمەی كە ئۆگری بریتانیا پتـر ڕاگرتنـی ناوچە نەوتییەكانی كەركووك بوو بۆخۆی نە دابیـن‌كردنی ئاوات و ئامانـجی نەتـەوەیی خەڵكی كورد. لـە فەڕانسەدا وەچەیەك لـە دەوڵـەتانی ڕاست و چەپ بۆ قازانج و بەهرە وەرگرتن لـە دووهەمین كانگای نـەوتی خـاوی جیهـان و بـۆ پاراسـتنی ئـەو جێ‌پێیـەی فەڕانسە لـە وێندەرێ وە دەستی هێنابوو, لامەلامەیان لـەبەر سەددام حوسـێن كردبـوو. ئێستا جەماوەری خەڵك بە گشتی ڕاست و دروستی ئـەم سیاسـەتە و ئـەخلاقی بـوونی ئەوكارەیان – كە جگە لـە كومۆنیستەكان, تەواوی گـەورەپیاوانی سیاسـی فەڕانـسەی كردبووە بڵێندگۆی ماستاوكەری بۆ بەغدا – بردبووە ژێر پرسیار. ئاكام و بەرهەمی ئەم ڕەوت و كێشەیە ئاشكرا بوونی سیایی حیساباتێكی پێنج میلیـارد دۆلاری بـوو كـە لـە بابەت فرۆشی چەك‌وچـۆڵەوە بەغـدا فلـسێكی نـەدابوو و هێنـدێكیان هـەر دژی ئـەم كوردانە دەكار كرابوون.

جا بەتایبەت لـە جیهانێك‌دا كە نژم و بیچمی بێ‌پسانەوە لـە ئـاڵ‌وگۆڕا بـوو, پـاش دەیان ساڵ دیتنی پەیتاپـەیتای ڕوخـساری پـەناخوازانی ئـەفریقایی و ئاسـیایی، كـوردان شتێكی سەرنج‌ڕاكێش و نوێ بوون. بینەرانی تەلـەفیزیۆن كە لـەمێژ ساڵ بوو خوویان بە دیتنی دەرد و كوێرەوەری لـە ناوچەكانی گەرمەسێری جیهان گرتبـوو ئێـستا كوردیـان دەدیتن كە لـە كوێستانان بە شڵێوە و باران ڕەق هەڵدەهاتن؛ لـە بەفر و قوڕ و زەلـەق و چلٚپاوا سەریان دێنا و دەبرد و بۆ دۆزینەوەی كوتەدارێكی بكرێتە دەستەچـیلـەی ئـاگر گیانیان دەخستە مەترسیی تەقینەوەی مین و لـەسەر ئەم پركە یارمەتییەی لــە لـۆرییانڕا بۆیان حەوا دەدرا بە شەڕ دەهاتن. تێهەڵدران لــە لایـەن نیزامییانـەوە – لـەم بابەتـەوە نیزامییەكانی توركیا دڕن – مەبەستێكی ئاسایی بوو, هەروەك تێكۆشـان و پێـشبڕكە بـۆ مانەوە و وە دەس هێنانی خورد و خۆراكیش كـارێكی سروشـتی بـوو. پیـاوان چەشـنی

زۆربەی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست مێژەریان لەسەر دەنا و ڕەنگی ئاڵ و واڵای جلوبەرگی هاوسەرانیان بۆ چێشکەی ماندووی بینەرانی ڕۆژاوایی هەوایەکی تازە بوو.

ئالێن پیزی, هەواڵنێری CBS هۆی بلاوکرانەوەی هەواڵ و ڕاپۆرتی تەلەفیزیۆنی سەبارەت بە کوردستان بۆ ماوەی بیستویەك ڕۆژی یەكپەشوودا ئاوا دەبڕێتەوە: "منداڵەکان جوانن, پیاوەکان دڕ و غلوورن و ژنەکان بێ پەچە و ڕووبەند و چارشێو و بەژن و باڵایان ڕێك و تەرزە." ئەوەی بوو بە هۆی سەرسوڕمانی جیهانی دەرەوە قژی کاڵ و چاوی شینی ژمارەیەك لە کوردان بوو. جا لەبەر ئەوەی جەماوەری چینی مام ناوەندیش ڕایانکردبوو, بە ڕادەی پێویست ئینسانی وایان تێدا بوو کە بە ڕاوێژێکی پەسندی تەلەفیزیۆن مەسەلە و گرفتی خۆیان شی بکەنەوە. بە قەولی "پیزی" پەیامەکە زۆر ئاشکرا بوو: "کوردان ببوونە قوربانی دەستی سیاسەت و هەڵوێستی ئەمریکا کە داوای ڕاپەڕینی جەماوەریی کردبوو. دیارە بۆ سوور کردنەوەی ئەم داوایەیان باوەشێکیان کاغەزی بێ ئیمزای بە عەرەبی نووسراو بە دەستەوە بوو کە فڕۆکە ئەمریکایییەکان بە وڵاتیان وەرکردبوو و داوای لە سەربازانیش کردبوو ڕیزەکانی سپا جێ بێڵن.[1]

کوردان دوای تێپەڕبوونی چەندین هەزار ساڵ, کە لە پلەی قەڵافەتی گەلێکی یەکنەگری بێ دەوڵەتا نوا بوون, لەناکاو بە چارەگەسەعاتێك گەیبوونە ناو و ناوبانگێ

---

١– ئێریك ڕۆلۆ باڵوێزی فەڕانسە لە تورکیا وە بیر دێنێتەوە کە لە سەرەتای ئاوریلدا "بێرنار کۆشنە" وەزیری "کاروباری مرۆص‌دۆستانە" دەباتە سنوور هەتا لەگەڵ نیزیکەی ئەم چوارسەد کەسە پەناخوازە بدوێ و هانیان بدا وردە وردە بگەڕێنەوە ئێراق. پەناخوازان یەك بە دوای یەکا, وەك بەڵگەی خەیانەتی هاوپەیمانان باسی ئەم کاغەزانەیان کرد کە فڕۆکە ئەمریکایییەکان بەریاندابوونەوە. وەك ڕۆلۆ دەڵێ پوختەی مەبەست ئەمەبوو: "لە بابەت ئەم وتە جوانانەوە سپاسگوزارین, بەڵام دوای ئەوەی سەددامتان تەیار کرد و بە ئێمەتان وت بە دژی ئەو ڕاپەڕین و پاشان ئێمەتان بەرەڵڵا کرد, بڕوامان بە ڕۆژاوایییان نەماوە. ئێوە لە ماوەی ئەم دوو حەوتووەدا کە بۆمبی بەسەردا دەڕشتین و قەڵاچۆی دەکردین تەنانەت قامکیشتان بە نیشانەی پشتیوانی لێ هەڵنەهێناین. کردەوەی کۆمەڵەی پاراستنی جانەوەران لەگەڵ سەگەلی بەرەڵڵا باشترە لە کردەوەی ئێوە لەتەك ئێمەدا. ئێوە مافی پەنابەری سیاسیمان لە فەڕانسە بۆ وەرگرن." کاتێك کۆشنە گوتی: "ئەم وتانەیان هەر بەڕاستی وایە کە ئێمە یارمەتی سەددامـمان داوە ..." ڕۆلۆ پێیگوت لێیگەڕێ "ئێوە ناتوانن ٥٠٠٠٠ پەناخواز وەربگرن."

کە "ئەندی هۆڵ" لای وابـوو لــە سـەردەمی تەلـەفیزیۆنا هەرکـەس دەتوانـێ بیگاتـێ. دۆستانی دەرەوەیان کە لـە هەموو شوێنێ پەرانپەران بوون, تەواوی هـەوڵی خۆیـان دا بۆ ئەوەی ئەم چارەگەسەعاتە نەمر بـمێنێتەوە, تەنانەت ئەگەر بۆ بردنەوە پاشـی وتـەی ڕەشبینانەی یەکێکی وەك ئەو باڵوێزەی جیهانی سێهەم لە بەغدا بوایە کە پێش‌بینـــــــی کردبوو, ئۆگری و خۆشەویستی ڕۆژاوا سـەبارەت بـە کـوردان مـەودای لــە مـەیل و تاسەی سەمای "هۆلا هۆپ"ی تافی لاوی ئەو پتر ناخایەنێ.

لـە فەڕانسە دانیەل میتران, هاوسـەری سـەرکۆمار و پـشتیوانی بـەدەنگ و هـەرای کوردان و تەواوی کەمەنەتەوە چەوساوەکان, بۆ ڕاکێـشانی سرنـــجی شـووەکەی بـۆ سەر کوێرەوەری و مسەوەدەی ئەم خەڵکە نیازی بە هاندان نـــەبوو. ئـــەو لـەگــــەڵ "کەندال نزان" کە فیزیك‌زانێکی بە ڕشتی کوردە ببوو بـە دۆسـت و بـۆ دامەزرانـدنی "ئەنستیتۆی کورد" لـە ساڵی ١٩٨٣دا لە پاریس یارمەتی دابـوو. (کەنـداڵ کـوردێکی تورکیا بوو کە کۆچـی کردبـوو بـۆ فەڕانـسە.) کاتێـك لــە کلکـەی مـانگی مارسـی ١٩٩١دا هێرشی سەرلـەنوێی ئێراقییەکان کەوتە سەردەور, دانیەل میتران وریایی دا بـە کارناسانی نێوخۆ و دەرەوەی دەوڵـەت. لـە یەکەم حەوتەی سامناکی ئاوریل‌دا کــــــە شەپۆلی کۆچ و پەڕەوازە بوون لــە گـڕی خـۆی دابـوو, مێردەکـەی وا لـــێ کرد کـە فیلمەکانی سەبارەت بە کوردانی بێنوا و پەسار لـە کوێستانان تەماشا بکا.

دانیەل میتران بــە پێـی ئـەزموونی تـافی لاوی خـۆی لــە فەڕانـسەی داگیرکـراوی نازییەکان, تەنگی بە کاربەدەستانی نیزامیی و غەیرە نیزامیی کۆشکی "ئێلیزە" هەڵێنا کە بزانن هەر چۆنێك دەکرێ بەڕێی ئاسـمان‌دا یارمەتی بگەیەننە کوردان, بەڵام ئەوان لــە ئاکام‌دا گوێیان ناکرێ. ئاغای فرانـسوا میتـــران وەهـا کەوتـە ژێـر شـەپۆلی پـەژارەی مەرەدی کوردان کە لـەڕێوە داوای لـە سـکرتێری ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان کرد لـەم بارەدا دەس بە کار بێ, ئەگینا پاریس خۆی ڕاستەوخۆ دەچتە مەیدان. لافـاوی دەربڕینی هاودەنگی بە تەلەفۆن بەرەو باڵوێزخانە و کۆنـسوولـخانەکانی فەڕانـسە لــە ئەمریکا لووزەوی بەست و دەوڵـەتی "بووش"ی تووشی ناڕەحەتی کرد کـە هـەروا بـە تەمابوو دەس لـەسەر دەس دابنێ.

هەڤگرتوویی قووڵ و پتەوی یای میتران لەگەڵ کوردان وێنەیەك بوو لە "داب"ێکی لەمێژین, کە پێشینەی دەگەڕایەوە سەردەمی پاشایەتی, بە گوێرەی ئەو دابە, جاری وابوو نزیکانی تانج و تەخت گیرۆدەی "ئامانجێکی" دوور و درێژ و دژوار دەبوون. ئەو کەسەی ئەوی بۆ لای کوردان ڕاکێشابوو "بێرنارد دۆرێن"ی سیاسەتوان بوو کە لەناکاو بۆ ئەوەی بێتە یاریدەی کوردان, دەستی لە کاری خۆی کێشایەوە, بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆ لەمەڕ ئەوانەوە بزانێ. لە ساڵی ١٩٦٤دا پاش دمەقاڵەیەکی کورت لەگەڵ "ئێریك دو کاربۆنێل", سەرۆکی ڕاستەوخۆی, کە سکرتێری گشتیی وەزارەتی دەرەوە بوو, دەسی لە کار کێشایەوە و وەزارەتی دەرەوەی بەجێهێشت. کاربۆنێل حوکمی لێکردبوو تا ئۆباڵ بۆ بریتانیا بکێشێ کە لە بابەت فرۆشتنی فڕوکەی هاوکێر – هانتێر بە دەوڵەتی ئێراق, فەرانسەی ئاگادار کردۆتەوە. دۆرێن لێرا هێندێك زانیاری لە بابەت ئەم خەڵکەدا کۆ کاتەوە کە پێشینەی خزمەتی سیاسی خۆی بەختی ئەوان کردبوو. لە ساڵی ١٩٦٨دا دەستی کرد بە موتاڵای زمانی کوردی و لێرا کە بێت و لە نزیکەوە بە چاوی خۆی ببینێ و بزانێ لە کوردستانی ئێراق چ دەبوورێ. ئەوان سەردەمان "دۆرێن" لە دەفتەری وەزیری توێژینەوە زانستییەکاندا کاری دەکرد. وەزیر هەم ئیزنی دا و هەمیش بەڵێنی دایە پاش گەڕانەوە بیباتەوە سەرکار: "ئەگەر نەکوژرای." لە ماوەی ئەو شەش مانگەی لەگەڵ مەلامستەفا بارزانی بوو هێندەی نەمابوو بکوژرێ. ئەوکات ڕاست ئەو سەردەمە بوو کە بارزانی بۆ وە دەس هێنانی خودموختاری دیسان لەگەڵ سپای ئێراق تێکهەڵچووبۆوە و شەڕی دەکرد. لە ساڵی ١٩٧١دا دۆرێن سەرلەنوێ ئیزنی گەڕانەوەی بۆ وەزارەتی دەرەوە درایە, ئەویش وەك باڵوێز لە هائیتی, ئەفریقای باشووری, بێرێزیل, ژاپۆن و پاشان بریتانیا کاری کرد و لە ڕۆژانی قەیرانی ئاوریلی ١٩٩١دا, ئەو کاتەی کە بریتانیا و فەرانسە لە ئۆینگێڕانێکی دەگمەندا سەبارەت بە دیاری کردنی زەمانی ئاشتی بۆ ڕزگاری کوردان و پێمل کردنی ئەمریکا لە بابەت ئەو لێپراسروییەی وە ئەستۆی بوو, دەستیان وێك دا, دۆرێن لەگەڵ دەوڵەتی ئینگلیس هەوڵی دا و خەریك بوو.

لـە بـەینی دۆسـتانی دەرەوەی کوردسـتان, یەکـەم کەسـێکی هاتـە مەیـدان پیتێـر گالبـریس, یەکێ لـە ئەندامانی فرە کارای کومیتەی دەرەوەی مەجلیسی پیرانی ئەمریکا بوو. ئەو لـە وەختی لێکهەڵوەشان و تێك‌شکانی ڕاپەڕینی کـوردان, لـە دهـۆك وێـڕای جەلال تاڵەبانی بوو. گالبریس کە لـە بەرگروانانی ماندوویی‌نەناسی کوردان بـوو, لـەو کاتەوە کە کێشەی تەفروتونا بـوونی ژیـانی گونـدەکی کوردسـتانی بـە دەس سـەددام حوسێن, پاش دیدارێکی ڕەسـمی خۆی لـە باکووری ئێراق بـە نووسـینی ڕاپۆرتێـك بـۆ مەجلیسی پیران, چقلێك بوو کە لـە ژێر هەنگڵی سەددام حوسێن و دەوڵەتانی ڕێگـان و بووش هەڵچەقیبوو. لـەو یەك‌شەمـمەی جێژنی پاك‌دا, ئەو یـەکێ لـەم ئـاخر کەسـانە بوو کە بـەر لـە بەسـتڕانی ڕێـی دەربـازبوون بـە دەسـتی ئێـراق, لـە ژێـر ڕەهێڵـەی خۆمپارەهاوێژانی ئێراقی بە دیـجلـەدا گەڕابۆوە سووریا. گالبریس هەر کـە گەیـشتەوە دەمیشق تەلـەفۆنی بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا کرد لـە ئانکـارا و سـەبارەت بـە لێـشاوی سەرەولێژی پەناخوازانی بەرەو سنوور وریایی دا و گوتی کە هەواڵنێرانی ئـەمریکایی و دەرەکیشیان لـەگەڵە. هەر ئەم تەلـەفۆنـە وریـا کردنـەوەك بـوو کـە باڵوێزخانـەی بـۆ سەرەتەقە و بەربەرەکانی لـەگەڵ قەیراندا وە جووڵە خست.

ئەو فیلـمە ڤیدۆیی‌یەی گالبریس لـە پـەناخوازانی بـازرە بـووی هـەڵگرتبۆوە, لـەم یەکەم فیلـمانە بوو کە تەلـەفیزیۆنی ئەمریکا نیشانی دا و چۆنیەتی ئەم کـۆچ و کـۆڕەوە مەزنەی بە خەڵکی جیهان ڕاگەیاند. گالبریس هەر کە گەیشتەوە ئـەمریکا زۆر جـاران هاتە سەر شاشەی تەلـەفیزیۆن و لـەسەر کوردان وەجواب هات. ئەو بۆ یەك‌خـــــستنی تێکۆشانێکی بەربلاو, کە دەوڵـەتی بێ‌مەیلی بووشی ناچـار بـە کـردەوە کـرد, دەوری بەرچاوی گێڕا و بە شێوەیەکی ماندوویی نەناسانە تینی بـۆ وەزارەتـی دەرەوە کـە هـیچ وازی لـەم کارە نەبوو هێنا, کە نوێنەرانی کورد وەخۆ کا. لـەو دەستە کەسانەی تر کـە لـە شێوەی هەڵوێـستی دەوڵـەت لـەگـەڵ کـوردان تـووڕە بـوون دوو ڕۆژنامەنووسـی وەرگـری خـەڵاتی "پۆلیـستز" بـوون. ئـەم دوو کەسـە, یـانی "جـیم هۆگلانـد" لـە واشینگتۆن‌پۆست و "ویلیام سافایر" لـە نیۆیۆرك تایـمز, لـەمێژ بوو پشتیوانی خۆیـان لـە ئاوات و ئامانـجی خەڵکی کورد دەربڕیبوو.

لە سێهەمی ئاوریلدا فرانسوا میتران, "بێرنار کۆشنە" وەزیری کاروباری مرۆڤدۆستانە کە ئادەمیزادێکی زۆر چالاك بوو, بۆ بەرێوەبردنی ئیشی مرۆڤدۆستانە هەناردییە ئانکارا. کۆشنە لەوێ لەگەڵ ترکان بۆ دارشتنی گەلاڵەیەکی حقووقی بە مەبەستی نووسرانی بریارنامەی شووراى تەناهی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پشتیوانی لە کوردانی ژوورەوەی ئێراق دەس بەکار بوو. کۆشنە لە دەسپێکی دەیەی حەفتادا لە ئەندامانی دامەزرێنەری رێکخراوی ناحکوومی "پزیشکانی بێسنوور" بوو. ئەم رێکخراوەیە دواتر لکێکی بە ناوی "پزیشکانی جیهان" پێوە زیاد بوو کە ئیشی خزمەتگوزاری بە پەلە و پێویستی پزیشکییە لە جیهانی سێهەما. کۆشنە بۆ دامەزرانی ئەم رێکخراوەش گەلێکی دەورگێرا. کۆشنە هەڵکەوتەیەکی دەگمەن بوو, سیاسەتوانێ بوو کە لە پرسی کورد چاك راهاتبوو و بێگرێ و بە بیر و بۆچوونەوە دەهاتە سەر شاشەی تەلەفیزیۆن. "پزیشکانی جیهان" چەند ساڵان تاقمێکی نۆژدار بۆ خزمەت بە کوردانی ئێران, لەسەر سنووری ئێران و ئێراق, دامەزراندبوو. کۆشنە کە لە پێخوستکرانی مافی مرۆڤ لە سەرانسەری دنیادا تۆقیبوو, لەمێژ بوو خوازیاری خۆ تێهەڵقوتاندنی کۆمەڵی جیهانی بوو لە بەستێنی پرسی ئینسانی و مرۆڤدۆستانەدا کە بە گوێرەی مێژوو بە خۆتێهەڵقوتاند و دەس خستنە نێو کاروباری وڵاتان مانا دەکرایەوە. ئەو لەم بەڵا و پەژارەدا کە رووی لە کوردان کردبوو, سەرەنجام هەلی بۆ هەڵکەوت کە بتوانێ تێئۆری دڵخوازی وە سەر کردەوە بگێرێ.

بە پێی ئەزموونەکانی پێشوو تەواو وا وێدەچوو کە تورکیا وەها پێشنیارێك کە رێی خۆ تێهەڵقوتاندنی دەرەکی خۆش دەکرد, بێ سێودوو بەرێتەوە پاش. ترکانی ناسیۆنالیست و توندەتەبیات, دەستێوەردانی پر سووکایەتی دەسەڵاتدارانی دەرەکی, بەتایبەت لێژنە مەزەبییەکان بۆ پاراستن و دەربرینی پشتیوانی بۆ کەمینەکانی مەسیحی لە مەودای سەردەمی رووخان و تێداچوونی پێداپێدای ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیان قەت لە بیر نەبردبۆوە و لەم بابەتەوە ئورووپاییەکانیان نەبەخشیبوو. هەروەها تێکۆشانی بریتانیا و فەرانسە و یۆنانیشیان پاش شەری یەکەمی جیهانی, کە دەیانویست ناوەندی

عەنەدۆڵ لە پاشماوەی وڵات جیا بکەنەوە, لە یاد نەبردبۆوە. سەرەڕای ئەمانە, ئەم وڵاتە تەواو "کۆدەسەڵات"ەی کە کەمال ئاتاترك لەسەر ویرانەی عوسمانی پێشوودا بنیاتی نابوو, تەنانەت حاشای لە بوونی کوردان دەکرد, کە گەورەترین کەمینەی هەر وڵاتێك پێكدێنن و ڕێژەی نفووسیان بە لە سەتا بیستی وڵات دەقەبلێنن. ئەم دوایییانە دەوڵەتی ترکان وای هەست پێکردبوو کە غەواران لە بابەت شێوەی ئاکار و جووڵانەوەی ئەوان لەگەڵ ئەو هەزاران کوردەی لە ترسی چالاکی شیمیایی مانگی ئووتی ١٩٨٨ی سەددام حوسێن ڕایانکردبوو و چووبوونە خاکی وێندەرێ و لەبەر پرسی مرۆڤدۆستانە وەرگیرابوون, زۆریان بە خراپە باس کردوون.

بەڵام فەڕانسەوییەکان دەیانزانی کە سەرۆك ئوزەل لە ترکێن پێیخۆش نیە و نایهەوێ کە نیو میلیۆن کورد بڕێژنە تورکیاوە, کە بە قەولی یەکێك لە نێردراوانی ڕۆژاوایی شتێك بوو "بۆ دەوڵەتی تورکیا وەك خۆکوژی". ئەوان سەردەمان ئوزەل لە ئەمریکا بوو و لە ئاخری ئەو پشوودانە بێفەڕەی جێژنی پاكدا گەڕاوە تورکیا. ئەو لەڕێوە شووڕای تەناهی نەتەوەیی تورکیای کە بەهێزترین بنکەی دەسەڵاتی وڵاتە و لە ژێر چەپۆکی نیزامییان دایە, بۆ کۆبوونەوە بانگهێشتن کرد. تێڕژانی پەناخوازان تەنیا دەیتوانی ئاڵۆزبڵۆزی کێشەی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا زیاتر بکا, کە لە ١٩٨٤ەوە بەرەو ئێرە ١٢٠٠٠٠ کەس لە هێزەکانی ئاسایش و لەشکریی خستبووە جەرگەی شەڕێکی نێوخۆ لەگەڵ سەربەستیخوازانی کورد کە پەساپەسا پتر خوێنی پێوە دڕژا. ئێستا ڕۆژنامەکان بە خراپە باسی تورکیایان دەکرد, چونکە تاقمە نیزامییەکانی ئەم وڵاتە بە ئاشکرا ڕێیان لە شەپۆلی پەناخوازان دەگرت بۆ چوونە نێو خاکی وێندەرێ و هەلی وابوو تەنانەت ئەوانیان ناچار دەکرد بگەڕێنەوە کوێستانە سەخت و بەفرگرەکان.

ئەو ڕیککەوتنەی کۆشنە لەگەڵ ترکان کردی, شتێکی لێ پەیدا بوو کە دواتر یەکێك لە دیپلۆماتە فەڕانسەوییەکان لە پاریس بە "کەلامی سێحراوی" ناودێر کرد و بە بۆچوونی ترکان چارەسەرکەری ئەم کەندوکۆسپە چارەسەر نەکراوە بوو. تورکیا ئەندامی شووڕای تەناهی نەبوو و بۆ پشتیوانی لەم گەڵاڵەیە پێویستی بە لایەنگری

یەکێك لە ئەندامانی هەمیشەیی شوورا هەبوو. فەڕانسە کە لەو وەختیەدا سەرقاڵی پێشنووسی بڕیارنامەی خۆی بوو زۆر بە تامەزرۆیی ئەم خزمەتەی قبووڵ کرد. ئەم ڕێککەوتنە پاکانەیەك بوو بۆ تورکیا سەبارەت بە ڕێگرتن لە پەناخوازان و سنووربەڕاندنیان و پشتیوانی لە ناردنی هێز بە مەبەستی دابین کردنی ڕێگای گێڕانەوەیان بۆ سەر ماڵوحاڵی خۆیان – جا چ سەددام حوسێن پێیخۆش یان پێیناخۆش بێ – لە سەر ئەساسی پەیڕەوی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان, واتە ئاماژە بە "هەڕەشە لە ئاشتی و تەناهی جیهان". کاربەدەستانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لووتیان هەڵدەپێچا و بەم کارەیان دەگوت: Refoulement, کە زاراوەیەکی تایبەتە بۆ گێڕانەوەی پەناخوازان. وێڕای ئەوە تورکیا کاتی ئیمزا کردنی کۆنوانسیۆنی نێونەتەوەیی پاش شەڕی دووهەمی جیهانی, کە مافی پەنابەری سیاسی دەدایە پەناخوازان, بە ئاشکرا پەنابەرانی سەر بە سنوورەکانی ڕۆژهەلاتی و باشووری ڕۆژهەلاتیی لەم جەغزە دەرهاویشتبوو. (هەڵبەت ئەم مەبەستە ڕێی لەوە نەگرت کە تورکیا پاش شۆڕشی ئیسلامی ئێران و ڕووخانی خانەدانی پەهلەوی لە ١٩٧٩دا نیزیکەی میلیۆنێك ئێرانی دالْدە بدا. هەروەها لە ساڵی ١٩٨٨دا گەلێکی کوردی ئێراقی پەنا دابوو, کە لەو تاقمە هێشتاش پتر لە بیستوهەشت هەزار کەس لە وێندەرێ مابوونەوە و لە بارودۆخێکی تاڵوتووندا لە هۆردووگاکانی باشووری ڕۆژهەلاتیی تورکیادا دەژیان. زۆربەی ئەم مشەختییانە لە ساڵی ١٩٩١دا گەڕابوونەوە ئێراق.)

ئێستا لە بەرەکەتی دیداری کۆشنە, فەڕانسە و تورکیا بە هاوبەشی, پێشنووسی بڕیارنامەیەکی شۆڕشگێڕانەیان بردە شوورای تەناهی, کە شوورا لەوپەڕی واقوڕمانی زۆرێك لە سیاسەتوانە بەئەزموونەکان, لە ڕۆژی پێنجی ئاوریلدا پەسندی کرد. (ئەم سیاسەتوانانە چاوەڕوان بوون کە یەکێتی سۆڤیەت یا چین یان هەرتکیان وێکڕا بیبەنەوە پاش.) پاش تێپەڕبوونی حەفتا ساڵ بۆ یەکەم جار لە بەڵگەنامەیەکی نێونەتەوەییدا, یانی بڕیارنامەی ژمارە ٦٨٨ی شوورای تەناهی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا

ڕاستەوخۆ باسی کوردان و ناوی "کورد" کرا. ئەم کارە خۆی لە خۆیا بە لاوەچوونێك بوو کە تورکیا بە بێ‌مەیلی ملی پێداهێنابوو. لە ڕاستیدا چارەیەکی تری نەبوو جگە لەمە. دەوڵەتی بووشیش هەروا بوو. دەوڵەتی بووش لەم کارە نارەحەت بوو, بۆچی؟ چونکە ئەم گەلاڵەیە خوازیاری تێوەگلانی تاقمە نیزامییەکان بوو لە باکووری ئێراق, کەچی سیاسەتی دەوڵەتی بووش بەر لە هەموو شتێ گێڕانەوەی هێزەکانی بوو لە کەنداوی فارسەوە بۆ وڵات و دیارە گەلاڵەکەی خۆی ئاوها لێ‌پووچەڵ دەبۆوە.

بەلام جۆرج بووش مەیلی لە یاریدەدانی تورگوت ئوزەل بوو کە لەم ڕەوت و ڕووداوانەدا تێمابوو. لە یەکەم ڕۆژانی ئالۆزبلۆزی پاش پەلاماری ئێراق بۆ سەر کووەیت, ئوزەل بە بەستنی شالوولەی نەوتی ئێراق کە بە تورکیادا تێدەپەڕی, لە سەروبەر پێکهێنانی یەکێتی دژی سەددامدا, بوو بە هاوپەیمانێکی گرینگ بۆ ئەمریکا. زیادە لەمەش, ڕەوتی بەدەنگ و هەرای "تەکووزی نوێباوی جیهانی"ش لە بەرەکەتی فیلمەکانی تەلەفیزیۆنی کە سەرکوتی ڕاپەڕینی تێکشکاوی شیعە و کوردانی پێشان دەدا, خەریك بوو دەبوو بە هەڵمەدووك. بە قەولی یەکێك لە لایەنگرانی گەرموگوڕی "مافی دەستێوەردان", "شووڕای تەناهی بە پەسندکردنی بڕیارنامەی ٦٨٨, بۆ ناردنی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بۆ کوردان و تەواوی جەماوەری ئێراق, بێ ئەوەی سرنج بداتە ڕەزامەندی و ناڕەزامەندی دەوڵەتی پەیوەندیدار, بێ‌گومان ئەم مەبەستەی دەستەبەر نەکرد کە لێرە بە دواوە تازە نابێ دەوڵەتان لەگەڵ خەڵکانی خۆیان خراپ بجووڵێنەوە یان قەلاچۆیان نەکەن, بەلام سەرەڕای تەواوی ئەمانە تازە هیچ وڵاتێك دەسەلاتی نیە کە بە سانایی بتوانێ بەر لە ناردنی یارمەتی مرۆڤدۆستانەی دەرەوە بگرێ."

کوردەکانی ئێراق دۆستێکی لەمێژینەی تریشیان لە ئانکارا هەبوو. ئەم کەسە ئێریك ڕۆلۆ باڵوێزی فەڕانسە بوو لە تورکیا. ئەو بەر لە کەوتنە جەغزی کاری دیپلۆماتیك بۆ ماوەی چەند دەیە یەکێك لە کارناسانی خۆرهەلاتی نێوەڕاستی ڕۆژنامەی بە برشتی "لۆمۆند" بوو. ڕۆلۆ لە مەودای ئەو مانگانەی ئاخریدا کە شەڕی تێدا قەوما "مورتون ئای. ئابراموویتس", گەورە باڵوێزی ئەمریکای لەگەڵ باری ناسك و ورد و باریکی

سیاسەتەکانی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست, بەتایبەتی سرشت و چۆنیەتی کۆمەڵی ئێراق, کە ئەو بەڵگەی دێنایەوە پڕ پێچوفڵووچێڕە لەوەی کە دەوڵەتی بووش بیری لێ‌دەکاتەوە, ئاشنا کرد. ئەو زانیارییانە پەندێکی گرینگ بوون و دەورێکی بەرچاویان لەم کێشەیەدا گێڕا.

ئابراموویتس پێشتر قەت لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست کاری نەکردبوو, بەڵام لە کاروباری پەیوەندیدار بە پەناخوازانەوە پیاوێکی لێزان و بەئەزموون بوو. لە ساڵەکانی ئاخری دەیەی حەفتادا, ئەو کاتە باڵوێزی ئەمریکا بوو لە تایلەند, لە بەربەرەکانی لەگەڵ لێشاوی پەنابەرانی ویێتنامی کە بە "لۆتکەنشینان" مەنشوور بوون, یەکجار سەرکەتوو بوو و لەم گەڕیانەدا لەسەرەخۆیی و دان بەخۆ داگرتنی ڕەوشتییانەی بە شێوەیەکی کارا لەتەك لێزانینەکانی ڕامیاری و ئیداری تێکەڵ کرد. دەوڵەتی تورکیا وەك هەمیشە لە پەیدا بوونی سەروسۆراغی دیپلۆماتەکانی لاوەکی لە مەڵبەندە بارناسکەکانی وڵات, بەتایبەت لە ناوچەکانی سنووری, نارەحەت بوو. بەڵام ئابراموویتس بە بیانووی نیگەرانی لە بابەت ساغی و سلامەتی تاقمێك لە هەواڵنێرانی ئەمریکایی کە لە ئێراق ڕەوی بوون و ئێستا بۆ وە دەس هێنانی زانیاری گەرمەتەندوور لەمەڕ بارودۆخی ژیانی ئەو پەناخوازانە لە کەوشەنی تورکیا ئاپۆرەیان دابوو, وێڕایان بوون, تاقمێکی زۆری لە کاربەدەستانی باڵوێزخانە بە ناوچەدا بڵاو کردبۆوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئابراموویتس بە مەبەستی وە خۆخستنی دەوڵەتی خەواڵووی بووش پەیتاپەیتا پەیوەندی بە واشینگتۆنەوە دەکرد. لێکدالێکدا تێلگرافی بۆ وەزارەتی دەرەوە بەڕێ دەکرد و لەگەڵ ڕایەڵەیەکی بەرین لە دۆستانی خاوەن دەسەڵاتی نێو دەوڵەت و دەرەوەی بە تەلەفۆن قسەی دەکرد و تەنانەت پەیامی بۆ خودی بووشیش دەنارده کۆشکی سپی. ئەو بە ئەزموونێکی کە لەسەر پەناخوازانی "لۆتکەنشین" هەیبوو, بڕوای وابوو کە سەرکەوتن بەستراوەتەوە بەوەی کە چلۆن بتوانێ بە خێرایی ئەم خەڵکە وەخۆ بخا. دیگوت: "لە وەها بارودۆخێکا ئەمە شێوەی کاری منە کە نالەبارترین هەلومەرجم لەبەر چاو بێ و پێ لەسەر دژوارترین بارودۆخ دابگرم."

برینت ئێسکۆ کرافت, ڕاوێژکاری سەرکۆمار لـە شووڕای تەناهی نەتەوەیی‌دا, ئاگـای لـە چالاکییەکانی باڵوێز لـە زەمانی کێـشەی پـەناخوازانی "لۆتکەنـشین"دا بـوو و لێـی سوور بوو ئەو نەهامەتی و چارەڕەشییەی بەرێوەیە بۆ تورکیا و ئەمریکا "لـە ڕادەبـەدەر جیددی" دەبڕێتەوە, هەڵبەت ئەمە وتەی یەکێك لـە دیپلۆماتە ئاگادارەکانی ئـەمریکایی بەسەر ڕایەڵەی پەیوەندییەکاندا بوو. ئابراموویتس لـە ئانکـارا بـێ‌نێوبڕ شـوێنی ڕەوتـی ڕووداوەکانی هـەڵگرتبوو و سـەرۆك ئـوزەلیش پـتر بـە تەلـەفۆن لەگـەڵ بـووش لـە پەیوەندی‌دا بوو.

باڵوێز لایەنگری بەردانەوەی یارمەتی خزمەتگوزارانە بوو لـە ڕێی فڕۆکەوە و هێزی ئاسـمانیی ئەمریکا لـە ڕۆژی حەوتی ئاوریلـەوە ملی لـەم کـارە نـا. بریتانیـا و فەڕانـسە خێرایەکی وە شوێنی کەوتن و کاتێك ئەم مەبەستە بووزی خوارد و ڕێی بۆ خـۆش بـوو کە تورکیا ڕەزامەنـدی خـۆی سـەبارەت بـە کـەلك وەرگرتنـی فڕۆکـان لـە بنکـەی "ئینجرلیك"ی هەڵکەوتوو لـە "ئادەنە" دەربڕی. هێزی ئاســمانیی ئـەمریکا گـەورەترین پۆلـە پاپۆڕی گواستنەوە و گەیاندنی ئاسـمانیی جیهانی لــە ئینجرلیـك وەگـەڕ خـست؛ بەڵام وێڕای ئەم تێکۆشانە, کاربەدەستانی باڵای نیزامیی لـە واشینگتۆن کـە لـەمێـژ بـوو دەیانزانی ئەم کارە شوێنێکی ئەوتۆی نابێ, لـە کۆڵ خۆیان کـردەوە. لایـان وابـوو وەك ئەمە وایە کە چەند دەنکە سەرداری باوێیە پـێش پۆلــە کـۆترێکی زۆر و زەوەنـد. جـا دەردی سەرباری دەردان ئەمە بوو کە هێندێك لـە بەستە فڕێ دراوەکـان لــە ڕەوگـەی خۆیان تلاسا ببوون و بەسەر پەناخوازاندا کەوتبوون و کوشتبوویانن. تاقمێکیش کە بۆ هەڵگرتنەوەی خورد و خۆراکی داباریو هەوڵیان دەدا لـەسەر هێڵی سنوور وە سەر مین پەڕین و تێداچوون. بەڵام ئەم کاروبار و چالاکییە بـۆ فـیلـم لـــێ‌هەڵگرتنەوە دەبـوو و سەرنجڕاکێش دەهاتە بەرچاوان و لانی کەم دەریدەخست کە هاوپەیـمانانیش خـەریکی کارێکن. بووشیش نیازی بەوە بوو کە لـە تەلـەفیزیۆندا بــدیترێ و خــەڵك ببیــنن کــە دوای خۆ شل کردن و ئاوڕ لـێ‌نەدانەوەی پێش‌دا, ئێــستا وە خــۆ کــەوتووە و بــە کردەوەی شێلگیرانەوە هاتۆتە مەیدان.

پاداشتی ئابراموویتس هەر ئەمە بوو کە توانی بڕوا بە وەزیری دەرەوە "جیمز ئێی. بێیکێر"ی "سێهەم" بێنێ هەتا سەردانی جوکورجە – یەکێك لە هۆردووگاکانی زۆزانی پەناخوازان لە سەر سنوور– بکا. لە وەختی دیدارەکەدا, لە حەوتی ئاوریلا, ڕۆژنامەکان ئاورێکی ئەوتۆیان لەم "بێیکێر"ەی چەکمەی گالەوەرێنانی لە پێ بوو نەدایەوە, کە دوای ئەمەی چارەگێك بە باڵەفڕ هاتە نێو ئەم دەیان هەزار خەڵکە لێقەوماوە, باڵی گرتەوە و فڕی. ئەو ئێستا لە خێروبێری وێنەیەکیش دەرچوو کە لێیهەڵگرنەوە, ئەگەرچی وا مەنشوور بوو کە زۆری بایخ دەدا بە خۆ نواندن و زەق بوونەوە لە بەرامبەر ڕاگەیەنەرە گشتییەکاندا. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر لایەنی سیاسی کەسایەتی بێیکێر لە سەرەتادا بۆ ڕووبەڕوو بوون لەتەك ئەم قەیرانەدا هێندێکی دوودڵی نواندبوو, ئێستا بە بینینی جوکورجە زۆر پەشێو و پەژار دەگەڕاوە. "ئەمە ڕەنگە باشترین دوازدە دەقیقەیەك بوو بێ کە بەختی کاروباری ڕزگار کردن کرا." ئەمە کۆبەندیی تێکەڵ بە ڕەزامەندیی ئابرامویتسیش بوو.

بێیکێر ئێستا تێگەیشت کە چارەسەری ئەم قەیرانە پێویستی بە جووڵانەوەیەکی بنەڕەتی نێونەتەوەیی هەیە و هەر ئەمەش بۆ یەکەم جار لە مێژووی سەردەما کوردانی خستە بازنەی کاروباری دەسەڵاتدارانی جیهانی. هەر کە گەیشتەوە دیاربەکر لە فڕۆکەی تایبەتی خۆیڕا کە دەچوو بۆ ئیسرائیل بە تەلەفۆن پەیوەندی کرد بە بووش و ڕیچارد چێنی وەزیری بەرگری و سکرتێری گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان, خاویە پرێز دوکۆئلار. هەرچۆنێك بێ, ئاغای بووش وردە وردە ناچار بوو لە مل نەدانی کەللەڕەقانە و دوورە هەست و عاتیفەی خۆی سەبارەت بەم کوردانەی خۆی تەواو دنەی پەرانپەران بوونی دابوون, دەس هەڵگرێ, چونکە ئەگەر کەسێکی جێی متمانەی بوایە, ئەو یەکە کەس نەبوو جگە لە بێیکێر.

هاوپەیمانانی بووش کە هەر دەهات و تووڕەتر دەبوون, لەسەر بارێکی وا نەبوون بتوانن دان بەخۆ دابگرن. جان مێیجێر, سەرۆکوەزیری ئینگلستان, لە هەشتی ئاوریلا, لە لۆگزامبوورگ لایەنگری و پشتیوانی تەواوی ئەندامانی کۆمەڵەی ئورووپای بۆ

کەلك وەرگرتن لە تیپەسازاوەکان هاوبەندان بۆ دابین کردنی "ناوچەی پارێزراو" لە باشووری ئێراق بە مەبەستی دنە دانی خەڵك بۆ گەڕانەوە, وە دەس هێنا. تەواوی خەڵکی ئینگلستان لەوەی بەسەر کوردان دەهات تووڕە بوون و "مارگارێت تاچێر"یش دەستی کردبوو بە سەرکۆنە کردن. مێیجێر تەمای وابوو سووری کاتەوە کە فەرمان لە کەس وەرناگرێ و مەسەلەی هەوڵی بەجێ لە بابەت کوردانەوە بوو بە کارێکی لە ڕادەبەدەر گرینگی ڕامیاری. ئەو نیازی بەمە بوو کە دەریخا کارێکی ئەوتۆی لە دەس دێ و ئەمە یەکەم قەیرانی سیاسی گەورە بوو, کە لە وەتی لە چوار مانگ پێشترەوە پێی نابووە ماڵی ژمارەی ١٠ی داونینگ‌ئیستریت, تووشی هاتبوو.

تەنانەت فەڕانسەوییەکانیش کە لەم چەند ساڵەی دوایی‌دا ئەوەندەی خەنیمی ئینگلستان بوون, هێندەی هاوکار و هاوبەند نەبوون, کەوتنە ژێر کاریگەری ئەم هەڵوێستەوە. دیپلۆماتە فەڕانسەوییەکان بە مەبەستی سەلماندنی نیازپاکی وچاکەخوازی خۆیان لەم هاوکارییەی ئەم بەرە و بەری خەندەکەدا, دەستیان لەم قسەیەی خۆیان هەڵگرت کە "بیری ناوچەی پارێزراو" لە پێش‌دا ئەوان هێناویانەتە گۆڕ و داکۆکییان کردە سەر مەیل و تاسەی نائاسایی مێیجێر بۆ گرتنی وەها تەمایەکی گرینگ بە بێ پرس و ڕاوێژ لەگەڵ واشینگتۆن. بۆ دەوڵەتی فەڕانسەش کە ماوەی چوارمانگ بوو کەوتبووە شوێن ئەمریکایی‌یەکان و ڕێبەرایەتی ئەوانی قبووڵ کردبوو و ئەوە لە دڵی مەزنەکەسانی نەتەوەخوازی فەڕانسە گران دەهات, کردەوەی دروست لەگەڵ کوردان, یارمەتی سڕینەوەی شوێنەواری ئەم مەبەستەی دا. ئەم ڕووداوە یارمەتی جوان کردنەوەی ڕووکاری فەڕانسەشی دا کە وەك ڕێ خۆشکەری دابین کردنی چەكوچۆڵ بۆ سەددام حوسێن دەناسرا, ئەگەرچی نەیتوانی بە تەواوی بیسڕێتەوە.

فەڕانسە و بریتانیا و تەواوی گەلانی ئورووپایی سەرەڕای ئەم گشتە مەیل و تاسەیەی بۆ یارمەتی‌دانی کوردانیان هەبوو, خۆیان ئەمەیان لە دەس نەدەهات و بە تەنیایی توانایی ئەنجامی کارێکیان لە ناوچەدا نەبوو. جا هەر لە سەرەتاوە تێگەیشتن کە تەنیا چالاکییەکی نیزامیی دەتوانێ لەگەڵ وەها کۆڕەوێکی بەربلاو, لە وڵاتێکی

وەها سەخت و سەرکەشا بەربەرەکانی بکا. هەروەها زانیان ئەوە تەنیا ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە دەتوانێ کارەکانی "لۆژێستیکی"[1] رێکبخا و بەرێوەی بەرێ. زیادە لەمەش بریارنامەی ٦٨٨ و بیری ناوچەی پارێزراو هەروا لەخۆوە خاوەنی مانا و واتایەکی تایبەت نەبوو. دەوڵەتانی فەرانسە و ئینگلیس وەك یەکەم هەنگاوی بە کردەوە بە مەبەستی هاندانی پەنابەران بۆ گەرانەوە سەر ماڵوحاڵی خۆیان, واشینگتۆنیان رازی کرد کە فرینی هێزی ئاسمانیی ئێراق لە باشووری هێڵی ٣٦ – بە رواڵەت بە مەبەستی دابین کردنی فرینی فرۆکە بارهەڵگرەکانی هێرکۆلیسی C – ١٣٠, کە بۆ یارمەتیدان و هاویشتنە خوارەوەی کەلوپەلی پێویست کەلکیان لێوەردەگیرا – بەربەست بکا.

ئەم بەستە و بارانەی فرۆکە C – ١٣٠ یەکان دایاندەباراند, لە راستیدا یارمەتییەکی ئەوتۆ نەبوون بۆ پەنابەرانی کورد. کوردانی تورکیا خۆیان لە ماوەی چەند رۆژاندا یارمەتییەکی یەکجار زۆرتریان لە "مانگی سوور"ی تورکیا و رێکخراوە نێونەتەوەیییەکان و فرۆکەکانی یارمەتیدەری هاوپەیمان, دا بە پەناخوازان. سەرەرای ئەمانە فرۆکە هێرکۆلیسەکان ئەرکی سەرەکی خۆیان بەجێ هێنا. چونکە ئەم فرۆکانە لە لایەن فرۆکە شەرکەر و باڵەفرە تۆپدارەکان و فرۆکە پارێزەرەکانی بنەگر لە "ئینجرلیك"ەوە پارێزگارییان لێدەکرا و لەگەڵیان دەهاتن و دەچوون. وێرای ئەمەش بۆ حاڵی کردنی تیپەکانی ئێراقی, لە پۆلەفرۆکەی پشتیوانیی A–١٠ کەلك وەردەگیرا کە زایەڵەی "زیرە"ی تایبەتییان بە مانای وریایی دان بوو: پەیامێکی بێ هەڵە بوو کە هاواری دەکرد کاتێك هێزەکانی هاوپەیمان دێنە باکووری ئێراق, دەبێ فرۆکە "غەوارەکان" ناوچە بەجێ بێڵن. ئەمەش بە مەبەستی دنەدانی پەناخوازان بوو بۆ هاتنەوەخوار لە کێوان. بۆ دڵنیا بوونی کوردان و بە مەبەستی هەرەشە لە ئێراقییەکان

[1] – کاروباری دابین کردنی شوێن و پەنا و کەلوپەلی پێویست بۆ ژیان و ...

کە ئیتر نابێ کۆڕەوێکی تر بەرەو سنوورەکانی تورکیا و ئێران وەڕێ بخەن, بە مانگ و ساڵان ئەم فڕینانە درێژەیان بووە.

کەلك وەرگرتن لەم بنکانە کە هەر بە شەش مانگ و پاشان هەر بە سێ مانگ جارێك نوێ دەکرایەوە (و دەوڵەتی تورکیا بە ناسەرسەنگی ملی پیّدا دێنا) تەنیا هۆکاری بەرگێڕەوەی کەڵکەڵەی بەغدا بوو بۆ گرتنەوەی سەرلەنوێی ناوچەیەکی بەرفرەوانی باشووری وڵات کە ئێستا کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی بە کردەوەی کوردستان. ئەم هێڵەی بە دڵخواز ڕاکێشرابوو تەنیا هێڵی **٣٦**ی دەگرتەوە کە پتر لە سەتا شێستی جەماوەری کوردستانی بێ لەمپەر دەهێشتەوە, بەتایبەتی زۆرێك لەم میلیۆن و چوارسەد هەزار کەسەی بەرەو ئێران ڕایانکردبوو. بەڵام ئەم هێڵە زۆربەی ئەم ناوچانەی دەگرتەوە کە شوێنی داسەکنینی **٤٠٠** تا **٥٠٠** هەزار پەناخوازێ بوو کە هەڵاتبوونە تورکیا. (هەروەها ئەم هێڵە ناوچە نەوتییەکانی کەرکووکی نەدەگرتەوە و ئەمەش بە مەبەستی کەم کردنەوەی ترسی دەروجیرانەکانی ئێراق بوو, بۆ ئەوەی وا بیر نەکەنەوە کە هاوپەیمانان ڕازی بە پێکهاتنی وڵاتێکی کوردن لە باکووری ئێراق.)

هەڤگرتنی هاوپەیمانان ئێستا دەبوایە بیری بە ئیستلاح "کۆڵانەکانی مرۆڤدۆستانە"ی برەو پیّدابا, یانی لە ڕێوبانان بنکەی تەیار و پڕ لە خورد و خۆراك و ئاو و بێنزین و پێداویستییەکانی پزشکی دامەزراندبا, هەتا پەناخوازان دنە درابان بۆ دابەزین لە چیا و گەڕابانەوە هۆردووگاکانی پێدەشتان کە هەوایان لە کوێستانان خۆشتر و خاوەنی تەناهیش بوون. گەڵاڵەی کرانەوەی ئەم کۆڵانانە کە بە وردی لەگەڵ بنکەی ڕێکخراوی نەتەوەکان لە "ژنێڤ" تویژینەوەی لەسەر کرابوو, خۆی کۆسپێك بوو کە دەبوایە هاوکاری نەتەوە یەکگرتووەکانی بۆ هەڵسووڕاندیان ڕاکێشرابا و کێشەی تاوانی دەستێوەردان لە نێوخۆی ئێراقی بردباوە پاش. دەوڵەتی بووش بە ڕادەیەك تەماداری کێشانەوەی هێزەکانی بوو لەم گێرە و کێشەیەدا کە پێداگربوو هەرچۆنێك بێ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کە هیچ وازی لەم کارە نەبوو, بخاتە جەغزی تەواوی ئەو چالاکییە مرۆڤدۆستانەیەی لە ئێراق بەڕێوە دەچوو و ئەویش هێشتا پێمل نەدەبوو. تەنانەت پەیوەندی گەرموگوڕی نێوان

ئینگلستان و ئەمریکا کە دەهـۆڵ و زورنـای بـۆ هـەڵگیرابوو و هاوکـاری دۆسـتانەی بریتانیا لـە مـەودای ئـازادکردنی کووەیتـا لـە سـەرەتاوە کـەلکی نـەبوو. ئەنـدامانی پارلـەمان وگۆڤار و ڕۆژنامەکان و خەڵکی ئاسایی بریتانیا لـە دەسپێکی ئاوریلـەوە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر تووڕەیی و ناڕەزامەندییان دەردەبڕی. یەکێك لـە ئەندامانی پایەبەرزی وەزارەتـی دەرەوەی ئینگلیس دواتر گوتی: "ڕۆژانێکی سامناك بوون, لـە واشینگتۆن کەس بە لای تەلـەفۆنانەوە نەدەچوو, ئەگەر هێڵی تەلـەفۆنیش ڕێی دابا, دیـسان کـەس نـەبوو وڵامـم بداتەوە!"

لـە نێو کورداندا شەکەتی و توانەوە و بێپەساری – ئیتـر جیا لـە نەبوونی خـورد و خۆراك و ئاوی خواردنەوە و پاك و خاوێنی – بـوو بـە هـۆی پـەرەگرتنی زگـچوون و زگـچوونی خـوێن و تـەواوی نەخۆشـییەکانی لێـوەگر. ڕێـژەی قڕانـی خـەڵك خێـرا پێهەلاچوو, ئەگەرچی ڕەنگە هەر نەگەییێتە ئەو ڕادەی کە کاربەدەسـتانی ئـەمریکایی و وتەبێژی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لـە ئاخری ئاوریلدا لـە ئێـران ڕایانگەیانـد. ئەم دوو سەرچاوەیە ڕێژەی مردنی پەنابەرانیان لـە خاکی ئێراندا, ڕۆژانە لـە هەزارەوە تا دووهەزار کەس قەبلاند. زۆربەی تێداچووەکان منالانی کەمتر لـە پێنج ساڵ و پیرەکـان بوون. کاربەدەستانی ساخڵەمی ئەمریکا وایان دانا کە لـە مـاوەی سـێ حـەوتوو کـۆچ کردندا لـە سنووری تورکیا ٦٧٠٠ کەس کوردی ئێراقی مـردوون, کـە ئەمـە خـۆی ٦٢٠٠ کەس زیاترە لـە ڕێژەی مەرگی ئاسایی لـە باکووری ئێـراق. کۆمیـسێری بـالای ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەنابەران, ژمارەی ئەوانەی لـە گەڕیانی پەناخوازی لـە ئێران تێداچوو بوون بە ١٢٦٠٠ کەسی لـە قەڵەم دا. هەر خودا دەزانـێ چەند کورد لـە نێوخۆی ئێراق یان لـە ڕێگاوبـان و کـوێرەڕێی کوێـستانان کـە بـەرەو سنوور دەچوون, مردن. بەلام گـەلێك کێـل و بـەردی سـاکار کـە نیـشانەی نێـژرانی خەڵکن و هەروەها کۆمەڵەیەك گڵکۆی دیکەش لـە هەموو شوێنان وەبەر چاو دێن.

ئەم شەپۆلی قڕانە ئاخرییەکەی دەوڵەتی بووش و کاربەدەسـتانی نیزامیـی و غـەیرە نیزامیی ئەمریکای وریا کـردەوە. (ڕەخنـەگرانی تونـد و تیـژی تـاقمی هاوپەیـمانان و

ڕەخنەگرانی نێوخـۆ, ئاغـای بووشـیان بـەم وتانـە بەسـەر کـردەوە: گـوڵی ئـەخلاقیی, خوێڕی و بێهەست و سۆز.) لە شازدەی ئـاوریلا, یـانی دوو حـەوتوو پـاش کـۆڕەو, بووش لـە ناکاو هەڵگەڕایەوە؛ هەڵبەت نیـو سـەعاتێك بـەر لـەوە, "دیویـد مـاك", لـە وەزارەتـی دەرەوە, بـە لیژنـەی نێـردراوی دژبـەرانی ئێراقـی گوتبـوو کـە ئەیالـەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا "تەنانەت دۆلارێك و سـەربازێك"یـش بـۆ ڕزگـاریی کـوردان خەسار ناکا. کەچی ئێستا بووش تیپەکانی ئەمریکایی دەنارده جەغزی ئەم بزووتنـەوەی بە "چالاکی بۆ تەناهی" ناودێر دەکرا! ئـەم چـالاکییە سـەربازانی بریتانیـا و فەڕانـسە و هولـەند و ئیسپانیاشی تێوەردەدا, کە سەرجەم ٢١٧٠٠ کـەس دەبـوون. دە ڕۆژ پـاش دامەزرانی یەکەم دەستەی ئەم هێزانە, کوردان بەرەبەرە گەڕانـەوە مـاڵی خۆیـان. ئـەم خەڵکە لـە گەڕانەوەدا زۆر جاران ئەم هۆردووگایانەیان دەور لـێدەدا کـە سـەربازانی هاوپەیـمانان لـە دەرەوەی شاری زاخۆ بۆیان ساز کردبوون. زۆربەی سـەرکەوتنی ئـەم گەلاڵەیە دەگەڕاوە سەرچالاکی تیپەکانی ئەمریکایی بە ناوی "هێزەکانی تایبەت" کە بـە کەلوپەلی پزیشکی و ئامراز و ڕایەڵەی پەیوەندیداری تەواوەوە تەیار کرابوون و بە ڕێی کوێستانان کرابوون. ئەم هێزە هەرخێرایەکی پەناخوازانی بە گوێرەی شار و شارۆچـکە و گوندان ڕێكخست و شوێنی نیـشتنی باڵـەفڕە زلـــحۆرتەکانی کـە بـە دەسـتوبرد خواردەمەنی و خێوەت و پەتوویان دەگەیاندە جێی مەبەست, دیاری کـرد, بـێ ئەمـەی تازە ئیدی مەترسی مردن بە داباراندنی کەل و پەلان لـە ئاسـمانەوە لـە ئارادا بێ.

هەر ئەم دەستوبردە سەرکەوتوانەیە, خۆ گنخاندنی ڕابردووی کـە بـە ئانقەسـت دەهاتە بەرچاو, زەقتر کردەوە. "زانایانی" کۆشکی سپی هـەروا شـێلگیر بـوون لـەسـەر ئەمەی کە "تەکووزی نوێباوی جیهانی" بووش هـەروا بەرقـەرارە و چ بـر نەڕووشـاوە. لـەگەڵ ئەمەش‌دا تەما گرتنی بۆ ئەم مەبەستە گرینگەی هێندە وە درەنگ‌خـــستبوو کـــە ئەگەر ڕاشیگەیاند خەڵك بە کردەیەکی نابەدڵ و بە ناسەرسەنگییان لـە قەڵەم دا.بووش بەم گوێخەواندنە کەوتە بەر ڕەخنەی توند و تیژ, سەرزەنیشتیان دەکرد لـەم بارەوە کە "قەت هیچ هەلێك بۆ کەمتەرخەمی سەبارەت بە مەبەستەکانی بنچینەیی لــە دەس نـادا,

بە بردنەوەیەکی کەم ڕازی دەبێ و لەسەر قومار هەڵدەستێ هەتا بە وەندووکەی بردوویەتەوە, بگەڕێتەوە ماڵ."

بۆ ئەو کەسانەی کە لە دەرەوەی بازنەی نێوخۆی ڕایەڵەی حکوومەت بوون, ئەم گشتە خۆ گنخاندنەی بووش بۆ گۆڕینی هەڵوێست, ئەویش لە بەرامبەر ئەم هەمووە دەرد و چارەڕەشییەی شەو و ڕۆژ لە تەلەفیزیۆنەوە نیشان دەدرا, مەبەستێکی پڕ پێچ و قەمچ و سەرەدەر لێنەکراو بوو. هۆیەکانی ئەم کارە پێچاوپێچ بوو و بە زۆر هۆکارانەوە دەبەسترایەوە کە بریتی بوون لە: جەغزە دیاری کراوەکانی سیاسەتی ئەمریکا,سارێژ نەبوونەوەی کۆنەبرینەکانی پێنتاگۆن لە سەردەمی شەڕەکانی ڕابردۆوە, تێکهەڵچوونی سیاسەتی نێوخۆ و سیاسەتی دەرەوە و ڕێکخستن و دانانی ڕایەڵەیەکی سەیر و سەمەرەی دەوڵەتی بووش لە بەشی سیاسەتی دەرەوەدا. بەڵام تەواوی ئەم هەڵوێستانە خاوەنی لایەنێکی هاوبەش بوون: خۆ دزینەوە و کەلا بوونی بێنێوبڕ لە دژبەرانی ئێراقی, بەتایبەت گرینگترین لایەنی ئەوان, یانی نەتەوەخوازانی کورد. دژبەران هەر خاڵێکی لاوازیشیان بووبێ — کە زۆریشیان هەبوو — تامەزرۆی یاریدەدانی هێزەکانی هاوپەیمان بوون. دژبەران بریتی بوون لە ڕێبەرانی بەئەزموونی تاقمەکانی پارتیزانی, ئەندامانی سوننی مەزەب و نارازی حیزبی بەعس و عولەمای شیعە و سیاسەتوانان. هەر ئادەمیزادێکی ئاقڵ دەزانێ کە پەیوەند گرتن و ئاشنایەتی لەگەڵ ئەم تاقم و مرۆڤە فرەبیچمانە لە هیچ باشترە و هەر چەشنە پەیوەندییەك لەتەك خەڵکەکەیان لە کاوێژی تێئۆرییەکان چاکتریان دەرس دادەدا.

خۆ دزینەوەی ئیدارەی دەوڵەت لە دیداری دژبەرانی ئێراق و نەهێنانە گۆڕی کێشەکانی چ بەر لە شەڕ چ لە گەریانی تێکهەڵچوونی کوەیت و چ پاش حەوت حەوتەی دواتری, نیشاندەری بوونی فرە ڕەنگی جیاوازە لە ترس و دڕدۆنگی. گەلاڵەڕێژانی کاروباری ئەمریکا قسەیان ئەوە بوو کە دژبەرانی ئێراقی بریتین لەم کەسانەی کە لە مێژە پەیوەندییان بە زێدیانەوە نەماوە و بە ڕادەیەك لە جەغزی سیاسەتی ئێراق دوور بوون کە خاوەنی ڕوانگەی بەکەلکی ڕامیاری نین, جا چ بگا

بەوەی کە بتوانن یارمەتییەك بەم چالاکییانە بکەن. پێنتاگۆن متمانەی بـە هـیچ کـام لـە تاقمەکانی دژبەر نەبوو و دەترسا هەر نهێنی و زانیارییەکی لەگەڵیان بێنێتە گۆڕ لـەڕێوە بگاتەوە بەغدا. گەلاڵەڕێژانی نیزامیی کاتێك کێشەکان بـە ئـاڵوگۆڕی نێـو کۆمـەڵانی بێگانەوە گرێ دەدرێن, لایەکی وایان لـێناکەنەوە.

نە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نـە شـەریکە هاوپەیـمانەکانیـشی, هیـچکامیان ماکە و سەرچاوەی ئاگادارییەکانی نیزامیی یا غـەیرەنیزامیی گرینگیـان لـە نێـو ولاتـی چورتـمیش‌کراوی سەددام حوسـێنا نـەبوو. واشـینگتۆن بـەم مەبەسـتەوە وەرەز نـەبوو چونکە خۆی مەسەلەکەی ئاوەژوو دەکردەوە و دەیگوت لەبـەر ئـەوەی بەشـی زۆری شەڕی ئازادی کووەیت لە ڕێی ئاسـمانەوە کـراوە, هـیچ نیازێـك نـەبووە بـۆ وە دەس هێنانی زانیاری لەمەڕ چلۆنایەتی پێکهاتەی کۆمەڵی ئێراق و مێـژووی پێـچەڵفلۆوچ و خوێناوی؛ هەڵبەت دیارە ئەگەر هێزەکانی ئـەردەکی تێوەدرابـان و "گـرتن و ڕاگرتنـی زەوی" لە گۆڕێدا با, ئـەم کـارە پێویـست دەبـوو. وێـڕای ئـەوە شـەڕی ئاسـمانیی, شەڕێکی "خاوێن" بوو بە کەمترین خەسارەوە, لانی کەم بۆ هێزەکانی هاوپەیـمان.

ئەم مەسەلـە کۆن و سواوە, هەڵگری ئەم حەقیقەتەیە کە سەربازان بە یادی شـەڕی پێشۆوە دەچنە مەیدانی شەڕی تازەوە و بە ناچار هێـزی نەتـەوی لـە ڕادەی خـۆی پـتر دەقەبلێنن, لـەگەڵ بۆچوونی پێنتاگۆنیش‌دا یەکتری دەخوێندەوە. ژێنێـراڵ کـالین پاوێـل کە سەرنەوی بوون و شکستی هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا لـە وێتنام و بەیرووت بـیری هەژاندبوو, بۆ وە دەس هێنانی ئامانـجی ناچیزە داوای لانـی زۆری هێـز و کەلوپـەل و چەكوچۆڵی کرد و وەریشیگرتن. کووەیت ئازاد کرا بێ ئەوەی هـیچ دەسـتێکمان لــە بەندا بێ و لـە شەڕی "کۆرە" بەملاوە هـیچ کـۆت و زنـــجیرێ دەس و پێـی پێنتـاگۆنی نەبەستبۆوە. دەگوترا کە دەبێ هێـزە چـەکدارەکانی ئێـراق برسـتی کـردەوەی شـەڕی ناوکی و بیۆلۆژیکی و شیمیایی لـێ ببڕێ. هەڵبـەت پڕوپاگەنـدەی "هاوپەیـــمانان" بـۆ دروســت نوانــدنی ئــەم لـەشکرکێــشییە بــە ســەرکردایەتی ئــەمریکا, ڕادەی هێــزە چەکدارەکانی ئێراقـی بـە زیـادەوە هـەتا پلـەی "چـوارەمین سـپای گـەورەی جیهـان" پێهەڵادەبرد.

کاتێك شەڕ دەستی پێکرد, پاوێل سەبارەت بـە سپـای ئێراق گوتـی: "لـــە پێشدا لەتوپەتی دەکەین و پاشان خاشەی دەکێشین." بەڵام بـە پێـی بـار و کەشـی سیاسـی, پەلـەی ئەمریکا بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ بە ڕادەیەك بوو کە پاوێل پشتیوانی لـە گەڵاڵـەی "شەڕی خاوێنی سەتسەعاتە"ی بووش کرد و ئـەم خاشـەبڕ کردنـەی بـەڵێنی دابـوو, ڕووی کردەوەی بە خۆوە نەبینی. ئەم وردوخاش بوونەی لـە باشوور ئاوقـای هێزەکـانی ئێراق ببوو قەت نەگەیشتە ئاکام. هێزەکانی سەددام حوسێن تەنیا قەبارەیان کەم ببـۆوە, ئەگینا تیپەکانی هەڵبـژاردەی نیزامیـی و پۆلیـسی نـەهێنی کـە بوونیـان بـۆ سـەپاندنی دەسەڵاتی حکوومەت بەسەر خەڵکا پێویست بوو, بـە گـشتی دەسـتیان لـــێنەدرابوو. هەروەها ئەوەندەش بەهێز بوون کە ئێران بـخەنە تەنگەژە, بەڵام نـەك بـەو ڕادەی کـە هەڕەشەیەك بن بۆ دۆستانی عەرەب لـە کەنداو.[1] هەنتەشی تاکتیکی هێزەکـانی هـەڤگر لـە ئێراق سنووردار بوو, چونکە هەر پاش ئەوەی کووەیت ڕزگار کرا, پاوێل دەیویست بە پەلـە هێزەکانی ئەمریکا لـە کەنداو بەرێتە دەر. دیـارە ئەمـەش ئـەرکێك بـوو ئەگـەر جمەوجۆڵ و ئاڵوگۆڕی نێوخۆی کۆمـەڵی ئێـراق – هـەروەها دژبـەرانیش – خرابایـە پشتگوێ زۆر هاسانتر بوو.

دەوڵەتی بووش لـە سەردەمی داگیر کرانی کووەیتەوە بەرەوە ئێرە, بۆ خـۆ بـواردن لـە مەسەلـەی هەڵسوکەوت لـەگەڵ دژبەراندا, خـۆی دەگنخانـد. بەرپرسـایەتی ئـەم گەڕیانە خرایە ئەستۆی بریتانیا کە ڕۆژگارێك ئەربابی کۆڵەداریی ئێراق بوو و وێدەچوو کـە لانیکـەم پێیخۆشـە بـە کاروبـاری وێنـدرێ ڕابگـا. بەرپرسـانی ڕاسـتەوخۆ لـە واشینگتۆن زۆر هاسان بە خۆیان سەلـماند کە ئینگلیسییەکان بۆ ئەم کـارە تـەیارترن, چـونکە هەرچـۆنێك بـێ ئەنـدامانی تاقمـە دژبـەرەکانی لـە لەنـدەن کـۆ بوونـەوە. کاربەدەستانی ئینگلیسی کە زیاتریان پەیوەندی بە دژبەرانی ئێراقییەوە بوو, پێیان وابـوو

---

[1] – دیارە ئەمەش هەمووی وا نەبوو, چونکە لـە ماوەی چەند ساڵی دواترا سەددام حوسێن زۆر جاران هێزەکانی ناردەوە سنووری کووەیت یا وای نواند کە خەریکە بیانێرێ و ئەمریکاش بە خەرجوبـەرجێکی زۆرەوە تیپـەکانی ئاسـمانی و زەوینی بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم هێزانە نارده ناوچە.

کە دەوڵەتی بووش مەیلێکی ئەوتۆی لەم زانیارییانە نیە کە ئەوان دەیخەنە بەر دەستی. لە وەها هەلومەرجێکا گەلالەرێژانی واشینگتۆن کە دەیانگوت خەبەریان لە ڕاپەڕینی کوردان و سەرکەوتنی بەربلاو و دەسپێك و تێکەڵگلانی پاشان و کۆچ و کۆڕەوویانەوە نەبووە, درۆیان نەدەکرد. بەلام نەزانین بەخشش و بەختەوەری نیە. پەناخوازانی بێئەنوا و کێل و بەردی نەتاشراوی قەراخی ڕێوبانان کە نیشانەی گڵکۆی کۆچ کردوان, ئەم وتە پشتڕاست دەکەنەوە.

ئەم خراپ بەڕێوە بردنە هەر لە سەرەتاوە پێشبینیی دەکرا. گەلالەی ئەمریکا تێکەلاوێك بوو لە خۆشباوەڕی و Realplitik و[2] تاکتیکی زیاتر و ئیستراتیژی کەمتر. دیارە ئەگەر ئەو شیمانە و بروا سەیر و سەمەرانە وەڕاست گەڕابان, شتێکی ناحەز نەبوو. نەرمکێشان شتێکی سەیرە, وەختێك کەسێك بیهەوێ ئەوەی لە خۆرهەلاتی نێوەڕاستە تێیبگا – ئەم ناوچەیەی کە لە باری ئاڵوگۆڕی لە نەکاوەوە بە ناوبانگە و لێرە بە شتێکی ئاسایی دێتە ژمار – جا چ بگا بە وەی لەگەڵی بەرەوڕوو بێ و خۆی پێوە خەریك بکا. هیچکەس نابێ سەری لە ڕووداوەکانی دووهەمی ئووت هەتا ئاخری مانگی مارسی ئەوێ دەمێ سوڕ بمێنێ: دووهەمی ئووت ڕۆژێکە کە سەددام حوسێن پەلاماری کووەیتی دا و مانگی مارس زەمانێکە کە شۆڕشی شیعە و کوردانی تێكشکاند.

سەرەڕای تەواوی ئەمانە هەڵوێست و سیاسەتی ئەمریکا هەروا بە "یەك لایەن"ی و قەتیس و چەقیو مایەوە و گوێی نەدایە ڕەنگدانەوەکانی شەڕ کە ڕەنگە حکوومەتی سەددام بگرنەوە. زۆر بەر لەوەی فیشەکێك بۆ ڕزگار کردنی کووەیت بتەقێ, ئەم چەشنە هەڵوێستە بە شێوەیەکی بێفکرانە ساکاری دەنواند. بۆ وێنە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بریتانیا نەیانشاردەوە کە تەمایان وایە وەك بەشێك لە شەڕ هێزەکانیان بنێرنە ئێراق. چاوخشاندنێك بە نەخشەدا دەریدەخست کە وەها خۆنواندنێك تەنیا تاکتیکێکی ساکاری لەشکرییە و ئەقڵیش دەیگوت تەنانەت ئەگەر

٢– واقعبینی, بە واتای ڕووبازاری.

ئەم هێزە سیٚهەزار کەسییەی ئەمریکا پەلاماری بەغداش نەدا, زۆر وێدەچێ بوون و هەنتەشی هەڵلا و ئاژاوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لە ولاتا بنێتەوە و زۆر وێدەچوو شوێن لەسەر کۆمەڵی ئێراق دابنێ.

دروست بەر لە کریسمەسی ١٩٩٠, لە سەردانێکی کورتمدا بۆ واشینگتۆن و دیدار لەگەڵ یەکێك لەم دەگمەن کارناسانەی کە لە یانەی خۆرهەلاتی نێوەڕاستی وەزارەتی دەرەوەدا لە تەماگرتندا بەشداری دەکرد, هەستم کە سۆسەی بە ڕووداوێکی تاڵی داهاتووی دەکرد, گری گرت. بەلام ئەو کات ئاشکرا بوو کە دەوڵەت ڕەپوڕاست دەیهەوێ سەددام تووشی سووکایەتی تێكشکان بکا و هیوادار بوو کە بە خۆشی خۆی کووەیت بەجێ نەهێڵێ.

پاش دامەزراندنی سەرەدای قسان لە کارناسی ئاماژە پێکراوم پرسی داخوا دەوڵەت دەیەوێ ئێراقی دوای شەڕ چلۆن ئێراقێك بێ؟

بە داخەوە هەر دووبەدوو نەبووین, یەکێکی تر لە بەرپرسان یادداشتی لە وتووێژەکەمان هەڵدەگرتەوە و ئەم دیدارە لە لای ئەو بێ نێوەرۆك دەرچوو. بێدەنگییەکی تەواو پاش پرسیارەکەم باڵی بەسەر دانیشتنەکەمان کێشا. دەمویست پرسیارەکەم دووپات کەمەوە, دەترسام پرسیارەکەم ڕوون نەبووبێ. پاشان ئەو کاربەدەستەی هاتبوومە دیتنی, بێ ئەوەی چ بڵێ بە شێوەی خۆی وڵامی دامەوە: زۆر لەسەرەخۆ چاوی لە دیواری باڵەخانەی پێشووی یانەی بەڕێوەبەرایەتی بڕی, کە شانبەشانی کۆشکی سپی بەرزی دەنواند و هەر ئەوەندە. بەم شێوەیە سەرلێشێواوی هەر تەنیا تایبەتی سەردەمی شەڕ نەبوو, بەڵکوو پاش شەڕیشی دەگرتەوە.

تەنانەت نیزیك ساڵێکیش دوای شەڕ, کاربەدەستانی ئەمریکایی لە هەڵوێستی خۆیان دانەدەبەزین. ڕیچارد هاس, بەرپرسی خۆرهەلاتی نێوەڕاست لە شووڕای تەناهی نەتەوەییدا کە خاوەنی هیچ ئەزموونێکی بە کردەوە نەبوو لەم بەستێنەدا, یەکێك لە دەورگێڕانی سەرەکی کێشەکان بوو. ئەویش جگە لە چەندپات کردنەوەی قسەیەکی کۆن و سواو و بێبایخ چی دیکەی لە جانتادا نەبوو: "هەڵوێست گۆڕین بۆ دەوڵەتان

کارێکی ساکار نیە." لە دێسامبری ١٩٩١دا کاتێك هاس هەر لەم عیمارەتەدا بۆ چاوپێکەوتنم ئامادە بوو, نە تەنیا لەم شێوە هەڵوێستە هەستی بە پەشیمانی نەدەکرد, بەڵکوو فیزیشی پێوە لێ‌دەدا. دەیگوت دەوڵەتی بووش هەقی بووە کە سەبارەت بە پەناخوازانی کورد بێ‌مەیلی نواندووە: دەوڵەت کە ناچار بوو بۆ ئەوەی بەری قڕ بوونی کوردان لە برسان بگرێ بە فڕۆکە خورد و خۆراکیان بۆ داباریێ و پاشان بە مەبەستی دنەدانیان بۆ گەڕانەوە, ناوچەی هێور و پارێزراوی بۆ دابین کردن, لە تەواوی ئەم ماوەدا لە ترسی تێوەچوون لە پیسایی تۆقیبوو. هەڵبەت مەبەستی [هاس] تێوەگلان و تلاسا بوونی ئەمریکا بوو بۆ دەرەوەی جەغزی ئامانجە دیاری کراوەکانی شەڕ.

تەواوی گەلاڵەدارێژانی هاوپەیمانان چ لە واشینگتۆن و چ لە پایتەختەکانی ڕۆژاوا تەمادار بوون کە خۆیان لەو شتەی پێیان دەگوت "پشتێندەی غەززە"یەکی تر خۆ بپارێزن. هەڵبەت ئەمە زاراوەیەکی دیپلۆماتیکە بۆ ڕۆچوون بە زۆنگی کۆسپێکی بێ چارەسەردا. هاس گوتی: "زۆران بڕوایەکی ڕۆمانتیکییان سەبارەت بە کوردان هەبوو و گەلێکیان پێخۆش بوو کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تێوەدەن." ئەو لە مەبەستی بە تاوانبار زانینی قوربانیاندا بەتەنێ نەبوو. یەکێك لە کاربەدەستانی لەگوڕ نەکەوتووی پشت مێزان لە وەزارەتی دەرەوە, وەك ئاوخواردنەوە بانگەوازی ڕۆژی پازدەی فێوریەی سەرۆك "بووش"ی بۆ ڕاپەڕین و بڵاوکردنەوەی ئاگاداری بە فڕۆکان بۆ هارووژان و شۆڕش دژی سەددام دەخستە پشت گوێ و دەیگوت: "کوردان سەبارەت بە ڕاپەڕینیان لە پێش‌دا پرسوڕایان بە ئێمە نەکردووە و تەنیا پاش قەومانەکان بوو کە گوتیان بانگەوازی بووش شۆڕشی هەڵگیرساندووە."

فیبی مار, پسپۆڕی زانستی سیاسی و یاریدەدەری مامۆستای زانکۆ و ئەندامی بالای ڕایەڵەی بەڕێوەبەری زانکۆی بەرگری نەتەوەیی, کە ڕاسپاردەکانی گەلێکی یارمەتی دەوڵەت دا, لەم بارەوە گوتی ئەم گەلاڵەیە لە ترسی ئەمە بووە کە نەکا هێزەکانی ئەمریکایی بکەونە بەر پەلاماری تووڕەیی ئەم خەڵکەی ئەوانیان ناخۆش دەوێ, بەتایبەت لە ناوەندی مەڵبەندی عەرەبە سوننییەکان, بەڵگە هێنانەوەی ئەم خاتوونە — ئەگەرچی تاقمێکی زۆریش تێی‌دا بەشدارن — بۆ کەسێکی کە لایەنگری چارەسەری

شەڕی چەکداری بوو, بەڵگە هێنانەوەیەکی سەیر بوو, چونکە لە جبەخانەی کەسانێك قەرزکرابوو کە دژی شەڕ بوون بۆ ئازاد کردنی کووەیت. ئەم تاقمە خەڵکە بڕوایان وابوو کە تەنیا سزا و گەمارۆی ئابووری بۆ وە خۆهێنانەوەی سەددام حوسێن تەواوە و هەڵگیرساندنی شەڕ دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دژی ڕۆژاوا کە حکوومەتانی نەرمەڕێی سەرانسەری جیهانی عەرەب بەرەڕووی مەترسی دەکاتەوە.[1] ملانە و کەڵەوەکێشی بۆ وە دەس هێنانی بەغدا یا ناوەندی کەمینەی جەماوەری سوننی مەزەبی خاوەن دەسەلاتی ئێراق, تەنیا بەربەرەکانی حکوومەت توند و تیژتر دەکاتەوە و ئەگەر بە شەوێکیش حکوومەت خاشەبڕ بکرێ, ئەوکات ئەم حکوومەتەی لە جێی سەددام دێتە سەر حوکم مۆرکی ئەمریکایی وێدەکەوێ و ئەم کارە خۆ کێشانەوەی ئەمریکا لە ڕووداوەکان ئاڵۆزتر دەکا و پای ئەمریکا دەخاتە نێو کەند و کۆسپی بێبڕانەوە. "مار" ئەم وتەشی لێ زیاد کرد گوتی بەتایبەت ئەم بڕیارەش لە گۆڕابوو کە "ئێمە خوازیاری کوردستانێکی سەربەخۆ نەبووین." نە "مار" و نە هیچ کەسی تر لە دەوڵەتی بووشدا سەرنجی نەدایە ئەم وە درۆخستنەوە پەیتاپەیتا و چەن پات کراوەی کوردان کە دەیانگوت ئامانجیان وە دەس هێنانی سەربەستی نیە. کوردان چ بەر لە شەڕ و چ پاش ئەو زۆر جاران ئەم وتەیان چەند پات کردبۆوە و داکۆکییان لەسەر کردبوو. لە ڕواڵەتی قسەکانی "مار"ەوە وا دەردەکەوت کە کوردان خەڵکێکی درۆزن یا بێبایخ یان هەردووکیانن.

کاتێك ڕاپەڕین لە ئێراق سەری هەڵدا و ئێراقییەکان بە هاودەنگی لەگەڵ هاوپەیمانان هەست و سۆزیان دەربڕی و تامەزرۆیی خۆیان بۆ ڕزگاری لە ژێر نیری حکوومەتی سەددام حوسێن نیشان دا, دەوڵەتی ئەمریکا کاس و ناشاد بوو و نەیدەویست پەیوەندییەکی پێیانەوە هەبێ. لە بەختیڕەشی لایەنگرانی بووش چەندین

١- ئەم دژکردەوە پەیتاپەیتایەی لێی تۆقیبوون قەت ڕووی نەدا. لە ڕاستیدا وڵاتێك پتر پشتیوانییان لە دەوڵەتی بەغدا کرد کە مەودایان لەگەڵ کەنداوی فارس زیاتر بوو - بۆ وێنە وڵاتانی باکووری ئەفریقا - کەچی دەوڵەتانی ناوچە ناچار بوون لە بەرامبەر بیروڕای گشتیی خەڵکی خۆیانا سەر داخەن.

بەڵگە سەبارەت بە دنەدانی ئەم خەڵکە بۆ شۆڕش و ڕاپەڕین بە دەستەوە بوو: یەکەم بانگەوازی بووش و ئەو کاغەزانەی بەریان دابوونەوە و داوای لە نیزامییان دەکرد کە ڕیزەکانی سپا جێ بێڵن. پاشان دامەزراندنی ئەو ڕادیۆیەی کە بە خەرجوبەرجی "سیا" لە عەرەبستانی سعوودیڕا بەرنامەی بڵاو دەکردوە, بە سرنج دان بە کردەوەی دەوڵەتی ئەمریکا لە دەیەی ١٩٧٠دا, ئەو کاتەی کە هێنری کیسینجێر لەسەر دەسەڵات بوو و خەیانەتی بە میرات بەجێهێشت ( ئەو داستانەی کە لە بەشی شەشدا با دەدەمەوە سەری) گوتنی ئەمەی کە کوردان بە فێڵبازی دەیانویست سیاسەتمەدارانی زیرەکی واشینگتۆن هەڵفریوێنن, تەنیا دەکرێ نیشانەی نەزانی و بێخەبەری و دڕدۆنگی و یان دەرکەوتنی هەستی گوناهێکی لەمێژین بێ. تەنیا هەستی تاوانێکی کە نیزیکە لە نەخۆشی دەتوانێ پاساو بۆ وتەی پەیتاپەیتای دەوڵەتداران — لە بووشەوە بگرە تا ئەوانی تر — بێنێتەوە کە دەیانگوت ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕێی لە کەس نەشێواندووە.

ترسی ڕۆچوون بە قوڕ و زۆنگا, مەبەستێکی تر بوو کە زیاتر لە مانگەکانی مارس و ئاوریلدا لە کۆشکی سپی قسەی لێدەکرا و ئەم ترسە بە یانگەری دەرسێکی تاڵ بوو کە گەلاڵەڕێژانی سیاسەتی ئەمریکا لە ویێتنام و بەیرووت فێری ببوون.[1] مەترسی

---

١– گەلاڵەڕێژانی سیاسەتی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە کوژرانی **٢٤٣** تفەنگداری دەریایی ئەمریکا لە بەیرووت بە دەس خافڵکوژانی شیعەی ژێربالی ئێران تەواو ڕاچڵەکیبوون. بەڵام ئەم گەڕیانە ڕاستەوخۆ دەگەڕایەوە سەر نەبوونی گەلاڵەیەکی دیاری کراو بۆ ڕاسپێراوی چەکداران و هەر ئەمە بوو کە ئەوانی لە پێشدا لە سیاسەتەکانی لوبنان و پاشان هی ناوچە وەردا. لە مەودای پەلاماری ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان لە ساڵی پێشترا, ئەم تفەنگدارانە و هەروەها هێزەکانی هاوپەیمانان بۆ چاوەدێری بەسەر ڕاگوێزرانی ڕێکخراوی ڕزگاریدەری فەلەستین لە بەیرووت, نێردرابوونە لوبنان. پاش تەواو بوونی ئەم ڕاسپێراوییە تفەنگدارانیش بەیرووتیان جێهێشت. پاش ئەوەی ئیسرائیل بەڵێنی خۆی لەسەر داگیر نەکردنی ڕۆژاوای بەیرووت, خستە ژێرپێ و نیمچە نیزامییانی هاوپەیمانی مەسیحی خۆی بۆ قەلاچۆکردنی خەڵکی هۆردووگاکانی سەبرا و شەتیلا دنە دا, تفەنگدارانیان گێڕایەوە لوبنان. بە پێچەوانە, دەرد و مەرەدی پەناخوازانی کورد ئاکامی ڕاستەوخۆی ئەم چالاکییە نیزامییە بوو کە بە ڕێبەرایەتی ئەمریکا کرا و خەڵکی ئەمریکا جیاوازی نێوان ئەم دوو تێکهەڵچوونەیان بە لاوە ڕوون بوو.

٢– ئاماژیە بە دە حوکمی ئایینی.

سیاسی هەڵگیرساندنی شەڕ بە بێ ڕاکێشانی پشتیوانیی ڕاستەقینەی خەڵك ببوو بە "حوکمی یازدەهەم"ی "ئەحکامی ئایینی"[٢] پێنتاگۆن. هەروەها کۆشکی سپی لە کەڵەکە بوونی کوژراو و بریندارانی شەڕ تۆقیبوو و تێوەچوون بۆ نەجاتی کوردان دەبوو بە لە مەترسی خستنی گیانی هێزەکانی هاوپەیمان. بەڵام لێکدانەوەی بووش چەواشە دەرچوو, چونکە هەروەك هەڵسەنگاندنی بیروڕای خەڵك دەریخست, هەر چەندی بووش خۆی لە یارمەتیدانی ئەوان دەپاراست, شەپۆلی هەستی لایەنگری لەوان پتری پەرە دەگرت. خەڵکی ئەمریکا فام و تێگەیەنێکی ئەخلاقیی ڕوونتریان هەبوو, تێگەیبوون کە ئێراقییە بێتاوانەکان بۆیە سەریان دادەنێن کە گەلاڵەڕێژانی سیاسەتی واشینگتۆن بە هەڵە وایان بیر دەکردەوە کە ئەمریکاییەکان بە هیچ شێوەیەك خۆ لە قەرەی شەڕێکی بەرفرەوانتر نادەن.[١]

ترسی تایبەتی "مار" لە بەرەوڕوو بوون لەگەڵ "دوژمنایەتی خەڵك" نیشاندەری بڕوایەکە سەبارەت بە بێگانەنەویستی نەتەوەخوازیی عەرەب بە گشتی و حیزبی بەعسی سوسیالیستی ئێراق بەتایبەتی. سەرنجی "مار" کەوتبووە سەر ئەو ساڵانەی کە لە درێژایی ئەوا و دوابەدوای هەرەسی پاشایەتی لە ١٩٥٨دا گۆدەتای پەیتاپەیتا لە بەغدا دەقەوما و دەوڵەت بە دوای دەوڵەتا دەهاتە سەر حوکم و دەڕۆیشت. ئەو قەت ئەم بیرەی بە هاسانی نەدەبردە مێشکەوە کە ئێراقییەکان بۆ وە لانان و دەرباز بوون لە ژێر هەڤدە ساڵ دەسەڵاتی بەعسدا کە پڕاوپڕە لە شەڕ و کارەساتی دەرەوە و سەرکوتی توند و تیژی نێوخۆ, پێشوازی لە یارمەتی غەواران دەکەن. لێرەدا وا وێدەچوو کە سیلەچاوێکی داوەتە پڕوپاگەندەی بەعسییەکان کە ئیددیعا دەکەن ئێراقیان کردۆتە وڵاتێکی "پێشکەوتوو" و بەهێز و باوەڕبەخۆ و لە دین تلاسا.

١- بە گوێرەی وەرگرتنی بیروڕای خەڵك لە لایەن دامەزراوەی "گالوپ"ەوە کە لە ١١ی ئاوریلی ١٩٩١, لە ئینتر نەشناڵ هێراڵدتریبیۆن دا بلاوکراوە, لە سەتا پەنجاونۆی ئەو کەسانەی بڕوایان وەرگیرابوو, لایان وابوو کە هاوپەیمانان دەبوو هەتا ڕووخاندنی سەددام حوسێن دەستیان هەڵنەگرتبایە و هەروەها لەسەتا پەنجاوحەوتیان ڕازی بە خرانەخوارەوەی باڵەفڕە تۆپدارەکانی ئێراق بوون.

ئەگەر ئێراقییەکان خۆیان بە شێوەیەك حکوومەتی بەعسیان رووخانـدبا — کـە لـەم رووەوە بێشك لـەگەڵ تەواوی پشێوی و ئاڵۆزییەکانی پێویست بۆ برینـەوەی خاشـەی دەسـەڵاتی درێژخایـەنی بـەعس بەربـەرەکانی دەکـرا — ئـەم خاتوونـە لـەم بیـری دەستێوەرنەدانە لـە نوێ کردنەوەی بنەڕەتی دارشتنی فکـری کۆمـەڵی ئێراقـا بـە تـەنیا نەدەبوو. کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە لـە "خـۆڕاگری شۆڕشـگێڕانە" لـە بەرامبـەر هەنتەشی هێزەکانی هاوبەندا لە ئێراق تـرس و خۆفیـان دەنوانـد. کەچـی لـە تـەواوی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستا, ناسیۆنالیزمی عـەرەبی سـوننی مـەزەب و کـاکڵ و نێـوکی کـە هەڤگرتنی عەرەبان بگرێتەوە, دوای سـەرکەوتنی ئیـسرائیل لـە شـەڕی شـەش ڕۆژەی ١٩٦٧دا, کەوتە هەڵـدێری نـەمان و دارزان؛ ئەگەرچـی ئـەم ناسـیۆنالیزمە هێـشتاش هەروا شوێنی بەرچاوی دەکردە سەر گەلاڵەدارێـژانی سیاسـەتی ڕۆژاوا کـە بـە هـۆی سەرهەڵدانی ئیسلامی بنەماخـواز و ئـەم دژوارییانـەی کـە پەرەپێـدانی دامـەزراوە دێموکراتیکەکانی پێدەویست, توند ڕاتڵەکابوون. بە بڕوای عەرەبـە نەتـەوەخوازەکان, لە نێوان ساڵانی ١٩٧٠–١٩٨٠وە جگە لە ناسیۆنالیزمی کورد, چ شتێك هەڕەشـەی لە بایـخەکانی نەدەکردن, چونکە ئەم نەتەوەخوازانە, ئەم نەتەوە غەیرە عەرەبـەی کـە لە ژێر ئاسـمانا شـوێنێکیان دەویـست و لـە لایـەن ئێـران و ئیـسرائیل و ئاخرییەکـەی ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە چاوەدێری دەکـران, بـە چـاوی سـەمبولی هێرشـی زایۆنی و ئەمپریالیستی سەیریان دەکردن کە ئاوقای بایـخەکانیان دەبوونەوە. لە دەیەی ١٩٨٠دا تامەزرۆیی کوردانی ئێراق بۆ دامەزرانـدنی دامـەزراوە دێموکراتیکـەکان بـە دابی ڕۆژاوا, بە ڕادەیەك بوو کە هەوڵە بێوچانەکانی ئایەتوڵڵا خومەینی بۆ ڕاکێشانیان بەرەو ئیسلامی بنەماخواز لە چەشنی ئێران, نەزۆك هێشتەوە و ئەمە تەنیا لەبەر هەنـدێ نەبوو کە ئەوان سوننی مەسەب بوون و لە ئاست شیعەگەری ئایەتوڵڵادا سەریان با دەدا.

ئەو شتەی کە بە شێوەیەك لـە ناوەنـدی سەرنـجان کـلا دەکـرا, زوڵـم و زۆر و چەوساندنەوەی حکوومەتی خۆ بە زلزانی سەددام حوسێن بوو کە تا ڕادەیەکی زۆر لە سەر تەوەرەی "کەمینە"ی خۆمەخۆمە لە نێوخۆی کەمینەیەکی عـەرەبی سـوننی مـەزەبا

بوو کە تاقمی دەسەڵاتداری بەغدای پێکدێنا. دوای تێپەڕبوونی مـاوەی چـەند سـاڵان, خۆ ئەوە کۆمەڵی عەرەبی سوننی مەزەبی ئێراق نەبوو, کـە لـە سـەتا بیـستی سـەرجەم جەماوەری وڵاتی پێکدێنا و ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەسـەڵاتی دەسـەپاند, بـەڵکوو بنەماڵـەی بەربڵاوی خودی سەددام لـە شاری "تکریت"ی زاگەی بوو کە بەسەر وڵاتا حکوومەتی دەکرد.

ئاوها بوون کارگێڕانی ڕامیاری و سپایی سیاسەتی ئەمریکا کە زۆر بەر لـە دەسپێکی شەڕ لـە نێوەڕاستەکانی ژانویەی ١٩٩١دا لــە شـوێنی خۆیـان دامـەزرا بـوون. ئەگـەر گەلاڵەداڕێژانی واشینگتۆن جارێك بیریان لـە ئێراقی پـاش شـەڕ کردبێتـەوە, ئـەم بـیرە هەمیشە لـە چوارچێوەی گۆدەتایەکی سپایی یـا بـە واتەیـەکی تـر حکوومـەتی "سـوننی مەزەبێکی بە دەسەڵاتی تر" و بە شیمانەی زۆر لـە بنەماڵەی بەربڵاوی خـودی سـەددام حوسێنا, خولی داوە. بێمـەیلی سروشـتی لــە وەگـەڕ خـستنی بـیر و مەشـق پێکردنـی پەیوەندیداربە نوێ کردنەوەی پێکهاتەی ئێراقـی دوای شـەڕ بـە هـۆی خۆشـاردنەوەی وەزارەتی دەرەوە و بەتایبــەت پـسپۆڕانی خۆرهـەڵاتی نێوەڕاسـت لــە کۆبوونـەوەکانی گەلاڵەڕشتندا پـتری خـۆ نوانـد, چـونکە هـەر ئـەم پـسپۆڕانە بـوون کـە ڕەوگـەی پەیڕەوەکانیان دیاری دەکرد.

یەکێك لـە کۆسپەکانی جێسرنـجی وەزارەتی دەرەوە بێمەیلی بێیکێـر, وەزەریـری دەرەوە بوو, سەبارەت بە کاروباری خۆرهـەڵاتی نێوەڕاسـت. ئـەو کـە بـیری بـە لای وێككەوتنەوەی سەرلـەنوێی ئەڵـمان و ئاویلکەدانی کومۆنیزم لـە ئورووپای ڕۆژهەڵات و یەکێتی سۆڤیەت و وتوویژەکانی سەبارەت بە کەم کردنەوەی چەکە ناوکییەکانەوە گیرسابۆوە, هەتا ١٢ی ئووتی ١٩٩٠ ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی لـەسەر پێوشـوێنی خـۆی ڕەها کردبوو و دوای ئەودەمیش لـە ماوەی چەند حەوتووی سەرەتای ڕووداوەکانـەوە, لـە قەراخا مایەوە. وەڕەز بوونی لـە چنگ چۆنیەتی جووڵانەوە و وێككــەوتن لـەگــەڵ سەرەكوەزیری سەربزێوی ئیسرائیل, واتە ئیسحاق شامیر, یارمەتی تێگەیشتن لـە بابـەت بێمەیلی ئەو سەبارەت بە ناوچەوە دەکـا. بـەڵام هەرچـۆنێك بـێ بێیکێـر, ئـەم یەکـە

سەوداچییە, هەر ئەوەندەی ئۆگری بە سیاسەتی دەرەوە بوو کە بزانێ لە واشینگتۆن چ ڕەنگدانەوەیەکی دەبێ و چ شوێنێك دەکاتە سەر ئاواڵی لەمێژینی, واتە جۆرج بووش. یەکێك لە کەڵە یاریدەدەرانی دەیگوت: "ئەگەر هەتا کۆتایی ئەم هەزارەیە لە بابەت داهاتووی درێژخایەنی یەکبوونەوەی ئەڵمان یام لێكبڵاوبوونی یەکێتی سۆڤیەت قسەت لەگەڵ بێیکێر کردبا, هەست و مەیلێکت لە چاویدا بەدی نەدەکرد؛ بەڵام ئەگەر لەتەك ئەوا تێکەڵاوی و هەستان و دانیشتنێکی زیاترت بوایە قسەی ئاوات نەدەکرد." ئەو وەزارەتی دەرەوەی بە شێوەیەك ڕێكخستەوە کە پیشاندەری خواستی خۆی بێ. ئەو هەر لە سەرەتاوە پێ پشتئەستوور بوو بە دەستەی هەڵبژاردەی بچووکی خۆی و لای لە ناوەند و دەفتەرە پسپۆڕییەکانی وەزارەتی دەرەوە نەکردەوە.

لە دەوڵەتێکی ترا "دەفتەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا" دەبوو بە ناوەندی تەما گرتن سەبارەت بە چۆنیەتی پەیوەندی پڕ پێچوفڵووچی نێوان کوردان و شیعان و توێژی دەسەڵاتداری سوننی مەزەبی ئێراق. لە سەردەمی بەرپرسایەتی بێیکێردا ئەم دەفتەرە بە دەگمەن هاتە کایەوە. کاتێك ئێراق پەلاماری کووەیتی دا دژکردەوەی بێیکێر, دژکردەوەیەکی تووڕانە بوو. وای هەست پێکرد کە "دەفتەر" بە کەمتەرخەمی خۆی ئەوی خستۆتە بارێکی نالەبارەوە و هەلومەرجی دروست بۆ هەڵنەسەنگاوە و هەلی دۆڕاندووە. دیزە و گۆزە هەموو لە سەروسەکوتی "ئێپریل گلاسپی", باڵوێزی ئەمریکا لە ئێراقدا, شکا. ئەم کارەش بە ڕەزامەندی جیمز بێیکێر و کۆڕی تایبەتی خۆی و "جان ئیچ. کلی", سەرۆکی ڕاستەوخۆی خاتوو گلاسپی بوو, کە یاریدەدەری وەزارەتی دەرەوەش بوو. تەواوی تاوانەکانیان لە بابەت شکستی سیاسییەوە کە بنج و بناوانیان دەگەڕایەوە کێشەکانی بەر لە چوونی ئەو بۆ بەغدا و لە دەوروبەری ١٩٨٩دا ڕوویان دابوو, خستە ئەستۆی ئەو. تەواوی ئەندامانی "دەفتەر" لەبەر چاوی کۆمای تایبەتی بێیکێر, ئەگەر بە تاوانباریش نەناسران, هەر نەبێ کەوتنە بەر شك و گومانەوە. هەروەها یەکێك لە یاریدەدەرانی باڵا گوتی: "کاتێك مەسەلەی کاری کارناسی و زانستی پسپۆڕی لەمەڕ ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و ئێراقەوە لە گۆڕا

بوو, بێیکێر و کەسانی دەورەبەری هەموو چاویان لە زاری ئیپریل گلاسپی بوو, بەڵام ئەو لە جەغزی باس و وتاری کەسانێکا نەدەگونجا کە بە چاکە باسی کەس بکەن."

لە ڕاستیدا دەزگای بەڕێوەبەرایەتی ئەمریکا بە گشتی و بێیکێر و کۆزیلەی کارگێڕانی بەتایبەتی, تاوانی نەبوونی قوژبنپشکنی بیر و زەینی خۆیان دەکەوتە ئەستۆ کە دەمێك بوو لەسەر یەك کەڵەکە کرابوو. لەو وەختیدا کە شۆڕشگێڕانی ئیسلامی باڵوێزخانەی ئەمریکایان لە نوامبری ١٩٧٩دا, لە تاران داگیر کرد و دیپلۆماتەکانیان بۆ ماوەی ٤٤٤ ڕۆژ بە دیل گرت, تەواوی سەرۆکانی "دەفتەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا" و وڵات بە گشتی, هەستیان بە دژی ئێران لە گڕی خۆیدا بوو. دەوڵەتی بووش لە ڕەنگدانەوەی هەر چەشنە کردەیەکی سیاسی کە ڕەنگ بوو بە باری بوونی پەیوەندی لەگەڵ حکوومەتی بنەماخوازی تاراندا مانا بکرێتەوە, تۆقیبوو. بێزاری زۆرێك لە ئەمریکاییەکان [سەبارەت بە ئێران] بوو بە ناخۆشویستنی تەواوی شیعان. هەڵبەت با ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە شیعەکانی ئێراق لە حکوومەتی پاشایەتیدا بە ڕادەیەك تەرکەدین ببوون کە زۆربەی ئەندامانی حیزبی کومۆنیستی ئێراق لە ڕیزەکانی ئەوانا سەریان هەڵدابوو. خومەینی ئێستاکە بەتایبەتی وڵاتی ئێران و شیعەکانی بە گشتی کردبوو بە هەوێنی ڕق و ناخۆشەویستی خەڵکی ئاسایی ئەمریکا. لە سیاسەتی نێوخۆی ئەمریکادا شتێك بە ناوی شیعەی چاك وجوودی نەبوو.

بۆ چما هەر ئەم ئێرانییانە نەبوون کە دەوڵەتی "ڕۆناڵد ڕیگان"یان لە ماوەی شەڕی خۆیان و ئێراق لە نێوەڕاستی ساڵەکانی ١٩٨٠دا و لە گەڕیانی بەرنامەی مامەڵەی "چەك بە دیل"دا هەڵفریواند؟ تەنیا خۆشەویستی فرەی خودی ڕیگان بوو کە توانی سەرەككۆماریێتی ئەو لەم کەند و کۆسپەی بە "ئێران — کۆنترا" ناودێر کرا, ڕزگار بکا. ئەم گەڵاڵە نەفامانەیە لە لایەن شووڕای تەناهی نەتەوەیی و "سیا" و ئیسرائیلەوە داڕێژرابوو کە بە گوێرەی وی قەرار بوو لە بەرامبەر دانی چەكوچۆڵ و ئامرازی پێویستی شەڕ بە ئێران, ئەو کەسانەی لە لایەن هاودەستانی ئێرانەوە لە لوبنان بە دیل گیرابوون, ئازاد بکرێن و قازانجی دەسکەوتی ئەم سەودایە — بە پێچەوانەی یاسای

پەسند کراو – بۆ دابین کردنی خەرجوبەرجی ئەم "کۆنترا"یانە کـەلکی لـــێوەربگیرێ کە لـەگەڵ حکوومەتی مارکسیستی نیکاراگۆئەدا شەڕیان دەکرد.

وەها کردەوەیەکی نەفامانە تەنیا دەیتوانی بە قازانـجی ئێراق بێ. پاش وەدەرکەوتنی دەریاوان "جان پۆئین دێکستێر" و سـەرهەنگ "ئۆلیـوێر نـورس" لـە شـووڕای تـەناهی نەتەوەیی وڵات, بۆ کەڵتە کردنەوەی وێرانییـەکان, کارناسـانی پـسپۆڕ و بەئـەزموونی کاروباری دەرەوەیان گێڕایەوە شووڕای تەناهی نەتەوەیی. دەوڵـەت گەیشتە ئەم ئاکامـە کە دەبێ سەبارەت بە بەغدا هێندێك چاوپۆشی هەبێ. هەڵـدانی ئـاڵای ئەستێرەنیـشانی ئەمریکا لـە ١٩٨٧دا لـەسەر نەوتکێـشەکانی کووەیـت کردەوەیـەکی ئاشـکرای دژی ئێرانـی و هـاودەنگی لـەگـەڵ ئێـراق بـوو بـە تۆڵــەی کـردەوەی ئێـران لــە گـەڕیانی "ئێران – کۆنترا"دا. بەم شێوەیە واشینگتۆن پێداپێدا سیاسەتی نزیك بوونەوە لـە سەددام حوسێنی دەس پێکردەوە. دوو ساڵ بەر لـە هێرشی سەددام حوسێن بۆ سـەر ئێـران لــە ١٩٨٠دا, ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خۆی لـە سیاسەت و هەڵوێستی بێلایـەنی بواردبوو و دەسـمایەیەکی زۆر و زەوەندی بۆ کڕینی بەرهەمی کشتوکاڵی دابـوو بـە ئێراق. پاشان ساڵی ١٩٨٣ دەستی کرد بە هەوڵ و تێکۆشان بۆ گەمارۆی چەكوچـۆڵ دژی ئێران. لـە ساڵی ١٩٨٤دا پەیوەندی دیپلۆماتیکی لـەگەڵ ئێراق دەست پێکـردەوە و ساڵی دواتر دەوڵـەتی ڕێگان لـە پەیوەندییەکانی خۆیدا ئێراقی دایە بەرەو. ئێستا, لــە دوا قۆناخەکانی شەڕا, دەوڵـەتی ڕێگـان وێـڕای هاوبەنـدانی ئورووپـایی خـۆی هـەروا توندتر لـە جاران مەیلی بەرەو بەغدا بوو و تـەواوی ئـەم شـتانەش تـەنیا بـە مەبەسـتی بەرەگە برینەوە لـە هەر چەشنە سەرکەوتنێکی شۆڕشی ئیسلامی دەهاتنە گـۆڕ, چـونکە شۆڕشی ئیسلامی خـەریکی ڕووخانـدنی حکوومـەتانی نەرمـەڕێی و ڕووەو ئـەمریکا و پەلامار بۆ سەر ئیسرائیل بوو. واشینگتۆن وردە وردە ئەو وێنانەی کە مانگـە دەسـکردە سـیخوڕییەکانی ئـەمریکا لـــە شـێوەی دامــەزران و مەتــەرێزەکانی هێزەکـانی ئێرانـی هەڵیاندەگرتنەوە, داینی بە ئێراق و ئێراقیش ئەم زانیارییانەی کـە بـە وردی ئامانـــجیان دیاری دەکرد, بە شێوەیەکی بەرچاو لـە شەڕی شاراندا کـەلکی لـــێوەرگرتن. ئـــەم شەڕە هێرشێکی مووشەکی بوو, بە مووشەکی "ئێسکاد" کە سەرەنـجام ڕێـی شکـستی

یەكجارەكی ئێرانی لە بەهاری ١٩٨٨دا خـۆش كـرد. ئـەمریكا تەنانـەت لـە كۆتـایی شەڕی ئێـران و ئێراقـا بـە سـافیلكەیی پـشتیوانی لـە ئێـراق كـرد — وەك بـەهێزترین دەسەلاتی نیزامیی لە ناوچەی كەنداوی فارس.

سیاسەتگێڕانی واشینگتۆن بە خۆیان سەلـماندبوو كە سـەددام حوسـێن لـەمپـەرێك دەبێ لە بەرامبەر ئێراندا كە كوەیت, عەرەبستانی سعوودی و تەواوی ولاتانی خاوەن نەوتی عەرەب نیازیان پێی بوو. بەلام كۆسپی بنەڕەتی ئەمـە بـوو كـە سـەددام حوسـێن سەرەڕای نەمانی سـامانی, میلیاردهـا دۆلاری لــە ڕێكخـستنەوە و سـازدانەوەی هێـزە چەكدارەكانی خەرج دەكرد، ئەم پشتیوانی كردنەی ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكای وەك بانگهێشتن بۆ سەر ڕێبازی فام و تێگەیشتـن لێكنەدەدایەوە. بە پێچەوانە وای لێك دەدایەوە كە ئەگەر بێتوو كوەیت بگرێ هەروا مفت بۆی دەربـاز دەبـێ و ئـەمریكاش كە بە وتەی خۆی حازر نیە گیانی دە هەزار ئەمریكایی لە گۆڕەپـانی شـەڕا فیـدا بكـا, دەترسێ و نایەتە بەرەوە.

ئەمـجۆرە هەڕەشەوگوڕەشانە شێوەی ئەزمواوی سەددام حوسێن بـوون و نـەدەبوو جێی سەرسوڕمان بن. وێڕای ئەمانەش دەولـەتی بووش بە ڕوالـەت وای بـیر دەكـردەوە كە ڕەنگە سەددام حوسێن لەم كـارە پەشـیمان بێتـەوە, هـەروەك لــە سـالانی دەیـەی ١٩٧٠دا پەشیمان ببۆوە. ئەو لەوان سالاندا هەر ئەم ولاتە عەرەبییانەی كە ئێـستا بـە ڕەزامەندی ئەمریكا بەلاگێڕەوەیان بوو, هەلچۆقاندبوو. لە ڕاستیدا سەددام قەت ئـەم فرتوفێلەی وەلا نەنابوو, چونكە لە گەڕیانی شەڕی ئێراق و ئێراندا كە بـێ پـرس یـا ئاگاداری واشینگتۆن دەستی پێكردبوو, ئەم ولاتە عەرەبییانـەی بـە چـاكی دۆشـیبوو و كاتێكیش شـەڕ كۆتـایی پێهـات, لــە حانـد دانـەوەی ئـەم پوولانـەی بـە كەلـەزەڕی لێیوەرگرتبوون — بە بیانووی ئەوەی لە چنگ تەفروتونا بوون بە دەستی ئێران نەجاتی داون — سەری بادا.

سەرەڕای ئەمانەش, لە واشینگتۆن هیچ كـەس كـەمترین گومـانێكی سـەبارەت بــە قەوارە و نێوەرۆكی حكوومەتی زالـمانەی بەعسی ئێراق نەبوو. پرسێكی كە لە گۆڕێدا

بوو کەلك وەرگرتن لەم دەسەلاتە مرۆکوژەی بەغدا بوو بە دژی حکوومەتەکەی دیکە لە تاران. پێشینەی حکوومەتی ئێراق بۆ ژێر پێخستنی بە ئاشکرا و دڕندانەی مافی مرۆڤ و کەڵەگایی لە ولاتانی تری عەرەبی, هاوسەنگی پێشینەی پێخوست کرانی مافی مرۆڤ لە ئێران و تەمای ئاشکرای ئەم ولاتە بوو بۆ ڕووشاندن و بێ ئابڕوو کردنی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ناردنی شۆڕشی بنیاتخوازی ئیسلامی بۆ ولاتانی دی. هەرچۆنێك بێ ئەم هەڵوێست و سیاسەتەی لە گەڕیانی شەڕی ئێران و ئێراقدا بەجێ بوو, تەنانەت دوای ئەوەی کە خومەینی ڕایگەیاند کە ناچار بووە "پیاڵەی ژار بخواتەوە" و سەددام لەسەر دەسەلات بێڵێتەوە, پێداهاتنەوەی لەسەر نەکرا. ئەم وتە نەخشینە کە بۆ بەجێ نواندنی پێمل بوونی ئاگربڕ لە ٢٠ی ئووتی ١٩٨٨دا دەکار کرا, زۆر بە توندی خەون و خەیاڵی ناردنی شۆڕشی بۆ ولاتان کۆتایی پێهێنا و ئەمە نرخێك بوو کە دەبوا خومەینی بۆ پاراستنی کۆماری ئیسلامی لە نێوخۆی ولاتا بیدابایە.

***

کۆتایی هاتنی شەڕی ئێران و ئێراق بەڕێوەبەرانی سیاسی ئەمریکای وا لێنەکرد کە لە بەرامبەر ئێراقدا بە هەڵوێستی خۆیانا بێنەوە. نابێ لە هەق لادەین کە سەددام حوسێن هەلی ئەم کارەی ڕەخساند: چوار ڕۆژ پاش ڕاگەیاندن و بەڕیوەچوونی ئاگربەس, هێزەکانی ئاسمانیی و تیپەکانی زەوینی ئێراق لە هەڵمەتێکی کە بە وردی گەلاڵەی بۆ داڕێژرابوو, بە پانەوە دژی کوردان دەستیان بۆ چەکی شیمیایی برد و دەیانهەزار کەسیان ئاودیوی تورکیا کرد و تاقمێکی بێ ژماریشیان کوشت. کەلك وەرگرتن لە گازی ژاراوی "سەرکۆنەیەکی توند و تیژتێپەڕ"ی "جۆرج شوولتس"ی وەزیری دەرەوەی بە دواوە بوو. وتەبێژێکی وەزارەتی دەرەوە دەس بردنی سەرلەنوێی بۆ چەکی ژاراوی وەك کردەوەیەکی "دزێو و بێجێ و قێزەوەن و هەرگیز نەسەلماو بۆ جیهانی پێشکەوتوو" مەحکووم کرد. ئەوان دەمان من ڕاپۆرتی سەبارەت بە هاتنی پەناخوازانی تۆقیوم بۆ کوردستانی تورکیا ئامادە دەکرد و لە بیرمە کە بە دەیان سکەم خستە داخڵەی ئەو تەلەفۆنەی بۆ سەیری ڕۆژگار لەسەر ئەم کێوە قوت ببۆوە, هەتا

بتوانم یەكێك لە هاوكارانم لە واشینگتۆن بدوێنم و لێی‌بخوازم كە پەیوەندی بە وەزارەتی دەرەوە بكا: داخوا هەر ئەم بەڵایەی بەسەر كوردان هاتبوو، دەرفەتێكی بەجێ نەبوو كە دەوڵەت لە سەددام دوور كەوێتەوە و هەڵوێستێكی بەئینسافانە و بێلایەنانە سەبارەت بە ئێراق وە بەر چاو بگرێ؟ (چەند ساڵ دواتر كە تەراز و هاوسەنگیی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست گۆڕابوو، دەوڵەتی كلینتۆن بۆ دوور بوونەوە لەم دوو حكوومەتە تووك لێ‌كراوەی بەغدا و تاران، هەڵوێستی هەوساری دوولایەنەی دەكار هێنا. ئەگەر ئەم هەڵوێستە لە ١٩٨٨دا بەڕێوە چووبا، زۆر لەوانەبوو كە بەری بە هەڵگیرسانی شەڕی كووەیت گرتبا. بەڵام لە نێوەڕاستی ساڵەكانی دەیەی ١٩٩٠دا مانایەكی ئەوتۆی نەبوو و سیاسەتی ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكای پتر تووشی گرێ و گۆڵ كرد.)

ئەم قسە كردنەم لەگەڵ واشینگتۆن گەرچی تا جێیەك شوێنی خۆی دانا، بەڵام ئاكامێكی بەرچاوی لێ‌نەكەوتەوە و نەدەبوو خۆم ماندوو كردبا، ئەگەرچی شادمانم لەمەی كە هەرچۆنێك بێ چیم بینی گێڕامەوە و نووسیم. چی بێ و چۆن بێ، كۆتایی شەڕی ئێران و ئێراق ئاكامێكی بەرچاوی كە لێی‌كەوتەوە ئەمە بوو تەواوی دەوڵەتانی ڕۆژاوایی بە هیوای نووسینی ڕێككەوتنامەی چاك و چەور بۆ سازدانەوە و نوێ كردنەوەی ئێراق وەك شێتان كەوتنە لامەلامەی سەددام حوسێن. ئەم چنۆكییە نەفامانەیە تەنانەت سەرەنجی نەكەوتە سەر ئەم خاڵە ساكارە كە سەددام حوسێن چل میلیارد دۆلار — بە بڕوای هێندێكان هەشتا — میلیارد دۆلار یەك‌جێ بە عەرەبان و یەكێتی سۆڤیەت و وڵاتانی ڕۆژاوایی قەرزدار بوو. ناردنی كەلوپەلی ئەمریكا بۆ ئێراق وردە وردە دەستی پێكرد و لە ١٩٨٩دا دەوڵەتی بووش بە ئاشكرا بۆ پێشكەش كردنی یارمەتی پتر بە ئێراق ڕووی‌خۆشی نواند و پاوانی سەردەمانی شەڕی نێوان ئێراق و ئێرانی كەم كردەوە؛ هەروەك دواتر ڕیسوایی فرۆشتنی بە دزی چەك و تەقەمەنی لە لایەن شەریكە و دامەزراوە ئەمریكایی و فەڕانسەوی و بریتانیایی‌یەكان، كێشەكەی بە ئاشكرا ڕوون كردەوە.

چەند ڕۆژ پاش کەلك وەرگرتنی ئێراق لە چەك و تەقەمەنی شیمیایی, مەجلیسی پیرانی ئەمریکا بە هۆی ژێر پێخستنی بەڵێننامەی ساڵی ١٩٢٥ی ژنێف لە بابەت قەدەخە بوونی کەلك وەرگرتن لە چەکی شیمیایی, بە زۆربەی دەنگ گەمارۆی توند و تیژی ئابووری خستە سەر ئێراق. چالاکانی بواری مافی مرۆڤیش وردە وردە کەوتنە پێوشوێنی ئیددیعاکانی ڕابردووی کوردان کە دەیانگوت کەوتوونە بەر پەلاماری سیاسەت و هەڵوێستی تۆوبڕکران و کەس لای لێ نەکردبوونەوە. بەڵام ئەو پەسندکراوە بە هۆی شەڕ و گیرەیەکی لە کۆنگرەدا لەسەر "سنووری دەسەڵاتی قانوونی" هەڵگیرسابوو, نەزۆك مایەوە. دەلاڵە دەسەڵاتدارەکانی فرۆشی گەنم و برینج کە لەگەڵ سەددام حوسێن سەودایان هەبوو, قسەیان لێ کردبوو. دەوڵەت زۆر بەدەماخ بوو کە وەها بازاڕێکی قەوغای بۆ بەرهەمەکانی کشتوکاڵ دۆزیوەتەوە و نیگەرانییەکی سەبارەت بە چاك بوون یان نەبوونی دەستێوەردانی ئەم دەلاڵانە لە داسەپاندنی سیاسەتی خۆیاندا لە پەیوەندی لەگەڵ ولاتێکی ئەم گشتە قسەی لە دوو بوو, دەرنەبڕی.

هیچ کەس لە دەوڵەتی کۆماریخوازاندا پەرۆشی ئەم مەبەستە نەبوو کە بڵێی سەددام حوسێن ئەم دلاوایییە چلۆن لێك بداتەوە, هەتا چەند ساڵ دواتر کە دەوری ئێراق لە چەپەڵکاری بنکەی "ئەتلانتا"ی بانکی "بانکا ناسیۆنالە دێل لاڤرۆ"دا ئاشکرا بوو. هەروەها هیچ کاربەدەستێکی ئەمریکایی واقی نەبردەوە کە ئاخر چۆنە ئەم ولاتە عەرەبییەی لە کۆنەوە بە لایەنی کشتوکاڵدا خۆبژیو بووە, ئێستا نیازی هەیە کە بایی چەند میلیارد دۆلار دان و دانەوێڵە لە دەرەوە بکڕێ. ولامی ئەم پرسیارە سادە بوو: داهاتی نەوتی ئێراق و دەسگیرۆیی هەلومەرج هاسانی ئەمریکا بالی ئەم ولاتەی دەگرت کە لە خێروبێری زەویوزاری بەرێژەوی کوردستان بچێتەدەر کە ئێستا بە مەبەستی سزدانی خەڵکی ئاسایی و پێشمەرگان چۆل کرابوون. حکوومەتی ئێراق بە ڕادەیەك لە داهاتووی نەمانی ئەم هەرزانبژیوییە تۆقیبوو کە خۆنیشاندانێکی "خۆڕسکی" لە دەرەوەی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغدا ڕێکخست. هەر لەو وەختەیدا کاربەدەستانی بانکی ناوەندیی ئێراق "بەدزی" بە تاقمێکیان گوتبوو کە خەزێنەی

پـووڵی ولآت وەهـا هەڵـچۆڕاوە كـە ئێـراق تەنانـەت لـە بەرامبـەر گەمارۆیـەكی كەمخایەنیش‌دا خۆ نەگرە.

شكانی گەمارۆی پێشنیاركراو, "دەفتەری كاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشـووری ئاسیا"ی هەتا ڕادەی تەواو خاترجەم كرد. ئەم دەفتەرە قەت دژایەتی خۆی لەگەڵ ئـەم كارە نەشاردبۆوە و بە جۆرێك كە یەكێك لـە كۆنە ئاواڵەكانـم لـە ساڵی ١٩٩١دا لـەم دەفتەرە پێی‌گوتـم دەترسان كە: "ئورووپاییـيـەكان شـتێكی زیـاتر بفرۆشـن و ئێمـە شوێنەوارمان نەمێنێ." ئاواڵەكەم گوتی: "ئەگـەر وا بوایـە سـەددامی تووشـی كارێـك دەكرد" كە دوو ساڵ دواتر كردی, یانی دەسدرێژی بۆ كووەیت. "لامان وابـوو دەبـێ پەیوەندیـمان لـەگەڵ ئێراق, كە یەكە دەسەڵاتداری لـەشـكریی ناوچـە بـوو و چەشـنی دێوێك بەسەر كەنداوا زاڵ بوو, بپارێزین, هەتا بتوانین سەددام حوسێن هەس دەینەوە و دەستی پێ لـە ئاژاوەی پـتری شـەڕخوازی هـەڵگرین و لـە هارووژانـدنی سرشـتە زۆر خراپەكانی خۆ بپارێزین." بەڵام بۆ چـما هێرشـی شـیمیایی سـەددام حوسـێن بـۆ سـەر كوردان — ئـەویش خـەڵكی ئاسـایی خـودی ئێـراق — بـۆ سـوور بوونـەوەی شـێتێتی هەوسارپساوی بەس نەبوو؟ ئەم ڕووداوە پاش ئاگربـەس قـەومابوو و كردەوەیـەكی بـە ئاشكرا تۆڵەوەرگرانەوە بوو و تەمایەك نەبوو كە بڵـێین لـە گەرمـە و جەنگـەی شـەڕا گرتوویەتی.

جگە لـەو مـاوە كورتـەی كـە تێی‌دا گومانێـك كەوتـە دەروونـی گەڵاڵەرێـژانی غەیرەنیزامیی و هەرخێراش وە درۆیـان خـستەوە, هـەتا بـەهاری سـاڵی ١٩٩٠ تـەنیا كاربەدەستی ڕەسـمی ئەمریكا كە سەددام حوسێنی پاش ئـاگربڕی سـاڵی ١٩٨٨ وەك باجگرێكی سەربزێو هێنایە ژمار, ژێنێراڵ شوارتسكۆف بوو كە لـە سـاڵی ١٩٩١دا بـۆ سەركردایەتی ئەو هێزەی هاوپەیـمانان هەڵبژێرا كە كووەیتی ئـازاد كـرد. لـە هـاوینی ساڵی ١٩٨٨دا ئەم ژێنێراڵە سیاسەتزانـە, "سـەركردایەتی ناوەنـدیی سـپای ئەیالـەتـە یەكگرتووەكانی ئەمریكا"ی وە ئەستۆ گرت, كە لـە سـاڵی ١٩٨٣دا بـۆ بەربـەرەكانی لـەگەڵ مەترسی هەڕەشەی یەكێتی سۆڤیەت لـە كەنداوی فارس پێكهاتبوو. ئەو تەواوی

ئەو گەلآلآنەی کە لە ١٩٤٧ەوە تا ئێستا, سەبارەت بە ناردنی هێز بۆ باکووری ئێراق ڕێکوپێک کرابوون و هاتبوونە پای نووسەران, وەك مۆتەکەیەکی لۆژێستیکی, وە لایەکیەنان. جا هەرچۆنێك بێ شەڕی سارد وردە وردە کۆتایی پێدەهات. بەڵام شوارتسکۆف لەم پلە و پایەدا سەرنجی دایە شتی باشتر: ئەو بە هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی ورد و دروستی ئاگربەسی ئێران و ئێراق بەم ئاکامە گەیشت کە ئێراق لە کاتێکا ئەم شەڕەی تەواو کردووە کە یەك میلیۆن کەسی چەکدار هەیە و باری ئابووریشی لەوە لاوازترە کە بتوانێ ئەم گشتە سەربازە بگێڕێتەوە سەر ژیانی ئاسایی.

هەڵبەت وەزارەتی دەرەوە جارناجارێك و لە مەودای شەڕی نێوان ئێران و ئێراقدا, دەکارهێنانی چەکی ژاراوی مەحکووم کردبوو و ئەوە تەنیا وەزارەتی دەرەوەی وڵاتانی ڕۆژاوایی بوو کە کەلك وەرگرتنی ئێراقی لە چەکی شیمیایی, لە ئووتی ١٩٨٨دا بە دژی کوردان, بە ئاشکرا مەحکووم کرد و بەڵێنی لە دەوڵەتی ئێراق وەرگرت کە ئیتر لەم جۆرە چەکوچۆڵانە کەلك وەرنەگرێ. بەڵام دەسەڵاتی بەعسی بۆ پەیمانشکێنی لە نێو ورد و درشتیدا مەنشوور بوو. جا هەرچۆنێك بێ بەڵێننامەی ژنێڤیش دەس بردن بۆ چەکی شیمیایی لە لایەن دەوڵەتانەوە بە دژی هاووڵاتیانی خۆی نەدەگرتەوە. کاتێك ئێراق ڕەزامەندی خۆی دەربڕی بۆ بەشداری کردن لە کۆبوونەوەیەکدا کە لە ژانویەی پاش کەلك وەرگرتن لە چەکی ژاراوی, لە لایەن گەورەهێزانی ڕۆژاواییەوە پێکهات و مەبەستیش سەلماندن و دووپاتی سەرلەنوێی کەلك وەرنەگرتن لەم چەکانە بوو, بەغدا تەنیا وەختایەکی بانگهێشتنەکەی قبووڵ کرد کە دەوڵەتی فەرانسە بەڵێنی دا کوردان تەنانەت وەك چاوەدێریش بۆ بەشداری کردن بانگێشتن نەکا.

لە پایزی ساڵی ١٩٩٠دا, "دەفتەری کاروباری ڕۆژهەلآتی نیزیك و باشووری ئاسیا" کە لە سیاسەتی خۆیدا بە مەبەستی هەسدانەوەی سەددام حوسێنا تێشکابوو, گیرۆدەی قەیرانێکی نێوخۆییش هاتبوو کە ئەوەتەی هەبوو شتی وای بە خۆوە نەدیبوو و ئەم قەیرانە یەکجار کزی کرد. لەم تاقمە خەڵکە باوەڕ پێکراوەی کە بێیکێر بە یاریدەی ئەوان وەزارەتی دەرەوەی هەڵدەسووڕاند, کەسێك لە "دێنیس ڕاس" گرینگتر نەبوو. ڕاس یەکێك لە هەڵبژێراوانی سیاسی دەوڵەتی ڕێگان بوو و ئێستا سەرۆکی

"دەستەی بەرنامەدارشتن" بوو کە گرێ و کۆسپی وەزارەتی دەرەوەی ڕەها دەکرد, ئەگەرچی کەمتاکورتێك پارسەنگی لـە "دەفتـەران" کـەمتر بـوو, بـەڵام لـە وەزارەتـی بێیکێـردا ئـەم شـتانە هـەمێتێکی وایـان نـەبوو. برشـتی ڕاس دەگـەڕاوە سـەر دەسوێراگەیشتنی سووك و هاسانی بە بووش, چونکە لـە گەڕیانی چالاکی هەڵبـژاردنی ساڵی ١٩٨٨دا ڕاوێـژکاری بـواری سیاسـەتی دەرەوەی بـوو. ئـەو کـە لـە بـەرەی "نوێپارێزگاران" بوو و ئۆگریی خۆی سەبارەت بە ئیسرائیل نەدەشاردەوە, تەمای وابوو کە پەر و باڵی "دەفتەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا" هەڵپاچێ, کە هەر لە کۆنەوە یەکێك لە پرشنگدارترین یانەکانی وەزارەتی دەرەوە بوو.

کاتێك بێیکێر و دارودەستەی لە "کار"ی دەفتەر بوونەوە, ئیتر "دەفتەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیـك و باشـووری ئاسـیا" وەك دەزگایـەکی قورمیـشیی سـاکار دەچـوو. بەرپرسایەتی کێـشەی پـر ژانەسـەری ئیـسرائیل و عـەرەبان خرابـووە ئەسـتۆی دانیـەل کورتسێر, کە دیپلۆماتێکی بەتوانا بوو و لە قاهیرە و تلاویو کاری کردبوو. جـا سـەیر لـەوە دایـە کـە کورتـسێر وەك یاریـدەدەری جێگـری دەفتـەر, لـە جیـاتی ئـەوەی وڵامدەرەوەی سەرۆکی ڕاسـتەوخۆی بـێ, وڵامـدەرەوەی سـەرۆکی "گەڵاڵەدارشـتنی سیاسی" بوو. پێوەندییەکانی بیست گەلی عەرەب خرابووە ئەستۆی دەفتەر, بەڵام بێیکێر بۆ ئەمەی سووکایەتیشی خستبێتە سەر ئازاردان, "جان کلێی" کردبوو بە سەرۆکی, کە بە بڕوای هەموان قاڵۆرترین و ئاژاوەگێڕترین سەرۆکێ بوو کـە "دەفتـەری ڕۆژهـەڵاتی نیزیك و باشـووری ئاسـیا" بـە خۆیـەوە بینیبـوو. لـە ڕابـردوودا ئـەم ئیـشە دەدرا بـە کارناسانی ئاشنا بـە کاروبـاری جیهـانی عـەرەب کـە خـاوەن ئـەزموونی بـەکردەوەی نەپساوە بوون, چەشنی سەرۆکی ڕاستەوخۆی پێشووی, ڕیچارد مۆرفی یـا کارناسـێکی بەڵەد لە کاروباری ناوچەدا وەك "ئالفرێد لوروی ئـاترتۆن" و بـورۆکراتێکی بـەتوانای وەك "جۆزێف سیکۆ". بەڵام تـەنیا ئەزموونگـەی "کلێـی" لـە خۆرهـەڵاتی نێوەڕاسـتا, باڵوێزخانەی ئەمریکا لە لوبنان یان بە واتەیەکی تر "مارۆونستان", یانی هەر ئەو قوڵکە سەروکلكپەڕاوە مەسیحیەنشینە بوو کە لە مەودای گەشت و گەڕانیـدا لـە ساڵانی

لای نێوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠دا بۆ دیپلۆماتێکی ئەمریکایی بە شوێنێکی پەنا ناسـرابوو. کلێی کە پیاوێکی توند و تیژ و خۆ بە زلـزان بوو و تـەواوی هاوکـاران و بەردەسـتانی زۆریان ڕق لێی بوو, توانی ئەو جێیەی کە لـەمێژ بوو ڕێكوپێك و بەکارترین دەفتـەری وەزارەتی دەرەوە بوو بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباران, تەواو دڵسارد کاتەوە.

"دەفتەری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا" بەر لـەوە قەت لـە درێژایی مێـژووی پڕ گێرە و کێشەی خۆیدا — کە کارناسانی جیهانی عەرەب بێبڕانەوە دەکەوتنـە بـەر تاوانبار کران بە دەس دەڵاڵانی زایۆنی — ئاوا هێزی لـێنەبڕابوو. ئـەم کـارە ئەوپـەڕی ئاواتی دەڵاڵاکانی زایۆنی بوو و ئاخرییەکەی بوو بە کارەساتێکی ناخۆش.

لـەگەڵ پەلاماری ئێراق بۆ سەر کووەیت "دەفتەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیـك و باشووری ئاسیا" کە بایخ و ورەیەکی بۆ نەمابۆوە, چورتەی لـە خۆی بـڕی و مـەیلێکی وای لـە دەروونیدا بەدی نەکرد کە دابنیـشێ و دەس بداتـە شـێوەیەك خـۆ پـشکنینی ئەوتۆ کە مەبەستی وەدەرخستنی بیری نوێ بێ لـە ژێر هەرەسـی وێرانـەکانی سیاسـەتی ئابڕووتکاوی ڕابردۆوە. یەکێك لـەو دیپلۆماتانەی ئەوان سەردەمان بە توندی خـەریکی بەرنامەدارشتن بوو گوتی: "هەر بەڕاستی دەفتەری ڕۆژهـەڵاتی نێوەڕاسـت و باشـووری ئاسیا ئەوەندە بـێهێز و نەشـە بـوو کـە وازی قـسە کردنـی نـەبوو. کەسـیش پرسـی پێنەکرد." هەر ئەم دیپلۆماتـە ئـاوای درێـژەدا: "کۆشـکی سـپی و شـووڕای تـەناهی نەتەوەیی تەما سیاسییەکانی دەگرت، جیـا لــە لایـەنی تـەواو نیزامیـی, کـە بـە بـوونی "هاس"ەوە لـەوێ, خاوەنی کەسێکی پسپۆڕ نەبوو لـە کاروباری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا.

ڕەخنـەگران لــە وەزارەتـی دەرەوەی ئـەمریکا و تـەواوی وڵاتـانی ڕۆژاوایـی یـان کوردان, کارێکیان بەم هۆك و بەرهۆك و لـەنگـولۆرییانە نەبوو. ئەمانە بڕوایـان وابـوو کە تەواوی پسپۆڕانی جیهانی عەرەب تەنیا سەرنـجیان داوەتـە سـەر شـوێن تێکـردن و بەسـتنی ڕێککەوتننامـە بـە خێروبێرەکـان لــە وڵاتـانی خـاوەن نـەوتی ناوچـەدا و زۆر لـەمێژیشە کە حکوومەتـە زۆردارەکـان و تەنانـەت ئەوانـەی کـە خـراپترین پێـشینەی نەپاراستنی مافی مرۆڤیان بووە, کەوتوونـە بـەر لاواندنـەوە و بەسـەر کرانـەوە. چـون ئاقیبەتەکەی ئەوە کێ بوو کە ماك و کەرەسەی شیمیایی و زانستی پسپۆڕی و تەنانـەت

زۆرجاران ئەندازیار و كارناسی پێویستی بۆ كارخانە شیمیاییەكانی ئێراق دابین كرد, كە سازكراوەكانیان ئەم گشتە كوردەی كوشت؟ كوردان ڕۆژنامە ئورووپاییەكانیان دەخوێندەوە و دەیانتوانی باسی زۆر نووسراوەتان سەبارەت بەم شەریكە ئورووپاییانەوە بۆ بكەن كە دروست لە وەختی ئەنجامدانی چەپەڵیدا, لە گەریانی ئەم بازەرگانییە گومان لێ كراوەدا كەوتبوونە داو؛ ئەو بازەرگانییەی كە لەمێژبوو دەوڵەتانیان لە حاندی چاویان دەقووچاند. پوختە و ناوكی ئەم بڕوایە لای وابوو كە بەرپرسانی پسپۆڕی جیهانی عەرەب – لە وەزارەتی دەرەوەدا – یا بە قەستی خۆیان گێل دەكەن یان كەسانێكی زگماك تەنكەبیرن یان هەردووكیان. ئەویش نەك بەم هۆیە كە سرشتی زاڵمانەی زۆربەی حكومەتەكانی خۆرهەلاتی نێوەڕاست, بەرێوەبردنی ئەركی دیپلۆماتیكی ئەوانی كە ئاشنا بوونە لەگەڵ خەڵك لە مەودای كار و پاشكارا, بەرووەڕووی تەنگەژە دەكاتەوە, بەڵكوو لەبەر ئەوەی بە بڕوای ڕەخنەگران، كاربەدەستانی ڕۆژاوایی سەرەڕای كەندوكۆسپی سەررێیان بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ خەڵكی ژێردەسەلاتی ئەوان حكوومەتان, زۆرتر مەیلیان لە پێهەڵاگوتنی فەرمانڕەوایانە.

بۆ لەسەر وەجواب هاتن لەم كاربەدەستانە دەبێ بێژین كە ئەم دیپلۆماتە ئەمریكاییانە درەنگ لەگەڵ بەعس بەرەوڕوو بوون.[١] پێوەندی دیپلۆماتێكی نێوان ئێراق و ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ساڵەكانی ١٩٦٧–١٩٨٤ پسابۆوە و تەنیا ڕێی پێوەندی ئەمریكا و بەغدا دەفتەرێكی بچووك بوو كە پارێزەری بەرژەوەندییەكانی خەڵكی ئەمریكا بوو. زۆر بەر لە هێرشی سەددام حوسێن بۆ سەر كووەیت، حكوومەتی چەك لە شانی وەها زاڵببوو دیپلۆماتەكان بە ڕادەیەك تاق كەوتبوونەوە و خەڵك هێندە ترسابوون كە باڵوێزخانەی ئەمریكا یا هەر نوێنەرایەتییەكی سیاسی تر كەمترین زانیاری لە مەڕ حاكم و مەحكوومەوە نەبوو. "دێیوید نیۆتۆن",

١– هەرچۆنێك بێ, لەمێژ بوو كە گومان دەكرا ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و بریتانیا لەگەڵ گۆدەتای یەكەم و دووهەمی ١٩٦٣ و ١٩٦٨ی بەعسا دژایەتییان نەبووبێ, چونكە بەعسییەكان دژایەتی ئەم كومۆنیست و ناسرییانەیان دەكرد كە دەیانویست دەسەلات وە دەس بگرن.

باڵوێزی پێشووی ئەمریکا دەیگوت: "چمان دیبا هەر ئەوە بوو، سەرچاوەی کۆ کردنەوەی زانیاریمان زۆر کەم بوو. ئێمە قەت بە ڕاست و دروستی نەماندەزانی لە وڵاتا چ ڕادەبرێ. تەنیا دەنگۆ بوو، ئەوەی ئێمە بە "تەلگرافی ڕووح"مان ناودێر کردبوو." هەر دەتگوت کاموسی ڕووخانی دەزگای پاشایەتی ئێران — کە بێخەبەریی دەزگای دەوڵەتی سەبارەت بە هێزەکانی دژبەری ئێرانی بە ڕوونی نیشان دابوو — لێرەش دووپات دبۆوە. لە هەردوو بابەتەوە کارناسانی ڕۆژاوایی ناچار بوون نژمێکی "نوێخواز"انە و "چاکساز"انەی کە بنکەکانی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لە سەددام حوسێن و شای ئێرانیان دەنواند و وێیان دەدان، وەك خۆیان وەریبگرن.

لەم بابەتەوە دیپلۆماتە ڕۆژاواییەکان جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ بەرەی پێش خۆیان نەبوو. دیپلۆماتەکانی بەرەی بەر لەوانیش بە گیان و دڵ پشتیوانییان لە ئاتاترك و ڕەزاشا کردبوو لە تورکیا و ئێران. ئەم دوو پیاوە لەشکرییە ملهوڕە کەسانێ بوون کە سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان بە ناوی "نوێ کردنەوە"، بەسەر هەرێمەکانی کەونارادا بە گوێرەی سیاسەتی کۆدەسەڵاتیی ناسیۆنالیزمی ئورووپایی و بە ڕەنگی لێنەبووردوویی "ژاکوبنی"[1] شۆڕشی فەڕانسە، بە خەڵك دەسەلماند. هەردوو حکوومەت کەمینەنەتەوەی وڵاتی خۆیان متەقمردوو کرد. بەر لە پەلاماری ئێراق بۆ سەر کووەیت، کوردەکان و تەواوی لقەکانی تری دژبەری ئێراق دەیانزانی کە ڕۆژاوایی بە شتێکی ئەوتۆیان دانەناون. پاش پەلاماری کووەیت لە لایەن ئێراقەوە کارناسانی ئەمریکایی کاروباری جیهانی عەرەب کەوتبوونە بەر شەپۆلی تووڕەیی و لە ناوەندی بنکەی سیاسەتدارێژی ئەمریکادا نەبوون.

ئەندامانی زانستگایی قوتابخانەی "نوێخواز" — یەکێکی وەك "مار" و "کریستیەن مووس هێلمێر" کە لە ڕابردوودا لە پەسندەرانی بەعسییەکانی بەغدا بوون — لەم کەسانە بون کە دەوڵەتی بووش لەم بابەتەوە کە دەبێ ئێراقی پاش شەڕ چلۆنی لەگەڵ وەجوولێی، پرسی پێدەکردن. هەروەك چاوەڕوانی دەکرا ئەم تاقمە لە ترسی

---

١– دێموکراتە توندڕەوکان لە شۆڕشی ساڵی ١٨٧٩ی فەڕانسەدا.

ئەوەی کە ڕەنگە ئێراق لە دابەشینەوەی دووبارەی دەسەڵاتا لەتوکوت بێ وایان بە باش دەزانی کە حکوومەت — تەنانەت بە بێ سەددام حوسێنیش — نەڕووخێ و ئەمە ڕاسپاردەیەکی "بەجێ" بوو کە لە ئاکامدا دەسەڵاتی کەمینەی سوننی مەزەب بە سەرۆکایەتی ژێنێراڵێکی لەم تایفە و هۆزە و بە شیمانەیەکی زۆر لە خزمانی تکریتی سەددام لە شوێنی خۆی دەمایەوە. بەڵام پاش ئەو هەمووە ترس و تۆقین و ساڵگاران دەسەڵاتی زۆردارانە, ئەم ڕێوشوێنە تەنیا لەسەر ڕووپەڕی کاغەز دەیتوانی ڕێچارەیەکی خۆڕاگر بێ. لەم پێشنیار و ڕێوشوێنەدا سەرنجێك نەدەدرا ئەو زوڵم و زۆرە پەرەگرەی کە بۆ پاراستنی مانەوەی ئێراق دادەسەپا, ئەم ئێراقە دەسکردەی کە بریتانیا پاش شەڕی یەکەمی جیهانی لە پاش ماوەی لەتوکوتی ئەیالەتەکانی پێشووی عوسمانی تێکیکردبۆوە. گرینگترینی ئەم هەرێمانە مووسڵی کوردنشین بوو بە نەوتەوە, پاشان "بەسرا" کە ناوەندی شیعەکانی وڵاتی تازەساز بوو, ئەمجار بەغدا وەك پایتەخت و مەکۆی کەمینەی عەرەبی دەسەڵاتدار. پرسی هەڵوەشاندنەوەی حیزبی بەعسیش لە گۆڕا نەبوو. دیپلۆماتێکی ئەمریکایی لە ژانویەی ١٩٩١دا لە باڵوێزخانەی لەندەن کە بەرپرسی پەیوەندی کردن بە تاقم و دەستەکانی خۆرهەڵاتینێوەڕاست بوو بە دزی پێیگوتم چونکە ویستوویەتی چاوی بە یەکێك لە ڕێبەرانی نەتەوەیی کورد بکەوێ کە بۆ دیدارێك چۆتە ئینگلستان, خەریکبوون لە فەلاقەی کەن.

"دەفتەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا" داخوا ئەگەر بارو ناوبانگێکی باشتریشی بوایە, دەیتوانی شوێن بخاتە سەر ڕووداوەکان؟ بووش هەر لە سێپتامبری ١٩٩٠ەوە ڕازی بە هیچ کردەیەك نەبوو کە ببێتە کۆسپی سەر ڕێی تەمای شەڕ کردنی, کە ڕۆژ بە ڕۆژ لە دەروونیدا پتری پەرە دەگرت. ئاوا بوو تەنگەژەی بووشی "ڕاڕا و پووچەکە" کە دەیەویست خۆیەك بنوێنێ؛ بە قەولی یەکێك لە خۆیان, بە شێوەی شپرێو و بێدار و لەلەی کۆشکی سپی. کەس ڕەزامەندی لەسەر ئەو قسانەش نەبوو کە دەگوترا ڕەنگە ئازاد کردنی کوەیت بتوانێ لە ترس و خۆفی

کۆمەڵی ئێراق کەم کاتەوە و دابەشینی دەسەڵات بێتە سەرباری دادپەروەرانە. لە واشینگتۆن بەرواڵەت دروشم ئەمە بوو: "بێخەبەری باشترە لە پڕ خەبەری." بووش خۆی لە حەساری تەنگی چارەسەری لەشکریی قەتیس کردبوو, ئەویش زیاتر لەسەر بناغەی هەلومەرجێکی "پاوێل" بۆ ئەم کاروبارەی دیاری دەکرد. (جا خۆش ئەوەیە, ئەم گشتە هێزە ئاگرین و بەرفرەوانەی پاوێل لە هێزەکانی هاوپەیمانا کۆی کردبۆوە, تەنیا لەم پرسیارانەی زیاد کرد کە جیهانی وڕ وکاس لە بەرامبەر خۆگنخاندنی ئەمریکادا سەبارەت بە شۆڕشەکانی ئێراق نواندی.)دیپلۆماسی کاری ئەمە بوو کە هەتا ئەوجێیەی دەکرا و بووزی دەخوارد هاوبەندی پتر پەیدا بکا. بێیکێر لەم بابەتەوە ئەندامانی دەزگای خۆی و دنیای دەرەوەی واقوڕماو کرد. ئەو بۆ بێبەش کردنی سەددام حوسێن لە پشتیوانی یەکێتی سۆڤیەت, کە بە بڕوای سەددام قەت یەكودووی لێنەدەکرا, لە دۆستایەتی نێوان خۆی و "ئیدوارد شوارد نادزە", وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت کە لە کۆبوونەوەی کێشەکانی تەناهی ئورووپادا داگیرسابوو, کەلکی وەرگرت. ئەم شاکارە هەلی بۆ بێیکێر ڕەخساند کە هاوپەیمانان بە ڕەزامەندی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان وێكبخا و لەم ڕێبازەدا تێگەیشتنی قووڵتری بووشی لە سیاسەت لەگەڵ تواناییەکانی خۆی لە مامەڵەگەریدا بەهێز و پتەو کرد.

بەڵام لەم پێکەوەساچیانە پیرۆزەدا, هەر ئەم گەریانەش لەسەر بناغەی بچووکترین وێکچوونی هاوبەشا کەوتە گەڕ: بۆ وێنە, ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نیازی بە بەشداری کردنی میسر و فەڕانسە بوو لەم هەڵڵایەدا: یەکەمیان لەبەر ئەوەی بەشدار بوونی پڕ جەماوەرترین وڵاتی عەرەبی نیشانەی ئەمە بوو کە شەڕێکی تری خاچپەرستانە بە دژی وڵاتێکی مسوڵمان لە گۆڕێدا نیە و دووهەمیش بە خاتری ئەمەی کە سەددام حوسێن هەوڵی دەدا فەڕانسە, ئەم وڵاتە ڕۆژاواییە گرینگە کە پەرۆشی ڕەنگدانەوەی شەڕ بوو لەسەر هەرێمە کۆلەدارەکانی پێشووی لە ئەفریقای باشووری, کە بە باری ئیحساسیدا مەیلیان بەرەو عەرەبان دەبزووت, بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. پاریس و قاهیرە لە ترسی عەرەبە نەتەوەخوازەکانی هەر لە ئێستاوە دەنگیان هەڵبڕیبوو و نەیاندەخواست کە هێزەکانی هاوپەیمانان ئەو گشتە ڕێیە بەرەو بەغدا

بکوتن و سەرۆکی ولاتێکی عەرەبی لێ بخەن, ئەوەش لە جێی خۆیدا لەگەڵ بیری واشینگتۆن لێکبوو.

بووش سەرەرای ئەم هەمووە شتەی دەربارەی سەددام حوسێن دەیگوت و ئەوی لەتەك هیتلێرا پێکدەگرت و داکۆکی دەکردە سەر بڕەوی دێموکراسی لە خۆرهەڵاتی‌نێوەڕاست, لە بابەت دەستێوەردان لە حکوومەتی تاقمێك کەمینەی سوننی مەزەب و تێکهەڵچوونیدا پارێزی دەکرد. تەنانەت ئەگەر کەڵکەڵەی وەها کردەیەکیش کەوتبایە بیری, دەزگای دەوڵەت بە بێ بەشداری چالاکانەی "دەفتەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا" خاوەنی زانستێکی ئەوتۆ نەبوو کە بتوانێ چوارچێوەیەکی لەبار بۆ دامەزراندنی حکوومەتێکی نوێ لە بەغدا پێکبێنێ. بەڵام دەست لەسەر دەستدانان و هیچ نەکردنیش دەیتوانی کارەساتی لە دوو بێ, وەك لە دووی بوو. ئەم شتە چاوەڕوان دەکرا. بەم پێیە وە بیر هێنانەوە و بە گوێهەڵێنانی ئەم قسەیە کە ئەگەر بێتوو چالاکی نیزامیی بە نیوە تەواوی وەمێنێ و بەعسی هەروا لەسەر کار بێ, مەترسی لە دوا دەبێ, خرایە ئەستۆی ویلیام ئێگلتۆن, کە لە ڕیزەی کارناسانی پسپۆڕی کاروباری کوردستانە و ئێستا خانەنشینە. ئێلگتۆن زۆر بەر لەوەی بووش شەڕی ئەردەکی دوای سەتسەعات زەبر و هەڵمەت لەپڕ ڕابگرێ, قەومانی کارەساتی چاوەڕوان کردبوو. ئەو زانیبووی کە سەددام حوسێن تەواوی هێزەکانی گاردی کۆماری کە بیستوچەند لەشکر بوون و هەروەها دەزگای پۆلیسی نەهێنی کە ڕاپەڕاندنی ئەرکێکی زۆری لە ئەستۆ بوو نەهێناونە جەغزی شەڕەوە. هەر ئەم هێزانە بوون کە حکوومەتی بەعسیان لەسەر دەسەڵات هێشتبۆوە. ئێلگتۆن ئەوەندە ئازا بوو کە تەواوی ئەم شتانە خێراخێرا وە بیر هاوکارانی بێنێتەوە لە "دەفتەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا". دوای ئەوەی تەمای لەنەکاوی واشینگتۆن بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ لە ٢٨ی فێوریەدا بۆ کوردان و شیعان بوو بە کارەسات, کاربەدەستێکی باڵای "پێنتاگۆن" باسی هێشتنەوەی سەددامی لەسەر

دەسەڵات ئاوا بڕییەوە: "ئیتر هەڕەشەیەك نەبوو بۆ ئێمە، تۆڵە و هەڕەشەشی بۆ خەڵکی خۆوڵاتی بە لای ئێمەوە قسەی لێنەکرابوو."

بەشێك لە ڕیس و گوریس هێنانەوەی کۆماریخوازان نیشاندەری لێکدانەوەی ئاسایی واشینگتۆن بوو لە ژێئۆپۆلۆتیکی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست بەتایبەت ژێئۆپۆلۆتیکی گەورە هاوپەیمانی لە کەنداو, واتە عەرەبستانی سعوودی. واشینگتۆن پێی سەلمابوو کە عەرەبستانی سعوودی لە بیری دێموکراسی بەم مانایە کە "هەرکەسێك خاوەنی دەنگێك"ە بێزارە و دەترسێ ئەگەر وای لێ بێ زۆرینەی جەماوەری شیعە مەزەبی ئێراق حکوومەتێکی لە چەشنی حکوومەتی ئیسلامی ئێران دامەزرێنن, کە تەنیا وڵاتی شیعەمەزەبی جیهانە: حیساباتی سیاسی لەم چەشنە کە حیساباتێکی تەواو ڕیازی بوو, پێشینەی مێژوویی خەڵکی شیعەی ئێراقی کە قەت سەر بە ئێران نەبوون و لە درێژایی شەڕی ١٩٨٠-١٩٨٨ی ئەم دوو وڵاتەدا بێ تلاسا بوون, سەبارەت بە حکوومەتی بەغدا وەفادار مابوونەوە, لەبەر چاو نەدەگرت. بەڵام بنەماڵەی پاشایەتی سعوودی کە لەسەر گەورەترین سەرچاوەی نەوتی جیهان ڕۆنیشتووە و ئەوێش وەختایەکی هەرێمی شیعەنشینی پارێزگای ڕۆژهەڵاتی سعوودی بووە, دژی هەر چەشنە خۆ خستنە مەترسی و خۆ دانە دەس هەڵوهەڵکەوتی داهاتووە. لە ڕاستیدا ناردنی هێزەکانی ئەمریکایی بۆ کەنداوی فارس لە ١٩٩٠دا, نەك بە مەبەستی ڕزگاری کووەیت بەڵکوو بۆ پاراستنی نەوتی سعوودی بوو. (ئەو وەختە ئێران و کووەیت و عەرەبستانی سعوودی و لە ڕاستیدا تەواوی وڵاتانی ناوچە, لە ناخۆشویستنی دەسەڵاتی دێموکراتەکاندا هەستی هاوبەشیان هەبوو؛ ئەمە شێوەی بیروڕای باوی ناوچە بوو.)

لە ماوەی مانگەکانی بەر لە ئازاد کردنی کووەیت, بریتانیا و فەڕانسە و ئەیالەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا بە شێوەی سەربەخۆ لەم بارەوە توێژینەوەیان کردبوو. سەیر ئەمەیە کە هیچکام لەم وڵاتانە لایان وانەبوو کە سەددام حوسێن بتوانێ لەم شەڕە بە ساخی ڕزگاری بێت, هەتا دەس بەرێ بۆ سەرکوتی زۆرینەی شیعە مەزەب و کوردان. ئاکامگەلێکی لەم توێژینەوانە وە دەس هاتن جۆرە مەشقێکی خۆشخەیاڵی بوو. هیوای هەرە گەورە لە واشینگتۆن ئەمە بوو کە بە قەولی مار "ئەگەر بەخت یار

بێ, خودی سپای ئێراق هەڵدەتەزێتەوە و سەددام حوسێن تیدا دەبا." سەرەڕای تەواوی ئەوانە, ئەم سێ دەوڵەتە هاوکات وایان بیر دەکردەوە کە ئەگەر سەددام لەشەڕی کووەیت قوتار بێ, دیسانیش بەرگر و تەگەرەیەك دەبێ لە بەرامبەر ئێراندا, با زۆریش لاواز بووبێ. هەرچۆنێك بێ وەك کۆسپ و بەرگێڕەوەیەك بە کاری ڕۆژی خۆی دێ.

ئەم شێوە بیرئالۆزییە وێڕای ئەمە دوو ئاکامی بە ڕواڵەت تەواو دژ بە یەکتری لەبەر چاو بوو: سەددام حوسێن دەسەڵاتی کز دەبێ, بەڵام لەسەر دەسەڵات دەمێنێتەوە یان لە مەودای هەڵگەڕانەوەی شیعە و کورداندا تەختی وەردەگەڕێ، بەڵام سەرکردە نیزامییە سوننی مەزەبەکان ئاخرییەکەی هەم بەسەر وێدا و هەم بەسەر ڕاپەڕیواندا زاڵ دەبن. تەنیا خاڵی هاوبەش لەم "کایە"دا بڕوا بە ڕاگرتنی کەمینەی عەرەبی سوننی مەسەب بوو لەسەر تەختی دەسەڵات. "خەبەر"ی نەوێژراوی ئەم "دەسپێك"ە بڕوای بێ بنەڕەت و بناغە بوو لەسەر ئەم مەبەستە کە چونکە ئێراق پێکهاتەیەکی وەها دەسکردە و بە ڕادەیەك لە لایەن عەرەبە سوننی مەزەبەکانەوە چەوسێنراوەتەوە, کە بێتوو زۆرینەی شیعە مەزەب و کوردان پاڵێکی توند بە حکوومەتەوە نێن دەکەوێ و لەبەر یەك بڵاو دەبێ. بەڵام ئەم بیرە شتێ نەبوو کە لە پێشدا گەڵاڵەی بۆ داڕێژرابێ و بەستێنی بۆ خۆش کرابێ. بە سرنج دان بە پێشینەی بەزەیی‌بزوێنی ئێراق لە ماوەیەکی پتر لە حەفتا ساڵ تەمەنی‌دا, تەما گرتن بە مەبەستی ڕاگرتن و هێشتنەوەی وەك هەرێمێکی یەکپارچە, نیشانەی ئەوینێکی کۆیلانە بوو بۆ پاراستنی سنووری دیاری کراوەکانی لە کۆمەڵی نێونەتەوەیی‌دا, کە مەبەستێکی چەواشە بینانە بوو. ئەوجار جگە لە نیاز بە هەبوونی پارسەنگێك لە بەرامبەر ئێراندا, تەنانەت لە وەختایەکدا کە ئێران بە هۆی شەڕەوە فرە لاواز ببوو چاکتر وا بوو لەبەر دڵی دەروجیرانان ئێراقیش شەقێکی وێکەوێ.

ئێران و سووریا و تورکیا بێ‌پسانەوە ئۆگریی خۆیان سەبارەت بە پاراستنی سەربەخۆیی و تەواوێتی خاکی ئێراق دووپات دەکردەوە, بەڵام ئەمە "نەهێنی‌گەلی" دیپلۆماتیکی بوون بۆ دژایەتی کردن لەگەڵ هەر شتێك کە لا لە سەربەخۆیی کوردان

بکاتەوە. ئەم هەڵوێستە تەنانەت ئەم خودموختارییەشی دەگرتەوە کە سەددام حوسێن لە ١٩٧٠دا وەك بەڵێن دابووی بە کوردان. ئەمەش شتێکی نوێ نەبوو: ئەم بەیاننامانە چەندپاتی نێوەرۆکی پەیمانی سەعداباد بوون کە لە ساڵی ١٩٣٧دا لە کۆشکێکی بەم ناوەدا لە تاران بەسترا. بە گوێرەی ئەم پەیمانە وڵاتانی ئەفغانستان, ئێران, ئێراق و تورکیا بەڵێنیان وابوو کە لە سەرکوتی هەر چەشنە جووڵانەوەیەکا کە خوازیاری رووخاندیان بێ, یاریدەی یەکتر بدەن. جگە لە ئەفغانستان, دڵپەرۆشی تەواوی وڵاتانی هاوپەیمان, نەتەوەخوازی کورد بوو, کە نەخۆشییەکی پەرەگری لێوەگر بوو, جا بۆیە بۆ وڵاتانی هاوپەیمان کە ئەوان سەردەمان دەیانویست حکوومەتی تەواو کۆدەسەڵات بە شێوەی رۆژاوا دامەزرێنن, لێی زەنین بوون. وەچەیەك دواتر هەر ئەم پەرۆشییە لە "پەیمانی بەغدا"دا هاتەوە گۆڕ کە لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٥٠دا بەسترا و دوای لێدەرکەوتنی ئێراق لە ساڵی ١٩٥٨دا ناوی گۆڕدرا و بوو بە "رێکخراوی پەیمانی ناوەندی".

بەرێوەبەرانی سیاسەتی دەوڵەتی بووش ئەم مەبەستەیان وەك بنەمایەکی بڕوای خۆیان بە خۆیان سەلماندبوو کە "دژبەران"ی ئێراق پێشاندەر و نوێنەری چ شتێك نین جگە لە پۆلێك بووکەڵەی بێبێجان خانمی دە نێوەوەچوو, کە بوونە داردەستی ئێران و سۆڤیەت. پێوەندی سووریا لەگەڵ دژبەرانی ئێراق, پێوەندییەکی لەمێژینەیە, هەروەها ئێرانیش هەر لە کۆنەوە نێوانی لەگەڵیان خۆش بووە, ئەگەرچی هاوکات لەتەك تاقمەکانی رەقەبەر دانووی کوڵاوە. (کاربەدەستانی عەرەبستانی سعوودی هێندە لە هەڵڵا بەدەر و دوور بوون کە لە پایزی ١٩٩٠دا باسی کەسایەتی وایان دەکرد لە ریزی دژبەراندا کە بەینێکی خۆشبوو مردبوون.) ئێران جێی متمانە نەبوو, ئەمە شتێکی بەرچاو بوو؛ سووریاش سەرەڕای بەشدار بوونی لە ریزی هاوپەیمانانیدا واشینگتۆن بە هێندی نەدەگرت, چونکە سەرکۆماری گەردنکەشی وێ — حافز ئەسەد — دژایەتی هەڵوێست و سیاسەتی ئەمریکای کردبوو سەبارەت بە ئاشتی بە جوێی نێوان لوبنان و ئیسرائیل لە دەوروبەری ساڵەکانی دەیەی ١٩٨٠دا تا دەگاتە بە غافڵکوژ ناسرانی وڵاتەکەی لە لایەن واشینگتۆنەوە. ئەمجار لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتی بووش بەردەوام

نیگەرانی ئەمە بوو کە نەکا دراوسییەکانی ئێراق پەیوەندی ئەمریکا و دژبەرانی ئەم وڵاتە خراپ لێکدەنەوە و بەم بیانووە لە هاوبەندی دەرکەون.

***

ئەوەی بە لای بووشەوە گرینگی دەنواند تورکیا بوو, کە تەنیا هاوپەیمانی "ناتۆ"ی واشینگتۆن بوو لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستا. لە درێژەی هاتنە سەرکاری گەلەحکوومەتانی چل ساڵی ڕابردوو لە ئەنکارا و واشینگتۆن, ڕازی ڕاگرتنی تورکیا زۆرتر مەبەستێکی فرە ورد و باریك و گرینگ بوو و ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا کە خۆ لە هەر کردەیەك بپارێزی کە بە شێوەیەك وەك سیلەچاوێك بۆ سەر ئاوات و ئامانجەکانی خەڵکی کورد – لە هەرکوێیەکی ناوچە – لێك‌بدرێتەوە. تورکیا بە کۆتایی هاتنی شەڕی سارد کە ئەو سەردەمی ئەرکی پاراستنی باڵی باشووری ناتۆ بوو لە بەرامبەری سۆڤیەتا, لە بابەت بەکەڵك مانەوەی لە داهاتوودا بۆ شەریکە خۆراوایی‌یەکانی تووشی ترس و پەرۆشی ببوو. داگیرکرانی کووەیت لە لایەن سەددامەوە بۆ ئانکارا پیت و بەرەکەتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو, بەڵام بۆ بەدبەختییان هەر ئەم گێرە وکێشەیە سەرنجی گشتی خستە سەر کێشەی کوردەکانی خۆی کە لە کۆنەوە باسێکی قەدەخە و پاوان بوو. ئەندامانی ناتۆ بۆ ماوەی نیزیك بە چل ساڵان لە بەرامبەر پێخوستکرانی مافی مرۆص و تەواوی چەوتی و لاری و لوێرییەکانی شێوەی جێبەجێ کردنی دێموکراسی لە تورکیادا, بە تایبەت لە پێوەندی لەگەڵ کوردستانا, چاویان قووچاندبوو. ئانکارا هەر لە سەرەتای دامەزرانی کۆمارەوە لە ١٩٢٣دا بە وردی و وریایی لە ترسی هاروژاندن و دنەدانی کەمینەی زۆر و زەوەندی خۆی, لە هەر چەشنە وێك‌کەوتن و پەیوەندییەکی قووڵ لەگەڵ کوردەکانی ئێراق خۆی پاراستبوو. تورکیا لە ١٩٨٤ەوە بەرەوسەر گیرۆدەی شەڕێکی نێوخۆیی بوو لە کوردستانی خۆیا کە تازە دەکەوتە سەر گەڕ و ئێستا بەوپەڕی پەرۆشییەوە تەماشای دەکرد کە پێوەندییەکی لەتەك کوردان و دژبەرانی تری ئێراقا نیە و لە چاو ئێران و سووریا کەوتۆتە بارێکی نابارەوە.

بەڵام سەرۆك "ئوزەل"یش بە دابی خۆی هەروەك ئاتاترك نەریتشكێنێك بوو. ئوزەل سەرەڕای نفرەتێكی هەڵسەنگاو كە ئاتاترك لــە نیزیـك بوونــەوەی ورد لــە هێزەكـانی غەیرە ئوروپایی نواندبووی, لـە گەڕیانی شەڕدا, لـەگەڵ ئێران و ئێراق كەوتە سەودا و مامەڵـەی پڕ بەهرەی ئـابووری. سـەددام حوسـێن كـە لــە سـەرەتای سـاڵی ١٩٨٢دا هێزەكانی لـە بەرامبەر هێزەكانی ئێرانیـدا لــە جێـی خۆیـان چـەقیبوون, ئیزنـی دا بـە هێزەكانی ترك هەتا بۆ پەیكـەردەی كـوردانی سـەرهەڵداوی توركیـا, كـە ناوچـەكانی سەرسنووری ئێراقیان كردبووە بنكەی دژی ئانكـارا, بـچنە خـاكی ئێراقـەوە. لـەگـەڵ ئەمەشدا توركیا سەبارەت بە هەموو چەشنە خورد بوونەوەیەكی دەرەوە لــە كـوردانی ئەوێندەرێ دڕدۆنگ بوو. تەنانەت پێناسەی ئەم كوردانە لـە لایەن حكوومەتی ئانكاراوە بە نەبوو داندرابوو, تا ڕادەیەك كە كاربەدەستانی ترك, بۆ ئەوپـەڕی كـەیف و گەمـەی وڵاتانی تری خۆرهەڵاتی نێوەڕاست, پێیاندەگوتن "تركی كێوی".[1]

توركیا ئەوەندە سەبارەت بە پەیوەندی غەواران لـەگەڵ كوردان — هەر كوردێك — دڕدۆنگ بوو, وەختێك یەكێك لــە كاربەدەسـتانی پلــە نێونــجی وەزارەتـی دەرەوەی ئەمریكا لــە ژووەنـی ١٩٨٨دا چـاوپێكەوتنی تاڵــەبانی بـۆ بیـستنی گلــە و گازنـدەی سەبارەت بە دەكار هێنانی چەكی شیمیایی ئێراق لـە هەڵەبـجەدا قبووڵ كـرد و دیتـی, گلـەیی لـە ئەمریكا كرد. مەبەستی تاڵـەبانی لـە دیداری كاربەدەسـتی دەرەوەی ئـەمریكا ئەمە بوو كـە ئـەمریكا پـەیامێكی نارەزامەندانـە و تونـد و تیـژ سـەبارەت بـە كـەلك وەرگرتنی ئێراق لـە چەكی ژاراوی بەرێ كاتـە ئـەم وڵاتـە, وا چـاوەڕوان دەكـرا كـە ئەمریكا كردەوەی ئێراق بە توندی مەحكووم بكا. ئەم كاربەدەستە هەم ناتێگەیـشتوویی نواند و هەمیش بە لایـدا خوار بۆوە. تاڵـەبانی كە مرۆیەكی زار بە هاوارە و خۆشی پێی لــێ دەنێ, بۆ وتوویژ لـەگەڵ بلاڤۆكان هەلی لـە دەس نەدا. (ئەم كردەیەی تاڵـەبانی بە

---

[1] – كاتێك لـە ساڵـەكانی دەیەی ١٩٦٠دا توركیا سەبارەت بە بەرنامە كوردییەكانی ڕادیۆ "سـەوتولعەرەب"ەوە گلەیی كرد — ئەم ڕادیۆیە لـە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا گـوێگری زۆر بـوون — ناسـر وە نێـو قـسەی كابرای دیپلۆماتی ترك پەڕی و پرسی: "داخوا ئێوە لـە وڵاتەكەتاندا كوردیشتان هەیە؟" كـابرا لێبڕاوانـە گـوتی: نەخێر! ناسر گوتی: "دەی كەوایە گلـەیی چی دەكەن؟!"

سرنجدان بە سیاسەتی ورد و هەڵسەنگاوی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەسەر دانانی ڕێوشوێنێکی سەخت و دژوار بۆ دانی ویزا بە ڕێبەرانی کورد, شیاوی تێگەیشتن بوو.)[١] خراپی کارەکە زیاتر لەمەدا بوو کە کابرای کاربەدەستی ئەمریکایی نەیزانیبوو کە ئاغای "کەنعان ئێورێن"یش لە واشینگتۆنە. ئێورێن بێگومان بەم ڕووداوە دڵی ئێشا.

جۆرج شووڵتس وەزیری دەرەوەی ئەوێ دەمێش لەم بابەتەوە نارەحەت بوو: ئەو پێیخۆش نەبوو کاتێك بەتایبەت پێی هاوبەندێکی ئەمریکا لە ناتۆدا لە نێوان دایە وەها کارێك بکرێ. ئەو بە قەڵسی و تووڕەیی, بوونی وەها کاربەدەستێك و دیداری لەگەڵ تاڵەبانی وە درۆخستەوە. ئەوەی چاوەڕوان دەکرا هەڕەشەیەك بێ بۆ ئێراق ئێستا کەوانەی کرد و ئاکامی پێچەوانەی لێکەوتەوە و ئێراق هەر لە مانگی ئووتی ئەو ساڵەدا بە دژی پێشمەرگە و خەڵکی ئاسایی, بە شێوەیەکی بەربڵاو دەستی بردەوە بۆ چەکی شیمیایی. دەستەیەك لە کارگێڕانی وەزارەتی دەرەوە بڕوایان وابوو کە ئەم ڕووداوە بە سەددام حوسێنی سەلماند کە هەرچی بیکا بە بێگرێ لە هەڵلایە ڕزگار دەبێ و پەلاماری کووەیت و داگیرکردنی بە چوارمانگ دواتر یەکێك لەم کردارانە بوو.

گلەیی تورکیا بێگومان لە وەزارەتی دەرەوەدا کەوتە بەر سرنج. هەروەك دیپلۆماتێکی ئەمریکایی زۆر دواتر گوتی "پەیوەندی ڕەسمی بە کوردانەوە هەمیشە گیرەی لەسەر بووە." جا ئێستا کەس مەیلی لە وەها کارێ نەبوو و تەنانەت وەختێکی

١– ڕێبەرانی کورد بە ڕادەیەك لە بەر چاوان "بێزرا" بوون کە هێندێك لە باڵوێزخانەکانی ئەمریکا – وەك باڵوێزخانەی ئەمریکا لە دەمیشق – کە لە باری دیپلۆماتیکییەوە زۆر بارناسك بوون و دەمیشق شارێ بوو کە کوردەکانی ئێراق و تەواوی هێزەکانی دژبەر لەوێ دەفتەرێکیان هەبوو, خۆیان لە کوردان دەبوارد. کاربەدەستانی "دەفتەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا" پێداگر بوون کە شتی وا هەر نەبووە, بەڵام لە ڕاستیدا هەر ئەوەی کە بۆ هەر پێوەندییەك "دانە بە دانە" تەما دەگیرا, ئەم کردەویە ناتوانێ خاوەنی مانایەکی تر بێ. ئەو ڕێبەرە کوردانەی بە پاریسدا تێدەپەڕین بۆ ئەوەی دەستیان بگەییایە باڵوێزخانەی ئەمریکا, ناچار بوون دەستەوداوێنی کەسانێکی وەك نووسەری ئەم کتێبە بن ... وەرگرتنی ویزا بۆ چوونە ئەمریکاش با هەر بمێنێ ...

بارودۆخیش لـە بنج و بناوانەوە گۆڕانی بەسەردا هات, دیسانیش ئەو مەیلـە هەر نەبوو. لـە ماوەی قەیرانی کووەیتا, سەرچاوە ئاگادارەکانی باڵای دەزگای پاراستنی کـوردان و سەرچـــاوەکانی تـــریش ئەوەنـــدە بـــەم کـــردارەی وەزارەتـــی دەرەوە وڕ وکـــاس و سەرلـــێشێواو بوون کە بڕوایان بەم دەنگۆیــەی ســەرزاران دەکـرد: بـە گـوێرەی ئـەم دەنگۆیە سەرکۆمار دەستووری دابوو کە تەنیا کەسانی سەر بە دەزگای پاراستن ئیزنیان هەیە پێوەندی بە دژبەرانی ئێراقەوە بکەن.

لـە ئووتی ١٩٩٠دا دوابەدوای ئەوەی عەرەبـستانی سـعوودی دابــەزینی تیپــەکانی ئەمریکایی لـە خاکی خۆیدا قبووڵ کـرد, بـە دنـەی سـەرۆك ئـوزەل, ترکـان یەکـەم کەسانێك بوون کە پاڵیان وە هاوبەندی ئەمریکای جڵەوکێش دا. سەرۆك ئـوزەل خێـرا شالـوولـەیەك کە نەوتی ئێراقی بە خاکی تورکیادا دەگەیاند دەریای مەدیتەرانە بەســتی, کە دیارە ئەمە خۆی تەمایەکی گرینگ بوو. ئەگەرچی سەرەنـجام تورکیا ناچـار دەبـوو بۆ پاراســتنی قـەراروبڕی گـەمارۆی ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان دژی ئێـراق هاوهەنگاو بێ, بەڵام ئەم تەمایە لـەم کاتــەدا بـۆ پێکهێنــانی هاوبەنـدی, زۆری یارمــەتی ئەمریکا دا. ئوزەل پێداگری کرد لـەسەر ناردنی هێزەکانی بەرگری دژی ئاســمانیی نـاتۆ بۆ تورکیا و تیپەکانی ترکی کە بەرەڕووی هێزەکانی سۆڤیەت دامەزرابوون ڕایگویزتنـە سنووری ئێراق و بە مەبەستی خۆش کردنی کەش و هەوای چالاکی ئاســمانیی بــە دژی ئێراق, ئیزنی دا بە هێزی ئاســمانیی ئەمریکا کە لـە پێگەی ئینجرلیك کەلك وەربگرێ. ئەو تەنانەت ڕەزامەندی لـەسەر بوو بۆناردنی هێزەکانی ترك بۆ عەرەبستانی سعوودی و بەشداری کردنیان لـە شەڕی هەردەکی دا و ئــەوە تــەنیا خــۆ تێهەڵقوتانــدنی ناوەنــدی سەرکردایەتی سپای تورکیا کە یەکەم دەسەڵاتی وڵاتە, ئەوی لـەم کارە پاشــگەز کــرد. بەم شێوەیە خۆ پاراستن لـە تێوەچوون لـە کاروباری هەرێمەکانی پێشووی ئیمپراتۆرییەتی عوســمانیدا کە بۆ دامەزراوە نیزامیی و غەیرە نیزامییــەکانی وڵات وەك مەبەســتێکی پیرۆز وا بوو, بە ئەنقەست خستیە ژێر پاوە. بەندێکی نەگۆڕیش کە ئاتـاترك لــە بابــەت پاراستنی بێلایەنی لـە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستا دایناـبوو, ڕووی کردە زبڵدانی مێژوو: یـانی بەندی "ئاشتی بۆ نیشتمان, ئاشتی بۆ جیهان". ترکان ئەم هەمێت وێنەدانەیان سەبارەت

بــە دەروجیرانــەكانی باشــووریی, لـــە بازنـــەی وتـــەی گەڵتەجارانـــەی "عـــەرەبی مارمێلكەخۆر"دا دێنا بەر زار و زمانان.

لەگەڵ ئەوەشدا, لە كاتێكا كە واشینگتۆن لە ترسی هەڵتەزاندنەوەی توركیا خۆی لە هەر چەشنە پێوەندییەك لەتەك كوردانی ئێراق دەپاراست, ئـوزەل خـۆی لـە بـیری كردنەوەی دەرگای وێكەوتنیاندا بوو. لە هیچ قۆناخێكدا هیچ دەوڵـەتێكی ڕۆژاوایـی بیری لەمە نەكردەوە كە هەر ئەم ئوزەلەی بەنـدە پیرۆزەكـانی ئاتـاتركی بـە قازانــجی هاوبەندی تێكەوەپێچابوو, ڕەنگە بتوانێ قەدەغە و قۆرغ لەسەر نێـوان پەیـدا كـردن و وێكەوتنی كوردان لابەرێ, بەڵام ئەمە ڕاست هەمان كارە كە ئوزەل كردی.

ئوزەل پیاوێكی زۆر تێگەیشتوو بوو. ئـەو هـەر لــە دەسـپێكی قـەیرانی كووەیتـەوە ڕایگەیاند كە دەبێ سەددام حوسێن لـێ بكەوێ. توركیا وەك تەنیا دراوسێی ئێراق كـە نێوانێكی لەگەڵ دژبەران نەبوو, بە سەختی دەیتوانی لاسای كردەوەی دوورەپەرێزانەی تێكەڵ بە سووكایەتی واشینگتۆن بكاتەوە و ئاگای لە سیاسەتی ئێراق نەبێ. ئێراقـی بـە بێ سەددام حوسێن زۆری ڕێ بۆ توركیا خۆش دەكرد و دەرگایـەكی باشـی لــە ڕووی ئەم وڵاتە دەكردەوە. یەكێك لە ئاكامەكانی ئەم بابەتە ئەمە بوو كە لەگـەڵ هەركـەس كە لەم ٢٠٦میل سنوورەدا بتوانـێ هێـوری و هێمنایـەتی باشـتر دابـین بكـا چـاكترین دۆستایەتی دامەزرێنێ. جا بە شیمانەی زۆر ئەوە ئاماژە بوو بە كوردەكانی ئێراق و ئەمە لە خۆیدا بە مانای پێخۆش بوونی دیدار لەگەڵ لێژنەی ڕێبەرایەتی كوردەكانی ئێـراق بوو. بەتایبەت مەسعوود بارزانی و پارتی دێموكراتی كوردستانی ئەو.

لە كلكەی ژانویەی ١٩٩١دا بێ ئەوەی خۆم بزانـم لەم تەما نەریتشــــكێنانەی ئوزەلدا بەشداریم كرد. بە گـشتی ئـوزەل پـتر لــە نیـو سـەعات لەگـەڵ هـەواڵنێران وتوویژی نەدەكرد و لەم دیـمانەیەشدا هەواڵنووسان یەك بە دوای یەكداوەك لەسەر هێڵی بەرهەم هێنانی كارخانە بڕۆن, دەچوونە ژوور, بەم شێوەیە خـۆی پـتر لــە هەموانی قسە دەكرد و دەرفەتی پرسیار و مەبەستی تری نەدەدا. ئەم شێوە وتوویژانـە بە پێچەوانەی دیـمانەی تێكڕایی كە زۆر بە مەیلی گۆڤار و ڕۆژنامەكانی ترك بوو, چی

وای بە دەستەوە نەدەدا. لە مەودای یەکێك لەم دیمانە بە هەشتاوانەدا من هەرچۆنێك بێ پرسیارەکانم هێنا گۆڕ: لێم پرسی بۆ چی لێکدالێکدا دەڵێ تورکیا دامەزرانی کوردستانێکی سەربەخۆ لە باکووری ئێراق قبووڵ ناکا؟ تازە لە دەمیشق گەڕابوومەوە, ئەو شوێنەی کە تاڵەبانی و تەواوی کوردانی ئێراق بە تووڕەیی وەها ئامانجێکیان وە درۆ دەخستەوە و داکۆکییان دەکرد کە دەزانن خودموختاری لە نێوخۆی ئێراقێکی دێموکراتیكدا ئەوپەڕی ئەو شتەیە کە دەتوانن هیوای دەسکەوتنیان پێی ببێ. لە ئوزەلم پرسی: بێتوو کوردەکانی ئێراق بتوانن خودموختاری خۆیان بە دەوڵەتی پاش سەددام بسەلمێنن و سنوورەکان بە چاکی بپارێزن, بۆچی دەبێ ئەو دژایەتی ئەم مەبەستە بکا؟ ئوزەل بە تێك کردنەوەی چەند مەبەستی تێکەڵپێکەڵ دەربارەی پێکهێنانی فێدراسیۆنێك لەگەڵ کوردەکانی ئێراق ولامی دامەوە, بەلام کاتی دیاری کراو بنەی هاتبوو و ناچار لە هۆدەکە دەرکەوتم.

ڕۆژی دواتر "کایا توپری", وتەبێژی ئوزەل و سەرۆکی پێشووی بەڕێوەبەرایەتی بلاڤۆکانی وەزارەتی دەرەوە وەیدۆزیم و بە جۆرێك کە هەوالنێرێك ئارەزووی بێ, گەرم و گوڕیی نواند و گوتی: "پرسیارەکانی تۆ لە ولامەکانی سەرکۆمار سەرنجڕاکێشتر بوون. ئێوە لاتان وایە باشترە ئێمە لەگەڵ کوردەکانی ئێراق بکەوینە گفتوگۆ؟" گوتم: "من هەوالنێرێکم ... نەك دیپلۆمات." چاکم دەزانی کە تەنانەت دۆستێکی تێگەیشتووی وەك "توپری"ش سەبارەت بە هەوالنێرانی لاوەکی بڕە دڕدۆنگییەکی هەیە, ئەم دڕدۆنگییەی کە لە زەینی خەڵکی خۆرهەلاتی نێوەڕاستا بنەی داناوە: ئەم خەڵکە لایان وایە هەوالنێران سەریان بە شوێنێکەوە بەندە. بە شێوەیەك کە هیچ چەشنە دەربەست بوونێك نەخەمە سەرئەستۆی خۆم, گوتم وەها دیدارێك ڕەنگە زەرەدێکی نەبێ و بەڵکوو بەڕاستی بە کەلکیش بێ. لە گەڕانەوەدا بۆ ئورووپا, کە هەر ئەوەندەم دەرفەت هەبوو لە فڕگە دابەزم و سواری فڕۆکەیەکی دیکە بم بەرەو تاران, چەند خالی گرینگی شیلە و هەوێنی وتەکانی "توپری"م دا بە پەیامگری تەلەفۆنی یەکێك لە نوێنەرانی کوردەکانی ئێراق لە لەندەن. هۆی هەرە بەرچاوی ئەوەی بارزانی منی بۆ ماوەی حەوتوویەك لە کوێستانی "ڕایان" میوانداری کرد دووپاتی

ئەم مەبەستە بووکە حیزبەکەی سنووری وەها هێور کردۆتەوە کە لە زەمـانی شۆڕشـی ١٩٦١ی باوکیڕا بەرەو ئێرە پێشینەی نەبووە.

ئەمەی کە داخوا ئوزەل وەختایەك هاتە مەیدانی کـردەوە کـە وتـەکانی سـەروگوێ شکاوی بارزانی لە واشینگتۆنپۆستدا بڵاوکرایـەوە, خـۆی جێـی بـاس و لێداونـە. (تەنانەت ئەگەر واش بووبێ, پاش ئەوەی کە ئـوزەل خـۆی لـە ١١ی مـارس پـەردەی لەسەر دیدار و چاوپێکەوتنی لەگەڵ کوردان هەڵدایەوە, دیسان ڕۆژنامـەکانی تورکیـا کە بۆ باس لەسەر شێواندنی ڕاستەقینەکان پابەنـدی هـیچ شـتێك نـین, نووسـیان کـە هەواڵنێرێکی ئەمریکایی سەر بە "سـیا" دەورێکـی بەرچـاوی لـەم گەڕیانـەدا گێـڕاوە. بەختەوەرانە ناویان نەبردبووم.) بەڵام لە حەوتەی دواتردا کە هێشتا شـەڕی هـەردەکی سەری لە حەوتوویەك نەدابوو, ئوزەل لەسەر دەستی دوو ڕۆژنامەنووسی تـر تـەکانێکی بە ڕووداوەکان دا و بانگهێشتنی ڕێبەرانی کوردی لـێکەوتەوە کە بە نەهێنی سـەردانی ئانکارا بکەن. ئوزەل بۆ دیدار ساز و ئامادە بوو. زۆر بەر لە چوونی کوردان بۆ ئانکـارا فەرمانی دابوو بە وەزارەتی دەرەوە و "توپری" کە سەنەد و بەڵگە پەیوەندیدارەکان لـە کۆلکەی دەوڵەتی دەرکێشن. زۆر دواتر پێیگوتــم: "سێسـەت چوارسـەت لاپـەڕەم خوێندەوە, لە بەڵگەنامە و سەنەد و ڕۆمانانڕا بگرە هەتا دەگاتە پێشینەی عوســمانی و وتووێژی تێکڕایی کۆمەڵی نەتەوەکان و پەیـماننامەی لۆزان." هەروەك پێـشتر وتــم, لەمەی ئاخریدا واتە پەیـماننامەی لـۆزان, بـە فـەرمانی ئاتـاترك ناوێـك لـە کـوردان نەهاتۆتە گۆڕ و لەو دەمەیڕا کوردان دیزە بە دەرخۆنە کران.

لەم دوو ڕۆژنامەنووسەی باسم کردن, یەکیان گنجیز چاندار بـوو کـە لـە زەمـانی مانەوەیەوە لە بەیرووت, لە ساڵەکانی دەیـەی ١٩٧٠دا لەگـەڵ بـارودۆخی جیهـانی عەرەب چاك ئاشنا ببوو. ماوەیەك پاش داگیرکرانی کووەیت لە لایەن ئێراقـەوە, ئـوزەل و چاندار کە پێشتر یەکتریان نەدەناسی پێکەوە دیداریان کرد, ئەم چاوپێکەوتنانە چـەند جار دووپات بوونەوە. لەم دیدارانەدا سەرکۆمار بە چرپە بە چـانداری گوتبـوو کـە وا دیارە ئەو شتگـەلێك دەنووسـێ کـە خـودی خـۆی, واتـە ئـوزەل هێـشتا بـیری

لـێنەکردوونەوە. ئەم دووە بەتایبەت لەسەر پێویستی فڕێدانی میراتی پیرۆز بەلام پـواوی ئاتاترك و چارەسـەری کێشەی کـوردی خـودی تورکیـا و هەڵسەنگاندنی سەرلەنوێ پێوەندی لەگەڵ دەروجیرانە عەرەبەکاندا, هاوبیر بوون.

چاندار وێڕای ئەوەش دەیتوانی لە دۆزینەوە و هەڵبـژاردنی جێنـشینێکی شـیمانەیی بۆ سەددام حوسێنیشدا بەکەلك بێ و ئەمەش دیسان بە مانـای داگیرسـاندنی وتوویـژ بوو لەگەڵ کوردەکانی ئێراق. هەر وەها لەبەر ئەمەی کـە سـەرۆك ئـوزەل پابەنـدی و گیرسانەوەی وەزارەتی دەرەوەی لەسەر نەریتی ئاتاترك لـێ ڕوون بوو, متمانەیـەکی بـە وەزارەتی دەرەوە نەبوو. چاندار بە ئاگـاداری و ئیزنـی ئـەو ڕێ درا هـەتا کوردەکـانی ئێراق لە لەندەن بدوێنێ و لە بابەت چوونیان بۆ ئانکارا بە مەبەستی وتوویژ لـە مـەڕ داهاتۆوە تامی زاریان بزانێ. جا ئەم کۆنە فێڵەی کایەی هەواڵنێری کاری خـۆی کـرد. چاندار لە لەندەن کەسێکی نەدەناسی, بەلام لە ١٦ی فێوریەدا توانی لەگـەڵ یـەکێك لە ڕێبەرانی دژبەرانی ئێراق بە ناوی ئەحـمەد چەلەبی دیدار بکا. چەلەبی بانکـدارێکی شیعە مەزەب بوو کە لە تافی لاوی‌را, یانی لە دەیەی ١٩٧٠وە باڵی ژێنێـراڵ بـارزانی بۆ کڕینی چەكوچۆڵ گرتبوو و یەکێك بوو لە دۆستانی نیزیك و گەرموگـــــــــوڕی کوردان.

کاتێك چاندار مەبەستەکەی لای چەلەبی درکاند, چەلەبی تەلـەفۆنی بـۆ تالـەبانی کرد کە بە هەڵکەوت ئەو کات لە لەندەن بوو. بۆ سبەینێ چاندار لە لەنـدەن چـاوی بە تاڵەبانی و موحسین دزەیی نوێنەری بارزانی کەوت. لە زەمانی دیداری پڕ ناهومێـدی مانگی ئووتی ڕابردووی تاڵەبانی لە واشینگتۆن, ڕێبـەرانی کـورد ئەوەنـدە لـە بابـەت دژایەتی کردنی تورکیا لەگەڵیان بێشك بـوون کـە سەرنـجێکی ئـەوتۆیان نەدابوویـە کردنەوەی دەرگای پەیوەندییەك لەگەڵ ئـوزەل. بـەلام لـە کاتێکـا شـەڕی هـەردەکی خەریك بوو دەستی پێدەکرد تاڵەبانی و دزەیـی مـەیلی خۆیـان بـۆ دیـدار لـە تورکیـا دەربڕی.

ئەو ئەمبارەوبار بوونە جێی سەرسوڕمان نەبوو. شەوی پێش وی کـامران قـەرەداغی لە ئیستامبووڵەوە تەلەفۆنی بۆ تاڵەبانی کردبوو. کامران قەرەداغی لە کوردانی ئێراق و

سەرنووسەری دەرەوەی "ئەلحەیات" بوو, کە ڕۆژنامەیەکی سعوودییان بوو لە لوبنان و تازە لە دیمانەیەکی یەك‌سەعات‌ونیوە لەگەڵ ئوزەل بۆوە. ئەم وتوویژە نەوەد دەقیقەیەش شتێکی زۆر باش بوو. قەرەداغی لەوپەڕی سەرسوڕماندا لە لایەن ئوزەلەوە بەرەوڕووی پرسیارێك ببۆوە. لەم دیمانەیەدا ئوزەل بە لەسەرخۆیی گوێی دەدایە وڵامەکان و زۆر کەمی قسە دەکرد و لە زانیاری گەرمەتەندووری قەرەداغی بەهرەی وەردەگرت و کۆمەڵێکی پرسیار سەبارەت بە کوردانی ئێراق و ڕێبەرانیان دێنایە گۆڕ و لە هەرێمی ژیانی دەپرسین و بەم مەبەستە نەخشەیەکی لە داخڵەی مێزەکەی دەرهێنا. ئوزەل زۆری بە لاوە سەیر بوو کە کوردەکانی ئێراق ئیزنیان هەیە بە زمانی خۆیان بدوێن و بنووسن و زانکۆیان هەیە.

ئوزەل بە قەرەداغی گوت: تورکیا دەتوانێ پشتیوانێکی باش بێ بۆ کوردان و زیادی کرد: "تکا دەکەم ... تکا دەکەم بە کوردان بڵێی متمانەم پێبکەن." هەروەها لە زمانی دەرپەڕی کە دایەگەورەی کورد بووە و دەیەوێ هەر بەم زوانە ئەم یاسا زۆر دزێوانەی زمانی کوردی بەربەست دەکەن و میراتی حکوومەتی فەرماندەرانی نیزامیی ساڵەکانی ١٩٨٠–١٩٨٣یە کۆکاتەوە. کاتێك ئوزەل سەبارەت بە دۆستایەتی نێوان کوردەکانی ئێراق و پارتی کرێکارانی کوردی تورکیا (پ.ك.ك) پرسیاری کرد, قەرەداغی بە دەس‌پێشخەری وڵامی داوە: "ئاغای سەرکۆمار, ئێوە بۆچی خۆتان لەگەڵ ڕێبەرانی پێشمەرگان دیدار ناکەن؟ من دڵنیام کە ئەوان تامەزرۆن زۆر زوو چاویان پێتبکەوێ."

ئوزەل متەقی نەکرد, بەڵام بێ‌گومان بە سەرنجدان بە دەس‌پێشخەری چاندار چاوێکی ماناداری لە توپری کرد, کە یادداشتی لەم وتوویژە هەڵدەگرتەوە. جگە لە مەبەستی ساکار و ئاسایی, مەبەستی سەبارەت بە دیدار لەگەڵ کوردان لە دەقی وتوویژەکە دەرهاوێژرابوو. قەرەداغی جارێکی تر لە مانگی ئۆکتۆبردا چاوی بە ئوزەل کەوتبۆوە و لە ڕێبەرانی کوردی ڕاسپاردبوو پەیوەندی بکەن بە ئانکاراوە, بەڵام ڕێبەرانی کورد بە پاڵپشتی ئەم بڕوایە کە تورکیا دوژمنێکی کەللەڕەقە و نەرم نابێ, هیچیان نەکردبوو. کاتێك دیمانەی دووهەم تەواو بوو, قەرەداغی ڕێوڕاست

گەڕایەوە میوانـخانە و تەلـەفۆنی بۆ تاڵـەبانی کرد کە لـە لـەنـدەن بـوو و گـوتی: "داوام لـە ئۆزەل کردووە پەیوەندیتان پێوە بکا, ڕازی یان نا؟" هەڵبەت کە ڕازی بوو. تاڵــەبانی بە قەرەداغی گوت کە دەقودۆغر بە ئۆزەل بڵێ کە ئەو و بارزانی پێیانخۆشە چـاویان بە دەوڵـەتی تورکیا بکەوێ. (هەڵبەت پاشان موحسین دزەیی بە جێی بارزانی چوو, کـە باوەڕ پێکراوی بوو.) قەرەداغی بۆ بەیانی, بەر لـە فـڕین بـەرەو لـەنـدەن تەلــەفۆنی بـۆ توپری کرد هەتا پەیامەکەی بگەیەنێ, بەڵام توپری لـە ماڵ دەرکەوتبوو. وا ئەوەی پاش حەفتا ساڵ وەك یەکەم پەیوەندی نووسـراوی کـوردان لـەتـەك تورکیـا دەهاتـە ئـەژمار یادداشتێکی کورت بوو بە زمانی ئینگلیسی کە قەرەداغی نابوویە پاکەتێك و لـەسـەری نووسیبوو "تایبەتی و نەهێنی" و بۆ توپری بەجێ هێشتبوو.

هەفتەیەك پێچوو هەتا توپری بە قەرەداغی ڕاگەیاند کە دەوڵەتی تورکیـا پێیخۆشـە ئەگەر بکرێ لـە لـەندەن یا ستۆکهۆڵـم چـاوی بـە کوردەکـانی ئێـراق بکـەوێ, بـەڵام هەرچۆنێك بێ بـەر لــە یـازدەی مـارس کـە ئـوزەل سـەردانی "مەسـکەو"ی دەکـرد. ئاخرییەکەی هەردوو لا لەسەر دیدارێك لـە ڕۆژانی ٨ و ٩ی مارسدا لــــە ئانکــــارا ڕێككەوتن. وەکوو ڕوونە دەبوایە کـوردان بـە مەبەسـتی ڕاکێـشانی یاریـدەی ئـوزەل سەبارەت بـەوەی دەسـتیان بگەیبایەتـە واشـینگتۆن, بـۆ دیـدارێکی خێـرا پێـداگرییان بکردایــە, چــونکە مــرزەم بــوونی ئــەمریکا بــۆ وەرگیرانیــان لــە لایــەن کۆمــەڵی نێونەتەوەیییەوە مەبەستێکی بنەڕەتی بوو. ئەگەر خێراتر جووڵابانەوە, ڕەنگە توانیبایـان بەر لـە دەسپێکی "ڕاپەڕین" لـە پێنجی مارسا، چاویان بـە ئـوزەل بکەوتایـە و بەمـــجۆرە بەری زۆرێك لـە کوێرەوەری و بۆندژییەکان گیرا بایە. لـە جیاتی ئەم کارە تاڵــەبانی لــە پێشدا چوو بۆ واشینگتۆن, بـەم هیوایــە کــە بــە ئــەمریکا بـسەلــمێنێ هــەتا شــوورەی پەیوەندی کردن بە کوردانەوە لابەرێ و ڕێی نێوانیان لـەتەك ئانکارا بکرێتەوە. هەروەك چاوەڕوانی دەکرا, تاڵەبانی ڕایەکی تر بە خۆیدا شکایەوە.

ئەمەش پێشبینی دەکرا کە کوردان بۆ جارێکی تریش هەتلــەرێ بـوون. ڕێبــەرانی کورد هەرگیز سەرنـجیان نەدایە ئەم مەبەستە کە زەمانێـك شـۆڕش هەڵگیرسـێنن کـە هێشتا شەڕی هەردەکی لـەگـەڵ ئێراقـا نەبڕاوەتـەوە. وەهـا کردەیـەکی ئازایانـە, وەك

یەكێك لە دیپلۆماتە بەئەزموونەكانی ئەمریكا گوتی، ڕەنگبوو بە قازانجیان تەواو بوایە: چونكە ئەو كات "هێزەكانی ئێراقی بە دژی كوردان دەهاتنە مەیدان و بەم شێوەیە بەربەرەكانی كردنیان بۆ شوارتسكۆف شتێكی سرشتی و بەجێ و ڕێ دەبوو؛ ئەو دەم نیازی بە سەلماندنی كاربەدەستانی بالاّ نەدەبوو؛ هێزی ئاسمانییش بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە كاری خۆی دەكرد." دیپلۆماتی ناوبراو لە درێژەی قسەكانیدا گوتی: "ئەگەر كوردان زانیبایان ئێمە چیمان دەكرد, بێگومان جیهان ئیتر گیروگرفتێكی نەدەبوو." بەلاّم مل نەدانی ئەمریكا بۆ پەیوەندی گرتن لە گەڵ كوردان, كۆسپی وەدیهاتنی وەها ئاكامێك بوو. بەمجۆرە هەل و شانسی بەدیهاتنی ئاڵوگۆڕ لە ئێراقا فەوتا.

بە نەبوونی ئەم ڕووداوانە, دەوڵەتی بووش هەروا بە بیروڕای ڕزیوی خۆیەوە نووسابوو و ئەم مەبەستە پێچەوانەی هاواری مەترسییەك بوو كە لە ئاخرین دەقیقەكاندا خۆی نواند. ئابرا مووویتس هەر ئەوەندەی بۆنی كرد لە ئانكارا چ ڕادەبرێ, تێلگرافێكی بۆ وەزارەتی دەرەوە لێدا و گوتی وەختی وەی هاتووە كە كوردانی ئێراق وتووێژیان لەگەڵ بكرێ, بەتایبەت ئەگەر پاژێك بن لە تەواوی لێژنەی نوێنەرایەتی كە تەواوی دژبەرانی ئێراق بگرێتەوە و هەڵبەت پێویستە بەم پێیە لە پێشدا توركیا ئاگادار بكرێتەوە. ئابراموویتس زۆر دواتر گوتی كە كاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە كە ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵ كردوون, چونكە ئەو لە ڕابردوودا, لە ترسی ڕەنجاندنی توركیا هەمیشە دژی وەها كردەیەك بووە, پێكەنیون و گوتوویانە: "ئەتۆ چت لێهاتووە!؟" ئەم پێوە ماندوو نەبوونە, یەكی تر لەم هۆكارانە بوو كە پاڵی بە واشینگتۆنەوە نا بۆ خۆگنخاندنی زیاتر لە بەرامبەر ئەم قەیرانەدا كە وا خەریكی گووران بوو.

كاتێ لە ڕۆژانی نۆ و دەی مانگی مارسا "تونگای ئوزچری", جێگری وەزارەتی دەرەوەی توركیا لە میوانخانەی دەزگای پاراستنی ئەم وڵاتانە چاوی بە تاڵەبانی و موحسین دزەیی كەوت, كوردان و تركان هیچكامیان چ بڕ ئاگایان لە ڕەوەندی ڕووەو

هەرەسی لەنەکاوی ڕاپەڕین نەبوو. ئوزچری لە کاتێکا گوێی دابوویە وتەی ڕێبەرانی کورد, کە بە شادمانییەوە باسی ئاخرین دەسکەوتەکانی پێشمەرگەیان دەکرد لە ئێراق و لەسەر هاوکاری خۆیان و تورکیا دەدوان, لێرەدا ئوزچری لە مەبەست حاڵی بوو: کوردان خوازیاری یارمەتی تورکیا لە کۆڕ وکۆما نێودەوڵەتییەکان دان, بەتایبەت دەیانهەوێ ئەمریکا حەساری وتوویژیان لەسەر هەڵبگرێ و دانیشتنیان لەگەڵ بکا. وەبەر چاو نەگرتنی پاوانی دامەزراوی ئاتاترك لەم سەردەمەدا کە شەڕی سارد کۆتایی پێهاتبوو و ترکان لەتەك دوژمنەکەی تریان لە ئەرمەنستان خەریکی وتوویژ بوون, ئاقلانە دەهاتە بەرچاو. ئوزچری هاودەنگی ڕاسپاردەی ئوزەل بۆ دیپلۆماتەکانی هاوکاری بوو کە بڕوایەکیان بەم مەبەستە نەبوو. ئوزەل گوتبووی: "لە سەردەمێکا هەموو وێکڕا کەوتوونە وتوویژ ئێوە دەبێ لە قاپۆڕی خۆتان بێنەدەر."

ئوزەل پاش یەکەم چاوپێکەوتنی ئوزچری لەگەڵ کوردان کۆبوونەوەیەکی بە بەشداری ئەندامانی سەرەکیی کابینە و سەرۆکی ناوەندی سەرکردایەتی سپا پێکهێناو ئەوانی لەم ڕەوتە پڕ دەمەتەقەیە ئاگادار کردەوە. ئەو لەم کۆبوونەوەدا لێگەڕا هەموو لە پێشدا قسەی خۆیان بکەن و هەر ئەمەش ڕێی بۆ سەلمانی پێشنیارەکانی خۆش کرد. ئەو بە هێنانە گۆڕی ئەم مەبەستانە کە تورکیا ئەوەندەی لە پشتیوانی کردنی کەمینە ترکەکانی بولغارستان یا قوبروسدا بەرژەوەندیی هەیە, هێندەش لە پشتگیری خزمانی کوردی لە ئێراقدا خاوەنی قازانجە, چی بە دەس ناسیۆنالیستە توند و تیژەکانی دژبەری ئەم گەڕیانەوە نەهێشت. لەگەڵ ئەمەشدا کاتێك باسی ئەم کارانەی کرد کە کردوونی, دەزگای دەوڵەتی تورکیا و ڕۆژنامەکانی ترك ترس و خۆفیان دەربڕی. وێڕای ئەمەش یەك دوو حەوتوو دواتر ئوزەل بە ئاشکرا چاوی بە ڕێبەرانی کورد کەوت, ئەندامانی دیکەی دەوڵەتی تورکیا و سیاسەتوانانی "دژبەر"یش هەر وایان کرد. ئوزەل بەڵێنی خۆی بردەسەر, خێرایەکی لە دەوڵەتی بووشی ڕاسپارد کە لەگەڵ کوردان بکەوێتە وتوویژ.

ئابراموویتس سەرەڕای تەواوی ئاگادارییەکی کە پێشتر سەبارەت بەم گەڕیانە هەیبوو, نەیتوانی کاکڵی کار و کردەوەی ئوزەل بدۆزێتەوە. ئابراموویتس کە لە ئوزەل

دڵمەند بوو چونکە پێشتر ئەم باسەی لای ئەو نەدرکاندبوو, لە رێی گۆڤار و رۆژنامانەوە چاوپێکەوتنی تاڵەبانی و دزەیی بە گوێ ئاشنا بوو. وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هەر بە پێی دابی خۆی دەربەسی ئەم رووداوانە نەبوو. هەڵبەزینەوەی تەواو شان بەشانی ئەو بێمەیلییە بوو کە پێنتاگۆن لە بەرامبەر زانیارییە تاکتیکییەکانی وا کوردان لە مەودای شەڕا بۆیان بەرێ دەکرد, لە خۆی نیشان دەدا. هەر بۆیە کوردان لە پێشا ئەم زانیارییانەیان دەنارد بۆ یەکێك لە کوردانی دانیشتووی "میشیگان"ی ئەمریکا و ئەویش ئەم هەواڵ و زانیارییانەی دەدا بە پیتێر گالبریس لە مەجلیسی پیران و ئەویش بە نۆرەی خۆی دەیدان بە پێنتاگۆن.

***

لە ٢٨ی فێوریەدا, یانی ئەو رۆژەی کە لەپڕ شەڕ برایەوە, کاربەدەستانی رەسمی ئەمریکا حارز نەبوون چاویان بە لیژنەیەکی رێبەرانی کورد بکەوێ کە لە واشینگتۆن بوون. ئەم رێبەرانە کە لەسەر بانگهێشتنی سێناتۆر کالی بورن پۆل, سێناتۆری دێموکرات لە روودئایلەند و سەرۆکی کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی مەجلیسی پیران هاتبوونە ئەمریکا, لە دیدارە رەسمی و غەیرە رەسمییەکانی خۆیانا مەسەلەی ئەگەری راپەرینێکی گشتییان لە داهاتوویەکی نیزیکا هێنایە گۆڕ و داکۆکییان کردە سەر بزووتنی هەستی خەڵك بە دژی سەددام و بە لایەنگری ئەمریکا لە ئێراقا. هیچ کاربەدەستێکی باڵا مەیلی لە بیستنی ئەم شتانە نەبوو. تەنانەت ریچارد شیفتێر, یاریدەدەری وەزارەتی دەرەوە لە کاروباری مرۆڤدۆستانەدا, لە ئاخرین ساتەکانی قەرارووبڕی چاوپێکەوتندا، دیدارەکەی لەگەڵ لیژنەکە هەڵوەشاندەوە. کاتێك سێ کەس لە ئەندامانی لیژنەکەی کوردان بۆ چاوپێکەوتنەکە گەیشتنە راڕەوی وەزارەتی دەرەوە, بەرەورووی کارمەندێکی بەرەژێر بوونەوە کە داوای لێ کردن بۆ خواردنەوەی قاوەیەك لە دەرەوەی عیمارەتەکە میوانی بن. ئەمە سووکایەتی پێکردنێکی دیپلۆماتیك بوو کە کوردان چاکی لەگەڵ راهاتبوون. لە رابردوودا کاربەدەستانی "دەفتەری رۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا" لایەکەم دەیانسەلماند کە بە گوێرەی

پێشینەی ئێراق لـە بەستێنی نە پاراستنی مافیمرۆصدا, لانیکەم پێویستە ئەم خەڵکەش پرسێکیان پێبکرێ و پاشان ئەوانیان حەوا دەدا بۆ لای کەسێك لـە دەزگای شـیفتێردا. پەیامی پڕ لـە سووکایەتی و بە هیچ نەگرتن لـەمە ڕوونتر هەر نەدەبوو.

لـە بەشی بەڕێوەبەرییدا تـەنیا "زاڵ وی خالــدزە" کـە یـەکێك لــە پەیڕەوەڕێـژانی پێنتاگۆن بوو لـە حاند ئەم بارودۆخە ڕاوەستا و دژایەتی نواند. لـە ماوەی چـاوپێکەوتنی نارەزامەندان لـە واشینگتۆن یـەکێك لــە کـارگێڕانی دەفتەرەکـەی و لــە دامـەزراوەی بروکینگز چاوی بە کوردان کەوت و قەراری دیدارێکی لـەگەڵ دانان. کاتێـك وە بـیر ئەم کەسەیان هێنایەوە کە ئەم کارە دەبێ ڕەزامەنـدی "دەفتـەری ڕۆژهـەڵاتی نیزیـك و باشووری ئاسیا"ی لـەسەر بێ, داوای ئیزنی کرد, بەڵام داخوازەکەی ڕەت کراوە. ئـەو گوتی: "هەر ریس‌وگوریسێکیش کە بەر لـە ئازاد کردنـی کووەیـت بـۆ بەڕێوەچـوونی وەها سیاسەتێك هەبووبێ, من لام وانـەبوو کـە وەهـا جـەغزێك پـاش شـەڕیش دەبـێ بەردەوام بێ. تەواو واق مابووم."

کاتێك چەند ڕۆژ دواتر ڕاپەڕین لـە کوردستان و باشوور سەری هەڵدا, ئاکامی ئەم نیزیك‌بینییە سیاسییە وەدەرکەوت. یەکێك لـە ئەندامانی شووڕای تـەناهی نەتـەوەیی لــە سەرەتای مانگی مارسا گوتی: "ئامانج و سیاسەتی ئێمە لـە کۆڵ بوونەوەی سەددامە نەك حکوومەتەکەی." وەك ئاشکرایە ئەمە "شیلـە و هەوێنی" سیاسەتی واشـینگتۆن بـوو لــە ئێراق. وا هەر ئـەم هەڵوێـست و سیاسـەتە بـوو کـە حکوومـەتی سـەددام حوسـێن و داروودەستەکەی بۆ داهاتوویەکی چاوەڕوان کراو خستە کۆڵی کۆمـەڵی نێونەتـەوەیی و خەڵکی ئێراق و سیاسەتی بە هـیچ نـەگرتنی ئاشـکرای دژبـەران یارمـەتی پـاش دەوەن بوونی کردەی حکوومەتێکی دا کـە وەك دیـارە "شـووڕای تـەناهی نەتـەوەیی" لـووتی تێیبوو. ئەو تاقمە سەرکردە نیزامییانەی ئێراق کە ڕەنگبوو دژی سەددام حوسێن بێنـە مەیدان, نەیاندەزانی واشینگتۆن چی دەوێ. ئەوە سرشتی حکوومەتە زۆردارەکانە. ئـەم نیزامییانەی لـە ناخی خۆیاندا دژبـــەری حکوومـــەتی ســـەددام بـــوون, نیازمەنـــدی نیشاندرانی "نیشانەیەك" بوون لــە لایـەن ڕێبـەری هێزەکـانی هاوپەیـــمانەوە. لـەگـەڵ پەرەسەندنی ڕاپەڕین, گـەورە پیـاوانی نیزامیـی ئێـراق کـە ویـستبوویان پەیوەنـدی بـە

دژبەرانەوە بکەن, کە چاویان بە بێمەیلی ئەمریکا کەوت, هاتنەوەخۆ و دەستیان ڕاگرت.

ئەم مل نەدانە بۆ وتوویژ لەگەڵ دژبەران, لەڕێوە هێندێك كێشە و تەنگەژەی بە کردەوەی نایەوە کە پتر بۆیە خۆفناك بوون کە ئەمریکاییەکان بە ئانقەست نەیانویستبوو پێشبینییان بکەن. ئەمانە مانگێکی ڕەبەق دانیشتبوون و چورتەیان لە خۆ بڕیبوو, وەك ئەوەی لۆی هیچ داوێکی ڕووداوەکانی ئێراق نەگەڕێتەوە سەر وان. تەنیا لە ئاوریلدا بوو کە زەنگی مەترسی زیراندیان و ئەمەش کاتێ بوو کە کوردان سەت سەت لە کوێستانان دەمردن. پاشان قەیرانی پەناخوازان لە ناخافڵ بەرۆکی گرتن. قەیرانێکی کە خێرا پەرەی دەسەند و لە مێژوودا پێشینەی نەبوو. "فێریدریك کۆنی" گوتی: "لە ڕۆژانی دەسپێکی ئاوریلا واشینگتۆن تووشی سەر لێشێواوی و تێکەولێکەیەکی تەواو بوو. لە وەزارەتی دەرەوە هیچکەس نەیدەزانی دەبێ چ بکرێ و هەرکەس وایدەزانی ڕاگەیشتن بەم قەیرانە ئەرك و بەرپرسایەتی کەسێکی ترە."

کۆنی ئەمەی بە لاوە سەیر نەبوو. ئەو کە پیاوێکی ڕەندی سەربەستی خەڵکی تێگزاس بوو و بە گوێرەی چێشکەی خۆی لێزانینێکی سەبارەت بە کاروباری خەڵکی بەلا لێدراو وە دەس هێنابوو و چەندین دەیە بوو کە شێوە توند و نوێباوەکانی ببوو بە هۆی سەرێشەی "کاغەزبازان"ی خاوەن ئەزموون, لە مانگی دێسامبردا ئەم "سێناریۆ"ی بۆ "دەفتەری کاروباری پەنابەران" نووسیبوو: ڕاپەڕینی گشتیی و هەڵقوڵیوی کوردان, هەرەسی تێکڕایی ڕاپەڕین و کۆڕەوی بەربڵاوی کوردان. ئەو, ئەوان سەردەمان خەریك بوو دەوڵەتی دوورخراوەی کووەیتی ڕێنوێنی دەکرد کە پاش ئازادی وڵات دەبێ چ بکا و بەتایبەت چ نەکا. پشتی مێزنشینانی وەزارەتی دەرەوە گوێیان دایە قسەکانی, بەلام جوولەشیان نەکرد: گەلاڵەدارشتن بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم ڕووداوانەی کوردیان دەگرتەوە دەیتوانی بە مانای دنە و پاڵ پێوەنانیان بێ بۆ ڕاپەڕین و لێكهەڵوەشانی ئێراق! زۆر بەر لەوەی "کۆنی" هیچ بەرپرسایەتییەکی لە پەیوەند لەتەك کووەیتا بخرێتە ئەستۆی, پاشەملە بۆ گەپجاری باسیان دەکرد و ئەو لە حاڵێکا

ڕۆژگاری بە خۆشییەوە تێپەڕ دەکرد, چاوەڕوانی کارەساتی پێش‌بینی کراوی بوو بـەڵام دەزگای حکوومەت هەر بە پووچی سەیری دەکرد.

لـەگەڵ ئەوەش‌دا پشتی مێزنشینان هەر بەڕاستی بـە دیتنـی بـەربڵاوی و تەنینـەوەی توند و لـەپڕی شۆڕشی کوردان لـە کوردستان و شیعەکان لـە باشـووری ئێـراق – ئـەو شوێنەی کە هێزەکانی ئەمریکایی بە کردەوە تەماشـاوانی سـەرکوتی ڕاپـەڕین بـوون – ڕاچڵەکین. وەزارەتی دەرەوە چاوەنواری ڕێ کەوتنی پەنـجا تا سەتهـــــــــــەزار پەناخوازیشی نەکردبوو و بە زمـانی خـۆی پێـی لێنـا کـە ئـەو وەهـا گێـرە وکێـشە و تێکهەڵچوونە هەراوەی پێش‌بینی نەکردبوو, ئیتر چ بگا بـە وەهـا کـۆڕەوێکی مـەزن و بەربڵاو. هیچ سەیر نیە کە گەڵاڵەرێژانی حکوومەتی بە سەرنج‌دان بـــەم حەســـارەی خرابوویە ســەر وتوویـێـژ لـەگـەڵ دژبـەران, لــە وتوێـژەکانی دوایی‌ـدا بێ‌پـسانەوە ئاماژەیان بۆ ئەم مەبەستە دەکرد کە ئـەوان بۆچـوونەکانیان لـەسـەر بناغـەی هـەواڵ و کۆمەڵێك زانیاری فرە ئاڵۆز ولێڵ دامەزراندبوو.

یەکێك لـە کەسانی زانستگایی کە کۆچی ساڵی ١٩٧٥ی کوردانی بەرەو ئێران وە بیر دەهات و تێوەنەگلانی ڕاستەوخۆی شارنشینانی بە لای زۆردا لـە یاد بوو و لـە بـیری چووبۆوە کە سەددام حوسێن بە چ شێوەیەکی ڕێك‌وپێك و ڕێ‌وشوێن بـۆ دیـاری‌کراو کۆمەڵی گوندنـشینی کوردسـتانی تـەفروتونا کردبـوو, گـوتی: "پێمـان سـەیربوو کـە شارنشینانیش کەوتوونە گەڵ کۆڕەو." بە هەر بارێك‌دا لـــە کوردانـــت دەڕوانـــی بـــە کردەوە شارەکی بوون: یا خۆیان لـە شار دەژیـان یـان سـەددام حوسـێن بـە زۆرەملـی ئـــەوانی لــە "موجەمـــەع"ەکـان پەسـتاوتبوو. ئـەم مەکۆگایانـە کـە لــە کەرەسـەی هەرزان‌بایی ساز کرابوون, بە مەبەستی "چاوەدێری" سووك و سانا لــە قـەراغ شـارێیان هەڵخرابوون و هەموو دەترسـان کـە سـەددام حوسـێن بـە چـەکی شـیمیایی تۆڵــەیان لـێ‌بکاتەوە, ئەگەرچی هەرچۆنێك بێ ساڵی ١٩٨٨ ئەم کارەی کردبوو. یـەکێك لــە کارەبەدەستانی وەزارەتی دەرەوە ڕێ‌وڕاست گوتی: "هەر بەڕاستی نەماندەزانی."

هەروەك زۆربەی ڕووداوەکانی‌کە لـە دەیەی ١٩٨٠دا قەومان, ئەوە تەنیا تێمـان و داماوی بوو کە دەوڵـەتی نێو گێژی تەنگەژانی ناچار کرد کە بەسەر گومان و بێرەبێـری

خۆیدا زاڵ بێ و بە نابەدڵی "كۆنی" ڕاسپێری هـەتا خـەریكی شـۆردنەوە و سـەروبەر وێكهێنانی كردەوەی ناشیاویان بێ سەبارەت بـە كـوردان. تەنانـەت كـۆنیش كـە لـە نێوەڕاستی ئاوریلدا چووە كوردستان لـە "بێخەبەری چەقبەسـتوو"ی كاربەدەسـتانی ئەمریكایی – بە نیزامیی و غەیرەنیزامییـەوە – سـەری سـوڕما. "هـیچ كـەس هـەر بـە خەیاڵیشیدا نەدەهات كە دەبـێ لـەگـەڵ كـێ وتوویـژ بكـرێ و تەنانـەت كەسـیش نەیدەزانی كە كورد كێن." كاتێك ژێنێـڕاڵ "جـێ ئـێم. گـارنێر" بـۆ وەرگرتنـی پلـەی سەركردایەتی هێزەكانی هاوپەیـمان لـە خـاكی ئێـراق هاتـە ناوچـە و كورتـە ڕاپـۆرتی ویست, هیچكەس نەیدەتوانی وڵامێكی پرسـیارەكانی لـە مـەڕ بزووتنـەوەی نەتـەوەیی كورد, ڕێكخراو و ئاوات و ئامانـجەكانی بداتەوە. "ئەم مەبەستانەی كە لـە نامیلكـەی زانیاری و ڕێنوێنیدا نووسرابوون وەك شۆخی دەچـوون, تەنانـەت ڕێبـەرانی حیزبـی و پەیوەندەكانیانی پێكەوە لێكدابوو. هێشتا دوو مانگێك لـە بڵاوكرانـەوەی تێنەپـەڕیبوو, كەچی ئاوها پڕ هەڵە بوو." هەرچۆنێك بێ ئەگەر كەسێك بۆ سـەركۆنە شـیا بـا, ئـەوە خودی كۆماریـخوازان بوون: دەوڵەتی ڕێگان كارناسـان و پـسپۆڕانی شـوێنی لاپـەڕ و دوورەدەستی وەك كوردستانی بژار كردبوو. لـە پیـت و بەرەكـەتی ئـەم پەیوەندییانـەی بریتانیا لـەگەڵ دژبەرانی ئێراق هـەبیوو, هێـزی دەریـایی پاشـایەتی چـەند ئەفـسەرێكی عەرەبزمان و ئەفـسەرێكی پایەبـەرزی هـەنارد كـە زانیارییـەكی زۆریـان دەر بـارەی هێزەكانی پێشمەرگە و ڕایەڵەی دارشتی هۆز و عێل و داب و ئاكاری كوردانی پێبوو. هێزەكانی دەریایی هولـەندیش چەند لاوی كوردیان لـەتەك خۆیانا هێنابوو كە لـە هولـەند مافی پەنابەری پێدابوون و ئێستا لـە جلوبەرگی هێزەكـانی هولـەندیـدا وەك ڕێنـوێن و دیلـمانج ئیشیان دەكرد.

لـە باری ڕامیارییـەوە كەترەخەمییـەكانی دەزگـای دەوڵـەت لـە مـەڕ خۆرهـەڵاتی نێوەڕاستا, پتر لـەبـەر "نیـشانەگەلی" لـێڵ و ئـاڵۆزی خـودی واشـینگتۆن لـە بیـچم و قەڵافەت دەترازان. بۆ وێنە, سعوودییەكان لایكەم لـەبەر چاوان وایان دەنوانـد كـە چ ترسیان لـە دێموكراسی و خراپـەكاری شـیعەكان نیـە. كەڵـەمێردانی شـیعە لـە ڕیـزی

دژبەرانی ئێراقدا, بەتایبەت ئەندامانی "ئەددەعوە" سعوودییەکانیان دڵنیا کردبـۆوە کـە هیچ مەبەست و ئامانـجێکی تاڵ و ناخۆشیان سەبارەت بە ناوچە نەوتییەکانی پارێزگـای ڕۆژهەڵاتییەوە نیە. لـە ڕاپۆرتێکی مەجلیسی پیراندا نووسرابوو: "لـە جەنگەی شۆڕشدا کاربەدەسـتانی سـعوودی پێـشنیاریان کـرد کـە ئەیالـەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا و عەرەبستانی سعوودی وێکڕا سەرهەڵداوانی کورد و شیعە بـە بـاری نیزامیی‌ـدا یاریـدە بدەن." ئەم پێشنیارە دەگەڕاوە سـەر "دەسـکەوت"ەکـانی دەزگـای پاراسـتنی سـەرۆك کۆماریی کە دروست بەر لـە دەسپێکی شەڕ لـە ژانویە بەڵێنی یارمەتی دەدا بە دژبـەرانی ئێراق.

دەوڵـەت خۆی لـە بەرامبەر زەرەدی بە هەڵکەوتا بیمە کرد: "ئەمـجار خەرجوبەرج لـە ئەستۆی کووەیتی و سعوودییەکان بوو و سەرەنـجام هەردوولا ترسیان ڕێ‌نیشت کە نەکا جگە لـە ئێراق, ئێران و سـووریا و تورکیـاش تووشـی ئـاڵۆزی بـن. ئەمـە وتـەی یەکێك لـە ئەفسەرانی ئاگاداری دەزگای پاراسـتن بـوو: "کـە وابـوو لێـبڕان بـە دوای کێشەکەدا نەچن." سعوودییەکان دەبێ لـە خۆیـان پرسـیبێ کـە ئـەمریکا بـە شـوێن چ ئامانـجێکەوەیە, چونکە دەوڵـەتی ئەمریکا لـە کلکەی مارسیشدا وڵامێکی سەبارەت بە پێشنیاری یارمەتی سپایی نەدابۆوە. لـەگەڵ ئەمەشدا, لــە سـێهەم حەوتــەی مارسـا سعوودییەکان "وشیار زێباری", یەکێك لـە یاریدەدەرانی بارزانییان بانگ کردە "ڕیـاز" و لـە بابەت "چالاکی بەگەرمە"وە پێشنیارگەلێکیان هێنـا گـۆڕ. پاشـان "برێنـت ئێـسکوو کرافت" و کارناسەکەی خۆڕهەلاتی نێوەڕاسـتی ئـەو یـانی "ڕیـچارد هـاس" لـەپڕ بـۆ بەڕێوەبردنی ڕاسپێراوییەك لـە واشینگتۆنەوە هاتن. سعوودییەکان لـە مەبەسـتەکە حـاڵی بوون, کوردەکانیش هەروەتر. پـاش ئـەوەی کـە ئێـسکووکرافت و هـاس هاتنـە سـەر گەڕانەوە, بلیتێکی فڕۆکەی لەندەنیان دایە وشیار زێباری و گوتیان کـە ئـیتر پێویـست نیە پتر وەمێنێ.

ڕاسـپێراوی و هـاتنی ئێـسکووکرافت کـە دروسـت پـاش چـاوپێکەوتنی بـووش و حەوتکـەس لــە ڕاوێـژکارانی بـەرزی, بـۆ ڕۆژهـەڵاتی نێوەڕاسـت دەسـتی پێکـرد, چارەنووسی ڕاپەڕینی کوردانی گۆڕی. هەموو دەیانسەلـماند کە ئێراق گوێی نەداوەتـە

مەبەستی کەلك وەرنەگرتن لە باڵەفڕە تۆپدارەکان لــە شەڕ لــەگەڵ سەرهەڵــداواندا, سەرەڕای ئەمەش تەما هاتە سەر ئەوەی کە بۆ ڕاگرتنی ئەم ڕەوتە هیچ کارێك نــەکرێ. ڕاپەڕینی باشوور تێك‌شکابوو و ئەمەش هێندێکی تاوانی سستی و دەس‌نــەبزاوتنی هێــزە هاوپەیـمانەکان بوو. لەگەڵ سەرەوژێر بــوونی هێزەکــانی گــاردی کۆمــاری, شــەپۆلی سپای ئێراق و باڵەفڕان و هێزەکانی زرێداری موجاهیدینی خەڵق — ئەم تاقمە دژبــەرەی ئێران و بە کرێ‌گیراوەی سەددام حوسێن — بۆ کەرکووك, سەرەنــجام ئــەم تەماگرتنــە ئارام و بزووتنەوە کیسەڵییەی واشینگتۆن "ئاکامی لــێ بەدی هات." کــوردان زۆر بــە کەمی خاوەنی چەکی باشی دژی فڕۆکە و تانك بوون و بە شێوەیەکی تەواو دەســەڵاتی خۆیان لە هەرێمدا دابین نەکردبوو. وتەبێژانی دەوڵەت بە قسە وایان دەنوانــد کــە لــە وان هەلومەرجاندا, بە دەنگەوە چوونی کوردان بۆ بەردانەوەی باڵــەفڕە تۆپــدارەکانی ئێراقی پتر وەك کردەیەکی بۆش و سەمبولیك دەبوو و ڕەنگە ئەیالەتە یــەکگرتووەکانی ئەمریکا و شەریکەکانی گیرۆدەی کێشەیەکی بێ‌بڕانەوە کردبا. یەکێك لــە بەرپرســان, لە کۆتایی کۆبوونەوەیەکی گرینگا لە وەختێکا کە دیسان بانگەواز و ڕاخوڕینی بووشی بۆ ڕاپەڕین و ئاکامەکەی پاش دەوەن دەکرد, گوتی: "ئێمە قەت هیچ بەڵێنییەکمان بــەم خەڵکە نەدا. هاوبەندان ئیتر وازیان لە چالاکی ســەربازی نیــە." هــەتا هاوپەیـــمان پــتر خۆیان گێل دەکرد و لە پێستی خۆیــان نەدەجووڵانــەوە, ئــەم قــسەیە کــە ئــیتر کــاری کوردان کراوە و خۆ تێوەردانی هاوپەیــمانان تــەنیا ڕوودانــی کارەســات وە پــاش دەدا, ڕاستتــری دەنواند.

لە ماوەی ڕۆژان و حەوتاندا دەوڵــەتی بــووش هێنــدێکی قــسە بڵاوکردنــەوە و پێ‌لێنان کە وەك بەڵگە لە سەر تەمای ورد و باریك بۆ ڕێگــەدانی پاشــماوەی ســپای سەددام بۆ سەرکوتی ڕاپەڕینی باکوور و باشوور دەهاتنە ئەژمار. بە گــوێرەی پێ‌لێنــانی خودی ژێنێراڵ شوارتسکۆف یەکەم هەڵە لە لایەن ئەوەوە لە کۆبوونەوەی سێی مارس لە سەفوان رووی دا, کــە تێیــدا هەلومــەرجی ئاگربــەس بــە ئاگــاداری ســپای ئێــراق گەیشت: لەم کۆبوونەوەدا ئەو ڕەزامەندی خۆی سەبارەت بــە داخــوازی سەرلەشــکر

سوڵتان هاشم ئەحـمەد بە مەبەستی هەڵگرتنی پاوان لەسەر فڕینی باڵـەفڕان – ئـەویش باڵەفڕی تۆپدار – دەربڕی. وەك خۆی دەڵێ: "دەبوایـە بـیرم لـێ کردبایەوە." چـونکە خێرا تێگەیشت کە "ئەو حەرامزادەیە فریوی داوە." چونکە بە پێـچەوانەی ئـەوەی کـە گوتبووی لەم باڵەفڕانە بۆ هاتوچۆی بەرپرسان بۆ ئێروئەوێ کەلك وەردەگـیرێ, بـۆ "سەرکوتی ڕاپەڕینەکان" بەهرەیان لـێوەرگیرا و سەرەڕای ئەمەی کە بێیکێـر دروسـت دووحەوتوو دواتر گوتی کە هێزەکانی ئێراق وەها پڕووزقابوون کـە "دەمـانتوانی هـەتا جەرگەی بەغداش بڕۆین", لەگەڵ ئەوەشدا نە ئەو, نە شوارتسکۆف و نە هیچ کەسـی تر لە دەوڵەتی ئێراقی ڕانەخوڕی کە فڕینی باڵـەفڕان لـەڕێوە ڕابگـرێ. لـە ڕاسـتیدا شوارتسکۆف بەرپرسایەتی لـە ئەسـتۆی خـۆی دارنـی و لـە ئەسـتۆی یـەکی دیکـەی پەستاوت. ئەو گوتی: "ئـەوکات" یـانی ئەوکاتـە کـە زانـی باڵـەفڕ کـەلکی نابـەجێی لێوەردەگیرێ "ئەمە لە ئەستۆی کۆشکی سپی بوو کە تەما بگرێ ئـەمریکا تـا کـۆی دەیەوێ خۆ لە کاروباری نێوخۆی ئێراق هەڵقوتێنێ."

لە واشینگتۆن کەم و زۆر هەموو ڕۆژێ مەبەستێکی لێڵ خۆی دەنواند کـە جـاری وابوو بە هۆی تەوژمی تووڕەیی خەڵك "چاك" دەکرا, بەڵام هـەر بـە دوایـدا شـتێکی نوێ خۆی دەنواند. لە ٩ی مارسا بێیکێر سـەبارەت بـە کـەلك وەرگرتنـی ئێـراق لـە چەکی شیمیایی بـۆ سـەرکوتی سـەرهەڵداوان, گـەفی لـەم وڵاتـە کـرد. بـۆ سـبەینێ ژێنێراڵێکی پێنتاگۆن ڕایگەیاند کە "هاوپەیـمانان" هیچ حەسار و پاوانێـك ناخەنـە سـەر ئەو ١٣٠ فڕۆکەی کە ئێراق لە ترسی تێداچوون بۆ ئێران ڕاگوێزتبـوون, یـانی ئەگـەر ئێران وێیداباوە, کە وێنەدەچوو. یەکێك لە کاربەدەستانی پایەبەرزی ئەمریکا هەر ئەو وتە سواو و ڕزیوەی دڵخـوازی کاغـەزبازانی دووپـات کـردەوە کـە بـەڵێ "تێکـەوتن لەگەڵ سەددام حوسێنێکی مـل کـەچ ونـەویکێش, سـاکارترە لـە تێکـەوتن لەگـەڵ کەمینەیەکی نەناسراودا."

بەڵام هاواری تووڕەیی جەماوەر هێندە بەرز و بەرزتر دەبۆوە کـە لـە ١٣ی مارسـا بووش لە چاوپێکەوتنێکی هەواڵنێریدا لە "ئۆتاوا" گوتی: "بۆ شەڕ لە نێوخۆی ئێراقدا نابێ لە باڵەفڕان کەڵك وەرگیرێ" و دەکار هێنانیـان دژی ڕاپـەڕیوان دەبێتـە ژێـر پـێ

خستنی پێکهاتنی هێزەکانی هاوپەیمان و بەغدا. یەکێك لە ئەفسەرانی پایەبەرز لە ١٧ی مارسا لە چاوپێکەوتنی لەتەك هاوتایانی ئێراقی خۆی لە سەفوان, وریایی دا کە درێژەی کەلك وەرگرتن لە باڵەفڕە تۆپدارەکان وەك "هەڕەشە لە هێزەکانی هاوپەیمان" دێتە ئەژمار. بەڵام سەرەڕای ئەم هەڕەشانەی کە هاوپەیمانان بە مەبەستی سوور بوون لەسەر قەدەغە و قورغی فڕینی فڕۆکان دەریانبڕی و دوو جێتی ئێراقیشیان سەرنخوون کرد, تەنانەت قەت باڵەفڕێکیان نەخستە خوار.

پاش چەند ڕۆژی دی ئاخرین مەتەرێزی خۆڕاگری و شیعەکان لە باشوور تێکشکا. بەڵام کوردەکان لە بیستی مارسا کەرکووکیان گرت و ئەمە سەرکەوتنێکی گومانـاوی و مەترسێدار بوو و بە ئاشکرا تای تەرازوی لە واشینگتۆن بە زەرەدی وان داهێنا. لە ٢٦ی مارسا هەڵوێستی تازەی واشینگتۆن ئاوای لێهات کە: "تەنیا زەمانێك باڵەفڕەکانی ئێراق دەخرێنە خوار کە هەڕەشەیەك بن بۆسەر هێزەکانی هاوپەیمان." مارلین فیتس واتێر, گوتەبێژی کۆشکی سپی کە هەوڵی دەدا پاساوێك بۆ ئەم سووکبارییە کردارییە وەدۆزێ گوتی کە هەڵپێچانی سەرەتایی کارەکان لە لایەن شوارتسکۆف لە سەفوان "شتێکی سەرزارەکی بووە و چ شتێك نەنووسراوە." یەکێك لە پایەبەرزانی ئەمریکا کە ناوی ئاشکرا نەکرا، گوتی: تەماگران لە واشینگتۆن لەگەڵ ئەوەی سەددام دەیکا "هاودەنگ نین, بەڵام پێشیان ناخۆش نیە کە ببینن لەم ڕووداوە تالآنە ڕزگاری بێ."

"کریستیەن مووس هێلمێز" بە ڕادەیەك لە تاوانبارکرانی هاوبەندان بۆ دنەدانی شەڕی نێوخۆی ئێراق پەرۆش بوو کە دژی "کردنەوەی مجری پاندوورا"[1] وریایی دا بە هێزەکانی هاوپەیمان. یەکێکی تر لە کاربەدەستانی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

---

١– بە نەزانێوە دەس بۆ کارێ بردن و کۆسپ سازکردن: (ئەساتیری یۆنان) مجری پڕ لە خراپە و دزێوکاری مرۆص کە ئیپیمەتئووس لە ڕووی نەزانێوە کردییەوە. بە گێڕانەوەیەکی تر ئەم مجریە پڕ بووە لە تەواوی ئەم شتە باشانەی خوایان دابوویان بە پاندوورا ... کە هەر کرایەوە لێکڕا ڕەوین, جگە لە هومێد کە لە بنی مجرییەکەدا مابۆوە.

کە لە ڕووی ڕاویژ و ناو حەشاردانیڕا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ گوتی: "با ڕێوڕاست بیلێم, ئێمە دەمانویست ئەم شەڕە نێوخۆییە بڕێتەوە, هەتا دەستێوەردانمان وەك تەمای یارمەتی دانی سەرهەڵداوان نەیەتە بەرچاو, بەڵکوو چەشنی دابین کردنی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بێتە حیساب." ڕۆژی پاش گیرانەوەی سەرلەنوێی کەرکووك لە لایەن هێزەکانی ئێراق لە کاتێکا کە کۆڕەو دەستی پێکردبوو بارزانی و تاڵەبانی لە داخوازێکی بەزەیی‌بزوێن‌دا بۆ داوای یارمەتی لە بووش گوتیان: "خودی خۆت داوات لە خەڵك کرد کە دژی سەددام حوسێن ڕاپەڕن. پاشان بەرەڵات کردن و بە شەوڕەشی زۆرداریی سەددام حوسێنت ئەسپاردن."

***

ڕاست لەو شەوڕەشەدا هێزەکانی پێشمەرگە لێك‌هەڵوەشان و پێشمەرگە لە بازرە بوونێکی مێژوویی‌دا ڕێبەرانیان بەجێ هێشت. بارزانی و تاڵەبانی بە جیا کەوتنە خۆڕاگری و لێبڕان وەمێنن و لە گەرمەی شەڕا بکوژرێن و هەڵنەیەن. تاڵەبانی و هێزۆی هاوسەری و تاقمێکی چەند کەسی لە هاوڕێیانی لە کاتێکا پێنج پێشمەرگەیان پتر بە دەورەوە نەمابوو, لە شوێنێکی دەوروبەری ڕۆژهەڵاتی سلێمانی بنکەیەکیان دامەزراند و بێ ئەوەی گوێ بدەنە داخوازی کشانەوە بۆ جێیەکی دوورتر و هێورتر, چەقین. ئەم لێبڕان و مانەوەیە توانی کەمۆکە هێزێك لە دەوریان کۆ کاتەوە و لە گەرووڵەیەکی ئەستەمدا بەری پەلامارەکانی ئێراق بگرن.

لە باکوور, بارزانیش کە هێزەکانی لێی تەوەلا ببوون, نیوە بە هەڕەشە و نیوە بە دنەدان ئەوندووکە پارێزەرانەی خۆی کە مابوونەوە و هێندێکیان کەسانی خاوەنی ئەزموونی سەردەمانی ڕێپێوانە مێژووییەکەی باوکی بوون کە لە ساڵی ١٩٤٧دا لە مەهابادەوە[1] بەرەوە یەکێتی سۆڤیەت چووبوون و ساڵانی دوورخرانەوەیان وێرای ئەو تێپەڕکردبوو, هێنانیە سەر خۆڕاگری و بەربەرەکانی. (هەتا پاش چەند ساڵان کەلاك و قاپۆڕی تێك‌شکاوی هێزێکی زرێداری ئێراق لەسەر کوێستانەڕێی نێوان سەلاحەددین و

١- "لە بارزان"ەوە دروستە. "یۆنسی"

شەقلاوا, وەك نیشانەی ئازایەتی مەسعوود لە سەرکردایەتی هێرشێكدا کە بەرەگەی لە پێشرەوی هێزەکانی ئێراق بریەوە, خۆیان دەنواند. لە کۆمەڵێکی خاوەن فەرهەنگێکی ترا ئەم قاپۆڕانەیان دەپاراست و بێ نێوبڕ ڕەنگیان دەکردنەوە و بە یادی سەرکەوتن ڕایاندەگرتن. بەڵام من هەرکات بە "دەربەندی کۆرێ"دا بە سەر پاشماوەی ئەم کاروانە تێكشکاوەدا تێپەڕ بووم قاپغ و قاپۆڕی کەمترم بینی. کەرەسەی سیارەکانیان یا بە تەواوی لێکردبۆوە یان هەر شوێنەواریشان نەمابوو. هەر چۆنێك بێ قارەمانەتی وەها دەگمەن بوون.)

لە سەردەمی ڕاپەڕینا، دوکتۆرێکی لاوی پێشمەرگە بە ناوی سەبراخان گرینگ، بەڕێوە بردنی نەخۆشخانەی کەرکووکی وە ئەستۆ گرتبوو. تەرمی پێشمەرگان لە بەر دەرگای نەخۆشخانە چەشنی کۆمایەك ویشکەڵەدار لە سەریەك کەڵەکە کرابوون و کاتێك من وتوویژم لەگەڵ دەکرد تۆپخانەی سپای ئێراق نەخۆشخانەی دابووە بەر ئاگری بێوچان. بەیانی ٢٨ی مارس ئەو هێشتاش هەر لەوێ بوو: کاتێك لە پەنجەرەوە بۆ دەرەوەی ڕوانی لەوپەڕی ترسا چوار تانکی ئێراقی بینی کە بە بێهەست و خوست نەخۆشخانەیان گەمارۆ دابوو: دەسڕێژی پەیتاپەیتای فیشەکان بوو کە نەخۆشخانەی دەنجنی. ئەو و "پێشمەرگەی ئێشك‌گر" زانیان هەر ئێستایە کە پەلامار بدرێن و فیزماڵکیان دایە. پێشمەرگە زامارەکان لەبەر گرینگ دەپاڕانەوە کە جێیان نەهێڵێ. یەکێك لەوان کە لاقێکی پەڕیبوو, خۆی لە جێوبانەکەی فڕێ دا و دەلینگی گرت هەتا ڕێی هەڵاتنی لێبگرێ.

گوتی: "یارمەتیم بکە!"

گرینگ پاڵێکی پێوەنا: "من خۆم تێماوم, چلۆن دەتوانم یارمەتی تۆ بکەم؟"

گرینگ بە زللەیەك دوکتۆرێکی کوردی پەشۆکاوی وە خۆ هێناوە و ئەم دووە لە وەختێکا پەرستارانی عەرەب لە خۆشی گەڕانەوەی دەسەڵاتی سەرلەنوێی بەغدا قریشکە و قریوەیان ولاتی داگرتبوو, پێکەوە ڕایانکرد. لەو دەمەیدا

هەڵدەهاتن گولـلـەیەك وە نەخۆشخانە کەوت و کەوانەی کرد و بە ویـزە ویـز بـە بـن گوێیاندا ڕۆیی.

گرینگ لـە ڕانیە ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامـەوە. مانگێـك دواتـر کـە بـە قاچـاغی گەڕامەوە کوردستانی ئێراق بە هەڵکـەوت چـاوم پێیکەوتـەوە. ئـەم ماوەیـە هـەواڵی سەبارەت بە بارودۆخی تاڵوتوونی کوردسـتانی ئێـراقم لـەوبـەری سـنوور, لـە خـاکی ئێرانڕا کۆ دەکردنەوە و بەڕێم دەکردن. لـەو دەمەدا سەدانهـەزار پـەناخواز هێـشتا چاوەڕوان بوون هەتا بگەنە ئەو نزیك میلیۆن کەسەی کە پێشتر پـەنایان بردبـووە بـەر ئێران. هـۆی گەڕانـەوەم ئەمـە بـوو کـە سەرنووسـەری ڕۆژنامەکـەم لێیخوازتبـووم بگەڕێمەوە ئێراق و لـەم مەبەستە بکۆڵمەوە کە بۆچی لـەوپـەڕی واق ورمـانی جیهـانی دەرەوەدا, کوردان هاتوونە سەر وتوویژ لـەگەڵ بەغدا بەتایبەت تاڵـەبانی بۆچـی وای بە باش زانیوە کە لـەبەر چاوی کامێراکانی تەلـەفیزیۆنیدا سەددام حوسێن بگرێتە ئامێز.

ئەم داخوازی گەڕانەوەیەم ڕەنگە لـە واشـینگتۆن وەك شـتێکی زۆر ئاسـایی خـۆی نواندبێ, بەڵام من دڵنیا نەبووم بتوانـم بچمەوە کوردستانی ئێراق. پێویستیم بە پێوەندی گرتن لـەگەڵ نوێنەرانی کورد لـە ئورووپا بوو کە ئێستا لـە واشـینگتۆن ئـاوارە بـوون و دۆزینەوەیان دژوار. ئەمانە بوون کە دەبوو ڕێبەرانی پێشمەرگەیان لـە ویستی گەڕانەوەم ئاگادار کردباوە. هەرچۆنێك بێ ئەوەندە لـەگەڵ یەساولانی سنووریی ئێران ئاشنا ببـووم کە تەنانەت بیریشم لـەمـە نـەکردەوە کـە داخـوا ئیـزن دەدەن غەوارەیـەك — ئـەویش هەواڵنێرێکی ئەمریکایی — سنوور ببەزێنێ و بچێتە ئێراق؛ نەشـمدەویست خۆ بـــخەمە مەترسی و بە قاچاغی ئاودیو ببم. ئەگەرچـی لـەبـەر تێنەکـەوتن لـەگـەڵ کاخـەزبازی" ئێرانییەکان دەبوو کارێکم کردبا پەساپۆرتەکەم مۆری دەرچوونی لـێدرابا. وەرگرتنـی ویزا لـە ئێران دژوار بوو و من نەمدەویرا کارێك بکەم ڕۆژنامەکـەم بکەوێتـە لیـستەی ڕەشەوە.

کۆسپی سەرەتایی ئەمە بوو کە کاربەدەستانی ئێرانی هەرکەسێکی ویستبای بە ڕێـی ئەردەکیدا لـە ئێران دەرکەوێ لێی دووشك بوون. بە منیان گوت باشتر وایە هـەروەك هاتبووین, چەشنی هاوکارانـم لـە فڕگەی تارانەوە, ئێران جێبێڵم. بەڵام من دەمویـست

ئیزن بـخوازم لـە کەوشەنی تورکیا و ئێران تێپەر بـــم. بـەم شـێوەیە دەمتـوانی ڕێـم لار کەمەوە و بە ڕێی ناوچەیەکی سـەخت و کوێـستانیدا کـە سـنووری ئێـران و تورکیـا وێكدەکەونەوە, بگەڕێمەوە. هیوادار بووم بەم شێوەیە بتوانـــم ڕێـی خـۆم بکەمـەوە و بچمە دیداری بارزانی و ڕێبەرانی تـری کـورد. ئومێـدوار بـووم نیازپـاکی هـەڵقولاوی یارمەتییەکانی مرۆڤدۆستانەی هاوبەندان بتوانێ باڵم بگرێ و بتوانـم بە شێوەیەك لـە تێکەوتن لەگەڵ سنووردارانی دڕدۆنگـی تورکیـا, کـە چـاوەدێری کەوشـەنێکی پتـر بەسراون, دەرباز بـم.

بەتایبەت دەمویست لـە فڕین لـە تارانەوە بۆ ئورووپا خۆ بپـارێزم. چـونکە ئـەوکات دەبوایە ئەوسەرەوسەری تورکیام هەتا "وان" بە فڕۆکە بڕی بـا و کـە وا بوایـە بێشـك پەیدا بوونەوەی سەروسۆراغم لـە ماوەی دوو مانگاندا, زەنگـــی مەترســـی لـــە مـــەڕ مەبەست و ئامانـجم تەنانەت بۆ کێهە پۆلیسی هەرە هێڕی ترکە وە جرینگە دەخست و وە ئاگای دێناوە. لـە تاران گەلـێ ڕۆژ پرتە و بۆڵەی بێپسانەوە ئاخرییەکەی وە ئاکـام نیشت. ئێرانییەکان ئیزنیان دا کە بە سنووری ئەردەکیدا وڵات جـێبێڵم. کـە وا بـوو بە فڕۆکە بەرەو ورمێ باڵم گرت و لــەوێش چـوومە دەفتـەری نوێنەرایـەتی بـارزانی و چاوەڕوان مامەوە. پاش ماوەیەك ڕاوەستانی پڕ دڵەڕاوکێ یادداشتێکیان لـەگەڵ لیستەی چەند کەسان لـە "یوکسەکوا" وێدام, کــــە یارمــــەتیم بکــــەن. یوکـــسەکوا هــــەمان شارۆچکەیە کە بۆ کەلوپەلی قاچاغ بەناوبانگە و هەر ئەو شوێنەشـە کـە لـە فێوریـەدا توانیم لـەوێوە پێوەندی بە پێشمەرگانەوە بکەم.

ئەمـجار وا دیار بوو دەستەودەیارەی بارزانی کاریان بۆ پۆلیسی ترك دەکـرد. هـیچ یارمەتییەکیان نەدام: هاتن, نامەکەیان خوێندەوە و ڕێوڕێ شرتوگوم بوون و ئـیتر نـە هاتنـــەوە و نـــە وڵامـــی تەلـــەفۆنیان دامـــەوە. ڕۆژی دواتـــر چـــوومە هـــەکاری کـــە شارۆچکەیەکی تەمی خەم لـەسەر نیشتووی ژێر چـەپۆکەی ترکانـە. لــەم شارۆچـکەدا ترس لـە ڕاپەڕیوانی کورد ئەوەندە بوو کە تەنانەت لـە باشترین ساتەکانیشا کە هیچ باس

و خواسێك نەبوو, پۆلیس و كۆماندووەكانی سپا و هێزەكانی تایبەتیی ژاندرمە و "مەئموورانی ئاسایی" شەو و ڕۆژ لە كۆڵان و شەقامان دەخولانەوە.

لە چاكەی ئەو دۆستە كوردانەی بە ڕێكەوت تووشیان هاتم دوو ڕۆژ دواتر لە شارەوانی دانیشتبووم و لەگەڵ یەكێك لە كاربەدەستانی شار چاییم دەخواردەوە. ئەم كاربەدەستە وای كرد كە بتوانم پێوەندی بكەم بە نوێنەری بارزانی لە واشینگتۆن. وا قەراروبڕی كرا نوێنەری بارزانی بە مەبەستی "دەستەبەر" بوونم لە كاتێكی دیاری كراوا بە تەلەفۆنێك پەیوەندەی بكا بەم كاربەدەستەوە. من لەم كاروبارە دڕدۆنگ بووم, شكم نەبوو كە فریو دراوم, بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە ئالی خۆم دەمگوت هەر ئەوەی كە داخوازەكەم بردۆتە لای كاربەدەستێكی ترك خۆی شتێكە ... وە هەر حاڵ جگە لەمە چارەیەكم نەبوو.

پاشنیوەڕۆیەكی درەنگ هاتمەوە شارەوانی. پاش چا خواردنەوەیەكی زۆر گوتیان هەرچۆنێك بێ یارمەتیم دەكەن. هەر ئەوشەوە بەر لەوەی ئەم كاربەدەستە مەودای پەشیمان بوونەوەی هەبێ, گەڕامەوە "یوكسەكوا", پاشان چوومە "سەمەدینلی" كە لە سنوور نیزیكتر بوو و شەوم لەگەڵ پەسندەرانی بارزانی ڕابوارد. وەك دیار بوو ئەم خەڵكە لە هەموو شتێكم ئاگادار بوون. بۆ سبەینێ بە ڕێیەكی پڕ كەندوقووڵا, بە تێپەڕینێكی سەرسوڕهێنەر, بە بەردەرگای بنكە نیزامییەكانی تركاندا باڵمان گرت و دیاربوو كە سەگورگی زنجیركراویان پرخەیان دەهات.

لە یەكێك لە ئوردووگاكانی خێوەتنشینی نیزیك سنوور "ڕێنوێن"ێكم دیتەوە كە ئینگلیسی دەزانی. گومانم نیە كە سنووردارانی توركیا دەیانزانی كە هەواڵنێرم, بەڵام لاسای لالانم كردەوە و بەخت باڵی گرتم. بە بوونی فریاڕەسانانی نێونەتەوەیی و كارگێڕانی ماندوویینەناس و ڕاهاتووی سەر بە هێزی ئاسمانیی بریتانیا و تەواوی ئەو جەماوەرە ڕەنگاوڕەنگەی لەو قەیرانەدا وەبەركار نرابوون, من تەنیا بێگانەیەك نەبووم كە لە كەوشەن تێپەڕ دەبووم و كەس داوای نەكرد كە پەساپۆرتەكەم مۆر بكا (و ئەم كارە مەسەلەی گەڕانەوەمی بۆ توركیا لە حاڵێكا پەساپۆرتەكەم مۆری دەرچوونی وێنەكەوتبوو هەروا دەهێشتەوە.)

لـە ئاخرین گوندی تركان ئەسپێكم بۆ هەڵگرتنی كەرەسە و شرِوشالاٌتەكەم بـەكرێ گرت. كاتێك رێنوێنەكەم بە كابرای كرێبارچی گـوت كـە دەچـمە دیـداری بـارزانی, پوولـەكەی لـێوەرنەگرتـم. كابرای رێنوێن كە یەكێكی پشووسواری ناقۆلا بوو, خێـرا لـە كاروان بەجێما و لـەسەر داخوازی من سواری ئەسپەكە بـوو. چوارسـەعات دواتـر بە داوێنی ئەو لووتكانـەدا تێپـەرِ بـووین كـە یـەك لـە دوای یـەك هەسـتابوونە پـێ و هێندێكیان هێشتا سامالٌ سپی بوون و بە لاپاڵی رِازاوە بە مێلاقەی سـوور و شەشـپەرِ و سـمڵدا رِابردین. لـە لای خوارتر, لـە خرِ و دۆڵانـدا خاشخاشكی كێـوی و گـەزیزە و چاوكسكە و گوڵاڵـەسوورە چاویان پێ روون دەبۆوە. رێ رِۆینمان خـۆش بـوو, هـەور بوو, بەلاٌم نـە دەبـاری و نـە گـەرم بـوو. كاتێـك لـە رێـی خۆمـان لامـان دا و پـاش نیوەرِۆیەكی زۆر درەنگ گەیشتینە رێگایەكی قیلـەتاوی تەواو لـەت‌وكوت و كـرِووز و نێوە نێوە ماو و نەماو, بە رِێكەوت تووشی بارزانی هاتین كە چاوەرِوانـمان بوو.

رِۆژی دواتر بارزانی بە سواری ئوتۆمبیل نـاردمی بـۆ دیـداری تاڵـەبانی لـە رانیـە. تاڵەبانی لـەبەر ئەو ماچوموچـــەی لـەگـــەڵ ســـەددام حوســـێن كردبـــووی و لـــە تەلـەفیزیۆنەوە بلاو كرابۆوە, كەوتبووە پاكانە و لـەســەر خۆكردنـەوە. گـوتی تەنانـەت ژنەكەشی هەڵیپێچاوە كە چلۆن توانیویەتی وەها دیـمەنێكی دڵژاكێن نیـشانی جیهـانی دەرەوە بدا, ئەویش لـە كاتێكا هەر ئەم جیهانەی دەرەوە راست ئەم بەینانە — ئەویش بە رِێكەوت — كوردی دۆزیبوونەوە و كەوتبووە بەرگری لـێكردنیان؟ ئەگەر دانیـشتن و وت‌وویژ لـەگەڵ ئێراق پێویست بوو, بۆچی نەدەبوو لـە خاكی ولاٌتێكـی بێلایـەن بایـە هەتا بەغدا؟ لـەوەش بترازێ, باشە بۆچی بە بێ هەنتەشی چـاوەدێرانی نێونەتـەوەیی یـان چاوەدێریی رِێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان؟

ئیتر لـە كومیتەی هاوبەشی دژبـەرانی ئێـراق, كـە لـە دیـسامبری رِابـردوودا بـەو هەمووە كوێرەوەرییە تێك‌خرابۆوە, چ شتێك مابۆوە؟

تاڵەبانی لـە كردەیەكی ناشیانەدا كە لـە سەرانسەری دنیادا بەدی كـرا, دیـــمەنێكی كە باسی كاڵی و نەكوڵیوی سیاسەتوانانی كورد دێنایە گـۆرِ و ئـەوانی وەك كەسـانێك

دەنواند کە ئەو هەلانـەی مێـژوو بـۆی هەڵخـستبوون دۆڕانـدبوویان, سەلـــماندی و سووری کردەوە. تەنانـەت کەڵــە دەوڵەتـدارێکی وەك ســەرۆك فرانـسوا مـیتران کـە مەیلێکیشی سەبارەت بەرەو ئێراق هەبوو, کەندالّ نەزان, سەرۆکی ئەنستیتۆی کوردی لـە "پاریس" سەرکۆنە کردبـوو کـە بۆچـی ڕوانگـەی کـوردان لـەسـەر خودموختـاری چەقبەستوو دەکا. گوتبووی: "ئەرکی ئێوە ئەمەیە کـە پارێزگـاری لــە مـافی خـەڵکی کورد بکەن بۆ هەبوونی وڵاتێکـی سـەربەخۆ." وا ئێـستا کوردەکـانی ئێـراق باشـترین دەرفەتێکی کە لـە زەمانی تێکچـوونی ئیمپراتۆرییـەتی عوســـمانییەوە تـا ئێـرە وە دەس هاتبوو, تووڕیان هەڵدابوو.

بە هەر حالّ, تاڵەبانی گوتی کە دەوڵەتی بووش کوردانی دنە داوە: واشینگتۆن لــە پێشدا ئەوانی بۆ ڕاپەڕین هان دا و پاشان بە نەخـستنەخوارەوەی باڵــەفڕە تۆپـدارەکانی ئێراق لای لـە سەددام حوسێن کردەوە کە پەلاماری کوردستان بدا.

جا ئەگەر کێشەکە وەها بوو, داخوا ئەم ڕاپەڕینـە بـەو کـۆڕەو و ڕەوێنـە سـەر بـە سووکایەتییە ئـەو گـشتە تێداچـوون و کوێرەوەرییـەی دێنـا, ئـەویش بـۆ دەزگایـەکی ڕێبەرایەتی کە پێشتریش لـە بابەت خۆخستنە نێو شەڕی ئێران و ئێراقەوە وە بەر تـەوس و توانـجی خەڵك کەوتبوو.

تاڵەبانی گوتی: "بەڵێ, دەکرێ بڵێین تـەواوی ئـەو دەرد و کوێرەوەرییانـەی دێنـا. بیری گشتیی جەماوەری جیهان تەوژمی خستە سەر دەوڵەتانی ڕۆژاوایی. بۆ یەکەم جار کێـشەی نەتـەوەیی کـورد کەوتـە نێـو جـەغزی کـاری ڕۆژانـەی ڕێکخراوەکـانی نێونەتەوەیی. بڕیارنامەی ٦٨٨ی شووڕای تەناهی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ناو باسی کوردانی کرد و لـە ماوەی حەفتا ساڵدا ئەمە یەکەم جـارە کـە ئـەم نـاوە لــە بەڵگەنامەیەکی نێونەتەوەیـدا دێ. تەنانـەت وەزارەتـی دەرەوەی ئـەمریکا گـوتی کـە کێشەی کورد, تەنیا مەسەلـەیەکی " مرۆڤدۆستانە" نیە, بەڵکوو کێشەی دابین بوونی مافی سیاسییە لـە چوارچێوەی وڵاتی ئێراقدا. بــۆ یەکـــەم جـــار تورکیـــا لـێژنـــەکانی نوێنەرایـەتی کـوردی وەرگـرت و بـەڵێنی پـشتیوانی دا. بـۆ یەکـەم جـار کۆمـەڵی ئورووپا ..."

تاڵەبانی بە پێچەوانەی هەمیشە لـە قـسە کـەوت؛ سـەرم لەسـەر کامپیووتێرەکـەم هەڵگرت کە مەبەستەکانـم تێدا دەنووسی. تاڵەبانی دەرکەی کامپیووتیرەکەی پێـوەدام کە ئیتر چ شتێك نەنووسـمەوە و گوتی: "پێویست بە نووسـینەوە ناکـا ... بۆخۆمـانین, کەسی دیکەی لـێ نیە. پووڵمان نیە, تەقەمەنیمان نیە, چەکی دژی تانکمان نیە, چەکی دژی فڕۆکەمان نیە. کەس پشتیوانیمان لـێناکا. بە بێ یارمەتی دەرەوە چلۆن دەتوانـم هاوڕێیانـم دابین کەم؟ ئەو یارمەتییانەی بۆمان دەنێرن ئێرانییەکان لێمان قـووت دەدەن, ئوتۆمبیلـەکانـمان دەدزن و لـەسەر سنوور چەکمان دەکەن."

ئەو شتانەی کە بۆ بەرگری کردن لـە خۆی وتنی، کۆمەڵەمەبەسـتێکی زۆر ڕاسـت بـوون و لـەگـەڵ ڕاسـتەقینە موویـان نـەدەبوارد. پێـی واشـینگتۆن و شـەریکە ئوروپاییەکانی تێوەچووی "چالاکی فریاڕەسانی"شی هـەتا ڕادەیـەکی زۆر تێـوەدەدا. دەوڵـەتی بـووش دەیەویـست هـەروا سەرسـەرەکی بـۆ دابـین کردنـی پـەناخوازانی گردەوەبووی سنووری تورکیا کارێك بکا و پاشان خێرا خۆی کەنار بگرێ و کـوردان بداتە دەستی چارەنووسیان. بەڕێوەچوونی چالاکی بە مەبەستی گێڕانـەوەی پـەناخوازان بە بێ کەمترین زیـان و زەرەد بـوو, چـالاکی بـە وردی و — بـە بـڕوای هێنـدێك لــە ڕەخنەگران — هەتا ڕادەیەکی پڕ مەترسی لـە لایەن واشـینگتۆنەوە تەنگەبـەر کرابـۆوە. ئەو ناوچە کەمتاکورت بچووکە "هێور"ەی کە هاوبەنـدان دیارییـان کردبـوو تەنانـەت شاری دهۆکی نەدەگرتەوە, یانی سەری ئـەو سـێ کوچـکەی کـە شـوێنی حاوانـەوەی زۆربەی پەناخوازان بوو. "کۆنی" لـە بەرەکەتی سەرژمێرییەکی کە بە یاریدەی هێزەکانی تایبەت لـە کوردانی گردەوەبووی سەرسنووری تورکیا کرابوو, ئەوەی دەزانی.

زۆربەی پەناخوازان هەتا هێزەکـانی هاوپەیـمان نەچـوونە نێـو بـاژێری "دهـۆك"ی ناوەندی پارێزگا, لـە چیا نەهاتنە خوار. بنکەی پۆلیسی نەهێنی و بەندیـخانەکان بۆ وان سەمبولی سەرکوتی بەعس بوون. ئینگلیسی و فەڕانسەوییەکان بە نارەحـەتی تەماشـایان کرد کە ژێنێراڵ پاوێل دژی چوونی هێزەکانی هاوپەیـمانە بـۆ دهـۆك, لــە ترسـی وەی نەکا هەنتەشی وان لـەوێ ئاگری شەڕەکە خۆش کاتـەوە. تیپـەکانی ئێراقـی لــە ترسـی

فڕۆکەکانی ١٠–A و تۆقین لە شریخوهۆڕی شکاندنی دیواری دەنگ دهۆکیان چۆڵ کرد, بەڵام پاشان گەڕانەوە.

سەرەنجام پۆلێك سەربازی ئەمریکایی و ڕاوێژکارانی غەیرە نیزامیی, بە ناچاری و فێڵ و دەهۆ – سەرەڕای بیری بەرپۆەبەرانی خۆپارێز لە واشینگتۆن – بە نوێنەرایەتی هێزەکانی هاوپەیمان بە شێوەی کاتی چوونە دهۆکەوە. یەکێك هەر لەمانە دەیگوت: لەوێ, یانی لە واشینگتۆن لە ئێمەیان دەویست کە بە پێی ڕێسای "مارکسیێ کوئیزبێری"[1] کایە بکەین, بەڵام سەددام پیاوەتیومیاوەتی نەدەزانی و ئێمە بە ناچار چاوی ئەو و واشینگتۆنمان نووساند.

سەرهەنگ ریچارد ناب, ئەفسەری پێوەندییەکانی ئەمریکایی کە لە گەڕیانی پێوەندی لەگەڵ هێزەکانی سۆڤیەت لە ئاڵمانی ڕۆژهەڵاتی, فێری هێندێك گزە ببوو, لە پێشدا بە شاتوشووت هاوتای ئێراقی خۆی ناچار کرد تاقمێك لە پیاوانی بێچەکی ئەمریکایی بۆ چوونە دهۆك بانگهێشتن بکا, ئەمە فێڵێك بوو کە ئەو ئەوی بە "مامەڵە" لەگەڵ هیتلێر شوبهاند. پاشان ئەمریکاییەکان گەڕانەوە و بە واشینگتۆنیان گوت کە دڵنیان ئەمریکاییەکان بانگ دێڵنە ناوەندی ئەم پارێزگایەی کە بە لای بارناسکی نیزامییدا شوێنێکی گرینگە. ئەم ڕووداوە بە ڕادەیەك سەیر بوو کە هاوکارانی واشینگتۆن گوتیان: "دەیجا کە وایە ئەگەر دەتوانن کارێکی وا بکەن کە ئێراقییەکان بانگتان بکەنە دهۆك, ئێستا کە وەخۆ کەوتوون بۆچی ناچنە بەغدا؟" لێرەوە کار کەوتە سەر دەور. تیپەکانی چالاکیی نیشتمانی و چالاکانی ڕێکخراوە تایبەتییەکانی فریاڕەسانی چوونە دهۆك و هێزەکانی ئێراق کشانەوە. واشینگتۆن لەم بابەتەوە قەڵس بوو". هەتا ئەوەی کە پەیامی پیرۆزبایی ئەمجار لە لایەن دەوڵەتانی هاوبەندەوە بەرەو کۆشکی سپی و پێنتاگۆن بە ڕێ کرا.

---

[1] – ڕێوشوێنی شەڕەمست کە لە لایەن مارکسیێ کوئیزبێری دامەزرا (١٨٤٤–١٩٠٠). یانی پاراستنی ڕێوشوێنی کایە.

لە ٣٠ی مانگی مەیدا پاوێل بە فڕۆکە چووە "زاخۆ" هەتا ڕایبگەیەنێ کە هێزەکانی هاوپەیمان "زووتر لەوەی ئێمە بیرمان لێدەکردەوە" ناوچەکە چۆڵ دەکەن. ئێستا تەنیا هەشتهەزار کەس پەناخواز لە سنووری تورکیا مابوونەوە. بەڵام ئەم وتانە کورد و فەرانسەوی و ئینگلیسییەکانیشی زۆر پەرۆش کرد. ئەگەر بێتوو سەددام حوسێن ویستبێتی بەڕاستی لەگەڵ کوردان بکەوێتە وتوویژ, ئێستا پاوێل تەواو هەلی بۆ دەرەخساند کە خۆی لێبگنخێنێ. لەندەن و پاریس هیوادار بوون کە هەنتەشی هێزەکانی ئورووپایی ببێتە هۆی پێکهاتنی وتوویژێك و پاشی ئەو هێزەکانی ئێراقی بە شێوەیەکی ئابڕوومەندانە وە دەرکەون. بەڵام تەنیا کارێکی کە توانیان بیکەن ئەمە بوو کە بۆ پاراستنی ئابڕووی خۆیان دوو حەوتوو ئیزن لە واشینگتۆن بخوازن. لە پازدەی ژووئیەدا دوایین کەرت لە هێزەکان کە بریتی بوون لە ٣١٧٠ کەس وێڕای ژێنێڕاڵ گارنێر, سەرکردەی هێز, لە سنوور پەڕینەوە و چوونە خاکی تورکیاوە. کوردان کە سەبارەت بە ڕاستی و دروستی ئەم کردەوەیە دڕدۆنگ بوون, ژێنێڕاڵ گارنێر دڵنیای کردنەوە: "گازم بکەن دەنگتان دەمگاتێ, هەر تەلەفۆنێك بکەن بەسە." بە بارێكدا ڕاستی دەکرد. فڕۆکە شەڕکەرەکانی ئەمریکا و بریتانیا و فەرانسە کە لە پێگەی تورکیادا بنەگر ببوون, بۆ پارێزگاری کردن لە کوردەکانی دەرەوەی ناوچەی پارێزراو, لە باکووری هێڵی ٣٦دا خولیان دەدا.

"هاوپەیمانان" کوردانیان وریا کردبۆوە کە ئەگەر بێتوو قەڵسە لە ئێراقییەکان بگێڕن و تووشی تەنگەژ بن, یارمەتییان نادەن. بەڵام پاشی چەند ڕۆژان پێشمەرگەی کورد دەستیان دایە چالاکی بە دژی هێزەکانی ورەدۆڕاوی ئێراق. لە مانگی ئۆکتۆبردا بڵێسەی شەڕ وڵاتی داگرت و کوردان بە سانی سلێمانی و هەولێریان گرتەوە, لە کاتێکا کە هەزاران سەربازی وەڕەز و بێمەیلی ئێراقی لە باتی شەڕ کردن چەکیان دانا و خۆیان بەدەستەوە دا. سەددام حوسێن لێی قەومابوو. بە تۆڵەی ئەم کردەیە مووچەی کارمەندانی کوردستانی ڕاگرت و ناردنی خورد و خۆراك و سووتەمەنی بۆ وێندەری تەواو کەم کردەوە و زیادە لە گەمارۆکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کە

تـەواوی ولاتـی دەگرتـەوە, حەسـارێکی تایبـەتی خـستە سـەر هـەرێمی کوردسـتان. واشینگتۆن لـە ترسی ئەوەی بەغدا لابردنـی هـەر گەمارۆیـەك لـەسـەر کـوردان بکاتـە بەڵگـە دژی حەسـاری ڕێکخـراوی نەتـەوەکان, داخـوازی پەیتاپـەیتای کـوردانی بـۆ شکاندنی گەمارۆ لـەسەر کەرەسە و ئامرازی پێویستی ئەو چەند کارخانەیەی بوویـان و ڕەنگبوو داهاتێك دابین بکەن و پووڵێك بـخەنە سەریەك, بردەوە پاش. لـە بەرامبـەردا ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیـمانانی ئێستا بە سەدان میلیۆن دۆلاریان لـە چوارچێوەی یارمەتیدا بەخت دەکرد هەتا بتـوانن کـوردان لـە مـردن ڕزگـار بکـەن. هەروەها ناچار بوون کە هاتوچۆی نەوتکێشەکانی تورکیـا کـە سـنووری گـەمارۆیان دەشکاند و سووتەمەنی دزێلیی ئێراقیان بە ناوچەی کوردنشیندا ڕادەگـوێزت, بــخەنە پشت گوێ. ئەم سووتەمەنییە بە نرخێکی زۆر هەرزان دەفرۆشـرا, بـەڵام هەرچـی بـێ پـووڵی زۆر پێویـستی بەغـدای دابـین دەکـرد کـە تـەواوێك بـۆی زەروور بـوو. ئـەم چەرخوخولـە بوو بە سەرچاوەی داهاتی گوومرگانەیـەکی گـرینگ بـۆ کـوردان و لـە ڕاستیدا چەشنی شادەماری ژیانەکی ناوچە وابوو و وێڕای ئەوە ڕوحێکی تازەی وە بەر ئابووری خۆجێیی تورکیا نایەوە, کە سەردەمایەکی گەشە و نەشەیەکی هەبوو و ئێستا بە هۆی پسانەوەی پردی هاتوچۆی ئەمبەرەوبەری سـنوور قـەتیس مـابوو. سـەرەڕای ئاڵۆزبڵۆزان, ڕەوتی پڕ پێچ و گەوە و تایبەتیی خۆرهەڵاتی نێوەڕاسـت ڕەوگـەی خـۆی دیبۆوە و وە سەرگەڕ کەوتبوو.

گـەورەهێزانی ناوچـەیی و ڕۆژاوایـی بـە ڕادەیـەك تـەماداری سـنووردار کردنـی هەڵسوکەوت و چالاکی کوردان بوون, کە هەڵتەزینـەوەیان لـە بەرامبـەر گـەمارۆی ئێراقدا بە باری نابارردا لێـك دەدایـەوە, سـەددام حوسـێنیش تووشـی وەهـا هەڵەیـەك هاتبوو. ئەم گەمارۆیە لـە جیاتی ئەوەی وورەی کوردان تێكشـــــکێنێ، وورەی بـــــەرز کردنەوە. تەنانـەت مەسـعوود بـارزانیش کـە هـەتا نێوەڕاسـتی نـوامبر بـە شـێوەیەکی سەرسەختانە درێژەی وتوویژی دا لـەگەڵ بەغدا, بەم ئاکامـە گەیـشت کـە گفتوگـۆ لـەتەك بەغدا ئـیتر بێفایدەیـە و بـۆ پێکهێنـانی پارلـەمانی هـەرێم داوای بەڕێوەچـوونی هەڵبژاردنی کرد لـە ناوچەی خودموختاری پێشوودا. بە دوای ئەوەدا لـە مـانگی مـەی,

لـە نێو ئەوپەڕی تووڕەیی و نارەزامەندی بەغدا و ئانکارا و دەمیشق و تاراندا, کـــــە هەموویان وێکڕا ڕق و ترسیان لـە هەر بیچم و ڕوخسارێکی نەتەوەخوازیی کورد بـوو, کوردەکانی ئێراق یەکەم هەڵبژاردنی ئازادی خۆیان بەڕێوە برد و پارلـەمانی خۆماڵییـان هەڵبژارد.

خوایىنەخوایی واشینگتۆن لاقی لـەو کێشە و هەرایەوە چوو, هــەر بۆیـە بـە ناچـار کەوتە سەر گرتنی هەڵوێستێکی نوێ کە لـە دەوڵـەتی کلینتۆندا دانی لانىکەم یارمەتی بە دژبەرانی ئێراقی بە مەبەستی بەر پەرچدانەوەی هێزەکانی ئێراقـی گرتـەوە. ڕێبـەرانی کورد و دژبەرانی ئێراق ئێستا "ماکەی خراپە" نەبوون. بەڵام ئەمە بەم مانایە نـەبوو کـە واشینگتۆن هەر لـەسەر ئەو هەوایە دەڕوا, ئەوەی لێرەدا دیار و بەرچاو بوو ئەمـە بـوو کە واشینگتۆن مادامێکی سـەددام حوسـێن لەسـەر دەسـەڵات بـێ, لـەگـەڵ لابردنـی گەمارۆکان دژایەتی دەکا. هەروەك یەکێك لـە کارگێڕانی سیاسەتی ئەمریکا پاش چـەند ساڵان گوتی, واشینگتۆن بە ڕەچاوکردنی سیاسەتێکی لاڕێ کە پێویستی بە هەڵسووڕان و بەڕێوە بردنی بەردەوام و خەرجوبـەرجێکی بـاڵا بـوو, ئـەویش نـەك بـە مەبەسـتی ڕێكوپێکی و تەکووزی کارەکان بەڵکوو بۆ شێواندن و تێكدانـی بـارودۆخی ئەوسـا, تێما بوو. کوردەکانی ئێراق لـەم دژاودژ کەوتنە پڕ خەرجەی ئەمریکا کـە ئـەوانی دەس بەتاڵ ڕاگرتبوو و ببوو بە کۆسپی سەرڕێی هەڵدان و خۆبژیو بوونی ئـابووری ناوچـە و ڕێی بۆ کۆچی توێژی خوێندەوار و مامناوەندی کوردستان خـۆش کردبـوو, نارەزامەنـد بوون و بە خراپە باسیان دەکرد. لـەگەڵ ئەمەشدا و وێـرای ئـەم گـشتە سـووکایەتی پێکران و هەمێت وىنەدان و دەستێوەردانە نەهێنییە, جا هەر بە شێوەی کاتیش بووبـێ, هەروا لـە مەیدانی شەترەنـجی جیهانىدا مانەوە.

یەکێك لـە ئەندامانی "دەفتەری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسـیا" بـە مەبەسـتی پاساو هێنانەوەی بۆ هەڵەکانی ساڵی ١٩٩١ دەستی لـەسەر هێندێك هۆکار دادەنا, کـە لـە چاردە سەعات کاری ڕۆژانەوە بە مەبەسـتی خـۆ سـازدان بـۆ شـەڕ و گەیـشتن بـە ئامانـجەکانىڕا بگرە هەتا ئەو پەیامانەی بە چەواشە لێكدرابوونـــەوە و بەتایبـــەت

نەبوونی توخمی وریا کردنەوە لە دەروونی دەزگای سیاسەتی دەرەوە یان ڕۆژنامەکان و خوێندەوارانی باڵای زانکۆیدا دەگرتەوە. ئەم کەسە وەك شی کردنەوەی مەبەستەکە دەیگوت: "لە شەڕی کۆرەوەکە بەم لاوە هەتا شەڕی کەنداو, بەتایبەت لەم بیست ساڵەی ئاخریدا, لە شەڕی ویێتنامەوە تا ئێرە, دەقی نێوەرۆکی زۆربەی نووسراوەکانی بلاڤۆکان و وتەی کارناسان ئەمە بووە کە "جەغزی خۆتان بناسن."

وێڕای ئەمە ڕووداوەکە تا ئێستا کارەساتێکی تەواو نەبوو. بە تێپەڕینی زەمان وتەکانی "شێتانە"ی تاڵەبانی ئیتر فیتوو لێدان نەبوو لە تاریکیدا بۆ ورە وە بەر خۆنان. ئاخرییەکی بارزانی و تاڵەبانی دەگژ یەك ڕاچوون و شەڕەکەیان گیانی هەزاران ئادەمیزادی کردە دەستەچیلە.[1] ئەم لێکدانە ڕقێکی ئەستووری لە نێو کوردان و دۆستانی غەوارەیاندا وەدی هێنا. سەرەڕای ئەمەش ئەو هەرێمەی ئێستا بە دەس کوردانەوە بوو لە باری بەرفرەوانیدا زیاتر بوو لە تەواوی ئەو ناوچانەی کە لە مێژووی تازەیاندا حوکمیان بەسەردا کردبوون. لە ژوەنی ١٩٩١دا یەکێك لە غەوارانی ئاشنا بە کاروباری ناوچە, کە پاش کۆبوونەوەی لەگەڵ ڕێبەرانی خۆجێیی, لە دهۆك لە پاشنیوەڕۆیەکا تووشی هاتم, لێم پرسی: "ئەرێ لە کشانەوەی هێزەکانی هاوپەیمان ناڕەحەت بوون؟ ئەگەر دیسان بقەومێ ڕوو دەکەنەوە چیا؟"

گوتی: "نا, بە هیچ شێوەیەك."

وتم: "پێم سەیرە!"

– "بڕوانە, ئەمانە لایان وا نەبوو کە پاش ئەو کارەساتە بمێنن. جۆرێکە هەر دەڵێی مردوون و چوونە بەهەشت."

---

١- دیپلۆماتێکی بریتانیایی لە گەرمەی گفتوگۆیەکدا, لە ١٢ی فێوریەی ١٩٩١دا ڕادەی کوژراوانی بە ٢٠٠٠ کەس قەبلاند. ژمارەیەکی جێ متمانەم لەم بارەوە بە دەستەوە نیە. لێبوردنی نێونەتەوەیی" کە لە مانگی ئۆکتۆبری ١٩٩٤دا لە کوردستانی ئێراق خەریکی کۆ کردنەوەی زانیاری بوو, ڕادەی کوژراوانی نیزامیی و غەیرە نیزامیی بە ١٦٠٠ تا ٢٠٠٠ کەس قەبلاند. وشیار زێباری لە پارتی دێموکراتی کوردستان ڕادەی کوژراوانی بە ٣٠٠٠ کەسێك دادەنا, کەچی سامی عەبدوڕڕەحمان هەر لەم حیزبە ڕێژەی کوژراوانی تا ٢٠٠٠ کەسێك بەراورد دەکرد, کە زۆربەیان پێشمەرگە بوون.

لەم سەدەیەدا, بۆ یەکەم جار لە درێژایی مێژووی ژیانی خەڵکی کوردا, هێزەکانی دەرەکی بۆ لایەنگری و پاراستنیان خۆیان لە کاروباری کوردستان هەڵقوتاندبوو.

# بەشی ٥

## ئەو سکە زێڕانەی بە کوتەناڵ دەرچوون

لە ساڵی **١٩٩٣**دا وێنەی پێنج شەش کەس لەو کوردانەی کە لە درێژەی خەباتی نەتەوایەتی ئەم سەدەیەدا شوێن و پلە و پایەیەکی بەرچاویان وە دەس هێنابوو, لە گۆڕەپانی گشتیی شاری سلێمانی, لەسەر دیوارێکی بەرزی بەرەوڕووی گۆڕەپانەکە خرابوونە بەر چاوان. ئەمانە ئەو شەهیدانە بوون کە لە گەرمەی گەریانی شۆڕشا گیانیان فیدای کوردستان کردبوو, یانی ئەو مێرانەی کە سەردەمانێك لە پێش پێشەوەی دیمەنگای سیاسی ناسیۆنالیزمی سیابەختی کوردا ڕاوەستا بوون. زۆربەی ئەم کەسانە لە مەیدانی خەباتا گیانیان بەخت کردبوو و تێکڕا قیمەتی شۆڕشیان لە ئێران و تورکیا و ئێراقا بە بەخشینی ڕووحیان پێشکێش کردبوو. ئەم ڕێز لێ‌گرتنە لاسا کردنەوەی کردەی سەددام حوسێن نەبووکە ئەم گشتە ساڵە لە شکڵ و شێوە و جلوبەرگی جۆراوجۆردا وێنەی خۆی لە دار و دیواری وڵاتی قایم کردبوو. وێنەکانی سەددام کە لە هەموو شوێنێك وە بەرچاو دەهاتن, بەرهەمی هونەرێکی توجارەتی و بە لێشاو بوون و تێکڕا زریقە و بریقەی تایبەتی ئەم ڕەوتەیان پێوە دیار بوو. بەڵام وێنەی ئەم کوردانە

کە پتر ساکار و کەمتر وێچووی خۆیان بــوو, بەشــێك لــەم نەریتــە کۆنــەی تــەبلیغاتی وێنەیی جیهانی سێهەم بوو کە مێژوو و پێشینەکەی دەگەڕایەوە بۆ بــەر لــە پەیــدابوونی وێنەی چوارڕەنگ و تەلەفیزیۆنی.

ساکاری ئەم ڕێز لێنانەی ڕابردوو, ڕاستەوڕاست ناکارامەیی لە بەستێنێکی ترا دێنایە بەرچاوان. بەڵام ئەوەی کە زۆر گرینگی دەنواند ئەمە بوو کە بۆ یەکەم جار بە درێژایی تەواوی ئەو مێژووەی کوردان وە بیریان دەهات دەیانتوانی بە ئازادی لە شوێنێکا تێفکرنە ڕێبەرانی نابەختیاریان و تماشایان بکەن و تێبگەن کە نەتەوەخوازیی کورد ئەم سنوورە دەسکردانەی بەزاندووە کە وڵاتانی ناوچە بە سەریدا سەپاندوون. کەسانی هەڵکەوتەی ئەم دەستەیە شوێنپەنجەی دەسەڵاتیان لە سنووری مەڵبەندی زێدیان تێپەڕاندووە و جاری وایە تەنانەت بە شێوەیەکی کاتی کەوتوونە بەر سەرنجی گەورەهێزانی جیهانیش, هەڵبەت دیارە ئەگەر پەی دابا پێیان خۆش بوو هەر شتێکی ڕەنگوبۆنی کوردی هەیە وە بەرچاوی نەگرن, کەچی ئێستا لە پیت و بەرەکەتی پشتیوانی بە کردەوەی ڕۆژاوا لە باکووری ئێراق ئەم وێنانە خرابوونە بەرچاوی تەواوی خەڵك.

لەم مەزنانەی ڕێزیان لێدەگیرا, ئەم کەسانە بەرچاو بوون: شێخ سەعیدی پیران, یەکێك لە پێشەوایانی دینی کە شۆڕشێکی کەم تەمەنی لە ١٩٢٥, لە تورکیا هەڵسووڕاند و بەم تاوانە لە سێدارە درا. قازی محەممەد, پێشەوایەکی مەزهەبی[1] دیکە کە محەممەد ڕەزاشا پەهلەوی بە تاوانی دامەزراندنی کۆماری کورد لە ١٩٤٧دا لە مەهاباد سێدارەی بۆ هەڵخست. هەروەها عەبدوڕڕەحمان قاسملوو کە لە ساڵی ١٩٨٩دا, لە ویەن بە دەس پیاوەکانی دەزگای پۆلیسی نهێنی کۆماری ئیسلامی ئێران کوژرا. وێنەی مەلامستەفا بارزانی تەواوی ئەوانەی لە بەرەو دەخستن، ئەو کەسەی کە ژیانی تێکەڵاوی ئاڵوگۆڕ و هەڵسوکەوتی نیوسەدە ناسیۆنالیزمی کورد ببوو. ئەم شوێنی شانازییەی پێیان تایبەت دابوو, شوێنێکی "شیاو" بوو, ئەگەرچی هەڵە و خەتاشی زۆر بوون.

---

١- پێشەوای شەهید دیارە لە حوجرە خوێندبووی و بەرگی مەلایەتی لەبەردابوو, بەڵام وەك کەسایەتێکی نەتەوەخواز و سیاسی هاتە مەیدان, نە ڕێبەرێکی ئایینی. وەرگێڕ.

لە نێو ئەم قارەمانە شەهیدانەدا, [تەنیا] وێنەی بارزانی لە هەموو شوێنێ وە بەرچاو دێ, لە کاولاشی خەڵکی ئاسایی کوردی تورکیا یان ئازەربایجانەوە بگرە هەتا دەفتەری کاری ڕۆژنامەنووسانی هەڵکەوتە لە واشینگتۆن. ژیانی دوور و درێژی بارزانی ماکە و هەوێنی گەلێ چیرۆك و ئەفسانە بوو: هەر شوێنێکی کوردی لێ با نەقڵ و نەزیلەی چالاکی و دەستەوەکەری بارزانی سەدان جار دەوێژرا و دەوێژرایەوە ... ئەم چیرۆك و بەسەرهاتانە هەوێنی شانازی و فیز و دەمارن و بە درێژایی دەیان ساڵ بیری نەتەوەخوازیی کوردیان نەمر ڕاگرتووە. ئەو خاوەنی ئەو توخمە سەرەکییە پێویستەی ڕێبەرایەتی بوو کە حوکمڕانی بەسەر هەرێمی هەست و سۆزا دەکرد و پیاوان و ژنانی وەها هاندەدا کە تەواوی کاروباریان جێ دەهێشت و سەرەڕای دەرد و کوێری تاقەتپرووکێن, دەکەوتنە شوێنی.

بارزانی لە پۆپەی هێز و دەسەڵاتی خۆیا, شەڕکەرانی نەخوێندەواری خێڵەکی و هەزاران دوکتۆر و ئەندازیار و فێرکار و پۆلیسیکە لە ژیانی بە ئێروو و ئاسوودەی باژێران بووردبوون و تاڵی و سوێری ژینی چیایان هەڵبژاردبوو, وێك‌خستن و کردنی بە هاوپشت. سەرەڕای تەواوی ئەمانەش هەمیشە ناچار بوو لەگەڵ عەشیرەتە ڕەکەبەرەکان و هێزەکانی سیاسی, واتە جاشەکان, کە بە مەبەستی لێك‌دەرکردنی ڕەقی کۆنە و نوێ, ببوونە بە کرێ‌گیراوی دەوڵەت و چەکیان هەڵگرتبوو, بە شەڕ بێ. ئەو بە نابارترین باری خۆیدا, پیاوێکی خیرەسەری کەم سەواد بوو کە پێی‌خۆش نەبوو دەسەڵاتی لەگەڵ خوێندەواران و پەروەردە بوانی کورد دابەش بکا. توانی خەباتکارانی کوردی ئێرانی بداتە دەس دوژمنیان و بە متمانە کردن بە غەواران جووڵانەوەی کورد بەرەورووی کارەسات کاتەوە. ئەم جیاوازی و دژاودژ کەوتنە, سووچە تیژەکانی کەسایەتی پیاوێك دەنوێنن کە لە ڕەوتی تێپەڕینا, لە نێوان دوو جیهاندا تێمابوو: جیهانی ئازاد لە چنگ تەکووزی تافی لاوی و جیهانی هێزەکانی خاپوورکەری وڵاتێکی تەواو چەق‌بەستووی پۆلیسی, یانی ئەم وڵاتەی کە ئەو وەك ڕێبەرێکی شیاو لەگەڵی تێکەوتبوو.

لە پێشدا بارزانی وەها کەتبووە ژێر کاریگەریتی بەند و داوی عەشیرەتی و دەرەبەگی کە لێیرا کۆت و زنجیر و جەغزی دەوڵەتی ناوەندی بنێتە لایەك و ئەمەش سەرقاڵیی زۆربەی چیانشینانی شوێنەکانی دیکەشە. ئەوەندەی کە ئەم رەوتە شوێنی تێکردبوو, قەت ئەوەندەی بروا بە پێویستیی کاروباری رێکخراوەیی نەبوو, چونکە هەم نیازی بە دان بەخۆ داگرتن و لەسەرەخۆیی هەیە و هەم بۆ سەرکەوتنی هەر جووڵانەوەیەکی رزگاریدەری نەتەوەیی تەواو پێویستە. بەڵام کاتێك بارودۆخ لەبار و بەکاو بوو, بارزانی ساف و ساکار "ئاغای کوردستان" بوو, یانی یەکەم سەرکردەی لەشکریی بوو کە تەنانەت هێندێکیش وەك سەلاحەددینی مەزن دەچوو کە وەختێکی بوو بە سەرۆك و جڵەوکێشی سپای ئیسلام, خاچپەرستانی تێكشکاند و ئەم وێچوونەی بارزانی وە وی لە هەر کوردێکی تر زیاتر بوو. کاتێك بارودۆخ هەڵگەرایەوە تەنانەت یەکێك لە کورەکانی خۆی – عوبەیدیللا – ئۆگریی بارزانی سەبارەت بە خودموختاری کە پێشتر وەك ئامانجی نەتەوەیی رایگەیاندبوو, بردە ژێر پرسیار. عوبەیدیللا دەیگوت بێتوو سەرکەوتن بە مانای بەخت کردنی هێز و دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی بێ و لە خۆیەوە دەس پێبکا, هیچ مەیل و تاسەیەکی بۆ ئەم خودموختارییە نیە. ئەو توێژەرە کورد و بێگانانەی کە بە گشتیی بارزانییان لەبەر چاو بووە "دژاودژی و نەحاوانەوەی دەروونیی" لە نەتەوەخوازیی کوردا دەبینن. یەکێك لە خاوەنرایان دەنووسێ: "خەبات و ململانیی نەتەوەیی خەڵکی کورد لە درێژەی سەدەی بیستەما, تەنیا ململانیی لە نێوان کوردان و دەسەڵاتدارانی غەیرە کوردا نەبوو, بەڵکوو هاوکات مل بە ملەیەك بوو لە نێوان مانای حکوومەتی عەشیرەتی و دەوڵەتی نوێدا: ململانیی نێوان هەرێمە سەربزێو و ناوچە هێورەکان و مل بە ملەی نێوان چیانشینان و خەڵکی نەرم و هێدی پێدەشتان بوو, کەڵەوە کێشی و ململانییەك کە جووڵانەوەی نەتەوەیی کوردی لێكدابریوە و لاوازی کردووە." نەتەوەخوازیی کورد هێشتاش, ئەگەرچی خاوەنی شێوە و بیچمی جۆراوجۆرە, بەڵام هەروا بە دووکەرتی ماوەتەوە.

مەلامستەفا کە لە ساڵی ١٩٠٤دا پێی نابوویە جەغزی ژیان, چرۆی ئیلهامی دەگەراوە سەر پلە و پایەی بنەماڵەکەی کە بە ناوی "ئاغا"ی خاوەن زەویوزار و شێخ

ناسرابوو, دیارە تێکەڵ بوونی ئەم دووە لە کوردستانی گوندەکیدا سەرەینچاوەی دەسەلات بوون. بارزانی سەردەمایەکی کە لە ١٩٧٩دا وەك دوورخراوەیەك لە ئەمریکا وەفاتی کرد تەواوی قوناخەکانی شۆڕشێکی نەتەوەیی هەتا قوولایی بڕیبوو و تواناییەکانی ئەوی بەتاقی کردبۆوە و هەتا بنەبان شوێنی لە دووگێڕا بوو؛ جوولانەوەیەکی کە هەولی دەدا لە بازنە و گەمارۆی دەولەتانێکدا کە قەت دەستیان بە خوێنڕێژی نەدەلەرزی, درێژە بە مانەوە بدا. لە ڕۆژگارێکیدا کە بارزانی وردە وردە خەریك بوو گەورە دەبوو, بارزانییەکانیان بە خێرەسەرترینی عێلەکانی کوردستان دەزانی. ئەم عێلە کە بریتی بوو لە ٧٥٠ خێزانی هەژار لە ناوچەیەکی سەخت و ڕەقەن و کەم داهات, لەسەری ئەو سەری باکووری ناوچەیەکی کە بوو بە ئێراقی ئەمڕۆ, پەڕاگەندە ببوون: ئەم خەلکە لەم بابەتەوە کە بۆ دەس و پەنجە نەرم کردن لەگەڵ دوژمنانی بەهێزتری خۆیان خۆفیان ڕێ نەدەنیشت بەناوبانگ بوون. لە سەردەمی حکوومەتی عوسمانیدا لەبەر ڕەوشتی ئازایانە و جێکردنەوە لە نێو تەریقەتی نەقشبەندیدا ئاوازەیان دەنگی دابۆوە.

ئەوان سەردەمان هێشتا دەوارنشینی لە برەودابوو و بارزان – ناوەندی ئەم خانەدانە – کە شارۆچکەیەك بوو لە بادینان, هەرێمێکی سەربزێو و سەرکێش بوو لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا و کەتبووە نیزیك کوێستانەکانی هەکاری کە هێلی سنووری نێوان ئێراقی ئێستا و تورکیایە. ئەم شوێنە بە شێوەیەك شاری ئاواتەخواستەی چاوناس بوو کە جووتیارانی خێلەکی و پەناخوازانی مەسیحی و مسولمانی بۆ لای خۆی رادەکێشا. عوسمانییەکان باوەگەورە و باوك و برای مەلامستەفایان لەبەر کەلەوەکێشی و ڕاپەڕین و پێمل نەبوونی لێکدالێکدا, لە سێدارە دا و مەلامستەفا بەوەی دەنازی کە هێشتا بەرمەمکانە بووە چۆتە بەندیخانە. لە حەقیقەتیشدا نۆ مانگانە بوو کە لەگەڵ دایکی و تەواوی ئەندامانی بنەماڵەی کەوتە زیندانی مووسڵ. بەم شێوەیە وەك برا چکۆلەیەك, لە کۆمەڵێکا کە دەسەلاتداریی مافی کوڕە گەورەی بنەماڵەیە, هیچ شتێك بارزانی بۆ پێشەوایەتی پەروەردە و ئامادە نەدەکرد.

مەلامستەفا – كە ناوی مەلایەتێكەی ناگەڕێتەوە جەغزی خوێندن بۆ مەلایەتی – پەروەردە كراوی دەستی "شێخ ئەحمەد"ی كاكۆیەتی. شێخ كە سێزدە ساڵ لەوی گەورەتر بوو تەواو كاری تێدەكرد و شوێنی لەسەر دادەنا. لە نێرینەی سەدەی نوزدەدا بەشداری كردنی باوەگەورەیان لە تەریقەتی نەقشبەندیدا بوو بە هۆی ناو و ئاوازەی عێلی بارزانی و پڕ بوونەوەی بۆ شایەیەك كە سەرینچاوەی دەچۆوە سەر تێكچوون و لێكهەڵوەشانی میرنشینە كوردەكان. شێخ ئەحمەد ڕێبەرێكی دینیی جێی ڕێز بوو, هەرچەند هێندەش لەسەر خەتی پێشەوایانی كۆن نەبوو و بە توندی لایەنگری پاراستنی ژینگە بوو. ڕاوی كەو و بزن و بەرانەكێوی قەدەخە كرد و ڕەنگە بە بوونی مەیلی سیلەچاوێك بۆ سەر بیر و بڕوای بەر لە ئیسلام، پاوانی لەسەر داربڕین دانا. دوژمنانی ئیددیعایان دەكرد كە نوێژی هەینی بە فەرمان و ناوی ئەو بەجێ دێنن و مریدەكانی لە جیاتی مەككە "بارزان"یان كردۆتە ڕووگە و خواردنی گۆشتی بەراز و خواردنەوەی شەرابی حەلاڵ كردووە و دڵداریی و ئاشقێنی بە ئاشكرایی دەخاتە پشتگوێ. ئەم چیرۆكە, چ ڕاست بێ و چ درۆ, بۆ ناوبانگی شێخ ئەحمەد بە لانی سەمەرە بوونیدا, زۆری باڵ لێناوە. مەلامستەفا زۆر دواتر كە ناو و ناوبانگی كەوتە پێش ئاوازەی تەواوی بنەماڵەكەی, بە بۆنەی ڕێز گرتن لە كاكی، هەمیشە لە هەوێڵیدا بە پاوە ڕادەوەستا و سوور بوو لەسەر ئەمە كە شێوی شێخ بەر لە هەموان دابندرێ.

بنەماڵەی شێخ خۆیان بە نیمچە پیرۆز دادەنا و زۆرێك لە كوردان لایان وابوو كە دەستێكی نەبەدی هەمیشە لە كاتی قەیرانیدا, بارزانییەكانی یاریدە دەدا. بارزانییەكان ڕەنگە لەبەر وەی كە زەویوزارێكی ئەوتۆیان نەبوو و ئەوەی بووشیان ڕێژەوی نەبوو, لە ڕاستیدا كۆمەڵێكی وا نەبوون كە لە ئاكامی شەڕا ئەشتەكی بەرچاویان تێدا بچێ. پەندێكی كوردی هەیە كە دەڵێ: "شەڕ چاكترە لە بێكاری". یەكی دیكەیان دەڵێ: "بەرخی نێر بۆ سەر بڕینە". بارزانییەكان بۆ پاراستنی ڕێكوپێكی لە هەنگامەی شەڕێدا, بە تەبی عالەم مەنشوور بوون. تێكەڵ بوون و تێكەلایەتی كارتێكردنی ماددی و مەعنەوی بۆ وەدیهێنانی داڕشتی فەرماندەرێتی گەلێكی یاریدە دان. زۆر جاران بە

دیدارکەرانی غەوارەیان دەگوت پەیڕەوی کردن و ملکەچـی خـەڵك بـۆ شـێخ بـە ڕادەیەکە ئەگەر بێتوو پێیان بڵێ خۆتان لە هەڵدێران هەڵدێرن بێ سێ و دوو دەیکەن.

مەلامستەفا پیاوێکی کورتەباڵای چاو و برۆ ڕەشی پەیوەست و خـەت و کـووزی ڕوخساری بەرچاوی دەنواند و زۆر بەهێز و گـوڕ بـوو. [بـارزانی] بـە چـاوی ڕەش و نیگای تیژی مرۆی دێنایە سەر ڕێزدانان. هێزی کەسایەتی و قورسـاغی وەهـا بـوو کـە کوردان بە قسەی خۆیان لـە دوورەوە هەسـتیان پێـدەکرد. یـەکێك لـە فەرمانـدەرانی هاوسەنگەری دەیگوت: "هەر کام لە ئەنـدامانی بنەماڵـەی بـارزانی خـۆی بـە میرێـك دەزانێ." هەر ئەم کابرایە کە هاتە سەر باسی تافی لاوی مەلامستەفا لە بارزان, گـوتی: "لەو کێوانە و لە ژێر ئەوان داربەڕواندا, مـرۆ دەتوانـێ سـەر بـەرێ بـۆ هـەموو خەیاڵاتێك. ئادەمیزاد بۆی هەیە تەواو لە ڕاستەقینە دوور کەوێتەوە. بەڵام خەیاڵاتی ئەو ڕووی ڕاستەقینەیان بە خۆوە بینی." ئەم ئاڵوگۆڕە زەمانی بە سەردا هـات. مەلامـستەفا جارێکی بە یەکێك لە نزیکانی گوتبوو کە لە تەمەنی بیست و شش ساڵیدا زانیویـەتی دەبێ دەوری ڕێبەرایەتی بگێڕێ, ئەم قسەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی یەکەم ڕاپـەڕینی گەورەی.

مەلامستەفا پتر بە پشتیوانی هێزی غـەریزەی خـاوەنی فـام و تێگەیـشتنێکی خێـرا و لەڕێوە بوو, نەك بە گوێرەی ئەزموون و لێکدانـەوەی ڕووداوەکـان و ئەمـەش ئاکـامی کـەم خوێنـدنی بـوو: شـەش سـاڵ پـەروەردەی تایبـەتی و چـوار سـاڵ خوێنـدن لـە مەکتەبـخانەی گوندێکی دوورەدەست. (سەیر ئەوەیە چـینی دەرەبـەگی کـورد – کـە بارزانی تێیدا گوورابوو – هەروەها خەنیمەکانی ئەم چینەش, یانی حکوومەت هـەرتك وێکڕا ماوەیەکی دوور و درێژ لە دڕدۆنگیدا سەبارەت بە پرسی فێر کردن و بارهێنان و شـوێنەوارە ڕزگاریـدەرەکانی کـە بـەرەوڕووی خـەڵکی چـینی خـوارەوە دەبـوون، هاودەنگ بوون.) بارزانی جگە لە زاراوەی کرمانـجی کە زمانی زگماکی بوو, بێ گرێ بە عەرەبی و فارسی و ڕووسی دەهاتە پەیڤین. ئەو وتەکانی خۆی بـە نـەقڵ و نەزیلـەی ئەخلاقیی, کە کەسایەتی و دەورگێڕانیان جانەوەران بوون، دەڕازاندەوە. لە سـاڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا بە گوێ گرتنی یەك‌پشوو لەو هەواڵانەی بە زمانی عـەرەبی لـە ڕادیـۆ

"ماك براون"ە ئەڵمانییەكەی بڵاو دەبۆوە لە ڕووداوەكانی جیهان ئاگادار دەبۆوە, ئەم ڕادیۆیە یەكێك لە كەلوپەل و ئامرازە گرینگ و پێویستەكانی بوو.

مەلامستەفا لە پێهەڵاگوتن و مەرایی كردن بێزار بوو و خێرا لە فێڵوفرتان حاڵی دەبوو. هەروەك زۆربەی ڕێبەرانی جیهانی سێهەمی هاوسەردەمی پێیخۆش نەبوو كەس لە بەرامبەریدا خۆ بنوێنێ؛ دێموكرات نەبوو. لە بازنەی دنیای ئەوا ڕێبەر لای سەرووی دیوەخانی دەگرت, یانی ئەگەر بكرێ وەها لەبزێك بۆ خدەوخووی ساكاری وی بەجێ بێ. خەنجەرێكی درێژ و نووك هەڵگەڕاوەی لەبەر پشتێنی دەچەقاند، ڕانكی فشەڵۆكەی دەكردە بەر, جگەرەی هەڵپێچراوی خۆماڵی بە مۆدنەی درێژی بەلاڵووك دەكێشا و كاتێك میوانی دەبوو چوارمێردەكی دادەنیشت و شووڵی دەتاشی. وەك ئێرانیان چای بە قەند دەخواردەوە. زۆر جاران بە كایەی "شەترەنج" وەڕەزی دەشكاند. بارودۆخ هەرچەندە تاڵ وتوونیش بوایە ئەو هەمیشە بۆ دیتنی غەواران و كوردان لە هەر تاقم و چینێك، لە پێشمەرگەی ساكارەوە بگرە هەتا فەرماندەرانی سپا, دەرفەتی هەبوو.

زۆر بێدەنگ و هەرا سەفەری دەكرد. ئەزموون پێی سەڵماندبوو كە هەموو شەوێك جێ بگۆڕێ و لەگەڵ حەرەسەكانی گونداوگوندان بكا, ئەوەش بە مەبەستی تێكشكاندنی چالاكی و پیلانی سیخوڕانێ بوو كە لای وابوو شوێنی لە دوو دەگێڕن. بەڵێ, ئیوهایە میراتی بنەگرتووی خەیانەت لە كۆمەڵی كوردەواریدا. بارگە و بنە و كەلوپەلی سەفەری ئەوەند ساكار بوون كە شوێنێكی بۆ نووسینەوە و تۆمار كردنی ڕووداوەكان نەدەهێشتەوە, بەڵام قەند و چاو برینجیان لەو كۆمەڵە ئەشكەوتانەدا تاقەت دەكرد كە خۆیان وەك پەسار و پەناگا لە بەرامبەر هێرشی ئاسمانییدا پەنایان بۆ دەبردن. ئەو بەشداری ژیانی ساكاری هاوسەنگەرانی دەبوو و لە دەرێ دەخەوت. تركان مەسەلێكیان هەیە كە دەڵێ: "كورد تەنیا ئەگەر لەگەڵ كافر پێكی بگری مسوڵمانە", ڕاستە مەلامستەفا هەر پێنجفەرزان نوێژی نەدەكرد, بەلام قەت نوێژی بەیان و خەوتنانی نەدەچوو. پیاوێكی ئازا بوو و لەم بابەتەوە كە لە كاتی بۆمبارانانەدا شلۆی نابێ بەناو و دەنگ بوو. تەمای شەڕ و دامەزران و كشانەوەی دەخستە ئەستۆی

سەرکردەکانی کە لـە خێڵی خۆی بوون و زۆر جاران دەربـارەی هاوڕێیـانی دەیگـوت: "بە خۆم و هەزاروپێنسەت کەس بارزانییەوە دەتوانـم ولات وە تـەنگ بێـنم." جـاری وابوو نەتەوەخوازانی تری کوردی بەم هەستە تاڵەوە جێدەهێشت، کە بـۆ وی بـارزانی بوون گرینگتـرە بوو لـە کورد بوون.

ئەو خاوەنی لان و لایەنی زەبروزەنگیش بوو, هـەروەك "مارگرێـت جـۆرج" کاتـێ لەبەرچاوان کەوت, پێی زانی. مارگرێت جۆرج ژنێکی کوردی مەسیحی بـوو, ژنێکـی جحێڵی بەدەنگ و نـاو. لــە سـاڵەکانی سـەرەتای دەیـەی ١٩٦٠دا کـە فەرمانـدەی مەفرەزەیەکی پیاوان بوو, لـە شەڕێکدا چاك درەوشایەوە و ناوبانگی دەرکـرد. تاقمێـك لـە تەبلیغاتکارانی کورد خێرا کردیانە "ژاندارك"ی کورد و پێشمەرگان وێنـەی ئـەویان وەك "نوشتوو" دەبردە مەتەرێزان. بەڵام سـەرکەوتن بادیهـەوای کـرد و داوای مـافی هەبوونی دەنگی لـە شووڕای باڵای سیاسیدا کرد. ڕەوتی ئەم داخـوازە بـوو بـە هـۆی وەرگەڕانی تەخت و بەختی, جگە لەو حیکایەتانەی کە سەبارەت بە دەستێکـــــــەڵ کردنی بێتامی لـەگەڵ عوبەیدیللا، کوڕە گەورەی بارزانی و زۆر کەسی تـر کـەوتبووە سەر زمانان. زۆر دواتر, کاتێ هەواڵنێرانی دەرەکی کە دەهاتنە کوردستان و خوازیاری وتوویژ و دیداری بوون, پێیاندەگوتن کە تووشی گولییەکی زۆر مەترسیدار هاتووە و گەڕاوەتەوە گوندی خۆی. بەڵام حەقیقەت ئەمەیە کە مەلامستەفا گەرچی زۆری هەوڵ دەدا گیانی هیچ پێشمەرگەیەك بە خۆڕایی نەخاتە مەترسی، فەرمانی کوشتنی دابوو.

ئەو زۆریش لـەسەر داب و نەریتی عەشیرەتی سـوور بـوو. ئەفـسەرێکی ئیـسرائیلی چۆنیەتی بەسەرهاتی پێشمەرگەیەکی دەگێڕایەوە کە گوێی بۆ ڕێوشـوێنی سـەرخوێن و بەرخوێن شل نەکردبوو و بۆخۆی بە کوشتنەوەی کابرا, کارەکەی یەکسەرە کردبـوو. گوتی: مەلامستەفا خودنووسی زێڕ و چەپکێك کاغەز و چاویلکەی قاپێلکـە تـەلای – لـە ڕاستیدا ئەوانە تـەواوی کەلوپـەلی دەفتـەری کارەکـەی بـوون – لــە ژێـر پـەتوو هێنانەدەر و فەرمانەکەی نووسی: تاوانبار دەردەس بکرێ, دادگایی بکـرێ, مـەحکووم بکرێ بە کوژرانەوە و بکوژرێتەوە و تەواوی ئەم کارانە بەر لـە کازیوەی بەیانی بگەنـە ئاکام. کاتێك کابرای ئەفسەری ئیـسرائیلی لێـی پرسـی باشـە بۆچـی زەحـــمەتی ئـەم

هەمووە كاغەزبازییە وەبەر خۆی دەنێ, بارزانی بە ڕاوێژێكی زیرەكانەی گاڵتەجاڕیانە گوتی: "باشە ئەگەر وا نەبێ ئەدی ئەركی دادپەروەری چی لێ دێ؟"

بیروردان بە تاڵی باسی ئەم ڕەوتە دەكەن كە بارزانی لە پلە و پایەی سەرۆك عێلێكڕا هەتا ڕێبەرایەتی گەلێك بریویێتی. ڕۆژگاری لە دایك بوونی بارزانی, ڕەنگە بیری نەتەوەخوازی بە حاڵ و دووبەلا یەك بووبێ و نەبووبێ و بە بڕوای زۆرێك لە مێژوونووسانی كورد, نەتەوەخوازیی "پێشكەوتوو" تەنیا لەگەڵ گەشە و هەڵدانی توێژی ڕووناكبیر و پەروەردە كراوی خەڵكی شارنشین پێكهات و خۆی نواند و كوردستان یەكێ لە ئاخرین هەرێمەكانی عوسمانی بوو كە لەم ڕەوتەدا هەنگاوی نا. "بابی عالی" لە جوولانەوە و بەرەوڕوو بوون لەگەڵ هۆزە كوردەكان و ئەوانەی لەگەڵ توركیا تێدەكەوتن و بەربەرەكانیان دەكرد تەواو خاوەن ئەزموون بوو: یان دەیكوشتن یان لە بەندیخانەی دەپەستاوتن یا قانی دەدانێ و دەیكڕین.

لە دەسپێكی سەدەی نۆزدەڕا كوردان گەلێجار تێكۆشابوون لە ئاست حكوومەتی ڕاستەوخۆی عوسمانیدا خۆڕابگرن و كوتولەتەكانی كوردستان وێكخەنەوە. هۆی سەرهەڵدانی ئەم ڕاپەڕینانە زیاتر خودی عوسمانییەكان بوون: عوسمانییەكان كە هەوڵیان دەدا بەر بە دارمانی ڕووەو هەشتاوی خۆیان بگرن كە پاش مرادمردوو بوونیان بۆ گرتنی "ویەن" لە ساڵی ١٦٨٣دا، بە ڕوودانی چەندین شۆڕش و ڕاپەڕین پەرەی دەگرت و ترسی پەلاماری ڕووسیاش لە گۆڕێدا بوو, دیسانەوە تێدەكۆشان دەسەلاتیان پتر بچەسپێنن و هەر بۆ ئەم مەبەستە ڕوویان كردە ڕەوتی پێمل كردنی میرنشین و هەرێمە زۆر و زوەندە خودموختارەكانی كوردستان.

ئامانجی پێداچوونەوە و چاكسازیی قانوونیی ساڵی ١٨٣٩، ناسراو بە "تەنزیمات"، كۆتایی هێنان بە سێ سەدە حكوومەتی چەندبنەكی بوو كە لە سەردەمی سەركەوتنی سوڵتان سەلیمی خوێنڕێژ بە سەر شاسمایلی سەفەوی دا, لە شەڕی "چاڵدران"ەوە (١٥١٤) بە میرات هاتبوو. لەم شەڕانەدا زۆربەی هۆزە كوردەكان چووبوونە یاریدەی سوڵتان. تەنیا لە ساڵی ١٦٣٩دا بوو كە عوسمانی و ئێران دانیان بەم سنوورانەدا هێنا كە كوردستانی باكووری دابەش دەكرد و هێڵێكی بەدی دێنا كە

ئەمڕۆکە سەرهەدی ناسراوی وڵاتانی تورکیا و ئێران و ئێراقە. دەوڵەتی عوسمانی لە چاکەی ڕاستەوخۆی کوردان شازدە میرنشینی پێکهێنا کە لە بەرامبەر دانی باج و خەراج و ناردنی شەڕکەر لە کاتی پێویستا و پاراستنی لانی کەمی تەکووز، خاوەنی ئازادییەکی تەواوی هەڵس وکەوت و جموجۆڵ بوون لە کردەوەدا.

لە درێژەی ئەم ڕەوتەدا کە چل ساڵی دەوام هێنا, زۆربەی کوردستان لەژێر تەوژمی چالاکی توند و تیژی سزا دان و لەشکر لێ کردنی پەیتاپەیتا کە بە مەبەستی خاشەبڕ کردنی ئەم میرنشینانە بوو وا سەرۆکە کوردەکان دەیانهەویست دەست و دەسەڵاتیان تێیانا هەتاهەتایی بێ، پێمل بوو. هەندێك جاران کوردەکانی عوسمانی و ئێران بە دژی حاکمانی ئیستامبووڵ و تاران ڕێكدەکەوتن، بەڵام زۆر وەختان لە شەڕی نێوان عوسمانی و ڕووساندا لانی عوسمانییان دەگرت, لە کاتێکا ئەوانی دی هەوڵیان دەدا بێ لایەن بمێننەوە. هەلی وابوو خێڵە مەسیحییەکان دەچوونە ڕیزی شۆڕش و ڕای وابوو وەفادار دەمانەوە. عوسمانییەکان هەمیشە دەیانتوانی تاقمێك لە کوردان بە دژی ئەو سەرهەڵداوانەی بە دووی وەرگرتنی یارمەتی لە ڕووسیا یان بریتانیاوە بوون – کە جاری واش بوو یارمەتی دەدران – بۆ لای خۆیان ڕاکێشن. مرخی فێڵەبازی و دەمچەورانە دانی عوسمانییەکان ئەوەندە تیژ بوو، تەنانەت ئەو جارانەی کە کوردان لە بەرەکانی شەڕا سەردەکەوتن هەر لەوڕێوە هەڵدەخەڵەتان و تووشی ئاکامی دوورخرانەوە و زیندان و کوژران دەهاتن.

ئەوەندەی کوردان سافیلکە بوون, چەند هێندە ڕکەبەرانیان زیرەك و لە بنەوەبڕ بوون. لە ساڵی **١٨٨٥**دا ئەمیرنیزام, یەکێك لە سەرکردەکانی ئێرانی, هەمزاغای [مەنگوڕ]، سەرۆکی هۆزی [مەنگوڕان] بە فێڵ و تەڵەکە بانگ دێڵێتە خێوەتی خۆی و دڵنیای دەکاتەوە "مادامێکی لەسەر ئەم خاکە بێ, زەرەدی بێ ناگا." بەڵام هەر کە هەمزاغا پێی دە خێوەتێ نایەوە کابرای ئێرانی دەستووری دا بە چەکدارانی ماتە هەڵگرتووی, تەقە لە میوان بکەن و بەم شێوەیە کوشتیان. ئەمیر نیزام ئیددیعای دەکرد کە پێی لە بەڵێنی خۆی نەناوە. چونکە لە پێشدا دەستووری دابوو تەرکی خێرەتەکەیان کۆڵیبوو و مافوورەیان لێ ڕاخستبوو، بە شێوەیەك ئەو دەمەی [هەمزاغا]

پێی ناوەتە خێوەتەکە دەسرێژی لـێ کراوە و لـە ڕاستیدا [هەمزاغا] ئیتر خۆ لـەسەر ئەو خاکە نەبووە. کوردانیش دەیانتوانی وەها زاڵـم و غەددار بن: سـمایل ئاغای سـمکۆ کە لـە سێ دەیەی دەسپێکی سەدەی ئێستادا یەکێك لـە سەرۆکانی عێلی شکاك بـوو, خـۆ بەدەستەوەدانی تاقمێك لـە یارانی پێـشووی خـۆی قبـووڵ کـرد و بـەڵێنی پـێدان کـە نایانکوژی و ئازادیان دەکا. ئەو کات پیاوەکانی جومگەی دەستی برادەرانیان ورد کرد و لـــە ڕێـسەی ملیــان دان و ئازادیـان کــردن - لــە حاڵێکـا بـێ ئیختیــار ســەریان بەسەر شانیانەوە تەکەتەکیبوو.

نیـشانەگەلـێ لــە "نەتـەوەخوازی"یـەکی بـەرەو ڕسـکان, جاروبـارە وە بەرچـاو دەکەوت. شێخ عوبەیدیللا شەمزینان دوو ساڵ بەر لـەو شۆڕشەی کـە لــە ١٨٨٠دا, لـە نیزیك کەوشەنی ئێران و عوسـمانی بە دژی دەوڵەتی ئێـران هەڵێگـیرساند و لـــە پێشدا بەرەورووی چەند سەرکەوتنێکیش بۆوە, لــە نامەیـەکا بـۆ جێگـری قونـسوولی نیشتەجێی بریتانیا لـە وێندەرێی نووسی: "گەلی کورد, گەلێکی جیاوازە. مەزەب و یاسـا و ڕیسا و داب و نەریتی لـەگەڵ ئەوان جودایە." لـە درێژەدا زیادی دەکرد: "سەرۆك و میرانی کوردستان, چ جەماوەری عوسـمانی بن و چ ئێـران یـان خـەڵکی کوردسـتان, هەموو یەكدڵ و یەکگرتوو هاودەنگن لـەسەر وەی کە لـەگـەڵ ئـەم دوو حکوومەتـەدا هیچ کارێکیان بەم شێوەیە بۆ جێبەجێ نابێ."

شۆڕشی شێخ عوبەیدیللا بە هاودەستی سپای ئێران و عوسـمانی تێكشـــکا. ئەمـــە وێنەی سەرەتایی ئۆگریی و تامەزرۆیی بنەگرتووی هێزەکانی ناوچەیە بـۆ هاوکـاری لــە بەستێنی سەرکوتی تەواوی ئەم جوولانەوانەی مۆرکی نەتەوەخوازیی کوردیـان پێوەیـە, ئەم نەتەوەخوازیەی وەك هەرەشەیەك لـەسەر کوتولـەت بوونی وڵاتیان خـۆ دەنوێنـێ. لـە سەدەی ئێستادا وەها هەڵوێستێك نەیتوانی بەر بە تلاسـابوون لــەم ڕێـسایە بگـرێ: گەلــێ جاران وڵاتانی ناوچە بۆ شوێن دانان لـەسەر سیاسەتەکانی دراوسێیان قامکیان لـە کوردان بزاوتووە و بۆ شۆڕش دژی وڵاتـەکانیان دنـەیان داون. دەوڵـەتانی ناوچـە لــە کاروباری دەستێـوەردانی ورد و باریـك لــەم ڕەوتــەدا – لــە چاوپۆشـی کــردن لــە سنووڕپەڕاندنڕا بگـرە هـەتا یارمـەتی بـە کـردەوەی ئـابووری و نیزامیـی – چـالاك و

لێوەشاوەن. کوردەکانی وڵاتێکی تایبەتیش فێر بوون کە هاوکات تەنیا پاڵ وە لایەك بدەن. ئاکامیش ئەمە بوو کە زۆر جاران کوردان نیازیان بە پشتیوانی یان بێلایەنی وڵاتێکی ناوچە بوو.

لەگەڵ بەرێوەچوونی پێداچوونەوە و چاکسازی قانوونیی (تەنزیمات) هاوکێشی کۆنباو تێكچوون و لەگەڵ هۆز و عێلی شەڕخواز جێگۆڕکەیان کرد کە ئەستێرەی بەخت و دەوڵەتەکانیان جاری وابوو لە حەویقی ئاسمان بوو و کەرەتی واش بوو لە بە قوڕدا دەچوو. تەکووز و رێكوپێکی دەستیان لێك بەردا و لە شارە گەورەکاندا نەبێ دیزە بە دەرخۆنە کران. ئەم ئاڵۆزبڵۆزییە لە سایەی هەبوونی تەریقەتی نەقشبەندی و قادری تۆزکاڵێك ئەهوەن دەبوونەوە, چونکە ئەم دوو تەریقەتە ئەم هۆز و عەشیرەتانەی وا لە کۆنەوە پێکەوە دوژمن و لێك ترازابوون, وێكدەخستەوە. بەڵام بە تێکڕایی کۆمەڵی کوردەواری بەرەو تێیاچوون هەنگاوی دەنا. ڕێبەرانیان یان دوور خرابوونەوە یا خۆیان "هەڵبژاردە"ی حکوومەتی ئیستامبووڵ بوون. ناسیۆنالیزمی تازە ڕسکاوی کورد هاوشانی ناسیۆنالیزمی تاقمەکانی تری "هاوفکری" عوسمانی لە عەرەبستان و باڵکان گەشەی کرد, کە پاشان لە لایەن "ترکانی لاو" کە لە ١٩٠٨دا هاتنە سەردەسەڵات, سەرکوت کرا.

ئەم ڕووخان و شێوانە لە وەختێکی خراپدا ڕووی دا: شەڕی یەکەمی جیهانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و ئۆتریش و مەجارستان و ڕووسیای ڕاماڵی و گەلێکی هیوا و هومێد خستە نێو دڵی گەلانی زوڵم لێکراوی هەرێمەکانی عوسمانی. کوردان کە لە کوشتاری ساڵی ١٩١٥ی دراوسێ ئەرمەنەکانیاندا بەشدارییان کردبوو, حکوومەتی عوسمانی خوێنێکی قورسی خستە ئەستۆیان و ئەوانی چەشنی ئەرمەنییەکان, لە ترسی ئەوەی نەکا پاڵ وە ڕووسان بدەن, لە ناوچەی باکووری ڕۆژهەڵاتیی وڵاتەوەڕا کۆچ پێدا و لە ماوەی ئەم چلووبڕ پێکردنەی زستانی ١٩١٦-١٧دا بە دەیان هەزار کەس لەبەر بێ پەساری مردن و کەسیرە بوون.

بەمجۆرە کوردان, بۆ دەرفەت هێنان لەم هەلەی بۆ سەربەخۆیی ڕەخسا بوو, ساز و ئامادە نەبوون. بەندی دوازدەی, چواردە بەندی "ڤودرۆ ویلسۆن" سەرکۆماری

ئەمریكا, بە ئاشكرا و ڕاستەوخۆ كەمینە غەیرە تركەكانی عوسمانی دڵنیا دەكردەوە كە لەمە بە دوا دەتوانن "بێ ئەوەی كەس ڕێیان لێ بگرێ ببنە خاوەنی خودموختاری و سەربەستی و تەواو بگەشێنەوە." بەڵام بریتانیا و فەرانسە و ڕووسیای خونكاری, هاوپەیمانانی پەیمانی سایكس – پیكۆ كە لە ساڵی ١٩١٦دا ئیمزا كرا, پێكهاتبوون كە ئیمپراتۆری عوسمانی لە نێو خۆیانا دابەش كەن.

لەم قوناخەدا كۆمەڵانی هەمەچەشنی خەڵكی كورد لایەنگری سەربەخۆیی تەواو بوون, كەچی هەر لەم كاتەشا تاقمێكی تر لە عەنەدۆڵ لایەنگری مانەوە لە جەغزی عوسمانیدا بوون؛ بەڵێ, هێزی كێشندەی مەزهەب و تێكەڵاوی كۆنەباو لەگەڵ خەلافەت تا ئەم ڕادەیە بوو. شێخ و ئاغاكانیش كە دەسەڵاتداری هەرێم بوون, لەوەی دەترسان كە ڕووناكبیرانی شارەكی كە بیری ئاڵوگۆڕیان لە سەردا بوو و لایەنگری سەربەخۆیی بوون, هێندێكیان هێز و دەسەڵات پێهەڵوێزنن. لۆرد كورزۆن, سەرۆكی لێژنەی نوێنەرایەتی بریتانیا لە كۆنفرانسی ئاشتی پاریسا, تێمابوو و نەیدەزانی كە "كوردان چیان دەوێ", ئەو گوتی: "پاش لێكۆڵینەوەیەكی كە لە قوستەنتەنیە و بەغدا و شوێنەكانی تر كردوومە, نەمتوانیوە كەسێ بدۆزمەوە كە نوێنەری خەڵكی كورد بێ ... وا دیارە هیچ كوردێك جگە لە خۆی و عێلەكەی نوێنەری كەسێكی تر نیە."

لەگەڵ ئەم گشتە وتوویژانەی كە لە نێوان هاوپەیمانانەدا, بە مەبەستی دابەش كردنی عوسمانی بەڕێوە دەچوو بۆ كوردان "دیاردەیەكی" ڕوون و ئاشكرا بوو، (یەكێتی سۆڤیەت لە ١٩١٧دا لە خواستەكانی سەردەمی خونكاری پاشگەز بۆوە.) بۆ یەكەم جار بە شێوەی ڕەسمی مافە سیاسییەكانی خەڵكی كورد دانی پێداهات. ئەم مافانە لە بەڵگەنامەیەكدا سەلمێندرا كە لە شارۆچكەی سێڤر، هەڵكەوتوو لە مەڵبەندی پاریس, كە لەبەر چینیی جوان و ناسكی چاوناسە, مۆر كرا بەڵام دواتر دەركەوت كە ئەم بەڵگەنامەیەش بۆ ناسكییان چی وای لە چینیی و بلووریاتی سێڤر كەمتر نیە. ئەم پەیمانە كە لە ١٠ی ئووتی ١٩٢٠دا بەسترا, پاش سێ ساڵان ئیتر "بەڵگەیەكی مردوو" بوو. بەڵام خەڵكی كورد چەند وەچەیە كە وەك بەڵگە لەسەر سەلماندنی مافی خۆیان لە یاسا نێودەوڵەتییەكاندا و هەروەها چەشنی سەنەدی

خەیانەتی گەورەهێزان, قامك لەسەر بەندی ٦٢و٦٣و٦٤ی ئەم پەیمان‌نامەیە دادەنێن و بە شاهیدی دەگرن.

بەندی ٦٢ کۆمیسیۆنێك ڕادەسپێرێ کە بۆ دامەزراندنی خودموختاری کوردان لە ژێر چاوەدێری کۆمەڵی نەتەوەکان دەس بەکار بێ؛ بەڵام ئەم ناوچە خودموختارە، مەڵبەندە شاخاوییەکانی کوردستانی نەدەگرتەوە کە ئەمڕۆ دەکەونە خوارووی تورکیا, لە ڕۆژهەڵاتی چۆمی فورات. بەشێکی زۆری کوردستانیش هەر لە ڕۆژاوای ئەم چۆمە نەدەکەوتنە ناوچەی خودموختار. فەڕانسە و بریتانیا پێیان‌خۆش نەبوو دەس لە سەرپەرستیی و کەیخودایەتی ئەو ناوچانە هەڵگرن کە دواتر بوونە بەشێك لە وڵاتانی تازەسازی سووریا و ئێراق. قەرار وابوو کوردستانی باکووری کە سەربەستی بەر دەکەوت, لەگەڵ وڵاتێکی ئەرمەنی سنووریان لێك بگەڕێتەوە. سەرەڕای ئەم وتە بەتام و خوێیانەی کە ویلسۆن لەمەڕ ئۆگریی خۆی سەبارەت بە سەربەخۆیی گەلان دەریدەبڕی, لە ڕاستیدا ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەر بیری قبووڵ کردنی سەرپەرستێتی ئەم دوو وڵاتەی کورد و ئەرمەنی – لە ڕۆژهەڵاتی تورکیای ئێستادا – کایەی دەکرد. بەڵام ئەم گەڵاڵانە بە گوێرەی دەنگی مەجلیسی پیرانی ئەمریکا, کە بەشدار بوونی ئەمریکای لە کۆمەڵی نەتەوەکاندا بەربەست کرد، تێك‌چوون.

بە گوێرەی بەندی ٦٣ی پەیمانی سێڤر، حکوومەتی عوسمانی دەبوو دان بە دەسکەوتی لێکۆڵینەوەکانی کۆمیسیۆندا بێنێ. بەندی ٦٤ شاکاری "تەفرەدانی" سیاسی بوو ؛ بە گوێرەی ئەم بەندە: ئەگەر دوای تێپەڕینی ساڵێك بەسەر بەرێوەچوونی ڕێوشوێنی پەیمانی سێڤردا کوردان سووری کەنەوە کە "زۆربەی خەڵکی ئەم ناوچانە خوازیاری جوێ بوونەوەن لە تورکیا (عوسمانی) و هەروەها ئەگەر شووڕای کۆمەڵی نەتەوەکان ئەو کات زانی کە ئەو خەڵکە شایانی سەربەخۆبوونن, تورکیا هەر لە ئێستاوە ڕازییە کە ئەم ڕاسپاردەیە قبووڵ بکا و لە تەواوی ماف و دەسەڵاتی خۆی لەم ناوچانەدا دەس هەڵگرێ." هەر بە گوێرەی ئەم بەندە: "هەر کات ئەو کوردانەی کە کەوتوونە ئەو بەشەی کوردستان کە هەر ئێستا کەوتۆتە سەر پارێزگای مووسڵ, ئەگەر

بخوازن ببنە خەڵکی وڵاتی تازەسازی کورد, دەسەڵاتدارانی هاوپەیمان ئیرادیان لێناگرن." ئەم "ئەگەر"انە هەموو مانایان وابوو کە کوردستان سەربەخۆ نابێ.

لوانی سەربەخۆیی "کوردستانێکی بەهرەدار" — یانی پارێزگای پڕ لە نەوتی مووسڵ، لەگەڵ چاڵە نەوتەکانی نزیکی کەرکووك — بەسترابۆوە بە بوونی وڵاتێکی کوردی کە لە داهاتوودا لە تورکیا دادەمەزرا. مانای ئەم ڕەوتە تەواو ڕوون بوو: ئینگلیسییەکان کە پارێزگای مووسڵیان چوار ڕۆژ پاش برانەوەی گێرە و کێشەکان لە ئۆکتۆبری ١٩١٨دا داگیر کردبوو، تەمایان وابوو کە بە کردەوە ئەم پارێزگایە و کانگا دەس لێنەدراوەکانی بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان. (لە ڕاستیدا تەواوی ئەم پارێزگایە درابوو بە فەڕانسە, بەڵام پاریس لە بەرامبەر وەرگرتنی سەتی ٥/٢٣ی نەوتی کەرکووكدا لەم بەشە خۆش بوو.) تێك‌کرانەوە و ڕاوێژی بەندی ٦٤ بە کردەوە ئەم مەبەستەی دەستەبەر دەکرد کە شووڕای کۆمەڵی نەتەوەکان لە بریتانیای دەوێ کە سەرپەرستایەتی مووسڵ و نەوتەکەی وە ئەستۆ بگرێ.

پاش چەند ساڵان بریتانیا وای بە بەرژەوەند بینی کە شەریکە نەوتییەکانی هولەندی و فەڕانسەوی و ئەمریکاییش بکاتە شەریك. بەڵگەنامەیەکی "سیا" کە لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران کەوتە دەستی خوێندکارانی شۆڕشگێڕ و بڵاوکراوە, بە ڕاوێژێکی ڕوون هاوار دەکا: "دۆزرانەوەی نەوت لە ١٩٢٧دا لە نزیك کەرکووك و بەشدار بوونی شەریکە نەوتییەکانی ئەمریکایی و ئورووپایی لە بەهرە و بەرهەمیدا بوو بە هۆی لا لێنەکردنەوە و هەمێت وێنەدانی وڵاتانی ڕۆژاوایی وە جووڵانەوەی سەربەستیخوازانەی کوردان." ئەم مەڵبەندە پڕ لە نەوتانەی کەرکووك و تەواوی ئەم کانگایانەی لە ناوچەکانی ترا کوردان بە هەق بە هی خۆیانی دەزانن, لە نێوەڕاستەکانی دەیەی ١٩٧٠دا, لە سەتا ٧٥ی نەوتی ئێراقیان بەرهەم دێنا.

پەیمانی سێڤر قەت "ئۆباڵ"ی بۆ نەکێشرا و ئاکامەکەی بۆ لای کوردان خوار بۆوە, یانی ئەوان تەنیا جەماوەری عوسمانی بوون کە نەك نەیانتوانی وڵاتێکی سەربەست پێك‌بێنن, بەڵکوو لە نێوان ئێراق و سووریا و تورکیاشا دابەش کران و تاکوو ئەمڕۆش هەروا ماونەوە. مستەفا کەمال ئاتاترك چارەنووسی کوردانی گۆڕی و

ئاوەژووی کردەوە. ئاتاترك لـە پێشدا فریوی دان هەتا یارمەتی بدەن و پاشان خۆشـیانی قڵپەوە کرد. ئەو لـە سەرەتاوە بۆ ڕزگار بـوون لـە شـەڕ و گـەڕی دوژمنـانی – یـانی هێزەکانی داگیرکەری فەڕانسە و یۆنان لـە ڕۆژاوا و هێزەکانی ئەرمـەنی لـە بـاکووری ڕۆژهەڵات – ئەوانی وەك "برابەش" وەخۆی خستن و هـەر ئـەوەی کـە لـە ١٩٢٢دا ئامانـجەکانی وەدی هاتن, ئەوجار بایداوە سەر هاوپشتانی کورد و ئـاوات و ئامانـــجی نەتەوەیی "براکانی". بریتانیا و فەڕانسە وەها لـە شـەڕ وەڕەز بـوون کـە هـیچ مـەیلیان لـەوەی نەبوو بۆ خاتری کوردان بکەونە شەڕی مستەفا کەمال و پووڵ و گیـانی کـەس بەخت کەن؛ هەر بەم هێندە دڵخۆش بوون کە هەرێمە عەرەبنشینەکانی عوسـمانی بۆ خۆیان پاش قول دەن و لـە بەرامبەر هەڕەشە و دەسـدرێژی نـەکاوی سـۆڤیەتا, تورکیـا بپارێزن.

کەنداڵ نەزان, مێژوونووسی کورد, دەڵێ: "پەیـمانی سێڤر بۆ ترکان سووکایەتی و بۆ خەڵکی کورد زۆر ناعادڵانە بوو." پەیـمانی لۆزان کە لـە ٢٤ی ژووئیەی ١٩٢٣دا بەسترا, وڵاتی تازەی تورکیای لـەسەر حیسبی کوردان, کە بە گوتەی کەنـداڵ ئـەوانی "خستە قۆناخێکی نۆیی کۆیلایەتی"، بە ڕوســمی ناسی.

لـە پەیـمانی لۆزاندا هەر لـە تەرکێن باسی کورد و مافی نەتەوایەتییان نەهاتە گـۆڕ, گەرچـــی هەنـــدێك بـــەڵێنی دایـــە کەمینـــە غەیرەمـــسوڵمانەکانی وەك جوولـەکـــە و مەسیحییەکانی ئۆرتۆدۆکس. چەند مانگێك دواتر ئاتاترك بە قازانـجی کۆمار کۆتایی بە تەمەنی عوسـمانی هێنا. بۆ ساڵی دوایی خەلافەتی هەڵوەشاندەوە کە دەستوپێوەنـــدی سوڵتانی لـەباری دینی و سیاسییەوە وێكخست. هەروەك دیتمان زمان و جل و بەرگ و قوتابـــخانە و ئەنـــجومەن و بڵاڤۆکـانی کـوردی و تەریقەتـەکانی بەربەسـت کـرد و تەنانەت "بیری کورد بوونی"شی ڕامالی. لـەو دەمەیڕا کوردان بوونە "ترکانی کێـوی". ئەم دروشـمە کەمالیستییە بە خەتی زۆر درشت لـەسـەر تـەپك و دیـواران نووسـران: "خۆزگە بۆ بەختەوەریی ئەو کەسەی کە دەتوانێ خۆی بە ترك بزانێ."

ئەوتەکانەی لـە ئاکامی ئەم بارودۆخەدا کوردانی ڕاتڵەکاند, لـەسەریەك تەقینـەوەی لـە دوو بوو. لـە سەرەتای ساڵی ١٩٢٥دا شێخ سەعیدی پیران بە ناوی نەتـەوەخوازیی

كورد و بە دژی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت شۆڕشێكی كەم تەمەنی لە كوردستانی توركیادا هەڵگیرساند, كە لەوپەڕی خۆیدا سێیەكی ناوچەی گرتەوە, بەڵام حوكماتی ئانكارا بە سانی تێكیشكاند.

كۆماری تازە دامەزراوی توركیا هەر لەڕێوە ئەو مەبەستەی پێشینیانی عوسمانی لە درێژەی سەدان ساڵ شۆڕش و ڕاپەڕینا حارز نەبوون پێی لێبنێن, دانی پێدا هێنا: كوردان خوازیاری وڵاتێكی سەربەخۆ بوون. دادوەری نیزامیی دیاربەكر لە دادگای تایبەتی سەربەخۆییدا, كە زۆر بە توند و تیژی چاوناس بوو, بەرەوڕووی شێخ سەعید و چل پەنجا كەس لە هاوڕێیانی گوتی: "ئێوە هەمووتان لە بابەتێكەوە هاوبەشن و ئەویش دامەزراندنی كوردستانێكی سەربەستە كە بیری بزاوتوون و وا بە سێدارە باربەهاكەی دەدەن" و دایان. بەر لە هەڵوەشانەوەی "دادگاكانی سەربەخۆیی" بۆ دوو ساڵ دواتر, ٧٤٤٠ كورد گیران و ٦٦٠ كەسیان لە سێدارە دران؛ سەدان گوندی كوردان ئاوری تێبەردرا و نیزیكەی چل هەزار تا دووسەتوپەنجا هەزار جووتێر لە گەڕیانی چالاكی هێور كردنەوەی پاش شۆڕشدا پلیشانەوە و تێداچوون. لە ماوەی دوازدە ساڵی دواتردا نزیكەی میلیۆنێك ژن و پیاو و زارۆكی كورد لە شوێنی خۆیان هەڵقەندران و بۆ عەنەدۆڵی ڕۆژاوا دوور خرانەوە. لە مەودای پازدە ساڵی دواتردا شازدە شۆڕشی دیكە لە چیاكانی توركیا ڕوویان دا و هەمووشیان بە توندی سەركوت كران. هەر تەنیا كوردان نەبوونە قوربانیی شۆڕشی شێخ سەعید. ئاتاترك ئەم هەلەی قۆزتەوە و بۆ كووژاندنەوەی گڕی ئەم ناڕەزامەندییەی لە ڕیزی خودی تركان و بلاڤۆكاندا خەریك بوو خۆش دەبوو, كەڵكی وەرگرت و ئەمە شتێك بوو كە پازدە ساڵ دواتریش هاتەوە گۆڕ.

بریتانیا و توركیا لەسەر نەوتی مووسڵ دە گژ یەك ڕاچوون, هەر كام لەم دوانە بێ ئەوەی گوێ بدەنە خواستی ئاشكرای كوردان, واتە سەربەخۆیی, خۆیان بە پاڵپشت و دەمڕاستی وێندەرێ دەزانی. لە ١٩٢١دا ئینگلیسییەكان هەڵبژاردنێكیان بە مەبەستی دانانی ئەمیر فەیسەڵ بۆ پاشایەتی ئێراق بەڕێوە برد. ئەمیر فەیسەڵ لە شۆڕشی عەرەباندا هەڤاڵی لۆرێنسی عەرەبستان و بۆ ماوەیەكی كورتیش پاشای سووریا بوو,

کە فەڕانسەوییەکان لـە ١٩٢٠دا لـێیان خست. بەڵام هەڵچوونی کوردان دژی تێکـەڵ بوون لـەگەڵ وڵاتی عەرەبیی ئێراق بە ڕادەیەك توند و تیژ بوو, کە کوردەکانی ناوچەی سلێمانی هەڵبژاردنیان وەلا نا, کوردەکانی ناوچـەی کـەرکووك تـەما گرتنیـان خـستە ماوەیەکی تر و تەنیا مووسڵ و هەولێر لـە هەڵبژاردنی فەیسەڵدا بەشدار بوون.

بە باری ڕامیاریدا, بریتانیاش هەروەك عوسـمانییەکانی بـەر لــە خـۆی, کەمینـەی سوننی مەزەبی پێ لـە زۆرینەی شیعە مەزەب چـاکتر بـوو کـە لــە سـەتا ٥٥ی ڕێـژەی نفووسی وڵاتیان پێك دێنا؛ کوردانیش لـە سەتا ٢٣ی ڕێـژەی جـەماوەری وڵات بـوون. وێڕای هەمووی ئەمانەش, لـە نێو تەواوی جەماوەری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا, کوردەکـانی ئێراقــی – بــە ڕێــژەی نفووســی بەرچــاو و خوووخــدەی شــەڕکەرانە و بــارودۆخی جوغرافیایی خۆیانەوە – شانس و بەختیان لـە هەموان زیاتر بوو. یەکێك لـە ڕاپۆرتەکانی دەزگای زانیاری بریتانیا لـە ١٩٤٥دا یارمەتی ڕوون بوونەوەی ئـەم مەبەسـت و مانایـە دەکا کە "بۆچی کوردەکانی ئێراق پاش تێپەڕ بوونی گەلــێ ساڵان قەت لـە حوکمات و ئەربابەکانیان ڕازی نەبوون و نیشانەیەك وەبـەر چـاو نایـە کـە ئـەم خـدە نەتەوایەتییـە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ. کەمن ئەم وڵاتانەی لـە باشترین هەلومەرجا لــە بـواری پرسـی تەناهیدا, گرێ و کۆسپیان بە قەت ئێراق بێ. ئێراق تەنگـەژەی قـەومی و عەشـیرەتی هەیە. پاراستنی تەناهی بەم گشتە کەندوکۆسپە سیاسییەوە نە تەنیا بۆ ئێراق, بەڵکوو بۆ وڵاتێکی پێشکەوتووش جێبەجێ نابێ."

ئینگلیسییەکان فێرە زەبروزەنگ ببوون, بەڵام وێڕای ئەمەش جاری وابوو هەسـتیان بە گوناهـ و تاوان دەکرد, کە کوردیان دابوویە پاڵ وڵاتێکـی دەسـکرد وا خۆیـان بـە ناوی ئێراقی ژێربالّی کۆمەڵی نەتەوەکان دایانــمەزراندبوو. هــەر کــە تووشــی تەنگــەژە دەهاتن دەکەوتنە ئەم بیرە کە ملکەچـی خواسـتی کـوردان بـن: لایەکـەم لــە بابــەت دەکارهێنانی زمانی کوردی لـە دەزگاکانی حکوومەتیدا, یانی ئەم کارەی کە حوکماتی نەدەخستە مەترسی. لـە ڕاستیش چارەیەکی تریان نەبوو جگە لـەمە, چونکە دەیانویـست کە بە بێ خەرجوبەرجێکی زۆر وڵات بەڕێوە بەرن و لـە جیاتی هێزەکانی ئەردەکی کـە ڕاگرتنیان پێویستی بە خەرجێکی فرەیە پتر لـە هێزی ئاســـمانیی کـەلك وەربگـرن. لــە

سەرەتای كاردا چەند بۆمبێك كە بە مەبەستی ئامانـجی گشتیی دەخرانەخوار بۆ چاندنی تۆوی ترس و تۆقین لـە نێو كورداندا و كۆتایی هێنان بە شۆڕش بەس بوو.

لـە ١٩٢٢دا بریتانیا كە بەرەورووی پێداگری توركیا ببۆوە لـەسەر مووسڵ و دانانی پێگەیەكی تركان لـە ڕەواندز, هەڵكەوتوو لـە باكووری ڕۆژاوای ئێـراق, بـە مەبەسـتی چەسپاندنی قسەی خۆی كە دەیگوت كوردان هیچ وازیان لـە حكوومەتی تركـان نیـە, شێخ مەحـموودی بەرزەنـجی لــە تاراوگــەڕا هێنایــەوە. ســێ ســاڵ پێــشتر هــەر ئــەم ئینگلیسییانە ئەوەیان كردبوو بە "حوكمدار"ی سلێمانی, بەڵام پاشان دەسـتیان بـۆ ئـەم كارە شكاندبۆوە و پەشـیمان ببوونـەوە, چـونكە شـێخ لــە ئـاوریلی ١٩١٩دا ئـاڵای كوردستانی – كە مانگێكی سوور بوو لـەسـەر تـەختی شـین – هەڵـدا و سـەربەخۆیی ڕاگەیاند. تیپەكانی سپا كە بۆ سـەركوتی شـێخ نێردرابـوون تـەفروتونا ببـوون و تـەنیا بۆمبهاوێژانی هێزی ئاسـمانیی پاشایەتی توانیان بە چـۆكی دابێـنن؛ شـێخ مـەرگی بـۆ برایەوە, بـەڵام ئینگلیـسییەكان حوكمەكـەیان شـكاندەوە و بـۆ هیندووسـتانیان دوور خستەوە. ئێستا ئەویان گێڕابوویەوە سلێمانی و ئەویش هەر لـەڕێوە سەری لـێ بـادان و خۆی بە مەلیك مەحـموودی یەكەم, پاشای كوردستان, ناودێر كـرد. دەوڵــەتێكی بـە هەشــت وەزیــرەوە پێكهێنــا, تــەمری پۆســتی چــاپ كــرد، خــەرج و پیتــاكی دانــا و حەوتەنامەیەكی بە ناوی "ڕۆژی كوردستان" بڵاو كردەوە كە لـەسەر "مافی گەلی مەزنی كورد بۆ ژیان و وڵاتێكی سەربەخۆ" دەڕۆیی.

دەوڵـەتانی بریتانیا و ئێراق لـە بەیاننامەیەكدا، لــــە ڕێكــــەوتی ٢٢ی دێــــسامبری ١٩٢٢دا بە ناوی كۆمەڵی نەتەوەكان دەیانگوت كە: "بە مافی كـوردانی چوارچـێوەی ئێراقــی دەزانــن كــە دەوڵــەتێك لــە وێنــدەرێ دامــەزرێنن و هیــوادارن كــە لایەنــە جۆراوجۆرەكانی كورد هەرچی زووترە لـە نێوخۆیاندا لـەسەر سنووری ئەم وڵاتـەی بـە ئاواتی دەخوازن, پێكبێن و نوێنەرانی خۆیان بـە مەبەسـتی تـاوتوێ كردنـی پەیوەندییـە سیاسی و ئابوورییەكان لـەتەك دەوڵـەتانی بریتانیا و ئێراق, بنێرنە بەغدا." ئەم بەیاننامەیـە قەیرانەكەی ڕۆمركاند. لـە بەهاری ساڵی ١٩٢٣دا تركـان لــە ڕەوانـدز ڕەپـاڵ نـران, بــەڵام پاشــان ئینگلیــسییەكان شــێخ مەحــــموود و ڕێبــەرانی كــوردی مووســڵ و

کەرکووکیان پێکوەرکرد کە بە گوێرەی ڕابردوو چ بڕ دڵیان بە ڕابەرایەتی وی خۆش نەبوو. کاتێك شێخ مەحموود بۆ چوونە بەغدا بە گوێی دەوڵەتی نەکرد, ئینگلیسی لەشکری پیادەیان نارده سەری و ڕایەکی تر هێزی ئاسمانیی پاشایەتی, هێزەکانی بۆردومان کرد. شێخ مەحموود لە ڕۆژی سێی مارسی ١٩٢٣دا پەنای بردە کوردستانی ئێران, بەڵام ماوەیەك دواتر گەڕاوە ئێراق, کەچی بە پشتیوانی بۆردومانی نێوە نێوە و دامەزرانی پێگەیەکی دەوڵەتی ئێراق لە وێندەرێ, دەستی وە سلێمانی ڕانەگەیشت.

بەڵام لەو کاتەدا کە ئاتاترك سەرقاڵی وتوویژێك بوو کە پەیمانی لۆزانی لێکەوتەوە و بوونی هەر چەشنە مافێکی بۆ کوردانی تورکیا پاش دەوەن کرد، ئەم بەندەشی بردەوە پاش کە لە پەیمانی سێڤردا ئیزنی بریتانیای دەدا وەك دەوڵەتێکی سەرپەرست بۆ تێکەڵ بوونەوەی کوردەکانی پارێزگای مووسڵ لەگەڵ ئەم وڵاتە کوردەی لە تورکیادا ساز دەکرێ, دەستی ئاوەڵا بێ. بەم کارەی تورکیا, ئێستا کە شێخ مەحموودیش لەسەر ڕێ وەلا برابوو, بەیاننامەی دەوڵەت و ئەم بەڵێنە دوور و درێژانەی لە بابەت "خودموختاری خۆ جێیی"دا دەیدا بە کوردان, بە سانی و لەوپەڕی بیر ئاسوودەیی ئینگلیسییەکاندا فەرامۆش کرا. کۆمیسێری بالای بریتانیا لە ئێراق گوتی: "بە سەرنجدان بە جەغزی تەنگەبەری بلاو کرانەوەی ئەم بەیاننامەیە, لام وا نیە تازە باسی بکرێتەوە." لای وابوو ئەگەر ڕۆژێك کوردان کەوتنە پێوشوێنی و قامکیان لەسەر دانا, دەبێ پێیان‌بگوترێ کە ئیدی ئەم مەبەستە "چۆتەوە پاش".

کۆمەڵی نەتەوەکان لە ١٦ی دێسامبری ١٩٢٣دا لەم بارەوە هیچ تەمایەکی نەگرت. لەم ڕێکەوتەدا بوو کە بریتانیای بۆ ماوەی ٢٥ ساڵان کردە سەرپەرستی ئێراق. پارێزگای مووسڵ ڕێوڕاست خرایە سەر حکوومەتی بەغدا. حەوت مانگ دواتر ئاتاترك بە گرێدانی پەیمانێك لەگەڵ بریتانیا بە وەرگرتنی لە سەتا دەی بەش لە شەریکەی نەوتی ئێراق (کە ناوی نوێ کردبۆوە) و دانی بەڵێنی بریتانیا بۆ خۆ پاراستن لە دنەدانی کوردان و ئەرمەنییەکان, چاوپۆشی لە سکالاکانی تورکیا کرد.

ئەو لیژنەیەی لە لایەن كۆمەڵی نەتەوەكانەوە بە مەبەستی لێكۆڵینەوە لەسەر كێشەی مووسڵ ڕاسپێرابوو, بە پێی ئەوەی كە كوردان لانیكەم پێنج هەشت و بە حیسێب كردنی كوردەكانی یەزیدی و جەماوەری توركمانان كە لەگەڵیان هاودڵ و دەنگن و هیچ هەستی لایەنگری و خۆشەویستییان سەبارەت بە وڵاتی ئێراق نیە, سەرجەم دەبنە حەوت هەشتی وێندەرێ, بە لای سەربەخۆیی كورداندا قـــــــــەیان كردبوو. وێڕای ئەمانەش "شووڕای كۆمەڵی نەتەوەكان" بەڵگە هێنانەوەی بریتانیای سەلماند كە دەیگوت ئەم پارێزگایە بۆ خاتری هاوسەنگی باری ئابووری پێویستە بخرێتە سەر ئێراق. لە وێدا تەنیا بەم هێندە وازیان هێنا كە لە قوتابخاناندا بە زمانی كوردی بخوێندرێ و كوردی زمانی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی وێندەرێ بێ. خۆ ئەم بەڵێنەش بە ناسەرسەنگی درا, بۆ وێنە خوێندنی زمانی كوردی تەنیا قوتابخانەكانی سەرەتایی سلێمانی و چەند بەشێكی پارێزگای هەولێری گرتەوە. لە گەڕیانی ئەم پەیمانشكێنییانەدا تەنیا خاڵی ڕووناك، وریایی دانێكە كە سەرەكوەزیـــری ئێـــراق، عەبدوولمحسین سەعدوون, لە وتەیەكدا، كـــە ســـاڵی ١٩٢٦ پـــێش دەس لـــە كاركێشانەوەی بە زاریدا هات: "ئێمە دەبێ لە چارەنووسی توركیا پەند وەربگرین ... ئیمە دەبێ مافی كوردان بدەین." كەس لای لەم نسحەتە نەكردەوە و بریتانیا كە بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی پتر بە چەند كۆنە فرۆكە و هێندێك زرێپۆش و تاقمێك هێزی خۆجێیی پشتئەستوور بوو, زۆر جاران ئەم مەبەستەی وە بیر بەغدا هێنایەوە. بەڵام ئەم دەوڵەتانە قەت پەندیان لەم ڕاپەڕینە پەراگەندانە وەرنەگرت كە لە درێژەی چەند ساڵاندا لە وڵاتا هەڵگیرسابوون. لە ئاخروئۆخری هەمان دەیەدا بەرپرسانی ئینگلیسی بە گلەیی بوون كە "ئێراق هێشتاش هەر زاراوەیەكی جوغرافیاییە."

لە ژوەنی ١٩٣٠دا، بە گوێرەی پەیمانێكی كە لە پورتسموسدا ئیمزا كرا بریتانیا لەناكاو كۆتایی بە سەرپەرستێتی خۆی هێنا و سەربەخۆیی ڕواڵەتیدا بە ئێراق كـە لـە ماوەی دوو ساڵاندا جێبەجێ بكرێ. لەم پەیمانەشدا هەروەك پەیـمانی لـۆزان لـە تەركێن باسی كورد و مافەكانی نەكرا. دەوڵەتانی بریتانیا و ئێراق پێداپێدا سكاڵاكارانی كوردیان لە كۆڵ خۆیان دەكردەوە. لە ڕاپۆرتێكی ئینگلسییاندا هاتبوو: "كـوردان بـە

گشتیی لەم یەكبوونــە سیاســیيە بــە دوورن کــە بــۆ دانــانی حکوومــەتێکی ســەربەخۆ پێویستە." لە درێژەدا زیادی دەکرد: "دەبێ بەم سـکالاکارانە بگـوترێ کـە شـتێك بـە ناوی دامەزراندنی ولاتێکی کورد و دابڕاو لە ئێراق کە بکەوێتە بەر سەرنج و پشتیوانی کۆمەڵی نەتەوەکان, ناتوانێ لە گۆڕا بێ."

شێخ مەحـموود بۆ جاری سێهەم لە ١٩١٨وە بەرەو ئێرە شۆڕشی هەڵگیرساندەوە. ئەو لە نامەیەکا کە ڕووی قسەی لە کۆمەڵی نەتەوەکان بوو دەیگوت: "کۆتایی هـاتنی سەرپەرستێتی ئینگلستان بە گوێرەی مەنتیق, دەبێ بـە واتـای ئـازادی کـوردانی ولات بێ." هەروەها داوای دەکرد کە: "تەواوی پەیوەندییەکان لـەگـەڵ بەغـدا بپـسێنەوە ... ئێمە بۆمان قبووڵ ناکرێ مافی سەربەخۆیی کە لە گـەلانی کێویلکـەی ئـەفریقایی وەك لیبێریا درێخ نەکراوە, لە ئێمە درێـخ بکـرێ ... ئەگـەر دەوڵــەتی عـەرەبی ئێـراق بـە پشتئەستووری فڕۆکە و چەکدارانی دەوڵەتی ئینگلیس نەبوایە کە کۆمەڵی نەتەوەکان سەرپەرستیی ئەم هەرێمانەی پێسپاردبوو هەتا بە ناوی ئەوەوە بەڕێوەیان بەرێ, دووپات کرانەوەی مێژوو و پەلاماردانی بەغدا و گرتنی تەنیا کاری چەند ڕۆژان بوو."

هەروەك شێخ مەحـموود بە دروستی پێشبینــی کردبـــوو, فڕۆکـــەکانی هێـــزی ئاســمانیی پاشایەتی وەك ڕابردوو بە مەبەستی تێكشکاندنی شۆڕش, هێزەکانی ئێراقیـان یاریدە دا, بەڵام بەر لـەوی مانگرتنێك لـە سلێمانی ڕووی دا و بوو بە سەرمەشقێك بـۆ داهاتوو. لەم مانگرتنەدا تەواوی چین و توێژەکانی خەڵکی، لە کرێکـار و بازرگانـەوە بگرە هەتا خەڵکی ئاسایی بەشدار بوون و بۆ یەکەم جار هەستی نەتەوەخوازانەی خۆیان نواند. لـەگەڵ ئەمەشدا کاتێك ئەم شۆڕشە شەش مانگەیە لـە ئاوریلی ١٩٣١دا کۆتایی پێهات, شۆڕشێکی تر هەڵگیرسا, بەڵام ئەمـجار لـە بادینانی ســەرکێش و چاونەترسـا. لێرەش کـوردان ســەبارەت بــە وەرگیرانــی ئێـراق لــە لایــەن کۆمــەڵی نەتەوەکانــەوە نارەزامەنــدییان دەربــڕی. گەلـــێ دادخــوازی و ســکالای خۆجــێیی بەرچــاوتر و ڕوونتریــشیان هــەبوو. دژی پــیلان و گەلاڵــەی دەوڵــەت بــوون کــە دەیویــست مەسیحییەکانی نەستووری کە لـە ناوچەی هەکاری لای سنووری تورکیـا ڕادرابـوون و وەك چریکی چەکدار خزمەتی ئینگلیسییەکانیان کردبوو و گەلـێ جـاران چـووبوونە

شەڕی کوردان, لەم ناوچەیەدا نیشتەجێ بکرێن. ئەم خەڵکە بوونی بنکەی ژاندرمە و هەنتەشی کاربەدەستانی کۆ کردنەوەی خەرج و پیتاکیشی بە لاوە خۆش نەبوو.

لە بەهاری ۱۹۳۲دا ئەم ڕاپەڕینە بە یارمەتی هێزی ئاسمانیی پاشایەتی تێکشکا. بەڵام ئەم ڕاپەڕینە پەیدابوونی شێخ ئەحمەدی بارزانی و مەلامستەفای برای بۆ سەرشانۆی سیاسەت ڕاگەیاند, کە کەوتبوونە شوێن ڕێبازی ئەم بارزانییانەی دژی حکوومەتی ناوەندیی عوسمانی ڕاپەڕیبوون. هەرتك برا هەڵاتن بۆ تورکیا, لە وێندەرێ دەردەست کران و درانەوە بە کاربەدەستانی ئێراقی. جارێکی تر حکوومەتانی ناوچە وایان بە سەلاح زانی کە لە بەستێنی کاروباری پەیوەندیدار بە کوردستانەوە هاوکاری یەکتر بکەن. دوو برالە کەوتنە بەر سزادانی دیاری کراو: دوور خرانەوە بۆ ناوچە عەرەبنشینەکانی باشوور. ماوەیەك دواتر بۆ سلێمانی ڕاگوێزران و لەوێ لە ماڵەکانی خۆیانا کەوتنە ژێر چاوەدێری. لە سلێمانی – ناوەندی ڕۆشنبیری کوردستانی ئێراق – بوو کە وردە وردە گۆڕانی مەلامستەفا لە ئەشقیایەکی چیانشینڕا بۆ بوون بە ڕێبەری ڕزگاریدەری خەڵکی کورد, دەستی پێکرد. لە ماوەیەكدا کە مەلامستەفا لە سلێمانی بوو هەر بە دوو سێ ساڵان جارێك تەكولۆ سەرهەڵدانی جۆراوجۆر لە کوردستانی ئێراق ڕوویان دەدا و سەرکوت دەکران.

ئەو نەتەوەخوازانەی لە سلێمانی دەیانناسی دەیانگوت کە ڕەوتی ئاڵوگۆڕی مەلامستەفا شل و دژوار چۆتە پێش. ئەمانە بەرەی چەپی شارەکی بوون – کوردان لە حیزبەکانی کۆمۆنیست و پارتەکانی نەتەوەیی و ڕێکخراوەکانی سیاسی نەهێنیدا, کەسانێکی هەڵکەوتە و لێوەشاوە بوون. لە سەرەتاوە ئەویان زۆر خۆپارێز هاتە بەرچاوان. بەڵام هەمیشە ڕێزی بۆ "زانست" دادەنا و بەرە بەرە سەبارەت بە بیروڕای سیاسی و جیهانبینی و نەتەوەپەروەرییان مەیلی نواند. بەڵام ئەم تێکەڵایەتییە هەمیشە بە ڕەوتێکی دژواردا ملی ناوە. کاتێك باس دەهاتە سەر پرسی سیاسی بە کردەوە ئەم پیاوە خودبەسەرە ناپەروەردەیە لە نێو ئەم خوێندەوارە شارستانییانەدا کە لە قوتابخانە و زانکۆکانی ئێراقی ژێربالدا پەروەردە کرابوون، هەستی بە نارەحەتی دەکرد. ئەمانە زۆر توند دژی ئینگلستان بوون و دژایەتی خۆیان بە ئاشکرا دەردەبڕێ. یەكێك لە

کارناسان دەڵێ: "هەر ئەمەی کە ئەم بارزانییە چیانشین و دەرەبەگ ڕەوشـــانە ببوونـــە پێشرەوی ناسیۆنالیزمی چەپخوازی کـورد, خـۆی یـەکێك لــە گاڵتـەکانی ڕۆژگـارە, چونکە نەتەوەخوازانی شارستانی ڕەقیان لـە ژیانی عەشیرەتی بوو و خوازیاری هەڵتەکان و دارمانی دارشتی دەرەبەگی بوون." بەڵام ئەم کوردانەی شارەکی دەیاندی کە خۆیـان چەکداریان نیە و تەنیا بارزانییەکانی و ئەم هۆز و عێلانەی توانیویانـە کاریـان تێبکـەن دەتـوانن هێزێــك کــۆ کەنــەوە کــە ئــاوات و خــەیاڵی پێکهێنــانی کوردســتانێکی خودموختار – ئیتر با لـە کوردسـتانی سـەربەخۆ گـەڕێین – وەدی بێـنن. جووڵانـەوەی ڕزگاریـخوازی نەتەوەیی کورد لـە ئێراق زۆر جاران بە هۆی دەگژ یەك ڕاچوونی چـین و توێژەکانی پێکهێنەرىدا لاواز بـووە. سـەیر ئەمەیـە کـە دەسـەڵات و خۆشەویـستی مەلامستەفا قەت بە ڕادەی ئەم کاتانەی لـەگەڵ دەوڵەت تێكهەڵـــــچووە, گــــــوڵی نەکردووە. لـەم وەختانەدا هەزاران کوردی خوێنـدەواری پـەروەردە کـراو لــە ترسـی سەرکوت و بە مەبەسـتی ڕاکـردن لــە دەس سـەربازی, لــە شـوێنە دوورەکـانی وەك بەغداوە بەرەو چیا دەڕەوین و دەچوونە ڕیزی خەباتی نەتەوەیی.

مەلامستەفا دوای دە سـاڵ دوورخرانـەوە و دەس بەسـەر بـوون ئاخرییەکـەی لــە ١٩٤٣دا بە دەرفەت هێنان لـە چاو خافڵ کردنی ئینگلیسییەکان لـە سـەردەمی شـەڕی دووهەمی جیهانىدا, ڕایکرد. بـە گـوێرەی دەنگۆیـەك مەلامـستەفا لــە بۆیـە بـەرەو چیاکانی زێد و ناوچەی خۆی تێیتەقاند، چونکە ئەو معاشەی دەوڵەت بـۆی بڕیـۆوە, لـەبەر پێهەڵاچوونی نرخی کەلوپەل ، پێی بەڕێ نەدەچوو. دەڵێن ئـەو تـەنیا وەختایـەك بەم بارودۆخە نالـەبارەی بنەماڵـەکەی زانی کە دەستی بە سەر و پرچی ژنەکەی داهێنا و تـماشای کرد لـە جیاتی ئەو سکە زێڕانەی بۆ ڕۆژی تەنگانە تێیا دەشاردەوە, کوتـەناڵی وێخستووە: خێزانی ناچار ببوو زێڕەکان خورد کاتەوە. ئەو کە لـەم ڕووداوە وە تـەنگ هاتبوو ڕای کرد, لـە پێشا چووە خاکی ئێران، پاشان سەرلـەنوێ گەڕایەوە ئێراق و ملی ڕێی "بارزان"ی گرت. هەر کە گەیشتەوە بارزان هاوبەندییەکی لـەم عێلانـەی بـاکوور, یانی دوڵـەمەری, شیروانی، مزووری و barووشی پێکهێنا کە تێکرا بە بارزانی دەناسـران شۆڕشی هەڵگیرساند. لـە پێش‌دا ڕووی کـردە هۆزەکـانی ڕکەبـەر و بـە کـرێگیراوی

حکوومەت کە چەند ساڵ پێشتر لە پشتەوەڕا خەنجەریان لێدابوو و تۆڵەی لێئەستاندنەوە. هەروەها ئەم هێزە تەواو مەشق پێنەکراوانەی کە دەوڵەت بە مەبەستی سەر پێدانەواندنی ناردبوونی سەری بێشۆڕ کردن و هەڵبڕهەڵبڕی وێخستن.

کاربەدەستانی تووڕەی ئینگلیسی هەر دوا بە دوای ئەم ڕووداوەدا, دەستیان کرد بە گلە و گازندان لە چنگ ئەم سەرۆك عێلە سەربزێو و فێڵەباز و نەحاواوەیە. ئەم باڵادەستانە زۆر جاران بە ناوی تالآنچی و دیکتاتۆر و ویشکەسوێ دەکەوتنە تاریفاتی. ڕاپۆرتێکی دەزگای پاراستن دەڵێ: "وای دەنوێنێ کە نوێنەر و ناسێنەری ناسیۆنالیزمی کوردە. بەڵام لە ڕاستیدا دەیەوێ بۆ تالآن و بڕۆ بە شێوەی ڕابردوو بەری ئاوەڵە بێ." "سێرکینان کورنوالیس"، کۆمیسێری باڵای بریتانیا لە بەغدا, قەڵس بوو و دەیگوت ئەمە کۆسپێکە کە خودی دەوڵەتی بەغدا بۆخۆی ساز کردووە: "هیچ کام لە بەڵێنەکانی جێبەجێ نەکرد و لەو سکاڵایانەی نەپرسییەوە کە هەقیان بە دەس بوو و یەربەیەرکردنی هەر هەموویانی خستە دوا. ئەو گوتی: "بە چۆك داهێنانی مەلامستەفا، ماقووڵتری دەکا و شەهیدێکی لێ ساز دەکا!" چونکە هێزێك یا فڕۆکەیەك بە دەستەوە نەبوو, سەرەك‌وەزیری ئێراق نووری سەعید کە خۆی کوردێکی لەبنەوەبڕ و فێڵەباز بوو کە لە بارگای سپای عوسمانیا پەروەردە کرابوو، لێبڕا پێك‌بێ. مەلامستەفا و تەواوی سەربزێوانی کورد لە ئاوریلی ١٩٤٥دا وەبەر لێخۆش بوون کەوتن. مەلامستەفا ئەم کردەیەی بردەوە سەر بێدەسەڵاتی حکوومەت.

یەکێك لە ڕەخنەگرانی ئەمریکایی کە بێلایەنانەتر لەم بارەدا دەدوێ لەگەڵ گومانی ئینگلیسییەکان سەبارەت بە نەتەوەخواز بوونی مەلامستەفادا هاودەنگ نیە. ئەو دەڵێ: "گەرچی مەلامستەفا پەیکەرەی ئازایەتی و چاونەترسی و هێز و تابشت بوو, لە هەمان کاتا کردەوەی وای لە خۆی دەنواند کە چیوا بۆ تاریف نەدەشیان: خۆ بە زل زانی، هەلپەرستی, بیر تەسکی و سەربزێوی." کەم بوون ئەو کوردانەی وەها هەستێکیان هەبوو. بە پێچەوانە, مەلامستەفا ئەوانی وە قلە دێنا. موحسین دزەیی کە تەواوی سەردەمی هەڵدانی بۆ خزمەتی بارزانی تەرخان کردووە, باسی وە قلە هاتنێکی سەیر دەکا, ئەو دەمەی کە لە ساڵی ١٩٤٣دا خۆی قوتابی بووە و بیستوویەتی کە

بارزانی لە سلێمانی دەربـاز بـووە. ئـەو دەڵـێ: "هەسـتی نەتەوایـەتی زۆر تونـد بـوو, تەنانەت لە نێو ئێمەی قوتابیدا." نزیك ساڵێك دواتر, لە نێوان کۆزیلـەی دە دەوازدە کەس حەرەسی خۆیا کە لـە چەکاندا ڕەش هەڵگەرابوون و برنووی چێکۆسـلۆواکییان کردبووە شان و جامانەی سووری تایبەتی بارزانییان لـەسەر نـابوو, پێـی نایـە هـەولێر. دزەیی دەڵێ: "ئێمە هەمووومان بۆ دیتنی لە قوتابـخانە دەرپـەڕین, مرۆیـەکی چوارشـانە نەبوو, بەڵام لـەبەر چاوی ئێمە لـەو جلوبەرگـە کوردییـەدا کێوێـك بـوو." وەچـەیەك دواتر یەکێك لە هاوڕێیانی داهاتووی دێتەوە یادی: بۆ هەوەڵ جار کە مەلامستەفام بینی بەهار بوو، بارزانی بە سـواری ئەسـپێکی شـێ, لـە پێـشەوەی ئاپۆرایـەکی شـکۆداری پارێزەرانی، لـە مەزرایەکی گوڵـە بەرۆژەوە دەرکەوت و من دڵم وە کوتەکوت کەوت.

لـە ئـووتی **١٩٤٥**دا, ڕاسـت ئەودەمـەی شـەڕی دووهـەمی جیهـانی بڕایـەوە, مەلامستەفا دیسانەوە ڕاپەڕی و سەرهەڵدانی گشتیی ڕاگەیاند. بـەڵام پـاش ئـەوەی لـە سەرەتاوە هێندێکی سەرکەوتن لـە شەڕ لـەتەك هێزە بـێ ئەزموونـەکانی دەوڵەتیـدا وە دەس هێنا, وەزیری نێوخۆی ئێراق بـە وریـایی پـووڵێکی زۆری بـە سـەر دوژمنانیـدا دابەش کرد، ئەوانیش کەیفساز بەوەی کە بۆ بەربەرەکانی لـەگەڵ کۆنەخەنیمی خۆیان پـووڵ و چـەکی بەلێـشاویان وەرگرتـووە, وە خـۆ کـەوتن و هێنـدەی پێنەچـوو کـە بارزانییەکان بە ناچاری ڕەویـن و بـارزانی لــە نێوەڕاسـتەکانی ئۆکتـۆبردا بـە خـۆی و دەهەزار کەسێکەوە, کە سـێیەکیان شـەڕکەر بـوون و هەمووشـیان بـارزانی نـەبوون سنووری ئێرانی هەڵبژارد. پەڕینەوە لـە کەوشەن بە سـانی بـوو: سـنوور ئـاوەڵا بـوو و بارزانی و جەماوەرەکەی لــە لایـەن نەتـەوەخوازانی کـوردی ئێـران و دەوڵـەتی تـازە دامەزراوی مەهابادەوە پێشوازییان لـێکرا. هـیچ هێزێکـی ئێرانـی بـەری لـــێنەگرتن, چـونکە زۆربـەی خـاکی کوردسـتان ببـوو بـە ناوچـەی لـەمپـەری نێـوان هێزەکـانی داگیرکەری سۆڤیەت و ئینگلیس. پێـشینەی هەنتەشـی سـپای سـوور لــە وێنـدەرێ و نـەبوونی دەزگـای دەوڵـەتی ناوەنـدی لــە ناوچـەدا، دەگـەڕاوە سـاڵی **١٩٤١**, کـە ئینگلستان و یەکێتی سۆڤیەت لـە ترسی مەیل و ئیشتیای ئەلـمانخوازانـــەی ڕەزاشـــا, دەستیان بەسەر ئێراندا گرت و ئەویان لـە پاشایەتی خست و بەرەو تاراوگەیان ڕەتانـد.

ئەم دوو دەوڵەتە هەر بۆ خۆ پاراستن لـە تێکهەڵچوونی چاوەڕوان نەکراو, ناوچەیەکی لـەمپەریان لـە نێوان هێزەکانیاندا دیاری کرد. هەرتك دەوڵەت زۆر بەگەرمە سـەرقاڵی ناردنی چەکوچۆڵ و تەقەمەنی لـە لایەن دەوڵـەتانی هاوپەیـمانەوە بـوون لــە کەنـداوی فارسڕا — بە خاکی کوردستانا — بۆ سنووری یەکێتی سۆڤیەت. یـەکێتی سـۆڤیەت بـە باری نەبوونی چەك و تەقەمەنیدا کەوتبووە تەنگەژە.

کوردەکانی ئێران و سـۆڤیەت دەرفـەتیان لــەم بۆشـایی دەسـەڵاتە هێنـا. کـوردان هەلێکی مەزنیان وەچنگ هێنابوو و ئەوەتەی دەوڵـەتی ئێـران, لــە ١٨٧٨دا میرنـشینی ئەردەلانی تێدا بردبوو, هەڵکەوتی وایان بـە خـۆوە نـەدیبوو. ئـەم ژێنێراڵـە ڕووسـەی لـەسەر سنوور دیداریان لــە گـەلا کردبـوو, هێزەکـانی بـارزانی وەبـەر دەسـتی قـازی مـحەمـمەد نا. قازی مـحەمـمەد مەلایەکی پەنـجا ساڵانە و زۆر لـەبەر چاوان بـەڕێز و قازیی شاری مەهاباد. قازی بـە یارمـەتی ڕووسـان کۆمـارێکی بـە سـەرۆکایەتی خـۆی دامەزراند کە پاشان مەنشوور بوو بە "کۆماری مەهاباد". قازی لـە بنەماڵـەیەکی چاوناس و پیـاوێکی بەقورسـاغ و خۆشەویـست و بــە کـردەوە حـاکمی ناوچــە بـوو. هـاتنی بارزانییەکان بۆ ئەو نیعمەتێکی خوداداد و چاوەڕوان نەکراو بوو، چونکە هەتا ئـەو دەم سپای نەبوو و تەنیا هێزی هیوای وەفاداریی تەواوی خەڵکی مەهاباد و هێنـدێك کەسـی نێو عێـل و عەشـیرەتان بـوو. بارزانییـەکان کـە چـازانی شـەڕی چیا بـوون, هێزێکـی زەبروەشێنی بزۆکیان نایە بەردەستی.

کۆماری مەهاباد وێنەیەکی کاڵـەوەبووی کۆماری خودموختاری ئازەربایـجان بـوو کە لایـەنگرانی سـۆڤیەت بـە یارمـەتی سـپای سـوور لــە دێـسامبری ١٩٤٤دا دوای داگیرکرانی تەورێز, دایانـمەزراندبوو. قازی مـحەمـمەد بە نـاوی حیزبـی دێمـوکراتی کوردستان، کە لـە شازدەی ئووتی ١٩٤٥دا بە ئاماژەی ڕووسان پێکهات، بە نابـەدڵی کەوتە شوێن ئازەربایـجان و لـە ٢٢ی ژانویـەی ١٩٤٦دا لــە مەیـدانی "چوارچـرا"ی مەهاباد دامەزرانی کۆماری ڕاگەیاند. (چوارچرا مەیـدانێك بـوو کـە لــەوێ تـەنیا دوو

شەقامی قیلەتاو کراوی شار وێکدەکەوتنەوە.)[1] قازی محەممەد لەبەر چاوی ئەو جەماوەرەی کە وا لە مەیدانەکەدا کۆببوونەوە و بریتی بوون لە سەرۆك عەشیرەت و کاربەدەستانی حیزبی دێموکراتی کوردستان و سێ کەس لە ئەفسەرانی سۆڤیەت و مەلامستەفا بارزانی, ئاڵای کوردستانی هەڵدا: سێ ئەفسەرەکەی سۆڤیەت ڕەشاش بە دەس لە قەراخ جەماوەرەکە لە جیپێکدا دانیشتبوون. پاشان بارزانی بە جلوبەرگی ژێنێراڵییەوە بە دابی ڕووسان — بە جووتێك چەکمەی ملدرێژ و سەرشانەی شەق و ڕەقەوە — هاتە نێو جەماوەر.

هەم دامەزراندنی حیزبی دێموکراتی کوردستان و هەم ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کورد, ئاکامی سەفەرێکی باکۆیە بوو کە لە سێپتامبری ١٩٤٥دا ڕووسەکان بۆ قازی محەممەد و سەرۆك عەشیرەکانیان ڕێکخستبوو. باوباوێنی ئیستالین بۆ خاتری دابرینی باکووری ڕۆژاوای ئێران و خستنە سەر خاکی سۆڤیەت بوو و کوردانیش دەکەوتنە جەغزی ئەم بیرە. لە باکۆ بەڵێنی پووڵ و چاپخانەیەك و چەکی قورس و وەرگرتنی خوێندکاریان لە خوێندگەی سپادا پێدان. حیزبی دێموکرات بە ڕواڵەت خوازیاری "خودموختاری" بوو لە چوارچێوەی وڵاتی ئێراندا نەك سەربەخۆیی و تاکوو ئێستاش سەبارەت بە ئامانجی کۆمار، لەسەر وە دەس هێنانی سەربەخۆیی تەواو, دووشکن. ئاڵای کۆمار, سوور و سپی و سەوز و سەرنخوون کراوی ئاڵای ئێران بوو, هەر دەتگوت کوردان نەیانتوانیبوو جیا بوونەوە لە ئێران بە خۆیان بسەلمێنن. بەڵام ئەم وردەکارییانە بۆ دەوڵەتی لاوازی ئێران و دۆستە ئینگلیسی و ئەمریکایییەکانی لەو دەمدا ئەشتەکی وا نەبوو سەرنج ڕابکێشێ. محەممەدڕەزا شای لاو و بێئەزموون کە لە جێی باوکی لەسەر تەختی تاوس پاڵی دابوّوە دەیزانی کە کورد و بلووچ و ئازەربایجانی و تورکان و عەرەب وێکرا دەبنە نیوەی جەماوەری وڵات و تەنانەت بوونی خودموختارییەکی نە هێندەش دەبێتە هەڕەشەیەکی مەترسیدار بۆ دەسەڵاتی ناوەندیی. هاوپەیمانان لە بەشداربوونی کوردان لە نەخشەکانی سۆڤیەتا

١– مەهاباد ئەوێ دەمێ شەقامی قیلەتاوکراوی نەبوو.

گەلــێ دڵپەرۆش بوون. ئەم ڕەوتە خێرا دەبوو بە دەسپێکی گێـرە و کێـشەی "شـەڕی سارد".

ڕووسەکان هەر لـە هەوڵەوە تێکەڵایەتی لـەگەڵ سەرۆك عێلانی خۆپارێزی کـورد و کەسانێکی وەك قازی مـحەمــمەدیان پـێ باشــتر بـوو لــە تێکـەوتن و پێوەنـد لەتـەك ئەنــدامانی ڕێکخراوەکــانی حیزبــی دێمــوکراتی کوردســتان کــە بریتــی بــوون لــە نەتەوەپەروەرانی چاوناس و [کۆنە ئەندامانی] کۆمەڵەی ژیانی کـورد و چـەند کەسـی کومۆنیست و نوێنەرانی خۆجێیی حیزبی نەهێنی کوردەکـانی ئێـراق بـە نـاوی هیـوا.) کۆمەڵە کـە ڕێکخراوەیـەکی نـەهێنی بـوو و لــە سـاڵی ١٩٤٢دا دامـەزرابوو، هـەر خێرایەکی پەلوپۆی هاویشت و لکی لــە هــەولێر, کـەرکوك، ڕەوانـدز، شـەقڵاوا و سلێمانی و هەروەها لـە سووریا و تورکیا دانا. سۆڤیەتەکان کە بە دڕدۆنگی دەیانڕوانییە شــێوەی جووڵانــەوە ئازادیـــخوازانەکەی, پێــداگر بــوون قــازی مـحەمــمەد کــە کەسـایەتییەکی بەدەســەڵات، بـەڵام خـاوەن ڕاوێـژی نـەرم و نیـان بـوو، وەك ئەنـدام وەربگرێ. قازی مـحەمـمەد لـە ئاوریلی ١٩٤٥دا بوو بە کۆمەڵە.

دەسەڵاتی کۆمار قەت پتر لـە سێیەکی ناوچە کوردنـشینەکانی ئێرانـی نەگرتـەوە و سنووری لـە شێست میل ئەولا تری مەهاباد وێوە نەچوو کە خـۆی ناوچـەی لـەمپــەری هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت بوو. بەڵام بۆ تەواوی کوردەکانی وڵات، بەتایبــەت لاوانــی ناڕازی کە بە تێكشکانی حیزبەکانی پێشوو سەرشکستە ببوون, وەك ئاسنڕفێنێــــــــك وابوو. لێژنەکانی نوێنەرایەتی کوردان سووریا و تورکیا و ئێراق بەگــەرمی پێـشوازییان لــێکرا. حکوومەتی مەهاباد سەرەڕای پشتگیری بە ئاشکرای ڕووسان – بە پێچەوانەی حکوومەتی ئازەربایـجان کە دەکەوتە قـوڵی بـاکووری و حکوومـەتێکی سـەرکوتکەر بوو– بە شـێوەیەکی تـەواو بەرچـاو ئـازاد و کـراوە بـوو. لــە هـیچ شـوێنێ ڕاهێنـانی مارکسیستی، پۆلیسی نـەهێنی و دابەشـینی زەوی‌ـوزار بـە شـێوەیەکی پتـەو و پتـوون نەدەهاتە بەرچاوان. لـە پیت و بەرەکەتی چاپـخانەیەکی کە سۆڤیەتان بەڵێنییان دابـوو و سپای سوور وێی‌دان, چەند کتێبی خوێندن، ڕۆژنامەیەك, مانگنامەیەکی سیاسـی و دوو گۆڤاری ئەدەبی بڵاو کرانەوە. کۆماری مەهاباد لـە سەردەمی ژینی کورتی خۆیا هیوادار

بوو بتوانێ وەك "ناوەندی فەرهەنگ و جووڵانەوەی نەتەوایەتی کورد" لـەگەڵ دەمیـشق و سلێمانی بەزێنە بکا.

بەڵام هەر کە دۆستانی سۆڤیەتی سەردەمانی خۆشـی، پـشتیان لـێ کردەوە تەمـەنی کۆماری مەهاباد بڕایەوە. تەوژمی بێ وچانی بریتانیا و بەتایبەت ئەمریکا ئیستالینی ناچار کرد کە ڕێز بۆ بەڵێنەکانی دەورانی شەڕ دابنێ و لـە مانگی مەی ١٩٤٦دا کۆتـایی بـە هەنتەشی سیاسی خۆی بێنێ. بەڵێنی ئێران لـەسەر دانی ئیمتیازی نەوتی بـاکوور، تـالآیی دەرکەوتنی سپای سووری لـە ئێران لـە زاری ڕووسان سڕیوە، هەر ئـەم بەڵێنـەی دانـی ئیمتیازی نەوتە دنەدەرێکی تەواو بوو کە سـۆڤیەتەکان ئازەربایـجانی و کـوردانی ژێـر داڵدەیان بەرەڵڵا کەن. (هەر کە ڕووسان خاکی ئێرانیان چۆل کرد، ئێران کەوتەخۆ بە مەبەستی دۆزینەوەی بیانوویەك و تێكدانەوەی پێکهاتنەکە.) کوردەکـان و ئێرانییـەکان زوو تێگەیشتن کە تازە سپای سوور ناگەڕێتـەوە. هـەر کـە ئەمەشـیان زانـی، کۆمـاری مەهاباد وەکـوو میوەیـەکی گەیـشتوو وەری. کـوردان کـە وەك ڕێـسایەکی کـۆن بـە دڕدۆنگی دەڕواننە هەموو حکوومەتان لـە حاڵی بوونی ئەم مەبەستەشدا تێمــــــان و نەیانزانی کە ئەمـجار کوردانی هاوڕەگەزیان حکوومەتیان بەسەردا دەکـەن و وا باشـە پشتیوانییان لـێبکەن؛ لـە بری ئەم کارە خۆیان لـە قازی مـحەمـمەد کـەنار دا، چـونکە تێکەڵایەتی ئەو لـەگەڵ ڕووسان وە بیرهێنەوەی کوشت و کوشتار و تاڵانێـك بـوو کـە سپای ڕووسـی خونکـاری لــە سـەردەمی شـەڕی یەکـەمی جیهانیـدا لــە کوردسـتان پێیهەستابوو.

قازی مـحەمـمەد کە بەرەوڕووی سپای کەڵتە کـراوی ئێـران بـوو بـە ناچـاری و لەوپەڕی تێماویدا دەسی یارمـەتی بـۆ لای سـەرۆك عێـل و عەشـیرەتان درێـژ کـرد. زۆربەی ئەم سەرۆکانە کەسانێکی بێ بەروپشت و پووچەکە و ئاژاوەگێڕ بـوون, جگـە لە هێزەکانی بارزانی, تەنیا یەکێك لـە عەشیرەکانی دەوروبەری مـەهاباد و قۆڵێـك لــە عێلێکی تر پێی وەفادار مانەوە. قازی مـحەمـمەد چەند جاران بـۆ سـەرکوتی دژایـەتی ئاشکرای عەشـیرەتان و شـەڕ لـەگـەڵ ئازەرییـەکان و سـپای ئێـران, بـارزانی دابوونـە بەرەوە. ئەو تانك و تۆپ و ڕەشاش و چەكوچۆڵ و کەرەسانەی سۆڤیەتەکان بـەڵێنییان

دابوو, قەت نەدیتران. قازی مـحەمـمەد ئاستی دەزگای دەوڵەتەكـەی بـەرەژێر بـرد و پلەی خۆی وەك ڕێبەری حیزبی دێموكراتی كوردستان هێنایە خوار و وەزیرەكان بـوون بە سەرۆكی یانەكان و قازی بێبڕانەوە لای دیداركـەرانی پێـداگر بـوو كـە ئامانـــجی هەوەڵ و ئاخری ئەو خودموختارییە.

ئەو هەوڵی دا بە كاربەدەستانی بەرپرسی ئێران بسەلـمێنێ كـە بیكەنـە پارێزگـاری پارێزگایەكی تازە, پارێزگایەكی بەربلاو, كە لــە سـنووری سـۆڤیەت هـەتا خـوارووی كرمەشانی دەگرتەوە, بە هێندێك دەسەڵاتی خودموختاری نێوخۆوە. بەڵام ئەم گەلاڵەیە نەیگرت. لـە مانگی مەیدا, دروست ئەو كاتەی هێزكانی سۆڤیەت خەریكی كـشانەوە بوون، تێكهەڵچوونی تاكوتەرا ڕوویان دا. لـە بەرەی نێوخۆدا, سەودا و مامەڵە لـەگەڵ شوێنەكانی دیكەی ئێران دابڕابوو؛ تەنیا بەرهەمی لــە بـرەوی ناوچـە كـە تـووتن بـوو, نەفرۆشرابوو و ڕوخساری خەڵك تۆزی خەمی لـەسەر نیـشتبوو. خـورد و خـۆراك لــە كەمێی دابوو، زیاتر لـەبەر وەی كـە هێزەكـانی بـارزانیش – كـە بـە درێـژایی مـاوەی مانەوەیان "خانەخوێیان" وەرەز كردبوو – دەبوو تەسەل بكرێن. بارزانی خۆی بڕوایەكی وای بە خانەخوێ نەبوو. زۆر دواتر بە خراپە باسی قـازی مـحەممـــەدی دەكـرد و بـە نــاوی پیــاوێكی كــە ئامانـــجی "ئــاخنینی گیرفــانی خــۆی" و خــاوەن كــردەوەی غەیانەتكارانەی "نادیار" بوو، تاوانبار دەكرد. گوناهباری دەكرد و دەیگوت بازەرگانێتی بە كوردستانەوە دەكرد, ئەگەرچی پێـشی لـــێدەنا كـە هێزەكـانی ١٢٥٠ تفـەنگ و ٣٠ڕەشاشیان لــێوەرگرتووە.

لـە ١٠ی دێسامبری ١٩٤٦دا هێزەكانی ئێرانی پـەلاماری دەرەیـەكی گرینگیـان دا كە بە دەس دێموكراتەكانی ئازەربایـجانەوە بوو؛ دیارە پاش شەو و ڕۆژێك خـۆڕاگری، تێكشـكان و بـەم شـكانە كۆمـاری ئازەربایـــجان هەرەسـی هێنـا و ڕووخـا. قـازی مـحەمـمەدیش لـەڕێوە بۆ پێمل بوون ڕەزامەندی دەربڕی. ئەو بە پێـچەوانەی ڕێبـەرانی ئازەربایـجان كە ڕایان كردە سۆڤیەت لـە مـەهاباد مایـەوە و تـاوانی كـردەی خـۆی وە ئەسـتۆ گـرت. ئـەو بـە پێـچەوانەی ڕێـسای كـۆنی كـوردان وە دەس نـەهات و بـێ

ئەملاوئەولا دەستی بەردانەوە و زۆر دواتر لەم بابەتەوە بە توندی کەوتە بەر لۆمە و لەقەمی نیشتمانپەروەرانی لاوی کورد. ئەو تەنانەت لە ٢٧ی دێسامبردا، بێ ئەوەی فیشەکێك بێتە تەقین, پێشوازی لە هێزەکانی سپای ئێران کرد. بۆ دوو ڕۆژ دواتر گیرا. قازی و [سەدرولئیسلام]ی برای و [حەمەحوسێنخان]ی ئامۆزای لە سەعات سێی بەرەبەیانی ڕۆژی ٣١ی مارسی ١٩٤٧دا لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد لە سێدارە دران. تاقمێکی تریش لە شارەکانی کوردستان ئیعدام کران. بەمجۆرە تەنیا وڵاتی سەربەخۆی کوردی سەدەی بیستەم لە بێ پەڕی.

بارزانی هەر بەڕاستی ئەم پلە ژێنێراڵییەی قازی محەممەد پێی بەخشیبوو هەقی خۆی بوو. بە تێپەڕینی هەر ڕۆژ و مانگێ، کۆمار پتر لە جاران بە هێزەکانی ئەو پشتئەستوورتر دەبوو, چونکە پشتیوانی عێلە بێ بەروپشتەکانی کوردی خودی مەهاباد هەر ڕووی لە کەمی بوو. کێشە و کۆسپی قازی محەممەد وێنەیەکی کۆنی گرێ و کۆسپی ڕووناکبیرێکی سیاسی شارستانییە کە لەگەڵ هێزەکانی عەشیرەتی بەرەوڕوویە کە سەریان لە کاروباری سیاسی دەرناچێ و چ ڕێزێك بۆ ڕێبەرانی سیاسی و هەڵوێستەکانیان دانانێن. زۆربەی ئەم هۆز و عەشیرەتە کوردانەی ئێران کە وەفاداری کۆمار بوون خێرا بایان داوە و کەوتنەوە سەر ڕێوشوێنی پێشوویان: ڕووت کردنی ڕێبواران و دادۆشینی جووتیاران.

بارزانی قەت هەستی بە چاوی سووکەوە ڕوانیی خۆی سەبارەت بە کوردەکانی ئێران نەشاردەوە و هەر ئەمەش بوو بە هۆی نێوانگرژی چەندین و چەند ساڵەی لەتەك کوردەکانی ئێران. وا دیار بوو ئەو پشووی لەسەر مەترسی پاڵوێدانی کوردانی وە هێزێکی غەوارەوە نەخواردەوە و سەرنجی نەدایە پەندێکی ڕوون و ئاشکرا کە کۆماری مەهاباد دابوویە دەس، بەڵکوو ئەزموونی مەهاباد وای لێکرد کە ئەم تێن و گوڕەی تێدا بەهێز بێ کە لە تەواوی کوردان بخوازێ بێ ئەملاوئەولا ڕێبەرایەتی ئەو قبووڵ کەن. ئەم بەندیوارییەی کە زۆر دواتر لەتەك شای ئێران لێکی گرێ دا لەسەر کەوڵی کوردەکانی ئێران بوو. ئەو زۆرجار و کەرەتان ئەم مەبەستەی ڕوون کردەوە کە خەباتی کوردەکانی ئێراق گرینگایەتی یەکەمی هەیە. بارزانی قەت لەسەر ئەم

بڕوایەی کە کوردەکانی ئێران – هەروەتر کوردەکانی سووریا و تورکیا – دەبێ ئـاوات و ئامانـجیان فیدای ئاوات و ئامانـجی وی بکەن، دووشك و دوودڵ نەبوو.

لـە ساڵی ١٩٦٨دا کاتێك دەستەیەك لـە کوردەکانی ئێران بە پێچەوانەی پێـداگری و فەرمانی وی جووڵانەوەیەکیان خستە گەڕ, بارزانی یەکێك لـە ڕێبـەرانیانی بـە نـاوی سولـەیـمان مـوعینی, کـە پـەنای بردبـووە ئێـراق، کوشـت و تەرمەکەشـی داوە دەس حکوومەتی شا و ئەوانیش بە شارەکانی کوردستاندا گێڕایان. لانیکەم ٤٣ کەسی تـر لـە ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کـە لـە مابـەینی سـاڵانی ١٩٦١ تـا ١٩٧٥ لـە [کوردستانی] ئێراق ماتەیان هەڵگرتبوو بە دەستووری بارزانی کـوژران یـام گـیران و درانـەوە بـە حکوومـەتی ئێـران. کاتێـك بـارزانی نیـازی بـە یارمـەتی بـوو, کوردەکانی ئێران لەوە لاوازتر و تووڕەتر بوون کـە قازانـجێکان لـێ هەڵوەرێ. جـا ناکۆکی نێوان کوردەکانی ئێراق و ئێران و تورکیا هەروا بـەردەوام مایـەوە. وەچـەیەك دواتر کوردەکانی ئێراق کە بـە گـشتی بـۆ دەس ڕاگەیـشتن وە دنیـای دەرەوە پاڵیـان وە تورکیا دابوو, کاریان گەیشتە جێیەك بە چەك بەرەوڕووی برا کوردەکانی تورکیایان ببنەوە, کە لایان وابوو خەباتی ئەوان گرینگایەتی پتری هەیە.

دەبێ بە قازانـجی بارزانیش ئەمە لـە یاد نەکەین و بیڵێین کە تەنانـەت پـاش ئـەوەی عێل و عەشیرەتەکانی مەهاباد پشتیان لـە قازی مـحەمـمەد کردەوە, ئەو هەروا دەرهەق بە کۆماری مەهاباد وەفادار مایـەوە. بـەڵام جگـە لـەوەش چـارەیەکی نـەبوو، چـونکە شـوێنێکی نـەبوو ڕووی تێکـا. جارێکیـان گـوتی: "کـوردان بـە دەس سـپای ئێـران تێنەشکان، بەڵکوو ئەمە یەکێتی سۆڤیەت بوو کـە لـە بەرامبـەر ئـەمریکا و بریتانیـای گەورەدا تێكشکا." چەند ڕۆژ پاش هەرەسی کۆماری مەهاباد بـە گـوێرەی لـێخۆش بوون و دەستەبەرێتی حکوومەت چووە تاران و پـتر لـە مانگێـك مایـەوە. لـەم نێـوەدا هـەوڵی دا بـەرگروانی بریتانیـا وە دەس بێنـێ هـەتا وەگەڕێتـەوە بـارزان یـا ئەیالـەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا مافی پەنابـەری وێ بـدا, بـەڵام سـەرکەوتنێکی لـەم کـارەدا وە دەس نەهێنا. شا پێشنیاری کـرد کـە بارزانییـەکان لـە هەمـەدان، هەڵکـەوتوو لـە

باکووری ڕۆژاوای ئێران نیشتەجێ بن. بەڵام هەمەدان لــە بارزانــەوە زۆر دوور بــوو و مەلامستەفا بەڕاستی دەیزانی کە شا دەیەوێ ئەو و هاوڕێیانی "وەخۆی خا".

بەڵام مەلامستەفا وای نواند کە ئەم پێشنیارەی ڕەت نەکردۆتەوە و تەنانەت واشــی نواند کە سەلــماندوویەتی. لە ڕاستیدا دەرفەتی لەم هەلــە دێنــا: لــەم زســتانەدا کــە بەفرێکی قورس تەواوی وڵاتی داگرتبوو، بارزانییەکان لە "نەغەدە" هەلیان بە خەنیمەت دەزانی. ئێستا خۆیان بە باشترین چەكوچۆڵ و جبەخانەی کۆمار تەیار کردبوو: ٣٠٠٠ تفەنگ، ١٢٠ ڕەشاش و دوو تۆپی گەورە[1] و هێندێکیان نارنــجۆك پێبوو. سەرەنـــجام کاسەی سەبر و دان بەخۆ داگرتنی سپای ئێــران کــەلاوی کــرد و ســپا بــە ڕاکێــشانی هاوکاری چەکدارانی ئەم عێل و عەشیرانەی کە تا ئێستا لەگەڵ مەلامستەفا یەك بــوون و بە دانی بەڵێنی لێبوردن, کەوتە شوێن بارزانی. بارزانییەکان لەم پاشەکشە ئازایانــەی خۆیاندا کە تەقە و لێكدانیشی بــە دواوە بــوو و لــە ١١ی مارســەوە دەســتی پێکــرد "نیشانیان دا کە دوژمنێکی وریا و لەبنەوەبڕ و فێڵەبازن. لە هەلومــەرج و بــارودۆخی خۆیــا ئاشــنا بــوون و لــە شــوێنێکی کــە بــە پێویــستیان دەزانــی شــەڕیان دەکــرد و هەروەختایەکی پێیانخۆش با شەڕیان بە ئەستۆی دوژمندا دەبـــڕی." لـــــەم شـــــەڕ و تێكهەڵچوونانەی مەگین بە هەڵکەوت، دەنا هەموو ڕۆژێ بێ نێوبڕ دەقەومان, کوردان زۆر زیاتر لەوەی خۆیان کوژراو و برینداریان لــێدەکەوتەوە, کەلاکیان دەخستە ســەر دەستی سپای ئێران. بەڵام بۆردومانی پەیتاپەیتای دە دوازدە فڕۆکــەی کــۆن و تــەوژمی بێوچانی هێزەکانی ئەردەکی, وردە وردە کــاری کــردە ســەر ورەی پیــاوان و ژنــان و زارۆکان. بارزانییەکان هێزەکانی خۆیان کردە چەند قۆڵ. لــە ســەرەتای ئــاوریلا شــێخ ئەحــمەد و چوار ئەفسەری ڕاکردووی سپای ئێــراق و زۆربــەی پیــاوان و خێزانــەکان لێیران بگەڕێنەوە ئێراق و چی دەبێ با ببێ. ئەم تاقمە لەسەر سنوور خویان دایە دەســتی هێزەکانی ئێراق. شێخ ئەحــمەد بــۆ مــاوەی یــازدە ســاڵان لــە بەندیــخانەدا مایــەوە و زۆربەی هاوڕێیانی بۆ خوارووی ئێراق دوورخرانەوە. مەلامــستەفا بــە بێهــوودە وریــایی

١– تۆپی ٧٥ی چیایی. "یۆنسی"

دابوو بە چوار ئەفسەرە ڕاکردووەکە و پێیگوتبوون کە تووشی چ چارەنووسێك دێـن، چونکە ئەوان تەمای خۆیان گرتبوو، ئەم چوار ئەفسەرە لـە سێدارە دران.

لـە ١٣ی ئاوریلا مەلامستەفا بە خۆی و ٤٩٣ کەس لـە هاوڕێیانی شـەڕکەری, بـە لاڕێیەكدا کە کەمتر لـەبەر چاوان بوو, لـە کاتێکا هێزەکانی ئێرانی دەم لـەسەر پشت بـە شوێنیانەوە بوون, هەر بە شـەو گـەڕاوە ئێـراق و بـەرەو چـیا و چـۆڵی دوورەدەسـتی باکووری بارزان ئاژوای. بەڵام دوو حەوتەی تریش هەر بەرێوە بوو, چونکە نەیتوانیبوو لێبووردنی دەوڵەتی ئێراق بۆ خۆیان دابین بکا و چاوەڕوانیی سۆز و پەنای لـە ئێرانییـان و ترکان نەبوو. هەمووی کۆ کردنەوە هەتا بۆیان شی کاتەوە کە بۆچـی تـەنیا ڕێگایـان کۆتان بەرەو سنووری سۆڤیەتە. گوتی: "شەکەت دەبن، برسی دەبن, پێخـاوس دەبـن." جا بێ ئەوەی ڕوونی کاتەوە کە کەی و لـە کوێ و چلۆن، درێژەی دا: "من ڕووسانـم دواندووە. گوتیان ڕەنگە ڕێگاتان بدرێ." وەك ئەوەی هەموو باسی دەکەن مەلامـستەفا لـەم بارەوە خۆی دایە دەس چارەنووس, چونکە چـارەیەکی تـری نـەبوو. بـارزانی لــەم پاشەکشە بیستویەك ڕۆژانەی خۆیا, لـە ٢٧ی مەیدا بۆ کورتە ماوەیەك لــە ئێراقـەوە پێی نایە تورکیا, پاشان دوو ڕۆژ دواتر سەروسۆراغی لـە ئێران پەیدا بـۆوە، لــە کاتێکـا بەرەو باکوور ملی دەنا. لـە شوێنێك دیسانەوە بۆ ماوەیەکی کەم گەڕاوە و سـەرلـەنوێ ڕووی کردە خاکی تورکیا, ئەوجار هاتەوە ئێران، لـە وەختایـەکا دوو گـوردانی ئێرانـی شوێنیان لـە دوو دەگێرا.[1] بارزانییەکان تەنیا چەن یەستێرێکیان پێبوو کە برە کەلوپـەل و برینداره‌کانیان لــێ شەتەك دابوون. بەمـجۆرە بارزانی و شەڕکەرانی چوست و ئازای تەواوی ئەم دووسەت و بیست میلـەیان بڕی, ئەویش لـە کاتێکـا بـەفر تـەواوی وڵاتـی داگرتبوو و لـە هێندێك شوێنان بارستایی لـە سێ گەز و نیوان زیاتر بوو.

ئەنارادە دۆلـەمەری [ئەمەر ئاغا دۆڵەمەری]، یەکێك لـە حەرەسەکانی بـارزانی کـە لــە ١٩٩١یـش دا لــە خزمـەت کـوڕانی بـارزانی دابـوو, لــەم کەسـانەیە کـە لــەم "پاشەکشەیە" ماوەتەوە. ئەو دەیگـوت: "مەلامـستەفا مرۆیـەکی زۆر خـاکی بـوو کـە

١– زۆر لـەوە زیاتر بوون، بڕواننە پاشکۆ. "یۆنسی"

نەیدەهێشت کەس کەلوپەلی تایبەتی خـۆی بـۆ هـەڵبگرێ. هەمیـشە گاڵتـەی لەگـەڵ هەموان دەکرد؛ هەمیشە هەوڵی دەدا خۆی لە ناوەندی شەڕەکاندا بـێ." ئـەو بـە فیزێکەوە زیادی کرد: "من ئەوەندەی شەڕم کـردووە هـەر لـەبـەر خـاتری مەلامـستەفا بووە, نەك لـەبـەر کوردسـتان." هاوڕێیـانی بـارزانی بـۆ ئـەوەی نەکەونـە بـەر وێـزەی دوژمنان, شەوانە ڕێی کوێستانانیان دەبڕی, کەوش و پێتاویان لە تەگەری ئوتۆمبیل چێ کردبوو. ئەم پێڵاوانە زۆر "شتی چـاك بـوون, چـونکە چـرپەیان نـەدەهات." هەرچـی ڕەشاشی قورس و ناقۆلا بوون تووریان دان و تێکڕا بڕنوویان کردنە شان کە لـە دەستان خۆشتر بوون و "شا" ئەوان سەردەمان کە نێوانی لـەگەڵیان خۆش بـوو، وێی‌ـدابوون.[٢] هەر چەکدارەی پێنسەت فیـشەکی درابوویـە. ئـەم خەڵکـە خۆولاتییـەی تووشـیان وە تووشیان دەهات، ئەوەندە دەترسان کە نەیانـدەوێرا پەنـچکە نانێکیـان بـدەنێ و هـەر لـەبۆیە پێشمەرگەکان (بارزانییەکان) بە هەڵکەوت لە گوندان دەخـەوتن، لـە جیاتیـان لەسەر تاشەبەرد و لە بەفرا "دەحەسانەوە". کۆسپی گەورەیان بێ ئاوی بـوو(!) — "لـە تەواوی ئەم ماوەدا لە توونیان گـەزارەمان کێـشابوو ... جلوبـەرگمان شـڕ و پـەتوور ببوون، چونکە بۆ ئەوەی نەمانبینن زۆرتر زگەخشکەمان دەکرد." لە هێنـدێك شـوێنان ولات ئەوەندە هەڵەت و هەڵەموت بوو کە "تەنانەت یەسترەکانیش دەرنەدەچوون ... ناچار دەبووین برینداره‌کانـمان جێ بێڵین." لە درێژەی ئەم ڕێپێوانەدا بارزانی سەرجەم ٢٨ پێشمەرگەی لە شەڕاندا کوژرا و بیست کەسێکی تریش لـەبـەر برینـی ئەسـتەم و شەکەتی مردن. سێجار تێك‌هەڵچوونی بەگەرمە و پێنج شەش لێك‌دانـی سـووکەڵەی وەبەر هات, بەلام هێزەکانی ئێران قەت نەیانتوانی تێکی‌شکێنن.

پاش چلوچوار سالان هۆی ئەم تێك‌نەشکانەم بۆ ڕوون بۆوە: لە وەختی ڕاکردنـم لە چنگ هێزەکانی ئێراقی، لەسەر سنووری ئێراق و تورکیا شوێنێکیان نیشان‌دام کـە بارزانی و چەکدارەکانی لەوێوە لە جۆبارێك پەڕیبوونەوە کـە بـە لـووزەوی بـەفراوان کەنداوکەند هەستابوو. بە ڕواڵـەت هـیچ شـتێك ئـەم حانـدەی لـە حانـدەکانی تـری

---

٢– ئەوێ دەمێ شا چەکی وە بارزانییەکان نەدابوو. "یۆنسی"

جۆبارەکە جیا نەدەکردەوە. ئەو جۆرەی بۆمنیـان گێـڕاوە, ئـەم ئاسـتە تـەنیا جێیـەك و دەراوێك بوو کە بە درێژایی ڕۆژەرێیەك تووشی دەهاتی و دەکرا لێی وەپەڕێ. بـارزانی گوڵوگیا و گیانلـەبەرانی ناوچەشی بە باشی دەناسی و وای ئیدیعا دەکرد کە بەڵـەدی تەواوی ئەو ڕێ و ڕەوگانەیە کە ئەسکەندەری گەورە پێیاندا چـۆتە هینـد. تەمـەنێك ئاشـنایەتی نزیکـی لـەگـەڵ زەوی یارمـەتی دا هـەتا ئەوانـەی بـە دووی‌ـدا دەگـەڕان بیانـخافڵێنێ.

هەڵبەت ئێرانییەکان هەرچۆنێك بێ ئاخرییەکەی لە ١٨ی ژوەن دا لـە لێوارەکـانی ڕووباری ئاراز, کە دەبێتە کەوشەنی ئێران و ئەرمەنـستان, گەیـشتنە سـەریان. ئـەوەی چاوەڕوانی دەکردن تەرمی دوو شەڕکەران بوو کە لـە پەڕینەوەی ڕووبارا خنکـابوون و هێندێك تەقەمەنی و چەند تفەنگێکی شـەق و شـڕ. بـارزانی و هاوڕێیـانی هەشـت ڕۆژ پێشتر گەیشتبوونە ٢٥ میلی باشووری ڕۆژهەلاتی ئارارات [چیای ئاگری] کە بـە بـەر چاوانەوە بوو و لووتکەی بەفرینی خۆی دەنواند. دوو کەسیان بـۆ وتوویـژ نـاردبووە لای ڕووسان. لـە ٢٥ی ژوەندا ڕووباریان بڕی. سەردەمی دووری لـە نیشتمان پـتر لـە یازدە ساڵی کێشا.

یەکێتی سۆڤیەت کوردەکانی پۆل پۆل کرد و هەر تاقمەی لـەم ولاتـە بەرینـەدا بـۆ لایەك حەوا دا. ئەمە شێوەی جوولانەوەی دامەزراوی ئیستالین بوو لـەگەڵ کەمینەکانی نەتەوەیی‌دا. لـە زستانی ١٩٤٩–١٩٥٠دا بارزانی بـە قبـووڵ نـەکردنی سـەرۆکایەتی دەوڵـەتی لە تاراوگەدا کـە ڕووسـان دەیانویـست وەك دەسـپێك بـۆ هەڵگێرسـانەوەی شۆڕشـی کـورد پێکی‌بێـنن, سـۆڤیەتەکانی هەڵتەزانـدەوە و تـووڕەی کـردن. ئـەم هەڵوێستەی گرتی, هەڵوێستێك نەبوو لـەسەر ڕەوتی "ئیدئۆلۆژیك", بەڵکوو هەڵوێستی خۆی بوو. ئەوەندەی ڕق لـە قازی مـحەمـەد بوو کە لـەسـەر پێـداگری ڕووسـان بـۆ هەڵبژاردنی ڕەحیم [ی سەیفی قازی] ئامۆزای قازی مەزن بـۆ وەزیـری دەرەوە، تـۆرا. کردەوەی مەلامستەفا وەبەر دڵی ڕووسان نەدەکەوت. گیرا و دوورخرایەوە: لــە بـاکۆ بۆ تاشکەند و لـە وێوە بۆ مەسکەو ... تەنانـەت دۆزینەوەشـی کـارێکی زۆر ئەسـتەم و مەترسیدار بوو. جەلال تاڵەبانی کە لـە پێداهەڵدەرانی ئەو بوو و لێبڕابـوو کـە "بـت"ی

خۆی وەدۆزێ, دێنێتەوە یاد کە بە فێڵ و تەڵەکە بانگێشتنامەیەکی بۆ بەشداری لە فێستیواڵی ساڵی ١٩٥٧ی لاوانی کومۆنیست کە لە مەسکەو بەڕێوە دەچوو, وە دەس هێنا و توانی چاوەدێرانی بخافڵێنێ و پاش هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر بارزانی لە یەکێك لە ئاپارتمانە بچووکەکانی مەسکەو بدۆزێتەوە. لەم چاوپێکەوتنەدا تاڵەبانی هەواڵ و وێنەکانی خاوخێزانی وێدا. پاش ئەوە, تەواوی مەودای قوتار بوونی تاڵەبانی بە وتوویژی نێوانیان دەربارەی داهاتووی کوردستان تێپەڕ بوو. تاڵەبانی ئەو کات مارکسیستێکی دیندار بوو، بەڵام خێرا لێی حاڵی بوو کە بارزانی وا نیە. (بارزانی خۆی بە ئاشکرا دەیگوت کە ئۆگریی بە مارکسیزمەوە ئەوەندە کەم بوو, کە هەر دوابەدوای ئەزموونێك خوێندنگەی حیزبی کومۆنیستی جێهێشتووە و لەم تاقیکارییەدا لە بیری نەبووە کە وەك بناغەدانەری ولاتی سۆڤیەت باسی لێنین بکا و ناوی بنووسێ.)

بەڵام ئەم مەبەستە نەبوو بە هۆی ئەوە کە دەسەڵاتەکانی ڕۆژاوایی بەتایبەت ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناوی نەخەنە لیستەی بێبێجانەکانی یەکێتی سۆڤیەت. بۆ وێنە لە ڕاپۆرتێکی ساڵی ١٩٥١دا کە ڕاوێژکاری سەرکۆمار لە بەشی تەناهی نەتەوەیی‌دا نووسیبووی پێداگری دەکرد کە سۆڤیەتەکان "بە دانی بەڵێنی خودموختاری، لە لایەن پیاوەکەی خۆیانەوە, بارزانی, کە هەر ئێستا لە سۆڤیەتە, سەرنجێکی تایبەتیان خستۆتە سەر کوردان. لە بەرامبەر هاوکاری کورداندا — لەگەڵ سۆڤیەت — وادەی خودموختاری دراوە." ئەم بۆچوون و لێکدانەوەیە بە دوو باراندا هەڵە بوو: بارزانی لەوەی نەتەوەخوازتر بوو کە فریوی سیستەمی سۆڤیەت بخوا و ئۆگری بێ, سەرەڕای ئەوە دابی [کۆشکی] کرێملینیش وا نەبوو کە بەڵێنی بداتە پەناگرانی, وادەیەکی وا کە دوولکی لە سەرملی دابنێ. زۆر دواتر، بارزانی بۆخاتری ئەوەی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی ڕۆژاوایی بە ناوی "مەلای سوور" باسیان دەکرد تەواو نارەحەت بوو و ئەمە نازناوێکی دووقات هەڵە بوو و خۆی بێپشوو بە دیدارکەرانی ڕۆژاوایی دەگوت: "من کومۆنیست نیم. بۆیە پەنام بردە ڕووسیە چارەیەکی ترم نەبوو."

پاش چەند ساڵان بۆ گوێگرانی دەگێڕایەوە کە کەیفێکی ئەوتۆی بە مانەوە لە سۆڤیەت نەهاتووە و ریس‌وگوریسیشی بۆ دێناوە. ڕەش‌بینان دەیانگوت بەڵێ, ئێستا کە بەختی خۆی لە بەختی ئێران و ئیسرائیل – لە دەیەی شەستا – و ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا – پاش ١٩٧٢ – گرێ داوە, هەر دەبێ واش بڵێ. لە ڕاستیدا زۆر پێشتر ئەو ئەم قسەیەی کردبوو. لە دەورانێکدا کە بە هۆی شەڕی ویێتنامەوە ئەمریکا خەریك بوو سەخت ئابڕووی دەچوو, بە دیدارکەرانی واق وڕماوی ڕۆژاوای گوتبوو کە پێی‌خۆشە کوردستان ببێتە پارێزگای پەنجاویەکەمینی ئەمریکا: وەرسووڕان لەم گەورە هێزەی شەڕی ساردەوە بو لای ئەو گەورە هێزەی تر، لە ڕاستیدا شێوەکاری ڕێبەرانی جوولانەوە ڕزگاریدەرەکانی ولاتانی جیهانی سێهەم بوو. هەروەها بارزانی بە ڕەوتی دەرەبەگیدا هەنگاوی دەنا: شتی وای بە میوانان دەتگوت کە دڵیان پێی‌خۆش بێ. تاڵەبانی دەگێڕێتەوە ڕۆژێکیان لە سەرەتای دەیەی شەستا کە بارزانی بە جوێ چاوی بە چەند هەواڵنێری غەوارە کەوتووە و ئەو دیلمانجی بووە بە ئەمریکایی‌یەکی گوتووە "پێی‌خۆشە کوردستانی ئێراق ببێتە پارێزگای پەنجاویەکەمی ئەمریکا." بە هەواڵنێرێکی ڕووسی وتووە کە "دەیەوێ شازدەهەمین کۆماری سۆڤیەت" بێ. وا دیارە بارزانی هیوادار بووە کە شەڕی سارد ناهێڵێ هەواڵنێران بیسراوەکانیان بۆ یەکتر بگێڕنەوە. سەرەڕای ئەمانە کەسانێکی کە دەیانناسی بە دڕدۆنگییەوە دەیانڕوانییە ئەم خۆ شیرن کردنانەی وا بە مەبەستی پێشکەوتی کاری شۆڕش دەیکرد و کوردستانی بە دڵاوایی بە ئەم و ئەو دەبەخشی.

جان فۆستر داڵس، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە مابەینی ساڵەکانی ١٩٥٢–١٩٦٠دا، سەبارەت بە هەر ڕێبەرێکی کە خڕ و پتوون لە جەغزی هەوارگەی ڕۆژاوادا نەبوو, دووشك بوو. بەڵام هەروەك جەمال عەبدونناسر بە ڕوونی بۆ هەموانی دەرخست, ڕێبەرانی جیهانی سێهەم وایان بیر دەکردەوە کە لەم کایەدا, گەلان وەها کەوتوونە بارێکی تاڵوتوون و نابارەوە کە بۆ گەیشتن بە ئامانجیان ئامادەن بە بێ هیچ ژاکانی ویژدانێك لەتەك شەیتانیشا ببنە هاوپەیمان. بارزانیش لەم ڕێسایە بەدەر نەبوو. بەڵام ئەم پیاوەش کە وا بە ئاشکرا و بە شێوەیەکی سەیر و سەمەرە دڵبەستەی ئەمریکا بوو

جارجار دەیتوانی دەقێك بە باری ڕەزامەندی سۆڤیەتا بـخوڵقێنێ. تەنیا شوێن و ناوەندی سەرنـجی کوردسـتان بـوو، ئەگەرچـی ڕەخنـەگرانی لایـان وابـوو کـە لـە ڕاسـتیدا کوردستانی لـەگەڵ عێلـەکـەی خـۆی هەڵدەسـەنگێنێ. توانـدنی کەلوپـەل و کانگـای کوردستان, بۆ وێنە نەوتی کەرکووك، یەکێك لـەم چـەند تیرانـە بـوو کـە لـە تیردانـی بەتاڵیدا بوون.

وا وێدەچێ کە لـە ڕووسیا جگە لـە فێربوونی زمانی ڕووسی کارێکی ئـەوتۆی تـری نـەکردبوو: لـەگـەڵ هاوڕێیـانی دوورخـراوەی و میوانـانی ڕووسـی بـەم زمانـە دەدوا, بەتایبەت کاتێك نەیدەویست ئەندامانی بنەماڵە یان ئەوانەی کاری لەگەڵ دەکردن، لـە باس‌وخواسەکە حاڵی بن. بەر لـە خواردنەوەی مەشرووب کولێرە چـەورەی بـە ڕۆنـی کەرەوە دەخوارد, کە خومارپەڕێنە و ئەمە شتێ بوو کە لـە مەودای مانەوەی ڕووسـیادا فێری ببوو. هەتا ساڵی ١٩٧٢ پەیوەندی لـەگەڵ ڕووسان نەپساندەوە, لـەم ساڵەدا بوو کە یەکێتی سۆڤیەت توانی پەیـمانێکی ١٥ سـاڵانەی دۆسـتایەتی و هاوکـاری لـەتـەك دەوڵـەتی بەعس ببەستێ. ئەم پەیـمانە کە تا ئەو کات گـەورەترین گۆدەتـای کـرێملین بوو لـە ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستا, یـەکێتی سـۆڤیەت سووسیالیـستی خـستە نێـو ڕەوگـەی دەسەلاتی یەکێك لـە گەورەترین فرۆشەرانی نـەوت و بـازاڕێکی قـەوغای بـەرەوڕووی چەك‌وچۆڵ و ڕاوێژکارانی نیزامیی و غـەیرەنیزامیی ڕووسـیدا کـردەوە. بـەم کردەیـە دەس تێکەڵ کردنی پێشووی ڕووسان و کوردانی ئێراق کێشرایە پەنا و پەسـیوان. (بـۆ وێنـە, لـە سـاڵی ١٩٦٣دا یـەکێتی سـۆڤیەت بـە ئاشـکرا لـە ڕێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتووەکان، ئەو مەبەستەی کە "بـە سیاسـەتی تـۆوبڕکردنی" ئێراقـی بەرامبـەر بـە کـوردان نـاودێر دەکـرد, مـەحکوومی کردبـوو و بـۆ هێنانـە سـەر کـار و لابردنـی حکوومەتانی جۆراوجۆر لـە ئێراقا کوردی کردبوونە ئاردەست.) با بە قازانـجی یەکێتی سـۆڤیەت ئەوەشـمان گوتبـێ کـە لـە ١٩٧٤دا بـە مەبەسـتی بـەرگری کـردن لـە هەڵگیرسانی شـەڕی نێـوان ئێـراق و کـوردان هـەوڵێکی ڕاسـت و ڕەوانـی دا, بـەلام ئاکامێکی لـێ‌نەکەوتەوە.

لەگەڵ ئەوەشا, بێشك کاتێك لە ئۆکتۆبری ١٩٥٨دا پاش ڕووخانی حکوومەتی پاشایەتی ژێر باڵی بریتانیا, یەکێتی سۆڤیەت مەلامستەفای بۆ گەڕانەوەی ئێراق دنە دا, ئامانجی ئەمە بوو کە هۆکارێکی ئاڵۆزیی بەرێتەوە وڵات. گێڕانەوەی مەلامستەفا بۆ ئێراق تەمایەك بوو کە لە شێوەی خۆیا و بەم ئاکامانەی لێیدەکەوتنەوە وەك تەمای ئەڵمانییەکان دەچوو بۆ داهاتووی شۆڕش لە سەردەمی شەڕی جیهانیی یەکەما کە "لێنین"یان لە شەمەنەفەرێکی دەرکە داخراوا ناردەوە ڕووسیا.

ئێراق و کوردستان لە دەورانی دوورکەوتنەوەی مەلامستەفا و حکوومەتی نووری سەعیدا – بە دەکارهێنانی ئەو دەور و دەرسانەی لە هەوێڵ عوسمانییاندا فێری ببوو – کەوتبوونە سەر ڕەوتی هێمنی و گەشە کردن. لەم چاخەدا دوو کەس لە سەرکردەکانی دەزگای ناوەندیی سپا – یەك لە دوای یەك – و فەرماندەی هێزی ئاسمانیی ئێراق کورد بوون. زۆربەی کەسانی ڕیزەکانی یەکێك لەم تەنیا دوو لەشکرەی ئێراق کورد بوون, زۆربەی سەرۆك هۆز و عەشیرەتەکان لە هاوکاری لەتەك حکوومەتا ڕازی بوون؛ ئەگەریش خوازیاری خودموختاری بوون یا هەستیان دەکرد کە گەشەی پەروەردە و ڕاهێنان و تەنینەوەی دەزگای ئیداری بناغەی دەسەڵاتیان لەرزۆك و تەفروتونا دەکا، هەرچۆنێك بێ دەریانەدەبڕی. دیپلۆماتە غەوارەکان بە بێ پارێزەر دەچوونە دوورەدەسترین چیا و چۆڵی ئێراق. بەڵام گەڕانەوەی بارزانی شۆڕشێکی ڕاستەقینەی لە یەکێك لە سەخت و چڕترین ناوچەکانی جیهان هەڵگیرساند. لە ماوەی حەڤدە ساڵ پاشی ئەو, پێنج شەڕی گەورە دژی کوردان داگیرسا و سەرجەم ماڵوێرانی و خاپوورکران و کوژراو و شەلوکوتێکی فرتوفراوانیان لێکەوتەوە.

لە یەکەم ڕۆژەکانی سەرکەوتنا، عەبدولکەریم قاسم، ڕێبەری تازەی ئێراق کە دایکی کورد بوو، "مافی نەتەوایەتی" خەڵکی کوردی بە ڕوسمی ناسی و ئەوانی بە ناوی "شەریکانی" نێوخۆی ئێراق ناساند. لە سەردەمی حکوومەتی ئەوا ئاڵای ئێراق بە نیشانەی ئەم هاوبەشییە بە نەخشی بازنەی زەردی خۆر و بە حەوتیشکەی سوورەوە, کە دروشمی تایبەتی کوردانە, ڕازایەوە. شێخ ئەحمەد کە لە ١٩٤٧ەوە لە

بەندیـخانەدا بوو و تین و گوڕی توابۆوە, ئازاد کرا: وا قاوە کـە ئـەو دنـەی قاســمی داوە بۆ بانگهێشتنەوەی مەلامستەفا بـۆ وڵات. مەسـکەو بـۆ ئـەوەی مانـەوەی دوور و درێژی لـە یەکێتی سۆڤیەتا لـەبەر چاوان ناچیزە بنوێنـێ, مەلامـستەفای نـاردە پـراگ و لـەوێشەوە بۆ قـاهیرە. ئـەو کوردانـەی بـۆ پێـشوازی مەلامـستەفا لــە فرگـەی بەغـدا کۆببوونەوە, ئێستاش باسی ئەم بە پیرەوە چوونە پڕ لـە شـادی و قلدیوبلییــە دەکـەن و دەیگێڕنەوە. ماوەیەك دواتر پاپۆڕێکی سۆڤیەت لـە لـەنگەرگای بەسرە لـەنگەری خست و هاوڕێیانی بارزانی لـە "ئۆدێسا"وە گەڕانەوە وڵات.

هەر کە سەرخۆشی سەرەتای شۆڕش تەواو بوو, قاسـم زانی کە خاوەنی ناوەندێکی بەهێزی دەسەڵات و سەقامگیر نیە, بۆیە هەوڵی دا بە تێكبەردانی حیزب و ڕێکخـراوە ڕکەبەرەکان خۆی لـەسەر دەسەڵات وەمێنـێ. لــە ڕاسـتیدا دەسـەڵات لــە کـۆڵان و شەقامان بوو. دە ساڵ شەڕ و شێواوی لـە بەغدا هەر لـە دەسـپێکەوە کـوردانی تێـوەدا. قاسـم هەتا ئەودەمەی لـە گۆدەتایەکی خوێنیی بەعسیدا, لــە فێوریـەی **١٩٦٣** و لــە دەفتەری کارەکەیدا کەوتە بەر دەسـرێژ، کۆشـشی کـرد لــە زنــجیرە چـالاکییەکی سەرەگێژەهێندا دژبەرانی خافڵگرکا. لـە پانزە مانگی سەرەتای حکوومەتیدا, بـارزانی بەرچاوترین هاوپەیـمان و بەڕێوەبەری بیر و بڕوای بوو.

لـە **١٩٥٩**دا چەکدارانی عێلی بارزانی هێزێکی زەبروەشێن بوون کە دژی ئەو عێل و عەشیرەتانە کەوتنەخۆ کە وا لـەگەڵ گەلاڵـەی دابەشینی زەویوزاری قاسم دژایەتییان دەکرد. (زۆربەی ئەم دەربەگانە سەرۆکی ئەم هۆز و عەشیرەتانە بوون کە لـە سەردەمی حکوومەتی پاشایەتیدا لـەگـەڵ بـارزانی شـەڕیان کردبـوو.) دیـسان لــەو سـاڵەدا – **١٩٥٩** – بارزانییەکان ڕاپەڕینی نەتەوەخوازان و لایەنگرانی حوکماتی پاشـایەتییان لــە مووسڵ تێكشکاند و[١] وێڕای کومۆنیستەکان لـە کەرکووك تورکمانەکانیان سـەرکوت کرد. پاشان بارزانییەکان بە فیتی قاسـم کەوتنـە گیـانی کومۆنیـست و بەعـسییەکان و ئەمانەش قەت ئەم ڕووداوەیان لـە بیر نەبردەوە و لـە بارزانی خۆش نەبوون. لـە چـاکەی

١– ڕاپەڕینی ژێنێراڵ عەبدولوهھاب شەوواف.

ئەم چالاکی و دەسبزاوتنانە قاسم لـە ژانویەی ١٩٦٠دا حیزبی دێموکراتی کوردستانی پاشی دە ساڵێك بەربەست کران لـە لایەن حکوومەتی پاشایەتییەوە بە گوێرەی یاسا بـە ڕوسمی ناسی و ئازادی کرد. ئەمە ئەوپەڕی نێوانخۆشی قاسم و بـارزانی بـوو. بارزانی لـەم لێكدەرکردن و تۆڵەوەرگرتنەوانەی عەشیرەتیدا, سەرۆکی عێلی زێباری کوشت. قاسم کە زانی "بارزانی" یەکـە دەسـەڵاتداری تـەنیا ڕێکخراوێکـی سیاسـی و یاسایی وڵاتە کە دەتوانێ هەڕەشەیەك بێ لـەسەری، زۆر بە گەرمی پێـشوازی کـرد لــە هاتنەوەی ئەم سەرۆك عەشیرانەی پێشتر بارزانی بازرەی ئێرانی کردبوون.

بۆ بارزانی, پرسی گرینگتر لـە دامەزرانەوە و سەقامگیر بوونەوەی هێز و دەسـەڵاتی لــە بـاکوور, گوڵبـژێر کردنـی لایـەنگرانی سیاسـی بـوو لــەم ماشـەرە ئاڵۆزکـاوەی نەتەوەپەروەرانی شارەکیدا کە پاش دەرچوونی ئەو لـە وڵات ڕێژەیان تەواو بەرەوسـەر چووبوو. لـە نەبوونی ئەوا زۆربەی کوردانی شارنـشین تێکـەڵاوی حیزبـی کومۆنیـست ببوون کە لقێکی تایبـەتی کـوردی دامەزرانـدبوو و قورسـاغ و خۆشەویـستی زۆر لــە حیزبی دێموکراتی کوردستان پتر بوو. ئەو حیزبەی کە بە گـوێرەی پـەیرەوی نێوخـۆی حیزبێکـی مارکسیـست – لێنینیـست بـوو. لــە نـاخی خـودی حیزبـی دێمـوکراتی کوردستانیشدا تۆوی ناکۆکی و دژایەتی داهاتوو داچێندرابوو.

برایم ئەحـمەد سکرتێری گشتیی حیزب, ئەو کاتەی بارزانی لــە یـەکێتی سـۆڤیەت بوو و جگە لـە تاقمێکی کەم ئەندامی وەفادار، تێکرا ئـەویان لــە بـیر بردبـۆوە، حیزبـی زیندوو ڕاگرتبوو. بـرایم ئەحـــمەد کـە مرۆیـەکی مافنـاس بـوو, ئێـستا لــە بەرامبـەر مەلامستەفادا کە هیچ دەسەڵاتێکی بۆ خوێندەوارانی شـارەکی وەبـەر چـاو نـەدەگرت, ڕادەوەستا و پێملی هەموو خواستێکی بارزانی نەدەبوو. بارزانی بـە لادانـی و هێنانـەوە کایەی هەمزە عەبدوڵڵا دژ کردەوەی نواند. هەمزە عەبدوڵڵا لـەو کۆنـە کومۆنیـستانە بوو کە برایم ئەحـمەد لـە زەمانی بزر بوونی مەلامستەفادا لــە حیـزب وەدەری نـابوو. بەڵام بـارزانی خێرایـەکی بایـداوە و تفەنگـچییەکانی نـاردە بنکـەی حیـزب و هـەمزە عەبدوڵڵا و لایەنگرانی وەدەرنا. لێرەدا سیاسەت و کەسایەتی هەرتك دەوریان گێڕا.

هەمزە عەبدوڵڵا ویستبووی لەگەڵ هۆز و عەشیرەتە خۆپارێزەکانی کورد تێکەوێ و ڕێککەوێ, چونکە دەیزانی خاوەنی ئەم هێز و دەسەڵاتەن کە نەتەوەخوازیی کورد پێویستی پێیەتی. برایم ئەحمەد مافی دەنگ و بڕوای پتری بۆ پەروەردە کراوانی شارەکی دەخواست و بارزانی سەبارەت بە یەکێتی نێوان هەمزە عەبدوڵڵا و کومۆنیستان دڕدۆنگ بوو. خوێندنەوەی سەرلەنوێی ئەو قسە سارد و سووکانەی پارتی دێموکراتی کوردستان دەیخستنە پارسەنگی "ئەمپریالیزم" و "دەرەبەگخوازان" و بورژواکانی ئەوان سەردەمان, بارودۆخی ساڵانی دەیەی ١٩٥٠ بە ڕوونی دێنێتەوە بیر و سووری دەکاتەوە کە ئەم پەیامانە بۆ زۆربەی کوردان, بەتایبەت جەماوەری نەخوێندەواری چیانشین، لە ڕادەی فام و تێگەیشتنیان بەدەر بووە.

نێوانناخۆشی و گرژی بە ڕادەیەك بوو کە ئەو دەمەی وا لە سێپتامبری ١٩٦١دا لە باکوور بەگەرمە شەڕی نێوان هێزەکانی حوکمات و بارزانی دەستی پێکرد، پارتی دێموکراتی کوردستان و برایم ئەحمەد هەوڵیان دا بێلایەن وەمێنن. کوردان و دەوڵەت هەتا ١٩٧٥ هەروا شەڕیان نەبڕایەوە, مەگەر نێوە نێوە و لە مەودای ئاگربڕاندا. کاتێك قاسم لە دێسامبری ١٩٦١دا چالاکی پارتی دێموکراتی کوردستانی بەربەست کرد، خوایینەخوایی پارتی پێی لە کێشەکان وەردرا. ئەوکات برایم ئەحمەد و زاوای خاوەن مرخ و بەرزەفڕی – جەلال تاڵەبانی – هێزێکی جودایان لە باشوور و ڕۆژهەڵات ڕێکخست کە لە دەورووبەری سلێمانیڕا هەتا سنووری ئێرانی بە دەستەوە بوو. ئەمە یەکەم تیشکەی ناکۆکی و لێکدابڕانی ڕیزەکانی کوردان بوو، چونکە بارزانی و برایم ئەحمەد هەرکامیان تەنیا خۆیان بە ڕێبەری لێوەشاوەی جووڵانەوەی کورد دەزانی.

ئەگەرچی ئەم ڕووداوانە پڕ پیچوفڵوچ بوون, بەڵام پرسی سەرەکی – و ساکاری – ڕەوتەکە بۆ کوردان و دوژمنانیان گۆڕانێکی بەسەر نەهاتبوو: لە ئووتی ١٩٤٦ەوە کە لقی پارتی دێموکراتی کوردستان لە ئێراق دامەزرا، ئامانجەکانی سیاسی ئاشکرای بارزانی نەگۆڕ مانەوە: کوردان خوازیاری سەربەخۆیی نەبوون و بەڵکوو کەوتبوونە شوێن دروشمی "دێموکراسی بۆ ئێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان". ئەم ویستە لەسەر

کاغەز تەواو ئاقڵانە دەهاتە بەرچاو، بەڵام ناحەزانی بارزانی لە بەغدا — یانی پاشایەتیخوازان، نەتەوەپەروەرانی عەرەب، بەعسی و کومۆنیستەکان — براوایان بە قسەکانی نەدەکرد. ئەمە لایەنی ساکار و پاککردەی ئیشەکە بوو.

بە گومانی ئەم دژبەرانە کوردان خوازیاری دابڕینی بەشێکی ئێراق بوون، ئەو بەشەی بە هەق بە هی خۆیان دەزانی (و ئەگەر توانیباشیان بەشەکانی کوردەواری ئێران و تورکیا و سووریاشیان دەخستەسەر.) جا ئەگەر لەم کارەدا سەرکەوتوو بان، بە بڕوای دژبەران بە مانای تێکچوونی بنەڕەت و هەڵوەشانی ئێراقی بارناسک بوو. ئەم بۆچوونە بە گشتیی بۆچوونێکی هەڵە نەبوو: پاش دەسپێکی شەڕ لە **۱۹٦۱**دا زۆربەی کوردانی ئێراق هەر بەڕاستی لایان وابوو کە ئێستا هەلێکی وایان وە دەس هێناوە کە دەتوانن "پلە و بارودۆخێکی" تایبەتی بۆ خۆیان دابین بکەن, جا کە وایە ئەم پلە و بارودۆخە بۆچی سەربەخۆیی نەبێ؟ یەکێك لە یارانی نیزیکی بارزانی دەیگوت: "ئێمە تەنانەت ئەو وەختیش دەمانزانی کە ئەو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی تێدەکۆشێ."

لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست, بەتایبەت ئەو شوێنەی کە یۆنانییەکان بە "دووچۆمان"یان ناودێر کرد، دەسەڵات هەمیشە شتێکە وەك کۆ کردنەوەی سیفران پێکەوە, ئێوە یان خاوەنی دەسەڵاتن یام نین. ئەگەر ئێوە نەتانبێ, یەکی تر هەیەتی, هەر نەبێ کەسێك لە بابەت دەسەڵاتەوە وەك ئێوە بیر دەکاتەوە. کە وایە دەسەڵات بۆ دابەشین نابێ. ئەم ڕێوشوێنە لە هیچ جێیەك بە ڕادەی ئێراقی نوێ یەکتری نەدەخوێندەوە, کە وڵاتێ بوو دەسکرد و ئینگلیسییەکان لەسەر بێوشوێنی بەرژەوەندی جۆراوجۆر تێکیان کردبۆوە و ئەویش ئەم هەرێمانە بوون کە لە سەردەمی زۆر کۆنەوە هەتا ئێستا مێژوویان لەگەڵ مێژووی زۆرەملیداتێکەڵاو بووە. چاو خشاندنێك بەسەر پەیکەرە زلحۆل و بە هەیبەتەکانی پاشایانی ئاشۆریدا لە موزەی "لوور"ی پاریس و مووزەی "بریتانیا" لە لەندەن و مووزەی "مێترۆ پۆلیتێن"ی نیۆیۆرك بۆ لابردن و سڕینەوەی هەر شك و گومانێ لەم بارەدا کیفایەتە. جا بە هەر حاڵ هیچکام لە گەورەهێزانی سەدەی بیستەم لەسەر ئەم بڕوایە نەبوو کە پشتگیری سەربەخۆیی کوردستان بکا یا تەنانەت بۆ

پشتیوانی لە "خودموختاری" جووڵە و چورتەیەکی بێ. لە خودی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا لەبەر وەی ئێراق هێندێك وە پێش دراوسێکانی کەوتووە و تابشتی هەبوونی کوردانی هێناوە و ئیزنی داون جلوبەرگی کوردی بکەنە بەریان و لە فێرگە و دەزگا ئیدارییەکان و بلاڤۆك و کتێباندا بە کوردی بنووسن و بئاخێون، بە دڕدۆنگی و بێباوەڕی بۆیان دەڕوانی.[1]

ئەم بێ باوەڕییە ڕێشەدارە بە ڕەسمی لە پەیمانی سەعدابادا خۆی نواند کە لە ساڵی ١٩٣٧دا ئیمزاکرا و بە گوێرەی ئەو وڵاتانی ئێران و ئێراق و تورکیا بەڵێنییان وابوو پێکەوە دژی کوردان بکەنەوە چالاکی. پاشان ساڵی ١٩٥٥ لە پەیمانی بەغدادا, کە دەوڵەتانی بریتانیا و ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ڕواڵەت لە جل و قاپێلکی بەربەرەکانی لەگەڵ کومۆنیزمدا بەسەر وڵاتانی ناوچەیاندا سەپاند، ڕەنگی دایەوە. پێداهاتنەوەی ئەم ڕەوتە ساکارە و دەکرێ بڵێین کە ئەم هەزارە و دوولایەی بارزانی بۆ دەرباز بوون لە ڕێوشوێنیکایەی "کۆی سیفران" دەیکردن هەر لە هەوەڵەوە تێكشکانیان لە دوو بووە. کوردان چ بەر لە بارزانی و چ پاش ئەو بە دروستی بڕوایان وابوو کە بە تەنێ حکوومەتیان بۆ نارووخێ، هەروەك چۆن دوڵەتیش ناتوانێ ناسیۆنالیزمی کورد بنەبڕ بکا. وێڕای ئەمانەش تەواوی ئەم حوکماتانەی یەك لە دوایەیەك لە بەغدا دەهاتنە سەر دەسەڵات جار لەگەڵ جار توند و تیژ و شڕ و دڕتر دەبوون و لە پیت و بەرەکەتی داهاتی نەوت کە زۆربەی لە چاڵاوەکانی کەرکووك هەڵدێنجرا و لە نێوەڕۆکا دزی بوو لە ماڵی کوردان، ڕۆژ بە ڕۆژ تەیارتر دەبوون. پتری سەرکەوتنەکانی بارزانی، تەنانەت ئەو کاتەی کە لە پۆپەی درەوشانەوەدا بوو و کوردان لە هەموو شوێنێ گوێیان دەدایە ئەم ڕادیۆ شەپۆل کورتە پڕ "پارازیت"ەی بە سەرکەوتنەکانی ئەوی هەڵدەگوت, قەرزداری پشتیوانی تەکۆلۆی دەرەکی بوو. ئەم کارە هەمیشە بەغدای هەڵدەگڕاند. مەبەستەکە زۆر سادەیە و دیسان دەکرێ بە هاسانی بارزانی سەبارەت بە وەی وا لە بەرەی شەڕا وە دەستی هێناوە لە پشت مێزی

---

[1] – ئێراق خۆی ئەم ئیزنەی نەدابوو, بۆ ئەستاندنی ئەم تۆزکاڵەش کوردان گەلێ ساڵان خەباتیان کرد. "یۆنسی"

وتوویژا دۆراندوویەتی, سەرکۆنە بکرێ. ئەم شێوە کارە هەر لە کۆنەوە بۆتـە خـاڵی لاوازی کـوردان. بـارزانی جـاری وایـە ئەوەنـدە تامـەزرۆی هـەروگیفی رووخانـدنی حکوومەتانی بەغدا بوو کە قەت هێندە ئۆگری بیر کردنەوە لـەم بارەدا نەبوو کە بۆچـی هەڵومەرجی دانی خودموختاری کەمتاکورتی وەك یەکەم هـەنگاو بـۆ وەرگرتنـی قـانی بالآتر ڕەت دەکردەوە. لـەگەڵ تەواوی ئەمانەشدا کاتێك لـە تاراوگـە گەڕایـەوە هـیچ کەس تەنانەت بە خەون و خەیاڵیشیدا نەدەهات کـە دوژمنـانی خـەڵکی کـورد دەس بەرن بۆ هـەموو شـێوەیەکی خۆفنـاك کـە ئـاخری کردیـشیان. هێـشتا سـاڵی ١٩٦١ نەبڕابۆوە کـە هێـزی ئاســمانیی قاسـم ١٢٧٠ گونـدی کـوردانی وێـران کـرد؛ ئەمـە سزادانێك بوو کە لە چوارچێوەیەکی "شیاو"دا دەهاتە ژمار.

لـە خەیاڵ و فەرهەنگی بارزانیدا, واتەی "گەورە هێزان" بە مانای زەخـت خـستنە سەر هێندێك کرداری حوکماتان بوو. ئـەو پیـاوێکی شـەریف بـوو کـە بـەڵێنی خـۆی دەبردە سەر و بڕوای بە وادەی دیتران دەکرد. ئەو لەسـەر ڕەوتـی جـەغزی ئـەم دنیـا تایبەتەی خۆی پێی وابوو شانسی وەی هەیە کە ئەم "بڕوا" کوردییەی لای وایە کوردان لـەتەك نەتەوەکانی ترا جیاوازن و – واتە عەرەب نین، فارس و ترك نین – شیاوی ئەوەن ڕەوشتی باشتریان لـەگەڵ بکرێ، بپـارێزێ. بـەڵام دنیـا بایـەخەکانی خـۆی گۆڕیـوو و یاسای "گرشام"[1]ی دەکار دێنا و بێوچان لـەسەر حیسێبی کوردان و زۆرێك لـە گەلانی تر لـە بایەخی ئەخلاقی کەم دەکردەوە.

یەکەم شەڕی کوردستان بـە کـوژرانی قاسـم بـە دەس بەعـسییەکان لــە فێوریـەی ١٩٦٣دا ڕاگیرا. بەعسییەکان لـەڕێوە بە کوشتن و قەلاچۆ کردنی هەزاران کومۆنیست بە فیتی ئەمریکا، کە کەیفی بەم دەرفەتە سازبوو هەتا گـەورەترین حیزبـی کومۆنیـستی ڕۆژهـەلآتی نێوەڕاسـت لاواز بکـا، مـەیل و تاسـەی خۆیـان سـەبارەت بـە نوانـدنی زەبـروزەنگ نیـشان دا. وتوویـژی لێرولــەوێ دەسـتی پێکـرد. ئـەم وتوویژانـەش

---

١– تامس گرشام، پسپۆڕی دارایی، خەڵکی ئینگلستان، ١٥١٩–١٥٧٩.

هەروەك زۆرێك لە وتوویژەکانی دواتر لەسەر کێشەی کەرکووك شکستیان خوارد. ئەو دەوڵەتانەی لە بەغدا بە دوای یەکا هاتنە سەردەسەڵات، تێکڕا خواستی کوردانیان لەسەر کەرکووك و نەوتەکەی بردەوە پاش, ئەویش بە گوێرەی ئەم بەڵگەیە کە کەرکووك لە سەرەتای سەدەی بیستەما و بەر لە هەڵێنجانی نەوت لە چاڵاوەکانی, هەر لە بنەڕەتەوە شارێکی تورکماننشین بووە و جەماوەرێکی زۆریشی کورد و عەرەب لێ بوون. لە مانگی ژوەنا بەعسییەکان شەڕیان دەس پێکردەوە. ساڵح مەهدی عەمماش، وەزیری شەڕ، بە هەڕوگیفەوە دەیگوت ئەمجار سپا ئامادەیە و لە ڕاستیدا چالاکی تەنیا "ڕێپێوانێکی سادەی نیزامیی" یان "گەشت و گوزار و ڕابواردنێکی سەرچیا"یە. بەڵام سپا ڕایەکی تریش زەبری قورسی وێکەوت. لە ١٨ی نوامبری هەر ئەو ساڵەدا بەعسییەکان سەرنگوون کران و عەبدوسسەلام عارف دەسەڵاتی گرتە دەس. وتوویژێکی تر لە ١٠ی فێوریەی ١٩٦٤دا ئاگربەسێکی دیکەی لێکەوتەوە.

شەڕی دووهەمی کوردستان بە دوولەت بوونی ڕیزەکانی نەتەوەخوازانی کورد کۆتایی پێهات: تاقمی ئەحمەد – تاڵەبانی ڕایگەیاند کە قبووڵی ئاگربەس لە لایەن بارزانییەوە خەیانەت بووە بە خەڵکی کورد، ئەویش زیاتر لەبەر ئەوەی دەفتەری سیاسی کە ئەوان ئەندامی بوون تەنانەت پرسیشی پێنەکراوە. بارزانی لە مانگی ژووئیەدا بە ناردنی هێز و ڕاماڵینیان لەسەر سنوور دژکردەوەی نواند و تاقمی ئەحمەد – تاڵەبانی لەگەڵ کۆمەڵێکی چوارهەزار کەسی پەنایان بردە بەر ئێران. دەوڵەتی ئێراق دڵنوایی کردن و گێڕانێوە وڵات و بۆ شەڕ لەگەڵ بارزانی کێشانیە ژێر ڕکێف. ئەم ڕقەبەرایەتییە هێزی بارزانی لاواز کرد. ئیتر ئێستا بارزانی بە هێنانی ناوی تاڵەبانی، کە ڕقەبەرێکی لاو و خاوەن مرخ و لە باری نیزامییەوە هاوسەنگی خودی ئەو بوو, بە ئاشکارا هەڵدەچوو.

لە مانگی مارسی ١٩٦٥دا شەڕێکی زیاتر لە کوردستانا قەوما. عارف لە ڕووداوێکی گومان لێکراوی کەوتنە خوارەوەی باڵەفڕا کوژرا و "عەبدوڕڕەحمان عارف"ی برای جێی گرتەوە. لە مانگی مەی ١٩٦٦دا ئێراقییەکان هێرشێکی قورسیان دەس پێکرد کە ئامانجی دوولەت کردنی بەرەی کوردان و قوتبڕاو کردنی بارزانی

لە كەلوپەل و كەرەسەی "لۆژێستیكی" و دابڕانی بوو لە ئێران، كە ژیانێكی خودای بە ویۆە بوو. بەلاّم سەرەڕای یارمەتی جاشەكانی تاڵەبانی، دیسانیش تووشی تێكشكانێكی سەرشۆڕانە هاتن. لە چیای هەندرێن كە دەڕوانێتە ڕەواندز، بارزانی گەورەترین سەركەوتنی وە دەس هێنا و مانگێك دواتر عەبدوڕڕەحمان بەززاز، سەرۆك وەزیری غەیرە نیزامیی ئێراق، یەكێك لە گەورەترین داواكانی كوردانی قبوولّ كرد و بە ڕوسمی دانی بە دوو تۆو بوونی نەتەوەیی ئێراقا هێنا. بەلاّم سپای ئێراق بە دەسپێكی وتوویژ لەگەلّ تاڵەبانی، بەر لە داگیرانی وتوویژ لەتەك بارزانی، چەتی لەم كارە خست. بارزانی دەرهەلّبوو و وریایی دا كە "جەلال تاڵەبانی غەیانە و بێتوو ئەو بەشداری هەرچەشنە ڕێككەوتنێك بێ تازە من وتوویژ لەتەك هیچ كەسێكا ناكەم." هەروەها زیادی كرد: "تاڵەبانی نۆكەری هەموو لایەكە." لایەنگرانی بارزانی هەتا ئەمڕۆش بە تاقمی تاڵەبانی دەڵێن "جاشەكانی ٦٦". هەرچۆنێك بێ, لە بری ئاشتی، لەسەر ئاگربەسێكی تر ڕێككەوتن.

حیزبی بەعس لە ژووئیەی ١٩٦٨دا سەرلەنوێ هاتەوە سەر حوكم و سەددام حوسێن وەك پیاوێكی خاوەن توانای ئێراق هاتە سەر شانۆ و "ئەحمەد حەسەنولبەكر"ی سەركۆماری لە نموود خست. بەعسییەكان لە پێشدا بۆ تێكەوتن لەگەلّ كوردان دەستیان لەسەر دەست دانا و چاوەڕوانی دەرفەت مانەوە: جارێ گیرۆدەی پاڵاوتنی ڕیزەكانی سپا بوون و هەل و دەرفەتی گەڕانەوەی سەر بارزانییان نەبوو. لە باتیان "جاشەكانی ٦٦" ببوونە دەمڕاستیان و درێژەیان بە شەڕ دەدا. كاتێك لە مانگی ئاوریلی ١٩٦٩دا شەڕ بەگەرمە دەستی پێكردەوە, سپای ئێراق تووشی وەها زەرەد و زیانێك هات كە لە ژانویەی دوای ئەوا, سەددام حوسێن بۆ وتوویژ و دیدار لەگەلّ بارزانی چووە كوردستان و لە ١١ی مارسی ١٩٧٠دا, "ئەلبەكر"ی سەركۆمار، بەشی ئاشكرای ڕێككەوتنی نێوان بارزانی و سەددام حوسێنی لە سەر ڕادیۆ خوێندەوە: ئەم ڕێككەوتننامەیە هەبوونی "گەلی كورد"ی دەسەلماند؛ پێشمەرگەی دەكردنە سنوورپارێز و مافی خوێندن بە زمانی كوردی و دەكار هێنانی ئەم زمانەی لە دەزگاكانی دەولّەتی دا و دامەزراندنی ناوچەیەكی خودموختاری بە

ناوەندێتی شاری هەولێر قبووڵ دەکرد و بە قەرار دەبوو یەکێك لە یاریدەدەرانی سەرکۆمار کورد بێ و کوردان چەند وەزیرێکیان لە دەزگای دەوڵەتی ناوەندیدا هەبێ. کوردان هەتا ئەمرۆش کە باس دێتە سەر چوار ساڵەی پاش ئەم ڕێككەوتنە بە ناوی سەردەمی زێڕینی ئاشتی و تەسەلی و گەشە و هەڵدانی فەرهەنگی یادی دەکەنەوە.

بەلام دەتگوت سەرلەنوێ کوردان هەڵخەڵەتاون: بارزانی نەیتوانی دەوڵەتی ئێراق بۆ چارەسەر کردنی کێشە بنەڕەتییەکان پێمل بکا: کێشەی کەرکووك، دیاری کرانی هەرێمی خودموختار و کات و هەلومەرجی سەرژمێرییەکی ورد و باریك کە بۆ سوور بوونەوەی ئیددیعای کوردان – لەسەر کوردنشین بوونی کەرکووك – تەواو پێویست بوو، هەر وا مایەوە و بارزانی ملی دا بە ڕێككەوتننامەیەکی لێڵ و نادیار کە بۆ دیاری کردنی کەوشەنی ناوچەی خودموختار ماوەی ساڵێکی بۆ سەرژمێری دانابوو. ئەمە بەم مانایە بوو کە هەتا ڕاگەیەندرانی خودموختارییەکی خڕ و پتوون لە ماوەی چوار ساڵان دا نێوەرۆکی ئەم ڕێككەوتننامەیە جێی باوەڕ و ماکەی بەڕێوەچوون دەبوو. کوردەکانی ئێراق لەسەر ئەم خاڵە پێدادەگرن کە خۆ گنخاندن و فریو و تەفرەدانی دەوڵەت هەمووی لەسەر ئەمە ساغ ببۆوە کە سەرژمێری قەت بەڕێوە نەچێ. وێڕای ئەمەش سیاسەت و ڕەوتی "وە عەرەب گێڕان"ی ناوچە کوردنشینەکانی دەوروبەر و نێوخۆی کەرکووك و تەواوی ناوچە نەوتییەکانی بە دەستوبرد بەڕێوە دەچوو. تەواوی کرێکارانی کورد لە مەڵبەندە نەوتییەکانی کەرکووك دەرکران. توێژەرانی کورد حیسابیان کردووە کە لە ماوەی سەردەمی "تێپەڕ" یا گواستنەوەدا تەنیا لە سەتا ٧ تا ١٢ی بودجەی ئاوەدان کردنەوەی ئێراق تایبەت دراوە بە ناوچەی خودموختار و تەنیا چوار گەلاڵەی ئاوەدان کردنەوە و گەشە پێدان لە کوردستان بەڕێوە چوون. ئیزنی خوێندکارانی کورد بۆ خوێندن لە زانکۆکانی ئێراق و وەرگیرانیان لە خوێندنگەی ئەفسەریدا زۆر لەمەش کەمتر بووە.

لە وەختایەکا وتوویژ و دانیشتنی تەكولۆ و لێرولەوێ هەر وا درێژەی هەبوو، بەغدا ڕایگەیاند کە جۆری خودموختاری بەر بیری خۆی بە شێوەیەکی یەكلایەنە لە ڕۆژی چوارەمین ساڵوەگەڕی مۆر کرانی پەیماننامەی "ی مارسی ١٩٧٠دا دەخاتە

گەڕ. بە خورد بوونەوە لەم کەش و هەوا لەرزۆك و بێمتمانەیەی بە هۆی شەڕ و پێکدادانی نێوە نێوەش هەر دەهات و خراپتر دەبوو، دەردەکەوێ کە کاسەی سەبری بەعسییان کەلاوی کردووە و تەمایان وایە بێتوو کوردان قبوولی نەکەن – کە وێدەچوو نەشیکەن – دەس بکەنەوە بە شەڕ. بەلاّم هێندێك لە کوردان دووشکن سەبارەت بە وەی بارزانی ئەم رێككەوتنەی بە ڕاست و پتەو زانیبێ. (خودی بارزانی بە دەربڕینی ئەم مەبەستە کە رێككەوتن هەر لە بناغەوە فێڵ و فریو بووە و ئەو بەر لە ئیمزا تێیگەیوە, پتر پەلوپۆی ئەم گومانەی دا.)

یەکێك لەم کەسانەی لە نیازپاکی بارزانی دووشك بوو، "عوبەیدیللا"ی کوڕە گەورەی بوو کە هەلاّتە بەغدا و ڕایگەیاند باوکی "ناخوازێ خودموختاری وەگەڕکەوێ، تەنانەت ئەگەر کەرکوك و تەواوی نەوتەکەشی بدەنێ. سەلماندنی یاسا و رێسای خودموختاری هەموو شتێکی لێدەستێنێتەوە، کەچی ئەو دەیەوێ خۆی هەر وا تەنیا فەرمانڕەوای کوردستان بێ." بەلاّم مەسەلەکە هەرچۆنێك بێ، دروست سێ ڕۆژ بەر لە ساڵوەگەڕی ئیمزای رێككەوتننامەی مارس – کە ئاخرین دەرفەتی قبووڵ کردنی مەرجەکان بوو – سەددام حوسێن پێشنیاری کرد کەرکووك نیوە بە نیوە دابەش بکرێ. بارزانی ئەم پێشنیارەی بردەوە پاش، کە لە یەکەم نیگادا بە ڕادەی تەواو وەك هەڵوێستێکی شیاو دەنوێنێ: پاش ئەم گشتە زوڵم و زۆر و زەبروزەنگە – بۆ وێنە گێڕانی پیلانی کوشتنی بارزانی بە چەند جار – هیچ لایەك متمانەیان بە یەگدی نەمابوو و لە پێداچوونەوەدا ڕوون دەبێتەوە کە رێككەوتننامەی ١١ی مارس تەنیا هەل و دەرفەتێك بوو بۆ خۆ سازدانەوە و پشوو نوێ کردنەوەی هەردوولا.

عەبدورڕەحمان قاسملوو، ڕێبەری کوردەکانی ئێران کە بە مەبەستی خستنە ژێر پرسیاری ڕێبەرایەتی بارزانی بەڵگە و بۆنەی تەواوی بە دەستەوە بوو، لەم کردەیەی بارزانی، واتە ڕەت کردنەوەی پێشنیاری سەبارەت بە کەرکووك، گەلێ نارەحەت بوو. قاسملوو لەم وتانەدا کە دە ساڵێك دواتر دەریبڕی، پەرۆشی و پەژارەی نواند کە ئەم رێككەوتننامە زۆری قازانج بۆ کوردان بووە و لە خۆوە پێملی نەبوون. ئەو لێرەدا بارزانی بە تاوانبار دەزانی. قاسملوو لای وا بوو کە ئەم تەمایەی بارزانی

هەڵەیەکی دزێوی ئاشکرا بووە، ئەویش نەك لەبەر وەی کە بەغدا یاریدەی قاسملووی دەدا. دەیگوت: "کوردەکانی ئێراق هەتا ئێرە چیان وە دەس نەهێناوە، چونکە لە سیاسەتدا پتر کەوتوونە شوێن پێی هەست هەتا ئاوەز. ئەوان یان هەموو شتێکیان دەویست یان هیچ شتێك، هەموو شتێکیان یان ڕەشیڕەش دەبینی یام سپیسپی. هەر لە بۆیە ئەشتەکیان وەگیر نەکەوت. لە سیاسەتدا ناتوانی یا ڕەشیڕەش بی یا سپیسپی. ئەوەی ئەمڕۆ دەڵێ سبەی بووز ناخوا، من لام وایە دەبوو بارزانی مامەڵەی کەرکووکی قبووڵ کردبا، چونکە ئەم هەلە، خودموختارییەکەی سەقامگیر دەکرد و لە داهاتوودا دەیتوانی بۆ ئەوی تر شەڕ بکا. ئێوە بیهێننە بەرچاو، بێتوو خودموختارییەکەی هەبوایە و هێزەکانی بە دەق نەشکاوی مابانەوە, ئەو کاتەی لە ١٩٧٩دا شۆڕشی ئێران قەوما چ هەل و دەرفەتێك دەبوو بۆ کوردەکانی ئێران؟"

وە هەر حاڵ، لە ١١ی مارسی ١٩٧٤دا بەغدا ناوچەی خودموختاری ڕاگەیاند کە هێندێك زیاتر لە نیوەی ئەو ٢٩٠٠٠ میلە چوارگۆشەیە بوو کە کوردان داوایان دەکرد. کەرکووك لەم بازنەیە دەرهاویژرا بوو. هەر لەرێوەش شەڕ هەڵگیرسا و کەسیش واقی نەبردەوە. هۆردووی بارزانی زۆر لە خۆی خاترجەم بوو: کوردان ٤٠٠٠٠ پێشمەرگەیان لە بەرەکانی پێشەوە دامەزراند بوو کە لە لایەن ٦٠٠٠٠ چەکداری هێزی بەرگری میللییەوە پشتیوانییان لێ دەکرا. لە ناوچە دوورەدەستەکانەوە هەتا دەگاتە بەغدا، خەڵکێکی زۆریان ڕەگەڵ کەوتبوو: ٦٠ دوکتۆر، ٤٥٠٠ مامۆستای قوتابخانە، ٥٠٠٠ پۆلیس و ژاندرمە، ١٦٠ ئەندازیار و ١٠٠ ئەفسەر. لەگەڵ ئەمەشدا شەڕ گەلێ قورس و ماڵوێرانکەر بوو، ورەی تێك شکاندبوون و لە هەمان کاتا هەستی تۆڵەئەستاندنەوەی توند و تیژی لە نەتەوەپەروەرانی کوردا گڕ دابوو. هەر لەرێوە پێشمەرگەکانی بارزانی تۆقین و بازرە بوون و لە ماوەی شەش مانگێکا ناوچەی وایان بۆ دوژمن چۆل کرد کە لە ١٩٦١ەوە بەرەو ئێرە دەسەڵاتی دەوڵەتی تێدا نەمابوو. زۆر بەر لە بارینی بەفر، ناوچەی چالاکیی نەتەوەپەروەرانی کورد کەوتبووە جەغزێکی بەرتەسك کە پاڵی وە باکووری ڕۆژاوای خاکی ئێران دەدا. ئا لێرە تۆپخانەی دوورهاوێژ و مووشەکەکانی زەوی بۆ حەوای

ئێران پشتیوانی لـێ‌دەكردن. لە ڕاستیدا ئەوەنـدە سـەر بـە دەوڵـەتی شـا بـوون كـە دەوڵەت تەنانەت خورد و خۆراك و جگەرەی ئەمریكاییشی بـۆ دابـین دەكـردن و وای لـێ‌هاتبوو كە ئیدی تۆو و دانەوێڵەی پێ‌بژیوی خۆیان نەدەچاند. پاشان لە ٦ی مارسی ١٩٧٥دا شا لەپڕ یارمەتییەكانی خۆی بڕی. بارزانی قەت بـە ڕاتڵـەكانی ئـەم ڕووداوە وە خۆ نەهاتەوە. وەها ئاڵۆزكاو و پەرێشان بوو كە فەرمانی شەڕوەستانی خۆیـانی دا — تەمایەكی كە نەتەوەخوازیی كوردی لە بنج و بناوانەوە لەرزاند — ئەویش بـە گـوێرەی ئەم بەڵگەیە كە درێژەی شەڕ لەگەڵ ئێـران و ئێـراق سـەری دەگاتـەوە سـەر قەلاچـۆ كرانی گەلەكەی.

وە هەر حاڵ پارتی دێموكراتی كوردستان ڕایگەیانـد كـە لـە درێـژەی شـەڕا دوو هەزار پێشمەرگەی كوژراوە. كوژراوی كـوردان، تەنانـەت بـە بـێ حیـسێب كردنـی خەڵكی ئاسایی، ڕەنگە زۆر لەوە پتر بووبێ. یەكێك لەو نەتەوەپەروەرانەی ئەوێ دەمێ بیست ساڵانە بووە، زۆر دواتر بە هەڵوەراندنی فرمێـسك باسـی ئـەم تەمایـەی بـارزانی دەكرد: "بارزانی بۆ ئێمە چەشنێ بوو لە خوا، ئەو ئێمەی بە دنیا ناساند و چما درێـژەی بە خەبات دابا، یەكێك دەبـوو وەك لێـنین بـۆ سـۆڤیەتەكان و جـۆرج واشـینگتۆن بـۆ ئەمریكاییەكان."

ئەم ڕاتڵەكانی بیر و زەینە تەواوی ئەم كوردانەی — لە هەر چین و توێـژێك — كـە دژی دوژمنان و سەركوتكەرانیان یەكیان گرتبوو پرزەی وێخستن و لێكی‌بڵاو كـردن. زۆربەی ئەو كوردانەی غەیبەتی بارزانییان دەكرد — بەتایبەتی لاوان — لێیان سوور بوو كە بارزانی وای بە باش زانیوە هەرەس بـە شـۆڕش بێنـێ و ڕێبەرایـەتی نەكەوێتـە دەس كەسی تر. جارێكی تر نەتەوەپەروەرانی كورد تێك‌بـەربوون. دە سـاڵێك پـتر پێـچوو. هەتا توانیان ڕیزەكانی خۆیان ڕێك‌خەنـەوە و دیـسان دژی سـەددام حوسـێن بـچنەوە مەیدانی خەبات.

جا بەڵام ژێنێراڵ بارزانی: بارزانی پاشـماوەی تەمەنی نـزم و نـەوی لـە تاراوگـەی ئێران و ئەمریكا، واتە ئەم دوو وڵاتەی خەیانەتیان پێكردبوو، ڕابوارد. ئەو لەم ماوەیەدا هەل و دەرفەتێكی چاكی هـەبوو هـەتا نـەك تـەنیا بـیر لـە ئاقڵمەندانـە نـەبوونی ڕەت

کردنەوەی پێشنیاری سەددام بۆ دابەشینی کەرکووك بکاتەوە، بەڵکوو دەکـرا نەفامانـە بوونی بـڕوا و متمانـە بـەم غەوارانـەی وەهـا تەمایـەکیان پێگـرت، وەرداتـەوە. وەهـا پاڵوێـدان و متمانەیـەك بـاوێکی لـەمێژینــە بــوو, ڕەوتێکــی دوور و درێــژ کــە دوای گەڕانەوەی لـە تاراوگەی سـۆڤیەت سـەرەتا بـە نابـەدڵی و پاشـان وەهـا بـە سـووك و سافیلکەیی وە شوێنی کـەوتبوو کـە ڕەخنـەگران و وردبینـان تەنانـەت سـەبارەت بـە تێگەیشتوویی و هەستی لێكهەڵاواردن و بیروبڕوای نەتەوەخوازانەی کەوتبوونە شك و گومانانەوە.

# بەشی ٦

## کیسینجێر: چالاکی تەبلیغاتی لە نێو هۆزێکی چیانشیندا

فڕین لە مەسکەو و دابەزین لە تاران، لە ڕۆژی ٣٠ی مانگی مەی ١٩٧٢دا بۆ ڕێزدار ڕیچارد ئێم. نیکسۆن سوکنایی دڵ و ئۆخـژنی بیـر بـوو. بـە قـەولی دوکتـۆر هێنری کیسینجێر، ڕاوێژکاری تـەناهی نەتـەوەیی وی، "دەربـاز بـوون لـە جـەغزێکی تەنگی بێ جەمسەر." هەشت ڕۆژی لە کرێملین تێپەڕ کردبوو کە خـۆی پێی‌ـدەگوت: "ئازار و ئەشکەنـجەی خەست‌وخۆڵ." لەو ماوەیەدا نیکسۆن بە حـەوڵ‌ودەولێکی زۆر کۆبوونەوە و کاری وت‌وویژی لەمەڕ پەیـمانی ساڵتی ١ی سەبارەت بـە چەك‌وچـۆڵی ئیستراتیژیکی فرە خاپوورکەر ڕاپەڕاند. بەهارێکی پڕ وەڕەزی, بەڵام سەرکەوتووانە بوو کە کاردانەوەی بەرچاوی هێرشی هێزەکانی ویێتنامی بـاکووری بـوو بـۆ سـەر ویێتنـامی باشووری لە ماوەی ڕۆژانی جێژنی پاك‌دا و هـەروەها وەسـتانی پەلامارەکـەی لـە ژێـر تەوژمی بۆردومانی قورسی ئەمریکا و مین‌ڕێژ کردنی بەندەرەکانی ویێتنامی باکووری لـە لایەن ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای لـێ‌کەوتەوە. تەماکانی نیکسۆن سەبارەت بـە ویێتنامی باکووری چـڕەوگوڕە و دمەقڕەیـەکی زۆری بـە شـوێنەوە بـوو, بەتایبـەت بـۆ یەکێتی سۆڤیەت – گەورە پشتیوانی ویێتنامی باکووری – ئەوەندەی سەرشۆڕی لـە دوا

بوو کە سەفەری نیکسۆن بۆ یەکێتی سۆڤیەت هەتا سەعاتی ئاخریش بە تاڵەموویەکـەوە بەندبوو. کە بێتە سەر پێکگرتنی مانەوە لـە مەسکەو و لـەنگەر خـستنێکی بیـستودوو سەعاتە لـە تاران و باس لـەسەر ئەم ڕوانگانەی نێوەنێوە کیسینجێر سەبارەت بـە سیاســەت بـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــە

گشتی لەتەك محەممەد ڕەزاشادا دەیهێنانە گۆڕ و چێژی لێوەردەگرتن, دیداری تاران بۆ ئەمریکاییەکان شتێکی ئازاد و دوورە بەند و بەسترانەوە بوو. بەڵام بۆ شا وەها نەبوو. ئەو ئەم دیدارەی بە خورد بوونەوە لە ملانەیەکی گەورەی نیزامیی ڕێك خستبوو کە جێی خۆی بوو لە سەر وردەکارییەکانی قسە و باس بێنەگۆڕ. دوو خولی وتوویژان – زیافەتێکی گەورەی شەو و نێوەڕۆژەمێکی ساکاریشی لەسەر بێ – چاك بەڕێوە چوو. نیکسۆن و شا هەرتك دەیانزانی چیان دەوێ و خواستەکانیان یەکتری دەگرتەوە: نیکسۆن تەمای وابوو کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە شەڕی هیندوچین دەرباز کا و دەیویست پشتیوانی لەم دەسەڵاتانەی ناوچەی ئاسیا بکا کە دەتوانن لە بەرامبەر کومۆنیزمدا پارێزگاری لە خۆیان – و واشینگتۆن – بکەن، بەڵام بە بێ هەنتەشی نیزامیی ئەمریکا لە ناوچەدا.

ئەوەی زۆر دواتر بە ڕەوشتی نیکسۆن ناودێر کرا، تەواو ئەو شتە بوو کە لەگەڵ حاڵوباڵی شا دەهاتەوە. ئێستا کە بریتانیای گەورە لەبەر کەم کردنەوەی خەرجوبەرجان هەنتەشی مێژوویی خۆی لە ڕۆژهەڵاتی سۆئێز کۆتایی پێهێنابوو، ئێران خۆی بە دەسەڵاتێکی فامیدە و لێوەشاوە دەزانی بۆ ئەوەی ئەم بۆشایی هێز و دەسەڵاتە پڕکاتەوە و هێوری و ئارامی کەنداوی فارس کە دووبەش لە سێبەشی بەرێکردنی نەوتی جیهان بە وێدابوو, دابین بکا. بێگومان ئەسپاردنی وەها ئەرکێك بە ئێران, عەرەبستانی سعوودی کە گەورەترین بەرهەمهێنەری نەوتی ناوچەی کەنداو بوو و هەروەها ئێراقیش کە ولاتێکی خۆ بە زلزانی بنیاتخواز و خاوەنی دووهەمین سەرچاوەی نەوتی ناوچە بوو و خۆشی بە جڵەوکێشی وێنەدەرێ دەزانی، تووڕە و پەرێش دەکرد. "هەرچی شا دەیەوێ وێی دەن." لە وتارێکا هەر بەم سەردێڕەوە کە لە گۆڤاری "هارپێر"دا چاپ کرابوو، پێشبینی دەکرد کە ئەم هەڵوێستە بە مانای تەیار کردنی شایە بەم ئامرازانەی دەوڵەتانی پێشووی ئەمریکا خۆیان لێ کلا کردبوو: دەس ئاوەڵا بوون بۆ کڕینی ئامراز و چەكوچۆڵی پێشکەوتە و زانستیی پسپۆڕیی ئەمریکا. نرخی نەوتی خاو کە لەمێژبوو دابەزیبوو، ئێستا ڕووی لە هەستانەوە بوو و شا بۆ دامرکاندنی مەیل و تاسەی نیزامیی خۆی پوولی تەواوی بە دەستەوە بوو.

کاتێك ئەمیر ئەرسەلان ئەفشار، گەورە باڵوێزی ئێران لە واشینگتۆن لە شای پرسی کە داخوا ڕێزدار نیکسۆن لە وەختی دیدارەکەی تارانیدا وڵامی خواستەکانی داوەتەوە یان نا، شا وتی: "بەڵێ، زۆرتر لەوەی من دەمەویست، پتر لەوەی چاوەڕوانیم دەکرد." لە ڕاستیدا ئەم دیدارە بە ناچار بۆ شا و مەلامستەفا بارزانی وێنەی ئەو حیکایەتەیە کە مەترسی دوعا و پاڕانەوە گیرابووەکان دەخاتەوە بیر: نیکسۆن بێ ئەوەی خۆی بزانێ بەستێنی شڵەژانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و ڕووخانی حکوومەتی شای خۆش کرد. بە جووڵاندنەوە و دنە دانی لا و لایەنی خۆبەزل زانانە و زۆردارانەی کەسایەتی شا و ئیشتیای تێرنەخۆرەی بۆ وە دەس هێنانی چەكوچۆڵی نیزامیی ئەمریکا, پاڵی پێوە نا هەتا ئابووری ئێران بەرەو خاشەبڕ کردن بەرێ و هورمی سست و لاواز کا و بەم شێوەیە ڕێگا بۆ شۆڕشی ئیسلامی ئایەتوڵڵا ڕووحوڵڵا خومەینی لە پێنج شەش ساڵی دوایدا تەخت بکا.

سەرکۆمار بێ ئەوەی بە وردی بیر لە ئاکام و داهاتووی شیمانەیی ئەم کارە بکاتەوە, لێرا هەرچۆنێك دەبێ و دەکرێ شا پتر ڕازی بکا. نیکسۆن ڕزامەندی دەربڕی کە بەشێکی کەم لە خەرجوبەرجی درێژەی شەڕی بارزانی لەگەڵ دەوڵەتی ئێراق دابین بکا. ئەم تەما سەیرە کە بە مانای دەس هەڵگرتن لە هەڵوێست و سیاسەتێك بوو کە ئەمریکا لەمێژ بوو بە توندی کەوتبووە شوێنی, کوردانی مەحکووم بە یەکێك لە مسۆگەرترین شکستەکانی مێژووی خەباتی خۆیان کرد و کۆتایی بە ڕۆژگارانی دەسەڵاتی بارزانی بەسەر جووڵانەوەی نەتەوایەتی کوردا هێنا.

یەکەم کەسێکی کە لە "میکانیسم"ی ئەم دوو کارەساتە حاڵی بوو، جۆرج دابلیوو. باڵ، یاریدەدەری پێشووی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو. کۆشکی سپی لە تێکۆشانێکی یازدە سەعاتە و سەرنەکەوتوودا، لە ساڵی **١٩٧٨**بانگی هێشتەوە هەتا بە جۆرێك شا لەم گێرە و کێشەی کە ئاکامی نەفامییەکانی خۆی بوون ڕزگار بکا. "باڵ" لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکانیدا نووسی: "هەر ئەو دەمەی شامان بە ناوی پارێزەری بەرژەوندی و قازانجی خۆمان لە کەنداوی فارسا قبووڵ کرد سەرمان وێ هێنا ...

وامان نواند کە دەتگوت هێزێکی هاوشانی ئەمریکایە." لە ڕاستیدا "ڕادەی شوێنی ئەم هاوپەیمانە لەسەر سیاسەتی ئەمریکا وەها بوو کە شا زەحمەتی وەبەر خۆی نەنا شەریکی ئەمریکایی گچکەتری ئاگادار کاتەوە کە کۆتایی بەرنامە نیزیکە." ئەمە ڕستەیەك بوو کە کومیتەی هەڵبژێراوی مەجلیسی پیرانی ئەمریکا, بە سەرۆکایەتی سەناتۆری دێموکرات، ئووتیس جی. پایك، لە نیۆیۆرك، لە ساڵی ١٩٧٥دا لە کاتی پێداچوونەوە بە بەڵگەنامە نهێنییەکانی سەبارەت بە چالاکی پیدزکانەی "سیا" دەکاری هێنا. ئەم کومیتەی توێژینەوەیە پاش گەڕیانی واترگێت پێکهات کە لە ئووتی ١٩٧٤دا نیکسۆنی ناچار کرد دەس لە کار وەکێشێ.

ڕاپۆرتی نهێنی کومیتەی پایك بە دوور و درێژی باسی چالاکی پیدزکانەی "سیا"ی لە ئانگۆلاوە بگرە هەتا کوردستان دەخستە ڕوو. ئەم ڕاپۆرتە کە لە ساڵی ١٩٧٦دا سەری لە ڕۆژنامە و گۆڤاراندا قوت کردەوە دەریدەخا کە شا چلۆن بە پێی بۆرەبەڵێنی و ڕەزامەندی ئەمریکا, لە پێشدا بارزانی بۆ هەڵگیرساندنەوەی شەڕ و شووڕ دنە دا و پاشان هەر کە لە ساڵی ١٩٧٥دا خواستەکانی دابین بوون – بێ ئەوەی بە قەت سەرەموویەك واشینگتۆن ئاگادار کاتەوە – لەپڕ کوردانی خۆڕایی کرد و بۆ تۆڵەی بەغدای بەجێ هێشتن. ڕاپۆرتەکە دەیگوت کە کوردان بۆ تاران و واشینگتۆن ئەشتەك نەبوون جگە لە "پەتەی کایە". "گۆپاڵ و ئامرازێکی یەگجار باش بوون کە بۆ لاواز کردنی دەسەڵاتی ئێراق و بەرگری لە تەنینەوەی فیتنە و ئاژاوەگێڕی ئەم وڵاتە کەلکیان لێوەرگیراوە." ئەم ڕاپۆرتە سەرەڕای ڕاتڵەکان و سەرسوڕمانێکی کە بە ئاشکرا کردن و لە هەرادانی بەدی هێنا، بە ناخی سەمەدە جیا جیاکان و زۆرتر دڕاودڕ و بۆندڕی و لێکدانەوە چەواشەکانا ڕۆنەدەچوو, کە ئەم تێکەڵییەی لەگەڵ کوردان بە شێوەی کتێبێکی سەرلەبەر خەیانەت و غەدر و فریو دەخستە ڕوو.

ئەم تەما بنەڕەتییانەی کە نیکسۆن لە وەختی دیدارەکەی تارانا گرتی، لەگەڵ سیاسەتی ئەمریکا یەکتری نەدەخوێندەوە کە پەیتاپەیتا دووپات دەکراوە و داکۆکی دەکرد کە نابێ بەرزەفڕی نیزامیی و ژێئۆپۆلۆتیکی شا گەشە و پەرەیان پێبدرێ. شا لە هەڵگێڕانەوەی دژایەتی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ یارمەتی دانی بارزانی بە

دژی دەوڵەتی ئێراقیش سەرکەوتوو بوو. لە هیچ شوێنێکی ڕاپۆرتی چلوسێ لاپەڕەیی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا کە هەڵگری گەلێ خاڵی گرینگ لە بابەت وتوویژ و بەڵێنەکانی نیکسۆن بوو لە مەودای دیدارەکەی تاراندا، ئاماژەیەکی سەبارەت بە یارمەتی بارزانی تێدا نەبوو. (زۆر وێدەچێ کیسینجێر لەم بابەتەوە هیچ ئاگادارییەکی نەدابێتە "ویلیام ڕاجرز"، وزیری دەرەوەی ئەمریکا، چونکە یەکبین لە پای سەری دەدا و ئاخرییەکی ساڵێك دواتر جێگاکەی گرتەوە.) کیسینجێر بە گوێرەی شێوەی نەهێنیکاری باوی خۆی قەت نەیگوت کە ڕاست کەنگێ کەوتە سەر ئەم بیرە کە دەبێ ئەمریکا پشتگیری کوردان بکا. داوید کیمچە، لە کاربەدەستانی باڵای دەزگای پاراستنی ئیسرائیل، بە شێوەیەکی لێڵ و تەماوی دەنووسێ کە کیسینجێر بەر لەوەی – سەرەڕای نارەزامەندی وەزارەتی دەرەوە – بێتە سەر بڕوای ئێمە (ئێران و ئیسرائیل) بۆ دنە و یارمەتی دانی بارزانی، بێبڕانەوە لە ڕەوتی هەوڵ و تێکۆشانەکانمان ئاگادار دەکراوە. بە پێی بەڵگەنامە ڕەسمییەکان شا لە نیکسۆن و کیسینجێری ویستووە لە بارزانی ڕابسپێرن و ئەوانیش وەهایان کرد. ڕەوتەکە ئاوا ساکار دەکەوتە گەڕ. گۆڕینی هەڵوێست بە ڕادەیەك گشتیی بوو کە کیسینجێر ئەم چالاکییەی لە پەردەیەکی نەهێنیکارییەوە پێچا و تەنانەت وەزارەتی دەرەوەشی ئاگادار نەکردەوە. لە ماوەی سێ ساڵاندا وەزارەتی دەرەوە و "سیا" بە دژی ناردنی یارمەتی نەهێنیی بۆ کوردان بە پێی داخوازی ئیسرائیل و ئێران ڕایان دەربڕیبوو. (لە ڕاستیدا سێ مانگ بەر لە دیداری تاران خودی کیسینجێر بە هاودەنگی وەزارەتی دەرەوە لەسەر بەڕێوەچوونی وەها گەڵاڵەیەك نارەزامەندی دەربڕیبوو.) بارزانی لە نوامبری ١٩٧١دا توانیبووی پێوەندی بکا لەگەڵ تامس کارۆلان, کاربەدەستی باڵای بەشی سیاسی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیرووت، بەڵام واشینگتۆن پێداگری کردبوو کە کارۆلان تەنیا گوێ بداتە قسەی کوردان و وریایان نەکاتەوە, چ بگا بە دانی بەڵێنی یارمەتی. پەیوەندی بەیرووت هەروا مایەوە و پاش پێکهاتنی تاران ئیتر تەواو لە برەو کەوت. گۆڕانی هەڵوێستی نیکسۆن هەتا ڕادەیەك پەردەی نەهێنی بەسەر کێشرا کە لە ئووتی ١٩٧٢دا ڕیچارد هێلمز,

سەرۆکی سیا، دەستووری دا بە ئارتور کالاهان، بەرپرسی "سیا" لە تاران کە لەم بابەتەوە هیچ شتێك بە جۆزێف فارلەند، بالۆیزی ئەمریکا لە ئێران، نەڵێ. ئەم کردەیەی هێلمز کارێکی دروست بوو، چونکە "ڕاجرز" وەزیری دەرەوە بۆ ئەم کارە ئاگادار نەکرابۆوە.

بناغەی ئەم هەڵوێستە نوێیەی ئەمریکا وەرگرتن و ناسینی دەوڵەتی ئێراق وەك وڵاتێکی "دەسکرد" بوو: بریتانیا پاش شەڕی یەکەمی جیهانی بە پێی بەرژەوەندی کێشەی نەوت، پارێزگای زۆربە کوردنشینی مووسڵی خستبووە سەر بەشی عەرەبنشین و پڕجەماوەرتری باشوور و وڵاتی ناوبراوی بەدی هێنابوو. ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دەسپێکەوە ئەم وڵاتە نوێسازەی دەسی بریتانیای بە ڕەسمی نەناسیبوو و تەنیا زەمانێك ڕەزامەندی دەربڕی کە بە دە ساڵ دواتر شەریکە نەوتییەکانی ئەمریکای لە ناوچە نەوتییەکانی کەرکووك بەشدار کرد. لەوە بە دوا ڕێز دانان بۆ سنووری ناسراوەکانی نێونەتەوەیی کەوتە ناوەندی بازنەی ئەم ڕێوشوێنەی کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ پشتیوانی لە سەربەخۆیی و دەسەڵاتدارێتی و پاراستنی تەواوێتی خاکی وڵاتان کردبوویە ڕەوت و ڕێباز. ئەم کارە بۆ کوردی تەواوی وڵاتان بەم مانایە بوو کە هەر شتێکی وا بۆنی خودموختاری لێوە بێ، لە ڕوانگەی واشینگتۆنەوە گومان لێ کراوە. واشینگتۆن بێپسانەوە لە بەرامبەر کوردانا پشتیوانی لە ئێران و ئێراق دەکرد و تێکۆشانی بێوچانی ئەوانی لە بۆ تواندنەوەی کوردانی نەدێنایە بەرچاوانی. (کاغەزبازی وەزارەتی دەرەوەش یارمەتی ئەم ڕەوتەی دەدا: بۆ وێنە وەزارەتی دەرەوە قەت هەڵوێستێکی وای نەگرت کە هەموو کوردان بگرێتەوە یا ئەوان بە ناوی تاقمێکی قەومی یان جەماوەرێکی بەرچاو بێنێتە ژمار. وەزارەتی دەرەوی ئەمریکا و تەواوی وڵاتانی ڕۆژاوایی تورکیایان بە بەشێك لە ئورووپا و ئێران و ئێراقیان بە بەشێك لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست دەزانی و کوردانی ئەم وڵاتانەیان وەك خەڵکێکی پێخوستی زۆرەملی، بەڵام جاری واش چەشنی کۆسپی سەرەڕێ دێنایە بەرچاو.)

ئەمەی کە نیکسۆن بەر لە پاشگەز بوونەوە لەم هەڵوێست و سیاسەتە کۆنباوە هەتا کوێ بەم ڕەوتەی زانیوە، هێشتاش ڕوون نیە. وتەکانی کیمچە دەیسەلمێنێ کە بەر لە

دیداری مانگی مەی ١٩٧٢ی تاران زۆریان بیر لە ئاکامی ئەم ڕەوتە کردۆتەوە. هەتا ئێستا بەڵگەیەك لەمەڕ وتوویژەکانی سەرۆك نیکسۆن و شا بڵاو نەکراوەتەوە. ئەوەی نیکسۆن و کیسینجێر دەربارەی کوردان دەیانزانی – ئەگەر زانیبێتیان – یا باشتر بڵێم، پێیانخۆش بوو بیزانن، هێشتاش جێی باس و لێپرسینەوەیە. بیست ساڵ دواتر، کیسینجێر لە وتەیەکدا کە دەکرا بیخەیە سەر حیسێبی خەفەت خواردن یان دان هێنان بە پارێزڕانەگرتنی ڕابردۆوە, پێی لێ نا: "ئەشتەکی ئەوتۆمان سەبارەت بە کوردان نەدەزانی ... لامان وابوو جۆرە هۆزێکی چیانشینن." بەڵام بە گوێری وتەی هێلمز کە پاش ئەوەی نیکسۆن لە سەرۆکایەتی "سیا"ی لا دا و بوو بە گەورە باڵوێزی ئەمریکا لە تاران، ئەم نرخاندنە دوورە لە حەقیقەت. هێلمز دەڵێ: "لە پێت و بەرەکەتی هەبوونی "کالاهان"ەوە, سەرۆکی بەشی "سیا" لە تاران، کە یەکێك لە کارناسانی کاروباری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بوو، زانیارییەکی زۆرمان لەمەڕ کوردانەوە هەبوو." کەترەخەمی سەرکۆمار سەبارەت بە کەلك وەرگرتن لە ڕاپۆرتەکانی دەزگای زانیارییەوە, گیروگرفتێکی کۆنی ئەم پلە و پایەیە, بەڵام سەرەڕای ئەمەش هێلمز لای وابوو کە خاڵی سەرەکی دەگەڕایەوە سەر ئەمەی کە "سەرکۆمار و کیسینجێر ئامانجیان ڕازی کردنی شا بوو و زۆریان بیر لەم پرسە نەدەکردەوە." لە ڕوانگەی مووریس دریپێر – ئەم کارەبەدەستەی ئەوان سەردەمان وە پێوشوێنی کاروباری ئێراق دەکەوت – "کوردان لە بۆ هێنری [ کیسینجێر]، بەشێك بوون لە مامەڵەی چەك و چۆڵ."

سێ ڕووداو چەند سەرەداوێك بۆ حاڵی بوون لەم گۆڕانی هەڵوێستەی ئەمریکا وە دەس دەدەن. یەکەمیان ڕیککەوتننامەی ١١ی مارسی ١٩٧٠ی بارزانی و سەددام حوسێن کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی هاوچەرخا خودموختاری دا بە کوردان و کۆتایی بە ٩ ساڵ شەڕی تەکولۆ هێنا. ئەمە مەبەستێك بوو کە شای تەواو تووڕە کرد. ئەو لەمێژ بوو بە مەبەستی لاواز کردنی ئێراق یارمەتی بارزانی دەدا, بەڵام ئێستا پشتیوانی

لە گۆدەتایەکی نابەجێ دەکرد کە بە کارەسات بڕایەوە.[١] هەڵبەت لەم گەڕیانەدا بە ڕەسمی پرس و ڕاوێژی پێنەکرابوو، بەڵام واش نیە کە بڵێی ڕووداوێکی لەنەکاو و ناخافڵ بوو، چونکە تەنانەت بەر لە ئیمزای ئەم قەراروبڕییەش، شا بە "ئەسەدوڵڵا عەلەم"، وەزیری دەرباری گوتبوو کە دەترسێ "ئێراق هێزەکانی بێنێ و لەسەر سنووری ئێران دایانمەزرێنێ."

ئاشکرایە کە شا بە دنەدانی بارزانی بۆ دەس پێکردنەوەی شەڕ بە مەبەستی وە دەس هێنانی خودموختارییەکی پتەو و سەقامگیر، ئاواتی لەم چەشنە و تەمای مەترسیداری لە نێو کوردانی ئێران و تورکیادا دەگەشاندەوە. ئەو پەردەی لە ڕووی ئەم دژاودژییە دەگێڕا و دەیگوت بە یارمەتیدانی بارزانی کوردەکانی خۆی ڕازی ڕادەگرێ و ئەم کارە هێوریان دەکاتەوە. لە ڕاستیدا شا دەق‌ودۆغر دەیویست سەرێشەیەك بۆ وڵاتی ئێراقی ڕقەبەری ساز بکا و کوردان ئەوێندەرێ مۆرەی کایەی جەغزی ئەم ئامانجە بوون. شا ڕاستەوڕاست دەیەویست کە کوردانی ئێراق لاواز بکەن و کوردانیش پتر بە فیتی نیکسۆن و کیسینجێر، لە مارسی ١٩٧٤دا وایان کرد.

ئیسرائیلیش لەم خواستەدا شەریکی شا بوو و هەوڵی دەدا بە شێوەیەك ئێراق نەپڕژێتە سەر گێرە و کێشەی عەرەب و ئیسرائیل. بەڵام شا ئەمەشی دەزانی کە بارزانی وەك کۆنە ئاشنایەك، بڕوای بە ئێران نیە. هەر نەبێ شای ئێران کۆماری کەم تەمەنی "مەهاباد"ی کە بارزانی پارێزگاری لێدەکرد ڕووخاندبوو و لە مەودای ڕێپێوانە

---

١- کەیخودای ئەم مامەڵەیە یەکێتی سۆڤیەت بوو کە لە ئۆکتۆبری ١٩٦٩دا, دارا تۆفیق کە یەکێك لە کوردانی مارکسیست بوو لە پراگەوە ناردیە لای بارزانی و ڕایسپارد کە لەگەڵ بەغدا بکەوێتە وت‌ووێژ. بارزانی لەڕێوە مەبەستەکەی گەیاندە ژێنێراڵ نەسیری، سەرۆکی "ساواك"ی ئێران و نەسیری چوو بۆ لای. بارزانی پێیگوت چما شا یارمەتییەکی کەمیشی پێ بکا، ئەو ئەم پێشنیارە ڕەت دەکاتەوە. ئێران بەڵێنی دا، بەڵام یارمەتی نەکرد. لەم بەینەش‌دا، شا بە بێ ئاگاداری کوردان، پشتیوانی لە گۆدەتایەك دەکرد کە وا خەریك بوو حکوومەتی بەغدا بڕووخێنێ. پیاوەکان و سیخوڕانی حوکمات خزانە ڕیزی گودەتاچییەکان و کارەساتێك قەوما: لە ٢٠ی ژانویەی ١٩٧٠دا نیزیکەی حەفتا کەس لە ئەفسەرانی سپای ئێراق گیران و لە دار دران. ئەوە وەختایەك بوو کە وت‌وویژی سەبارەت بە خودموختاری بە شێوەیەکی گەرم دەستی پێکرد.

حیماسییەکەیدا بە ئێران و ئێراق و تورکیادا بۆ سۆڤیەت، گەلێکی گرێ و کۆسپ وەبەر پێی هێنابوو. شا کە ئاگاداری هەورمی کوێرانەی بارزانی سەبارەت بە ئەیالەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، هیوادار بوو بە ڕاکێشانی ئەمریکا بۆ پشتیوانی کردنی شۆڕشی کوردان، دڕدۆنگی بارزانی سەبارەت بە ئامانجەکانی ئێران بەرێتەوە پاش. بەڵام بارزانی خۆی داوی بۆ خۆی نایەوە: تەنگی بە شا و ئیسرائیل هەڵچنی کە ڕێیەکی وا وەدۆزن کوردان دەستیان بگاتە دامێنی کاربەدەستانی ئەمریکا. سەرەڕای ڕەت کردنەوەی لێکدالێکدای ئەم داخوازە، شا قەت شوێنی ئەم مەبەستەی بەرنەدا.

هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٦ەوە پشتیوانی ئەمریکا لە شا بەری پەرەگرتنی ڕووسانی لە ئاسیای ناوەندیدا گرتبوو و یارمەتی شای دابوو کە حوکم و دەسەلاتی بگێڕێتەوە ئازەربایجان و کوردستان. ئێستا دیسانەوە جارێکی تر شەڕی سارد وە فریای شا کەوت. دووهەمین ڕووداوی گرینگ کە بوو بە هۆی گۆڕانی سیاسەت و هەڵوێستی ئەمریکا, بەستنی پەیمانی پازدە ساڵەی دۆستایەتی و هاوکاری ئێراق و یەکێتی سۆڤیەت بوو کە لە ڕێکەوتی ٩ی ئاوریلی ١٩٧٢دا مۆر کرا. جا ئێستا لەپڕ شا توانی "جگە زەردی گەورەهێز" بێنێتە کایەوە, بەتایبەت کە یەکێتی سۆڤیەت پەیمانی لەم چەشنەی لەگەڵ میسر و سووریاش بەستبوو. واشینگتۆن کە دڵپەرۆشی ئەمە بوو ڕەنگە یەکێتی سۆڤیەت زەخت بخاتە سەر وڵاتانی کەم جەماوەری عەرەبستانی سعوودی و میرنشینە پڕنەوت و بێدەسەڵاتەکانی کەنداوی فارس، وای بە بەرژەوەند زانی کە گوێی بۆ بەڵگە و بۆنەکانی شا کلۆر کا و لە بەستێنی شەڕی ساردا هاوهەنگاو بێ.

ڕۆژی دوای گەڕانەوەی نیکسۆن لە تارانەوە، شا بە "عەلەم"ی گوت کە: " کیسینجێر لای وایە کە ڕووسان لە دۆستایەتی لەگەڵ ئێراقا زۆر چوونە پێش." هەروەها درێژەی دا: "دەبێ کارێك بکەین و بەری ئەم داڕزانە بگرین." خودی کیسینجێر چەند ساڵ دواتر گوتی: "ئیستراتیژی زۆر ڕوونی ئێمە لاواز کردنی تەواوی وڵاتانی سەر بە یەکێتی سۆڤیەت بوو. چون ئەوکات سۆڤیەتەکان پێوەندی لەشکریيان

لەگەڵ ئێراق داگیرساند, ئێمەش لە بابەت یارمەتیدانی کوردانەوە ڕووی خۆشمان نواند."

ئەمە ڕاست هەر ئەو شتە بوو کە شا دەیەویست. ئەو یارمەتییە نهێنییەی کە لە ماوەی دە ساڵاندا لە ڕێی مووسادەوە (دەزگای زانیاری ئیسرائیل) دابوویە بارزانی، هانی بەستزانی پەیمانی دۆستایەتی ئێراق و سۆڤیەتی دا. (لەم هەلومەرجەدا خاتوو گوڵدامایەر، سەرەکوەزیری ئیسرائیلیش کە بە گوێرەی هۆکار و هەڵوێستی تایبەتی خۆی زۆر توند لایەنگری یارمەتیدانی بارزانی بوو، لە ماوەی یەکێك لە گەشتەکانیدا، نەناسیاوانە ڕووی کردە تاران و لەم بگرە بەردەدا چاوی بە شا کەوت، هەڵبەت ئەم سەفەرە هەروا لەخۆوە و بە هەڵکەوت نەبوو. مەسکەویش بە پێچەوانەی پێشوو لەناکاو پشتگیری خۆی بۆ خودموختاری کوردان کە تا ئەوکات بە ئاشکرا دەریدەبڕی, ڕاگرت. شا لەم مەبەستەش بە شێوەی ناڕاستەوخۆ کەڵکی وەرگرتبوو.) بەڵام ئێستا شا دڵپەرۆشی شوێنکەوتەکانی پەیمانی بەغدا بوو: وێکچوونی زۆری نێوان ئەم پەیمانە و شوێنی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئێران و سەرقاڵ بوون و دامەزرانی هەزاران ڕاوێژکار و کارزانی ئەمریکایی لە وڵاتا دەهاتە بەرچاو و ئێستا لێی ڕوون بوو کە تاقمێکی گەورەی ڕاوێژکاران و ڕێخۆشکەرانی سۆڤیەت دەرژانە وڵاتی دراوسێی.

لە ماوەی شەڕی ساردا، قەت لەوە بۆ ئیسرائیل خۆشتر نەدەبوو کە دوو کەڵەهێز دە بەریەك ڕادەچوون. بە لای نیکسۆن و کیسینجێرەوە هاوهەنگاوی لەگەڵ شا بەم مانایە بوو کە "بیردۆزیی نیکسۆن" دەتوانێ لەم ناوچە نەحەجمیوەی کەندوا وە ڕاست بگەڕێ و سەرەڕای ئەمەش بایی چەندین میلیارد دۆلار چەكوچۆڵ بە ئێران دەفرۆشرا. ئەوەندە خەرجوبەرجەی لە ماوەی ساڵانی ١٩٧٢–١٩٧٥ ئەمریکا وەك یارمەتی دایە کوردان تەنیا ١٦ میلیۆن دۆلار بوو، کە ئەویش بەشی زۆری ئەو چەکانەی پێ کڕدرا بوو کە ئیسرائیل لە شەڕی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧دا لە عەرەبانی بە خەنیمەت گرتبوو. یارمەتی مانگانە بۆ کوردان لە ڕێی ساواکەوە دەدرا؛ ساواك درانی یارمەتی بە بارزانی

وەها بە وردی دەخستە ژێر چاوەدێری کە تەنانەت مووچـەی پێشمەرگانی بـە پـووڵی ئێرانی دابین دەکرد.

ڕێبەرانی کوردی ئێراق، ژێنێرال نیعمەتوڵڵا نەسیری، سـەرۆکی سـاواك و تـەواوی ئەفسەرانی باڵادەست و چنۆکی ئێرانیان تاوانبار دەکرد کە بەشێك لەم یارمەتییانـەی وا بە ڕێی ئێراندا بۆیان تەرخان کراوە، لێیان پاش قول دەدەن.[1] بەڵام هەرچی بێ یارمـەتی ئەمریکا بۆ شۆڕشـی کـوردان شـتێکی بەرچـاو نـەبوو؛ لـە ڕاسـتیدا ئەمانـە لەگـەڵ بەڵێنەکانی شا – پووڵ، خورد و خۆراك و کەلوپـەلی تیپـە چـەکدارەکان – یـەکتریان نەدەخوێندە و هەر وەبەر چـاویش نـەدەهاتن. بـەڵام لـە بـۆ بـەهێز کردنـی خـەیاڵاتی خەساربار و زۆر مەترسیداری بارزانی – یانی دەسـتەبەر بـوونی ئـەمریکایییان لـە بـۆ یارمەتی کوردان – لەوپەڕی گرینگی دابوو.

ڕووداوێکی گرینگی تر ڕۆژایەك قەوما کە نیکسۆن و کیسینجێر لە تارانەوە بەرەو واشینگتۆن گەڕانەوە: ئەو ڕۆژە ئێراق "شەریکەی نەوتی ئێراق"ی کە لـەمێـژ بـوو هـی شەریکە نەوتییەکانی بریتانیا و هولـەند و فەڕانسە و ئەیالـەتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا بوو، میللی کرد. ئەمە ڕووداوێکی گرینگ بوو و لەم ساڵانەدا کە پیتەکانی سـەرەتای ڕێکخراوی وڵاتانی فرۆشەری نەوت (ئۆپێك) لە سەرانسەری دنیادا ناوێکی ئاشـنا بـوو و لـەوان ساڵاندا وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست سەرپەرستێتی ڕۆژاوایان تـوورِ هەڵـدا، وەرچەرخانێکی بایـخدار بوو. میللـی کرانـی "شـەریکەی نـەوتی ئێـراق" بـۆ ئێـران و بارزانی و ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خۆی بۆنە و بەڵگەیەکی تـر بـوو هـەتا بـە گوێرەی ئەو "مامەڵە"ی خۆیان بە ڕاست بنـوێنن، چـونکە هـەر کـام لـەوان بەڵگـە و

---

[1] – گلە و گازندەی کوردان لە "دەس‌پیسی" ئێرانییان گلە و گازندەیـەکی نـەبڕاوە بـوو. ئـەم گلەیییانـە لـە بەهاری ١٩٩١یش دا نوێ کرانـەوە: ڕێبـەرانی پێشمەرگان باڵادەسـتانی ئێرانیـان بەمـە تاوانبـار دەکـرد کـە خواردەمەنی و پەتوو و پۆشمەنی و تەواوی کەلوپەلی بە دیاری نێردراوی ڕێکخراوە نێونەتەوەیییەکان بۆخۆیان گل دەدەنەوە و هی کۆن و کۆنەونوێیان لە جێی دادەنێنەوە و (وێیان دەدەن).

بۆنەی سەبارەت بە ترس ڕێنیشتنیان لە ڕەنگدانەوە و شوێن‌کەوتەکانی کارتێکردنی سۆڤیەت لەم وڵاتە پڕ نەوتەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست هەبوو.

لەگەڵ ئەمەش‌دا ئەم هەڵوێستە نوێیە بە ڕادەیەك دمەتەقە هەڵگیرسێن بوو کە دژبەرانی نێو دەزگای دەوڵەت – زۆر وێدەچێ لە وەزارەتی دەرەوەڕا – خێرا مەبەستی یارمەتی ئەمریکایان گەیاندە لاپەڕەی بڵاڤۆکان. (ئەم کارە نەیتوانی ڕێ لەمە بگرێ کە وەزارەتی دەرەوە بوونی هەر چەشنە پەیوەندییەك لەتەك کوردانا لەبەر چاوی دیپلۆماتە سەرلێ‌شێواو و شەمزاوەکانی‌دا وە درۆ بخاتەوە. بۆ وێنە, واشینگتۆن، تامس کارۆلان، گەورە کاربەدەستی باڵوێزخانەی لە بەیرووت تەواو گێژ کردبوو، چونکە سەرچاوە ئاگادارەکانی لێکدالێکدا بەڵگە و بۆنەی سەبارەت بە تێوەگلانی "سیا"یان لە پەیوەندی لەتەك کوردان لە تاران لە بۆ دەنارد و ئاگاداریان دەکردەوە.) ئۆگریی نیکسۆن سەبارەت بە نهێنکاری تا ڕادەیەك بوو کە هەر بۆ ئەوەی شا دڵنیا کاتەوە کە وا هەموو کارەکان کەوتوونە سەر خولی خۆیان، "جان بی کانالی"، وەزیری خەزێنەداریی بە دزی ناردە تاران. ئەم دیدارەی نێوان شا و کانالی لە مانگی ژوەن‌دا، بە واتای "ڕاپۆرتی کومیتەی پایك" دیداری "دوو کەسایەتی کاروباری نەوتی بوو پێکەوە. تەنیا پاش گەڕانەوەی کانالی بۆ ئەمریکا بوو کە "کومیتەی چل" – ئەویش تەنانەت بە گوێرەی ڕێوشوێنی شلی خودی کومیتەکە – بە شێوەیەکی سەرسەری چەند ڕاسپاردەیەکیان ڕاسپارد. ئەم "کومیتەی چل"ە تاقمێك بوون کە چاوەدێرییان بەسەر چالاکی کۆکردنەوەی باس و خواسی نهێنی‌دا دەکرد. لەم کومیتەدا دمەتەقەیەکی ئەوتۆ ڕووی نەدا, جا چ بگا بە دەنگ وەرگرتن. ئەم یادداشتەی وا باو بوو کە لە سێ لاپەڕاندا دەنووسرا و بە کورتی باسی چۆنیەتی وێك‌کەوتنەوەی سەروبەری کارەکانی دەکرد, نەدرایە ئەندامان. لە جیاتیان، هەروەك ڕاپۆرتی "پایك" باسی دەکرد، پێیان گوتن کە وەرگێرانی "کورتەی ڕاوەی چالاکی" کە بەندێك زیاتر نەبوو، ڕابگەیەنن. تەنیا پاشی چوارساڵی دواتر بوو کە ڕاسپێراوانی لێکۆڵینەوەی کۆنگرە لە گەڕیانی توێژینەوەدا یادداشتێکی "تەواو نەهێنییان" بە ئیمزای کیسینجێرەوە دۆزێوە.

بارزانی هەر لـە سەرەتاوە دەیویست بۆ ڕوون کردنەوەی وردەکارییـەکانی ئیـشەکە بچێتە واشینگتۆن. ئەو هەروەك کوێران بڕوای بە ئەمریکا بـوو، بـەڵام ئەوەندەشـی لــە ڕێوشوێنی دنیا دەزانی کە بیهەوێ خـۆی ئـەم کەسـانە هەڵـسەنگێنێ کـە لەگـەڵیان تێکەوتووە و پاشان داوەری بکا. کیسینجێر بەرهەڵستی هاتنی کرد بۆ ئەمریکا و پاشی چەند جاران ئەمە یەکەم جار بوو کە بە بیانووی ئەوەی چما سەروسۆراغی لە ئـەمریکا هەست پێبکرێ، چالاکییەکان دەکەونە مەترسی، ویزایان نەدایە. بارزانی کە لـەمێژ بوو لـەگەڵ ڕەوتی کاری نەهێنی و شاراوە ڕاهاتبوو, پێی لــە غـرووری خـۆی نـا و متـەقی نەکرد. لـە مانگی ژووئیەدا ئیدریسی کـوڕی و دوکتـۆر مەحـــموود عوســـمانی نـاردە واشینگتۆن. دوکتۆر مەحـموود عوسـمان لـە واتادا وەزیری دەرەوەی بوو و لـەو دیوی جەغزی بنەماڵـەی نزیکترین هاوکاری بـوو. ئـەم دووە لــە ناوەنـدی "سـیا" لــە لایـەن ڕیچارد هێلـمز، ژێنێراڵ "ئیم. هیگ"ی (کوڕ)، سەرۆکی کارمەندانی کۆشـکی سـپی و سەرهەنگ ڕیچارد کێنێدی، یاریـدەدەری یەکـەمی کیـسینجێر لــە شـووڕای تـەناهی نەتەوەییدا پێشوازییان لــێکرا.

دوکتۆر مەحـموود عوسـمان دەڵێ: "هێلـمز زۆری درێژ نەکردەوە و پێیگوتین لـە بۆیە ئێمەی ڕێداوە کە شا ویستوویەتی دەوڵـەتی ئـەمریکا یارمـەتیمان بـدا و یارمـەتی واشینگتۆنیش هەر لـەبەر هەندێیە. جا تا هەر وەختایەکی شـا لـەسـەر ئـەم ڕێبـازە بـێ، ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش وەها دەکا. مـن خـۆم زۆر هەسـتم بـە خاترجـەمی نەکرد. من لـە بۆیە چـوومە واشـینگتۆن کـە بـارزانی گوتبـووی بـچم. ئـەرکی خـۆم بەجێ هێنا، بەڵام وام بیر نەدەکردەوە کە ئەم پەیوەندە بـۆ ئێمـە پەیوەنـدێکی ڕاسـتەکی بێ، چونکە دەمزانی لێرەدا کێشەی سەرەکی بۆ ئەمریکا خودی شایە. ئەمریکایییەکان خڕ و پتوون خۆیان تێوەنەدابوو. دەسبەر بوونێکیش لـە گۆڕێدا نەبوو. مـن زۆر گـەش بین نەبووم."

بەڵام بارزانی گەشبین بوو، هەر نەبێ لــە دەسـپێکەوە. ئـەو پاشـی تێپـەڕبوونی دە سـاڵێکی کـە تێیـدا وای دانـابوو هــەر ئەمریکاییـەکی کـە دەیبینـێ – تەنانـەت

هەواڵنێرانیش – کاربەدەستانی خۆگۆڕیون،[1] ئاخرییەکەی تووشی تێکەڵاییەتی بە کردەوە بوو لەگەڵ ئەمریکاییەکان. هەڵبەت لە بابەت ئەم کاربەدەستە خۆگۆڕیوانەشدا زۆر هەتڵەرێ نەبوو: چونکە هەرچۆنێك بێ، بە شێوەیەکی زۆر ورد و باریك پێوەندگەلێ هەبوو. وە هەر حاڵ هەواڵنێرانی ڕۆژاوایی و تەواوی ئەو کەسانەی لە ڕۆژاواوە دەچوونە دیداری بارزانی، وای تێدەگەیشتن کە برابرا بارزانی دڵپەرۆشی ئەمە نەبوو کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە زۆنگی شەڕێکی ئیدئۆلۆژیکدا لە وێتنام خەریکی پەلەقاژەیە و خەریکە لە دەستودوو دەکەوێ. جا ئەمە شەڕێك بوو کە دەبوو بە هۆی تێداچوونی گەلێك لە ناسیۆنالیستەکانی جیهانی سێهەم و هەروەها زۆرێکیش لە ئەمریکاییەکان. دوکتۆر سامی عەبدوڕڕەحمان، یەکێك لە کەڵە یاریدەرانی بارزانی دەیگوت: "بارزانی ئەمریکاییەکانی لە قووڵایی دڵەوە خۆش دەویست." ئەمە ئۆگرییەك بوو کە سی ساڵێك بەر لە هەنگێ داگیرسا، یانی ئەو دەمەی کە لە ڕۆژی جێژنی ساڵی **١٩٤٧** لە تاران چاوی کەوت بە ئارچی ڕۆزوێڵت، جێگری وابەستەی نیزامیی باڵوێزخانەی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. کوردان تەنانەت هەتا ئەمڕۆش لەتەك کێشەیەکا دەستەویەخەن کە لەوان سەردەمانڕا هەڵگیرساوە و بیری شەمزاندوون و نارەحەتی کردوون: بۆچی بارزانی وەها دڵبەستەی ئەمریکا بوو؛ ئەویش تا ڕادەیەك کە بە خۆی و گەلەکەی سەلماند کە ئەمریکا ئەم گەلاڵەیەی "شا"ی سەرەڕای دەرکەوتنی بەڵگە و بۆنەی پێچەوانە و ڕوو لە زیادی، بەڕاستی دەستەبەر کردووە؟

ئاشکرایە کە بارزانی بوو بە قوربانیی جەغزی ژیانی خۆی: پیاوێك بوو کەمخوێندەوار و ئاسۆی بیری زۆر تەسك بوو، هەتا ئەو شوێنەی کە هورمی

---

١– دووشك بوونی بارزانی لەم بابەتەوە زۆریش لە خۆوە نەبوو. ئیسرائیلییەکان لە دەیەی ١٩٦٠دا ڕۆژنامەنووسێکیان کردۆتە ڕاسپاردەی داگیرساندنی دۆستایەتی و ئاشنایەتی لەگەڵ بارزانی. زیادە لەمەش "سیا"ش لە پێوەندی لەتەك کوردەکانی ئێرانا لە ڕۆژنامەنووسان – چ ئەمریکایی و چ غەیرە – بەهرەی وەردەگرت.

گەرموگوڕ و ناسیاری خۆی لەسەر گەلەکەی نایە پێناوی بێدەروەستیی کەڵەهێزێك کە دەیویست لەسەر کەوڵی وی چاکە لەگەڵ یەکێك لە وڵاتانی ژێر سێبەری خۆی بکا؛ ئەویش پاش ڕاوەستان و دوودڵییەکی تەواو. ترکان، ئینگلیسییەکان، عەرەبەکان و ئێرانییەکان کە ئەو ساڵگاران ئارای لەگەڵیان ببوو، سەرەڕای تەواوی عەیبەکانیان، هێندەی ئەمریکاییەکان بێدەربەس نەبوون، کە ئەو گەلێ ساڵان ئەوانی لە زەینی خۆیا کردبوو بە هەوێنی ئەوپەڕ دڵخوازی. کە لەم سووچەوە بڕوانین بارزانی تووشی گوناهێکی سیاسی هاتووە، کە بۆ لێبووردن ناشێ و ئاکامی کەم هەڵدان و نەبوونی وردبینییە. چونکە هەرچۆنێك بێ کیسینجێر لە ساڵی ١٩٦٨ەوە سیاسەتی واقعبینیی خۆی ڕاگەیاندبوو [و گوتبووی] کە مشتەری خۆی دەبێ "ئاگای لە کاری خۆ بێ ..."

لەگەڵ ئەمەشدا تامەزرۆیی بارزانی لە گەڕیانی ئەم چالاکییە نەهێنییەی کە گەورە و گچکە هێزانی وێكدەخستەوە و بێگومان هەڵگری گەلێك مەترسیش بوو ئیشێکی تەواو ناسراو بوو. کە باس دێتە سەر بارزانی ئەمە ئەزموونی خودی خۆی بوو کە سەرەگێژەی دەنایەوە, چونکە خەڵك لایان وابوو کە بێشك سەمەدەکانی ئەمریکای لەم یارمەتییانەدا وەبەر چاو گرتووە. دەی چلۆن بوو کە ڕێبەرێکی بەئەزموون کە ئەو ژیان و ئەو هەوراز و نشێو و دوورخرانەوەیەی تووش هاتبوو و بە زیندوویی لە گێرە و کێشان قوتار ببوو, ئەوهای بڕوا بە کەڵەهێزێك دەکرد و هیچ بیری لەمە نەدەکردەوە کە ڕەنگە ئەم کەڵەهێزە لەوپەڕی دڵڕەقیدا بە شوێن قازانج و بەرژەوەندی خۆیەوە بێ؟ ئەم غەوارانەی بارزانییان دەناسی و چاویان پێیکەوتبوو بڕوایان نەدەکرد کە ئەو تا ئەم ڕادەیە سافیلکە بێ کە خۆی دەینواند. لایان وابوو، بەڵێ کاتێك پێشنیار دەکا کە کوردستانی ئێراق ببێتە ئەیالەتی پەنجاویەکەمی ئەمریکا یان پێشنیار دەکا کە شەریکە نەوتییەکانی ئەمریکا نیوەی ناوچە پڕنەوتەکانی کەرکوکیان بە دەستەوە بێ، ئەمە ڕەوت و ڕێبازێکی چازانی و زیرەکانەیە. ڕاستە ئەو جگە لە مانەوەی لە سۆڤیەت و دیداری لە ئێران و ئیسرائیل و ڕۆمانی قەت هیچ کوێیەتری نەدیبوو و لە بەستێنی ژێئۆپۆلۆتیکدا پەروەردە نەکرابوو، بەڵام ئەو غەوارانەی دەچوونە دیداری بەم ئاکامەوە

دەگەڕانەوە کە ئەو یـەکێك لـە سەرسەختتـرین ڕێبـەرانی نەتەوەیییـە کـە بینیویانـە؛ پیاوێکە هاوشانی خاتوو مایەر و چەشنی ئەو هەلومـەرج و بـارودۆخێکی زۆر دژوار و پڕ دوژمنایەتی بۆ ماوەیەکی پتر لـە پەنـجا ساڵان تێپەڕ کردووە.

بارزانی ئەمـجار ئەگەریش باشتر و زیاتر لـە ناخی کارەکان ڕاهاتبـا، دیـسانیش لـە ساڵی ١٩٧٢دا ئیتر هیچ چـارەیەکی نـەبوو جگـە لـەمـەی ئـەو ڕێیـەی وەبـەری داوە درێژەی بدا. سەرخۆشیی پاش ئیمزا کرانی ڕێككەوتننامەی خودموختاری شتێکی کـەم تەمەن بوو. لـە بەهاری ساڵی ١٩٧٢دا پاشی گێڕانی دووجار پیلان بۆ کوشتنی بارزانی و ڕوون بوونەوەی ئەم مەبەستە کە حیزبی بەعس نایەوێ بە دانی خودموختاری لەسـەر بێوشوێنی هەلومەرجی دیاری کراوی بـارزانی پێمـل بـێ, نێـوان و پێوەنـدی لـەگـەڵ دەوڵـەتی ئێراق وە ناخۆشی گەڕا. بەغدا لـە باتی بەڕێوە بردنـی ئـەم سـەرژمێرییەی کـە ڕێككەوتننامەی ئاماژە پێکراو دیاری دەکرد، کوردانی لـە کەرکووك و تەواوی ناوەندە نەوتییەکان وەدەرنا و عـەرەبی لـە جێـی خزانـدن؛ هەڵبـەت ئـەم گەلاڵـەیـەی لەسـەر زەویوزاری بەرێژەویش بەڕێوە برد.

وێڕای ئەمەش پێکهاتن لـەگەڵ شا و ئەمریکاییەکان بێگومان لـەسـەر هەڵوێـستی ئەو سەبارەت بە پێشنیاری ئێراق لـە ١٩٧٣دا بۆ دابەش کردنـی کـەرکووك و داهـاتی نەوتەکەی، شوێندانەر بوو. بارزانی ئەم پێشنیارەی لـەڕێوە نەبردەوە پـاش. تاقمێـك لـە کوردان لـەگەڵیا کەوتنە باس و ڕاوێژ و بڕوایـان وابـوو کـە دەبـێ لـەم هەلـە بـەهرە وەرگیرێ و پێشنیارەکە قبووڵ بکرێ. هەر ئەم تاقمە پاشان ئیددیعایان کرد کـە قبـووڵ کردنی ئەم پێشنیارە بە هـەموو کەموکووڕییەکانییـەوە کـوردانی لـە شکـستی مارسـی ١٩٧٥ قوتار دەکرد و باڵی دەگرتن هەتا لـە شەڕی ئێران و ئێراق بە دوور بـن. بـەڵام شا زەختی خستە سەر بارزانی هەتا پێشنیاری ئێراق کە لـەگەڵ داخوازە نوێکراوەکانی کوردانا دەهاتەوە، نەسەلـمێنێ. بارزانی دروست هەتا ئاخرین ساتەکان هـەر دڵاودڵـی کـرد، بـەڵام کاتێـك لـە مارسـی ١٩٧٤دا دەوڵـەتی ئێـراق دیـسان لـە بـەربڵاوی خودموختاری ساڵی ١٩٧٠ی کەم کردەوە و ڕایگەیاند کە جەغزی تەنگەبەر کـراوی

خودموختاری، خوایینەخوایی لە ماوەی دوو حەوتوانڎا پیـــادە دەکـــرێ، ئـــیتر چارەنووسی ئیشەکە ڕوون و ئاشکرا بوو. ئێستا هەردوو لا دەیانزانی کە قەومانی شـەڕ مسۆگەرە.

بارزانی هیچکام لە کوردانی دیکەی چ لە گەڕیانی شۆڕشدا و چ بـێنێوبڕ پـاش هەرەسـی ١٩٧٥ بەشـداری تـەماگرتنی نـەدەکردن. تـەنیا دوای دەس بـەکار بـوونی دەوڵـەتی سەرۆك جیمی کارتێر لە ژانویەی ١٩٧٧دا بوو کە بارزانی بەند و داوی بـیر و زەینی خۆی وەلا نا و بە هیوای وە دەس هێنانی پشتگیری دەوڵـەتی نـوێ کەوتـەخۆ هەتا بە ئاشکرا باسی پرس و تەنگەژەی خوی بکا. بـارزانی کـە ئێـستا پیـاوێکی نـزم و نەوی و گیرۆدەی شێرپەنـجەی ڕیـخۆڵە بوو و بە دوورخراوەیی لە نیزیك واشـینگتۆن ژیانی ڕادەبوارد، لە فێوریـەی هـەمان سـاڵ لـە دوو نامـەدا بـۆ نوێنـەرانی کـۆنگرە و مەجلیـسی پـیران ڕایگەیانـد ئەگەرهـەر وەختایـەکی ئاگـاداری ئـەو فریـو و کـردەوە نامرۆڤانەیە ببوانەوە کە هەر لە دەسپێکی ١٩٧٢ەوە هاتبوونـە کایـەوە "یـان بـە دژی دەوێستان و ئێمەیان بۆ هەڵبژاردنی ڕێچارەیەکی ئەو کات لەبەر دەستا بـوو ئـازاد دا دەنا – بێ ئەوەی ئێمە تووشی خەسـارێك بووبـاین – یـا پـشتیوانییان لـەو ڕێوشـوێنە دەکرد و نەیاندەهێشت کورد خەیانەتیان پێکرابا." لە نامەیەکا بە ناوی کارتێرەوە هـەر لەو مانگیەدا دەیگوت کە تەنیا بەڵێنەکانی ئەمریکا لـە ١٩٧٢دا نەیهێـشتووە لـەگـەڵ ئێراق ڕێكبکەوێ کە "لـەتەك بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا یـەکتری نەدەخوێنـدەوە و بـۆ دراوسێکانی ئێراق زەرەربار بوو." هەروەها زیادی دەکرد: "من ئەگەر بە پتەوی بـڕوام بە بەڵێنەکانی ئەمریکا نـەهێنابا دەمتـوانی بـەری ئـەم چارەڕەشـییە بگـرم کـە ئاوقـای گەلەکەم بوو." بارزانی لــە درێـژەدا دەیگـوت دڵنیـا کرانـەوەی لــە لایـەن بـاڵاترین کاربەدەستانی ئەمریکاییەوە وایـان بـڕوا پێهێنـابوو کـە هاوکـاری لەگـەڵ ئێـران و ئەیالـەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا یارمـەتی دابـین بـوونی خودموختـاری کـوردان و چەسپانی دێموکراسی لە ئێراقدا دەکا. ئەم وتانەی بارزانی، جا بـە هـەق بـێ یـان بـە

ناهەق، بە تێپەڕ بوونی ساڵگاران لە ڕوانگەی زۆربەی کوردەکانی ئێراقەوە ڕەنگی ڕاستەقینەی لە خۆ گرتووە.

وا دێتە بەرچاو کە لەم ڕەوت و ڕووداوانەدا پەیمانی دۆستایەتی نێوان سۆڤیەت و ئێراق لە ١٩٧٢دا دەورێکی بە بڕشتی لەم بوارەدا گێڕابێ. بۆ یەکەم جار بوو کە ئێراق دەستی دەگەیشتە ئەو توانا نیزامییەی کە تا ئێستا نەیبوو و بارزانی بەرەو داوێك پاڵپێوەنرا کە شا و واشینگتۆن لەسەر ڕێی نابوویانەوە. هەرکە پەیمانەکە مۆرکرا مەسکەو یارمەتی خۆی لە کوردان بڕی و ناردنی ڕادەیەکی زۆری چەك‌وچۆڵ و ئامرازی شەڕ بۆ ئێراق دەس پێکرد: فڕۆکەی شەڕکەر و بۆمباهاوێژ، تۆپخانەی دوورهاوێژ، باڵەفڕ و گەلێك چەکی پێشکەوتوو. لە ساڵی ١٩٦٣دا یەکێتی سۆڤیەت هەڕەشەی کردبوو کە مەسەلەی تۆوبڕکردنی کوردان لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دێنێتە گۆڕ، بەلاّم ئێستا گەرموگوڕی لەگەڵ عەرەبان, بەتایبەت وڵاتانی خاوەن نەوت و بێ حوکماتی مەزەبی چەشنی ئێراقی بە لاوە باشتر بوو. کومۆنیستەکانی ئێراق کە گەلێك کوردیان لە گەلاّ بوو, پشتوانییان لە حکوومەت دەکرد و هەر ئەم ڕەوشە بارزانی پتر تاق دەکردەوە. وێڕای ئەمەش بە دەرکەوتنی باڵەفڕە خێراکان بۆ سەر شانۆ, دەورانی چرپانچرپانی باوباوێنی شەڕی پارتیزانیش لە کۆتایی خۆی نیزیك دەبۆوە.

لە وەها هەلومەرجێکا بەشداری خودی ئەمریکا لەم گەڕیانەدا بێ‌گومان باشتر بوو لە پاڵوێدان بە شاوە. وە هەرحاڵ زیاتر لە سایەی یارمەتییەکانی ئێرانەوە بوو کە بارزانی توانیبووی لە ١٩٦١ەوە بۆو لایە دەسەلاّتداری بەشێکی بەرینی کوردستانی ئێراق بێ و بە قەولی خۆی پێنج حکوومەت و حەوت دەوڵەتان لە بەغدایە دە ناخێ ڕۆکا. دەستەیەك لە کوردان بڕوایان وابوو کە لایەنی قوماربازانە و گێچەڵخوازانەی [کەسایەتی] بارزانی دەیزانی کە لەم قومارەدا ئەمە دوایین جاری مۆرە هەڵخستنەوەیەتی. ئەوان سەردەمان بارزانی شێست‌وحەوت ساڵانە و لە باری ئەندامەوە بەهێز و بە لایەنی بیر و زەینا وشیار بوو. ئەگەر وەها بووبێ دەبێ بارزانی بە لای خۆیەوە لێکی دابێتەوە کە ئەو سیاسەتە نەقوستانەی وا دوکتۆر مەحموود

عوسمان لە ژووئیەی ١٩٧٢دا لە واشینگتۆن تێیگەیبوو، دەتوانێ لە داهاتوودا بە قازانجی کوردان خولی پێ بدا. بارزانی لە ١٩٧٣دا بە "جیم هۆگلەند"ی "واشینگتۆنپۆست"ی گوت: "ئێمە بڕوامان بە شا نیە، بڕوامان بە ئەمریکایە. ئەمریکا گەورەترە لەوەی خەیانەت بە گەلێکی بچووکی وەك گەلی کورد بکا."

لە مارسی ١٩٧٥دا کە بارزانی بەرهەمی عومرێك هەوڵ و تێکۆشانی ببوو بە خاك و خۆڵەمێش بە ڕواڵەت چلۆنایەتی خراپ لێکدانەوەی خۆی هاتە بەرچاوی. هۆگلەند کە بۆ نووسینی ڕاپۆرتی تێكشکان و هەرەسی شۆڕش چووبووە کوردستان, بارزانی پێیگوت: "دەوڵەتی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیچ چەشنە دەستەبەربوونێکی ڕەسمی نەدایە ئێمە. بەڵام ئێمە لامان وابوو قەت پشتی بەرنادا. ئێستا دەزانین کە بە هەڵە چووین." بەڵام بڕوای بارزانی بە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەمان کاتدا دژکردەوەیەك بوو کە – پاشی ئەو گشتە چەرمەسەی و بێبەشییانەی لە مەودای دوورخرانەوەیدا لە سۆڤیەت کێشابووی – لە بەرامبەر دڵساردی سەبارەت بە هەر شتێکی ڕووسی دەینواند. وێڕای ئەمەش "شێخ ئەحمەد"ی کاکیشی کە ساڵگاران شوێنێکی گەورەی تێکردبوو, ڕایسپاردبوو کە تێکەڵایەتی لەگەڵ ئەمریکا درێژە پێبدا. موحسین دزەیی کە یەکێك لە گەورە یاریدەدەرانی بوو دەیگوت: "بارزانی بڕوای وابوو کە هیچ کارێك لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا بە بێ پشتیوانی ئەمریکا جێبەجێ نابێ." دوکتۆر مەحموود عوسمان دەڵێ: "هەروەها بارزانی وای بیر دەکردەوە کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یەکە کەڵەهێزە و سەرەنجام دەرکەوت کە لێرەدا ڕووی نەکردۆتە هەتڵە ڕێیان."

لە "هۆردووگا"ی کوردانیدا ڕایەڵەی ورد و باریك سەبارەت بە ڕادەی بەڵێنداری ئەمریکا لە دەسپێکەوە تا ئاخر, جگە لە ئەندامانی سەرووی بنەماڵەی بارزانی و هێندێك لە گەورە یاریدەدەرانی, لە وانی تر حەشار درا. لەگەڵ ئەمەشدا هەموویان بوونی شێوەیەك پێوەندییان لەگەڵ ئەمریکا بە لاوە سوور بوو. یەکێك لە مێژوونووسانی کورد دەنووسێ: "لە ڕاستیدا هەرکەسێکی لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا

خاوەنی زەینی سیاسی بوو باوەڕی نەدەکرد کە شا بە بێ پرسی دەوڵەتی واشینگتۆن دەس بەرێ بۆ وەها کارێکی گەورەی نیزامی وماڵی." لە سەرەتای هەڵگیرسانەوەی گرژی نێوان کوردان و ئێراقییەکان لە مارسی ١٩٧٤دا، کادرەکانی باڵا و بەپارێز چەند پرسیارێکیان لە بابەت چۆنیەتی دەستەبەریی یارمەتییەکانی دەرەوە بە گوێی بارزانی و "مەکۆی تایبەتی و ئاگادارییی" ئاشنا کرد و گفتوگۆ هەتا بەرەبەری بەیانی درێژەی کێشا. بارزانی و ئیدریس و دوکتۆر مەحموود عوسمان بێ ئەوەی خۆ لە قەرەی درێژدادڕی بدەن گوتیان لەم بوارەدا دەستەبەر بوونی تەواو لە گۆڕێدایە. کەس گوێی بۆ هاواری پارێز کردن کلۆر نەدەکرد. تا ئەوەی کە تازە درەنگ بوو, بەڵام هەتا ساتەکانی ئاخریش بارزانی بڕوای وابوو کاتێك ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا "وەك کەڵەهێزێك ڕزەامەندی لەسەر دامەزراندنی پێوەندی نێوانمان دەربڕیوە, کوردان بەڕەڵلاّ ناکا." بەڵام هەر ئەو لە ١٩٧٧دا، لە نامەی خۆیا بۆ کارتێر بە ئاشکرا پێیلێنا کە بەرعودە بوونی بە نووسراو لە گۆڕا نەبووە و زیادی دەکا: "کوردان بڕوایان بە دەستەبەر بوونی سەرزارەکی ئەمریکا و ئێران کردووە." هەروەها کوردان "بە گیان و دڵ لەسەر ئەم بڕوایە بوون کە بەرعودە بوونی ئەمریکا, چ سەرزارەکی بێ و چ بە نووسراو ناچێتەوە پاش."

وێڕای ئەمەش هەروەك بارزانی چاکی دەزانی بەڵێنی سەرزارەکی لەگەڵ دەستەبەریی بە نووسراو جیاوازن. لە کۆمەڵێکی وەك کۆمەڵی ئەمریکادا کە خەڵکەکەی خاوەنی "زەینی حقووقی"ن، بەڵێن و بەرعوودە بوونی بە نووسراو دەیتوانی ئەگەر هەر لە ترسی ئاشکرا بوون و سەرێشەی پاشانیش بێ، دەوڵەت وا لێبکا بەڵێنی خۆی بە تەواوی بەرێتە سەر. بەڵام با بێ لە جەغزی ئینساف نەبەینە دەر؛ لەم سەدەیەیدا کە دیومانە پیاوێکی بەدەسەڵات قانوونیترین پەیمانی دڕاند و فڕێی دا, داخوا تەنانەت پەیمانێکی ڕەسمیش دەیتوانی بەرگێڕەوی شا بێ و نەهێڵێ خەیانەت بە کوردان بکا؟ بە دەستەوە نەبوونی هیچ چەشنە سەنەد و بەڵگەیەکی بتوانێ لەم بوارەدا کەس پێملێ ڕاپەڕاندنی بەڵێن بکا, مەیلی کیسینجێری بۆ شاردنەوەی

شوێنەواری کردەوەی و هیواداریی بارزانی لەوپەڕی بەزەیی پێداهاتنا دێنێتە بەرچاو. بارزانی هەڵەی کرد و ژیا هەتا دان بە گرینگترین چەواشە هەڵپێچان و لێکدانەوەی درێژایی ژیانیدا بێنێ. تاڵ و تیژی ئەو نزم بوونە پتر لەوە دایە کە ساڵەکانی ئاخری تەمەنی لە تاراوگەی ئێران و ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا تێپەڕ کرد؛ لە کاتێکدا دەمیان گرێ دابوو کە تەنانەت نەتوانێ هیچ شتێك سەبارەت بەو کەسانەش وا خەیانەتیان پێکردبوو دەربڕێ. لە ڕۆژانی دوایی ژیانیدا بە گاڵتە دەیگوت: "هیوادارم چارەنووسم بمباتە "پێکەن"، کە لەوێوە بتوانم ئەوەی دەمەوێ لەمەڕ سۆڤیەتان و ئەمریکاییەکانەوە بیلێم." وە هەر حاڵ لە کتێبێکی وەك کتێبی "ڕێکۆرد شکێنانی گینێس"[١]دا – سەبارەت بە جیهانی سێهەم – وەك تەنیا ڕێبەرێکی کە بۆ ماوەی پتر لە دە ساڵان تەمەنی لە یەکێتی سۆڤیەتا تێپەڕ کرد و لە قایەمەی مووچەخۆرانی "سیا"دا بوو و ئیستالین و شای ئێران بەهرەیان لێ بینی و پاشان پشتیان بەردا – کەسێکی وەك بارزانی – خاوەنی ڕێکۆرد دەبوو.

بەڵام ڕازی کەسایەتی بارزانی و ئەم دەوڵەتانەی لە ژێرەوە تێژیان دەکرد و چۆنیان هەڵدەسەنگاند و حوکمیان لەسەر دەدا لە بازنەی ئەم نموونە و بابەتە پەندلێوەرگرەدا حەشاردراوە کە چلۆن گەورەهێزێك تەنانەت کەمینەیەکی دوورەدەست و تاقەوە بوو و ناهومێد دەهاڕووژێنێ. ساکاری و ساویلکەیی بارزانی لە بواری ئیمان و بڕوا بە ئەمریکاوە جۆرێك بوو کە دەبوو بە هۆی ئەوەی ئەمریکاییەکان وەك کەسێکی گومان لێکراو یا خەرفاو بۆی بڕوانن. بیست ساڵ دواتر کە کیسینجێر کەتبووە سەر هەڵوێستی بەرگری کردن لە خۆی پێیگوتم: "تەنانەت ئەگەر لە هەستیی ڕەزامەندانەی بارزانی سەبارەت بە ئەمریکاش حاڵی بووبا – کە ئەو لێی حاڵی نەببوو – "چ فەرقێکی دەکرد؟" هێلمز ڕەنگە لەبەر وەی هەر لە

١- Guiness Book Of Records، کتێبێکە هەڵگری ناوی ڕێکۆرددارن یا ڕێکۆردشکێنانی جیهان وەك: باڵا بەرزترین پیاوی جیهان، کورتەباڵاترین پیاوی جیهان، زۆرخۆرترین، قەڵەوترین و ...

سەرەتاوە هەستی دەکرد کە لـە شـیکردنەوەی دەوری بەرتەسـکی ئـەمریکا لـەگـەڵ کوردانا سەرڕاست بـووە, دەیگـوت تـەواوی ئەوانـەی کـە لـەم کێـشەیەی کوردانـا دەوریان دەگێڕا, پاش تەمەنێك پیلان و فێڵ و تەڵەکە و شۆڕش، بارزانییـان بـە چـاوی "منالێکی ریشدار" چاو لـێدەکرد. بەلام نەتەوەخوازانی کورد – جگـە لـە ئەنـدامانی مەکۆی نێوخۆی کە زانیاری پتریان هەبوو – لایان وابوو کە ڕێبەرەکەیان قەت بـە بـێ دەستەبەر بوونی ڕەسـمی ئەمریکا لـە مارسی ١٩٧٤دا ملی لە شەڕ نەدەنایـەوە, بـەلام ئەم دەستەبەربوونە ئەگەر زۆریش پتەو و پتوون بوایـە, دیـسانیش دژاودژکـەوتنی تێـدا بەدی دەکرا.

بـەلام کورتوکرمانـــجی هـیچ شـتێك بـەرگێڕەوی بـارزانی نـەبوو لەسـەر ڕێـی هەڵگیـرساندنەوەی شەڕ. ژێنێڕاڵ ئاندرێی گرچـکۆ, وەزیـری بـەرگری سـۆڤیەت کـە بارزانی لـە سەردەمانی دوورخرانەوەی لە سۆڤیەتا دەناسی, چونکە هەسـتی بەمـە کـرد هەڵگیرسانەوەی شەڕ لـە نێوان کوردان و بەعسییاندا کارەسـاتی لـێدەکەوێتەوە, بـە مەبەستی وەدی هاتنی ڕێككەوتنێك لـە نێوانیاندا چووە بەغدا. بارزانی بە فیتی تـاران و واشینگتۆن ئـەم داخـوازەی بـردەوە پـاش. لـە دەسـپێکی هەڵگیرسـانەوەی گێـرە و کێشەکاندا, سەددام حوسێن لـە دیداریکا دیسانەوە پێشنیاری دابەش کردنی کەرکووك و نەوتەکـەی هێنـاوە گـۆڕ, بـەلام "ئیـدریس"ی کـوڕی بـارزانی پێـشنیارەکەی ڕەت کردەوە. گوتی: "ئێمە لەوە بەهێزترین وا ئێوە بیری لـێدەکەنەوە و ناچـارتان دەکـەین داخوازەکانـمان لـێ قبووڵ کەن." سەددام حوسێن کـە قـەت پیـاوێکی وا نـەبوو لــە هەڕەشەوگوڕەشە بتۆقی, وتەکانی بە هەڕەشە ولام دایەوە و تێی ڕاخوڕی: "ئەگەر شەڕ دەس پێبکاتەوە ئێمە سەردەکەوین." ئەو ئێستا نە تـەنیا چەكوچـۆڵی سـۆڤیەتی لەبـەر دەستا بوو, بەڵکوو دەیزانی کە ئەوە پاڵوێدانی بارزانی وە شایە کە لێـبڕاوە دەسـەلاتی بەشێك لـە "ئەروەندڕوود" – ئەم ڕێگـا ئاوییـەی کەنـداوی فـارس و بەنـدەری نـەوتی ئابادان و بەسرە لێك گرێ دەداتەوە – لە چنگ ئێراق دەربێنێ.

لـە ساڵی ١٩٣٧دا ئینگلیسییەکان کە وەك جێنـشینانی عوســمانی تـەواوی ئـەم "ڕێگا ئاوەیان" لـە ژێر دەسەلاتا بوو، بە دەوڵەتی ئێراقیان سەلـماند کە لـە خوڕڕەمشار و

ئابادانەدا برە هەقێ بداتە ئێران: لێرە ئەم پاپۆڕانەی لەنگەریان گرتبوو لەمە بەدوا ئالاّی ئێرانیان هەڵدەدا. ئینگلیسییەکان لەمە دەترسان کە هەر چەشنە پێداهاتنەوە و بیرگۆڕینێك لە بابەت ئەم تەکووزەوە هاتوچۆیان بە ڕەوگەی ئەم ئاوەڕێیەدا بەرەو پالاّوگەیان لە ئابادان و بەسرە تووشی ئالۆزبلۆزی بکا. هەتا ساڵی ١٩٦٩ ئاژاوتنی تەواوی ئە پاپۆڕانەی لە ئەروەندڕوودەوە دەچوونە بەندەرەکانی ئێران لە ئەستۆی پاپۆڕەوانانی ئێراقی بوو. شا ئەم ڕێوشوێنەی بە سووکایەتی دەزانی و لای وابوو بەسەر باوکیا سەپاوە, چونکە ئێران ناچار بوو سنووری نێونەتەوەیی لە ڕۆخی ئاوەڕێی ئێران بسەلمێنێ و بەمە ڕازی بێ کە ئەم پاپۆڕانەی بە ڕووبارەکەدا هاتوچۆ دەکەن ئالاّی ئێراقیان لەسەر بێ.[1] — سەددام حوسێن هەڕەشەی کرد: "بێتوو بکەوینە تەنگەژە و ناچار بین یا دەس لە نیوەی یەکاویعارەبان هەڵبگرین یان تەواوی ئێراق بدۆڕێنین, ئەو کات دەس لە یەکاویعارەبان هەڵدەگرین، هەتا تەواوی ئێراق بە شێوەی دڵخوازی خۆمان بپارێزین و ڕایبگرین."

چەند مانگێکیش دواتر سەددام حوسێن خەریکی ئەم گەلاّڵەیە بوو کە خۆی دایرشتبوو: بەمجۆرەی "سیا" بۆی دەرکەوت پێشینەی ئەم گەریانە دەگەڕایەوە بۆ ئۆکتۆبری ١٩٧٢. یەکاویعارەبان کەتبووە ناوەندی ئەم وتوویژانەی کە لە مانگی ئووتا لە نێوان وەزیرانی دەرەوەی ئێران و ئێراقا لە ئیستامبووڵ سەری گرت. ئەم دیدارە لەسەر داخوازی ئێران و بە نێوبژیوانی ئەلجەزایر سەری گرتبوو کە تەمای وابوو بۆ قایم و پتەو کردنی "ئۆپێك" کۆتایی بەم ملبەملەیە بێنێ. بارزانی هەر خێرا سەرنجی کەوتە سەر ئەم وتوویژە و ئەگەری ڕێککەوتنی نێوان ئێران و ئێراقی بە چەند جار لەگەڵ "مەکۆی نێوخۆی" خستە بەر باس و گفتوگۆ، بەلاّم "سەروبەری ئاکامی کارەکەی بۆ نەچۆوە سەریەك." بارزانی لە تێگەیشتنی ئەم مەبەستە کە ڕەنگە شا تەواوی یارمەتییەکانی لێبڕێ و تەنانەت بۆ پێمل بوون و بە چۆکداهاتنی کوردان

---

١– ئەم سنوورە زۆرتر هێڵی تالۆگ یان نێرینەی ئاوە کە بە نێوەڕاستی ڕووبارا تێدەپەڕێ. "یۆنسی"

هاوکاری ئێراق بکا، تێما. هەروەختایەکی بارزانی ئەم مەبەستەی دێنا گــۆڕ ئێرانییــەکان پێیاندەگوت هەر بیریشی لــێ نەکاتەوە؛ بەلام دەبێ دڕدۆنگی کوردان دواتر لـە هاوینـا پتر بووبێ: ئەمە وەختایەك بــوو کــە ئێریــك ڕۆلــۆ، سەرنووســەری بەشــی ڕۆژهــەلاتی نێوەڕاستی "لۆمۆند" بە کوردانی گوت کە شا لـە دوایین دیـمانەیدا خۆی درکاندوویە و گوتوویەتی بوون و نەبوونیان بە شێرەیەکەوە بەستراوەتەوە, کە ئەو دەتوانێ هەرکات مــەیلی لـــێ بــێ بیکاتــەوە یــا بیگرێتــەوە. ڕۆلــۆ ســەری لـەمــە ســوڕما کــە کــوردان گرینگایەتییەکیان نەدایە ئەم پلارە تیــژ و نــەکاوەی شــا و دەتگــوت بــێ ئــەوەی بــیری لــێبکەنەوە گوێیان لـە ئاکامەکەی ئاخنیۆە و بەم ئاکامە گەیشت کە ئەمانە (کــوردان) خاوەنی توانــایی شــیکردنەوە و لێکدانــەوەی ڕووداوەکــان نــین. دەلــێ: "وەختایــەك تەماشام کــرد ئــەم هەوالــە چــاو و گــوێی نەکردنــەوە, ئــەم مەبەســتەم بــردەوە ســەر بێئەزموونی ئەوان لـە بابەت بارودۆخی جیهانەوە." لـە ڕاستیشدا زۆربـــەی ڕێبـــەرانی پــارتی دێمــوکراتی کوردســـتان, بەتایبـــەت دەوروبەرییـــەکانی بــارزانی, بــە خۆیــان سەلــماندبوو کە ئێران قەت لـەگەل ئێراق سەودا ناکا؛ کاتێك وەخۆ هاتنەوە تــازە کــار لـە کار ترازابوو. بەلام هەر بەڕاستی واشینگتۆن چلۆن دەیتوانی شا لـە وەها ســەودایەك — بێتوو ویستبای — پەژیوان کاتەوە و نەیهێلێ؟ ئەم ڕازە هەروا سەر بە مۆر مایەوە.

هەر دەتوانین ئەوەندە بلێین کە ئەم مل‌نەدانەی کوردان ســەبارەت بــە سەلـــماندنی ئەو دیاردە شومانەی بێپسانەوە پتر لـەسەریەك کەلـەکە دەبوون ڕەنگێکی بــەزەییبزوێن و هومێدپرووکێنی هەبوو. ئەمانە بە خۆیان سەلــماندبوو کە چــەند مانگێکیــان لـەگــەل خودموختاریدا — لـە ڕاستیدا لـەتەك سەربەخۆییدا — پتر مەودا نیە. ئەو کەسانەی بە شەوق و تامەزرۆییەکی کەمترەوە لـە ڕووداوەکانیان دەڕوانی دەیانتوانی بە هێنانەوەی بەلگە و نیشاندانی لایەنــەکانی وریــا کردنــەوەدا, ئــەم هەســتەیان ڕۆمــرکێنن. بــەلام کوردان وەك بنچینەیەکی پتەوی ئیمان و بڕوا لایان وابوو کە ئەوەی پێویستە لـە بابەت ئێرانییەکانەوە بیزانن, دەیزانن؛ دەتگوت بەدگومانی و دڕدۆنگی سەبارەت بە تــاران لــە تایبەتییەکانی ژیانی ئەم خەلکە بوو. وێش دەچێ هەر ئەم فرە دڕدۆنگییــە بــوو بــێ کــە

ئەوانی هەڵفریواند و نەیهێشت بیری لـێبکەنەوە و رێی نـەدا دیـاردە و بەڵگـە زۆر و زەوەندەکان لــە پـەنا یـەك دابنێـنن و سـەرجەمی چـەرخ و خـولی ڕووداوەکـان بێتـە بەرچاویان. هەتا ئاخرییەکەی کە ئیدی چی بە بەرەوە نەمابوو. بارزانی قەت نەیزانی کە شا چەندە ورد و زیرەکانە هەڵومەرج دەناسێ و تا چ ڕادەیەك تاسەباری زەبروزەنگێکە کە بـە لەسـەرەخۆیی بـەرێوەی دەبـا و چـەندە بێبەزەیـە. ئـەم ڕەوت و ڕووداوە لــە سەرەتاوە تا کۆتایی تەنیا و تەنیا گۆڵمەزی خودی شا بوو.

خۆش ئەمەیە کە بە باری نیزامییدا کوردان بۆ وڵامی پەلاماری ئێـراق کـە تـەواو بەهێز ببوو, ساز و ئامادە نەبوون. لەسەر کاخەز کوردان قەت ئەوەندە هێزدار نەبوون: لـە ژێر دەستی ڕاوێـژکاران و پـسپۆڕانی ئـەمریکایی و ئیـسرائیلی و ئێرانـی پـەروەردە کرابوون و ئەمـجار بە پێچەوانەی ساڵانی دەیەی ١٩٦٠ کە تەنیا خاوەنی هێزی پیـادە و چەکی سووك بوون، ئێستا تۆپـخانەشیان بە دەستەوە بوو و بـە چـەکی نـوێی هێـزی پیادە تەیار کرابوون. بەشی هەرە زۆری چەك و جبەخانەیان ڕووسی بوون؛ (ئەم چەکانە بوون کە یان ئەمریکاییەکان لـە شەڕی ویێتنام بـە خەنیمـەتیان گرتبـوون یـان ببوونـە دەسکەوتی ئیسرائیل لـە شەڕی شەش ڕۆژەی عەرەباندا.)[1] ئەمەش تەگبیرێك بـوو کـە باڵـی یارمەتیدەرانی دەگـرت هـەتا دەسـتێوەردانی خۆیـان بـە شـێوەیەکی بـاش وە درۆ بـخەنەوە. زۆر دواتـر کوردەکـانی ژوورەوەی ئێـراق لــە لایـەن دوو گـوردان و نیـو تۆپـخانەی دوورهاوێژەوە پشتیوانییان لـێدەکرا. ئەم هێزانە کە خاوەنی پتر لــە سـەت تۆپ و مووشەکی زەوی بۆ حەوا "ڕاپیەر"ی ئینگلیسی بوون و پسپۆڕەکانیان خانەنشین

---

١– ... "پاش هێرشی مەلیك حوسێن بۆ سەر فەلـەستینییەکان و تێكشـکاندن و ڕاونانیـان، جارێکیـان لــە سەفەرێکیدا بۆ تاران بە شا دەڵێ، چەكوچۆڵێکی زۆرمان لـە جبەخانەی فەلـەستینییەکان وە دەس کەوتووە کـە بە کەلکی سپای ئۆردۆن نایەن. ئێوە دەتوانن ئەم چەکانە بدەنە کوردانی بارزانی لـە ئێراق. شـا پێـشوازی لــەم پێشنیارە دەکا و بە ١٤ کەڕەت فڕینی فڕۆکەی هێرکوولێسی C–١٣٠ چەكوچۆڵەکان لــە عەمانـەوە دێنێتـە شارەکانی تەورێز، سنە و کرماشان و دەیانداتە بارزانی." سەرچاوە: بیرەوەرییە تایپکراوەکانی سەرتیپ "قـەدەر" لـە واشینگتۆن، ڕەزبەری ١٩٧٤ی هەتاوی، یادداشتەکانی سەرتیپ قەدەر، باڵوێزی ئێران لـە عەمان. "یۆنسی"

کراوانی سپای ئینگلیس بوون، لەسەر سنوور دامەزرا بوون. لەگەڵ ئەمەشا خێرا خێرا بەرەو چیا دەکشانەوە و تەنانەت لەم کۆنە وارگە و مەتەرێزانەشدا تەنیا لــە ســۆنگە و سایەی پشتیوانی ئاگری تۆپــخانەی ئێرانــەوە بــوو کــە توانیــان خــۆ ڕابگــرن. کۆســپی گەورەی کوردان ئەمە بوو کە پاڵپشتە غەوارەکانیان پێیــان سەلــماندبوون وا شــێوەی شەڕی دەس‌وەشاندن و دەرباز بوونی خۆیان کە بەڕاستی چاکیان لــێ‌دەزانی, وەلا بنێن و ڕوو بکەنە شێوەی شەڕی بەرەنگار بوونی ڕاستەوخۆ؛ لەوەشدا پێــــشمەرگە نـــــە توانستیان هەبوو نە بۆ ئەم شێوە شەڕەش پەروەردە کرابوون.

لەمەش خراپتر ئەمــەبوو کــە ئــەم گــۆڕانی تاکتیکــە کــوردانی پــتر لــە جــاران بــە پشتیوانانی غەوارەوە, بەتایبەت بە "شا"وە گرێ دا. بارزانی لە نامەکەیا بۆ کارتێر لەمە گلەیی دەکا کە "درەنگ وە خۆ هاتینەوە ... کاتێك وە خۆ هاتینەوە کــە بــەرەورووی هەشت لەشکری ئێراق, سەدان تانك و پتر لە سەت فڕۆکەی پێشکەوتە بووینەوە کــە فڕۆکەوانی هێندێکیان ڕووس و هیندی بوون ... ئەو یارمەتییانــەی کــە دۆستەکانــمان پێیان کردین هەم بە باری چەندێتی و هەم بە باری چۆنێتی زۆر [لە چەك‌وچۆڵی سـپای ئێراق] لە خوارتر بوو." ئێران زۆرجاران ئەو وەختانەی کوردان دەکەوتنــە پێــشڕەوی، چەتی دەخستە ناردنی چەك‌وچۆڵ و هەرکە پاشەکشەیان دەکــرد و دەگەڕانــەوە ســەر سەنگەرەکانی خۆیان، سەرلەنوێ دەستی پێدەکردەوە و پتریش وایان دادەنا کە کوردان قەت لە بەشی سێ‌ڕۆژیان زیاتر پاشەکەوتی گوللەی تۆپــخانە بە لاوە نەبێ. ئاخرییەکی کوردان تێگەیشتن کە ئەم ئەرکەی هاوپەیــمانانیان خستوویانەتە ئەســتۆیان ئەمەیــە کــە سپای ئێراق لە شوێنی خۆیان ڕەق ڕاگرن, نەك بە سەریاندا زاڵ بن.

لە پێداچوونەوەدا وا دێتە بەرچاو کە کوردان یان خەڵکێکی گێل‌وحۆل بــوون یــان زۆر وێڵی چارەنووس. بەڵام بۆ بەرگری کردن لە بارزانی دەبێ بێژین کــە کوردەکــانی ئێراق گێڕانی دەوری "سەرودڵگر"انەی خۆیان بــە تــەواوی پــێ بێ‌جــێ نــەبوو. ئــەوان خۆیان هەمیشە بڕوایان وابوو و دەیانگوت کە دەتوانن بشێوی بــخەنە وڵاتی ئێراقــەوە, بەڵام قەت ناتوانن پەلاماری بەغدا بدەن و داگیری بکەن و خۆیان ڕاستەوخۆ دەسەڵات

بگرنە دەس، لە ١٩٦١ەوە بۆو لایە توانیبوویان کەم و زۆر بە سەرکەوتنەوە خۆڕاگری بکەن.

هەتا سێپتامبری ١٩٧٤ ئێراقییەکان پێشکەوتی زۆر بەرچاویان وە دەست هێنابوو و حاڵوباڵی کوردان وەها تاڵوتوون بوو کە ئێران تۆپخانەی دوورهاوێژ و چەکی تانک شکێنی وێدان. وێڕای ئەمەش لە دەوروبەری ساڵی تازەدا کوردان کەوتبوونە هەلومەرجێکی تەواو ناخۆش و پڕ مەترسی. عەلەم لە بیرەوەرییەکانی‌دا کە پاش مەرگی بڵاوکرایەوە، کە دێتە سەر باسی ڕۆژی سێی ژانویە دەنووسێ: "شا کە ڕاپۆرتی چالاکی هێزەکانی ئێرانی بۆ هاتبۆوە و باسی ئەمەی دەکرد کە وەك شێر شەڕیان کردووە و نەیانهێشتووە کوردان تێك‌بشکێنن و وورەی بەرەنگارییان بەرز کردوونەوە، زۆری پێ خۆشحاڵ بوو." سەرەڕای ئەم فیز و شادییەی کە شا بە بۆنەی شکستی پڕ سووکایەتی ئێراق هەستی پێدەکرد، بارزانی بە ئاشکرا دڵنیگەران بوو. چەند حەوتوویەك ئەویان بە هیوای چوونە خزمەت شا کە هەموو جارێك وە دوا دەخرا، لە تاران بە سەرگەردانی ڕاگرت. دەنگۆ دەربارەی کەیخودایەتی ئۆردۆنی و ئەلجەزایرییەکان بۆ کۆتایی هێنان بە نێوان‌ناخۆشی ئێران و ئێراق لەسەر حیسێبی کوردان، هەر دەهات و پتری پەرە دەگرت. بارزانی لە نامەی ڕێکەوتی ١٩٧٧ی خۆیا بۆ کارتێر دەڵێ کە ئێراق "ناڕاستەوخۆ" لە واشینگتۆنی حاڵی کردبوو ئەگەر بێتوو شا دەس لە کوردان هەڵگرێ، نێوانخۆشیی لەگەڵ ڕووسان کەم دەکاتەوە. بەڵام ئەم مەبەستە جێی گومانە کە بارزانی ئەوان سەردەمان لەم ڕەوتە ئاگادار بووبێ. هەرچۆنێك بێ بارزانی لە دوایین ساتەکانا، خۆی پێشنیاری مامەڵەیەکی دایە سەددام حوسێن کە لێی قبووڵ نەکرد، چونکە وت‌وویژی لەگەڵ شا گەیبووە شوێنێك کە ئیدی پاشگەز بوونەوەی لێ نەدەکرا.

شا پیاوێکی گەلێك متمانە پێ‌نەکراو بوو؛ ئەو کوردانی خستە پێ‌وشوێنی شێری چۆلەکە و گوتبووی بچنە لای مەلیك حوسێنی پاشای ئۆردۆن و لە بابەت پێکهێنانی دەوڵەتی لە تاراوگەدا وێڕای تەواوی دژبەرانی ئێراق پرسی پێ‌بکەن. نێردراوەکان لە

ژانویەدا گەیشتنە عەمان, ئەوانیان حەوتەیەك ماتڵ کرد و ئاخرییەکەشی مەلیك حوسێن چاوی پێیان نەکەوت. پاشان لە فێوریەدا سەرۆك ئەنوەرسادات داوای لە بارزانی کرد کە سامی عەبدوررەحمان بنێرێتە قاهیرە. لەم دیدارەدا سادات سامی هەڵفریواند کە رازی بێ میسر پێشنیارێکی پێکهاتن لە لایەن کوردانەوە بداتە سەددام حوسێن؛ بەڵام بە بێ ئاگاداری کوردان دەستووری دا بە نەهێنی وتوویژەکان لەسەر شریت تۆمار بکرێن و پاشان شریتەکەی بۆ شا نارد و شا زۆری پێ توورە بوو.

هیچ سەیر نیە کە بارزانی دیسانیش ویستی بچێتە واشینگتۆن و کارێکی وا بکا کە ئەمریکایییەکان بۆ چاك کردنی ئەم بارودۆخە نیزامیی و سیاسییەی تەواو بەرەو ناخۆشی و تەمتومان ئاژاوتبووی، چارەیەك وەدۆزێ، کە ئەم هەنگاوەش بە هیچ کوێ نەگەیی. ئەو کە هیوادار بوو بە رێیەکی دیکەدا لە کاربەدەستانی باڵای ئەمریکا نیزیك بێتەوە و سەرنجیان رابکێشێ سێ قالیچە و پاشان ملوانکەیەکی مرواریینیشانی وەك دیاری بە بۆنەی زەماوەندی لەتەك "نانسی ماگینێز" نارد بۆ کیسینجێر. بەڵام ئەم دەربڕینی نیزیکایەتییەش ئاکامێکی لێ نەکەوتەوە. کیسینجێر کە ئێستا وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو، لە ١٩٧٣ەوە بۆو لایە, ناردنی یارمەتی ئەمریکای لێ کەم کردبۆوە. سەرەڕای تەواوی ئەمانەش بارزانی لە نامەی رێکەوتی ٢٢ی ژانویەی ١٩٧٥دا دیسان مەسەلەی دیدەنی لە واشینگتۆنی هێنایەوە گۆڕ. هەروەك دوکتۆر مەحموود عوسمان زۆر دواتر گوتی " کیسینجێر ماوەیەکی درێژ بە وردەکاری رەوتی رووداوەکانی" دەزانی. تەواو مانگێکی ئازگاری کێشا هەتا کیسینجێر وڵامی "ژێنێراڵی عەزیز"ی داوە و ئەوی لە بابەت "رێز و تاریفمان سەبارەت بە خودی خۆتان و خەڵکەکەتان و هەوڵی بوێرانەتان" دڵنیا کردەوە و لە مابەینی ئەو قسە پووتانەدا داخوازەکەی بردەوە پاش: "ئەم کەندوکۆسپانەی ئێوە لەگەڵیان دەستەویەخەن سامناکن." نامەکە دەیگوت:

***سەبارەت بە لێکدانەوەتان لەسەر بارودۆخی سیاسی و نیزامیی یەگجار خۆشحاڵ بووم. دڵنیا بن کە راسپاردەکانی ئێوە لەبەر گرینگایەتییەکی بە لامانەوە هەیانە،***

*دەکەوتە بەر سەرنجی وردی باڵاترین کاربەدەستانی دەوڵەتی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.*

*بێتوو بخوازن بۆ دانی زانیاری پتر بە دەوڵەتی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بابەت هەلومەرجەوە, کەسێکی باوەڕ پێکراو بنێرنە واشینگتۆن، بە شادی و شانازییەوە وەریدەگرین. من لام وایە کە پاراستنی نهێنیکاری تەواو لە دابین کردنی توانایی ئێمەدا بۆ ڕاپەڕاندنی ئەوەی هەتا ئێرە کردوومانە, هۆکارێکی گرینگ بووە. تەنیا بەم هۆیەیە – و نیگەرانی لە بابەت پاراستنی خودی خۆتانە – کە من لەم بابەتەوە کە خوازیاری دیداری ئێوە بم لێرە، دڵاودڵ دەکەم. بە تاسەوە هیوادارم خێرا هەواڵی زیاترم لە لای ئێوەوە پێ بگا.*

*تکایە ئاواتی باش و ڕێزی بێسنوور و هەرەچاکم لێ قبووڵ بکەن.*

لە ڕاستیدا هەروەك ئەم لەکۆڵ خۆ کردنەوەیە – ئەویش بە شێوەیەکی ئاوها ویشك و پڕگرێ – دەریدەخست، کیسینجێر هیچ پێیخۆش نەبوو کە هیچ شتێك لە بارزانی ببیستێ. بەڵام بێپسانەوە پەیامی دڵپەرۆشی لە لایەن کالاهان، سەرۆکی بەشی "سیا"ی تارانەوە دەهاتن؛ ڕێکەوتی یەکەم پەیام دوو حەوتە پاش ئەم نامەی سەرەوەیە و هەر دوای ڕێككەوتنێك بوو کە شا لە سەعات دووونیوی پاش نیوەڕۆی شەشی مارس لە دیدارێکی نهێنیدا لە کەنار کۆبوونەوەی سەرۆکانی ئۆپێكدا لەگەڵ سەددام حوسێن کردبووی. شا لە بەرامبەر چەسپاندنی دەسەڵاتیدا لە لایەکی یەکاویعارەبان و چاوپۆشی ئێراق لە داوای خۆی لەسەر خووزستان – پڕ نەوتترین پارێزگای ئێران – و کۆتایی هێنان بە نانەوەی ئاژاوە لە بلووچستانی ئێران, لەپڕ کوردانی بەرەڵڵا کرد. (لەمێژ ساڵ بوو کە ئێراق لە خووزستان یا بە قەولی خۆی, عەرەبستانا، کە ئیددیعای دەکرد بە ناهەق لە گەلی عەرەب دابڕاوە, یارمەتی ئاژاوەگێڕانی دەدا.)

کیسینجێر و هێلمز و ویلیام ئی.کولبی، سەرۆکی سیا و تەواوی کاربەدەستانی ئاگاداری گەڕیانەکە هەموو ئیددیعایان دەکرد کە لە هەڵبژاردنی زەمانی ڕووداوەکە – نەك لە نێوەرۆکی ڕێككەوتنەکەی ئەلجەزیرە – بەڕاستی تەواو سەریان سوڕماوە. ئەو

جۆرەی کە کۆلبی دەیگوت، سیا ئەم ڕووداوەی "بە هـەق و دەسـەڵاتی شـا دەزانـی."
سەرەڕای تـەواوی ئەمانـە و لـەگـەڵ ئـەم گـشتە داخـوازە هیوابراوانەیـەی کـوردان، دەوڵـەت هیچی نەکرد. کۆلبی دواتر گوتی: "داستانێکی پڕ کارەسات بوو، داسـتانێکی جوان نەبوو. بەڵام هەر ئەوێ بەهارێ گەلێك داستانی پڕ کارەساتی ترمان لـە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا بە ڕیشەوە ببوو, کە زۆر لـەمە گرینگتر بوون." مەبەستی کـامبۆج و ویێتنامی باشووری بوو.

لـەگەڵ ئەمەشدا کە ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هێـشتا کەڵـەهێزێك بـوو – ئەگەرچی برینـدار – کیـسینجێر هـەر لــەو بەهاریـدا لــە گـەڕیانی وتوویـژەکانی سەبارەت بە لێك‌کردنەوەی هێزەکانی میسر و ئیسرائیل لـە دەمـی درا و پاشـانیش لـە هیندوچینا خوێڕی کرا و سووکایەتی بەسەر هات. دەوڵـەتی ئەمریکا – بـە پێـچەوانەی ئیسرائیل – ئەو بۆنە و بیانووەی بە دەستەوە نەبوو کە بڵێ دەوڵـەتێکی بچووك بـووە و نەیتوانیوە دەنگی بۆ بەرگری کردن لـە هاوپەیـمانێکی بەرڵڵاکراو هەڵبرێ. بەڵگەیەکی ئەوتۆ هەتا ئێستاش بڵاو نەکراوەتەوە کە نیشانی بدا دەوڵـەتی "فۆرد" تەنانەت بیری لـە وەها بۆنە و بیانوێك کردبێتەوە: هەروەك گەلـێ دواتر هێلـمـز لــە بابـەت هەڵوێـستی خۆی سەبارەت بە مامەڵـەی ئەلـجەزیرە گوتی: "من لام وابوو واشینگتۆن کـەیفی پێـی سـاز دەبـێ" چـونکە هەرچـۆنێك بـێ ئێـران کـە هاوپەیـمانی ئـەمریکا بـوو، ئێراقـی هاوپەیـمانی سـۆڤیەتی شکـست دابـوو. هـەروەك کیـسینجێر لــە بیرەوەرییەکانیـدا نووسی: "شا بۆ ئێمە لـە ڕێزەی ئەو ڕێبەر و هاوپەیـمانە دەگمەن و توند و پتەوانـە بـوو کە تێگەیشتنی لـەسەر هەلومەرج و بارودۆخی جیهان، زانیاری ئێمەی پێهەڵادەبرد."

سـەرەڕای تـەواوی ئەمانـەش واشـینگتۆن بـە گـوێرەی ڕەوتـی ئـەم گەڕیانـە وای لـێحاڵی ببوو کە شا لـە ڕێك‌کەوتننامەی نێـوان خـۆی و کیـسینجێر کـە لـە سـاڵی ١٩٧٢دا مۆرکرابوو, لای داوە. تەلگرافێکی "سیا" لـە ڕێکەوتی ٢٢ی مارسی ١٩٧٤ کە لـە "ڕاپۆرتی پایك" لـە ١٩٧٦دا لـە قـاو درا ڕووداوەکـە بـە کـورتی دەگێڕێتـەوە: ئێران وەك ئێمە, قـازانج و بەرژەوەنـدی "لــە پێکهێنـانی حاڵوبـاری نـە شـکان و نـە سەرکەوتن‌دا دەبینـێ." هیـچمان نامانـەوێ ببیـنین کـە کێـشەکە لایـەکی وە لایـەکی

کەوتووە. بەڵام ئێستا شا بە مەیلی خۆی کۆتایی بەم بارودۆخە هێنابوو و گێرە و کێشەکەی بە بێ ئاگاداری کوردان و بە ڕواڵەت بە بێ ئاگاداری ئەمریکاییەکانیش چارە کردبوو. واتە ئەگەر بشێ وتەی کاربەدەستانی ئەم دەوڵەتانە بڕوایان پێبکرێ. کیسینجێر زۆر دواتر گوتی وەختایەك گوێبیستی پەیماننامەی ئەلجەزیرە بۆتەوە واقی بردۆتەوە و هەر لەڕێوە بایداوەتەوە و چۆتە زووریخ کە چاوی بە شا بکەوێ کە خەریك بوو بگەڕێتەوە ئێران. کیسینجێر بە ڕاوێژێکی کە بۆنی شەرم و شوورەیی لێدەهات گوتی: "بڕوا و بۆچوونی ئێمەی نەپرسی." بەڵام لێرەدا بیرگەی کیسینجێر کڵاوی دەنایە سەر: ئەم دیدارەی زووریخ بەر لە هەڵکەوتی ئەلجەزیرە بوو و ئەگەرچی شا وا بە ئاشکرا مەبەستەکەی لا نەدرکاندبوو، بەڵام دەیزانی چ دەقەومێ.[1]

بە باری سیاسەتی ئەزموونیی و کردەوەییدا (Realpolitik)، شا بۆیە ئەم کارەی نەکرد کە هاتبووە سەر تێشکانی سەربازیی, ئەگەرچی هێزەکانی چورتمیش کرابوون و بەربەرەکانی کوردان لە وەرزی شلێپێڕی زستانا بە کردەوە کۆتایی پێهاتبوو؛ ئێراقییەکان بۆ یەکەم جار لە چیاکان مابوونەوە و نەگەڕابوونەوە بنکە زەمسانییەکانی خۆیان. وەرزی هەڵگیرسانەوەی شەڕەکانی بەهاری بە خۆی و مەترسییەکانی چاوەڕوان نەکراوی نیزیك دەبۆوە. بەڵام لە ڕاستیدا شا بۆیە ئەم کارەی کرد کە بە قازانجی بوو و هەروەها شەریکە غەوارەکانی نەیانویست یا

---

١- ئەحمەد چەلەبی، لە شیعە دوورخراوەکانی ئێراق, کە ئەو کات لاو و بنکەی لە بەیرووت بوو "هەستی بە ڕەوتی ڕووداوەکە کردبوو." هەر بۆیە دروست بەر لە کۆبوونەوەکانی ئەلجەزیرە بەرەو تاران باڵی گرت و بارزانی ئاگادار کردەوە. ئەو شتەی کە سەرنجی چەلەبی ڕاکێشایە سەر ڕەوتی ڕووداوەکان تەنیا دیداری زووریخ نەبوو, بەڵکوو ڕێ کل کردنی شا بوو بە مەبەستی ئاگادار کردنەوەی پایەبەرزانی گرینگ بەر لە کۆبوونەوەکانی ئەلجەزیرە. سادات و مەلیك حوسێنیش هەرتك لەم سەودایەی خەریك بوو سەری دەگرت, ئاگادار بوون. نەسیری دەستووری دا بە چەلەبی کە خێرا بگەڕێتەوە بەیرووت: "چما بەرژەوەندی و چاکەی خۆت دەوێ، بڕۆوە." لەگەڵ ئەمەشدا چەلەبی لەم ماڵە پارێزراوەدا کە بارزانی پێ لەوێ میوانداری دەکرا، چاوی پێیکەوت. لە ژوورەوەدا ئامرازی دەنگدزینیان دانابوو, لە بۆیە وتوویژەکان لە باخچەی حەوشە کران. بارزانی هەناسەی هەڵکێشا و تف و لەعنەتی کاربەدەستانی ساواکی کرد کە نەیانهێشت چاوی بە شا بکەوێ.

نـەیانتوانی پێـشی بگـرن. ئـەوەی دیپلۆماتـە بەئەزموونـەکان بـە شـوێنییەوە بـوون و دەیانـخواست بیزانن، ئەوە بوو کە داخـوا سـەددام حوسـێن چاوپۆشـی لـە چـەندەی یەکاویعارەبان کردووە کە ئێستا هێڵی سنوور بە نێرینەیدا تێپەڕیوە و داخوا نێرینـەی گرتۆتەوە یان نا؟ ئەمەش شتێ بوو کە بەتایبەت بـە هۆگـەلی تـاکتیکی و بنەماڵـەیی و خۆکەسی مەبەستی بەرچاوی شا بوو.

هەتا ساڵی ١٩٩١ کیسینجێر شی کردنەوەی تەواوی ئەم کێـشە و ڕووداوانـەی تەنیا لـە کورتە بەندێکی پەراوێزی بیرەوەرییە قەبارەمەندەکەیدا باس کـرد، جـا سـەیر ئەمەیە کە لـەم کورتە پەراوێزدا هەر باسی یەکاویعەرەبانی نەکردبوو و بەڵێنی دەدا کە لە بەرگێکیترا باسی "گێرە و کێشەی پـڕ کارەسـاتی کـوردان و ئاکامـەکانی" دەکـا؛ هەڵبـەت قـەت وای نـەکرد. لـەم پـەراوێزەدا کـە بـە ڕواڵـەت وا دیـارە دیهـەوێ ڕیس‌وگوریس بۆ کردەوەی شا بێنێتەوە دەڵێ: "تەمای شا لـەسەر بناغەی ئەم تێگەیشتنە زۆروکەم دروستە کە وا کوردان گەیشتوونە هەڵدێری بـەزین و بـە بـێ خۆتێـوەردانی دوو لـەشکری ئێرانی و ٣٠٠ میلیۆن دۆلار یارمـەتی ئێمـە قوتـار نـابن." ئەمـەی کـە بەڕاستی هێزەکانی بارزانی تا چ ڕادەیەك گەیبوونە سـەر هەڵـدێری بـەزین و تێـشکان، تەنانەت تاکوو ئەمڕۆش هەر لـەسەر بنەمای شك و گومانە. دروست بـەر لـە دیـداری ئەلـجەزیرە, ئەوکاتەی کە چەلـەبی بـارزانی وریـا کـردەوە "ئـەوی بـە ژاکـاوی هاتـە بەرچاو, ئەو گازندەی کرد کە تەنیا لـە سەتاسێی هێزی پێـشمەرگە سـەرقاڵی شـەڕن." وێڕای تەواوی ئەمانەش کوردەکانی ئێراق هەروا پێیان وابوو کە ڕەنگـە شـا لانیکـەم هەڵومـەرجێکی ئابرووداران ـەیان لـە ئەلـجەزیرە بـۆ بڕەخـسێنێ. کیـسینجێر لـە بیرەوەرییەکانیدا شی ناکاتەوە کە بە گوێرەی کام بناغـە و بنـەڕەت حـوکم دەدا کـە "کردەوەی شا زۆروکەم دروست" بووە و بە پێـی چ حیـساباتێك گەیوەتـە ئـەم ٣٠٠ میلیۆن دۆلارە و ئەمریکا کە ساڵگاران بە نیشانەی دەورگێڕان لـەم گەڕیانەدا پوولێکی کەمی خەرج دەکرد، بۆچی چاوەڕوان دەکرا ئەم هێندە پوولە بدا. کیسینجێر بـە بـێ هیچ چەشنە ڕەخنەگرتن و هەڵسەنگاندنێکی ئەم هەڵوێستە یەکلایەنەیە تـەنیا دەیگـوت

كە خۆڕایی كردنی كوردان "تەمایەك بوو كە دەبوو شا بیگرتبا." ئەم شەڕە هەر لە دەسپێكەوە هەتا كۆتایی شەڕی شا بوو نەك واشینگتۆن.

لەگەڵ تەواوی ئەمانەش‌دا كوردان بە دڕدۆنگی دەیانڕوانییە ئەم "پەڕاوێزە"ی كی‌سینجێر و ئەویان بە پاكانە كردن بۆ خۆی لێك‌دەدایەوە.

كی‌سینجێر لە ژێر گوشارا, ئەویش لە **١٩٩٢**دا، لە وت‌وویژێكی ڕۆژنامەوانی‌دا ئاشكرای كرد كە "چوار یا شەش حەوتوو" بەر لە كۆبوونەوەكانی سەرۆكان لە ئەلجەزیرە, شا لە بابەت **٣٠٠** میلیۆن دۆلارەوە پێوەندی پێوەگرتووە و پێی لێنا كە ڕەنگە شا بە هێنانە گۆڕی ئەم هێندە پووڵە ویستبێتی سەرەدای سەودا یەك‌لایەنەكە خۆش بكا و بە شوێن بەڵگە و بیانوویەك‌دا گەڕاوە بۆ ئەم كردەوەی خۆی. بەڵام بە هەر حاڵ ئاشكرای نەكرد كە داخوا ئەو كاتی ئەو بە هیچ شتێكی زانیبوو یان نا. بەڵام هێنانە گۆڕی ئەم هێندە پووڵە بەرچاوە بە ئاشكرا ئاماژەیەكی ڕوون بوو؛ نیشانەی ئەمە بوو كە شا لە پشتیوانی كردنی كوردان ماندوو بووە و لە شوێن بیانوێك گەڕاوە كە كوردان بەرەڵڵا كا و تاوانی ئەم كردەیەش بخاتە ئەستۆی دیتران, یانی ئەمریكا.

هێنانە گۆڕی **٣٠٠** میلیۆن دۆلار یارمەتی ڕاستەوخۆ بە مانای سازكردنی كۆسپ و تەگەرە بوو لەسەر ڕێ. شا كە بە وردی واشینگتۆنی خستبووە بەر سەرنجی، باشتر لە هەر كەسێكی تر دەیزانی كە لە ساڵی **١٩٧٥**دا ڕوخساری "كەڵەپیاوانەی" كی‌سینجێر تولەخ هەڵگەڕاوە و لە تروسكە و دەرەوشانەوە كەوتووە و ئەم چالاكییە نەهێنییانەی كە ئەو لەم سەرەوسەری دنیا پشتیوانی لێ‌دەكردن هاتوونە ئەستۆی. لە ویتنام بارودۆخ گەیشتبووە ئاستی تەقینەوە و لێك بڵاو بوون و ئیسرائیلییەكان دەیانویست وت‌وویژەكانیان لەگەڵ میسر سەبارەت بە كشانەوە لە سارای سینا ڕابگرن. "شا"ش وەك هەموان دەیتوانی ببینێ كە كی‌سینجێر ناتوانێ تەنانەت كۆنگرە بۆ تەرخانی پووڵێك بە مەبەستی بەرگری كردن لە گیرانی سایگۆن ڕازی بكا, جا چ بگا بە **٣٠٠** میلیۆن دۆلار بۆ كوردان. بە پێچەوانە شا كە چوارقات بوونی داهاتی نەوت ئەنگراندبووی و یارمەتی دابوو كە پاش شەڕی ساڵی **١٩٧٣**ی عەرەب و

ئیسرائیل ببێتە مێشکی بیرۆمەندی ئۆپێك، لە باری ماڵییەوە لەگەڵ وەها تۆڕ و داوێکی یاسایی بەرەوڕوو نەبوو. پووڵ بۆ شا هۆکارێکی بنەڕەتی نەبوو.

بارزانی لە ڕاسپاردەی ڕێکەوتی ١٠ی مارسی خۆیا بۆ کیسینجێر، یانی پاش مۆرکرانی پەیمانی ئەلجەزیرە, نێوکی قسەکەی دڕی:

***جەرگمان خوێن دەدەڵێنێ کە دەبینین یەکێك لە زنجیرە ئاکامەکانی ڕێککەوتنیان لە ئەلجەزیرە تەفروتونا کردنی خەڵکی بێپەسارمانە بە شێوەیەکی وا کە ئێران سنوورەکانی خۆی خڕ و پتوون لێبەستێن و ئێراق گەورەترین پەلاماری خۆی دەس پێکرد و هەروا درێژەی هەیە. شۆڕشی ئێمە و گەلەکەمان بە شێوەیەکی باوەڕ نەکراو تێدا دەچن و کەس متەقی لێوە نایە. ڕێزداری بەرزەجێ, ئێمە لامان وایە کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئاست گەلی ئێمە, کە خۆی کردۆتە پابەندی سیاسەتی وڵاتی ئێوە, بەرپرسێتی ئەخلاقیی و ڕامیاری هەیە ... جەنابی وەزیر, ئێمە بە دڵپەرۆشییەوە چاوەڕوانی وڵامی ئێوەین.***

دوازدە ڕۆژ دواتر کالاهان لە تاران, تەلگرافێکی بۆ کۆلبی، سەرۆکی "سیا" لێدا و گوتی کە کیسینجێر هەتا ئێستا وڵامی نەداوەتەوە و وریایی دا و گوتی: "ئەگەر واشینگتۆن دەیەوێ بەری کوشت و کوشتار بگرێ دەبێ لەڕێوە لە لای شا کەیخودایەتی بکا." هیچ شتێك لەم بارەدا نەگوترا و هیچیش نەکرا. هەر ئەو بەهارە کیسینجێر بە توندی لەگەڵ داخوازی پەیتاپەیتای یارمەتییەکانی مرۆڤدۆستانە بە مەبەستی دابین کردنی خێوەت و کەلوپەل بۆ هەزاران پەنابەری کورد دژایەتی کرد. لەم دەستوورەدا دەیگوت: "چالاکی نەهێنی نابێ لەگەڵ کاری لێژنەی میسیۆنێران بکرێنە یەك." ڕاپۆرتی پایك لە بابەت ئەم "بەرگری نامەیەوە" دواوە. ڕاپۆرتەکە باسی کیسینجێر دەکا و بە ناوی بەرپرسێکی باڵادەستی دەوڵەتی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناوی دێنێ.

بارزانی قەت ئیددیعای نەکردبوو کە کوردان دەستەبەربوونی ڕەسمییان لە ئەمریکا وەرگرتووە و هەڕەشەشی نەکردبوو کە ئەم سووکایەتی پێکرانەیان لەگەڵ بلاڤۆك و ڕاگەیەنەران دێنێتە گۆڕ. بارزانی بە بارێکی ئەوەندە ناسکدا کەوتبوو کە هەر

چەشنە تاوانێکی زیاتر بێ‌گومان دەبوو بە هۆی ئەوە کە شا سنوورەکان توندتر بتەنێ و بیانبەستێ. بەڵام کالاهان پەرۆشی ئەوە بوو کە ڕەنگە کوردان گلەوگازندەیان هەر لە جەغزی نەهێنی و پشتی پەردەدا نەهێڵنەوە و ئەم تاوانانە لەو سەرەوسەری دنیادا بڵاو کەنەوە. کالاهان پرسی:

***داخوا ئیدارەی ناوەندیی (سیا) لەم بابەتەوە پێوەندی بە کێسینجێرەوە هەیە؟ بێتوو دەوڵەتی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم گەڕیانە بە وریایی و کارزانی و بە شێوەیەکی وا ڕانەپەڕێنێ کە بتوانێ بەری ئەم مەبەستە بگرێ کە کوردان وا بزانن پشتمان تێکردوون, هیچ دوور نیە ڕەوتی ڕووداوەکان بدرکێنن و لە قاوی دەن. کردەوەی ئێران نەك تەنیا ئاواتە ڕامیارییەکانی بە با داون بەڵکوو گیانی هەزاران کەسیشی خستۆتە مەترسی.***

پەیام و ڕاسپاردەی لێکدالێکدای بارزانی بۆ سیا و سەرۆك جراڵد فۆرد و کێسینجێر هەر لە بەهاری ئەوساڵەدا بێ وڵام مایەوە. لە تەواوی ئەم مەبەستانەی کە "ڕاپۆرتی پایك" لێفەی لەسەر هەڵدانەوە, ڕەنگە ئەم ڕاپۆرتە کە سەرەتا لە لایەن "دانیەل چۆر"، هەواڵنووسی خاوەن ئەزموونی "سی بی ئێس"ەوە لە قاودرا و پاشان دەقی تەواوی لە ژمارەی تایبەتی فێوریەی ١٩٧٦ی "دەنگی گوند"دا بڵاوکرایەوە کە حەوتەنامەیەکی لیبراڵە, ویلیام سافایەر, وتارنووسی خۆپارێزی "نیۆیۆرك تایمز"ی سەیر ڕاتڵەکاند. سافایەر کە قەت لە ڕێبازی بەرگری کردنی بەگەرمەی لە کوردانی ئێراق تلاسا نەبوو, ئەم "هەراجکردنە بێویژدانانە"ی بارزانی مەحکووم کرد و داوای لە فۆرد کرد کە کێسینجێر لەبەر داسەپاندنی "ئەم کردەوە بێویژدانانەیە بەسەر دەوڵەتا" لە کابینە وەدەر بنێ.

سافایەر لەم کەترەخەمییەی دەوڵەت کە نەك تەنیا گوشاری نەخستە سەر شا کە "کردەوەیەکی شیاو سەبارەت بە دابین کرانی خودموختاری [لە بۆ کوردانی ئێراق] لە خۆی بنوێنێ, بەڵکوو تەنانەت دینارێکیشی "یارمەتی مرۆیانە" تەرخان نەکردبوو, زۆر نارەحەت بوو. "ڕاپۆرتی پایك" دەگەیشتە وەها ئاکامێك کە هەر لە دەسپێکەوە:

*سەرکۆمار و دوکتۆر کیسینجێر و شا هیوادار بوون کە "سایەنشینانی ئێمە" واتە کوردانی بارزانی, سەرنەکەون. لە باتی ئەمە وایان پێباش بوو کە سەرهەڵداوان ململانی و کێشەیان لە ئاستێکدا درێژە پێبدەن کە هەر بەشی لاواز کردنی وڵاتی دراوسێی هاوپەیمانەکەمان [ئێران], واتە ئێراق بێ. ئەم هەڵوێست و سیاسەتە بۆ سایەنشینانی ئێمە ڕوون نەکرایەوە کە هان دەدران هەروا درێژە بدەن بە شەڕ. کردەوەی ئێمە تەنانەت لە جەغزی چالاکی "نهێنی"شدا کردەیەکی دوور لە هەست و سۆز بوو.*

زێدە لەمەش "ڕاپۆرتی پایك" دەیگوت "ئەم بەڵگانەی هاتنە بەر دەستی کومیتە" بە گوێرەی قۆناخەکانی یەك لە دوای یەکی ئەوان سەردەمان دەریاندەخست کە چلۆن دەوڵەتی ئەمریکا, لە گوێن "شەریکێکی نزمۆکەی شا هاوهەنگاوی ئەم گەلاڵەیە بووە و لە ڕاستیدا وەك دەستەبەرێك خۆی نواندووە کە شا تاقمی سەرهەڵداوان (یانی کوردەکان) لەپڕ بەرنەدا." سەرەڕای ئەم بەرعودە بوونە سەرزارەکییانە شا پاشی سێ ساڵان و کوژران و بریندار بوونی هەزاران کەس و بەختی ١٦ میلیۆن دۆلاری ئەمریکا لەپڕ کوردانی بەرەڵلا کردووە. "ڕاپۆرتی پایك" لە کۆبەندی خۆیا کە لە جەغزی وشە و وتەگەلی زۆر ڕوودانپۆشراوا هەڵپێچرابوون زیادی دەکرد: "وا وێدەچێ ئەگەر هاتبا و ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دنەدانەکانی شای نەسەلماندبا ڕەنگە کوردان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیی ئێراق گەیشتبانە ڕێككەوتن و پێکهاتنێك. بەمجۆرە لایکەم هێندێکیان خودموختاری وە دەس دێنا و پێشی کوشتوبڕی زیاتریان دەگرت. لە جیاتیان کوردان درێژەیان بە شەڕ دا, هەزاران کەسیان کوژراو و نەقوستان لێکەوتەوە و ٢٠٠٠٠٠ کەس بوونە پەنابەر."

ڕەنگە ڕاپۆرتی پایك سەبارەت بە ئەگەر و لوانی ڕێككەوتن زۆری تێهەڵێنابێ, بەڵام دەس پێکردنەوەی شەڕ لە ١٩٧٢دا بێگومان ناوچەیەکی بەربڵاوی کوردستانی ئێراقی تاپۆ کرد و خەسارێکی گەورەی لە ناسیۆنالیزمی کورد دا. ئەوەی لەم نێوەدا بە ڕوونی خۆی دەنواند شادی و بەدەماخی شا بوو لە ١٩٧٥دا. لە گەڕانەوەی ئەلجەزیرەیدا کەیفساز بوونی تێکەڵ بە بێهەستییەکی لەم فەرتەنەبازییە

ماکیاولیییانەی لەسەر حیسێبی بارزانی کردبووی سنووری نەدەناسی. عەلـەم، وەزیـری دەربـاری ئێـران، باسـی ئـەم کـەیف قنجییـەی شـا دەکـا کـە پێیگـوت: "سـەفەری ئەلـجەزیرەی یەکێك لـە سەرکەوتووترین، سـەرکەوتەکانی ژیـانی بـووە. شـا هەسـتی دەکرد کە "دوو کۆسپی بە میراتبردەی زەمانی بـاوکی" چارەسـەر کـردووە. یـەکیان سەرشۆڕی و سووکایەتی سەبارەت بە داسەپان و قبوولّی دەستووراتی شەریکەی نەوتی ئینگلیس و ئێران[1] و ئەوی تر چەسپینی دەسەڵاتی ئێراق بەسەر یەکاویعارەباندا. کاتێك سەبارەت بە چارەنووسی کوردان پرسیاری لـێکرا بێ ئەوەی خـۆ شـلویّ کـا وڵامـی داوە کە هەر لـە سەرەتاوە خودموختارییەکەیان شتێکی قالۆر و لەخۆوە بووە. بەڵام ئەم شایەی کەوا بە زەبروزەنگ قسەی دەکـرد هێـشتاش بـارزانی بـۆ هـەوێڵی خـۆی ڕێ نەدابوو و بە بڕوای عەلەم وا دیار بوو کە نیگەران و بێشك تـۆزێکیش نارەحەتـە کـە لەگەڵ ئەم پیاوە بەرەوڕووبێ. شا بە ڕاوێژێکی وا کە بیهەوێ پاکانە بۆ کـردەی خـۆی بکا بە عەلـەمی گوت کە کوردان لێکدالێکدا تێكشکاون و "بە بێ یارمەتی و پشتیوانی ئێمە نەیاندەتوانی دە ڕۆژانیش لە بەرامبەر ئێراقییەکاندا خـۆ ڕابگـرن." لەسـەر زمـانی سەددام حوسێنەوە کە لە ئەلـجەزیرە پێی لـێ نـابوو گێڕایـەوە: "چـەند جـاران تـەنیا هۆکـارێکی کـە ئێراقییـەکانی لـە سـەرکەوتنی تـەواو گێڕاوەتـەوە هەنتەشـی تیـپ و تۆپخانەکانی ئێمە بووە." عەلـەم دەنووسێ کە لـە ١٩٧١دا تەنیا خۆتێوەردانی شـا بـوو کە نەیهێشت بارزانی ڕەزامەندی خۆی سەبارەت بە پێشنیارەکانی ئێـراق دەربـڕی کـە داخوازەکانی کوردانی سەلـماندبوو. "هەر دوو لا دەیانزانی کە ئێراق تەمای وا نیە ڕێز بۆ قەول و بەڵێنەکانی دابنێ." عەلـەم لـە بیرەوەرییەکانیدا دەگێڕێتەوە کـە شـا گـوتی: "زیاتر فەرتەنەیەکی پووچ بوو هەتا وادە و بەڵێنییەك."

جا ئەم ڕەوت و ڕووداوە چ فێڵ و فەرتەنە بوو بێ یان نا، کوردان بە بێ ئاگـاداری و وریا کرانەوەی پێشوو لـە شەوی شەشی مارسا بە ڕێككەوتنی ئەلـجەزیرەیان زانـی:

---

١- سەیرە!

لە میوانخانەی ساواك، کە بارزانی لە ویندەری ڕۆدەنیشت, خەریك بوون گوێیان دەدایە هەواڵە عەرەبی و فارسییەکانی بیبیسی. (بارزانی و موحسین دزەیی و دوکتۆر مەحموود عوسمان بێ نێوبڕ گوێیان دەدایە هەواڵەکانی بیبیسی.) دزەیی گوتی: "ئیتر کارمان کرا." دوکتۆر مەحموود عوسمان هەواڵەکەی وەك "کایەیەکی دیپلۆماتیك" لە ئەستۆی خۆی دارنی. بارزانی ژاکابوو بەڵام هیچی نەگوت. هەر ئەو شەوە تەلەفیزیۆنی ئێران "شا"ی لە کاتی دابەزینی لە فڕگە نیشان دا. شا شەکەت بەڵام بە دەماخ بوو و تەنیا سەرۆکی ستادی هاوبەشی دواند. دزەیی دەڵێ: "گوێمان لە قسەکانی نەبوو, بەڵام دیمان. من گوتم لام وایە باسی ئێمەیە." دیسان دوکتۆر مەحموود عوسمان نەیسەلماند و دیسانیش بارزانی متەقی نەکرد.

بۆ سبەینی پاش بەرچایی خواردن نوێنەری کوردان لە تاران بە خۆی و کۆڵێك هەواڵی تاڵوتوونەوە کە سەریشەو ئیدریس لە کوردستانی ئێراقەوە هەناردبووی سەروسۆراغی پەیدابوو: بە گوێرەی هەواڵەکە تیپەکانی ئێرانی بە خۆیان و تۆپخانە و چەكوچۆڵ و کەلوپەلەوە بە بێدەنگی ئاودیوی سنوور بوونەوە و گەڕاونەوە ئێران و هاوکات هێزەکانی ئێراقی هێرشێکی گەورەیان دەس پێکردووە. دزەیی بە دوکتۆر عوسمانی گوت: "دوێشەو پێم گوتن کە وتەکان سەبارەت بە ئێمە بوون." سەرلەشکر عەبدولعەلی مەنسوورپوور کە خۆی لە کوردانی ئێران و ئەفسەری بارگای سەرۆکی ساواك، نەسیری بوو, بە تووڕەیی هەر چەشنە خەیانەتێکی وە درۆ خستەوە و داکۆکی کرد کە "شا قەت پشتی ئێوە بەرنادا." دوایە ڕۆیشت و پاش ماوەیەك بە قەڵافەتێکی خەمبارەوە گەڕایەوە و ترس و دڵپەرۆشی کوردانی سەلماند. بارزانی بردە پەنایەك, چەند خولەك دواتر کە ڕۆیی دەگریا. بەڵام پاشان تەلەیفوونی کرد و تکای لێکردن لای کەس باسی گریانەکەی نەکەن.

شا کاری ئامادە کردنی کوردانی بۆ دیداری خۆی و ئەوان خستە ئەستۆی نەسیری. هەر بەڵگە و بۆنەیەکی خووی دڕندانەی شای پەردەپۆش دەکرد, بەجێ بوو. نەسیری پێیگوتن ئەم شریتەی ساداتی دووڕوو ناردوویەتە تاران "شا"ی وەها تووڕە کردووە کە ئەم ڕێككەوتنەی مۆر کردووە. نەسیری زیادی کرد کە شا لە لایەن سادات و

ئەمریکایی و دیتـرانەوە کە دەیانویست بە پێی پێشنیاری سـەددام حوسـێن بـۆ دژایـەتی سۆڤیەت و خـۆش کردنـەوەی نێـوانی لەگـەڵ ئێـران, دەس لـە کـوردان هـەڵبگرێ, گوشاری لەسەر بووە و پشتگیری ئێران بۆ کوردان تـەنیا کۆسـپی سـەررێی برانـەوە و پسانەوەی سەددام حوسێن بووە لە سۆڤیەت.

دەزەیی دەڵێ: "بارزانی بە ڕادەیەك تووڕە بوو هەر خۆی دەخواردەوە. لە سەرۆکی ساواکی پرسی: "بۆچی پێشتر پێتاننەگوتین؟ چلۆن دەتوانن بـڕوا بـە سـەددام حوسـێن بکەن, کە هەر پاش ئەوەی لە کاری شۆڕشی کوردان بۆوە و هێزێکـی هاتەوەبـەر لـە قسەی خۆی پاشگەز نەبێتەوە؟ لەم کارە پەشیمان دەبنـەوە." نەسـیری گـوتی کـوردان ئازادن درێژە بە شەڕ بدەن، بەڵام بێ پشتیوانی ئێران و ئەگەریش بـخوازن ببنە پەنابەری ئێران وا بە ئامێزی ئاوەڵاوە پێشوازییان لـێدەکرێ. دزەیی بـێ سـێ و دوو نێردرایـەوە کوردستان هەتا بارودۆخەکە هەڵسەنگێنێ. ئەو پاشان لە بارزانی ڕاسپارد کە ڕێبـەرانی پـارتی دێمـوکراتی کوردسـتان و سـەرکردەکانی پێـشمەرگە ئەگەرچـی زۆر پەشـێو و سەرشکستەن بەڵام دەخوازن درێژە بە خەبات بدەن. شا لە ئەلـجەزیرە چـەند بـەڵێنی نەهێنی تریشی دابوو بە سەددام حوسێن، بەڵام وا دیارە وای بـە بـاش زانـی وردە وردە بە گوێی کوردانی هەڵێنێ.

شا دیداری لەگەڵ بارزانی هەتا ١١ی مارس وە دوا دا, بـە بـاوەڕی هێنـدێك لـە کوردان بۆیە وای کرد کە تاڵی و سووکایەتی ئـەم ڕۆژە کـە ڕێکـەوتی هەیـە لەگـەڵ ڕۆژی مۆر کردنی ڕێکەوتننامەی خودموختاری، کە گوێیان بۆ نارەزامەندی ئـەو کـاتی [شا] کلۆر نەکردبوو, زیاتر کا. چاوپێکەوتنی کۆشکی نیـاوەران وێنەیـەکی بەرچـاوی فرڵداغی بوو، کە بارزانی لە ژێر پەردەی ڕووکاری ئەوا — سەبارەت بە داسەپینی وەها پەسـتی و سـووکایەتییەك بەسـەر کوردانـا — شـێوەیەك ڕەزامەنـدی و ئۆخـژنی هاتـە بەرچاوان. شـا گـوتی کـە کـوردان نابـێ لـە خۆیـان واوەتـر بەسـەر کـەس بـڕۆن و سـەرکۆنەی کـەس بکـەن؛ هـەر سـاڵێك دوای دەس پێکردنـەوەی شـەڕ ئـەوان نـەك نەیانتوانیوە حکوومەتی سەددام برووخێنن، بەڵکوو ئەوەندەشیان پاشەکشە کردووە کـە

ئێران بە ناچاری هێزی زیاتری بردۆتە مەیدان و ئەمەش لە خۆیا وەك شەڕێکی ڕاستەوخۆ و بەگەرمە وابووە دژی ئێراق. ئەوجار بە هێندێك ئێروئەوێ و درێژدادرینەوە کەوتە شوێن ڕیسوگوریس هێنانەوەکانی نەسیری و گوتی هاوپەیمانانی ئێستای ئێران تاوانی ڕوو کردنە مەسکەوی ئێراق دەخەنە ئەستۆی ئەو.

بارزانی باسەکەی هێنایەوە سەر ڕەوت و جەغزی ئەخلاق و گوتی: "ئێمە دەستمان نایە دەستی ئێوەوە. ئێمە چاوەڕوانیمان نەدەکرد کە دەستمان بپەڕێ." دوکتۆر مەحموود عوسمان پرسی: "ئێمە کە متمانەمان بە ئێران کرد، ئێستە چ جوابی خەڵکەکەمان بدەینەوە؟" شا غەزری و کوردانی سەبارەت بە زۆربڵەیی سەرکۆنە کرد. دزەیی وە بیری هێنایەوە کە کوردان ئەزموونێکی زۆریان لەسەر سەددام حوسێن هەیە و دەزانن کە "بەڵێنیی خۆی ناباتە سەر و کاتێك هێزی گرتەوە خەیانەتوو پێدەکا." ئەو بە ئاماژە بەم سەردەمانەی کە خۆی باڵوێزی ئێراق بووە زیادی کرد: "من دەزانم؛ بۆ ئەم مەبەستە بەڵگە ڕەسمییەکانی ئێراقم لە بابەت کەنداوی فارس و خووزستانا دیوە کە "ئیردانتیسم"[١] لە نێو کەمینەی عەرەبزمانا پەرە و دنە دەدرێ."

شا دووپاتی کردەوە کە کوردان دەتوانن درێژە بە شەڕ بدەن, بەڵام بە بێ پاڵپشتی ئەو و ئێران تەنانەت ئەو پەنابەرانەش کە بیانهەوێ دواتر یانی پاش تێپەربوونی دوو حەوتووی مەودای ئاگربڕەکەی وا سەرەتای ئاوریل تەواو دەبێ بگەڕێنەوە ئێراق بەگەرمە ڕێیان بۆ خۆش دەکا. (هەڵبەت ئێراق هەر خێرایەکی ئەم بەڵێنەشی بردەوە پاش.) بەڵام ئەو جۆرەی کە عەلەم دەنووسێ, شا لە سەرکۆنەی دەرەکی سەبارەت بە کردەوەی لەگەڵ کوردان نارەحەت بوو. گوتی: "کۆمەڵانی جیهانی ئێمە بە خەیانەت کردن بە کوردان تاوانبار دەکەن." بەڵام "بە هەر حاڵ ڕەنگە کوردستانێکی سەربەخۆش قازانجێکی ئەوتۆی بۆ ئێمە نەبوایە." لە ٢٠ی مارسا عەلەم لەم دەرد و

١- Irredentism: لە بناغەوە یانی گێڕانەوەی تەواوی ئەم شوێنانەی بە ئیتالیایی قسە دەکەن بۆ سەر ئیتالیا. (لێرەدا گێڕانەوەی هەرێمە عەرەب زمانەکانە بۆ وڵاتانی عەرەبی.)

مەرەدەی ئاوقای دەیان هەزار پەناخوازی كورد ببۆوە هەڵچزی؛ ئەو لەم بارەدا ئاماژە دەكاتە داخوازەكانی بارزانی بە مەبەستی دەرفەتی زیاتر بۆ پەرینەوەی بنەماڵەكانی پێشمەرگە لە سنوور؛ پەناخوازیی تەنیا تایبەت درابوو بە پێشمەرگان، بەم هیوایە كە ئێراق كاری بە ژن و زارۆكان نابێ. عەلەم دەنووسێ: "من وڵامم داوە ئەگەرچی ڕەنگە ئەم وتەیەی ئێراق وا بێ, بەڵام سەختە كوردان بڕوا بەم بەڵێنە بكەن یان ژن و زارۆكان بەڕەڵڵا كەن." تەنیا هەڵوێستی شا ئەمە بوو كە پێشنیار بكا كومیتەی خاچی سووری جیهانی باڵی بەسەر ئەم بنەماڵە ئاوارانە بكێشێ. وا دیارە ئەمە تەنیا دەسكەوتی هەوڵ و تێكۆشانی واشینگتۆن بوو لە بەرامبەر پاڕانەوەكانی بارزانیدا.

بارزانی لە ١٢ی مارسا گەڕایەوە حاجی ئۆمەران لەسەر سنووری ئێران و ئێراق؛ باس لەسەر سەركردایەتی پێشمەرگە هەتا شەودرەنگانێ درێژەی كێشا و ڕۆژی دواتریشی وەبەر دا. وتەكانی بارزانی بە شێوەی گشتیی و لە بواری سەلماندنی گوتەی كەسانێدا بوو كە — ئەگەرچی بە هێزێكی كەمەوە — خوازیاری درێژەی خەبات بوون. پاشان سەرلەشكر مەنسوورپوور گەیشتێ، كە شا ناردبووی و هەواڵی ناخۆشتری پێبوون: شا ئێستا وە بیری هێنابۆوە كە لە ئەلجەزیرە بەڵێنی داوە بە سەددام حوسێن كە چاوپۆشی لە درێژەدانی شەڕی كوردان نەكا و بۆجێبەجێ بوونی ئەم وادەیە ئیزنی داوە كە ئێراقییەكان سنوور بپەڕێنن و هێزەكانیان بێننە خاكی ئێرانەوە؛ ماوەی ئاگربڕی ڕەسمی — كە مەبەستێكی خەیاڵی بوو — نوێ ناكرێتەوە، كە تەنیا دەرفەتی ئەوەندە بدا كوردەكانی بادینان لە سووچی ئەوسەری باكووری ڕۆژهەڵاتی ئێراق هەر بە پێیان ئەم ڕێگا دوور و درێژە هەتا خاكی ئێران ببڕن. مەنسوورپوور گوتی: "دەتوانن خۆتان یا تەسلیمی ئێراق بكەن یان ئێمە. چارەیەكی ترتان نیە."

بارزانی كە بەم شێوەیە چۆڵەپێچكراو و تەواو ناهومێد بوو بە تەلگراف پێشنیاری وتوویژی دایە دەوڵەتی ئێراق. بەغدا هەر ئەو شەوە ئەم پێشنیارەی سەرلەبەر بردەوە پاش. بارزانی هەر ئەو شەوە كە دەستەیەك مافناس بۆ بیستنی وتەكانی كۆببوونەوە, پاش پێداهاتنەوە بە سەربوردەی خەباتی خۆی و ئەم خەیانەتانەی پێیكرابوون و بۆنی

مالآواییان لـێدەهات، لەپڕ فەرمانی بڕانەوەی خەباتی دا. بۆ گرتنی ئەم تەمایـە, جگـە لـە بنەماڵەی خۆی و "مەکۆی [تایبەتی] نێوخۆی" پرسی بە کەس نەکرد. ئاشکرایە کـە هیچ پرس و ڕاوێژێکی بە کومیتـەی ناوەنـدی و دەفتـەری سیاسـی پـارتی دێمـوکراتی کوردستان نەکرد. بارزانی گوتی کە زەرەدی شەڕڕاوەستان کەمترە لە درێـژەی شـەڕ؛ هەرکـەس پێیخۆشـە بـڕوا, دەتوانـێ بـڕوا. کـوردان تکایـان لـێکرد، لەبـەر ئـەم هەلومەرجەی تێیکەوتبوو – بە سەرنجدانـە تەمـەنی زۆری – هـەڤگرتنیان نوانـد و لەبەری پاڕانەوە و داوایان لـێکرد: "ئیزن بدەن یەکێك لـە کوڕەکانت درێژەی خەبات وە ئەستۆ بگرێ." ڕۆژی دواتر کادرە بالآدەستەکانی بنکەی سەرکردایەتی دەیانگوت و دەیانگوتەوە: "شۆڕش تەواو بوو!"

ئەم تەما بە ڕواڵەت لەپڕەی بـارزانی هـەتا ئـەمڕۆش هـەر بۆتـە هـۆی تـووڕەیی و بێزرانی خەڵك و شێواوی شۆڕشی کورد و لـێڵ بـوونی بیـچم و ڕوخـساری بـارزانی. زۆربەی ئەم خەڵکەی ئاگـاداری بـوار و بەسـتێنی ڕەوتـی ڕووداوەکـان نـەبوون، ئـەم تەمایەیان چەشنی برووسکەیەکی ئاسـمانی ساو هاتە بەرچـاو. بـۆ پـەژیوان کردنـەوەی لەم تەمایە هەوڵی تریش درا. بەلآم "بێسـوود بـوو." سـامی عەبدوڕڕەحـمان دەڵـێ: "ئەوەی بزانن کە بارزانی ئەوان سەردەمان نیمچە خوایەك بوو. من لام وایە چما خـۆی جحێڵتـر و بنەماڵەکەی هـەژارتر بوایـەن درێـژەی بـە شـەڕ دەدا. بـەلآم پـیر ببـوو و ئێرانییەکان بە میلیۆنانیان پووڵ وێـدابوو."[1] ئـەم پـشتیوانییەی ئـەمریکا کـە "مـەکۆی [تایبەتی] نێوخۆی" ئاماژەیان پێدەکرد سەروسۆراغی دیار نـەبوو. ڕۆژ بـە ڕۆژ هەسـتی شڵەژان و "خەیانەت" و بێبڕوایی پتر سەبارەت بە هێزی و نـەفامی تـاقمی ڕێبەرایـەتی کوردان لای خەڵکەکەیان – لە هەر تاقم و چینێك – تەشەنەی دەکرد. سپای پەنـجا هەزارکەسی پێـشمەرگەی بـارزانی لـە مـاوەی دوو حـەتوودا دەسـتووری ڕێبەرایـەتی جێبەجێ کرد و شوێنەواری بڕا. تەنانەت کەسـێکی وەك دزەییـش کـە سەرسـپێراوی

١– ڕەخنەگران لایان وایە کە بارزانی بە خۆی و ٧٠ میلیۆن دۆلارەوە کوردستانی بەجێهێشت.

بارزانی بوو ئەو دەمـی پێـی وابـوو: "ئـەم ڕووداوە بـارزانی وردوپـرد دەكـا." دیـتران ئەوەندەیان خۆش نەدەویست. یـەكێك لــە كـادرە كۆنـەكارەكان دەیگـوت: "ئەگـەر بارزانی ماباوە و سەركردایەتی شەڕی كردبا یان خۆی كوشتبا، هەتا هەتایـە دەبـوو بـە قارەمانێك و  هیچ‌كەس نەیدەوێرا بە خراپەی باس بكا."

بەر لەوەی كە بارزانی بۆ دوایین جـار لــە سـنوور وەپـەڕێ و لەسـەر ڕوخـساری پیاوێكی ژاكاوی شكاوەی نەخۆشا بێتە ئێران، زووخـاوی كۆوەبـووی دڵ و دەروونـان سەبارەت بە شێوەی ڕێبەرایەتییەكەی كـەلاوی كـرد: بـە خراپـە بـاس كرانـی هـەموو شتێكی دەگرتەوە، لـە سەرنـجی تایبەتی بۆ سەر عێل و بنەماڵـەكەی خۆیرا بگـرە هـەتا دەگەیشتە ئۆگریی سەبارەت بە ڕازداری و نەهێنیكاری، ملهوڕی و زۆركاری, بـڕوا و متمانەی بێ‌جێی بە هاوبەندانی دەرەكی. لـەناكاو خـەڵكی ئاسـایی تێگەیـشتن كـە وەی هاوار, ڕێبەرەكەیان تا چ ڕادەیەك پیاوێكی كاڵ و نەكوڵیو و خۆبـە زلزان و بیرتەسـك بووە كە چارەنووسی جووڵانەوەیەكی ڕزگاریدەری نەتەوەیی ئەسپاردەی فرت‌وفێڵی شا كردووە, ئەو كەسەی وا زۆر جار و كەڕەتان فریویـان لـــێ دیبـوو و یـان دڵبەسـتەی تراویلكەی پـشتوانیی كەڵـەهێزێك بـوو كـە پێـشینەی دوژمنایـەتی لەگـەڵ ئـاوات و ئامانـجەكانی خـەڵكی كـورد وەكـوو ڕۆژ ڕوون بـوو. تـالآیی ئـەم سـووكایەتییە لــە سەردەمێكا كە هێشتا قورسایی باری بیر و بڕوای چەپی بە كۆڵـەوە بوو، زۆر زیـاتر لــە ڕادەی ڕاستەقینە هەستی پێدەكرا. ئابڕووی ئەمریكا لـەبەر شكانی لـە وێتناما بـە تونـدی زەبری وێكەوتبوو و كوردان بەم بارەدا خۆیان بـە كەترەخـەم دەبینـی كـە نـەیانتوانیوە بیروڕای گشتیی خەڵكی جیهان بۆ لای خۆیـان ڕابكێـشن و هـەلیان بـۆ ئازاردەرانیـان ڕەخـــساندووە كـــە لـــەژێر داڵـــدەی "ئۆردووگـــای سووسیالیـــستی" و هێـــزە پێشكەوتن‌خوازەكانا بسرەوێن و پەنا بگرن. هێنـدێكیش لایـان وابـوو كـە گیروگـرفتی بـارزانی خـەتای پـشتیوانانی خۆپـارێزی نـەبوو, بـەڵكوو دەگـەڕاوە سـەر ناوبـانگی "مەلای‌سوور"ی كە گۆڤار و ڕۆژنامەكانی بریتانیـا پـاش مانـەوەی دوور و درێـژی لــە یەكێتی سۆڤیەت خستبوویانە دووی.

کوردان ئێستا لەوپەڕی ترس و تۆقینا تێگەیشتن بێتوو بیانەوێ خۆیان بە تەنیایی دەس بدەنە شەڕێکی پارتیزانی درێژخایەن، چەك و جبەخانەی پێویستیان نیە. شکستی نیزامیی بۆ ئەم خەڵکە چیانشینە شەرکەر و غللووره لەمەش بە ژانتر بوو. کوردان بە تۆپخانەی شاوە شەتەك درابوون و شا ئێستا لەپڕ پشتی بەردابوون. بارزانی بە خاتری پێخۆش بوونی شا ڕێبەرانی کوردانی ئێرانی پەناگرتووی کوردستانی ئێراقی بە قۆڵبەست کراوی وێدابۆوە. "شۆڕشی کورد" لە ماوەی دووحەوتوواندا زۆر بە سانی دەستی لێك بەردا و لێكبلاو بوو! یەکێك لە مێژوونووسانی کورد لەم بابەتەوە گلەیی دەکا و دەڵێ: "من وێنە و نموونەیەکی دیکەم لە نێو جوولانەوەی گەلیدا پێشك نایە کە بەم شێوە تاڵ و بەزەیی‌بزوێنە و تەنیا پاش دەستوورێکی ڕێبەرایەتی کۆتایی پێ‌هاتبێ، ئەویش لە کاتێکا خەڵك هێشتاش تەماداری شەڕ بوون و ئامرازی ئەم کارەشیان بە دەستەوە بوو." کوردان لە ڕووی نەزانییەوە لەبری ئەوەی خەریکی کشت‌وکاڵ بن، تەنانەت بۆ خۆراکیش خۆیان بە خورد و خۆراکێکەوە گرێ دابوو کە ئێران بە "لۆری"یان بۆی دەناردن. بەڵێ ئاوها بوون دۆزی گشتیی ئەم باسانەی کە لە کوردستانی ئێراقا خولیان دەدا و جوولانەوەی نەتەوەیی کوردی دیسانیش لاوازتر دەکرد. هەرچۆنێك بێ ئەم مەبەستانە ئەمڕۆش بە شێوەیەك هەر دمەتەقەیان لەسەرە. وەك هەمیشە دەوڵەتانی دراوسێ کەیفیان سازبوو.

لەو کاتەدا زۆربەی کوردەکانی ئێراق سەریان بۆ فەرمانی بارزانی نەوی کرد، جا ئەگەر لەبەر ئەمەش بووبێ کە لەو ترس و سەرشێواوییەدا ڕێیەکی تریان وەبەر چاوان نەهاتبێ. چ پێمان‌خۆش‌بێ و چ پێمان‌ناخۆش‌بێ ئەم وتەیەی شا ڕاست بوو کە دەیگوت: "ئێران تەنیا پەنجەرەی کوردانە بەرەو دنیای دەرەوە" و ئێستا شا ئەم پەنجەرەیەی گاڵە دەدا. تاقمێك لە پێشمەرگەکان سەریان وەبەر باری ئەم فەرمانە نەهێنا و درێژەیان بە شەڕ دا، دەستەیەك خۆیان کوشت. هێندێکیشیان بەر لەوەی بە پێیان لەم سەهۆڵبەندانەدا ڕێی قوڕ و زەلەقی کوێستانان بگرنە بەر هەتا ئاودیوی سنووری ئێران بن و بچنە ڕیزی ئەو ٢٥٠٠٠٠ پەنابەرەی لەو وڵاتەدا پەنادرابوون، کەلوپەلی ماڵیان

وردوپرد کرد و ماڵەکانیان ئاگر دا. ئەمە پاشەکشەیەکی ڕێکوپێك بوو؛ دەیان هەزار کەس لەم خەڵکەی زۆربەیان پێخواس بوون و جگە لە جلوبەرگێکی ناسکی پەمۆ و پەلاستێك چیان لەبەردانەبوو کەوتنە ڕێ ... وە هەر حاڵ هەرچییەك بوو پاشەکشە بوو. تورکیا هەر بەم بیانووە کۆنە کە جگە لە ئورووپایییان پەناخوازانی تر وەرناگرێ، سنوورەکانی بە ڕووی کورداندا نەکردەوە.

بارزانی زۆر جاران هەوڵی دا پشتگیری ئەمریکا و ئێران بۆ درێژ کردنەوەی ئاوربەس ڕابکێشێ هەتا ئەو پێشمەرگانەی بنکەیان دوورتر بوو بتوانن لەگەڵ بنەماڵەکانیان بگەنە پەناخوازان و لە تۆڵە و زەبروزەنگی مسۆگەری سەددام قوتار بن، بەڵام چ ئاکامێکی لەم هەوڵ و تێکۆشانانە وە دەس نەهێنا. تەنیا کارێکی کە توانی بیکا ئەمە بوو کە ئۆتۆمبیلێکی بۆ هێنانی عیسا سوار, سەرکردەی کۆنەکاری پێشمەرگەکانی بادینان و بنەماڵەکەی هەنارد. بەڵام هەر کە پێشمەرگەکانی زانیان دەیەوێ بەجێیان بێڵێ بە تۆڵەی ئەم کردەوەیە کوشتیان: ئەم پێشمەرگانە زۆر چاك دەیانزانی کە لە گەڕیانی تۆڵە ئەستاندنەوەی سەددامدا تووشی چ چارەنووسێك دێن. لە ڕاستیشدا هەزاران کورد کە زۆربەشیان غەیرە نیزامی بوون, لەم گێرە و کێشەدا گیانیان لە دەس دا و دەیان هەزارکەس ڕادرانە ئێران.

زۆربەی هەرە زۆری ئەم خەڵکە کە بێهوودە بوونی درێژەی خەباتی چەکدارییان لێ سوور ببۆوە بە زوویی کەلکیان لەم لێخۆش بوونە گشتییە وەرگرت و لە ماوەی چەند مانگاندا گەڕانەوە ئێراق. تاقمێکی تریش ئێرانییەکان ئیزنی سنوور بەزاندنیان نەدان. پاشان بەغدا بۆ بەڕێوەبردنی بەشێك لەم هەڵوێست و سیاسەتەی کە کوردانی بە ناوی ئەم دوژمنانەی کە قەت چاك نابن، وەسپ دەکرد، دەستی دایە خاشەکێشانی کوردان. ئەم ١٢٠٠٠٠ تا ٣٠٠٠٠٠ کوردەی بە گوێرەی لێخۆش بوونی گشتیی لە ئێرانەوە گەڕابونەوە, بەرەو ناوەند و باشووری ئێراق دووری خستنەوە و بۆ ماوەی نزیك ساڵێك لەوێ ڕاگرتن. شۆڕشگێڕان, بەتایبەت خوێندکاران

و مامۆستایانی قوتابخانە بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە هەڵبژێران یام خرانە زیندان یان پاشی ئەشکەنجە و ئازار ئیعدام کران.

ماوەیەك دواتر بۆ دابڕینی پەیوەندی کوردەکانی ئێراق لەگەڵ هاوڕەگەزانی دراوسێیان پشتێندەیەکی هێمنایەتی بە قووڵایی پێنج تا پازدە میل و بە درێژایی نزیك شەشسەت میل شانبەشانی سنوورەکانی خۆی لەگەڵ ئێران و تورکیا و سووریا دابڕی. نیزیك ١٥٠٠ گوندی نێو ئەم جەغزەی بە دینامیت خاپوور کرد و بە بۆلدزێر تێکیهەڵشێلان، باخ و ڕەزی هەڵکەندن و کانی و چاڵاوەکانی بە سمیت دارشتن و کوێری کردنەوە. ٧٥٠٠٠٠ کەسی دانیشتووی ئەم گوندانەی کۆ کردەوە و لە تاراوگەی ئۆردووگای تازەسازی "شارۆچکانی سەرکەوتن"ی پەستاوتن. ئەم ئۆردووگایانە بۆ چاوەدێری و ئاگاداری لێکرانی سادە و ساکار لە نیزیك بنکەی ژاندرمە و سپا هەڵخرابوون. عەرەبی دنە دان کە ملك و ماشی کوردان بە ناوی هەڵوێستی درێژخایەنی حیزبی بەعس داگیر بکەن. ئەم هەڵوێستە درێژخایەنە کوردانی لە ناوچەکانی سنووریی و مەزرای بەرێژەوی وڵات و هەروەها لە کەرکووك و تەواوی ناوچە نەوتییەکانی قڕ لەسەر هەڵکەند. ئەمانە تۆوێك بوون کە چێندران و بە "تۆوبڕکردنی فەرهەنگی" ناوبانگی دەرکرد؛ یانی بنبڕ کردنی پێداپێدای ژیانی گوندەکی خەڵکی کورد, کە جەرگ و هەناوی کۆمەڵی کۆنی کوردان بوو. لە کلکەی پاییزی ساڵی ١٩٧٥دا کورتە ڕاپۆرتێك لەم گەلەڕاپۆرتە دوور و درێژانەی لە بواری پێشێل کرانی مافی مرۆڤ لە ئێراقا, لەسەر کوردان, لە لایەن "ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی"یەوە بڵاو کرایەوە و لە بەشێکیدا نووسرابوو کە ٣٨٩ کەس ژن و منداڵی کورد هەر بە تاوانی ئەوەی کە شوویان یا باوکیان کەوتوونە ڕیزی چالاکی پارتیزانی، لە ئێراقا گیراون.

لەگەڵ ئەمەشدا کالاهان، سەرۆکی "سیا"ی تاران پێشنیاری کردبوو کە "کەم و ئەهوەن کردنەوەی کوێرەوەری و دەردی کوردان باشترین کارێکە کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بیکا." ئێستا لانیکەم لە بابەتێکی بەرچاوی دیکەوە

نیگەران بوو. لە ئاوریلدا وە بیری هێنـابۆوە كـە "ئەگـەر بێتـوو كاربەدەسـتانی بـاڵای ئەمریكایی، یانی كەسانێكی وەك كیسینجێر، كارێـك نەكـەن بـۆ یارمـەتی كـوردان، دەكرێ لێمان سوور بێ كە ئەوانیش بێدەنگ نەبن و حیكایەتەكە بۆ تـەواوی خـەڵكی دنیا وەگێڕن." بەڵام ساڵگار تێپەڕین هەتا بارزانی لەم بارەوە وە قسە هـات و ئەمـــجار ئەو وەختیش هیچی نـەگوت. متـەق نـەكردنی بـارزانی كـورد و غـەوارانی وەك یـەك سەرسوڕماو كرد. لەگەڵ ئەمەشدا ئـەم خـۆ پاراسـتن و ئـەم بێدەنگییـە بـۆ كۆنـە شۆڕشگێڕێكی كە لە سەردەمانی تاڵوتوونا فێر بووە نابێ داهاتوو بە وتـەی عـاتفی كـە پلە و پایەی لاوازتر دەكا ڕەش هەڵگێڕێ, بێ واتا و مانا نەبوو. دەیزانی كە نابـێ هـیچ چاوەڕوانییەكی لە شا هەبێ, بەڵام هێشتاش هیوای بە پشتیوانی ئەمریكا هـەبوو. چـەند حەوتوو پاش ڕێككەوتنەكەی ئەلـجەزیرە لە چاوپێكەوتنێكی ڕۆژنامەوانیدا لە مانگی مارس، لە حاجی ئۆمەران، "جیم هۆگڵەند"ی ڕۆژنامـەوانی كـە پێـشتریش دەیناسـی و سەرەڕای حاشا كردنی لە هەردوو دیدارەكەیدا, بە پێداگرییەوە ئەوی بە یـەكێك لـە كاربەدەستانی ئەمریكا دەزانی، كێـشایە كـەنارێك. ئێـستا بـارزانی لێـی خواسـت كـە ڕاسپاردەی وی سەبارەت بە دانـی مـافی پەنابـەری سیاسـی بـۆ خـۆی و پـشتیوانی لـە خەڵكی كورد بگەیەنێتە دەوڵەتی ئەمریكا.

بارزانی كە لەمێژ ساڵ بوو گیرۆدەی تووتن و پەڕ بوو و گەلێكی جگـەرە دەكێـشا ئێستا ئێشێكی لە ژێر گرێی قەبەزەی سینەیا هەسـت پێـدەكرد كـە دواتـر ڕوون بـۆوە شێرپەنـجەی ڕێخۆڵـەیە و پێی ژاكا و قەڵافەتی داتەكی. دەیوست هـەم بـۆ چارەسـەری دەردەكەی و هەم بە مەبەستی خۆپاراستن بچێتە ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئـەمریكا. لـە ڕووی سرنجدانەوە بۆ سەر تاسەی ئێـراق بـە مەبەسـتی نوانـدنی زەبـروزەنگ و تۆڵـە ئەستاندنەوە كە زۆرجاران سوور ببۆوە, بەڵگە و بۆنەی تەواوی بە دەستەوە بوو كە لە گیانی خۆی بترسێ. بارزانی دەیزانی مادامێكی لە تاران وەمێنێ ساواك دەوری دەتەنێ و لە بری ئەو برە یارمەتییەی دەیداتە پەنابەرانی دەمی دەدروێ و تـاكی دەكاتـەوە. هـەر بۆیە كـاتی دیـــمانەی لەگـەڵ هۆگڵەنـد و تـەواوی هـەواڵنێران، بـە پـارێزەوە و بـە

شێوەیەکی گشتیی باسی خەیانەتی کرد. بە دزی پێیگوت کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوانی بەرەڵلا کرد هەتا بەرەورووی شالاوی تۆوبرکران ببنەوە. "ئێران زۆری ئێمە بۆ ئەم کارە دنە دا و بەڵێنی فرەی پێدراین و وەفای پێنەکردن. بە ئێمـەیان گـوت بە هەموو بارێكدا پشتیوانیتان لـێدەکەین." پرسیارێکی پـڕ گلـەیی کـە لـەم بـوارەدا هێنایە گۆڕ زۆر بەجێ بوو: "داخوا خەڵکی کورد جینایـەتی وەهایـان خۆڵقانـدبوو کـە تەواوی خەڵکی جیهان لێیان ڕاست بنەوە؟"

ژانی سینگی ئەوەندە پێهەڵاچوو کە لـە ژوەنی ١٩٧٥دا ئیـزن درا بـۆ چارەسـەری بـچێتە ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. کاربەدەستێکی سـاواکیان ڕەگـەڵ خـست و ئەو لـەم بابەتەوە زۆر تووڕە بوو. کاتێکیش لـە فڕگەی کێنێـدی نیۆیـۆرك کارمەنـدێکی "سیا" و مووریس دریپێر، سەرۆکی دەفتەری کاروباری ئێراق لـە وەزارەتی دەرەوەیـدا چاو پێکەوت، هەر نەهاتەوە سەرخۆ. ئەم دوو کەسە بە سواری فڕۆکە هـەتا کلینیکـی مایۆ، لـە "ڕۆچستێر"ی "مینەسووتا" وێڕای بوون. لـەوێ ڕوون بـۆوە کـە شێرپەنـجەی ڕیـخۆڵەی بـارزانی چارەسـەر نـاکرێ و گوتیـان شـەش مـانگێکی دیکـە پـتر نـاژی. دەیویست یەکڕاست بـچێتە واشـینگتۆن, ئـەو شـوێنەی کـە وا مـحەمـەد دۆسـکی، دیپلۆماتی پێشووی ئێراق، کە دواتر بوو بە نوێنـەری بـارزانی لـە ئـەمریکا، سـەرنج و بڕوای باشی سێناتۆر هێنری ئێم. جەکسۆن، سێناتۆر ڕیچارد ئێستۆن و هەروەها جـۆرج مێنـی، سـەرۆکی "یـەکێتی کـاری ئـەمریکا و کـۆنگرەی ڕێکخـراوە پیـشەییەکانی ئەمریکا"ی بۆ لای جوولانەوەی کورد ڕاکێشابوو. بارزانی هیـوادار بـوو ئـەم دۆسـتانە بتوانن بە بێدەنگێکی و لـە ژێرەوە دەوری خۆیان بگێـڕێن و شـوێن دابنـێن. جارێکیـان تەنانەت کەوتە ئەو فکرە کە لـە "مێنی" بـخوازێ فڕوکەیەکی گچکە بەکرێ بگـرێ و "بیرفێنێ" و بیباتە واشینگتۆن، بەڵام فرشتەکانی پاسەوانی پیلانی تریان بە دەستەوە بـوو. لــە کاتێکـا دۆسـکی سـەری سـوڕمابوو کـە چـلۆنە بـارزانی و تاقمۆکـەی هـاوڕێی نەگەیشتنێ, بارزانی و هاوسەفەرانی لـە ئەمریکا دەگەڕان و چووبوونە دیداری لیكتائۆ و کالیفۆڕنیا. ئەم دیدارە مانگێکی کێشا و مەبەست ئەوە بوو کـە لـەبـەر چـاوان دوور بێ.

سەرەنـــجام یـــەكێك لـــە یاریـــدەرانی بـــارزانی بـــە بیانوویـــەك بـــە دزی لـــە ماڵـــە پارێزراوەكە, هەڵكەوتوو لە "مەكلین"ی ویرجینیـا, كـە بـارزانی تێیـا ڕاگیركرابـوو و پەیوەندی لـەگەڵ دنیای دەرەوە دابڕابوو, دەركـەوت و تەلـەفۆنی بـۆ دۆسـكی كـرد. یەكدوو جاران باسی چوونە سویس هاتەگۆڕ كـە بـە بۆچـوونی "مەسـعوود"ی كـوڕی بارزانی, باشتر لەم "بەند"ە بوو كە لـە ئـەمریكا بـە سـەریا سـەپابوو. دۆسـكی وەهـای غوربەتی هەستا كە سەری لـە ئاست دەستووری بارزانی بۆ خۆ دزینەوە لـە ڕۆژنامەكان، با دا. ئەو لـەسەر ئەم تەمایـە كـە دەوڵـەت پێملـی كردەوەیـەكی باشـتر بكـا لـەگـەڵ بارزانی، پێوەندی كرد بە "دانیەل چۆر" لـە دەزگای "سی‌بی‌اس". چـۆر دەیویـست كـە بارزانی بەرێتە سەر تەلـەفیزیۆن هەتا چیرۆكی خەیانەتی ئەمریكا بە كـوردان بگێڕێتـەوە, بەڵام بارزانی ملی نەدا: ئەو دەیەویست لـە ئەیالـەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا وەمێنــێ و لـە بارودۆخێكدا نەبوو كە ئەم هەڵومەرجە لـەرزۆك و ناسكەی وەك میوانێـك بـــخاتە مەترسی.

هەروەها بارزانی بە دروستی هەستی پێـدەكرد كـە بـە نیزیـك بوونـەوەی چـالاكی هەڵبژاردن دەوڵەتی فۆرد دەیهەوێ بینێرێتــەوە ئێـران. لــە نـوامبری ١٩٧٥دا، دەوا و دەرمانی شەش مانگی داهاتووی بۆ دابین كرا و بە وێ قسێ كە پزیشكانی ئێرانـی تـای پزیشكانی دەرمانگەی مایو دێنەوە, نێردرایەوە تاران. درپیێر كـە وەك زۆر كەسـانی تـر ڕموودەی بارزانی ببوو و بە دیتنی حاڵوباڵی زۆر پەژار بوو، دروستی بیر كردبۆوە. بـۆ یەكەم جار كە كرابووە ڕاسپێراوی پێوەندی لـەگەڵ بارزانی پێیان گوتبوو كە لـەم بابەتە ورد بێتەوە كە ڕەنگە بیەوێ لـە ڕاگەیەنێرەكاندا سەرێشە بۆ دەوڵەت ساز بكـا، بـەڵام ئەو لـەسەر ئەم بڕوایە بوو كـە هـیچ گرفتێـك سـاز ناكـا و بۆچوونەكەشـی وەڕاسـت گەڕابوو.

خێرایەكی لـە جیاتی بارزانی كۆنگرە كاری ڕاگەیشتن بەم ئابرووچوونەی وە ئەسـتۆ گرت. كاتێكی ئەو لـە ئێران بوو "ڕاپۆرتی پایك" تەقێوە و كەوتـە لاپـەڕەی بلاڤۆكـانی ئەمریكا. سەرەڕای ئەوەش بارزانی هەروا متەقی نەكرد. كۆلبی دەڵـێ: "ئەگـەر پێـشتر

کەڵکەڵەی گێڕانەوەی نەقڵ و نەزیلەی سەربوردەی خۆی بوایە, بێ‌گومان بە شێوەیەك نەماندەهێشت مەبەستەکان لە قاو بدا و چاوەدێری کرانی بارزانی لە ماوەی شەش مانگی مانەوەی لە ئەمریکا هەر لەبەر هەندێ بوو. لە بەهاری ساڵی ١٩٧٦دا ئێمە لە کۆنگرەدا هەتا ملان نوقمی توێژینەوە بووین." ئەم وتەیەی کۆلبی زۆر دواتر درا و وا دیارە ئاماژەیەکە بەم لێکۆڵینەوانەی لە بابەت چالاکییە نەهێنییەکانی "سیا" لە ئانگۆلا و تێشکانی "هیندوچین"ەوە کران. کۆلبی زیادی کرد: "هیچ نەماندەویست لەگەڵ تاوانەکانی سەبارەت بە بارزانیش بەرەوڕوو بینەوە. ئەگەرچی سەرێشەیەکی واشی ساز نەدەکرد."

لەگەڵ ئەوشا دەوڵەتی فۆرد لە ساڵێکا کە هەڵبژاردن بەرێوە دەچوو, هیچ نەیدەویست خۆی بداتە دەس هەڵکەوت و ئەگەران. بارزانی کە گیرۆدەی ژان و ئیشێکی بەرەو سەر بوو و لە ژێر کارکردی "شیمی دەرمانی"دا توابۆوە و هەروەها دەوا و دەرمانیشی لێبڕا بوو, کاتێك ویستی بۆ "ئەزموون" و موعایەنەی نوێ بێتەوە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرەوڕووی تەنگەژە بۆوە. دۆسکی بە گوێرەی بەڵگە و بۆنەی پزیشکی داخوازی ویزای بۆ کرد لە دەفتەری جۆزیف سیسکۆ، جێگری وەزارەتی دەرەوە لە کاروباری سیاسیدا, بەڵام بە تووڕەیی لە کۆڵ خۆیان کردەوە. پاش ماوەیەکی درێژ و خۆ گنخاندنێکی زۆر ئاخرییەکەی یەکێك لە یاریدەدەرانی سیسکۆ ڕێی دا. پێی‌گوت چ ناکرێ, چونکە بارزانی بە پەساپۆرتی ئێرانی سەفەر دەکا و تارانیش داخوازەکەی ڕەت کردۆتەوە. دۆسکی بە تووڕەیی واشینگتۆنی تاوانبار کرد کە کارەکان لە ئەستۆی خۆی دادەڕنێ: "ئێوە بارزانیتان بە باری سیاسیدا کوشت، ئێستا دەتانهەوێ وەکی دی هەر یەکجاری بیگوژن."

ئاخرییەکی دۆسکی توانی وەزارەتی دەرەوە ڕازی بکا ویزا بداتە بارزانی, ئەگەرچی تازە هیچ قازانجێکی بۆی نەبوو, چونکە ئێرانییەکان ئیزنی چوونە دەرەوەی وڵاتیان پێ‌نەدەدا. دۆسکی کە لە سەرەتەقەی وەزارەتی دەرەوە بۆ ئەوەی خۆی لە ژێر شاقەلی شادا حەشاردا وەگیان هاتبوو, هەڕەشەی کرد کە ئیتر ئەمجار ڕەنگە بارزانی نەقڵ و نەزیلەی سەربوردەی بۆ خەڵکی جیهان وەگێڕێ. ئەم هەڕەشەیە وەزارەتی دەرەوەی

وەخۆ هێنایەوە. بە مەبەستی قسە کردن لەسەر هەلومەرجێکی کە قەرار بێ بە گوێرەی ئەو بارزانی لە ئەمریکا وەمێنێ, دۆسکیان بانگهێشتە وەزارەتی دەرەوە و وتیان: بە پێی هەلومەرجی سەردەمانی هەڵبژاردن نابێ چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی بکا و بە پێچەوانەی جاری پێشوو کە سیا خەرجی نەخۆشخانەی دابوو, دەبێ ئەمڕا خۆی بیدا, بەلام ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پاسەوانی بۆ دادەنێ. کەچی دۆسکی پێیداگرت کە بارزانی ئازاد بێ و بتوانێ بە بێ چاوەدێر سەفەر بکا و هەرکەسێکی پێیخۆش بوو چاوی پێی بکەوێ.

بەلام کاتێك بارزانی لە ژوەنی ١٩٧٦دا لە فڕگەی کێنێدی نیۆیۆرك دابەزی, کاربەدەستێکی ساواك و دریپێر و کاربەدەستێکی سیا، خۆی و هاوڕێیانیان هەتا دەرمانگەی مایۆ بەرێ کرد. پاش موعایەنە کرانەوەی لە واشینگتۆن بنەگر بوو. لە هۆتێلەوە گوێزرایەوە ئاپارتمانێك و لەوێشەوە بەر لەوەی کە لە خانووبەرەیەکی "کۆلەداریی" خاوەنی پێنج دیوی خەودا لە "مەکلین" وەمێنێ، هاتە خانوێکی نێو شار. ژانی سینگی جاری وابوو گڕی دەگرت و هەلی وابوو هەندێك ڕۆدەمرکا؛ بۆ دیداری دوکتۆران بە فڕۆکەیەکی تایبەت دەچۆوە "مینە سووتا". زۆربەی شەوان و ڕۆژان لەگەڵ ژانێکی تاقەتپرووکێن دەستەویەخە بوو, بەلام پیاوانە خۆی لەبەر ئێشەکە ڕادەگرت, تەنیا ڕوخساری هەلۆیانەی بوو کە تەوژمی ژان و ئێشەکەی دەدرکاند.

ئەم غەوارانەی بارزانییان دەناسی بە دیتنی ئەم حالە تۆقین ... هۆگلەند کە وێنەی بارزانی لە یەکەم دیداریا لەگەڵی لە نووسینگەی کاری خۆی ڕاگرتووە, چەند جار پێشنیاری هاوڕێیانی بارزانی بۆ دیدار نوێ کردنەوەی بردەوە پاش. گوتی: "ناتوانم غیرەت وەبەر خۆم بێنم کە ئەم هەلۆیە لە قەفەزدا بەدی کەم – بەڕاستی هەستم لێم نەدەگەڕا." حەئیم لە واکۆف، کاربەدەستێکی پێشووی مووساد لە کوردستان, ئەو کاتەی وا بارزانی "لە مالەوە دەسبەسەر بوو ویستبووی چاوی پێیبکەوێ, بەلام ئەمریکایییەکان بەریان لێ گرت. کابرای ئیسرائیلی دەیگوت بێتوو منی دیبا دەیگوت

"وەرە با پێکەوە بمرین." بارزانی هەروا بە ڕووی خۆشەوە مانەوەی خۆی لە واشینگتۆن قبووڵ دەکرد.

ئەو کە پێیخۆشنەبوو بیسەلمێنی کە لە تاراوگەیە و تەمادار بوو بە شێوەیەك ئەمریکایییەکان بێنێتە سەرڕێگا, زۆر جار بە بانگهێشتنکردنیان دەیەویست پێوەندی لەگەڵ دەوڵەتی ئەمریکا ڕابگرێ. بەڵام گیروگرفتی "زمان" کۆسپێك بوو؛ سەرەڕای هەوڵێکی بوێرانەی کە بە یارمەتی فەرهەنگێکی دوو زمانەی وشان دەیدا, قەت لە بازنەی ڕستە و وتەی زۆر ساکاری وەك: "بەتامە ... سپاسمەندم." وێوەتر نەچوو. لە مەودای ئەم نیوەڕۆکردن و شێو خواردنانەیدا کە لەگەڵ سێناتۆر جەکسۆن و سێناتۆر ئێستۆن و درییێر و ڕۆژنامەوانانێکی وەك جەك ئەندرسۆن و ئێسمیت هەمپێستۆن, پێکەوە بوون زۆر بە سانی دەهاتە ئاخاوتن, بەڵام سەرەڕای تێکۆشان و دنەدانی لێکدالێکدای دۆستەکانی بە مەبەستی تۆمار کردنی بەسەرهاتی لەسەر شریت یا نووسینەوەیان, ملی بۆ ئەم پێشنیارە نەدا. بە بۆچوونی درییێر بارزانی هەر بەڕاستی لای وابوو کە نووسینی بیرەوەری, مەرگی وە پێش دەخا.

وێدەچێ کە خۆ پاراستنی بارزانی لەم بابەتەوە بەجێ بووبێ, چونکە هەوڵێکی دیکەش بە مەبەستی گێڕانەوەی بۆ ئێران درا. لە سەرەتای پایزا, زۆریش وێدەچێ بە پێشنیاری ئەمریکا, شا بە تەلگراف لە بارزانی خواست بگەڕێتەوە تاران. زۆر لەوانەیە ئەم کردەوە پتر بە مەبەستی دڵهێوری دەوڵەتی ئەمریکا بووبێ لە بابەت نیگەرانی سەبارەت بە گڕ و گفی ئاخرین مانگەکانی چالاکیی هەڵبژاردن. بەڵام ئەمجار بارزانی ملی نەدا بۆ گەڕانەوە، دەیزانی کە ئێستا دەتوانێ بە پشتیوانی دۆستانی لە مەجلیسی پیران و جوولانەوەی کرێکاری پشتئەستوور بێ. بارزانی نەقڵ و نەزیلەی سەیر و سەمەرەی ژیانی خۆی بۆ ئەم ئەمریکایییانەی بە شێوی کوردی میوانی دەکردن دەگێڕایەوە. باسی خەیانەتی لێکدالێکدای ئێران و ئێراق و تورکیا و یەکێتی سۆڤیەت و ئیسرائیل – و ئێستا هی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا – ی بۆ دەکردن، ئەویش لە بارودۆخێکی پڕ ناهومێدی و شەڕوشووڕی ئەوسایدا. درییێر دەیگوت: "وەهابوو

دەتگوت چینییەکان ڕووداوەکانی ڕێپێوانی مەزنیان دەگێڕایەوە." بارزانی زۆر بە ئاشکرا پێی لە هەڵە و بۆچوون و لێکدانەوە چەواشەکانی دەنا. لەگەڵ تەواوی ئەمانەشدا سەرپشکایەتییە ڕامیارییەکانی ئەمریکای لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا — وێڕای ئەم ئۆگرییەی سەبارەت بە گێرە و کێشەی عەرەب و ئیسرائیلەوە هەیبوو — بۆ نەدەچوونەوە سەریەك. داخ و کەسەرێکی درپیێر لێیهەڵکڕاندبوو، ئاوها بوو:

***پاش ئەم گشتە هەڵس‌وکەوتە پیاوێکی بەئەندێش و خۆڕاگر و پتەو بوو ... من زۆری لەگەڵ هەستام و ڕۆنیشتم و دوانلم ... بەلام ئەگەر ئەمریکاییەکان ڕەزامەندییان دەرنەبڕیبا، قەت خۆی نەدەدایە پاڵ گەریانی ساڵی ١٩٧٢. ئەو ئێرانیی پێ لە ئێراقییان خراپتر بوون, متمانەشی بە ترکان نەبوو.***

بارزانی هەمیشە دووپاتی دەکردەوە کە ئامانجی وە دەس هێنانی "خودموختارییەکی سنووردار" بووە و وەك پارێزەر و ڕاگری زمان و فەرهەنگی کورد باسی دەکرد و بەشێکی عادڵانەی داهاتی نەوتیشی دەخستە سەر. درپیێر دەیگوت: "من تەواوی ئەم شتانەم دەنووسییەوە و بە سەرڕاستی دەمکردنە ڕاپۆرت. بەلام بۆ هێنری (کی‌سینجێر) لە قاتی حەوتەمی وەزارەتی دەرەوەدا تەواو ڕوون بوو کە ئەم گەریانە تەنیا سەرێشەیەکە." لە ڕاستیدا کی‌سینجێر وەها سوور بوو لەسەر ڕاگرتنی نێوانخۆشیی لەگەڵ ئێران کە خۆی و شا لە کۆشکی هاوینەی پاشایەتی لە لێواری خەزەر, هەر لەو مانگی ئووتەدا, لە دیمانەیەکی دوور و درێژدا "ڕاپۆرتی پایك"یان بە شتێکی ناچیزە دانا.

فرۆشتنی چەك‌وچۆڵی ئەمریکایی پتری باڵ و برەو دەگرت و شا بە فیزیکەوە دەیگوت: "چما چارەیەکی تریشتان هەیە؟" لە نێوبەندی ئەو قسانەدا کە کی‌سینجێر خۆی پێی‌خۆش بوو چەن‌پاتیان کاتەوە ئەمەشی گوت: "ئەگەر ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یارمەتی دۆستەکانی نەدا, ئەو کات تەنیا ڕێیەکی تر کە دەمێنێتەوە کوشتارێکی ناوکییە و وێتنام‌گەلێکی تر." وەکی ئەمرۆ بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێ, کی‌سینجێر کوردانی لە ڕێزەی دۆستان دانەناوە. لە بەرامبەردا کوردان خۆیان تاڵایی ئەم

مەبەستەیان لا شیرینە کە بە وە بیر هێنانەوەی ناویان دەرهەڵدەبوو و کەفی دەچاند. لە وەزارەتی دەرەوەدا دەنگۆ بوو کە هەرکەس لای کیسینجێر ناوی کوردان بێنێ خۆی تووشی مەترسی وەدەرنان کردووە.

بارزانی بە سەرکەوتنی کارتێر و شکانی فۆرد لە هەڵبژاردنی مانگی نوامبری سەرکۆماریدا و کۆتایی هاتنی ئیشی کیسینجێر کەیف سازبوو. لەگەڵ ئەم گرینگایەتییەی کارتێر لە رێكخستنی سیاسەتی دەرەوەیدا بۆ "مافی مرۆڤ"ی دانابوو, هیوای بارزانی بۆ وەبەرچاو گرتنی هەڵوێست و سیاسەتێکی ئەهوەنتر سەبارەت بە کوردەکانی ئێراق، گەشایەوە, بەلام ئەم هیوایە خێرایەکی بەسەر هیوابراویدا کەوت. بۆ دانیشتنێکی تەشریفاتی و خواردنەوەی چایی و دەربڕینی هاودەردی بانگهێشتن کرایە وەزارەتی دەرەوە و هەر لەم دانیشتنەدا پێیان گوت کە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا هیچ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا نایا، جا چ بگا بە دیداری لەتەك سەرکۆماردا. بەڵێ گرینگایەتی شا بۆ ئەم دەوڵەتانەی دوا بە دوای یەکا دەهاتن ئەوەندە زۆر بوو. بارزانی بە دڵپەرۆشی و نابەدڵی سەری وەبەر چارەنووسی هێنا. درپیێر دەڵێ: "چەند هاواڵێکی لە مەجلیس پیران و گۆڤار و رۆژنامەکاندا هەبوو, بەلام قەت نەیتوانی پەیوەندی لەگەڵ بەرێوەبەرانی بالای دەوڵەت پێكبێنێ. من تەواو دەقودۆغر بە کوردانم گوت کە ئەشتەکی ئاوا روو نادا." بارزانی ئەو دەمانەی غەوارانی دەچوونە دیداری لەوپەڕی بە ئەدەبی و سەنگینی و بە دەماریدا ئەم ناهومێدی و تێماوی و قەڵسییەی دەخواردەوە. لە نێوەراستەکانی ژانویەی ١٩٧٩دا ئەو دەمەی کە شای شێرپەنجاوی بازرە کراوی دەستی هێزەکانی شۆرشگێری لە تەلەفیزیۆندا هاتە بەرچاوی بە شادمانی گوتی: "بڕوانە، بڕوانە ئەم کابرا گۆرینەی ئێمەی فریو دا تووشی چ رۆژێك بووە!"

بارزانی ئەو وەختی تیژ بۆخۆی دەتوایەوە. درپیێر کە ئیتر نەیدەتوانی ئەم دیمەنە ببینێ و تابشتی نەدێنا پێی لێنا کە "خۆی کەنار دا" و لە باتی خۆی "ماری ئان کیسی" ناردە سەردانی ئەم رێبەرە تێشکاوەی زۆری رێز بۆ دادەنا. ماری ئان کیسی یەکێك لە بەرپرسانی "دەفتەری کاروباری سەر بە ئێراق" بووە. کاتێك "ماری ئان" گەیشتێ

بارزانی تەواو پشووی سوار بوو, بەڵام چونکە هەستی دەکرد کە ئەمە دوایین هەلێکە وا دەتوانێ تەواوی ئەم دەرد و زووخاوەی لە دڵی دایە بەسەر کاربەدەستێکی ئەمریکایی‌دا هەڵڕێژێ، ملی نا لە باسی خراپەی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بە دوور و درێژی و هەست و سۆزەوە تەواوی ئەم مەبەستانەی پێشتر خۆی لێ‌پاراستبوون درکاندنی و لە بنی کوولەکەی دا: ئەم بێ‌دادییەی هەستی پێدەکرد، خەیانەتەکان و جێ‌متمانە نەبوونی ئەمریکا. دۆسکی دەڵێ: "لەگەڵ درێژەی وتەکانی هێزی وەبەرهات, دەتگوت دەیزانی کە تازە دەمرێ." تا ئەمرۆ کیسی ئەشتەکی لە بابەت ئەم دیدارەوە نەدرکاندووە.

لە دوایین ڕۆژانی فێوریەی ١٩٧٩دا بارزانی بێ سەروزمان لە نەخۆشخانەی زانکۆی "جۆرج تاون" کەوتبوو. ئەندامانی بنەماڵەی شەو و ڕۆژ بە نۆرە بە سەریەوە بوون. دەیویست لە گوندەکەی خۆی, بارزان, بنێژرێ, کە لەمێژ بوو لە لایەن هێزەکانی تۆڵەئەستێنی ئێراق, کە لێبڕابوون داری لەسەر بەردی نەهێڵن، خاپوور کرابوو. بەڵام ئێراق لەسەر هەوایەك نەبوو کە لەم بابەتەوە خۆ شل و کل کا. شوێنی هەڵبژاردەی دیکەی بۆ نێژرانی "شنۆ" بوو، سی ساڵ پێشتر لە وێندەری شەڕی پاراستنی "کۆماری مەهاباد"ی کردبوو. بەڵام هەرچۆنێك بێ دەیەویست لە کوردستان, لە ئامێزی بنەماڵەکەی‌دا بنێژرێ. لەمە نەخۆشتر بوو کە بە فڕۆکەی مسافیربەری ئاسایی سەفەر بکا، هەر بۆیە فڕۆکەیەکی تایبەت و تەیاریان بەکرێ گرت، هەتا لە ٢ی مارسا بیباتەوە تاران. لە ١ی مارسا بارزانی گوتی دەیەوێ دانیشێ. دۆسکی هەستا هەتا باڵنجێك بێنێ, بەڵام بارزانی گوتی نا، دەیەوێ لەسەر کورسی دابنیشێ. دۆسکی دەڵێ: "سەری کەوتە سەر سینگی، مردبوو."

***

بارزانی سی‌ودوو ساڵ بەر لەو کاتە لە تاران چاوی بە "ئارچی باڵد ڕۆزوێڵت" کەوتبوو: ئەویان کێشابووە تاران هەتا بە تاوانی پارێزگاری لە "کۆماری مەهاباد"ی تازە تێك‌شکاو تۆڵەی لێ بکەنەوە. بارزانی بەم یەکەم کارەبەدەستە ئەمریکایی‌یەی کە

دیداری لەتەکا کرد گوت: "من لە مردن ناترسم. من تەنیا دەربەستی دوو شتم: شەرافەتم و بەڵێنیم." تەنانەت ئەمەشیان پێ ڕەوا نەدی.

داخوازی بارزانی بەرێوەچوو, لە کوردستان نێژرا، بەڵام ئەم گەڕیانەش ڕووداوێکی تاڵی بە دوادا هات: تابووتەکەیان بە فڕۆکە هێنایەوە تاران و لەوێوەش لە سایەی هاوکاری دەوڵەتی شۆڕشگێڕی ئێران بردیانە ورمێ. لە ڕاستیدا قەرار وابوو کە تەرمی بارزانی بە ڕێورەسمێکی ڕەسمی لە ورمێڕا بە ئۆتۆمبیل بەرنە شنۆ. بەڵام لە دوا کاتەکانا کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی پاشگەز بوونەوە و بە گوێرەی هەنگاوی بەپارێز و بوونی نیگەرانی لە بابەت سەرهەڵدانی نێوانناخۆشی لە مابەینی لایەنگرانی بارزانی و زۆرێك لە کوردەکانی ئێران کە ئەویان سەبارەت بە گرتن و کوشتنی ڕێبەرانیان لەبەر دڵی شا نەبەخشیبوو, تەرمەکەیان بە باڵەفڕ بردە شنۆ.

تەرمی بارزانی لە شنۆ لە نێوان ئەم دەهەزار کەسەی لە شوێنە دوورەدەستەکانی وەك سنە لە باشووری کوردستانی ئێران و بادینانی باکووری ڕۆژهەلاتی ئێراقەوە هاتبوونە بەڕێ کردنی، تەسلیم بەخاك کرا. ڕووداوێکی دزێو نەقەوما. لە دەسپێکی ساڵی ١٩٨٠دا مارکسیستە توند و تیژەکانی کورد حورمەتی گڵکۆی ساکاریان ڕانەگرت و تەرمەکەیان فڕاند. بارزانییەکان تەرمەکەیان دۆزییەوە و لە قەڵای سەختی خۆیان لە ڕایان کە کەوتۆتە سەر سنووری ئێران, ناشتیانەوە.[1] لە پایزی ساڵی ١٩٩٣دا تەرمەکەیان بە باڵەفڕ بردەوە سنوور و لە وێوە جەماوەر بە ڕێوبانانەدا بردیانەوە بارزان. لەم کەسانەی وا بە پیرییەوە چووبوون و هێنایانەوە یەکیان جەلال تاڵەبانی بوو کە لە پێشدا قوتابی و مریدی بارزانی بوو و دواتر بوو بە نەیاری ... یەکێکی تر مەسعوودی کوڕی بوو. ئەویان وەك چۆن خۆی وەسێتی کردبوو لە بارزان ناشت. دووباڵەفڕی شەڕکەری ئێف ١٦ بۆ ڕێز گرتن دووجار بەسەر مەزاریدا فڕین:

١– تەرمەکەیان بردەوە گوندی هەڵەج لە نزیك شارۆچکەی زێوە و نێوانێکی وای لەگەڵ سنووری ئێراق نیە. "وەرگێڕ".

ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئاخرییەکەی بایدابۆوە سەر قەرەبوو کردنەوەی خەیانەتی ساڵی **١٩٧٥**.

ئەمریکایی‌یەکان لە ڕیزەی ئەم گشتە غەوارانە بوون کە لە ڕێی پەڵەدار کردنی شەرەف و بەڵێنی بارزانی‌دا هەنگاویان نا. ئەیاڵەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەر لە تەمای کی‌سینجێر لە **١٩٧٢**دا بۆ پشتیوانی کردن لە شا، چارەگە سەدەیەك بوو کە لەگەڵ ڕەوتەکە تێکەڵاو ببوو. زۆر پێشتر، یانی لە **١٩٤٧**دا ئارچی ڕۆزوێڵت ئەوەندەی وریایی و تێگەیشتن ببوو کە ئاوات و ئامانجەکانی نەتەوەیی کۆماری مەهاباد بەرێتەوە سەریەك. زۆربەی چاوەدێران تەنیا سەرنجیان دابووە سەر "دەسپێکی" شەڕی سارد کە لە درێژەی ئەوا مەسکەو لە بەرامبەر شایەکی سەرکەوتووا کە کەوتبووە ژێر باڵی بریتانیا و ئەمریکا، پشتیوانی لە کوردان و ئازەربایجانییان دەکرد. ڕۆزوێڵت پاش بیستنی هەواڵی دەرکرانی حوکمی ئیعدامی سێ‌کەس لە مەزنە ڕێبەرانی کۆماری مەهاباد لە **٢٣**ی ژانویەی ئەو ساڵەدا, جۆرج ئالێن، گەورە باڵوێزی ئەمریکای هەڵپێچا کە لە لای شا تکایان بۆ بکا. بە بڕوای ڕۆزوێڵت "بێتوو ئەمانە لە سێدارە بدرێن نەتەوەخوازانی کورد لە هەموو شوێنێك ئێمە بە شەریکی ئەم تاوانە دەزانن." شا لەرێوە "جۆرج ئالێن"ی ڕێ دا بچتە دیداری و بە بزێکەوە لێی پرسی: "دەترسێی گوللە بارانیان کەم؟ ئەگەر پێتان وایە، خاترجەم بن کە وەها کارێك ناکەم." شا بە شێوەی سەمەرەی ئێرانیی وەفای بە قەولی خۆی کرد, گوللەبارانی نەکردن، لە داری دان.

بەم شێوەیە پێش‌بینی ڕۆزوێڵت لەمەڕ بێ‌بڕوایی کوردان سەبارەت بە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وردە وردە خۆی نواند. بارزانی لە مەودای دوورخرانەوەی لە واشینگتۆن لە سەر ڕێوشوێنی کۆنباوی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست, پەر و پۆی زیاتری وەو مەبەستە خست و بەرەبەرە بە بەکەم‌گرتنی هەڵەکانی خۆی لە بابەت هەڵسەنگاندنی بارودۆخانەوە, تەواو قورسایی باری تاوانی خستە ئەستۆی غەوارەکانی فێڵەبازی لە بنەوەبڕ. بارزانی لە نامەی ڕێکەوتی **١٩٧٧**ی خۆیا بۆ کارتێر, کە

پوختەی کوێرەوەری و چەوسانەوەکانییەتی نووسی: "دوژمنەکەمان بە لانی سەربازییەدا ئێمەی تێك نەشکاند، دۆستەکانمان خاشەی ئێمەیان کێشا." پاشان پرسی: "داخوا گەلێکی مەزنی وەك گەلی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە ڕێوشوێنی بنەڕەتیی و ڕاگەیاندراوی شەرەف و ڕاستی و ئازادی و دێموکراسییە بۆ تەواوی گەلان, دەتوانێ پاش ئەم دەورەی کە لە تێك شکان و تەفروتونا بوونی خەڵکی کوردا گێڕای سەری بەرز کاتەوە؟"

لە چاردە ساڵی دواییدا جگە لە تاقمێك لە کارگێڕانی وەزارەتی دەرەوە و سیا کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ کوردان پێوەندییان هەبوو و هەستیان بە ئازاری ویژدانیان دەکرد، ئەم دەوڵەتانەی کە لە ئەمریکا هاتنە سەردەسەڵات وا دیارە هیچ دڵپەرۆشی ئەمە نەبوون کە چ شتێك قەوماوە. واشینگتۆن لە کلکەی شەڕی ئێران و ئێراقا سەبارەت بە کەڵك وەرگرتنی ئێراق لە گازی ژاراوی کە لە مارسی ١٩٨٨دا هەزاران مرۆڤی بێدەسەڵات و بێچەکی لە هەڵەبجە کوشت، بچووکترین سزای تۆڵە ئەستاندنەوەی نەخستە سەر ئێراق. هەزاران کەسی تر لە مانگەکانی ئاخری شەڕا بە هۆی کەڵك وەرگرتن لە چەکی شیمیایی تێداچوون و دیسانەوە هەزاران ئادەمیزادی دی تەنانەت پاش ئاگربڕی ٢٠ی ئووت کە کۆتایی بە شەڕ هێنا, کوژران. لە فێوریەی ١٩٩١دا سەرۆك بووش کوردانی بە دژی سەددام حوسێن بۆ ڕاپەڕین وەخۆ خست, پاشان لەبەر ئەوەی دەوڵەتەکەی باڵەفڕەکانی ئێراقیی کە لە باکوور تۆوی ترسیان دەپرژاند نەیخستنە خوارەوە و هەرەسیان بە شۆڕش هێنا, هەوڵی دا ڕەوتی ڕووداوەکان تەواو بخاتە پشت گوێ. تەنیا دیمەن و وێنەی تەلەفیزیۆنی کە کوردانی لە کوێستانان نیشان دەدا کەوا خەریك بوون لە سەرمان کەسیرە دەبوون, ناچاری کرد دەس بزێوێ.

هەر ئەم دیمەنە بوو کە ئاخرییەکەی "کیسینجێر"ی وا لێکرد بە شێوەی خۆی, لەگەڵ بەشێك لە بێباوەڕی کوردان سەبارەت بە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا "پێك بێ." لە ٥ی مانگی مەی ١٩٩١دا بە وەرگرتنی پوولێك وتارێکی بۆ یەکێك لە ڕۆژنامەکان نووسی: "هەرکەسێك ئەم دیمەنە دڵتەزێنانەی لەسەر سنوورەکانی تورکیا

و ئێران دەقەومێن, ببینێ, ناتوانێ بە باشی پێشوازی لەم كردانە نەكا كە ڕەنگە بەری قەومانی كارەساتی نێو كوردان بگرن." ئەو لە ساڵی ١٩٧٥دا بە دیتنی وەها دیمەنگەلێ هەڵنەچۆقیبوو كە ئەم هێندەش بە ئێش و ژان بوون, ئەگەرچی لە لەسەر شاشەی تەلەفیزیۆن بڵاو نەكرابوونەوە. هەروەك لە "ڕاپۆرتی پایك"دا نووسراوە, ئەو كاتی تەنانەت بۆ دابین كردنی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بۆ پەنابەرانی كورد هیچ كارێكی نەكرد. كیسینجێر ئێستا بۆ یەكەم جار دەیگوت: "بۆ ئێمە كە لە دەوڵەتا بووین ئەو تەمایە تەمایەكی تاڵ و دڵتەزێن بوو." ئەو كە هەروا پابەندی "سیاسەتی واقعبینانە"ی خۆی بوو، درێژەی دا: "پەندێكی كە دەبێ لەم ڕووداوانە وەرگیرێن دەگەڕێتەوە سەر "بەڵێنی" سەرەتایی, نەك ئاكامی دوایی, ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەبوو لە هەوەڵەوە دیاری كردبا كە بۆ یارمەتی دانی كوردان دەیەوێ هەتا كوێ بچتە پێش و بەر لە ناردنی هەر یارمەتییەك دەبوو جەغزی ئەم گەڕیانەی بە ڕوونی دیاری كردبا."

لە ئووتی ١٩٩١دا لێژنەیەكی كوردان كە خەریكی دیدار و سەردان بوو لە واشینگتۆن، بوو بە پێشقەدەم و چاوپێكەوتنێكی لەگەڵ كیسینجێر ساز دا. ئەم كردەیە بە ئاشكرا بەم مانایە بوو كە ئەوان لە تاوانی – نەوەك لە لێپرسراوییەكەی – ساڵی ١٩٧٥ی خۆش بوون. یەكێك لە بەشداربوانی ئەم كۆبوونەوەیە بە مەبەستی شیكردنەوەی گەڕیانەكە گوتی: "ئێمە هەر دۆستێكی بتوانین پەیدای كەین نیازمان پێیەتی."

ساڵێك دواتر كاتێك سەرەنجام توانیم ڕەزامەندی كیسینجێر بۆ پێكهێنانی دیمانەیەك بە مەبەستی باس و دوان لە بابەت كوردانەوە وە دەس بێنم, ئەم كارناسەی سیاسەتی دەرەوە كە پتر خۆی لە بزركان و شەمزان دەپارێزێ، بە ئاشكرا هەڵگرابوو. بێپسانەوە دەربارەی كاتی دیاری كراوی دیدارەكە تەفرەی دەدام و ئاخرییەكەی وەختەكەی وا دانا كە بكەوێتە زەمانی چوونی بۆ فرگە, بە بیست دەقیقەیەك پێشتر. لە تەواوی مەودای دیدارەكەیدا پەیتاپەیتا چاوی لە كاتژمێرەكەی دەكرد. لەگەڵ ئەمەش

دا وڵامەکانی پڕ بوون لە وتەی لەم چەشنە: "ئەگەر خۆم بە شیاوی سەرکۆنە کردن بزانم" و "لە پێداهاتنەوەدا — وا هەست دەکەم — دەبوو پتر ورد بووبامەوە." و "هەلومەرجم بە وردبینی تەواوەوە هەڵنەسەنگاند و شیم نەکردەوە."

— دەی، دەربارەی کردەوەی شا لەگەڵ کوردان چۆن بیر دەکەنەوە؟

کیسینجێر لە وڵاما گوتی: "وام بیر دەکردەوە کە کایەیەکی دڕاندانە دەکا و کردەوەی لەگەڵیاندا لە ڕادەبەدەر توند و تیژە ..." جا بە ڕاوێژێکی کە بۆنی شەرمەزاری لێوە دەهات بە ڕواڵەتێکی گوناهبارانەوە زیادی کرد: "بەڵام شا — بەر لە مۆرکرانی پەیمانی ئەلجەزیرە — بیروڕای ئێمەی نەپرسی."

داخوا ئەم نامەیەی کە نووسیبووی — و ئێستا لە دەس دۆسکی دایە — و تێیدا دیدارەکەی بارزانی کە دڵپەرۆش بوو و دەیەویست لە ژانویەی ١٩٧٥دا بۆخۆی بە مەبەستی وتوویژ بێتە واشینگتۆن و ئەو هاتنەکەی وە پاش دابوو, لە بیر مابوو؟

وە بیری نەدەهات, بەڵام لای وابوو کە هێنانی ئەم بیرانە بۆ سەر کاغەز و نووسینیان کردەوەیەکی بێپارێزانە بووە، ئەگەر وەهای کردبێ.

ئەو مەبەستەی کە لە "ڕاپۆرتی پایك"دا، لەسەر زمانی ئەوڕا گێڕدرابۆوە کە گوتبووی چالاکی نەهێنی لەگەڵ کاری "لیژنەی میسیۆنێران" جیاوازە, چۆن؟ داخوا ئەمە وتەی ئەوە؟

گوتی ڕەنگە شتێکی ئەوتۆی گوتبێ: "بەڵێ، ڕەنگە گوتبێتم" بەڵام "هەر بەڕاستی ئەشتەکی ئەوهام گوتووە؟"

بە بڕوای ئەو پاش تێپەڕینی ئەم هەمووە ساڵە لە دیداری لەگەڵ کوردان چ شتێك لە هەموان گرینگتر بووە؟

وڵامی داوە: "دەمەویست ڕێوڕاست پێیان بڵێم من کارێکم کرد کە بە ئەرکی خۆمم دەزانی."

# بەشی ٧

## گەدای کوێر: چلە

بوولێڵی ئەم ئێوارەی ڕۆژی ٢٧ی ئاوریلی ١٩٧٩ لە یانەی هێزە چەکدارەکانی ئیسڕائیل, تەنانەت لە مێژووی چالاکی دەزگاکانی زانیاری ڕۆژهەڵاتیِنیوەڕاستیش‌دا ڕووداوێکی سەمەرە بوو. چەن‌سەد کەسێك بە بانگێشتننامە بۆئەم ڕێ وڕەسمە لێیان گێڕدرا بۆوە: هێندێکیان بریتی بوون لە سەرۆك وەزیر ئیسحاق ڕابین, سەرۆکی پێشوو و ئێستای مووساد, ڕێکخراوی سیخوڕی ئیسرائیل و کارگێڕانی سپا و مووساد و تەواوی ئەوانەی کە لەم چالاکییەدا بەشدار ببوون کە ئیسڕائیل خیرەسەرانە بە چالاکی نەهێنی ناودێر کردبوو؛ ئەگەرچی ئەم چالاکییە خراپترین ڕازێك بوو کە لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا پارێزرا بوو.[1] لەم ڕێوڕەسمەدا کە سێچارەگی درێژە کێشا, وتارەکان

---

١– یەکەم کاربەدەستی ڕەسمی ئیسڕائیل کە ئاشکرای کرد ئیسڕائیل پووڵ و چەكوچۆڵ و فێرکاری ڕاهێنانی لە ئیختیار کوردان ناوە, سەرۆكوەزیر مناخم‌بگین بوو. ئەو ئەم مەبەستەی لە ٢٩ی سێپتامبری ١٩٨٠دا ئاشکرا کرد و بەم کردەوەی بالادەستانی "مووساد"ی تووڕە کرد. بۆ سبەی ئەوێ ڕۆژێ بلاڤۆکانی ئیسڕائیل نووسیان کە ژێنێراڵ بارزانی لە مەودای ساڵەکانی دەیەی ١٩٦٠ و سەرەتای دەیەی ١٩٧٠دا چەند جاران بە دزی هاتۆتە ئیسڕائیل.

کورت و گەرم وگوڕ و جارجاریش تێکەڵ بە هەست و سۆز بوون. شەپوورەکانی دەستەی مووزیکی سپا هەوای بێدەنگییان لێدا, ئالآی ئەستێرەی داود هەڵدرا و بۆ ڕێزگرتن لە هاوکاروانێکی خزمەتکار داکێشرایەوە سەر دۆخی نیوەهەڵدراو.ئەوەی ئەم ڕێوڕەسمەی تایبەت و تاق دەکردەوە ئەمە بوو کە چل ڕۆژ پاش کۆچی پیاوێك بەڕێوە دەچوو کە ئەم ڕێوڕەسمەی بۆ گیرابوو و ئەمڕۆ چلەی بوو, کە باوێکی ئیسلامییە لە بیرەوەری ڕێز لێنانی مسوڵماناندا.

جا بەڵام ئەم پیاوەی ڕێزی لێ‌گیرابوو مەلامستەفا بارزانی بوو کە لە مەودای دە ساڵی قەیرانییدا هاوبەندی ئەم هەوڵانە بوو کە ئیسرائیل بە مەبەستی لاواز کردنی دەوڵەتەکانی ئێراق بەڕێوەی بردبوون. لە نەخۆشخانەی زانکۆی "جۆرج تاون"ی واشینگتۆن کۆچی کردبوو. تەنیا شتێکی هێندێکی لە مەسەلەی دوورخرانەوەی تاڵ و پڕ کوێرەوەری ئەوی لە ئەمریکا کەم کردبۆوە, تۆڵەیەکی بەجێ بوو کە ئاوقای بەرۆکی دەوڵەتدارانێکی بەهێز ببۆوە کە پیلانی ئەم خەیانەتە پڕ شەرمەزارییەیان سەبارەت بە وی – لە مارسی ١٩٧٥ – گەڵاڵە کرد و بەڕێوەیان بردبوو: سەرۆك ڕیچارد نیکسۆن لەسەر ڕیسوایی "واترگێت" لە ١٩٧٤دا دەسی لە کار کێشابۆوە؛ وەزیرە ڕەنگوڕوو کاڵەوەبووەکەی دەرەوەی, واتە هێنری کیسینجێر, وێڕای تێشکانی سەرۆك جراڵد فۆرد لە هەڵبژاردنی سەرلەنوێی ١٩٧٦دا، لە لووتکەوە بەرەوخوار تلی بوو؛ هەواری بوومیدیەن، ڕێبەری ئەلجەزیرە ڕێکخەری سەودای فرۆتنی کوردان لە لایەن شاوە بە سەددام حوسێن, لە دێسامبری ١٩٧٨دا بە مەرگێکی پێداپێدا و پڕ ژان دەسی لە دنیا بەردابوو و تەنیا شەش حەوتە پاشی ئەو شۆڕشی ئیسلامی ئێران محەممەدڕەزاشای پەهلەوی لە ئێران بەرەو تاراوگە ڕادابوو.

وەك لە ڕێوڕەسمی "چلە"کەوە دەردەکەوت بەشداران گوناهێکیان لە بابەت ئابڕووتکان و تەرتوتونا بوونی بارزانییەوە لە دەروونی خۆیانا هەست پێ‌نەدەکرد، ئەگەرچی زۆریشیان ڕێز بۆ مەلامستەفا و ئامانجەکەی دادەنا؛ هەروەك زۆر دواتر یەکێك لە ئەفسەرانی بالآدەستی مووساد گوتی: "ئەم مەبەستانەی فکریانی بە خۆیەوە خەریك کردبوو بیرەوەرییەکی سادە و ساکار نەبوون." بەڵام لای‌کەم بە بڕاوی ئەم

کەسانە خوارەکەوپێچەکەی دۆستایەتی نێوان ئیسرائیل و کوردەکانی ئێراق بە گشتیی بۆ بیرئالۆزکان و بەخۆداهاتنەوەدا نەدەشیا. بە تێپەڕ بوونی زەمان ئەم ئیسرائیلیانەی کە دەستیان لە کێشەی کوردانا هەبوو بە خۆیان سەلماند کە برابرا لە خەیانەتی شا و ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەشدار نەبوون و دەوریان نەگێڕاوە. ئەمانەش وەك زۆرێك لە کاربەدەستانی دەزگاکانی زانیاری تر کە بە کردەوە لە سەرانسەری دنیادا خەریکی چالاکی زانیاری لەم چەشنەن پێیان باشتر بوو داکۆکی بکەنە سەر لایەنەکانی ترووسکەداری ئەم کارانەی کردوویانە و ئەم دۆستانەی لەم سەرەوسەری دنیادا پەیدایان کردبوون.

لە دوو ساڵی فرە قەیرانیی نێوەڕاستەکانی دەیەی ١٩٦٠دا، یارمەتی ئیسرائیل لە شەڕێکی وا دا کە شتێکی ئەوتۆی لێ نەزانرا بوو گۆیا جوولانەوەی بارزانی لە تێداچوون ڕزگار کردبوو و بۆ ماوەی دە ساڵان یاریدەی دابین کرانی شوێن و دەسەلاتی لە باکووری ئێراق دابوو, بە شێوەیەکی وا کە ئەم حوکم و دەسەلاتە وەك سەربەخۆیی دەچوو. ئەو برە یارمەتییەی ئیسرائیل وە کوردانی دابوو کە هەزاران کەس لە هێزەکانی ئێراقیان لە جێوە چورتمیش کردبوو, لە قیمەتی فرۆکەیەکی بۆمباوێژی میراژ کەمتر بوو. چما وا نەبووبا ڕەنگە ئەم هێزانەی ئێراق لە شەڕەکانی ١٩٦٧ و ١٩٧٣ی عەرەبان و ئیسرائیلدا بە دژی ئیسرائیل بەشداری شەڕ بووبان. ئاخرین کارەسات دەخەینە پشت گوێ و کارمان نەداوە بەسەر ئەمەوە کە ئەم یارمەتییانە بۆ دابین کرانی ئامانجی دیاری کراو کە بریتی بوو لە برستبرین و چورتمیش کردنی تەواوی لەشکرەکانی ئێراق کورتی هێنا. دە ساڵ دواتر بۆ ئەم ئیسرائیلییانەی کە کەوتبوونە جەغزی کێشەی کوردستان، لە وتوویژیاندا لەگەڵ هەمووکەس، ڕوو وەرگێڕانیان لە ئاوات و خەیالاتی ڕابردوو و سەرنج دانە جیهانی ڕاستەقینەی دەورووبەر و دامرکاو دژوار بوو. ئەم تاقمە بە فیز و سەربەرزییەوە ئەم وێنانەیان نیشان دەدا کە لەتەك ڕێبەرانی کوردا گرتبوویان: لە دەوری مێزی قاوەخۆری دیمەنی شەڕەکانیان نوێ دەکردەوە, تاکتیکەکانیان دەخستە بەر ڕەخنە, دەکەوتنە پێ‌وشوێنی دۆستە کوردەکانیان و ئاواتیان دەخواست کە سەرلەنوێ چاویان پێیانبکەوێتەوە. یەکێك لە

باڵوێزەکانی بریتانیا لە ئێراق لە مەودای دەیەی ۱۹٤۰دا کە بۆ هاوخەمی کوردان چ ناوبانگێکی نیە، جارێکی بە ڕاوێژێکی دزێو گوتی: "ئانگلۆ ساکسۆنەکان هەمیشە دەبنە ئۆگری خەڵکی سەیر و سەمەرە." ئیسرائیلییەکانیش هەر وەوتۆیان لێ‌هاتووە: ئەوان لەبەر دەقودۆغر بێژی و ساکاری تایبەتی خەڵکانی چیانشین و مەردازایەتییان لە شەڕ و خۆڕاگری پیاوانەیان لە بەرامبەر کوێرەوەریدا بە کوردان هەڵدەڵێن. یەکێك لە کارمەندە لێوەشاوەکانی مووساد بە شۆق و زۆقەوە دەیگوت: "کوردێك بە خۆی و تفەنگێك و کولێرە جۆیەك و چەن سەلك پیوازەوە بنێرە سەر تەپۆڵکەیەك، بە تەنێ پێشی پۆلێك سەرباز دەگرێ." ئیسرائیلییەکان هەروەها دانیان بەمەدا دێنا کە وێك چوونێك لە مابەینی خۆیان و کورداندا دەبینن، ئەویش ئەوان سەردەمان کە کەمینەیەکی چەوساوە بوون؛ ئەگەرچی کوردان بە پێچەوانەی ئیسرائیلییەکان خەڵکێکن کە خاوەنی ڕایەڵەی پێوەندی دەرەکی و توێژی خوێندەوار و پەروەردە کراو نین لە سەرانسەری دنیادا و تەنانەت بە پێچەوانەی ئیسرائیل ڕێیان بۆ دەریاش نیە. دژبەرانی کەللەڕەقی کوردان وە بیریان دێناوە کە یارمەتی ئیسرائیل بۆ وان بە مەبەستی بەهرە وەرگرتن لەبەر گەیشتن بە ئامانج و ئاکامی خۆیانە.

هەروەك دەرکەوت ئەزموونی کوردستان دواتر بۆ ئیسرائیلییەکانیش بەری تاڵی لێ‌کەوتەوە و بوو بە هۆی گەشە و پەرەی مەیل و ئیشتیای مەترسیدار بۆ بەرێوە بردنی چالاکی پڕمەترسی و گومان لێ‌کراو. کارگێڕانی کۆنەکاری ئیسرائیل کە لە کوردستان کاریان کردبوو پاشان بەشداری گەلێك چالاکی بوون؛ لە باشووری سوودان و ئێتیۆپیەڕا بگرە هەتا لوبنان و ئەمریکای لاتین و ئەم ڕەوتە بۆ ماوەی بیست ساڵان ئیسرائیلی گیرۆدەی گێرە وکێشە کرد. تاقمێك لەو ئیسرائیلییانەی کە لە کوردستان خەریکی ڕاپەڕاندنی کاران ببوون دواتر سەریان گەیشتەوە نێو ڕایەڵەی چەپەڵکاریی: لە مارۆونییەکانی لوبنان و کارتێلی مەودای موخەدیری مەدلین و ملهوڕانی ئەمریکای ناوەندی، لە "ئاناستازیۆ سوموزا دێبایلە"ی "نیکاراگۆا"ڕا بگرە تا "مانۆئێل ئانتۆنیۆ نوریەگا"ی پاناما.

ئەم چالاکییە چەپەڵکارانە و بەربلاوە دوابەدوای شەڕی ساڵی ١٩٥٦ی عەرەبان و ئیسرائیل، (ئەو شەڕەی کە لەسەر کاناڵی سوئێز هەڵگیرسا)، دەستی پێکرد و ئەوکات کە ئیسرائیل یەگجار بەپارێز سیاسەتێکی گێڕا کە بە "سیاسەتی دەورروبەر" ناودێر کرا و ئامانجی دەرباز بوون لە دوورەپەرێزی بوو لە ناوچەکەدا، مەبەستێکی چاوەڕوان نەکراو بوو. ئەم سیاسەت و هەڵوێستە شیلەی بیری "رووڤێن شیلواه" یەکەمین سەرۆکی مووساد بوو, کە بنج و بناوانی دەگەڕاوە سەر هەڵسووڕان و چالاکی تافی لاوی خۆی لە ئێراق. ئەو ئەوان سەردەمان کاری بۆ ئاژانسی یەهوود دەکرد، کە رێکخراوێکی زایۆنی بوو و لە فەلەستینی ژێربال و سەرپەرستێتی بریتانیا دەوری دەوڵەتی دەگێڕا. شیلواه لە ساڵانی دەیەی ١٩٣٠دا بۆ ماوەی سێ ساڵان وەك مامۆستای قوتابخانە و رۆژنامەنووسی نیوەڕۆژ کاری دەکرد و لەوان دەورروبەراندا دەکەوتە گەڕان و بە ناوی کۆکردنەوەی زانیاری بە مەبەستی نووسینی وتارگەلێکی کە قەت بلاونەکرانەوە, لەگەڵ کوردان و تەواوی کەمینەکانی دانیشتووی ئێراق نێوانی دادەگیرساند.

کەینەوبەینەی نێوان کەمینەکانی غەیرەعەرەب لە ولاتانی بەناوعەرەبی و لەتەك ولاتانی دراوسێی مسوڵمان و غەیرەعەرەبدا بوو بە یەکێك لە خاڵە سەرەکییەکانی چالاکی سیخوڕی ئیسرائیل. شیلەی ئەم سیاسەتە هەر ئەم وتە مەشهوورە بوو کە دەیگوت: "دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە." ئامانجی ئەم سیاسەتە کە ساز کردنی کەند و کۆسپ لەسەر رێی حکوومەتانی عەرەبی و پشتوودانی ئیسرائیل بوو, ریشەی دەچۆوە سەر رێكخستنی رەسمی تێکەڵ بە چالاکیی سیخوڕی لە رۆژهەلاتی نێوەڕاست و بە مسوڵمانانی غەیرەعەرەب لە ئێران و تورکیا و — دواتر — ئیتیۆپی لە شاخی ئەفریقاوە گرێ دەدرا, کە مەسیحییەکان حکوومەتیان بەسەردا دەکرد. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە مووساد لە ساڵی ١٩٥٨دا ئیدارەیەکی بە ناوی ئیدارەی پەیوەندییەکانی دەرەوە دامەزراند کە سەرنجی تایبەتی دابووە سەر دەورەدانی دەسەلاتی پەرەگری جەمال عەبدونناسر, سەرکۆماری میسر کە مووساد ئەوی بە هاوپەیمانی غەیرەرەسمی کومۆنیزمی جیهانی دەزانی.

ئەو ڕێکخراوە بە ناو"سێ لکە"ی کە ئیسرائیل و ئێران و تورکیای لێکتر گرێ دەدا, لە ساڵی ١٩٥٨ەوە بۆو لایە بە شێوەیەکی ڕێكوپێك دانیشتن و کۆبوونەوەی دەبوو و بناغەشی دەگەڕاوە سەر بەندیواری نێوان ئەوان و ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هەروەها ترس لە ناسیۆنالیزمی توندی عەرەب و کومۆنیزم. هەتا بیست ساڵ دواتر کە شای ئێران سەرەونخوون کرا، ئێران گەوهەری تروسکەداری قووچی کلاوی ئەم ڕایەڵە بوو و هەموو شتێکی – لە نەتەوە بگرە هەتا دابین کردنی پاراستنی سەرەکی – دەدایە ئیسرائیل و بۆی دەرەخساند. ئەم پاراستنە سەرەکییە لە چوارچێوەی کڕینی چەكوچۆڵێکی زۆر و زەوەندا بوو کە بە بیانووی بەربەرەکانی دژی یەکێتی سۆڤیەت لە ئەمریکای دەکڕی, بەڵام لە ڕاستیدا بە مەبەستی تۆقاندنی ئێراق و پێشبڕکە دانەوەی بوو لە بەستێنی ئاخنینی جبەخانەدا. یارمەتیدانی کوردەکانی ئێراق بۆ ئیسرائیل و ئێرانی شیعە مەزەب و ئاریایی ڕەگەز – بە پێشینەی دوور و درێژی دوژمنایەتی لەگەڵ عەرەباندا – هەرتك کارێکی بە ڕێوجێ بوون.

دێوید کیمچە یەکێك لە کۆنە کارمەندانی مووساد دەنووسێ: "هەرتك وڵات لە بوونی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستێکی سوننی مەزەبی بەهێزی هاوچەشن تەواو تۆقیبوون. ئیسرائیل هیچ پێیخۆش نەبوو کە سپای ئێراق لە شەڕێکی داهاتوودا سووریا و ئۆردۆن یاریدە بدا." ئێرانیش مەیلی وابوو سپای ئێراق لە سنووری باشووری خۆی کە دەکەوتە شانی یەکاویعارەبان و نێواناخۆشیی لەسەر بوو، هەروەها لە پارێزگای پڕ نەوتی "خووزستان"ی دوور ڕابگرێ. پاش شەڕی ١٩٤٨ی عەرەبان و ئیسرائیل، ئێراق تەنیا وڵاتێك بوو کە سەری لە ئاست مۆر کردنی کۆتایی هاتنی گێرە وکێشەی ڕەسمی لەتەك ئیسرائیلا با دابوو. چورتە لێبڕینی لەشکرەکانی ئێراق – جاری وابوو زۆربەیان لە پێ دەپەڕین – بوو بە هۆکارێکی بنەڕەتیی "ژێئۆئیستراتژیك"، کە بەردی بناغەی یاریدەدانی کوردانی لەسەر دامەرزا, چونکە ئەم وڵاتە جوولەکەیە تەمای وابوو کە لاوازی ڕێژەی جەماوەریی خۆی بە سازکردنی لانی زۆری گیروگرفت بۆ عەرەبان قەرەبوو کاتەوە.

ئیسرائیل بە یارمەتی تەبلیغاتی دژی زایۆنی توند و تیژی دەوڵەتانی یەك لە دوای یەکی بەغدا پاساوی بۆ ئەم هەڵوێست و سیاسەتەی دێنایەوە. هەڵبەت بەشێك لەم قسە سووکانەی ئێراق دەگەڕاوە سەر تێمانی لە بابەت بێدەسەلاتی خۆی کە نەیدەتوانی پێوەندی نێوان ئیسرائیل و کوردان لێك دابڕێ و دوایی پێبێنێ. دیسانیش ئەم بەرژەوەندییانە نەیتوانی بەرگێڕەوەی ئێراق و ناردنی هێزەکانی بێ بۆ بەرەکانی شەڕ لە ساڵانی ١٩٦٧ و ١٩٧٣دا، بەڵام گیرۆدە بوون لە بەرەی کوردستاندا بێگومان توانایی ئێراقی بە مەبەستی یارمەتیدانی پتری ئامانجی فەلستینییەکان تەواو کەم دەکردەوە.

جەمسەری دەسپێکی سیاسەت و هەڵوێستی ئیسرائیل سەبارەت بە کوردەکانی ئێراق دەگەڕێتەوە سەر زەمانی ڕووخانی پاشایەتی بنەماڵەی هاشمی لە ١٩٥٨ و کۆتایی هاتنی حوکم و دەسەلاتی ئینگلستان لە ئێراق کە لە سەرەتای سازکرانی وڵاتی ئێراقەوە, واتە دوابەدوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە بێپسانەوە دەستی پێکردبوو. لەگەڵ شۆڕشی ژێنێراڵ عەبدولکەریم قاسم کەم و زۆر دەساڵەیەکی تەواو ئاڵۆز و لەرزۆکی سیاسی سەری هەڵدا و ئەمە دەرفەتی بۆ ئیسرائیل ڕەخساند کە بێتە مەیدان. ئاڵۆز و لەرزۆك کردنی ئێراق ئامانجی نەپساوە و هاوبەشی ئیسرائیل و ئێران و کوردان بوو. ئێران لە ١٩٥٠دا بە شێوەی ڕەسمی دانی بە وڵاتی ئیسرائیلدا هێنا و ئیزنی دا کە فڕۆکەی شەریکەی ئیسرائیلی "ئێل عال" لە فرگەی تاران بنیشن, بەڵام قەت بە ڕەسمی ئیزنی لێژنەی سیاسی ئیسرائیلی نەدا کە ئاڵای ئەستێرەنیشانی داود لە سەردەرانەی بنکەی ڕامیاری خۆی هەڵبدا و یا تەنانەت لەوحێکی وەرشەو بە ناوی باڵوێزخانە بە دیواری دەرەوە هەڵواسێ. نێوانخۆشی لەگەڵ ئێران بۆ ئیسرائیل بە ڕادەیەك گرینگ و ژیانەکی بوو کە ئیسرائیلییەکان قەت پێیانخۆش نەبوو لە هیچ گەڕیانێکی گەورە یان بچووکدا بە پێچەوانەی مەیل و بیری شا بجووڵێنەوە. بە خوردبوونە لە یەکتر نەخوێندنەوەی ئەم پەیوەندییە, سەرەڕای هەست و سۆزی هێندێك لە ئیسرائیلییە ڕۆمانتیکەکان کە بە چاوی دوو کەمینەی پێخوستکراو تەماشای ڕەوتەکەیان دەکرد کە یاریدەی یەکتر دەکەن, ئامانجی سەرەکی و گرینگی

ئیسرائیلییەکان کوردان نەبوون. جا بەڵام بۆ بارزانی – کە پووڵ و چەكوچۆڵی نـەبوو و تاق کەوتبۆوە و لـە ١٩٦١ەوە بـۆو لایـە بـە دژی ئێـراق ڕاپـەڕیبوو – ئێـران تـەنیا شادەماری ژیان و مان بوو بە مەبەستی دەسڕەسی بە دنیای دەرەوە و خر و پتوون سـەر بە ئێران بوو.

لـە تەواوی ماوەی دە ساڵەی ئاماژە پێکراوا گەورەترین یارمەتی لـە لایـەن ئێرانـەوە دەدرایە کوردانی ئێراق و چۆنیەتی ئەم یارمەتییەش دەگەڕاوە سەر بۆچوونی شا لـەسـەر سیاسەتی ئێراق و دەکەوتە هەوراز و لێژان. بـۆ وێنـە کاتێـك "عەبدوسـسەلام عـارف ناسری" لـە ساڵی ١٩٦٤دا لـە ئێراق هاتە سەر دەسەڵات، یارمەتی شا بۆ کـوردان بـە شێوەیەکی بەرچاو پێهەڵاچوو. ئیسرائیل بۆ "شا" ئامرازێکی باش بوو: هـەم دەوڵـەتێکی بچووك بوو و هەمیش بە پێچەوانەی ئـەو داوێنـی بـە خەیانـەت بـە کـوردان ئـالوودە نـەببوو. کـەلك وەرگـرتن لـە ئیـسرائیل بـۆ یارمەتیـدانی کـوردان لـە ڕوانگـەی "زانیاری"شەوە زۆر بە قازانج بوو: دەیتوانی بە شێوەیەکی شیاو و سەلـماو پاکانـە بکـا و حاشا لـە دەستێوەردانی خۆی بـکا.

بەمـجۆرە بە پێی ڕەزامەندی و سەلـماندنی ئێـران بـوو کـە ئیـسرائیل و بـارزانی هەلیان بۆ ڕەخسا لـە ساڵانی دەیەی ١٩٦٠دا بکەونە باوەشی یەکتر. داخوا بلێـی کـێ یەکەم هەنگاوی هەڵێنابێتەوە ڕوون نیە. یـەکێك لـە دەورگێـرە بنەڕەتییـەکان کـامران عالی بەدرخان بوو: ئەو کوردێکی تورکیا بوو کە پێشینەی شۆڕشگێڕ بوونی دەگەڕاوە سەر ساڵانی نێوەڕاستی سەدەی نۆزدە و لـەوێوە دەستی پێدەکرد. بـەدرخان کـە ئـەوان سەردەمان تەمەنی پاڵی وە حەفتا ساڵ دابوو وتەبێـژی بـارزانی بـوو لـە ئورووپـا و بـە مووچەیەکی زۆر کەم لـە قوتابـخانەی میللی زمانە زیندووەکانی ڕۆژهـەڵاتیی (ناسـراو بە Langueso) دەرسی دەگوتەوە. ئەو لـەگـەڵ چـالاکی سـیخوڕی نائاشـنا نـەبوو. دروست پاش شکانی عوسـمانی لـە شەڕی یەکەمی جیهانیدا وەك دیلمـانج و ڕێنـوێنی ماوژۆڕ ئێدوارد دابلیو.سی. نۆئێل، کوردنـاس و ترکزەخـوازی چاوناسـی ئینگلیـسی، چووبۆوە بۆ تورکیا. ئەم ڕاسپێراوییەی ئاوریلی ١٩١٩ لـە کوردسـتانی تورکیـادا بـە ڕادەیەك ئاگری تووڕەیی باڵادەستانی ترکی خۆش کرد کە دەوڵـەتی ئینگلـستان ناچـار

بوو بانگی بێڵێتەوە. ترکان "بەدرخان"یان لـەبەر دەورێکی کە لــە شۆڕشــەکانی دواتــرا گێڕای لـە دوورەوە مەحکووم بە ئیعدام کرد. لـەوی بەو لاوە ئەو لـە نێوان بەیرووت و دەمیشق‌دا هات‌وچۆی دەکرد؛ سەرپەرستێتی ئەم دوو وڵاتە لـە ئەستۆی فەڕانــسە بــوو. بەدرخان بڵاڤۆکی کوردی بڵاو دەکردنەوە و وەك پارێزەرکاری دەکرد. لــە ١٩٤٧دا لـەسەر تکای ڕۆژێ لێسکۆ و ڕۆژهەڵاتناسانی تری فەڕانسەوی کە خۆیان کەوتبوونە نێو ڕایەڵەی دەزگاکانی زانیاری چووە پاریس. لێسکۆ هەر خێرایەکی بە تەواوی چووە نێو دەزگای زانیاری فەڕانسە و کورسی مامۆستایەتی خۆی لـە دامــەزراوەی زمانــەکانی ڕۆژهەڵاتی بۆ بەدرخان بە میرات بەجێ‌هێشت. بەدرخان ناوەندێکی بە نــاوی ناوەنــدی توێژینەوەی کوردی دامەزراند، بەڵام ئەوەندە دەس‌تەنگ بوو کــە زۆر جــاران توانــایی چــاپ کردنــی بڵاڤۆکــەکانی نــەبوو و بــە ناچــار بــە یارمــەتی مەکینەیــەکی دەســتی "میمۆگراف" سەر و بنی کارەکانی وێك‌دێنانەوە.

بەدرخان پەیوەندییەکی کۆنی نەهێنی لـەگەڵ زایۆنییەکان هەبوو. چەند مانگێك پاش دامەزرانی وڵاتی ئیسرائیل لـە مانگی مەی ١٩٤٨دا، ئەو لـە ڕۆژهــەڵاتی نێوەڕاســت — میسر، سووریا، لـوبنان و ئەوبەری ئۆردۆن — خەریکی سەفەران بــوو. جارێکیــان هــەر لـەم هاوینەدا, ڕاسپێراوی "مەلیك عەبــدوڵڵا" بــوو بــۆ چارەســەر کردنــی پاشــماوەی کێشەکانی ئەوبەری ئۆردۆن و ئیسرائیل. ئەو لـەخۆوە هەوڵی دا پشتیوانی ئیسرائیل بــە مەبەستی ڕووخاندنی دەوڵـەتانی سووریا و لـوبنان، بە کەلـك وەرگرتن لـە "دەرووزی" و "چەرکێس" و مەسیحییەکانی "مارۆونی" کە هەموویان خــاوەنی پلــەی بــاڵا بــوون لــە دەوڵـەت و هێزە چــەکدارەکانی پــەروەردەکراوی دەســی فەڕانــسە, ڕابکێــشێ, بــەڵام ئاکــامێکی لـــەم هەڵــسووڕانە وەرنــەگرت. بـــەدرخان دەیگــوت وەهــا چــالاکی و هەڵسووڕانێك دەتوانێ سووریا و لـوبنان لـە ئاوقا بوونی ئیــسرائیل دوور ڕابگــرێ و بــۆ وێنە ئاوات و ئامانــجەکانی نەتەوایەتی کوردانیش لــە تــەواوی ناوچــەدا وەخۆبـــخا و ڕاپەڕێنێ. هەڵبەت ئەم بیرە شتێکی نوێ نەبوو. زایۆنییەکان لـە "داوید بێن گۆریۆن"ەوە بۆو لایە بە بیر و بۆچوونی لـەم چەشنەوە کە لای وایە تــەنیا ڕێگــای دەســتەمۆ کردنــی جیهانی عەرەب پێکهێنانی چەندین وڵاتی تر و لایەنگری کردن لـە کەمەنەتەوەکانــە لــە

جەغزی ئەم سنوورانەی کە لە خاپوورستانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەدی هاتوون، ئاشقێنییان کردبوو. ئاخرییەکەی ئیسرائیل ملی بۆ ئەم وەسوەسەیە ڕاکێشا و لە دەیەی ١٩٧٠ و ١٩٨٠دا پێی نایە بازنەی یەکێتییەکی غەیرەڕەسمی, بەڵام چڕ و پڕ لەگەڵ مارِوونییەکانی لوبنان کە گەلێك ڕووداوی پڕ کارەساتی لێ کەوتەوە. زۆرێك لە چالاکانی پێشووی مووساد لە کوردستان, کەوتنە نێو ڕەوتی ڕووداوەکانی وێندەرێ.

بە گومانی دۆستە فەرانسەوییەکانی مەیلی بەدرخان بۆ کاروباری جەغزی دەزگای زانیاری دەگەڕاوە سەر ئاکامی لێكهەڵوەشانی خێرای شۆڕشی ساڵی ١٩٣٠ی کوردان و ئەرمەنییان بە دژی ترکان کە زۆر چاکیشی گەلاڵە بۆ دارِژابوو و خۆیشی دەورێکی تێدا گێڕابوو. بە گوێرەی ئەم ئاکامە ئیتر شۆڕشی چەکداری نە دەلوا و نە بووزی دەخوارد.[١] ئەو پاش شەڕی دووەمی جیهانیش، لە وەختایەکا کە شەڕی سارد ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی کردبوو بە دووکوتی دژاودژ و دامەزرانی دەوڵەتی ئیسرائیل برینێکی لەسەر جەستەی عەرەبان جێهێشتبوو و بیر و بڕوای جهانی سێهەم تین و گوڕی وە بەر نابوو, هەروا لەسەر ئەم قسەیەی خۆی سوور بوو. لە وەها جیهانێكدا ئارمانجی کورد – بەم خواستانەی کە لەسەر ئێران و تورکیا و تەنانەت سووریاشی هەیە – سنووره ڕامیارییە دەسکردەکانی تێکەوەدەپێچا و لە نێو حیزب و دەوڵەتانی بنەگری دنیادا پشتیوانێکی قایم و پتەوی گیر نەدەکەوت. بە بڕوای بەدرخان باشترین شتێکی کە کوردان دەیانتوانی چاوەڕوانی بن ئەم دەسکەوتە باشانە بوون کە لە ڕێی بەهرە وەرگرتنی بەپارێز لە ڕایەڵەی دەزگا زانیارییە نهێنییەکانەوە کۆ دەکرانەوە, ئەمە میراتی ئامۆزایەکی گوندەکی بوو کە کوردان، بەتایبەت کوردەکانی ئێراق، نەیانتوانی خۆی لێ کلا بکەن و ئاخریش تووشی نەهامەتی کردن.

لە بەهاری ساڵی ١٩٦٣دا مووساد بە کەوتنە شوێن ئەزموونەکانی سی ساڵی بەرەوەی شیلواه، ڕۆژنامەنووسێکی کە بنکەی لە پاریس بوو ناردیە کوردستان. لەتەك بارزانی و برایم ئەحمەد سکرتێری گشتیی پارتی دێموکراتی کوردستانی ئێراقدا

١– مەبەست شۆڕشی ئاراراتە.

دیداری کرد و پێشنیاری کرد کە کەسێك بنێرنە پاریس هەتا لە هۆتێلێك لەسەر لێواری باڵی ڕاستی "سێن" لەگەڵ ئیسرائیلییەکان وتوویژ بکا. هۆتێلەکە کەوتبووە نیزیك باڵوێزخانەی ئیسرائیل، کە ئەوکات لە یەکێك لە کۆنە کۆشکەکانی "ڕۆچیلد" لە شەقامی "واگرام"دا بوو. بارزانی کە لە لایەن هێزەکانی ئێراقەوە خرابوویە جەڕ و مەنگەنەوە، پێشنیارەکەی قبووڵ کرد، ئەگەرچی ئەم ڕەزامەندییە ئەو شۆر و شەوقە چاوەڕوان کراوەی تێدا نەبوو, چونکە ئەو زۆری پێ چاکتر بوو کە لەگەڵ ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یا عەرەبان بکەوێتە گفتوگۆ و مامەڵە کردن, واتە ئەگەر ئەمانە مەیلێکی گەرموگوڕیان سەبارەت بەم گەڕیانە نواندبا. ڕق و کینەی نەتەوەخوازێکی کورد سەبارەت بە ئازاردەرانی گەلەکەی, واتە عەرەبەکان و ئێرانییەکان و ترکەکان زۆریش بێ, دیسانیش ئەم ڕقە بە ڕێزدانان بۆ دەسەڵاتی ناوەندیی ئەم وڵاتانە برێك دەنیشێتەوە و پتر پێیخۆشە لە بری ئەوەی تووشی تێکهەڵچوون بێ لە گەڵیان، بکەوێتە وتوویژ سەبارەت بەو قازانج و بەرژەوندییانەی کە دەتوانن لەسەری ڕێكبکەون و ئەمەش ئاواتێکە کە قەت وەدی نەهاتووە.

وەکی دیمان بارزانی قەت بیری وە دەس گرتنی دەسەڵاتی لە "بەغدا" بە لای خۆیەوە پوختە و گەڵاڵە نەدەکرد؛ ئەو لەوپەڕی ئیشەکەدا هیواداربوو کە بۆ دابین کردنی ناوچەیەکی ئازاد و دوور لە دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی حکوومەت لە باکووری ئێراق, کەلك لە یارمەتی دەرکی وەربگرێ. بە وتەی یەکێك لە مێژوونووسانی کورد بۆ گەیشتن بەم ئامانجە "ئیسرائیلییەکان ئەشتەکی بەرچاو نەبوون و چما عەرەبان شتێکیان وێ دابا، هەر لەڕێوە دەستی لەوان هەڵدەگرت." بەڵام عەرەبان هیچیان وێ نەدا. بارزانیش وەك فەلەستینییەکان چارەیەکی تری نەبوو جگە لەوەی هەر ئەسپێکی هاتە بەرچاوی گرێوی لەسەر بکا. جارێکیان بە لێژنەیەکی نوێنەرانی ژنانی فەلەستینی کە ئەویان لە بابەت هاریکاری لەگەڵ ئیسرائیلدا سەرکۆنە کردبوو، گوتبوو: "من وەك ئەو گەدا کوێرەی بەر دەرکی مزگەوتی سێلمانیم، دەستم ڕاداشتووە, نابینم کێ پووڵی ناوەتە بەری دەستم."

ئا بەم شێوەیە لە پایزی ساڵی ١٩٦٣دا برایم ئەحمەد چوو بۆ پاریس, لە هۆتێلی شوێنی "مەبەست" ژوورێکی گرت و تەلەفۆنی بۆ ڕۆژنامەنووسی "گۆرین" کرد. هەروەها ئیسرائیلییەکانیشی ئاگادار کردەوە؛ ئیسرائیلییەکان هەم سەریان سوڕما و هەمیش پێیانخۆش بوو. دڵنیا نەبوون کە بارزانی وە بێوشوێنی مەبەستەکە بکەوێ, جا چ بگا بەوەی کە بۆ ئەم کارە کەسایەتێکی گرینگی وەك برایم ئەحمەد بنێرێ. "مناخم ناهیك ناوت"، کارگێڕی مووساد لە پاریس – جێگری دواتری مووساد – یەکەم ئیسرائیلی بوو کە لەگەڵ [برایم] ئەحمەد دیداری کرد، کە ئەو کات چل ساڵی تەمەن بوو بەڵام وەك زۆربەی خەڵکانی چەوساوە بە تەمەنتری دەنواند. [برایم] ئەحمەد دواتر لەتەك "والتێر ئیتان" باڵوێزی ئیسرائیلیش دیداری کرد. ئیتان گوێی دایە حیکایەتی دوور و درێژی دەرد و مەرەد و پەرێشانی و سەرەنجام داخوازی بۆ یارمەتی. [برایم] ئەحمەد قامکی لەسەر چەند خاڵێکی گرینگ دانا. ئەو چارەنووسی کوردانی لەگەڵ چارەنووسی جوولەکان پێکەوە هەڵسەنگاند و گوتی خەباتکارانی کورد بە ڕادەیەك دەستەنگن کە تەنانەت قەند و چای خۆشیان بۆ ناکڕدرێ و لێرەدا چۆوە سەر هەست و سۆزی دایکانەی خاتوو گوڵدامایەر, وەزیری دەرەوەی ئەو سەردەمی. ئەگەرچی دەزگای حکوومەتی ئیسرائیل بۆ نواندنی هەست و سۆز چاوناس نەبوو, بەڵام چەند ساڵ دواتر "ناوت" دەیگێڕاوە کە ئەو و "ئیتان" زۆر خەمبار بوون و کاتێك خاتوو مایەر ئاگادار کرایەوە لەڕێوە دەستووری داگیرسانی ئەم پەیوەندییەی دا کە ئاوا بێفەر و پڕ بەڵا کەوتەوە. [برایم] ئەحمەد کە ئۆگریی ئیسرائیلی لێ ڕوون بۆوە, لەم بابەتەوە سەری سوڕنەما. کاتێکیش بەدرخان – کە [برایم] ئەحمەد بە ئانقەست دیداری خۆی و ئیسرائیلییانی لا نەدرکاندبوو – شەو بردی بۆ کابارەی "لیدو" لە شانزەلیزە و بە ڕواڵەت لەخۆوە سەری قسانی لەگەڵ کەسێکی پەنایان داگیرساند کە بە هەڵکەوت یەکێك لە نوێنەرانی کومۆنیستی پارلەمانی ئیسرائیل بوو، دیسانیش هەڵنەبەزییەوە. ئیسرائیلییەکان [برایم] ئەحمەدیان بە خۆی و بیست هەزار دۆلار و بەڵێنی یارمەتی زیاترەوە ناردەوە کوردستان.[1] یەکەم بارخانەی چەکوچۆڵان

١– هەر لە بۆ پێکگرتن – چەند ساڵ دواتر سامی عەبدوڕڕەحمان، نوێنەرێکی تری بارزانی, توانی فرانتس

مانگێك دواتر گەیشتە کوردستان. کاتێك [برایم] ئەحمەد گەڕاوە کوردستان, بارزانی لە بابەت چەكوچۆلانەوە خۆشحاڵ بوو، بەلام سەبارەت بەم پوولە کەمەی کە کۆی کردبۆوە نارەحەت بوو. [برایم] ئەحمەد لەم بابەتەوە گلەیی کرد کە بارزانی ئاگربڕی بە هەلومەرجێك قبوول کردووە کە بە بڕوای ئەو و پارتی دێموکرات ناتەواوە و ئامانجی پێوەدی نایە؛ بارزانی گوتی کە بۆ درێژەی شەڕ پوولی تەواوی بە دەستەوە نیە.

کەمتاکورتێك هەموو شتێك, وەك چەكوچۆڵ، جبەخانە, ڕاوێژکاری نیزامیی و کادری ڕاهێنان، تەنانەت وەزیرێکی سەربەگێچەڵی کابینە, کارناسانی کشتوکاڵ، دوکتۆر, دانپزیشك و نەخۆشخانەیەکی دەشتەکی – و ئی شەڕیش – هەموو دەستیان تێکگرت و بە دوای ئەم گەڕیانە دا هاتن. یەکێك لەم ڕۆژنامەوانانەی چوو بووە دیدەنی کوردستان هەر لە دەسپێکی ساڵی ١٩٦٣ەوە باسی ئەم چەکانەی کرد کە بە شێوەیەکی گوماناوی بە چەتر بەردەدرانەوە. (سەرچاوەکانی تر دەیانگوت کە لە ١٩٦٥دا هاوکارییەکی پتەوی سەربازییان لە نێواندا بووە.) یاکۆف غروودی، وابەستەی نیزامیی ئیسرائیل لە تاران، لە گەڕیانی ناردنی چەکا، لە ئیسرائیلەوە بەرەو ئێران بۆ کوردان چالاك بوو. ئەو دواتر لە سەودا و مامەڵەی چەكوچۆلا سامانێکی زۆری وەسەریەك نا و لە گەڕیانی ئابڕووتکانی کێشەی ئازاد کرانی بە بارمتە گیراوەکانی ئەمریکایی‌دا لە بەرامبەر وەرگرتنی چەكوچۆلا, لە دەیەی هەشتادا، دەوری سەرەکی گێڕا. ناردنی چەك و جبەخانە پاش شەڕی ١٩٦٧ و ١٩٧٣ی عەرەبان و ئیسرائیل بوو بە لێشاو و ئەمانە ئەم چەکە پێشکەوتانەی ڕووسی بوون کە ئیسرائیل لە سپای عەرەبانی بە خەنیمەت گرتبوو.

لە دەسپێکی ئەم چالاکییانەدا مووساد ددانسازێکی بە خۆی و یەکێك لەم "چەرخەپێ"یانەوە، بە مەبەستی کێشانی ددانەکانی بارزانی و سازکردنەوەیان ناردە

---

یوزێف ئیشتراوس, سیاسەتوانی سووسیالیستی مەسیحی لە "باواریا" ڕازی بکا کە دوو میلیۆن دۆلار یارمەتی بداتە جوولانەوەی کوردان.

کوردستان. ددانەکانیان لە تاران بۆ ساز کردەوە. یەکێك لە گرینگترین کار و هەڵسووڕانەکانی ئیسرائیل لە کوردستان کە بە لای هێندێك لە کوردانەوە زۆر گرینگ بوو، یارمەتی ئەم وڵاتە بوو بۆ دامەزراندنی دەزگای زانیاری کوردان بە ناوی "پاراستن" کە "مەسعوود"ی کوڕی بارزانی سەرۆکی بوو. ئەم هەم لە کوردستان و هەم لە ئیسرائیل بە شێوەیەکی لەپەستا هاتە ڕاهاتن و پەروەردە کران. "پاراستن" لق و پۆی هاویشتە نێو تەواوی کۆمەڵانی کوردەواری لێر و لەوێ و مووساد لە هەر شتێکا کە پێویست بە ڕێنوێنی بوو, ئەوانی ڕێنوێنی کرد. ئەمە وتەی یەکێك لە کەسانی زانستگایی ئیسرائیلە کە پەیوەندێکی زۆر گرینگی لەگەڵ دەزگای زانیاری ئیسرائیل هەیە.

کارگێڕانی مووساد لە نێوخۆی کوردستان یان خۆیان بە ئێرانی دەگۆڕی یام جلوبەرگی کوردییان دەپۆشی و پشتێندیان لێ دەهاڵاند و جامانەیان دەکردە سەر. جاری وابوو بە مەبەستی لاڕێ کردنی بیری قوژبنپشکنی هێندێك کەس بنکەی خۆیان بە ناوی "خێوەتی بلاڤۆکان" دیاری دەکرد.

قەت جگە لە تاقمێکی کەم ئیسرائیلی لە کوردستانی ئێراق نەبوون و ئەم تاقمەش زۆر جاران لە قەراغ و قولاغی سنووری ئێران وێوەتر نەدەچوون. سەیر ئەوەیە کە مووساد لەم چالاکییانەدا بەهرەی لە هیچکام لەو جوولەکانەی لە کوردستان لە دایك ببوون وەرنەگرت و وای پێ باشتر بوو کە بۆ ڕاوێژکارانی خۆی دیلمانجی عەرەب تێوە دا.[1] سەرەڕای تاوانبار کرانی پەیتاپەیتای ئێران و ئیسرائیل لە لایەن ئێراقەوە

---

**١– ڕێژەی جەماوەری ئەم جوولەکانەی کوردستانیان بە وڵاتی خۆیان دەزانی بەر لە کۆچی بە کۆمەڵی ساڵی ١٩٥٠ بەرەو ئیسرائیل سی تا چل هەزار کەسێك دەبوو. ئەم جەماوەرە لە شارەکانی زاخۆ، ئاکرێ, ئامێدی, دهۆك، هەولێر و سلێمانی بنەگر ببوون و چەشنی مەسیحییە کوردەکان بە زمانی ئارامی و کوردی دەپەیڤین و خۆیان بە نەوە و نەتیجەی جووەکانی گراوی بابل دەزانی. (٦٥٢ بەر لە زایین). لە سەتا نەوەتی ئەم جوولەکانە نەخوێندەوار و بریتی بوون لە بازرگان و دووکاندار و لۆتکەوانانی – ڕووباری خابوور – جا سەیر ئەوەیە کە تاقمێکیان ملکدار و جووتیار بوون. زۆربەی جووەکانی گوندەکی لە دێهاتەکانی تێکەڵ بە مەسیحی و کورد ژیانیان تێپەڕ دەکرد. گوندی سوندوور, لە نێوان ئامێدی و زاخۆ بە جەماوەرێکی چوارسەد خێزانەوە تەنیا گوندی یەکسەر جوونشینی کوردستانی ئێراق بوو. ئەم جوولەکانە پاشی بیست ساڵ بنەگر بوون لە ئیسرائیل هەروا ئۆگری زێدی خۆیانن و پشتیوانی لە هەوڵی دەوڵەت دەکەن بۆ یارمەتی کوردان. تا ئەم ساڵانەی دوایی**

سەبارەت بە یارمەتیدانی بارزانی, ڕۆژنامەنووسانی دەرەكی و تەواوی ئەوانەی سەردانی كوردستانیان كرد، قەت بە بوونی "تاقمی" مووسادیان نەزانی. كاتێك ئیریك ڕۆلۆ, كە ئەو سەردەمی كارناسی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی "لومۆند" بوو و ڕۆژێكی بە ڕێكەوت تووشی ئەم ئیسرائیلییانە بوو كە خەریكی پەروەردە كردن و ڕاهێنانی كوردان بوون, یەكێك لە ڕاهێنەرانی مووساد پێشنیاری كرد كە هەر ڕێوڕێ بیكووژن و ڕووداوەكە بە هەڵكەوتێكی وێڵ بقەبڵێنن. كوردان دڵاودڵیان كرد، لایان وابوو – دیارە دواتر ڕوونیش بۆوە – كە ڕۆلۆ هەستی بە بوونی ئیسرائیلییان نەكردووە.

وەهەر حاڵ تەنیا چەند كەسێك لە باڵادەستانی كورد لە دۆزی كار وچالاكی نەهێنی مووساد لە كوردستان ئاگادار بوون. (ئەگەرچی ئەفسەرێكی ئیسرائیلی كە خرابووە پاڵ لێژنەی نوێنەرایەتی وتووێژكاری كورد لەگەڵ كاربەدەستانی ئێراقی بە ئانقەست خۆی ئاشكرا كرد – بە ڕواڵەت بە ئاگاداری بارزانی – ڕاهێنانی سەربازی لە كوردستانی ئێراق و ئێران و ئیسرائیل بەڕێوە دەچوو. لە چالاكییەكی نەهێنیدا بە ناوی "ئومێنێت توڤا"[٢] كوردانیان بە فڕۆكە دەبردە حەیفا ... ڕاهێنان و پەروەردە كران لە پێشدا بەلای شێوەی ساكاری شەڕ و بەرگری پیادەدا شكابۆوە. وەك كەڵك وەرگرتن لە خۆمپارەهاوێژ و چەكی بێ پاشەكشە و مووشەكی دژی تانك و مووشەكهاوێژی دژی فڕۆكەی دەسكاری سۆڤیەت كە بە شان هەڵدەگیرا.

ئیسرائیلییەكان قەت نەیانویست شێوەكانی شەڕی كوردان بگۆڕن – پێویستێك بەم كارە نەبوو. حەئیم لەواكۆف, عەرەبناسی شێلگیری ئیسرائیلی كە لە ١٩٦٦ هەتا ١٩٧٣ بێپسانەوە لە نێوان ئیسرائیل و كوردستاندا هاتوچۆی دەكرد دەیگوت: "كوردان بەڵەدی زەوی بوون و دەیانزانی چۆن شەڕ بكەن." ئەو، چالاكی و هەڵسووڕانی خۆی لە نێو كورداندا لەگەڵ ئەزموونەكانی تافی لاوی لە كلكەی

---

تاقمێك لەم خەڵكە بۆ دیدار نوێ كردنەوە لەگەڵ زێدی خۆیان وەك گەڕۆك دەچوونە توركیا و بە ئوتووبووس سەردانی ناوچەكانی سەرسنووریان دەكرد.

٢- Omenet Tova پەرستاری باش.

دەیەی ١٩٣٠ و کار لەتەك تاقمەکانی جوولەکە پێکدەگرت کە لە لایەن "ئۆرد وینگێت"ەوە بۆ چالاکی پارتیزانی پەروەردە دەکران. (ئۆرد وینگێت ئەفسەرێکی ماوریك‌ئاسای بریتانیایی مەیلەو زایۆنییەکان بوو کە دواتر بە ڕەچاو کردنی هەر ئەم ڕێوشوێن و شێوانە لە ماوەی شەڕی جیهانی دووهەمدا لە "بێرمە" دژی ژاپۆنییەکان زۆر چاك درەوشایەوە.) ڕاهێنەرانی مووساد کوردانیان لەگەڵ کەڵەشینکۆفی ڕووسی و تفەنگی پەلامار، ناسراو بە "کارۆل گوستاو"ی سوئێدی ئاشنا کرد. ئەوان تاریفی ئەنگێوەیی پێشمەرگەی کوردیان دەکرد کە دەبوو بە هۆی خەسار نەبوونی تەقەمەنی و باسی ئەنگێوەیی کوردانیان لە پێنسەد گەزی ویۆەترەوە لە زمانان نەدەکەوت کە بەم تفەنگە برنوە کۆنانەی شا وێیدابوون, نیشانەیان دەپێکا. یەکێك لە پەروەردەکارانی پێشووی ئیسرائیل بە تاریف و سەرسوڕمانەوە دەیگوت: "هەرکامێکیان تیرهاوێژێکی هەڵبژاردەی سیرەڕاستن؛ ئەنگێوەترین تیرهاوێژانێکن کە هەتا ئێستا دیومن." ئیسرائیلییەکان و دیترانیش بە چاوی ڕێز و حورمەتەوە دەیانڕوانییە ئەم کردەی کوردان کە برینداره‌کانیان هەرچۆنێك با لە مەیدانی شەڕ بەجێ‌نەدەهێشت و دەربازیان دەکردن. کوردان قسەی خۆشیان بە قسەی خۆش وڵام دەدایەوە و دەیانگوت: "خودا جوولەکەی بۆ شەڕ ساز کردوون!"

ڕێنوێنی ئیسرائیلییەکان یارمەتی مەشهوورترین سەرکەوتنی کوردانی دا لە دەیەی ١٩٦٠دا: تێداچوونی سەرلەبەری تیپێکی ئێراق لە چیای هەندرێن، لە نیزیك ڕەواندز, لە ١٢ مەی ١٩٦٦دا. هەڵمەتی هەندرێن هەر لە بنەڕەتەوە شانۆ و خۆنواندنێك بوو لە لایەن کوردانەوە بە سەرۆکایەتی ئیدریس، کوڕی بارزانی و جێگرەکەی لەم شەڕەدا فاخر مێرگەسووری،[1] کە یەکێك لە کۆنە خەباتکارانی بەئەزموون بوو. ئەفسەرانی کومۆنیست و سەر بە تاقمە چەپەکان کە لە سپای ئێراقەوە ڕایانکردبوو لەم تێکهەڵچوونەدا بەگەرمە یاریدەیان دا. ڕێژەی ئەم کەسانەی کە ئەم سەرکەوتنە دەدەنە

١– زۆر دواتر دەزگای پاراستن مێرگەسووری و خاوخێزانی بە تاوانی خەیانەت ئیعدام کرد، بەڵام ئەم تاوانەی لە بابەت خەیانەتەوە هاتەگۆڕ شیاوی سەلماندن نەبوو.

پاڵ خۆیان بە ڕادەیەکە کە مرۆڤ ئەفسانە و ڕاستەقینەی بۆ لێك جیا ناکرێتەوە. لە ڕاستیدا تەنانەت لە نێو کارگێڕانی مووسادیشدا سەبارەت بە گرینگایەتی دەور و بەشداری ئیسرائیل، بەتایبەت دەوری سەرهەنگ "تیسووری ساگۆیی" دمەتەقەیە. ساگۆیی کە بە شێوەی غەیرەڕەسمی وەك سەرۆکی بارگای سەرکردایەتی هێزی پێشمەرگە چالاکی دەنواند، بە گوێ ڕاگرتن لە پەیامە ڕادیۆیی‌یەکانی سپای ئێراق بەم ئاکامە گەیشت کە ئەفسەرانی تۆپخانەی سپا لەمەڕ دامەزرانی مەتەریزی پێشەوەی ئاگربارەکانەوە ڕاپۆرتی چەواشەیان داوەتەوە سەرکردایەتی خۆیان. ئەو هەلومەرجی ناوچەکەی هەڵسەنگاند و لە تاران و ئیسرائیل کوردانی بە گوێرەی ئەم ڕاپۆراتانە ڕاهێنا. داکۆکی زیاتر هەر لەسەر ئەم مەبەستانە بوو کە کوردان خۆیان پێشتر دەیانزانی: لە مەتەریزان وەدەرمەکەون و خۆتان بە فڕۆکە و تیپەکانی زرێداری ئێراق نیشان مەدەن؛ مەتەریز و شووران ساز مەکەن، چونکە وەبەرچاو هاتنیان لە ئاسمانەوە زۆر بە سانییە؛ بۆ حەشاردان و حەشارگە هەڵگرتن لە داروبار و ڕەوەز و هەڵەتان کەلك وەربگرن.

کاتێك هێزە زۆر و زەوەندەکانی ئێراقی کەژ و کۆی دەورووبەری ڕەواندزیان یەك لە دوای یەك داگیر کرد، بێشك بارزانی و ئیسرائیلییەکان تەواو دڵپەرێش بوون. بارزانی دەیزانی کە هێزەکانی خاوەنی چەکوچۆڵ و تەکووز و ڕێکخستنێکی پێویست نین کە بۆ شەڕێکی ڕێكوپێك و قەراروبڕی لەسەر کراو هەوێنی ژیان و مانە. ئەو لە قۆناخێکی ناسکدا ناچار بوو دەستووری پاشەکشە بداتە یەکێك لە سەرکردە چاوناسەکانی کە لێی سوور بوو تاقمەکەی بەری هەر هێرشێکی ئێراقی دەگرن و دەروەستیان دێن. دەستووری کشانەوەی دا کە دوژمن بخانە بۆ سەوە — بۆسەیەکی کە چیرۆکی ئازایەتی و نەبەزینی لێ‌کەوتەوە. کوردان — کە تەنیا بریتی بوون لە پەلێك پێشمەرگەی ئەنگێوە و دوو پەلی پشتیوان — هەر بە تفەنگی ڕووت و چەند خۆمپارەهاوێژان دەستیان دایە شەڕ و ئێراقییەکان بێ‌پشوو لە داوێنان وەسەر دەکەوتن. نیزیکەی دوو هەزار گەزێك کە لە چیا سەرکەوتن، کوردان لە دوو لاوە وەبەر دەسرێژیان دان و تیپی چواری لەشکری دووی ئێراقی بە خۆی و ١٨٠٠ کەسەوە لە

ماوەی سێ کاتەژمێراندا لەتوپەت کرا. کوردان لەم تەقە و لێکدانەدا — کە وێنامی پێی دەڵێن شەڕی "دەستەویەخە"، یانی وەها نیزیك بوونەوە لە دوژمن کە تۆپخانە و فڕۆکە لە ترسی گیانی هێزەکانی خۆیی لە فڕە بکەون — چازان و وەستا بوون. لەم شەڕ و لێکدانەدا کەمتر لە ٢٠ کورد کوژران، کوژراوی ئێراقییەکان بە گوێرەی ڕاپۆرتی سەرکردەی ئەوان هێزان کە پاش تێکهەڵچوونەکە دایە فەرماندەرانی باڵادەستی تەنیا ئی لەشکرێك ١٢٠٠ کەس بوو. ئەم تاقمەیان لە شارۆچکەی دیانا، لەوان نیزیکان ناشت و لە بری کێل یەکی قودوولەیەکی "سوێن‌ئاپ"یان لە لای سەرینێ چەقاندن. ئێراقییەکان لە ماوەی دە ڕۆژ شەڕ و پێکدادانا لە لای ڕەواندز، بێجگە لە کوژراوی جاشان، لانی کەم ٢٠٠٠ کەسیان لێ‌کوژرا.

بەر لە دەسپێکی شەڕ، بارزانی گەلێك دڵپەرۆشی کوژران و زامار بوونی بەرچاوی پێشمەرگە بوو لە شەڕێك‌دا کە دەبوایە زەبر وەشاندنی پارتیزانی و چالاکی ڕێك‌وپێك و خاوەن تەکووز تێکەڵ کرابان — ماوەیەکی کێشا هەتا سەرەنجام بۆ ئەم کارە ملی دا و پێیان سەلماند. کاتێك هەواڵی شەڕەکەی پێگەیشتەوە زۆر پەرێش بوو؛ ساگۆیی کە لەم دژکردەوە سەری سوڕما، بارزانی پێی‌گوت: "سی چل کەس کوژراو ... ئەمە شتێکە پیاو بۆی دەسەلمێ ... بەڵام سێ هەزار کوژراو ... وەیش! من ئیدی تازە حازر نیم ڕوو بکەم جەیشی ئێراق!" ساگۆیی لە خۆوە سەبارەت بەم وتەیە نارەزامەندی دەربڕی و گوتی ئێراقییەکان حەقی خۆیان بوو ئەوهایان بەسەر بێ، چونکە ئەوان دەستیان دابوویە پەلامار. کاتێك نێردراوەکانی ئێراقی بە سواری دوو ئوتۆمبیلی جیپ و بە ئالای سپییەوە گەیشتنە جێ و داخوازی دیداری بارزانییان کرد، ساگۆیی گوتی: جا ئەگەر بێتوو ئێستا پێنج تیپەکەی تریش لەت‌وکوت کرێن هەلومەرجیان لەمەش باشتر دەبێ. بارزانی فکرەکەی لێ قبووڵ نەکرد و گوتی: "ببوورن، بەڵام من تەمەنێکە چاوەڕوانم کە ئەمانە وەسەر لوتف بێن و وت‌وویژم لەگەڵدا بکەن." لە تلاویو کاتێك ئەفسەرانی باڵادەست گوێبیستی ڕادەی کوژراوی ئێراقییەکان بوون، بە دوودڵی لە مەبەستەکەیان ڕوانی. ژێنێراڵ ئاهارون یاریڤ سەرۆکی دەزگای زانیاری سپا، گوتی: "شتی وا نابێ ... ئەمە شەڕیکی پارتیزانییە ... ئەوە باسی چ دەکەن؟"

سەركەوتنی چیای هەندرێن وای لە دەوڵەتی ئێراق كرد كە لە شەشی ژوەندا ئاگربەس ڕابگەیەنێ — ئەم ئاگربڕە دوو ساڵی خۆ ڕاگرت.

ئیسرائیلییەكان لەم سەرمایە نانەوەی كە لە كوردستان كردبوویان قازانجێكی چاكیان وە دەس هێنا. كوردان لە گەڕیانی بە هەڵاتن دانی فڕۆكەوانێكی مەسیحیدا بە ناوی "مونیر ڕێدفە", لە چالاكییەكی زۆر پێچاوپێچدا یارمەتی مووسادیان دا. ئەم فڕۆكەوانە لە ١٥ی ئووتی ١٩٦٦دا فڕۆكەی زۆر پێشكەوتە و پڕ وردەكاری میگی ٢١ی خۆی بردە ئیسرائیل. پیاوەكانی مووساد بنەماڵەی ڕێدفەیان بە بیانووی گەشت و سەیران لە بەغداوە ناردە كوردستان و كوردان زۆر بە سانی لە سنووری ئێرانیان پەڕاندنەوە. ئیسرائیل میلیۆنێك دۆلاری دایە ئەم فڕۆكەوانە و خۆی و بنەماڵەكەی بە پەنابەری سیاسی وەرگرتن. لە ڕوانگەی ئیسرائیلەوە ئەمە پووڵێك بوو كە زۆر بە ڕێوجێ خەرج كرابوو و ئەمریكایییەكان كە بەم ڕووداوە گوڵیان كردبوو, داوایان لێ كرا بچن و فڕۆكەی دەسكاری سۆڤیەت ببینن و كار و پشكنینی خۆیانی لەسەر بكەن. مووساد ئێستا نوقمی شانازی ئەم گەڕیان و ڕووداوە بوو و ناوبانگی لە واشینگتۆن پتر پێهەڵادەچوو.

كوردان لە چالاكییەكیشدا كە ئیسرائیلی زۆری تامەزرۆ بوون چازان بوون و ئەویش دەربازكردن و بە هەڵاتن دانی پاشماوەی كۆمەڵی ئەم جوولەكانە بوو كە ڕێژەی نفووسیان بەر لە كۆچی قانوونی ساڵی ١٩٥٠ پتر لە سەدهەزار كەس دەبوو. كوردان بە باشترین شێوە كیسیان لە هاوینی ١٩٧٠ و ١٩٧١ هێنا و بەهرەیان لە ئاگربڕەكەی دوابەدوای وەرگرت؛ كوردان بە ئوتۆمبیل جووەكانیان بردە باكوور. (لەبەر هەڵنەتەزاندنەوەی ئێراقییەكان كات و ساتی ئەم كۆچە وەها ڕێكخرابوو كە لەگەڵ دەركەوتنی خەڵكی شار و چوونە هاوینەهەواران هاوكات بێ.) جا بەڵێ, لە باكوورەوە ئەوانیان ناردە ئێران و لەوێوە چوونە ئیسرائیل. كاربەدەستانی ئێراقی لە هیچ شوێنێك خۆیان لە كەس هەڵنەقوتاند و بەری هیچ ئوتۆمبیلێكیان نەگرت. كۆمەڵی ئەم كۆچەرانە بە ڕادەیەك زۆر بوو (نیزیك ٣٠٠٠ كەسێك) كە مووساد گەیشتە ئەم ئاكامە كە دەوڵەتی ئێراق بە پێی بەڵگە و بۆنەی تایبەتی خۆی ڕەوتەكە دەخاتە پشت

گوێی. لێپرسراوانی مووساد لایان وابوو کە هەر ئەم چالاکی قوتار کردنی جوولەکانە بۆخۆی، بەتایبەتی تێکەڵاوی و نێوانخۆشیی چڕ و پڕی کوردان و ئیسرائیلییانی وەك مەبەستێکی بەجێ دەنوانـد و نـشانی دەدا کـە بـایی زەحـمەتەکەی دەبـوو. لەسـەر سەلـماندنی شا, ئیسرائیلییەکان هەروەها لـە گەڵاڵـە کردنی هەڵمەتی مارسی ١٩٦٩، یانی پەلاماردانی سازکراوەکانی نەوتی کەرکووك کە ئـەو دەم لـە سـەتا ٧٥ی نـەوتی ئێراقی بەرهەم دێنا, یارمەتی کوردانی دا. مەبەست لەم پەلامارە ئەمە بوو کە بە دنیـای دەرەوە نیشان بدرێ کە پێشمەرگەی بارزانی دەتوانن ئابووری ئێـراق لـە پـێ بـخەن. وێنە ڕەش و سپییەکانی لەواکۆف دوو تاقمی دەمامکداری پیادە نیـشان دەدەن کـە بـە خۆیان و چوار یەستر بە باری خۆمپارەهاوێژ و تفەنگی بێپاشەکشەوە بەرەو شوێنی زەبر وەشاندن کەوتوونە ڕێ. سەرکردەی ئەم چالاکییە سـامی عەبدوڕڕەحـمان بـوو، کـە ئەنـدازیارێك بـوو لـە ئینگلـستان دەورەی دیبـوو و ئـەوان سـەردەمان یـەکێك لـە ئەستێرەکانی بەختی ئاسـمانی کوردان بوو. ئەم پەلامارە کە تێیدا خەزێنـەکانی گـازی سروشتی و هێندێك لە دامەزراوەکان تووشی خەسار هـاتن، ئـەم هەسـتی مەترسـییەی مەبەستی کوردان بـوو پێکیهێنـا، بـەڵام ئەوەنـدەی ئیسرائیلی چـاوەڕاونییان دەکـرد سەرکەوتوو نەبوو. لەواکۆف بە ڕاوێژێکی پڕ سـووکایەتی لـووتی هەڵپێـچا و گـوتی: "چاکتر لە کڵ دەردەچوو ئەگەر کوردان بەشێکیان لە تەقەمەنییەکە بۆخۆیان پاشقـول نەدابا."

ئەگەرچی پەیوەندی نێوان کورد و ئیسرائیلییان نێوانێکی چڕ و پـڕ نـەبوو،لقوپۆپی تریشی هەبوو کە کەمتر وەبەر چاو دەهات، یـەکێك لـەم مەبەسـتە تایبەتییانـە بـرەوی دەسەڵاتی مووساد بوو. مووساد بەوە دەنازی کە ئێراقییەکانی وەهـا پـەرۆش و پـەرێش کردووە کە لە بابەت هەنتەشی کارگێڕانی لە کوردسـتانا زۆری فـوو لـێ دەکـەن و تێشکان و سەرنەکەوتوویی لەشـکریی خۆیـان دەدنـە پـاڵ هەنتەشـی هـەزار کەسـێك ئیسرائیلی لە کوردستان. ئەمریکاش سەبارەت بە چالاکی مووساد لە کوردستاندا کـە ببوو بە هۆی شێوان و ئاژاوەی نێوخۆی ئێراق دڵپەرۆش بوو. واشینگتۆن پێیخۆش بوو لەم دە ساڵەدا کە پاش ڕووخانی خانەدانی هاشـمی بەسەردا هات, پشتیوانی بکـا لـەم

دەوڵەتانەی بە دوای یەکا دەهاتنە سەر دەسەلاّت و لـە سـەرەتای سـالاّنی داگیرسـانی پێوەندی نێوان کوردان و ئیسرائیلییان، بە بارزانی دەگوت "مەلای سوور" و تەواو سەر بە مەسکەوی دەزانی, ئەویش لەبەر وەی کـە ماوەیـەکی زۆر لـە سـۆڤیەت مـابۆوە و جاروبارە کە دەوڵەتی ئێراق ئیزنـی سـەفەری دەدایـە دیپلۆماتـەکانی سـۆڤیەت بـەرەو باکووری ولاّت، رێی‌دەدان و چـاوی پێیـان دەکـەوت؛[1] ئیـدی ئەمریکایی‌یـەکان سەرنـجیان نەدەدایـە ئـەم مەبەسـتە کـە بـارزانی لـە مـاوەی مانـەوەی لـە سـۆڤیەتا بێ‌باوەڕێکی قووڵی سـەبارەت بـە کومـۆنیزم و کومۆنیـست کەوتۆتـە مێـشك و وەك سەرۆك عەشیرەتێك دژ بە بیر وباوەڕێك بوو کەوا کـەوتبووە بـەر سرنـجی کـوردانی شارەکی و خاوەن دەسەلاّتی پارتی دێموکراتی کوردستان. بەلاّم مووساد کەیف‌ساز بوو کە ئەمریکایی‌یەکان چالاکی و هەڵسووڕانی ئەوانیان لـە کوردسـتانا بەگەرمـە هاتۆتـە بەرچاو و زەختیان دەخستە سەر دەوڵەتی ئیسرائیل کە واز لە یارمـەتی کـوردان بێنـێ. یەکێك لە بالاّدەستانی مووساد لە بیر هێنانەوەی بیرەوەرییەکانی ڕابردوودا گوتی: "ئەو کات لای خۆمان وامان دانا کە بەڵێ, ئێمە بۆ ئەوان کۆسپێکین. ئەمـەش بـەم واتایەیـە کە وەکوو بایەخێکی سەرودڵگر واین. ساز کردنی تەنگ و چـەڵەمە و درێـژە پێـدانی تەنگەژەی نێوان ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ولاّتانی عەرەبی ئامانـجی بـەرز و دڵخوازی مووساد بوو. بەر لەوەی کە تلاویو ڕاهاتوویی و لێزانینێکی زیاتر لـە بابـەت دەس ئەنگاوتن لە سیاسەتی ئەمریکادا وە دەس بێنێ, ئەم شتانە هۆی دڵخۆشی ئیسرائیل بوون.

لە ڕاستیدا ئیـسرائیل لـە بابـەت وەدی هێنـانی مەبەسـتی بـارزانی واتـە دەس وە ئەمریکا ڕاگەیشتنی بـەرەورووی گـەلێك دژواری بـۆوە و بـە لای بارزانیـشەوە دەس وێڕاگەیشتن وە کاربەدەستان و سیاسەتگێڕانی ئەمریکا هەمیشە سەرەتی یەکەم بوو. لـە

١- یەکێك لەم دیدارکەرانە یوگێنی پریـماکۆف بوو کە لەسەر شکڵی هەواڵنێران کاری دەکرد و بنکەی لـە بەغدا بوو. ئەم کەسە لەوپەڕی تووڕەیی و ناڕەزامەندی دەوڵەتی بووشا لە ١٩٩١، لە هەوڵێکی ١١ سەعاتەدا کۆششی کرد قەناعەت بە سەددام حوسێن بێنێ کە کووەیت چۆل بکا ... پریـماکۆف لە حکوومەتی ڕووسیەی پاش سۆڤیەتا بالاّترین پلەی لە دەزگای زانیاریدا وە دەس هێنا و لە ١٩٩٦ بوو بە وەزیری دەرەوە.

ساڵی **١٩٦٣**دا برایم ئەحمەد، لە خۆوە و بە بێ هیچ سەرەدا خۆشکردنێك داوای ڤیزای چوونە ئەمریکای کرد و داخوازەکەی بە ڕووساردی و لا لێنەکرانەوە برایەوە پاش. پێیگوترا کە واشینگتۆن هیوادارە بتوانێ نێوانی نێوانی ئێران و ئێراق خۆش کاتەوە و وەرگرتنی نێردراوێکی بارزانی لە وەها هەلومەرجێکا وەك کردەیەکی دوژمنانە خۆ دەنوێنێ. بەڵام بارزانی هیوادار بوو کە ئیسرائیل لەم بوارەدا یاریدەی بدا. ئیسرائیلییەکان هەوڵیان دا، بەڵام سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان وە دەس نەهێنا. عیسمەت شەریف وانلی کە کوردێکی لە دایك بووی سووریایە و ئەو کات لە ئورووپا کاری بۆ بارزانی دەکرد، لە **١٩٦٤**دا سەردانی ئیسرائیلی کرد. ئەمە زەمانێك بوو کە برایم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی و ئەندامانی تری پارتی دێموکراتی کوردستان پاشی گێرە وکێشەیەکی توند و تیژ لە بارزانی هەڵبڕابوون. عیسمەت شەریف وانلی چاوی کەوت بە "یاکۆف هێزۆك" بەڕێوەبەری گشتیی وەزارەتی دەرەوە, "شیمۆن پرێز" جێگری هەمیشەیی سەرۆك وەزیر و خودی سەرۆك وەزیر "لووی ئیشکول" و لە کاتێکا برووسکەی شادی لە چاوانیڕا دەتروووسکانەوە لەم کۆ بوونەوانە هاتەدەر. گوتی: "ئەم باڵادەستانەی لە ئیسرائیل چاوم پێیان کەوت گوتیان کە کوردستان بەرەو سەربەستی داژوێ. من لێم سوور بۆوە کە ئیسرائیل سەبارەت بە کوردان بڕوای باشە و لەگەڵیان هەست بە هاودەردی دەکا."

وانلی دەڵێ: "بارزانی دڵی خۆش بوو و دڵنیا بوو کە وا ئێستا هاوکاری ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەبەر دەستانە." تا ئەم ڕادەیە ئیمان و بڕوای بە زیرەکی و کارتێکردنی ئیسرائیل هەبوو. بۆ ساڵی دواتر وانلی پەیوەندی کرد بە باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەوێوە نێوانی لەگەڵ دامەزراوەیەکی پێوەندی گشتیی لە شەقامی مادیسۆن کە نێوانی لەتەك ئیسرائیلا خۆش بوو، بۆ داگیرساند. ئەو لە واشینگتۆن لە "مەکۆی بلاڤۆکانی نەتەوەیی" وتاری دا و چاوی بە هەندێك لە ئەندامانی مەجلیسی پیران کەوت. وانلی دەڵێ: "هەر خێرایەکی تێگەیشتم کە ئیسرائیلییەکان نەیانتوانیوە ئەمریکاییەکان ڕازی بکەن و ئەمریکاییەکانیش پێیانخۆش نەبوو خۆ تێوەدەن." قازی ویلیام ئوو.دوگلاس, کە لە ڕابردوودا بە باری

چاکا لەسەر کوردانی نووسیبوو, ملی نەدا بۆ چاوپێکەوتنی. وانلی دەڵێ: "لە هەموو شوێنێك بە رووساردی وەرگیرام. هەڵکەوتێك رووی نەدا." کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە دیداریان لەگەڵ نەکرد، بەڵام کۆبوونەوەیەکیان پێکهێنا کە تێیدا لە بۆ کارناسان بێتە ئاخافتن. (ئەمە تەگبیرێك بوو کە وەزارەتی دەرەوە لە ماوەی سێ دەیەی پاش ئەوا گەلێك جار و بە باشی بەهرەی لێوەرگرت.)

کاتێك وانلی راپۆرتی رەوتی رووداوەکانی هەناردەوە "بارزانی سەری سورما و بە خۆیا شکایەوە." بەڵام هەتا پشتبەردانی لە ۱۹۷۵دا قەت ئیمان و بڕوای سەبارەت بە توانایی ئیسرائیل لە بابەت شوێن دانانی لەسەر ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دەس نەدا. بارزانی هەمیشە تکای لە راوێژکارانی مووساد ئەمە بوو: "هەر لە بن گوێی سەرکۆماری ئەمریکا سرتوخورتێك بکەن بەسە." لە گەریانی دوایین دیدار لەم گشتە سەردانەی بۆ ئیسرائیل کە تێیدا چاوی کەوت بە هەموو وەزیران و سەرکردەکانی سپا، پێشنیاری بە شیمۆن پرێز کرد کە ئەگەر دەوڵەتی سووریا برووخێنێ, کوردانیش دەوڵەتی ئێراق دەرمێنن. کاتێك ئیسرائیلییەکان پەیمانی دۆستایەتی سۆڤیەتیان بیر هێنایەوە و ئەم پێشنیارەیان بردەوە پاش، بارزانی وڵامی داوە: "ئێوە دۆگۆڵ و نیکسۆنتان لە کار لادا. ئیتر ناتوانن من فریو دەن." هیچ شتێك ئەم خەیاڵاتەی لە زەینی نەدەبردە دەر.

لە ۱۹۷۲دا بەخت رووی کردە بارزانی، یانی بۆخۆی وای زانی. خاتوو "گوڵدا مایەر", سەرۆكوەزیری ئیسرائیل لە تاران بوو و داوای یارمەتی زیاتری دەکرد بۆ کوردان. ئەمە مانگێك بەر لە دیداری شا لەگەڵ نیکسۆن و کیسینجێر بوو کە تێیدا شا بڕوای بە نیکسۆن و کیسینجێر هێنا کە ئەم سیاسەتەی ئەمریکا لە بابەت خۆتێوەرنەدانی لە کێشەی کوردان وەلا بنێن. کیمچە, سەرۆکی مووساد ئەم ئاڵوگۆڕەی لە چاوی خۆیان دەزانی و پێی وابوو ئیسرائیل دەوری کاریگەری گێراوە. بەڵام ئەم گۆڕانی هەڵوێست و سیاسەتەی واشینگتۆن تەنیا لەبەر دڵی خودی شا بوو کە سەبارەت بە پێهەڵاچوونی ناردنی چەك بۆ ئێراق، بە گوێرەی پەیمانی دۆستایەتی ئێراق و سۆڤیەت دڵپەرۆش بوو (و ئەم یارمەتییە سەربازییە گرینگانەش کە ئیسرائیل و

ئێران بە بارزانییان کردبوو خۆی ڕەنگدانەوەی ئەم دڵپەرۆشییە بوو.) جا سەیر ئەوەیە سەرەڕای زۆر بوونی بەرچاوی یارمەتییەکانی سەربازیی ئیسرائیل بۆ کوردان لەو هاوینەدا، چاوەدێری تازەی ئەمریکا و پشتیوانی ئاشکرای ئێران بۆ وان ئێستا بە زەرەدی برەوی دەسەڵاتی ئیسرائیل شکایەوە.

کار و گەڵاڵەی یارمەتییە غەیرەنیزامییەکانی ئیسرائیل هەروا درێژەی کێشا و بارزانی زۆرتر لەگەڵ ئەفسەرانی سپای ئیسرائیل لە تاران ڕاوێژی دەکرد. لە مەودای شەڕی ١٩٧٣ی عەرەب و ئیسرائیلییاندا دەنگۆی وتوویژی تەکولۆ سەبارەت بە کرانەوەی بەرەیەکی دووهەم لە لایەن کوردانەوە بە مەبەستی بەرپەرچ دانەوە و ڕێگرتنی ئێراق لە ناردنی هێزی یارمەتیدەر بۆ وڵاتی سووریا لە بەرزاییەکانی گولان بەرگوێ دەکەوت. تا ئەمڕۆ ڕوون نەبۆتەوە کە داخوا ئەم بیرە لە لایەن کوردانەوە دەربرابوو یا لە ئالی ئیسرائیلییانەوە, کە پتر ئەمەیان وێدەچێ. یەکێك لە یاریدەدەرانی باڵادەستی بارزانی بە لێبڕاوی گوتی ئەوە ئیسرائیل بوو کە داوای لە کوردان کرد بە کردنەوەی بەرەیەکی ئەوتۆ "ئێراق بخەنە تەنگەژە، بەڵام بارزانی لەگەڵ ئەم پێشنیارە هاودەنگ نەبوو." بەتایبەت پاش ئەمەی کە ئەمریکاییەکان ڕایانسپارد کە لەم کارە خۆ بپارێزێ.

بارزانی پتر ئەمریکای بە هێند دەگرت هەتا ئیسرائیل "ڕاپۆرتی پایك" دەڵێ ئەم ڕاسپاردەیە خودی کیسینجێر کردی کە ئەو کات وەزیری دەرەوە بوو. کیسینجێر لە بیرەوەرییەکانیدا گەڕیانەکە بە دوو شێوە دەگێڕێتەوە: بە خۆی دەنازێ کە نەیهێشتووە بەرەی دووهەم بکرێتەوە و ئەمجاریش بایەخی پێوەندی لەگەڵ کوردان زەمانێك ڕوون بۆوە کە تەنیا لەشکرێکی ئێراق — بۆ بەشداری — لە شەڕا بە دەستەوە بوو." پازدە ساڵ دواتر دەڵێ بۆیە دژی پێشنیاری ئیسرائیلییەکان ڕاوەستا چونکە دەترسا بێتوو کوردانی سووکەڵەچەك لە چیا دابڕێن — لە ژێر زنجیری هێزەکانی زرێداری ئێراقا — بپلیشێنەوە." جا هەر لە ترسی داهاتووی ئیشەکە, پاش کۆتایی هاتنی شەڕی "یوم‌کیپوور"، پێی‌خۆش نەبوو یارمەتی بۆ بارزانی پێهەڵابەرێ, چونکە ئەم کارە — کردنەوەی بەرەی دووهەم — پێویستیی بە پەلامارێکی بەربڵاو بوو. سەرچاوەکانی

دەزگای زانیاری ئیسرائیلیش بە پێی بەڵگە و سەنەدی تایبەتی خۆیان داکۆکی دەکەن لەسەر ئەم مەبەستە کە ئەم پێشنیارە لە لایەن خودی کوردانەوە کراوە و بۆیە ئیسرائیلییەکان پێی ڕازی نەبوون، چونکە نەیاندەتوانی پاشان بەری تۆڵە ئەستاندنەوەی ئێراقیان بۆ بگرن و باڵیان بەسەر بکێشن.

ڕەنگە هۆی یەکتر نەخوێندنەوەی ئەم وتانەمان لە داخ و مخابەتێکڕا بۆ دەرکەوێ کە کیسینجێر لە "تلاویو" وە دەستی هێنا: "ئیسرائیلییەکانی تلاویو لە مەبەستم حاڵی بوون." بەڵام ئەم ئیسرائیلییانەی لە شانۆدا – یانی لە کوردستان – بوون هاودەنگی ئەم گەلاڵەیە بوون. هەرچونێك بێ هیچ کارێك نەکرا و هێزەکانی ئێراق کە بریتی بوون لە ٣٠٠٠٠ سەرباز و ٦٠ فڕۆکە و ٤٠٠ تانك نێردرانە بەرزاییەکانی گۆلان. سەددام حوسێن ئەوەندە لەم بابەتەوە نیگەران بوو کە لە پێشا بەڵێنی لە شا وەرگرت دەرفەت لەم هەلومەرجە نەهێنێ. شا ئەو کاتە گوتبووی: "من هیچ پێم خۆش نیە کە کوردان مۆرکی بەکرێگیراوی ئەمریکا و ئیسرائیلییان لێبدرێ." بەڵام لەگەڵ تەواوی ئەمانەشدا، لە بەرامبەر متەق نەکردنی سەبارەت بە ناردنی هێزی ئێراق بۆ سووریا، نوێ کرانەوەی پێوەندی سیاسی بە سەر سەددام حوسێنا داسەپاند. ئێراقییەکان ١٢٥ سەرباز و ٢١ فڕۆکە و ١٨٠ تانکیان لە گۆلان تێداچوو.

پاشی شەڕ، ئیسرائیل گەلێکی چەكوچۆڵی ڕووسی بۆ کوردان هەنارد: تۆپخانە، مووشەكهاوێژی دژی ئاسمانیی ئیستڕێلا کە لەسەر شانان هەڵدەگیران و شتێکی ئەوتۆ نەبوون و چەکی دژی تانکی ئیستاگێر.

بەڵام کاتێك شەڕ و هەڵاڵای نێوان کوردان و ئێراقییەکان لە ١٩٧٤دا دەستی پێکردەوە, مووساد لەوپەڕی نارەحەتیدا لێی حاڵی بوو کە ئیتر ئێستا بۆتە شوێنکەوتەی شا و ئەمریکا. ئێران بۆ باڵگرتنی کوردان کە کەوتبوونە تەنگەژە، پۆلێك ئاگرباری ١٢٠ میلیمیتری دەسکاری سۆڤیەت و پۆلێك ئاگرباری ١٣٠ میلیمیتری تری ناردە نێو خاکی ئێراق – ئاگرباری تریش دواتر بە شوێن ئەمانەدا هاتن و هەروەها مووشەكهاوێژەکانی "ڕاپیەر"ی ئینگلیسی لەسەر سنوور دامەزران. بەڵام یەکێتی سۆڤیەت ئێراقی بە چەكوچۆڵی پتر و پێشکەوتەتر تەیار کردبوو, لە باڵەفڕەوە

بگرە هەتا فڕۆکە و تانـک. هێـزە زرێـدارەکانی ئێراقـی هـەر خێرایـەکی و بێپـسانەوە کوردانیان لـە دەشتەکانی هەولێرەوە بـەرەو مەتـەریزەکانی کێـو و کێوپـاران ڕامـاڵی. کاتێك کوردان ئەم پردە گرینگەیان تەقاندەوە کە ڕێی دەبردەوە سەر دەرەی سەخت و دژواری "گەڵی عەلیبەگ"، ئەندازیارانی ئێراقی بە بۆلـدزێر چیایان دابڕی و ڕێیـان بـۆ تانکان کردەوە و لـقێك تانکی تەیارکراو بە لێواری داوێنی چیای هورەكدا بــــــەرەو دەشتەکانی دەوروبـەری دیانـا و ئـەولاتری ئاژاوتیـان و چـوونە پـێش.[1] زوی زەمـیر, سەرۆکی مووساد کە کوردستانی بـە وردی دەناسـی, سـەرلـەنوێ سـاگۆیی نـاردەوە, کاتێك ساگۆیی گەیشتە جێ سەری سوڕما وەختایەك دیتی بارزانی و کوڕەکانی ئاگایان لـــە جمەوجـــۆڵی هێزەکـــانی ئێراقـــی نیـــە، ســـاگۆیی دەڵـــێ: "دەســـەڵاتی ڕاگرتنـــی بارودۆخەکەیان بە دەستەوە نەمابوو."

لە کۆبوونەوەیەكدا کە لـەتـەك فەرمانـدەرانی کـورد لــە ئەشـکەوتی زوزیـك لــە دەرەوەی ڕەواندز پێکیهێنا داکـۆکی کـرد کـە بـارودۆخ بـە بـاری تاکتیکیـدا زۆر پڕمەترسییە. سەرەڕای تەواوی ئەمانە ساگۆیی دەستی کرد بە دامەزراندنی بۆسەی تەیار بە چەکی دژی تانکی "ئێستاگێر" و "تۆپی ١٠٦ی بێ پاشەکـشە". ئیـسرائیلییەکان بـە سەرنجدان بەم مەبەستە کە ئێراقییەکان قەت لـە ڕێوبان کلا نەدەبوون و زۆر لـە ژێـر باڵی پـشتیوانی تۆپخانـە دوور نەدەکەوتنـەوە, بۆسـەیەکیان دانایـەوە کـە لـە مـاوەی نیوسەعاتێکا سەت تانکی ئێراقیان تەفروتونا کـرد. بۆسـەکانی تـر خەسـاری قورسـتری لـێدان، بەڵام ئەمـجار ئێراقییەکان بە بێ گوێدانە خەسار هەروا بەرەوپێش دەئـاژوان. بە قوونەشەڕ لـە زوزیك هەڵدەکشان و ئەم کێـوە چـەند جـاران دەستاودەسـتی کـرد. لـەگەڵ بارینی بەفر شەڕەکان لـە گەرمە کەوتن، بەڵام نەبڕانەوە. ئێراقییەکان بۆ یەکـەم جار لـە شەڕ لـەتەك کوردانا توانیان زستانێ لـە کوێستانان درێژە بە شەڕ بدەن. ساگۆیی

---

[1] – دیاردەگەلێك وەك نیشانەی خەیانەت لـە ڕیزی پێشمەرگەدا خۆی دەنواند: هێزی زرێداری ئێراق لـە کات و شوێنی "مناسب"دا لـە چیا دابەزین و ئەم پێشڕەوییە دروست وەختایەك بوو کە هێزەکانی پێشمەرگە بە شێوەیەکی گومان لـێکراو کشابوونەوە. هۆی پاشەکشە دەمەقڕەیەك بوو کە لـە نێو خۆیانا هەڵگیرسابوو, دیـار نـەبوو بـە ئانقەستە یان نا. تێکرا بۆ چارەسەری ئەم ناکۆکییە گەڕابوونەوە ناوەندی سەرکردایەتی خۆیان.

کە زۆر لەم بابەتەوە دڵپەرۆش بوو گەڕاوە ئیسرائیل هەتا ڕێچارەیەك بۆ ئەم کارە بدۆزێتەوە.

هێشتا خەریکی دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ ئەم تەنگەژە و دارشتنی گەڵاڵەی بەربەرەکانی و بەرپەرچ دانەوە بوو کە لە شەشی مارسا ڕێککەوتنی ئێران و ئێراق لە ئەلجەزیرە ڕاگەیەندرا. لەپڕ دەستوور درا بە تەواوی هێزەکانی تۆپخانە و تۆپی دژی ئاسمانیی ئێران ئاودیوی خاکی خۆیان ببنەوە و ئێراق جێبێڵن. ئەم هێزانە لەبەر چاوی کورد و ئیسرائیلییان کە واق مابوون "ئامراز و کەلوپەلیان تێکەوەپێچا و گەڕانەوە." ئەفسەرانی ئێرانی کە نەیاندەوێرا ڕاستییەکەی بڵێن، ئەم پاشەکشەیان وەك ئاڵوگۆڕی هێزەکان و نۆرە پێکرانیان لە قەڵەم دا. ئەم چەند کەسەی تاقمی مووساد کە هێشتا لە کوردستان بوون بە فەرمانی ساواك بارگە و بنەیان خستە نێو چەن جیپێك و خێرایەکی بۆی قوتار بوون. ئەمە کۆتایییەکی تاڵی ڕەوتی ڕووداوەکان بوو.

لە تاران "ئیوری لوبرانی" باڵوێزی لێوەشاوە و غەیرەڕەسمی ئیسرائیل کە ماوەیەکی زۆر یەکێك لە کارگێڕانی "سیاسەتی لە لاوەی" مووساد بوو لە ئیتیۆپیەڕا بگرە هەتا لوبنان، سەری لە "دڵڕەقی و بێهەست و سۆزی شا" سوڕما. یەکێك لە باڵادەستانی ڕەسمی حکوومەتی شا پێشبڕی و نارەزامەندی ئیسرائیلییانی ڕادایە کەنارێك و ئەوانی سەبارەت "بە تێکەڵ کردنی هەست و سۆز لەگەڵ سیاسەت" سەرکۆنە کرد. ئەم کارەبەدەستە بڕوای وابوو کە "نابێ یارمەتیدانی کەمینەکان بە شێوەیەك بێتە بەرچاو کە ئاخرییەکەی بگەڕێتەوە سەر خۆت، بەڵکوو دەبێ وەك ئامرازێك چاوی لێبکرێ بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی باش لە زۆرینە" و درێژەی دا: "سیاسەتی باش یانی بڕینی یارمەتی لە کاتی خۆیا بۆ وەرگرتنی لانی زۆری ئیمتیاز و ئەمەش هەر هەمان کارە کە شا کردوویەتی." لوبرانی تازە لە هەڵەی ئیسرائیل حاڵی بوو کە وای بیر دەکردەوە دوژمنایەتی لەمێژینەی ئێران و عەرەبان شتێکی خۆڕاگرە و ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایە و ئیزنی ئیسرائیل دەدا کە کوردان بۆ ئەم کارە هان بدا. ئەو بە پەرۆشییەوە تێگەیشت زۆر سەیر نیە هەر کات شا بە قازانج و بەرژەوەندی بزانێ ئیسرائیلیش تووشی وەها چارەنووسێك ببێتەوە.

بەڵام دەڵێ: "قەت دەستوورێکی ئەوتۆیان پێنەدام کە بە مەبەستی لایەنگری لە کوردان شا بدوێنم و تەنانەت سەبارەت بە دانی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بۆ لافاوی ئەم پەناخوازانەی کە ئێستا بەرەو ئێران سەرەولێژ ببوون، متەق بکەم." لە درێژەدا دەڵێ: "ئاشکرایە ئێمە وەك ئەم ئیسرائیلییانەی کە ڕاستەوخۆ کەوتبووینە نێو گەڕیانەکە زۆرمان هەست بە تاوان دەکرد." دەیزانی کە سەدان کورد لە ئێراق کوژراون و هەزاران کەسیان ڕەپێچەکی دەشت و سارای وشك و قاقڕی باشووری ئێراق داوە. چەند ساڵێك دواتر گوتی: "ئەگەر ئیسرائیل لە بری وڵاتێکی ٤/٥ میلیۆن کەسی وڵاتێکی ٢٥ میلیۆنی با، ئەوکات بە شێوەیەکی تر قسەمان کردبوو." لێرەدا بە مست کوتایە سەر مێزەکەی. بەڵام ئەمە قسەیەك بوو کە بۆ دامرکاندنی هەست و دڵدانەوەی خۆی دەریدەبڕی. ئیسرائیل هەر ئیددیعایەکیش کە هەیبوو و لەگەڵ ئەمەشدا کە خۆی بە "چوارەمین هێز و دەسەڵاتی نیزامیی جیهان" دەزانی, قەت لە وڵاتێکی بچووکی ناوچەیی وێوەتر نەبوو و نەیدەتوانی دەسەڵاتێکی سەقامگیری دوورتر لە بنکەی مەدیتەرانەیی خۆی پەرە پێبدا و شا هەر لە سەرەتاوە بۆ ئەم مەبەستە دنەی دا خۆ لە کاروباری کوردستانەوە بگلێنێ: دەیزانی کە ئیسرائیلییەکان بە زۆر باراندا ئەمەگداری ئەون و ناتوانن لەگەڵیا بکەونە دژایەتی.

بۆ ساڵی دواتر, ئەو کاتەی وا لەوبرانی لە دورگەی کیش لەتەك شادا تاق کەوتبۆوە و وردە وردە کەش و هەوای ڕەسمی دیدارەکە دامرکا، لە شای پرسی کە ئەم یەکێتییە "بەکردەوەی" لەگەڵ ئیسرائیل بە چ مەبەستێك درێژە پێدەدا؟ شا گوتی ئیسرائیل وەك ئاسنڕفێنێك وایە کە ناخۆشەویستی و هێزی عەرەبان بۆ لای خۆی دەکێشێ و بەم بارەدا بە قازانجی ئەوە. ئەم کارە هەل بۆ ئێران دەڕەخسێنێ کە بە مەبەستی بەربەرەکانی لەگەڵ عەرەبان و نیزیك کردنەوەی تلاویو لە واشینگتۆن تەیار بێ و ئەمەش خۆی بۆ شی کردنەوەی هەڵوێستی ئێران بۆ ئەمریکایییەکان و تێگەیشتن لە هەڵوێستی خۆیان بەکەلکە. ئەو لە هیچ شوێنێك باسی کوردانی نەکرد کە ئاشکرایە لەم بوارەدا هەل و دەرفەتیان بۆ ڕەخساندبوو.

پایەبەرزانی کورد ئیددیعا دەکەن کە مەکۆی دەوروبەری بارزانی ئاگایان لە دیداری وەزیرانی دەرەوەی ئێران و ئێراق بووە کە لە نێوەراستەکانی ساڵی ١٩٧٤دا توانیان هێندێك گرێ و کۆسپان ڕەها کەن، بەلام دەڵێن قەت پێیان وانەبووە کە ئاوا لەڕێوە دەگەنە سەرەنجام. وێڕای تەواوی ئەمانەش کوردان دەڵێن ئێمە بەتایبەت لە ئیسرائیل تووڕە بووین کە ئاگاداری چاوپێکەوتنی ئەلجەزیرەی نەکردینەوە, چونکە بێ‌گومان مووساد لە پێشا بەم کەینەوبەینەی زانیوە ... ئەمەش هەر ئەم خەیالاتەیە کە لەمەڕ ئیسرائیلییانەوە بوویان و پێیان وابوو لە هەموو شتێك ئاگادارن. بەلام مێژوونووسانی ئیسرائیلی لەگەڵ ئەم بۆچوونە نین و دەڵێن ئیسرائیلییەکانیش دەکرێ وەك هەر کەسانێکی تر "هێڕ" بن. بۆ مەگین هەر خودی ئەم دەوڵەتی ئیسرائیلە نەبوو کە لە ١٩٧٣دا دیاردەگەلی ڕوون و ئاشکرای هەڵگیرسانی شەڕی دەبینی, کەچی لە وەختی هێرشی تێکڕای میسر و سووریادا ئاوەها تێکەوت و خافڵگیر کرا؟

کیمچە حاشا لە هەر چەشنە "وریا کردنەوەیەکی پێشتری" ئیسرائیلی لە لایەن شاوە دەکا؛ بەلام مێژوونووسێکی ئیسرائیلی کە توێژینەوەی لەسەر یەکێتی کورد و ئیسرائیلییان کردووە بە دڕدۆنگی و دووشکییەوە دەڕوانێتە بێ‌تاوانی و بێ‌ئاگایی دەوڵەتی ئیسرائیل. بە ورد بوونەوە لە مەیلی بەردەوامی ئیسرائیل بۆ لاواز بوونی ئێراق, بێتوو شەڕ کۆتایی پێهاتبا، بێ‌گومان ئیسرائیل لەم گێرە و کێشەدا زۆرشتی لە دەس دەدا و لە بەرامبەردا هیچیشی گیر نەدەکەوت، چونکە ئەگەر شەڕ برابایەوە, ئێراق ئازاد دەبوو کە هێزەکانی بۆ بەرەنگاری ئەو بەرەو ڕۆژاوا بخاتە گەڕ. هەر ئەو دەم جۆزێف کرافت، وتارنووسی ئەمریکایی کە لە کیسینجێر نیزیك بوو لە نووسراوەیەکدا هەر ئەم شێوە ڕوانگەیەی دەخستەڕوو: ئەو لەم وتارەدا ڕێککەوتنی ئەلجەزیرەی وەك "زەبرێك لە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا"، گەورە پشتیوانی ئیسرائیل، لە قەڵەم دا.

دواتر ئێوری لوبرانی گوتی: "لێی سوور نیە کە قسەی کوردان دەربارەی گوناهی هاوبەندانی ڕاڕایان کە تاوانی ڕێککەوتنی ئەلجەزیرەیان دەخەنە ئەستۆی هەتا کوێ وایە." ئەو خاڵێکی خستەڕوو: ڕەوڕەوەی شەڕ هەڵتەهەڵتەکی بوو و ئێراق پێشنیاری

سەرکەوتنێکی دیپلۆماتیکی دەخستە بەر دەستی شا کە مەترسی تێوەچوونێکی پتری نیزامیی لە دوا نەبوو کە وەکوو زۆنگ دەچوو. بەڵام بارزانی قەت لەم بابەتەوە ئیسرائیلی نەبەخشی. مەلامستەفا هەتا سەرەمەرگی، هەر کات کە باسی نێوانی لەگەڵ ئیسرائیل دەهاتە گۆڕ باسەکەی دەگۆڕی.

مەسعوودی کوڕی لەمەش ئاشکراتر هەڵوێستی دەگرت. لە ئۆکتۆبری ١٩٩١دا وەختایەك لە گەڕیانی سەردانێکمدا بۆ کوردستان پێم گوت هەر بەم زوانە دەچمە ئیسرائیل بەم هیوایە کە چاوم بە کاربەدەستانی پێشووی مووساد بکەوێ، ئەم مرۆیە کە سەرچاوەی جوانترین ڕەوشتی ئینسانی و خوددارترین پیاوی کوردە، لەپڕ دەرهەڵبوو، گوتی قەتی پێخۆش نیە سەبارەت بە ئیسرائیلییەکان قسەم لەگەڵ بکا. ئەوەندەی ڕق هەستابوو پڕیشکەی لێدەبۆوە. وتی وەك بارزانییەك بڕوای وایە کە تێکەوتن و دۆستایەتی لەگەڵ ئیسرائیل، باوکی، هۆزی، بنەماڵەی، حیزبەکەی و هەموو کوردانی بە ڕێیەکدا برد کە کارەساتی لێکەوتەوە. ناکامی و بە پووچ دەرچوونی دۆستایەتی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی دەرەکی کە وەختایەك زۆر وەك مەبەستێکی جێی باوەڕ خۆی دەنواند، کۆنەرقێکی پایەداری جێهێشتبوو.[1] وا بێ و وا نەبێ، کوردان بە خۆیان سەلماندووە کە ئەگەر بارزانی سەرەتای دۆستایەتی لەگەڵ ئیسرائیلییان دانەمەزراندبا ئەوەندە سادە و ساکار نەدەبوون کە لەتەك شا و واشینگتۆنا دەس بدەنە هاوکارییەکی خڕ و پتوون.

بەو حاڵەشەوە لە ئیسرائیل پشتیوانی بێ پێچ و پەنای گشتیی سەبارەت بە ئاوات و ئارمانجی کوردان هەر لە گڕی خۆی دایە. لە بەهاری ساڵی ١٩٩١دا، کاتێك کوردان دژی سەددام حوسێن ڕاپەڕین، ئیسرائیلییە بە ڕەگەز کوردەکان لە دەرەوەی بیناکانی دەوڵەتی کۆبوونەوە و داوای یارمەتییان لە "ئیسحاق شامیر"ی سەرۆك وەزیر

١– بەڵام لە ١٩٩٢دا، لە وتوویژێك لەگەڵ کامران قەرەداغی – لە ئەلحەیات – ەوە، گوتی خۆ پاراستنی لە وتوویژ لەتەك ئیسرائیلدا ئەوەندەی دەگەڕێتەوە سەر دژایەتی عەرەبەکانی ئەندامی کۆنگرەی ئێراق، یانی دژبەرانی سەددام، پێوەندەی بە ڕابردۆوە نیە.

کـرد، یارمـەتی مـرۆڤدۆسـتانە نێـردرا، ئەگەرچـی نیۆیـۆرك تایـــمز کـە بـێ هـیچ ئێروئەوێیەك پشتیوانی لـە ئیسرائیل دەکا، ئیسرائیلی لـەبەر سـرنج وێنـەدان وە دەرد و بەڵای کوردان "بە گوێرەی ئەم دڵپەرۆشییە لووت بەرزانەیەی کە سـەربەخۆیی کـورد ڕەنگە ناڕاستەوخۆ فەلەستین بەرەو سەربەستی پاڵ پێوە بنێ" سەرکۆنە کرد.

هەروەك کە هەر کارگێڕێکی بەئـەزموونی دەزگـای زانیـاری دەزانـێ، باوەڕگـەلی نەگۆڕ و پتـەو، چـاوەڕوانی لـە ڕادە بـەدەر و بـە خراپـە بـاس کـردن زۆرتـر نرخـی مسۆگەری ئەم جمووجۆڵە پەنامەکییانەن کە لـە وڵاتانی جیهانی سێهەما بـەڕێوە دەچـن. بەم گەڕیانە لـەم بابەتانەدا کـە گـەورەهێزێك لـەگـەڵ خـەڵکێکی هـەژار و پێخوسـتی زۆرکاری چەشنی کوردان, تێبکەوێ، کارێکی ئاسایی و باوە. ویلیـام کـۆلبی کـە لــە سەردەمانی بەرەڵڵا کردنی کوردانا سەرۆکی "سیا" بوو، چەند ساڵ دواتـر پێیگوتــم: "هەتا زیاتر تێکەڵاوی ڕەوتەکە دەبێ، تێکەڵاییەتی عاتیفی بەتایبـەت لــە نێـو کـارگێڕانی چالاکی سەرشانۆ زیاتر دەبـێ."[١] کـۆلبی کـە خـۆی یـەکێك لــە کارناسـانی چـازانی کاروباری ئاسیایە لـەم پلـەیەدا دەیزانی باسی چ دەکا. ئیسرائیل کوێرەوەرییەکی تریـشی تووش هاتبوو: دوای ١٩٧٥ لوبرانی گـوتی: "خـەڵکی سـاکاری ناوچـە – کـوردان، ئێرانییەکان و زۆر لـە خەڵکانی تر – پێیان وابوو جوولـەکـە بـۆ پـووڵ هـەموو شـتێك دەکا." کە بە بڕوای ئەو, مەبەستەکە دەگەڕێتەوە سەر ئەم باسـەی کـە لــە "پەیـــمانی شێخەکانی زایۆن"دا باسی کرابـوو، کـە دروشـــمێکی چاوناسـی دژی جوولـەکەیـە و پۆلیسی ڕووسیای خونکاری لـە سەرەتای ئەم سەدەیەدا دەستی تێبردبوو.

---

١– دۆستایەتی "سیا" لـەگەڵ کوردەکانی ئێراق ساڵگاران وەك ڕۆحێکی نەسەکنیو پێوەندی و دۆستایەتی نێـوان ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئێرانی کردە مەیدانی تراتێنی خۆی. هەر دوابەدوای ڕووخانی شا "ڕی کیو"، سەرۆکی پێشووی "سیا" لـە بنکەی تاران بانگ کرایەوە سەر کار هەتا وتوویژێك لـەگەڵ دەوڵـەتی تـازە دەس پێبکا کە لـە بوونی پێوەندی شیمانەیی نێوان ئیسرائیل و کوردەکانی ئێراق دەترسا. "کیو" گوتی تا ئـەو جێیـەی ئەو ئاگادارە هیچ نێوان و پەیوەندییەك لـە گۆڕا نەبوو.

## بەشی ٨

# عەلی کیمیاوی

***بۆ سەرکەوتنی خراپی تەنیا هەر ئەوەندە پێویستە کە مرۆڤە باشەکان دەس لەسەر دەس دانێن و هیچ نەکەن.*** ***"ئێدمۆند بێرک"***

لە هاوینی ١٩٩٤دا سیمۆن وایزنتاڵ، هەروا هێدی و لەسەرەخۆ و بە ڕووخۆشی کە لە تەنیا دیدارمان بەچارەگە سەدەیەك پتر بەر لە ئێستا لەبیرم مابوو گوێی بۆ شل کردم. لە ساڵی ١٩٦٨دا، وەختایەکی بۆ یەکەم جار لە "ویەن" گەیشتمە دەفتەری کاری ئەم پیاوە ماندوویینەناسە، ئەو کەوتبووە بێوشوێنی ئەم نازییانەی کە لە گەڕیانی "ئاخرین ڕێچارەی هیتلێر بۆ دۆزی جوولەکە" لێپرسراو بوون، ئەوکات هەواڵنێری نیۆیۆرك تایمز بووم لە "وەرشەو". ئاشنایەتییەکم لەگەڵ شەیتان و شۆفارەکانی ئورووپای ڕۆژهەڵاتیی نەبوو و لە بابەت ئەو شتەی کە بە لامەوە وەك ڕەوت و ڕێبازێکی سوورریئالیستی دەچوو لە بەستێنی ***جووئازاری*** لە وڵاتێکا کە پاش تالان و قەڵاچۆی لێکدالێکدای هیتلێر بە کردەوە لە بوونی جوولەکان پاك کرابۆوە, پێویستیم بە ڕێنوێنی بوو. ئەو ساڵە مرخێشمرخێش لە نێو "حیزبی سالاران"ی وڵاتی

کومۆنیستی لەهێستاندا تونـد و تیـژتر بـوو. وایزنتـاڵ بـە هێمنـی و لەسـەرەخۆیی زانیارییەکی دوور و درێژی نایە بەردەستم.

ئەو کات من گەڕابوومەوە ویەن هەتا بە پێی ڕێنوێنیی ئەو ڕازی ئەم تۆڵە خۆفناکەی سـەددام حوسـێن بەسـەر کوردەکـانی ئێراقـی هێنـا بـوو ئاشـکراکەم. ژان و ئـۆف و ئەشکەنـجەی ئەم خەڵکە گەلـێ ناخۆشتر بوو لـەم ئێش و ئازارەی "شەدرەك و میشکە و عەبدنغوو"[1] کە لـە "تەورات"دا بەسەرهاتیان گێڕدراوەتەوە. ئـەم سـێ کەسـەیان بـە دەستووری "نەبوکد نەسر" خستە کلّی ئاگردانەوە (کە دەڵـێن چاڵەڕەشـەکانی هـەر ئەم سەرچاوە نەوتییە تازانەی کـەرکووکی کوردسـتان بـوون.) ئـەم گەورەگەورانـەی چاخی کۆن ئاخرییەکەی ڕزگارییان هات، بەڵام بۆ کـوردان کـە کەوتنـە بـەر لافـاوی چەکی شیمیایی و دوورخرانەوە و خاشـەبڕ کرانـی گونـدەکانیان، قوتـار بوونێـك لــە گۆڕێدا نەبوو. دەیانهەزار کەس بە بێ دادگایی کران و بێ سێ و دوو ئیعدام کران و کەوتنە بەر دەسدرێژی و ئازار و ئەشکەنـجە و سەددام تاوانبارە بەوە کە ئـەم ئـازار و نەگبەتییانەی وەك هونەرێکی ورد و باریك پێهەڵابردبوو.[2]

هیوادار بووم کە وایزنتاڵ گەیشتبێتە تێگەیشتنێکی تایبەت لـەسەر ئەم واتایـە کـە چ شتێك بۆتە هۆ و چ شتێك زۆرکارانی ئەمڕۆیی، لـە ئاڵـمانیڕا بگرە هەتا ڕۆژهەڵاتی دنە

---

١– نەبووکد نەسر بە تووڕەیی و غەزرینەوە فەرمووی هەتا شەدرەك و میشکە و عەبدنغوو بێنن ... فەرمووی کە کلّی ئاگردانەکە حەوت ئەوەندە نێڵ دەن و سووری کەنەوە ... پاشان فەرمووی شەدرەك و میشکە و عەبدنغوو چۆڵەپێچ کەن و بیانـخەنە گڕەمشقەڵانی ئاگردانەوە. (کتێبی دانیال پێغمەر، بەشی سێ.)

٢– "لە ئێراق گوللـەباران و لـە سێدارەدانی بەدەر لـە جەغزی قانوون هەتا ڕادەی هونەرێکی ورد و باریك پەرە و گەشەی سەندووە. شێوەی کارەکان بریتی بوون لـە دەکـار هێنـانی چـەکی شـیمیایی دژی خـەڵکی ئاسـایی، گوللـەبارانی بە کۆمەڵ لـە لایەن تاقمەکانی پیاوکوژ، زیندە بەچاڵ کـردن و هەڵواسـینی شـتی قـورس بـە پـای بەربەڵاکان و بە دەم چۆم دادانیان، خوێن لـێگرتن و ژارکوژ کردنی بـەڵاگێڕەوەکان بـە ژاری "تـالیۆم" (کـە دەرمانی مشکانە) و ژاری تر. دانە بەر دەسڕێژ و کوشتن بە کارەساتی ئوتۆمبیل یا باڵەفڕ. زێدە لـە مانەش هەزاران کەس لـە بەندیـخاناندا لـە هەلومەرج و بارودۆخێکی نادیارا بە هۆی ئەشکەنـجەوە مردن. هەروەها تێداچوون بە هۆی بزر بوون و کوژرانی سیاسی. سەرچاوە: نامیلکەیەك لـە ژێر سەردێری "قەیرانی مافی مرۆص لــە سـاڵانی ١٩٩٠دا – لێبوردنی نێونەتەوەیی، ١٩٩٤."

دەدا کە بۆ سەپاندنی وەها دەرد و ئازارێکی خۆفناك گەلاڵە دابرێژن و بەرێوەی بەرن و وەها کۆلکە و بەڵگەنامەی ورد و تەواو لەم بارەدا بەدی بێنن و ڕەوشتناسـینەکانی کۆمەڵکوژی وەدی بێنن و سەرەنجام ئەوە چلۆنە کە زۆربەی خەڵکی دنیا سەبارەت بەم دڕندایەتییە تۆزێك خورد نابنەوە. لە ڕاستیدا بۆ تێگەیشتنی ڕووداوەکان بە دوای بەڵگە و سەرەداوێکا دەگەڕام کە دنیا ئیزنی قەومانی دابوون و من دەمویست بزانم بۆچی؟ من هەر هیچ نەمدەزانی کە داخوا وایزنتاڵ مەیلی بۆ لای ئەم دۆزەی کورد هەیە و هیچ شتێك لەمەڕ چارەنووسیانەوە دەزانێ یان نا. بەڵام ئەو لەگەڵ هەوالێران زۆر هێدی و دڵۆڤان بوو، هەر بۆیە زۆر دەربەستی ئەم پرسیارانە نەبوو کە ڕەنگە لە ڕوانگەی ئەوڕا گەوجانە بێنە بەر چاو. ئەوەندەم پرس و مەبەستی پڕ گرێوگۆڵ بەرەوڕوو بۆوە کە هەستم بە نارەحەتییەکی ئەوتۆ نەدەکرد لەوەی کە ڕەنگە بیشەمزێنم و ئازاری بدەم. بە لای خۆمەوە دەمگوت پیاوێك کە تەمەنێکی لەم ڕێگایەدا ڕابواردووە و ڕووداوەکانی پەیوەندیدار بە ڕەوشتی کۆمەڵکوژی و چەرخە بە دەورەی ئەم سەدەیەی بە شێوەی ڕێكوپێك و بەڵگەدار بنووسێتەوە و ڕایبگرێ، ڕەنگە وڵام گەلێکی بۆ ڕەوتی ئەم ڕووداوانە لابێ، ئەگەرچی بە شێوەی بەرچاو قەبارە و ڕادەی توانایی ئەو کوشتارە لەگەڵ ئەم قەڵاچۆکرانەی ئێستا بۆ پێك گرتن نەشێن.

لەگەڵ تەواوی ئەمانەشدا سەبارەت بە دەربڕینی مەبەستەکان پارێزم دەکرد. دەیان ساڵ دەرهێنانی ڕاپۆرتە هەواڵی سەبارەت بە شەڕەکانی ئەفریقا و ئاسیا و ڕۆژهەڵاتینێوەڕاست و بابەتەکانی پێشێل کرانی مافی مرۆڤ لەم ناوچانەدا و تاوانبار کردنی وڵاتان بە ئەنجامدانی ئەم دەسدرێژییانە و تەنانەت کوشتاری بە کۆمەڵ و ڕەگەزکوژی، وای لێ کردبوون بەپارێز هەنگاو هەڵێنمەوە. ئەم وێكچوونانە جیاوازیی گەورە و بنەڕەتی دوو گەڕیانی لەبەر چاوان دوور دەکردەوە: جووەکانی ئورووپا تووشی کردەوەی دەسدرێژکارانەی ئاشکرا نەببوون؛ ئەوان قەت بە دژی دژبیرانی خۆیان دەستیان بۆ چەك نەبردبوو، بێشك کردەیەکی واشیان لێ ڕوو نەدابوو کە بکرێ و بشێ لەگەڵ شۆڕشی پەیتاپەیتای ڕابردووی کوردان و تەنانەت ئەرمەنییان

پێکبگیرێ، کە جوولانەوەی دژی عوسمانییان لە مەودای شەڕی یەکەمی جیهانیدا یەکەم "تۆوبڕکردنی" ئەم سەدەیەی خستە گەڕ. هەڵبەت کوردان خۆیان لە قەلاچۆ کردنی پتر لە میلیۆنێك ئەرمەنیدا بێگوناه نەبوون: بەشدار بوونیان لە کوشتاری ئەرمەنییەکانی تورکیادا، چ بە شێوەی تاکەکەسی، عەشیرەتی یان لە ڕیزی سوارەی حەمیدیدا بووبێ – کە لەسەر شێوازی قازاخی ڕووس ڕێکخرابوو – مێژووی کوردی تاڵ و تار دەکرد. سەرەڕای تەواوی ئەمانەش، ئەم توێژینەوە بەربلاوانەی کە لە لایەن کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی مەجلیسی پیرانی ئەمریکا و ڕێکخراوی "لێبوردنی نێونەتەوەیی" و "زێرەوانی مافی مرۆڤ" و گەلێ ڕێکخراوی تر و خودی کوردانەوە کراوە، دەریدەخا کە سەددام حوسێن تاوانبارە لەسەر بەڕێوە بردنی ئەم سیاسەتە "تۆوبڕکردن"انەی کە کۆنوانسیۆنی ساڵی ١٩٤٨ی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاوای لەسەر دەڕوا و شی دەکاتەوە: "تەما بە تێدابردنی بەشێك یان تەواوی تاقمەکانی نەتەوەیی یان مەزهەبی و ئەخلاقی."

من لەخۆوە سەبارەت بەم بابەتە نارەحەت بووم، چونکە وایزنتاڵ سەری لەم پرسیارانەی من سوڕنەما. وەختێك لێمکۆڵییەوە دەرکەوت کە بەر لە من خوێندکارانی کورد هاتوونە دیداری: ئەوان بۆ تێگەیشتنی ئەم مەبەستە کە ئازار و کوێرەوەری کوردان دەکەونە کوێی زنجیرە ڕووداوە تاڵەکانی ئەم سەدەیە یارمەتییان لێخواستبوو. بە بڕوای ئەم ڕووداونووسە کە کەوتبووە پێوشوێنی شێوەکانی تۆوبڕکردنی نازییەکان، وێنە و پێشەنگی هیتلێر لەو کۆمەڵکوژییەدا، "ئێنکیزیسیۆن"ی ئیسپانیا بوو.[1] بە بڕوای وایزنتاڵ تەنیا پێشکەوتێکی لەم بەستێنەدا ڕووی داوە و داری تەڕ و سەلای سەگی گۆڕیوە بە ئاگردانی مرۆڤ سووتاندنی ئاشوویتس،[2]

---

١– Inquisition: دادگایەکی کە کارەکەی "محاکمەی" خەڵکانی لە دین هەڵگەڕاوە یا ڕافزی و سزادانیان بوو. (سەدەی چاردەی زایینی) دەزگای پشکنینی بیروڕا.

٢– Auschuitz: شارۆچکەیەك لە لەهێستان کە ئاگردانەکانی مرۆڤ سووتاندنی هیتلێر لەوێ نێڵ درابوون.

پێشكەوتێكی تێكنۆلۆژیكە. گوتی: "ئەگەر دەزگای پـشكنینی بـیرورِا ئـەم كەرەسـتە و ئامرازە نوێیانەی بە دەستەوە بووبا، هیچ جوولـەكەیەك لـە ئیسپانیای سەدەی پازدەهەمدا بە زیندوویی نەدەما."

وا دیارە لـە ئێراقا هۆكاری تریش لـە كاردا بوون. بەڵام خۆ هەر تەنیا هیتلێر نـەبوو سەرۆی لـە "ئێنكیزیسیۆن"ی ئیسپانیا وەرگرتبوو. "هێنری مورگێنتـاو"ی بـاوك كـە لــە سەردەمی كوشتاری ئەرمەنییان لـە ساڵی ١٩١٥دا باڵوێزی ئەمریكا بـوو لــە بارەگـای عوسـمانی، لـە زمان "بەدری بەگ" سەرۆك پۆلیـسی قوسـتەنتەنییەوە دەگێرێتـەوە كـە پێیگوتووە: "دەوڵــەت" رِاپۆرتـەكانی ئێنكیزیـسیۆن"ی ئیـسپانیا و تـەواوی دەقـەكانی ســەبارەت بــە ئەشكەنــجە و ئــازار ورد ورد خوێندۆتــەوە و كــەلكی لـــە شـــێوە داهێنراوەكانی ئەوان وەرگرتووە." بە برِوای وایزنتاڵ هیتلێر ئـەم بازنەیـەی تـەكمیل و تەواو كردبوو. جووئازاری ئەو رِیشەی بە قووڵی دەگەرِاوە سەر رِێـسا و بنەرِەتـەكانی كاتۆلیكی، بەتایبەت ئێنكیزیسیۆن و دیارە هیتلێـر لــەم بابەتـەوە خـۆی بـە قـەرزداری تركان دەزانێ و دانـی پێیـا دێنـێ. (بێگومـان تـەفروتونا كردنـی زاهـدان ئـەلبی، لـە باشووری رِۆژاوای فەرِانسە، بە دەس سیمۆن دومۆنفۆر لـە سەدەی سـێزدەدا و لـەسـەر داخوازی رِۆم، تەنانەت شایەت و بەڵگەیەكی كۆنترە لـەم بوارەدا.) هیتلێر لـە دەسپێكی شەرِی دووهەمی جیهانی، لـە ئووتی ١٩٣٩دا دەستووری بە ژێنێرِاڵە پایەبـەرزەكانی دا پەلاماری لـەهێستان بدەن: "تەواوی ژن و پیاو و زارۆكی بە رِەگەز لـەهێستانی بێرِوحم و بەزەیی خاشەبركەن؛ ئەمرِۆ كێ باسی تەفروتونا بوونی ئەرمەنییەكان دەكا؟"

هیتلێر و سەددام حوسێن سەیریش ئۆگر و تامەزرۆی بەڵگەدار كردنـی دەسـكاری خۆیان بوون و هەروەها برِوایان وا بوو كـە لــەو پـەرِی تەناهیـدا دەتـوانن درێـژە بـە كارەكانیان بدەن. وایزنتاڵ گوتی: "نازییەكان بۆیـە ئـەم بەڵگانـەیان بـە لای خۆیانـەوە رِاگرت كە پێیان وابوو هەر وا مفت لـەم هەڵلایە قوتـار دەبـن. ئەوانـە بـە كـردەوەی خۆیان دەنازین." ئەڵـمانییەكان خەڵكێكی زۆر خوردوورد بوون و دەستوورەكانیان بـێ ئەملاوئەولا بەرِێوە دەبرد. گوتی: "بە بیری هیچ ئەڵـمانییەكدا رِانــەدەبرد كــە بتوانــێ

دژی هیتلێر هەڵگەڕێتەوە و ڕاستەوەبێ." سێودوو لـێ‌کردنێك لـە گۆڕێدا نەبوو. ئەم وتەیەم بە ئاماژە بەم مەیل و تاسەوە لـێ‌دەرکێشا کـە دەزگـا ڕقەبـەرەکانی ئاسـاییش و پاراستنی حکوومەتی سەددام حوسێنی لـە شێوەی بەڵگەدار کردنی کردەوەی خۆفنـاکی خۆیان و ڕاگرتنی بەڵگە و شوێن‌پەنـجەیانی سەبارەت بەم کردەوە مەترسیدارانە لێکتر جیا دەکردەوە. ئەم دام و دەزگایانە کە زۆریان دڵ بە بەڵگەی نووسراو و بەڵگـەدار و وێنە و لـەم چەشنە خۆش نەبوو، زانیاری نەهێنی کامپیووتێری و شریتی تۆماری دەنگـی ڤیدۆیی‌یان لـە کردەکانی خۆیان ڕادەگرت. کاتێك گوتـم کـە "ئێـشتاسی" – دەزگـای پۆلیسی نەهێنی ولاتی کومۆنیستی ئەلـمانی ڕۆژهەلاتیی – ساڵگاران بە نانە بەردەسـتی "ئامرازی فەننی" هاوتاکەی خۆی، یانی پۆلیسی نهێنی ئێراقی یاریدە داوە, وایزنتـاڵ بـە نژمێکی کە وای دەنواند ئاگاداری ڕەوتەکەیە ئاخێکی کێشا.

ڕژێمی ئێراق ئەوەنـدە لــە خـۆی دڵنیـا بـوو کـە وا دیـارە قـەت فکـری ئەمـەی نــەدەکردەوە کــە ئــەم بۆنــە و بەڵگــە تاوانبارکەرانــەیان ڕۆژێــك بکەوێتــە دەسـتی چەوسێنراوەکانیان. جیا لــە هــەموو شـتێکی تـر، ئـەم بۆنـە و بەڵگانـە سـەبارەت بـە تێگەیشتنی زیاتری وایزنتاڵ لـە بواری هاوهەنگاوی لـەگەڵ تێکنۆلۆژی نـوێدا هـورمی پتری دەدایە.

بۆچوون و بیروڕای وایزنتاڵ ئەگەرچی یەکجار بەکەلك بوون، بەلاّم "وردەکـاری" دام و دەزگای سەددام حوسێن خاوەنی تایبەتییەکی تایبـەت بـە ڕۆژهـەلاّتی نێوەڕاسـت بوون کە نەهاتبوونە بەرچاوی ئەو. شریتێکی ڤیـدۆیی بەتایبـەت بـیری ئـالۆز و پەشـێو کردبووم: بە ڕۆژێکی بەفر و کڕێوە لـە سـەلاحەددین، لــە بنکـەی پـارتی دێمـوکراتی کوردستان، لـەتەك هوشیاری زێباری‌ـدا گـەرمی قـسان بـووین کـە باسـی ئـەم شـریتە هاتەگۆڕ. فێوریەی ١٩٩٢ بوو و ئەو شی دەکردەوە کە سەددام حوسـێن چـی بەسـەر کوردان هێناوە. لـە سایەی بەفر و کڕێوە هات‌وچۆی دیدارکەران بنەی هـاتبوو و لانـی کەم زێباری بۆ جارێك دەرفەتی هەبوو کە چالاکی پۆلیسی نەهێنی ئێراق بـە بەڵگـەوە

نیشانی من بدا. تازە خەریك بوو باسی بنەماڵەكەی دەكرد,[1] بەر لەمە كە سەددام حوسێن پەلاماری ئێران بدا و ئاوری شەڕی هەشتساڵەی ئێران و ئێراق هەڵگیرسێنێ، سێ برای زێباری لە مووسڵ لە قەڵایەكی سپای ئێراقا دەژیان. ئەم سێ برایە خۆیان لە سیاسەتی نەتەوایەتی وەرنەدابوو — بێتوو خۆیان تێوەردابا لە مووسڵ نەدەمانەوە — بەڵام خودی هوشیار هەر بەم زوانە ببوو بە یەكێك لە هاوكارانی نزیكی مەسعوود بارزانی.

هەر ئەم هاوكارییە چارەنووسی براكانی گۆڕی. براكان لە لایەن پۆلیسی نەهێنییەوە ڕاسپاردەی یەك چەشنیان پێگەیی: دەبێ هوشیار دەس لە هاوكاری پارتی دێموكراتی كوردستان هەڵبگرێ. براكان هاواریان لێبڵێند بوو و گوتیان كە هاوولاتییەكی فەرمانبەردار و ملكەچی قانوونن و هیچ پەیوەندییەكیان بە براكەیانەوە نیە, چ بگا بە وەی كە دەسەڵاتیان بە سەریدا بێ و حوكمی لێبكەن. پۆلیسی نەهێنی یەكێك لە براكانی بانگهێشت و بە زۆری گلاسێكی ئاوپرتەقاڵ فەرموو كرد و ئەویش خواردییەوە, بەڵام پاشان ڕوون بۆوە "تالیۆم"ی تێكراوە كە ژارێكی كوشندەیە وەك دەرمانی مشكان كەلكی لێوەردەگیرێ. ڕێی هیچ دوكتۆرێكیان نەدا كە چاری بكا، بەڵام دوكتۆرێكی سەر بە پارتی دێموكراتی كوردستان بە دزی لە مردنی ڕزگار كرد. كاتێك چاك بۆوە سەرلەنوێ پۆلیسی نەهێنی بانگیهێشتەوە و پەرستارێكی بانگ كرد و ژارێكی كوشندەی بە شریقە لێدا ... دواتر دوو براكەیان وێكڕا بانگ كرد و لە بابەت چالاكییەكانی هوشیار لە پارتی دێموكراتی كوردستانا سەركۆنەیان كردن؛ براكان پێكەوە بە سواری ئوتۆمبیل بەرەو ماڵ بوونەوە و لە ڕێیە بە "تەسادوفێك" كوژران.

---

١– بارزانییەكانی نەتەوەخواز و زێبارییەكانی جاش كۆنەدوژمنی یەكتر بوون و سەرەڕای زەماوەندی مەلامستەفا بارزانی لەگەڵ كچی سەرۆكی زێبارییەكان – ئەو زەماوەندەی كە بە مەبەستی كۆتایی هێنان بە نێواناخۆشییەكان كرابوو – هەروا دوژمنی یەكترن. ئەم زەماوەندە زۆر پیرۆز بوو و مەسعوود بارزانی لێكەوتەوە. هوشیار زێباری لەم نێوەدا شتێكی دەگمەنە: ئەو یەكێك لە هاوكارانی نزیكی مەسعوود بارزانییە.

پاشان هوشیار هاتە سۆیی شریتێکی ڤیدۆیی کە لەم ماوە کورتە حەوت ڕۆژەیدا لە ١٩٩١ کەرکووك بە دەس کوردانەوە بوو لە پەلامار دانی ماڵی یەکێك لە سەرکردە پایەبەرزەکانی ئێراقی وە دەس پێشمەرگەیەك کەوتبوو. شریتەکە ڕێوڕەسمی گوللەبارانێکی نیشان دەدا کە لەبەر چاوی کادرە باڵادەستەکانی حیزبی بەعس و کاربەدەستانی تری حکوومەت و جەماوەرێکی زۆر کە هەستی شادییان دەنواند بەڕێوە دەچوو. لە پێشدا تاقمی گوللەباران دەسڕێژی کردە ئەم پێنج کوردەی بە دارەوە چۆڵەپێچ کرابوون و بە جامانەکانیان چاویان بەستبوون، پاشان ئەگەرچی کوردەکان مردبوون، بۆ ماوەیەکی درێژ بە ڕەشاش تەقەیان لێکردن. دوای ئەمە ئەفسەرێك بە هەنگاوی قورس و پتەو بەرەو مەیتەکان بزووت و بە دەمانچە یەکی فیشەکێکی تەواو بوونی بە — لاجانگیانەوە — نا. شتێکی کە پتر سەرسوڕماوی کردم، ئەفسەری دووهەم بوو کە دوابەدوای ئەفسەری یەکەم دەڕۆیی، ئەو مەیتەکانی دایە بەر گوللە. شریتەکە لەپڕ تەواو بوو، بەڵام دیار بوو کە ئەفسەرەکان هەموو یەك بە دوای یەکا چوون و ئەم کردەیان چەنپات کردۆتەوە.

ئەم چەنپات کرانەوە شتێکی هێنایەوە بیرم کە خاتوو "فریا ئێستارك"ی ئینگلیسی کە لە کاروباری ناوچەدا پسپۆڕە، وێنای دەکا. ئەم وێنا کردنە باسی ئیعدامی "نووری سەعید"ی سەرۆکوەزیرە لە گەڕیانی شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨ی ئێراقا کە کۆتایی بە حکوومەتی پاشایەتی ژێرباڵی بریتانیا هێنا. نووری پاشا هەوڵی دا بە جلوبەرگی ژنانە لەم هەڵڵا و بگرە دەرباز بێ، بەڵام خەڵك گرتیان و کوشتیان. شەوی دواتر خەنیمەکانی چاردە مەیتیان لە ژێر گڵ هێناوەدەر، هەتا ئاخرییەکەی دۆزیانەوە؛ ئەو کات ڕانندەی ترۆمبێلانیان ناچار کرد لێکدالێکدا وەسەر کەلاکی پەڕن. ئێستارك کە لە دۆستانی نیزیکی نووری سەعید بوو ئاماژە بە دڕندایەتییەك دەکا کە "ئێراق لە درێژەی مێژووی خۆیا پێیەوە بەدناو بووە." ئەم خاتوونە سەرنج دەخاتە سەر "جرینگەی نێوەنێوەی کۆنەزەنگێکی لە گوێیان ئاشنای کوشتوکوشتارێك کە لە قەدیمەوە لێدراوە، یانی لەو ڕۆژەوە کە عەلی، زاوای پێغەمبەری ئیسلام و خەلیفەی چوارەمی

مسوڵمانان لە کووفە بە زەبری شیر کوژرا – ٦٦١ زایینی – وا وێدەچێ زۆر پێشتر گەلاڵە و بیچمی کارەکە دارێژرابێ. تەنانەت قەڵاچۆکرانی بنەماڵەی پێغەمبەری ئیسلامیش لەم هەرێمەدا شتێکی تازە نیە."

بەڵام تۆ بڵێی جگە لەم کردەوە سامناکەی لە شریتە ڤیدۆییەکەدا چەنپات دەبۆوە، شتێکی تریش هەبووبێ کە من تێینەدەگەیشتم؟ بۆچی دەبێ پەیتاپەیتا تەقە لە مەیتی مردوو بکرێ؟ بیستبووم کە پۆلیسی نەهێنی بەر لە دانەوەی مەیتەکان بە بنەماڵەکانیان پوولی فیشەکە هاوێژراوەکان – و خەرجوبەرجی کرینی تابووت و ڕاگواستنیان – لە کەس و کاریان وەردەگرێتەوە. یانی مەسەلەی وەرگرتنی دمچەورانە پاش مەرگ لە گۆڕێ دایە! هوشیار بەم واقوڕمان و پەشۆکاوییەی من پێکەنی. ئەوەی بە لای منەوە زۆر سەیر بوو هاوهەنگاوی بێ ئەملاوئەولای ئێراقییەکان بوو لەگەڵ ئەم شێوە حکوومەتەی سەددام حوسێن. هەموو لە گەریانی پاڵاوتن و لێکدەرکردنی پایەبەرزانی حیزبی بەعس کە پاش وە دەس هێنانی دەسەڵاتی لە ١٩٧٩دا ڕووی دا ئاگادار بوون. سەددام حوسێن چەندسەت کەسێکی بۆ بیستنی وتاری یەکێك لە بەشدار بوانی پیلانی ئەم گۆدەتایەی قەرار بوو بکرێ و دەسەڵات بگرێتە دەس بانگهێشتە هۆڵی کۆنفرانس. لەگەڵ ناوهێنانی هەر کام لە پیلانگێران لە وەختایەکدا کە سەددام حوسێن فرمێسکی دەهاتنەخوار دەستووری دەدا کابرای ناوبراو لە نێو قریوە و قریشکەی شادی جەماوەرەکە بەرنە دەرەوە. پاسەوانەکان تاوانباریان دەبردەدەر. ئەو دەم سەددام تەواوی وەزیران و باڵادەستان و ئەندامانی پاشماوەی حیزبی ناچار کرد کە بکەونە ڕیزی تاقمی دەسڕێژکەران و تەقە لە مەحکووم کراوەکان بکەن.

ئەم کردەوە شێوەیەکی چەپەڵانەی دەس و داوێن تێوەدانی هاوکاران بوو لە کارەساتەکەدا، وێنەیەك بوو کە لە تەواوی ئاستەکانی زنجیرەی فەرماندەرێتیدا چەن پات دەبۆوە: لە ژێرووترین ئەندامی پۆلیسی نهێنیڕا بگرە هەتا باڵاترینیان، تێکڕا بەرپرسایەتی ئیعدامەکانیان کەوتبووە سەرشان. بەمجۆرە وەفاداری سەبارەت بە سەددام حوسێن و خزمەت کردنی بە ناچار دابین و دەستەبەر دەکرا. کە وایە ئەم

فیلمە ڤیدیۆیییەی کە وەك شتێکی سەمەرە وەبەر چاوی من هاتبوو لە ڕاستیدا بەڵگەیەك بوو کە نیشانی دەدا دەستوور بەڕێوە چووە و هیچ باڵادەستێك نەیدەتوانی سەبارەت بە وەفاداری کەسانی نێو ڕەوتی ڕووداوەکان و لێهاتوویییان دڵاودڵ بکا. ئەم شریتە ڤیدۆیییانە و شریتە ئاسایییەکان، کە چالاکی و هەڵسووڕداسووڕی حکوومەتیان بە خۆفناکترین شێوە دەنواند، بۆ ترساندنی کەسانێکیش کە شۆڕ و شەوقێکی کەمتریان سەبارەت بە خولقاندنی ترس و تۆقاندن نیشان دەدا، زۆر بەکەلك بوون.

ڕژێم ئەم ڕووداوەی ساڵی **١٩٧٩**ی لەسەر شریت تۆمار کرد و گەلێکی لەبەر گرتەوە و لەبەر چاوی گوڵبژێرکراوانی ئێراقی، بۆ وێنە جاشەکان و ئەندامە عەرەب و کوردەکانی حیزبی و کاربەدەستانی ڕەسمی ڕانا. ئەم ئامرازانە بۆ تەمێ‌گرتوویی لەگەڵ شێوەکانی تری کە حکوومەتی حیزبی بەعس بەدی هێنابوون تێکەڵ دەکران و تێکرا سیستمێکی زۆرکارانەی هەوسارپساویان پێكدێنا کە دەرفەتی بۆ سەددام حوسێن و بنەماڵەکەی دەرەخساند بە ناوی کەمینەی عەرەبی سوننی مەزەب و ئاپۆرە داوی شارەکانی دووچۆمانی دیجلە و فورات چەشنی تکریت، زاگەی خودی سەددام، بەسەر ئێراقا حکوومەت بکەن. شەڕ لەگەڵ ئێران ئەم مەیلی بەدفەڕی و توند و تیژی و زۆرکارییەی کە لەمێژ بوو لە ناخیدا جێگیر ببوو، پێهەڵابرد. ئەم ئامراز و کەرستانەی کە بۆ نواندنی توند و تیژی هەڵبژاردن کوشندە و دڕتر و خۆفناکتر بوون، هەتا سەرەنجام بۆ لێكدەرکردن و ڕقڕشتنێکی تاسەشکێن بە دژی دوژمنان دەسی ڕووی کردە گازی ژاراوی و خاپوورکەر برد، ئەویش نە تەنیا لە بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنانی دەرەکیدا بەڵکوو لەتەك خەڵکێك کە وەك خۆی ئێراقی بوون.

وا دیارە مەیل و ئیشتیای سەددام حوسێن بۆ نواندنی زەبر و زەنگی پتر بە دژی کوردان نابێ شتێکی لە ناخافڵ بووبێ. نەیاری و ڕق و قینی سەبارەت بە وان خاوەنی بیست ساڵ پێشینە بوو؛ سەددام تەماداری خۆی لە بابەت پاككردە حیسێب و ڕقبێ‌ڕشتنیانی قەت لەکەس نەشاردەوە. حاڵی بوون و تێگەیشتن لە ویست و ئامانجی

لە پێشدا گەڵاڵە کراوی حیزبی بەعس لە پێوەندی لەتەك کوردانا شتێکە کە مرۆ ناچار بە لایەنگری دەکا و وا باشە باس و خواسی ئەم بوارە بخرێتە ئەستۆی مێژوونووسان. دوژمنەکانی ئاماژە بە پێشینەیەکی نەپساوە دەکەن کە لە سەرکوت و خاشەبڕ کردنی حیزبەکانی ترا کەوتۆتە پێشوێنی، بەڵام لاگیرانی رژێم دەڵێن کە حیزبی بەعس هەر پاش گەڕانەوە سەر دەسەڵات لە ١٩٦٨دا بەگەرمە تەمای وابوو کوردان لە دەسەڵاتی سیاسی و داهاتی نەوتا بکاتە شەریك و ئەو سەردەمی بۆ وڵاتێکی کە لەبەر دە ساڵان بشێوی و شڵەژانی بێ نێوبڕی شۆڕش و رووخانی خانەدانی هاشمی تەواو لە پێ کەوتبوو، پێکەوە سازانی تەواوی خەڵکی ئێراق بە گشتی لە عەرەبی شیعە و عەرەبی سونیڕا بگرە هەتا کوردان وەك شتێکی ئاقڵانە و مەنتیقی دەهاتە بەرچاوان. لاگیران و بەرگریکارانی رژێم لایان وایە کە تاسەی کوردان بە لایەنی دەس تێکەڵ کردنی لەگەڵ غەواران – بەتایبەت ئێران و ئیسرائیل لە ساڵانی دەیەی ١٩٦٠دا – لێکهەڵاواردنی چاکە و خراپەی بە لاڕێدا بردن و بوو بە هۆی ئەوەی کە داواکانیان بە شێوەیەکی گران و لاسەنگ پێهەڵابەرن و ئاخرییەکەی بەعسی وا لێبکەن کە بەجێی پێکهاتن لەگەڵ نەتەوەخوازیی کورد لە نێوخۆی ئێراقێکی یەکگرتوودا، بکەونە سەرکوت کردنی.

وە هەر حاڵ، سەددام حوسێن قەت فەرامۆشی نەکرد کە لە ساڵی ١٩٧٠دا حیزبەکەی ئەوەندە لاواز بوو کە خۆی ناچار بوو بێتە سەر دانیشتن و مامەڵەیەك لەگەڵ کوردان کە خودموختارییەکی بەرفرەوانی لێکەوتەوە. نەبوونی هاودەنگی و رەزامەندی لە کاروباری ئێراقا – و تەواوی شوێنەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستا – ئەوەندە زۆرە کە هەروەك دیتمان دەوڵەتی ئێراق هەرگیز بەگەرمە و سەرراست لێنەبڕا کە قەراروبڕییەکان بخاتە گەڕ. بە پێچەوانە هەر کە حوکمات هێزی هاتەوە بەر سەددام حوسێنساڵمەخەتەی کرد و پێی لە بڕیارەکان نا و هەوڵی دا کێشە و داوای کوردان سەبارەت بەم هەرێمانەی کە بە هەق بە هی خۆیان دەزانین لە هورم و برەو بخا. وێڕای ئەمەش شێوە و شێوازی کارەکانی – واتە دەسدرێژی بۆ گیانی خەڵك و خاپوور کردنی گوندان و دوور خستنەوەی بە کۆمەڵ بۆ باشوور – هەموویان لە جەغزی ئەم

نەریتە توند و تیژانەدا بوون کـە ئێراقـی نـوێ لـە حکوومـەتی عوسـمانی بـە مـیرات وەرگرتبوو.

لـە ٢٩ی سێپتامبری ١٩٧١دا پیلانێکی تـر کـە بـە "پیلانـی تەقینـەوەی مـەلایان" ناوبانگی دەرکرد، هەوڵێکی دیکە درا بۆ کوشتنی بارزانی. ڕژێـم داوای لـە لیژنەیـەك مەلای شیعە و سوننی کرد کە دەیانویست بچنە سەردانی بارزانی، بیروڕای بپرسن و لە ملی هێندێکیانی پەستاوت کە بۆ تۆمار کردنی قسەکانی بە وردی دەزگای وەرگـرتن و تۆماری دەنگ لە ژێر پشتێندەکانیان ببەستن. بەڵام بە بێ ئاگاداری ئەوان دەزگاکانیـان پڕ کرد لە تەقەمەنی. پۆلیسی نهێنی بە دروستی لێکی دابۆوە کە لەبەر ڕێزێکی تایبەتی کە بارزانی بۆ مەلایانی هەیە, ناهێڵێ پاسەوانانی گیانیان بپشکنن. هـەر کـە دیدارەکـە دەستی پێکرد, ئەم کەسانەی دەوری ڕاندەی لیژنەکەیان دەگێـڕا, لـە ئوتۆمبیلـەکانی خۆیانا, کلیلی تەقینەوەیان لێدا. مەلاکان چـوونەوە لای خـوای خۆیـان و پریـشکە و پنچکە گۆشتی لەشیان چەند ڕۆژان هەر وا بە میچەکەوە ما. بارزانی لە سایەی سـەری خزمەتکارێکی کە چای بۆ دا دەنا بە سلامەت دەرچوو: قەڵافەتی کـابرای خزمـەتکار, زەبری شەپۆلی تەقینەوەکەی گلدابووە. پاسەوانانی بـارزانی لـەم شـڵەژاوییەدا و بـەم بیرەوە کە ڕێبەرەکەیان کوژراوە دەستیان کرد بە کوشتاری مەلا و هاوڕێیانیـان کـە بـە سلامەت لەم تەقینەوە خەلەستبوون. بەو جۆرەی کـە لـە کـونی جێ فیشەکەکانڕا لەسەر دەرکەی ئاودەستەوە دەردەکەوت وادیاربوو یـەکێك لـە میوانـەکانیان لەسـەر پێشاوێ دابوویە بەر دەسرێژ.

دەوڵەتی بەغدا پاش ماوەیەك دیسان سنووری "دابەشینی وڵاتی" گۆڕی: کوردانیـان لە ناوچە بارناسـکەکانی نیزیـك چـاڵە نەوتـەکانی کـەرکووك یـا مەڵبەنـدەکانی لای سنووری ئێران و خودی شاری کەرکووك وەدرنا و مووچە و مەزرا بەرێژەوەکانی دایـە ئەم عەرەبانەی کە بۆ وێندەرێی هێنا بوون و بەم شێوەیە هاوسەنگی جەماوەریی پێشووی تێك دا. یەکەم گوند لەم ٤٢٤٠ گوندە کوردەی کە بە دەسـتی حکوومـەت خـاپوور کران, پاش لێکهەڵوەشانی شۆڕشی بارزانی لە ١٩٧٥دا تەخت کرا. سەددام حوسـێن سێ کوڕی بارزانی کوشت "لوقمان, عوبەیدیللا و سابیر" و دەیانهەزار کـوردی پـاش

گەڕانەوە لە ئێران دوور خستەوە بۆ دەشت و سارای وشك و قاقڕی باشوور. پتر لە ٢٠٠٠ گوندی کوردان بەر لە ١٩٨٧ لە سەر لاپەڕەی جوگرافیای کوردستان بزر بوون.

ئەم مەبەستە دروست پاش هەشتساڵ هەڵگیرسانی شەڕی سەددام حوسێن بوو لەگەڵ ئێران. ئەو لەم ساڵەدا دام و دەزگای لەشکریی خۆی کە بە مەبەستی پەلامار و زەبرێکی تۆڵە ئەستاندنەوە وەها ساز و تەیار کرابوون هەتا بە کەس چورتمیش نەکرێن, دژی کوردان خستە گەڕ. کوردان کاتێك وە خۆ هاتنەوە کە تازە کار لە کار ترازابوو. لە دێسامبری ١٩٨٧دا مەسعوود بارزانی پێیگوتم: "ئەگەر ڕەوتەکە هەر وا باژوێ ئیتر کوردێك لە کوردستان نامێنێ. پیلانی سەددام حوسێن ئەمەیە کە ئێمە وەك گەلێك خاشەبڕ کا. یان ئەو دەبیاتەوە یان ئێمە, هیچ ڕێگایەکی دیکە نیە."

***

کاتێك لە ١٩٨٠دا شەڕی ئێراق لەگەڵ ئێران دەستی پێکرد, زۆرێك لە کوردەکانی ئێراق پەند و گۆڵمەزەکانی شکانی پێنجساڵ لێرەوبەریان باش هەزم نەکردبوو. ئەم خەڵکە لەم زنجیرە شەڕانەدا کە لە ماوەدای تەمەنی بەرەیەکا قەومابوون, ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵ جبەخانەی ئێراق کە پەساپەسا خۆفناکتر دەبوو, ڕاهاتبوون. ئەم جبەخانەیە لە فڕۆکەی تیژباڵی هەرە چالاکی "هاوکێر هانتێرە"وە بگرە هەتا ناپاڵم و باڵەفڕی هەمە چەشنی دیکەی گرتەوە و ئەمانە کۆمەڵێك چەكوچۆڵ بوون کە لە نرخ و بایخی پشتیوانێتی چیای بۆ کوردان تەواو کەم دەکردەوە. لەمە پڕخەسارتر بێدەسەڵاتی کوردان بوو لە بواری ئەگەری تێکدانەوە و زەرەد گەیاندن بە حیساباتی [دوژمنان]. کوردەکانی ئێراق بەتایبەت ئەوانەی کە بە کوڕانی بارزانی وەفادار بوون, زۆرتر وەك ڕابردوو شەڕیان تەنیا وەك هەلێك بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە دەهاتە بەرچاو و لایەنی پارێزیان تەواو وەلا نابوو. مەسەلێکی کوردی کە دەڵێ: "کەم بژی, کەڵ بژی", ئەم خۆ دانە دەس چارەنووسەی بە باشترین شێوە دەردەخست. کوڕانی بارزانی بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەم سەرکوتەی ڕەنگە پاش تێشکانی ئێران و مانەوەی سەددام ئاوقایان بێ دەستیان بردەوە بۆ چەك. ڕاستییەکەی ئەمەیە, من خۆم

هەر ئەو دەم لە ماوەی چەندین کاتەژمێر دانیشتن و وتووێژ لەگەڵ کورداندا, قەت نەمبیست کە ڕێبەرێکی کورد لەسەر ئەم گومانە بێ کە ڕەنگە شەڕ بە جۆرێك کۆتایی بێ بێ کە پتر لە ڕابردوو بە زەرەدی ئارمانجەکانیان بێ. ئەوان لایان وابوو کە شەڕ برستی هەردوو ولاتی ئێران و ئێراق دەبڕێ. نموونەی خەیانەتی "شا"یان تەواو لە بیر بردەوە و لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئایەتوڵلا خومەینی کە ساڵێك پێشتر کوردەکانی ئێرانی بە توندی سەرکوت کردبوو, دەستیان تێکەڵ کرد. لە هاوینی پاش شۆڕشی فێوریەی ساڵی ١٩٧٩ی ئێراندا, دەوڵەتی نوێ داخوازی کوردانی لەسەر خودموختاری بردەوە پاش و بە پشتیوانی هێزە چەکدارەکانی کەوتە سەرکوت کردنیان.

کوردستان قەت نەبوو بە مەیدانی شەڕ و کەڵەوەکێشی ئێران و ئێراق, بەلام هێزی پێشمەرگە بە ئازاد کردنی خێرای ناوچەکانی بەرفرەوانی کوردستان — لە سنووری تورکیاڕا بگرە هەتا ئێران — ئەم "خەیالاتەی سەرکەوتنیان" بۆخۆیان پێکهێنا, ئەویش وەختایەکی کە شەڕ لە باشوور لە گڕی خۆیا بوو. کوردستانی ئێراق عەمباری دانەوێڵەی ولات بوو و لکی گەورەی ڕووبارەکانی دیجلە و فورات و چۆماوەکانی تر, ئێراقی لە نێو ولاتانی عەرەبیدا ڕاستەوخۆ کردبوو بە ولاتێکی خۆبژێو لە بابەت ئاو و بژیوەوە. هاوکاریی کوردان لە باکوور لەگەڵ ئێران زۆرێك لە هێزەکانی ئێراقی کە سەددام حوسێن لە بەرەدا تەواو بۆیان زەروور بوو لە پێ پەڕاندبوو و ئەم هاوکارییە هێندێك جاران ناوچە بارناسکەکانی وەك چاڵە نەوتەکانی کەرکووك و بەنداوەکانی "دەربەندی خان" و "دووکان"ی کە ئاو و کارەبای بەغدایان دابین دەکرد, دەخستە مەترسی. لە ئاکامدا ڕوانگە و بۆچوونی حکوومەت تەواو ژێر و ژوور بوو و ئەم ئاڵوگۆڕە شتی ناخۆشی لێ کەوتەوە. لەبەر چاوی سەددام حوسێن "پێشمەرگە" چەشنی "خراپکار" خۆی نواند, ئەم لەبزەی کە لە قامووسی بەعسا تەواوی کوردانی دەگرتەوە و مافی شیاوی هاوولاتی بوونی ئێراقی لێوەردەگرتنەوە و بە بێ ئاگاداری ئەوان, ئەوانی دەخستە ئەوبەری سنووری ژینەوە. هەر جیاوازییەکیش کە لە نێوان پێشمەرگە و خەڵکی ئاساییدا بوو, نەما. ئێستا بۆچوونی کۆمەلانی

سەرەتایی هاتەوە گەڕ, یانی ڕەت كردنەوە و وە بەرچـاو نـەهێنانی هـەبوونی دوژمـن و گۆڕینی بە باری كەسایەتییەكی نەبوودا. وێڕای ئەمەش حوكمات پاراستنی هەر چەشنە ڕێ وشوێنێكی كە لـە شەڕاندا وە بەرچاو دەگیرێ, وە لای نا. كاتێـك سپاسـی ئێـراق كەوتە بارودۆخێك كە حیسێبی لـەگەڵ كوردان ساف بكا و ڕقـی خۆیـان پێبڕێـژێ — هەر وەك دەبینین كە لـە ئاوریلی ١٩٨٧دا ئەم كارەی دەس پێكرد و لـە درێژەی ساڵی ١٩٨٨دا كەوتە شوێنی — سەركردایەتی باڵای سپای ئێراق شانازی دەكرد كە بێ نێـوبڕ چەكی ژاراوی دەكار هێناوە و ئەم دەس وەشاندنانەی بە "بەربەرەكانییـەك دەزانـی كـە كەوتۆتە بەر ئافەریم و پێهەڵاگوتنی تەواوی خەڵكانی جیهـان." چـونكە "تـەواوی ئـەم غەیانەتكارانەی خۆیان بە نەیارانی دەرەكی هەرزانفرۆش دەكەن ڕەپاڵ دەنێ."

دواتر بۆم دەركەوت كە ئەم زمـان و ڕاوێـژە خۆفناكـە لـە ناوچـەدا پێـشینەدارە: وێكچوونێكی ئازاردەرانە لـە نێوان بیروڕای بەغدا سەبارەت بە كوردان وەك خەڵكێكی "خائین" كە دەبنە هاودەستی ئێران و هەر وەهـا تێكـەوتنی ڕێبـەرانی تـەك لـە بەسـتێنی ڕیشەبڕ كردنی ئەرمەنییەكان لـە ١٩١٥دا بە تاوانی هاوكاری لـە تـرك ڕووسـیادا, وە بەرچاو دەهات. ئەنوەر پاشا, وەزیری "شەڕ"ی عوســمانی بـە "مورگێنتـاو"ی گـوت: "ئێوە دەبێ بزانن لـە كاتێكا كە ئێمە لـە "داردانێل" بۆ نەفسی ژیانـمان شەڕمان دەكرد و هەزاران كەسـمان دەكردە قوربانی, نەماندەویست ئیـزن بـدەین كـە ئـەم خەڵكـە لـە پشتەوەڕا بـماندەنە بەر خەنـجەر." دەزگای زانیاری بریتانیا لـە مەودای شەڕی یەكەمی جیهانیدا دەقی تەلگرافێكی ڕەمزی بە ڕێكەوتی ١٥ی سێپتامبری ١٩١٥ بـە ئیمـزای تەلعەت پاشا, وەزیری نێوخۆی عوســمانی بـڵاو كـردەوە كـە دەیـانگوت هێزەكـانی ئینگلیـسی لـە سـووریا بـە خەنیمـەتیان گرتـووە. تەلگرافەكـە دەیگـوت: "دەوڵـەتی عوسـمانی تەمای وایە ئەم خەڵكـە تۆوبڕكـا, تەنانـەت ئەگـەر چـالاكی لـەم بـوارەدا زۆریش توند و تیژ بن ... نابێ هیچ چەشنە خاترگرتنێك لـە بەر نێر و مێ بوون و تەمەن یان ئازاری ویژدان لـە گۆڕێدا بێ."

عەلیحەسەن مەجید, ئامۆزای سەددام و سەركردەی هەرە باڵا بـۆ كوردسـتان لـە چوارچێوەی وشە و وتەی لەم چەشنەدا بیری دەكردەوە. هـەر كـە ڕۆژی ٣ی مارسـی

١٩٨٧ وەك سـكرتێری گـشتیی نووسـینگەی بـاكووری حیزبـی بـەعس كاروبـاری كوردستانی بە دەستەوە گرت, بە هەڵسووڕانێكی تێكـەڵاوی دڵڕەقـی خـۆی تەنانـەت كوردانیشی واقوڕماو كرد. كوردان لـە ماوەی دوور و درێژی خەباتی خۆیان لـەگـەڵ ئێراقا قەت بە هیوای تاقە كەسێك خۆڕایی نەكرا بوون كە ئاوهـا دەسـەڵاتی مـەرگ و ژینی خەڵكی بە دەستەوە بێ. لـە ڕابردوودا سەددام حوسـێن و پێـشینانی هـەرگیز لـە ترسی سەر هەڵێنانی ڕەقیبانی شیمانەیی دەسەڵاتی تەواویان نەدابوویە دەس كەس. ئێستا مەجید كەسی لـە ئامۆزاكەی باڵادەسـتـر نەبوو و لـە گشت كاروباری نێوخۆ و نیزامیـی و هێمنایەتی بـاكووری ئێراقـا تـەواو خـاوەن دەسـەڵات بـوو. ئێـستا ئیـدی كـوردان هیوایەكیان نەبوو بۆ ئەوەی كە بتوانن بە قوژبنی قەڵش و تەقەڵی ئەم حكوومەتە چـەق بەستوەدا هەڵسووڕێن و بۆ مانەوە چاوی هیوا ببڕنە مل بە ملـە و بەرچـاوتەنگی نێـوان ڕێكخراوەكانی زانیاری و پۆلیسی نەهێنی و حیزبی دەسەڵاتدار و هێزە چـەكدارەكان و جاشـەكان. مەجیـد هـەتا ڕۆژایـەكی كـە لـە ٤ی ئـاوریلی ١٩٨٩دا كوردسـتانی جێهێشت بەوپەڕی كەیفسازی و تام و چێژەوە دەسەڵاتی سەپاند. هەروەك یەكێك لـە خوێندەوارانی كورد بە پەژارەوە گـوتی: "سـاڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٨ بـۆ كـوردان لـە هێرشی ئەسكەندەری گەورە لـە ساڵی ٣٣١ی بەر لـە زایینەوە – لـەسەر ڕێی خۆی بۆ هیندووستان – بەرەو ئێرە, ناخۆشترین ساڵانی كوردسـتان بـوون." بیـستنی شـریتە بـە خەنیمەت گیراوەكان ئەم مەبەستەی بە ڕوونی دەردەخست. زمانی بـزۆز و بـەڕەڵڵا و زۆربە چەپرەكی مەجید, دەنگی زیقزیقۆكـە و سـەیر و ڕاوێـژی دیـار و گوندییانـەی, سەرلـەبەر تەمای حكوومـەتی بـۆ هەڵتەكانـدنی میراتـی نەتەوایـەتی و شـێوەی ژیـانی خەڵكی [كورد] بە تەواوی دەردەخست.

مەجید لـەڕێوە بە كەلك وەرگـرتن لــە چـەكی شـیمیایی بـە مەبەسـتی كوشـتار و تۆقاندنی خەڵكی گوندەكی باكووری ئێراق, شێوازێكی نوێی خـستە سـەر ڕێوشـوێنی كۆنی شەڕەكانی دژی پارتیزانی. لـە نێو كورداندا نـاوی بـە عـەلی كیمیـاوی زڕا. تاكتیكەكانی ڕاماڵینی لـەسەر شێوازی چۆڵ كردنی ناوچە گوندنشینەكان خێراتر كرد و ئەو برە پارتیزانەی كە مابوونەوە لـە خورد و خۆراك و زانیاری بێبەشی كردن. تەنانەت

بەر لە هاتنی ئەو, خەڵکانی گوندەکی لە گوندەکانی خۆیان ڕەپێچەك درابوون و لە شارۆچکەکانی مەشهوور بە "سەرکەوتن"دا لە قەراخ شارێ و دەوروبەری شارەکاندا کە بە سانی چاوەدێرییان بە سەرا دەکرا, بنەگر کرابوون. مەجید بە خاپوور کردنی ئەم کۆخ و گوندانەی کە هەر لە سەردەمانی کۆنەوە بەردی بناغەی کۆمەڵی گوندەکی کوردیان پێکهێنا بوو ئەم ڕەوتەی پتر خستەگەڕ. لە قۆناخێکی ترا, دەیانهەزار گوندەکی کۆکردەوە و گرتنی و بەرەو کوشتارگاکانی بەڕێ کردن. بۆ پاساو هێنانەوە لە بابەت تەخت کردنی گوندە کوردەکان و پێکهێنانی پشتێندەیەکی هێمنایەتی بە بەرفرەوانی "نیوئینگلەند" لە یەکێك لە شریتە بە خەنیمەت گیراوەکاندا دەیگوت: "ئەگەر وا نەکەین چالاکی خراپکارانە قەت, هەتا میلیۆن ساڵی تریش کۆتایی پێنایە."

ئەو نەبوونی بەرهەم و حاسلاتی کە لە ئاکامی چۆل بوونی دێیەکانەوە بەدیهاتبوو, بەم شێوەیە و بە بایخ پێنەدان لە کۆڵ خۆی کردەوە: "گەنمەکەیانمان ناوێ, لەم بیست ساڵەی دواییدا هەر گەنممان لە دەرەوەڕا هێناوە, بلا با پێنج ساڵی تریشی بێتە سەر." کوردان لەوپەڕی دەرد و هەڵچۆقینا دەیانبینی کە داهاتی نەوت, کە بەشی زۆری لە کوردستان دابین دەکرا, هەل بۆ سەددام حوسێن دەڕەخسێنێ کە گەنمی پێبکڕێ و چنۆکی ئەمریکا ئەم ڕەوتەی بۆ خۆش کردووە: زیاتری ئەو گەنمەی کە ئێراق دەیهێنا, گەنمی بە لاشی ئەمریکا بوو کە دەوڵەتانی ڕێگان و بووش جار لەگەڵ جار پتر دەیاننایە بەر دەستی ئێراق, هەتا وای لێهات لە سایەی نێوانخۆشیی چەند کەسێك لە ئەندامانی کۆنگرە, ئێراق بوو بە گرینگترین بازاڕی گەنمی ئەمریکا. لە سایەی بە لاش دان و دەستەبەر بوونەکانی "دامەزراوەی پشتیوانی بۆ کڕینی کەلوپەل" ئێراق لە ساڵی ١٩٨٩دا بایی چوارمیلیارد دۆلاری گەنم لە ئەمریکا کڕی و لە ١٩٨٩دا دەوڵەتی بووش ئەم دەسقەرزانەی کە "دامەزراوەی پیشتیوانی بۆ کڕینی کەل وپەل" دەستەبەریان ببوو, هەتا دوو بەرامبەری پێهەلابرد.

لە شریتێکی ترا عەلی کیمیاوی لە وتارێکدا بۆ کادرەکانی حیزبی بەعس ئاوای پاساو بۆ کەلك وەرگرتنی پەیتاپەیتا لە گازی شیمیایی بە دژی کوردان هێنایەوە: "کێ دەخوازێ متەق بکا؟ کۆمەڵی نێونەتەوەیی؟ بێ جێ دەکەن ... کۆمەڵی نێونەتەوەیی و

تەواوی ئەوانەش کە گوێ دەدەنە قسەکانیان هەر وەتر!" لە دەسپێکی ساڵی ١٩٨٩دا لە کۆبوونەوەیەکی دەگەڵ ژێردەستانی, لە بەرامبەر کەسانێکا کە ڕەنگە غیرەت وەبەر خۆ بنێن و لەمەڕ گوللەبارن و کوشتاری بە کۆمەڵی پیاوان و ژنان و زارۆکانی کورد کە لە ١٩٨٨دا بەڕێوە چووبوو ڕەخنە بگرن, بەم وتانە کەوتە بەرگری کردن لە خۆی: "لە منیان دەوێ ئەوان ساخ و بەدەماخ ڕابگرم؟ ... نا, من ئەوان بە بۆلدزێر زیندەبەچاڵ دەکەم." لێرەدا وەك ئەوەی باس و دەمەتەقەیەکی هێنابێتەوە بیر کە لە زەینیدا هەڵگیرسابوو, درێژەی دا: "باشە, ئەم گشتە خەڵکە لە کوێ وەحاوێنم؟ ئەوانم بە سەر قەزاکاندا دابەشی. پاشانیش بە ناچار بۆلدزێرەکانم ناردە ئێروئەوێ."

ئەمە خۆ هەڵکێشانێکی لەخۆوە نەبوو. هێندێك لەو کەسانەی قوتار بوون گێڕایانەوە کە چلۆن دەیان هەزار کورد بە فەرمانی ئەو تێدا چوون: زۆربەی ئەم کوژراوانە بریتی بوون لە ژنان و منالان. ماوەیەك دواتر, لە بەهاری ١٩٩١دا, ئەو وەختەی کە کوردان و ئێراقییەکان هاتنە سەر زنجیرەیەك وتووێژی بێ ئاکام, مەسعوود بارزانی و تەواوی ئەندامانی لێژنەی نوێنەرایەتی کورد هەستی خۆیان قەیتەرقوو کرد و خۆیان خواردەوە و هەر لەگەڵ ئەم "عەلی حەسەن مەجید"ە کە یەکێك لە ئەندامانی لێژنەی نوێنەرایەتی ئێراق بوو دانیشتنە سەر وتووێژ. کوردان پێیانگوت وەك لێکیان داوەتەوە ١٨٢٠٠٠ کورد بزر بوون, کە وێدەچێ مردبن و زۆربەی ئەوان لەم زنجیرە دەسوەشاندن و چالاکییە سەمەرانەدا تێدا چوون کە لە ١٩٨٨ بە ناوی چالاکی "ئەنفال" بەڕێوەچوو و زۆرتریش خەڵکی ئاسایی وەبەر خۆی دا. عەلی حەسەنمەجید وەهای ڕق هەستا کە لە جێی خۆی بڵێند بوو و نەڕاندی: "ئەمە وانیە, زۆریان پێوەناوە, ١٨٢٠٠٠ کەس, یانیچی؟ لە سەتهەزار کەس پتر نەبوو!"[1] هەتا وە دەس هێنانی بەڵگە نەهێنییەکان لە بەغدا, کە ڕەنگە سەرەداوێکی

---

١- عەدنان موفتی پێیگوتم: "لەو چل و دوو ڕۆژەدا کە وتوویژ درێژەی هەبوو" جارێکیان عەلی کیمیاوی کە باسی خاپوور کرانی بەربلاوی گوندەکان و کەلك وەرگیران لە چەکە شیمیاییەکان بە فەرمانی ئەو هاتە گۆڕ, توند دەرهەڵبوو و گوتی: "ئەگەر باسی کوردستان دەکەن دەبێ لە سەرەتاوە دەس پێبکەن, نەك تەنیا لە زەمانی ←

ورد و باریك لە بابەت کوژراوانی ئەم ڕووداوانەوە بداتە دەس, ئەم کوردانەی کە خەریکی کۆکردنەوەی بەڵگە و بۆنەی سەبارەت بەم زۆرکارییەن ژمارەکەی مەجید بە ڕاستر دەزانن. یەکێك لە توێژەرانی ورد و خوردی کورد بە ناوی شۆڕش ڕەسووڵ, بە گوێرەی وتوویێژی بەربلاو — لە کوردستان — و پێداچوونەوەیەکی ورد بە بەڵگەناکانی بەدەستەوەی ئێراقیدا, لە ئاخروئۆخری ساڵی ١٩٩٤دا پاش پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندنێکی بەپارێز سەبارەت بەم گەڕیانە, واتە ژمارەی تێداچوانی کوردانی زەمانی سەرۆکایەتی مەجید, ژمارەیەك لە نێوان ٦٠٠٠٠ تا ١١٠٠٠٠ کەس دەخاتە ڕوو. ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی وای دادەنێ کە — جگە لەم قۆناخە — لە ساڵانی دەیەی ١٩٨٠دا لە کوردستان و ناوچەکانی تری ئێراق "سەدان هەزار کەس بوونە قوربانیی ئەم شێوە ئیعدام کرانە سەرسەرەکییانە." یەکێك لە ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووکان دەڵێ: "زەبروزەنگ و فیتنەگێڕی سەددام حوسێن دەرهەقی کوردان وەها لەزەبر و بە ڕادەیەك بەربلاو بوو کە لە پاش شەڕی دووهەمی جیهانی بۆو لایە وێنەی لە کەمتر شوێنان وەبەر چاو دێ.

***

بەر لە هێرشی سەددام حوسێن بۆسەر کووەیت لە ١٩٩٠دا کە هەڕەشەیەك نەبوو سەبارەت بە گیانی مرۆڤان بەڵکوو مەترسییەك بوو لەسەر هاوسەنگی نەوتی ڕۆژهەڵاتینێوەڕاست, دەوڵەتانی ڕۆژاوایی بۆ پاساو هێنانەوەیان سەبارەت بە پێشێل کرانی بە ئاشکرای مافی مرۆڤ لە لایەن سەددام حوسێنەوە لە شەڕی ئێران و ئێراقا, خۆیان بە باری نەزانیدا دەخست. هەتا ئەو دەم هیچکام لە لق و پۆپە جۆراوجۆرەکانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان تەنانەت ڕاگەیەندراوێکیان سەبارەت بە ڕەخنە گرتن لە کردەوەی هەڵە و دزێوی ئێراق نەدایەدەر, چ بگا بە زەخت خستنە سەری بۆ دەس هەڵگرتن لەکردەوەکانی, بەڵام وە سەر ئێراق گێرانی کووەیت لە لایەن سەددام حوسێنەوە لەپڕ دژ کردەوەی کۆمەڵی نێونەتەوەیی وەخۆ

---

سەرۆکایەتی منا." هەر دەتگوت مێژووی دوور و درێژی پێوەندی نێوان کوردان و ئێراقییەکان بەرپرسایەتی ئەم جینایەتانەی لە ئەستۆ دادەماڵێ!

خست و ئەم کۆمەڵە لەناکاو سەرنجی کەوتە سەر پێشێل کرانی ڕوون و ئاشکرای مافی مرۆڤ لە ئێراقا و لەم بابەتەوە بە توندی و دەقودۆغر ئێراقی مەحکووم کرد، ئەم مەحکووم کردنانە دوا بە دوای تەمایەك بوو کە کۆمەڵی نێونەتەوەیی بە مەبەستی سەقامگیر بوونەوەی حوکم و دەسەڵاتی خۆی بەسەر نەوتی ڕۆژهەڵاتی‌نێوەڕاستا نواندی. باسی ئەو چاوپۆشییانەی نەکرد کە لە ڕابردوودا, لە ئاست چەوساندنەوەی ئاشکرای خەڵك, بەتایبەت ئەم زوڵم و ئازارەی ئاوقای خەڵکی کوردی کردبوونەوە, خۆی لێبواردبوون و ئاماژەی بۆ ئەم واتایە نەکرد کە هەر ئەم چاوپۆشییانە بوون کە سەددام حوسێنیان دنە دا وا بیر بکاتەوە لە کێشەی وەسەرخۆ گیرانی کووەیتیشا بێ‌ئەوەی ئارەقەی ڕێنیشێ لە گیرەکە قوتار دەبێ.

هەر کە کووەیت ئازاد کرا پێشێل کرانی ئاشکرای مافی مرۆڤیش لە ئێراقا فەرامۆش کرا. لە بڕیارنامەی مەنشووری شووڕای تەناهی‌دا, کە "دایکەی تەواوی بڕیارنامەکانە" و هەڵومەرجی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە بابەت ئاگربڕی ئاوریلی ١٩٩١دا دیاری دەکا, باسێکی ئەم گەڕیانە نەکرا. دەوڵەتی بووشیش بە مەبەستی کێشانی سەددام حوسێن بۆ پای مەحکەمە, بە تاوانی ئەنجام دانی کوشت و کوشتار و چەپەڵکاریی جەنگی و بەڕێوە بردنی سیاسەتی تۆوبڕکردن, مەیلێکی نەنواند, ئەگەرچی لە ماوەی پتر لە دەساڵاندا ڕێکخراوە چالاکەکانی مافی مرۆڤ پێشینەیەکی وردیان لە بابەت خاپوور کرانی گوندە کوردنشینەکان و کوشتاری بەهەڕەمە دەسدرێژی و زۆرداریەکانی تری حیزبی بەعس کۆ و ڕێك‌وپێك کردبوو.

بەڵام تەنانەت وێڕای سرنج دان بە پێودانەکانی ترس و خۆفی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست, سەددام حوسێن نیشانی دابوو کە لە ئاو و گڵێکی ترە. سەددام حوسێن لە یەکەم هەڵتەزینەوەی لە ١٩٨٣ لە بەرامبەر هێرشی شەپۆلی هێزی پیادەی ئێراندا کە بەرەکانی پێشەوەی ئێراقیان بەرەوڕووی مەترسی ڕووخان کردبوون, بە کەلك وەرگرتن لە گازە ژاراوییەکان یەکێك لە ئاخرین قەدەغە کراوەکانی سەربازیی جیهانی پێخوست کرد. دەیخەمەوە بیر کە ئێراق خۆی یەکێك بوو لەم سەت وڵاتانەی کە بەڵێن‌نامەی ساڵی ١٩٢٥ی ژنێڤی لە بابەت بەربەست کرانی کەلك وەرگرتن لە

چەکە شیمیایییەکانەوە مۆر کردبوو – ئەم چەکانە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا خەڵکێکی زۆریان تێدا برد. بەڵام بەڵێنی ئەوتۆ بۆ سەددام حوسێن هیچ بایەخێکیان نەبوو, بەتایبەت لە بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنانی ناوچەیی دا.[1] هەر ئەو وەخت ئەیالەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئێراقی لەبەر کەلك وەرگرتن لە چەکە شیمیایییەکان مەحکووم کرد – و سێ ساڵ دواتر ئێران و ئێراقی وێکرا – بەڵام هیچی تری نەکرد. وا دیارە بوو کە ڕژێمی ئێراق ئەم هەقەی دەدا بە خۆی کە بۆ پێش گرتن لە سەرکەوتنی ئێران لە بەرەکانی باشووریی و ناوەندیدا دەس بۆ هەموو ئامراز و کەرستەیەك بەرێ.

بەڵام لە ١٩٨٨دا دیار بوو کە بێ ئەملاوئەولا ڕووپەڕی شەڕ بە زەرەدی ئێران هەڵگەڕاوەتەوە و بەرەی کوردستان پڕ لە هەموو وەختان شانۆیەکی لا دەستەیە. بەڵام لە گۆڕا نەبوونی هەر چەشنە دنە و بیانوێکی بەرچاویش بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی بەرگێڕەوەی سەددام حوسێن بێ لە بابەت کەلك وەرگرتن لە چەکە شیمیایییەکان بە دژی کوردان.

لەو باس و خواسەدا سەددام حوسێن بە بەربڵاوترین و خۆفناکترین شێوە لە کوردستان دەستی برد بۆ چەکی شیمیایی – ئەویش بە دژی خەڵکی لاشەڕی ئاسایی کورد, نە جارێك و دوان بەڵکوو گەلێجار. یەکەم هێرش بەم چەکانە لە ئاوریلی ١٩٨٧دا ئەنجام درا؛ لە ماوەی ساڵونیوێکدا حکوومەتی سەددام لانیکەم شێست گوندی کوردانی بە خەیاڵێکی ئاسوودە و بە بێترس لە سزا دران بە چەکە شیمیاییکان پەلامار دا و ئێمە قەت تێیناگەین کە بەرپەرچ نەدانەوەی دەوڵەتانی دەرەکی هەتا کوێ بۆ دنەدانی ئەو سەبارەت بە درێژەی ئەم هێرشانە شوێندانەر بوون.

---

١– کێنێت تیمرمەن لە ژمارەی ڕێکەوتی ٢٠ی ژانویەی ١٩٩٦ی نیوریپابلیكدا نووسی: "بە گوێرەی سەندەکانی پێنتاگۆن و ئەم بەڵگانەی لە ئێراقییەکان وە دەس هاتوون سەددام حوسێن دەستووری دابوو بە هێزەکانی بەرەوەی بەرەکان بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ هێزەکانی هاوپەیمان بە جڵەوکێشی ئەمریکا کەلك لە چەکە شیمیایییەکان وەربگرن, بەڵام سەرکردەکانی ئەم فەرمانەیان بەڕێوە نەبرد.

ئاخرییەکەی دەوڵەتانی ڕۆژاوایی ناچار بوون هەڵتەزنەوە و ئەوەش وەختایەك بـوو کـە لـە ١٩٨٨دا ئەم شێستهەزار کوردەی لـە بەر پەلاماری شیمیایی ئێـراق ڕایـانکردبوو, ترساو و تۆقیوو سنووریان پەڕاند و چوونە "خاك"ی تورکیاوە. ئەم دەوڵـەتانـە تەنانـەت ئەو دەمیش, کە تامەزرۆی ڕاگراتنی بازاڕە بە خێروبێرەکانی ئێراق بوون بۆخۆیـان, بـە دەمڕاستی سەددام دەستیان کرد بە ڕیس وگـوریس هێنانـەوە و گوتیـان بـەڵێ چـونکە "بەڵێننامەی ژنێڤ بە ڕوونی باسی بەربەستکرانـی کـەلك وەرگرتنـی لـە چـەکە شیمیایییەکانی بە دژی خەڵکی دەوڵـەتی بەڵێنـدەر نـەکردووە" کـوردان نـاتوانن بـە شێوەی قانوونی دژی حوکماتی بەغدا سکالاّ بکـەن. ئـەم بێدەنگییـە جیهانییـە لـەگـەڵ هەڵوێست و سیاسەتەکانی مەیلەو ئێراقی ولاّتانی ڕۆژاواییش زۆری یـەکتر دەگرتـەوە: مەترسی ئێرانی شۆڕشگێڕ بۆ سەر نـەوتی ڕۆژهـەلاّتی نێوەڕاسـت و نەشـەمزانی بـاری ڕامیاری ولاّتانی ناوچە — کە زۆری قسە لـێکراوە — و هەبوونی ئێراق وەك لـەمپەر و بەرگرێك لـە بەرامبەر ئێرانی بنیاتـخوازدا, پاساوی بۆ وە پاش گوێ دانی دەسـدرێژی و زۆرکارییەکانی سەددام حوسێن دێنایەوە. بە پێی ئەم بەڵگە و بۆنانـە کۆمـەڵی جیهـانی پێـشتر ڕاوێـژی پـڕ نارەزامەنـدی خـۆی سـەبارەت بـە ئەسـتوور بـوونی پەروەنـدەی نەپاراسـتنی مـافی مـروص لـە ئێـراق و کـەلك وەرگرتنـی ئـەم ولاّتـەی لـە چـەکە شیمیایییەکان بە دژی هێزەکانی ئێرانی, بردبۆوە سەر بارێکی نەرم و هێدیتـر.

ئەو دیپلۆماتانەی کە بە بێوشوێنی ڕووداوەکانی ئێراقەوە بوون, تەواو لـێیان سـوور بوو کە سەددام حوسـێن سـزادانێکی تونـد و تیـژ و یەکدەسـت بـە سـەر چـەکدار و بێچەکی کوردا, لـەبەر هاوبەندییان لـەگەڵ ئێراندا دەسەپێنێ. ویلیام ئێگلتۆن, کە ئەو زەمانی یەکێك لـە کارناسانی دەگمەنی کوردستان بوو, لـە ١٩٨٦دا بو پێشبینـــــــی تەفروتونا کردنی دڵڕەقانەی کومەڵی کوردی ئێراق, واتەی "تۆوبڕ کردنی فەرهـەنگی" دەکار کرد, چونکە ئەو وەختەی کە سەددام حوسێن دژی ئێران دەستی برد بۆ چـەکی شیمیایی و بێ ئەوەی گەردی لـێبنیشێ بۆی قوتار بوو, زۆر وێدەچوو هـەر وەختایـەك بارودۆخی نیزامیی ڕێگا بدا ئەم چەکانە بە دژی کوردانیش بـخاتە گەڕ. هۆکارێـك بـە ناوی "نەخافڵ گرتن" لـە گۆڕا نەبوو: کوردان هەرکەسێك گوێی بۆ قـسەکانیان کلـۆر

دەکرد, پێیاندەتگوت کە ئینگلیسی, هولەندی, فەرانسەوی, ئەلمانی, ژاپۆنی, ئیتالیایی و سویسییەکان کەرستەی وایان داوەتە دەس ئێراق کە توانیویەتی ئەم کارخانە بە رواڵەت بێ زەرەر و ئازارانەی ژاری جرِوجانەوەرکوژ بەرهەم دێنن، بکاتە کارخانەی بەرهەم هێنانی چەکی شیمیایی.

چەکە ژاراوییەکان جگە لە ترس و تۆقینێکی دەیانخستە دڵی کوردانەوە و ئەم مەرگ و نەخۆشییانەی بڵاویان دەکردەوە, زۆریش بە هەرزان ساز دەبوون و یەگجاریش کاریگەر بوون. لەمێژ ساڵ بوو کە کوردان وەك شەرِکەرانی ترسێنەر ئاوازەیان دابۆوە و چ لە شەرِ و لێکدانی چکۆلە و چ لە شەرِ و لێکدانی گەورەدا زەبر و خەساری قورسیان لە هێزەکانی عەرەب دابوو. بەڵام کەڵك وەرگیران لە چەكوچۆڵی شیمیایی بە دژی خەڵکی ئاسایی زۆر برِستبرِ بوو و هێزی پێشمەرگە تابشتی نەدێنا. چەند رۆژ پاش پەلاماری شیمیایی ئێراق لە مانگی ئووتی ١٩٨٨دا, مەسعوود بارزانی فەرمانێکی دا کە لەو فەرمانەی وا سێزدە ساڵ لێرەوبەر باوکی دابووی و بە گوێرەی ئەو ماڵاوایی لەگەڵ چەك کرد بوو, هیوابرِتر و تێکرِووخێنتر بوو. لەم پەیامەدا هاتبوو: "هەمووشتێك تەواو بووە: شۆرِش کۆتایی پێهاتووە." واتای ئەمە خۆ بە دەستەوە دان بوو, یانی ئەگەر کرابا بەم خۆ بە دەستەوە دانە ژیانی خەڵکی ئاسایی پارێزرابا: "ئێمە ناتوانین بە دەستی بەتاڵ لەگەڵ چەکە شیمیاییەکان بەربەرەکانی بکەین ... ناتوانین درێژە بە شەرِ بدەین."[1] بەڵێ دەس بردن بۆ چەکە

---

١- باڵادەستانی پارتی دێموکراتی کوردستان ئەودەم وایان قەبڵاند کە ٤٣٠٠ کەس لەم کوردانەی هەوڵیان دەدا خۆیان بگەیەننە سنووری تورکیا کوژران, ٢٤٠٠ کەسیان کە زۆربەیان ژن و زارۆك بوون لە نیزیك گوندی کانیماسی کوژران. من خۆم کوردم دواندن, گوتیان هێزەکانی ئێراقی ناوچەیەکی بەربڵاویان گەمارۆ دابوو و لە ئاکامدا تەنیا کەسانێك توانیان بە سلامەت خۆیان قوتاربکەن و بگەنە سنوور کە کەوتبوونە باکووری هێڵی گەمارۆ.

٢- "سیا" ژمارەی کوژراوانی ئێراق بە ١٥٠٠٠٠ تا ٣٤٠٠٠٠ کەس, یانی کەمتر لە تەلەفاتی ئێران دەقەبڵێنێ. بە گوێرەی قەبڵاندنی "سیا" کوژراوی ئێران لە مابەینی ٤٥٠٠٠٠ تا ٧٣٠٠٠٠ کەس هاتۆتە ژمار؛ کوژراوی ئێراق بە پێی رێژەی جەماوەر هێندێك لە سەرێیە, چونکە جەماوەری ئێراق نیزیك سێیەکی جەماوەری ئێرانە.

شیمیایییەکان پاش برانەوەی شەڕی ئێران و ئێراق,[٢] بە مەبەستی کۆتایی هێنان بە شڵەژاوی کوردستان تا ئەم ڕادەیە بە کەڵك بوون: خەرجێکی وایان هەڵنەدەگرت و ئەگەری تێدا چوونی هێزەکانی خۆییش لە گۆڕا نەبوو.

سەددام حوسێن هەروەها بە دروستی لێکی دابۆوە کە دەکرێ گومان و پارێزی ئەخلاقیی کۆمەڵی نێونەتەوەیی بە بەهرە وەرگرتن لە تامەزرۆیی وڵاتانی جیهان بۆ بەشدار بوون لە بە قەباڵ هەڵگرتنی سازکردنەوەی ئەم وڵاتە پڕ نەوتەدا – کە لەم ڕووەوە دەکەوێتە دوای عەرەبستانی سعوودی – بەربەس بکرێ. لە ڕاستیدا لە ئووتی ١٩٨٨دا دەوڵەتی تورکیا گەلێکی بەڵگە و بۆنە دەربارەی قوربانیکراوانی گازە شیمیایییەکان بە دەستەوە بوو کە لە نەخۆشخانە و دەرمانگاکانی کەوتبوون, بەڵام لە ترسی ڕەنجاندنی بەغدا وای بە باش زانی کە لەم بابەتەوە متەق نەکا: تورکیا دراوسێیەکی خەسارمەند بوو, چەند میلیارد دۆلار بە ئێراق قەرزدار بوو و لە جبەخانەی ڕووەو ئاوسانی ئێراق, بەتایبەت لە مووشەکی زەوی بە زەوی ئەو زۆر تۆقیبوو.[١] کۆمەڵی عەرەب کە بەرەوڕووی بەڵگە و بۆنەی کەڵك وەرگرتنی ئێراق لەم چەکانە ببۆوە "هاوپشتی تەواوی" خۆی بۆ ئێراق ڕاگەیاند, کە ئەم مەبەستە خۆی لە خۆیا ڕەنگدانەوەی بە چاوسووکەوە ڕوانینی ئەندامانی کۆمەڵەکە بوو سەبارەت بە هەموو شتێکی سەر بە کەمینەکانی غەیرە عەرەب و ترس لە تۆڵەی سەددام حوسێن.

---

١– سێ پزیشکی ئەمریکایی کە توانیان لە دیاربەکر و ماردین پەنابەران موعایەنە بکەن گوتیان کە ڕاستەوخۆ چاویان کەوتووە بە چەند بابەتی ڕوون و ئاشکرای پێکەوەنووسانی سیپەلاك و خەساری سەرپێست. "وال ئیستریت ژورنال, ژمارەی ڕێکەوتی ٢٠ی سێپتامبری ١٩٨٨." بەڵام پاشان کاربەدەستانی ترك بۆ بەرگری لە دەس وێڕاگەیشتنی ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی و سێ پزیشکی ئەمریکایی "نوێنەرانی ڕێکخراوەکانی پاراستنی مافی مروص" و پزیشکانی خاچی سووری تورکیا و تەواوی ئەوانەی بە پەنابەرانی تر ڕادەگەیشتن, ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دا. کاربەدەستانی ترك هەروەها کۆششیان کرد دەستی هەواڵنێرانی ترك وەو دوکتۆرانە ڕانەگا و زانیارییەکی هەڵەیان سەبارەت بە دامەزران و شوێنی بنەگر بوونی تاقمێك لە پەنابەرانیان وێ دان و لەسەر سنوور بەریان بە موعایەنەی پزیشکی گرت. "ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی" لەم بارەوە بەیاننامەیەکی دایە دەر و نارەزامەندی خۆی سەبارەت بەم کردەوە ڕاگەیاند.

تەنیا ئەیالەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو کە بە ناچار دەنگی هەڵبڕی: جۆرج شووڵتس، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا گوتی کە کەلك وەرگرتنی ئێراق لەم جۆرە چەكوچۆڵانە "کردەوەیەکی ناپەسند و بێزبزوێنە." دەوڵەتی ڕێگان بە شێوەیەکی تێژتێپەڕ ئاماژەی کردە ئەم زانیارییانە کە بە هۆی گوێ هەڵخستن لە پەیامە ئاڵوگۆڕ کراوەکانی مابەینی کارگێڕانی سپای ئێراق وە دەستی هێنا بوون، کە باسی بلۆق دانی لەش و سەرەگێژە و خۆف و خەیاڵاتی برینداران و بەر هەڵمەتکەوتوانی گازی شیمیایییان دەکرد.[1] بەڵام سەرەڕای تەواوی ئەمانەش دەوڵەتی ڕێگان لەبەرامبەر کردەوەی تەمبێیانە لەبەر ئەم "شەڕە تۆوبڕکەرانەیە" و بڕین و نەدانی سەدان میلیۆن دۆلار دەسقەرز بە سووتی کەم و هەڵگرتنی دەستەبەر بوونی ماڵیی کە لە مەجلیسی پیراندا بەرباس بوو، دژایەتی نواند. دەوڵەتی ڕێگان کە دڵپەرۆشی ئەمە بوو نەکا وڵاتانی تر لە سازکردنەوەی ئێراقی پاش شەڕا گەلێ قان و دەرفەتی بازرگانێتی پڕ قازانجتر وە دەس بێنن، هەر کە ئەم گەڵاڵەیە لە کۆنگرەدا نێژرا، پشووی هاتەوەبەر.

من زۆر جاران سەرم سوڕماوە و لە خۆم پرسیوە تۆ لات وایە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی دەرەوەش لەم هاوهەنگارییە شوێندانەرەدا کە لە گەڕیانی کەلك وەرگرتن لە چەکە شیمیاییەکان بە دژی کوردان وەك پیلانی بێدەنگیی دەچوو، تاوانبار نەبوون؟ من بە داخەوەم کە بڵاڤۆکانی ڕۆژاوا نەیانتوانی بۆ خڕ هەڵدانی دژ کردەوەیەکی بەجێ لەم بوارەدا سەرکەوتنێکی ئەوتۆ وە دەس بێنن. لێپرسراوانی کورد چەند حەوتە پاش پەلامارە شیمیاییەکانی ١٩٨٧دا مەبەستەکەیان بە من و هەواڵنێرانی تری دەرەکی گوت و ئێمەش ڕەوتی ڕووداوەکانمان وەك خۆی کردە ڕاپۆرتەهەواڵ. بەڵام بڵاڤۆکانی دنیای عەرەب، جگە لە چەند هەڵکەوتی زۆر دەگمەن، بەداخەوە نەیانوێرا

١– شیلا ئاویسترین، گوتەبێژی ئەو کاتی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە ئانکارا لە وتوویێژێکی تەلەفۆنی کە لە دێسامبری ١٩٩٣دا لە واشینگتۆن لەگەڵیا کردم گوتی ئەم هەڵوێستەیکە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ناچار گرتی تەواو بە گوێرەی ئەو گفتوگۆیانە بوو کە مێردەکەی لە ناوچەکانی نیزیك سنوور لەتەك هەواڵنێرانی غەوارە کردبوونی. شووی ئەم خاتوونە مایکێل ئاویسترین، خاوەن پلەی سیاسی باڵوێزخانە بوو.

خۆ لە قەرەی ئەم کارە بدەن. لە بیرمە لەم بارەوە سەرنووسەری یەکێك لە ڕۆژنامەکانی عەرەبم دواند کە دۆستایەتیم لە گەڵیا هەبوو؛ گلەییم لێ کرد کە نەیویستووە بە شێوەیەکی شیاو بەرەورووی ئەم کێشەیە ببێتەوە کە بە بڕوای خودی خۆشی گرینگ بووە. گوتی کە دەیزانی خاوەنی ڕۆژنامەکە پێی‌خۆش نیە شتێکی ئەوتۆ چاپ بکا. بەڵێ ... ئەوانەن جەغزی تەنگەبەری ئیشێکی ناتەواو.

کوردانیش خۆیان یارمەتی پێشکەوتی ئامانجی خۆیان نەدا. سەددام حوسێن بە نەدانی ویزا بە هەواڵنێرانی غەوارە و ڕێ نەدانیان بۆ وڵات, ڕێوڕاست کوردستانی ئێراقی لە دەس‌وێڕاگەیشتن دوور خستبۆوە. هەڵبەت ئاخرییەکەی هەواڵنێرانی ڕێ دایە وڵات, بەڵام نەیهێشت بچنە کوردستان و کوردان خۆشیان بە شێوەیەکی سەیر بێ‌کیفایەتییان نواند. مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی لەسەریەك لەسەریەك دەیانگوت و چەن‌پاتیان دەکردەوە کە ڕۆژاوایی‌یەکان و سۆڤیەتەکان گەلێکیان ئامراز و کەرستەی شەڕ داوەتە ئێراق و ئورووپایی‌یەکان کارخانەگەلی بەرهەم‌هێنانی ژاری جڕوجانەوەرکوژیان بە ئێراق فرۆتووە و هەر ئەم کارخانە "دوو مەبەستییانە" و بە ڕواڵەت بێ زیان و زەرەرانە, گازەکانی خەردەل و پیریت و تێکدەری مێشك و دەماریان کە دژی کوردان دەکار کراون, بەرهەم هێناوە. سەرنووسەرانی ڕۆژنامەکانی ڕۆژاوایی بە بێ دەس وێڕاگەیشتن وە ئێراق و ڕوون بوونەوەی ڕادەی ڕاستی و دروستی ڕووداوەکان, مەیلێکی ئەوتۆیان سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی ئەم گەریانە نیشان نەدەدا. ئەو کوردانەی کە وەختایەك – دە ساڵێك پێشتر – بۆ ئاودیو کردنی ڕۆژنامەنووسان بە شێوەی ناقانوونی لە سنوورەوە ئەو گشتە لێوەشاوەیی و لە کارزانییەیان لە خۆیان دەنواند, ئێستا بۆ پەڕاندنەوەی ئەم تاقمە لە کەوشەنی تورکیا و ئێران یان سووریاوە دۆش دامابوون. خودا لەو سەرە ئاگای لێیە من زۆر جاران لەم بارەدا لەگەڵ لێپرسراوانی کورد دمەتەقەم کردووە – و لەم بوارەدا من تەنیا نەبووم. بەڵام ئەوانیش گیروگرفتی خۆیان هەبوو. بۆ وێنە لە ١٩٨٧دا باشترین ڕێیەکی کە دەیانتوانی نیشانی منی بدەن ئەمە بوو کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریاوە بچمە

خاکی تورکیا و لەوێوە بچمە ئێراق. کارگێڕانی بارزانی لە دەمیشق خەت و کووزێکی لەبار و وردیان بۆ کێشامەوە کە دەراوی ڕووبارەکان و شوێنە مینڕێـــــژکراوەکان و مەتەریزی ڕەشاشەکانی نیشان دەدا و تەواوی ئەم ڕێگایەم دەبوو بە شەوێك بڕیبا. دڵاودڵم کرد. پیاوەکەی بارزانی گوتی: "لۆمەت ناکەم, خۆمان کە ئاخرین جار ویستمان لەم ڕێیەوە تێپەڕین سێ کەسمان لێ کوژرا."

لەوپەڕی ناهومێدیدا پێشنیارم کرد کە پێشمەرگەکان دە دوازدە دانە کامێرای ڤیدۆیی هەرزانبایی و تەنانەت کۆنەونوێ بکڕن و فیلمیان پێ لە ڕووداوەکانی کوردستان هەڵگرنەوە و پاشان فیلمەکان لە دەرەوە بڵاوکەنەوە. بۆ جووڵانەوەیەکی نەتەوەیی دەستکورتی وەك ئەم جووڵانەوە نەتەوایەتییەی کوردە کە هەر کات خەزێنەی لیپاولیپی ڕێکخراوی ڕزگاریدەری فەلەستین دەبینێ لە تاوان لیکاوی بە دەولەوسیدا دەێتە خوار؛ وەها پێشنیارێك لە لایەن ڕۆژاوایییەکی نەزان و نیازپاکی وەك من, پتر وەکوو ڕێچارەیەکی خەیاڵی و دەس وێرانەگەیو خۆی دەنواند. کوردان گوێیان نەدایە پێشنیارەکەی من. وە هەر حاڵ, تەنیا کۆمەڵە فیلمێکی کە لە زاماران و وەبەرهاتوانی پەلامارە شیمیایییەکان گەیشتنە دنیای دەرەوە, ئەم فیلمانە بوون کە ساڵێك دواتر هەڵگیرانەوە. لە مارسی ١٩٨٨دا, ئێرانییەکان هەوالنێرانی غەوارەیان بۆ هەڵگرتنەوەی فیلم لەم هەزاران کەسەی کە لە هەڵەبجە بە پەلاماری چەکی شیمیایی ئێراق کوژرابوون بردە ئەو شارە؛ دیارە ئەودەم بۆ ماوەیەکی کورت ئەوێ بە دەس ئێرانەوە بوو. گەلێك شریتی ڤیدۆیی هەمەچەشن لە گەڕیانی شۆڕشی کوردان لە ساڵی ١٩٩١دا لە دەزگاکانی زانیاری ئێراق بە خەنیمەت گیران کە تەرمی کوژراوانی پەلامارە شیمیایییەکان و هەروەها درێژەی چالاکییەکانی نیشان دەدا. ئەم شریتانەشیان زۆر نیشان نەدا, ڕەنگە لەبەر وەی کە زۆرێك لە کوردانیش لەم دەسوەشـــــاندنانەدا بەشدار بوون.

لە سەردەمی "گوندی جیهانی"دا ئومێد وابوو کە دیتنی شتێکی وەك کارەساتی هەڵەبجە خۆش خەیاڵترین کەسیش بێنێتە جواب و بیخاتە سەر دژکردەوەی توند و

بێپسانەوە. لانیکەم پاش ڕووداوی هەڵەبجە, جیهانی دەرەوە ئیتر نەیدەتوانی خۆی بخاتە سەر باری نەزانی و بێخەبەری. بەڵام ئەم شانۆ دزێوە بۆ چورتمیش کردنی سەددام حوسێن یا پاڵدانی ڕۆژاوا بە مەبەستی هەنگاو هاویشتنی پتر و دەباز بوون لە جەغزی بڵاو کردنەوەی ڕاگەیەندراوێکی لە قالبدروای کۆن بۆ مەحکووم کردنی وی ناتەواو بوو. تاقمێکی کەم لەم کوردانەی کە گەورەیی کارەساتی هەڵەبجەیان بۆ دەرکەوتبوو لە ڕووی سافیلکەیی خۆیانەوە هیوادار بوون کە دەنگدانەوەی ئەم کارەساتە لە دەرەوەی وڵات بتوانێ ببێتە پاڵپشتی پاشماوەی کوردانی ئێراق. ئەم جەماوەرە هەڵتەزینەوەی دەرەوەیان پتر لەوەی کە بوو دەنرخاند. سەددام حوسێن پێداگر بوو کە ڕووداوی هەڵەبجە کاری ئێرانییانە, بەڵام هێشتا پێنج مانگێك لەم ڕووداوە تێنەپەڕیبوو کە دژی کوردان دەستیدایە ئاخرین پەلاماری شیمیایی خۆی و لە ٢٥ی ئووتەوە هەتا ٩ سێپتامبری کێشا – یانی پاش تەواو بوونی شەڕی ئێران و ئێراق. ئەم هەڵمەت و پەلامارانە ئەوەندە لەزەبر بوون کە خەڵەفەمێشەکانی ئەوبەری سنوور – واتە هی کوردستانی تورکیا – شی ژاراوی کرد و مێشەنگوینەکانی کوشت. وای دەنواند کە سەددام حوسێن ئەنگوستی بەلای لووتییەوە ناوە و زارەخوارە لە کۆمەڵی جیهانی دەکا – هەر ئەو کۆمەڵە جیهانییەی شێلگیرانە هەوڵی دابوو بە دەسپێشخەری دیپلۆماتیك و یارمەتییەکانی پەنامەکی چەك و جبەخانە شەڕەکە بە قازانجی وی کۆتایی پێبێنێ.

بەڵام بۆ یەکەمجار دەستەیەك لە پێخوستکراوانی ئەم هەڵمەتە شیمیاییانە نەمردن و توانیان پاش چوونە تورکیا نەقڵ و نەزیلەی بەسەرهاتیان بۆ خەڵکی جیهان وەگێڕن: کۆمەڵی نێونەتەوەیی کە بەرەوڕووی شاهیدی دانی ئەم زامار و دەردەدارانە ببۆوە لەوپەڕی شەرم و شوورەییدا هێندێکی دەس پێکداسوو و ئاخرییەکەی بۆ مانگی ژانویەی ١٩٨٩ و بە مەبەستی داکۆکی لەسەر پاراستنی بەندەکانی "پەیمانی ژنێڤ" لە داهاتوودا, وڵاتانی بۆ کۆبوونەوە بانگهێشتن کرد. لەسەر پێداگری سەددام حوسێن، فەڕانسە کە پارێزەر و ڕاگری ئەم پەیمانە و میوانداری دانیشتنەکە بوو, تەنیا وڵاتانی سەربەخۆی بانگهێشتن کرد و بەم شێوەیە نەیهێشت کورد و ئێراقی بەرەوڕووی یەکتر

بنەوە. "تەها مـحێدینمەعرووف", یاریدەدەری سەرکۆمار و نوێنەری دەوڵـەتی ئێـراق لە کۆنفرانسی ١٩٨٨دا دانی پێدا هێنا کە ئێـراق لـە هەڵەبـجە دەسـتی بـۆ چـەکی شیمیایی بردووە, بەلاّم پاش ئاگربڕ کەلك وەرگیران لـەم چـەکانەی وە درۆ خـستەوە. لە ماوەی کۆبوونەوەی پاریسا, دەوڵـەتی فەڕانسە خۆی بۆ هیچ ئەگەر و پێشهاتێك شل نەکرد: لـە تەواوی ئەم ماوەیەدا کە کۆبوونەوەکە لـە لێواری چەپی ڕووباری سێن, لـە بنکـەی یۆنـسکۆ بـەردەوام بـوو، پێـشی نیزیـك بوونـەوەی نارەزامەنـدان بـۆ شـوێنی کۆبوونەوەکە گیرا. لـە سێپتامبری ١٩٨٨دا بە پەلـە چووبوومە تورکیا هـەتا سـەبارەت بە لێشاوی دەیانهەزار پـەناخوازی سەرلـێشێواو و تۆقیـو کـە لـە ترسـی هەڵـمەتـە شیمیاییەکان ڕایانکردبوو, ڕاپۆرت ئامادە بکەم. زۆربـەی برینـداران و بەرکـەوتوانی هێرشەکە کەوتبوونە دوای هێزەکانی ئێراقی یان بە هۆی بێتاقەتی و بڕستبـــــــڕان نەیانتوانیبوو خۆیان بگەیەننە ئەوبەری سنوور, بەلاّم چەند کەسێك گەیبوونـە تورکیـا. وێنەی یەکێك لـەم قوتار بوانەیان بـە مەبەسـتی فرۆشـتن پێنیـشان دام کـە بـە تونـدی تووشی خەسار هاتبوو هەر کە ڕووداوەکەم بە سەرنووسەری ڕۆژنامـە گـوت, نـاوبراو لەوپەڕی تەریق بوونەوەی منا لـە ئاست دانی ئەم ٢٠٠ دۆلارەی کە کـابرای فرۆشـەر داوای دەکرد سەری با دا, لـە حاڵێکا ڕەنگە من بە قەرا ئەم پووڵـەم وەختـی دمـەقرەم لـەگەڵیـدا بـە مەبەسـتی وە دەس هێنـانی ڕەزامەنـدیی لـەسـەر ئـەم کـارە خـستبێتە قودوولـەی تەلـەفۆنێکی ڕێیدوور کە دەوڵـەت لـە کوردستان دایناوبوو. گرنە و بیانووی سەرنووسەر ئەمە بوو کە شایەتی دانی قوتار بووان بۆخـۆی ئەوەنـدە هەیـە کـە حاشـا لـێکردنی لێکدالێکدای ئێراق بە گاڵتەجاڕ بنوێنێ و پێویست بە وێنە ناکا. بـەلاّم ئـەم سەرنووسەرە پیاوێك بوو کە ئەم شوێنەی دەخستە سەر مرۆڤ کە بۆ جەمی شـەو یـا نیوەڕۆ قەت ڕوو لـە خۆراکی گەرم وەرناگێڕێ و نێوانێکی خۆشیشی لـەگەڵ ئەم تونـد و تیژی و ترازان و لادانانەی ڕۆژهەلاّتیی نیە. بەلاّم خەتای خۆم بـوو. بێتـوو هێنـدێکم وریایەتی نواندبا و بە بێ ئیزنخواستن لـەو هەر ئەوکاتە ئەم وێنەیەم کڕیبا و ناردبامەوە, ئەو خوایینەخوایی بە گوێرەی کارتێکرانێکی کە دەیبوو لـەڕێوە چاپی دەکرد.

ئەم تەریق بوونەوە کاتێك بوو بە تووڕەیی کە دەوڵەتی ئێراق هەر وەك چاوەڕوان دەکرا, دەس‌بردن بۆ چەکی شیمیایی وە درۆخستەوە و داخوازی وڵاتانی بە مەبەستی لێکۆڵینەوەی بێلایەنانە لە وێنەدەری بردەوە پاش. بەغدا دەیگوت کە ڕێ دانی غەواران بۆ لێکۆڵینەوەی خۆجێیی دەسەڵاتی ئێراق دەخاتە ژێر پا و لە وەرسووڕانێکی شانۆیی‌دا ئیددیعاکارانی بۆ نیشان دانی سەنەد و بەڵگە جاڕ دا! دەکرێ بڵێین سەددام حوسێن لەم هەڵلایە بێ ئارەقە ڕێنیشتن دەرباز بوو. نیزیکەی دووسەت هەواڵنێریان بۆ دیداری کوردستانی ئێراق بانگهێشتن کرد:

ئەم تاقمەیان لە بازنەی گەشتوگەڕانێکی ڕێك‌وپێك‌دا گێڕا و وەك چاوەڕوان دەکرا تووشی بەڵگە و شاهیدێك لەسەر کەلك وەرگیران لە چەکە شیمیایی‌یەکان, نەهاتن. حکوومەت بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ تێیگەیاندن کە کارتێکردنی ڕووداوی هەڵەبجە – کە خۆی هەر وا تاوانەکەی دەخستە ئەستۆی ئێران – ئەوەندە لەزەبر بووە کە دەس بردن بۆ کەرەسەی شیمیایی بە دژی خۆنیشان دانی سەرشەقامان وای کردووە کە کوردان بتۆقن و ڕاکەنە تورکیا.

بەڵام تاقمێك لەم هەواڵنێرانە لەوپەڕی ترس و خۆفی چاوەدێرانیان‌دا تووشی هێزێکی نیزامیی بوون کە سەر تا پا خوار بە چەك‌وچۆڵی شەڕی شیمیایی تەیار کرابوون. چەند ساڵ دواتر بوو کە توێژینەوە و خوێندنەوە زانستییەکان کەلك وەرگیران لە گازی خەردەل و دژی دەماری لە لایەن ئێراقەوە بە شێوەیەکی مسۆگەر سوور کردەوە.[1]

---

١– ئەم ئەزموونەی کە لە ئەزموونگەی چەکە شیمیایی‌یەکانی "پورتێن داون"ی سەر بە هێزە چەکدارەکانی بریتانیا لە سەر خاك و نموونەکانی تر کرا, کە لە ئووتی ١٩٩٣دا کۆکرابوونەوە, هەبوونی توخمی سازدەری گازی خەردەل و دەماری سەلماند. ئەم نموونانە لە گوندی بیرجینی کۆکرابوونەوە کە لە ئووتی ١٩٨٨دا کەوتبووە بەر پەلاماری شیمیایی. گرین ڕابێرتس هەواڵنێری ناپیشەیی ئینگلیسی و کارناسی خاوەن پێشینەی کاروباری کوردستان لە ئۆکتۆبری ١٩٨٨دا لەگەڵ بەڵەدێکی کورد بە دزی لە سنووری تورکیاوە چووبووە ئێراق, بەڵام ئەزموونی پورتێن داون ئەو کات وەها ڕوون و ئاشکرا نەبوو.

لەگەڵ تەواوی ئەمانەشدا هەر ئەم تووشی یەکتر هاتنە هەڵکەوتەی هەواڵنێران و هێزێکی ئێراقی زۆر لەوە گرینگتر بوو کە ئەو کات نرخێندرا. ئەم چەند باڵوێزخانە رۆژاواییەی کە لە بەغدا بوون و هەمیشە گوێقولاغ و چاوەدێری وەها بەڵگە و بۆنەگەلێك بوون، قەت شتێکیان لەسەر ئەم مەبەستە گرینگە نیشان نەدا و بە پێچەوانەی بۆچوونی کوردان دەلیلەکەی ئەمە نەبوو کە هەوڵیان نەدەدا. نا، باڵادەستانی ئێراقی چالاکی و سەرکەوتنە سەربازییەکانی خۆیان لە کوردستان بە تەپڵعالەم دەکوتا و دەهۆڵ و زورنایان بۆ هەڵدەگرت و بۆ وێنە لەمەڕ ئەم دەس‌وەشاندنەوە باسی پۆستخانەیەك و مەڵبەندێکی گازی سروشتیشیان کرد، بەڵام هیچیان دەربارەی وردەکاری و شێوەی چالاکییەکەدا نەدەگوت و ئیزنی هیچ دیپلۆماتێکی غەوارەیان نەدەدا بچێتە باکوور و رووداوەکان بە چاوی خۆی ببینێ. بیانوێکی رەسمی بۆ ئەم رێگرتنەش پاراستنی خودی دیپلۆماتەکان بوو، چونکە کوردستان لەبەر هەنتەشی هێزەکانی ئێران و هێزەکانی پێشمەرگە شوێنێکی مەترسیدار بوو. بەم شێوەیە تەنانەت ئەو کاتانەی کە بە رواڵەت زۆریش ئارامی دەنواند کاربەدەستانی دڕدۆنگی ئێراقی پێوەند گرتنی غەوارانیان لەتەك هەر ئێراقییەك، بەتایبەت لەگەڵ هەر کوردێك، بەربەند دەکرد. لە وەها هەلومەرجێکا "سیا" تێماو و بێدەسەڵات بوو. سایری دەزگا زانیارییەکانی دەرەکیش لەوی باشتر نەبوون. دەس وە کوردستان راگەیشتنی بێ سەرێشە بۆ دیپلۆماتەکان بووزی نەدەخوارد و نەدەلوا: کوردستان ناوچەی پاوان و پارێزراو بوو و بێتوو وەزارەتی دەرەوە بە هەڵکەوت ئیزنی گەشت و گەرانی ناوچەی دێهاتەکانی کوردستانی دابا، پۆلیسی نەهێنیی دڕ و دەستەوستان، شوێنی لە دووی رەوگەی سەفەرەکە دەگێرا.

"ئیپریل گلاسپی"، باڵوێزی ئەمریکا لە ئێراق و "هی ڤوود رانکین"، یەکێ لەم دوو خاوەن پلانەی باڵوێزخانە کە سەرەدەریان لە زمانی عەرەبی دەردەکرد، لە پاش پەلامارە شیمیاییەکانی ئێراق لە گەریانی هەڵمەتی ئەنفالی ئووتی ١٩٨٨دا ئەوپەڕی تەقەلای خۆیان خستە گەڕ کە خۆیان بگەیەننە کوردستان و بزانن کە چی قەوماوە. چەند ساڵ دواتر گلاسپی لە واشینگتۆن پێیگوتم کە ئاخرییەکەی بە زەبری هەڕەشە

و بە بیانووی دیداری ئەم چەند ئەمریکایییەی کە لە شەریکەی ئەندازیاریی تێکەڵاویی ترك و یوگوسلاوی کە لەسەر سەدی "*بێخمە*" کاریان دەکرد توانی بچێتە کوردستان. بەرزایی تانجی دیواری ئەم سەدە هەشتاوشەش میترونیو بوو و بە مەبەستی دابین کرانی ئاوی پێویستی کشتوکاڵ و بەرهەم هێنانی کارەبا ساز دەکرا؛ بەڵام چاکییەکەی ئەمە بوو کە هەم شوێنەزای بارزانییەکان، یانی گوندی بارزانی وە ژێر خۆی دەدا و هەمیش بارزانییەکانی لە بادینان لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لە ڕۆژهەڵات و ناوەندەوە، لێكدادەبڕی. گلاسپی دەرهەڵبوو و هەڕەشەی کرد بێتوو ئێراقییەکان پێمل نەبن و نەهێڵن سەفەرەکەی بکا، کارگێڕانی باڵوێزخانەی ئێراق لە واشینگتۆن ئیزنیان نابێ بە ئازادی لە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هاتوچۆ بکەن. هەڵبەت دەیزانی ئەم قسەیە یانی ئەمەی کە تازە پیاوەکانی پۆلیسی نەهێنی ئێراق ئیدی ناتوانن بە ئازادی بە وڵاتا بخولێنەوە و هەڕەشە لە ئێراقییەکانی دانیشتووی ئەمریکا بکەن.

چوونە کوردستان هیچ بەم مانایە نەبوو کە ئینسان بێ‌گومان زانیاری وە دەس دێنێ، تەنانەت ئەگەر تووشی کەسانێکی ڕام و سەر بە فەرمانیش هاتبا کە وەفاداری حکوومەت بوون. ڕانکین لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ یەکێك لە سەرۆك هۆزەکانی سەر بە دەوڵەت دیداری کردبوو وەك "ماکەی خراپە" ناسرا. وتوویێژ کردن لەگەڵ دیپلۆماتێك بۆ هەر کوردێکی دی کردەیەکی پڕ مەترسی بوو. جارێکیان ئەم خاتوونە باڵوێزە توانی پۆلیسی نەهێنی چاوەدێری بخافڵێنێ و هێندێکی لێ‌دوور کەوێتەوە، بەڵام چاوەدێرەکە خێرا گەیشتەوە سەری. گلاسپی بە ترس و تۆقینەوە لە ئاوێنەی پێشەوەدا دیتی کە پۆلیسی نەهێنی کوردێکیان گرت کە ئەو تەنیا ئەوەندەی لێ‌پرسیبوو کە داخوا دەتوانێ لە کوێ هەنگوین بکڕێ. جارەکانی تر ناچار بوو کە بۆ بەراوردی ڕادەی گوندە خاپوور کراوەکان لە نێو ئوتۆمبیلەکەی خۆیەوە تەنیا بە خوێندنەوەی یادداشتەکانی ئە.ئێم. هامیلتۆن، ئەندازیاری نیوزلەندی، ڕازی بێ. ئەم ئەندازیارە هەر ئەو کەسەیە کە لە ماوەدای ساڵانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ لە سەردەمی

سەرپەرستێتی ئینگلستاندا یەکەم ڕێگای مەشهووری سەربازی بە ناوی "هامیلتۆن" لێدا کە بە کوردستانی ئێراقا تێدەپەڕی و هەتا سنووری ئێران ڕادەکشا.

تەنانەت چاوەدێرێکی بەئەزموونیش فریوی دەخوارد. عەبدوڕڕەحمان قاسملوو، ڕێبەری کوردەکانی ئێران کە بۆ هەڵسووڕان لە ئێراقا لەمپەری لەبەر نەبوو و تەنانەت دەیتوانی پێوەندی بە باڵوێزخانەکانی دەرەوەش بکا، لە ڕووی ئەم وتوویژانەی کە لەتەك کوردەکانی ئێراق کردبووی لێی سوور ببۆوە کە ئەم گازە شیمیایییەی وا ئێراق لە ئووتی ١٩٨٨دا لە کاری کردووە، گازێکی کوشندە نەبووە و هەر لە چەشنی ئەم گازەی فرمێسك بووە کە بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ خۆپێشاندانی شەقامان کەلکی لێوەردەگیرێ. دەوڵەت وەهای هەوساری کاران بە دەستەوە بوو کە لە ژوەنی ١٩٨٩دا قاسملوو بۆ ڕوون کردنەوەی ڕاستی و درۆی ڕاپۆرتی "تایمز"ی لەندەن کە دەیگوت سپای ئێراق ڕانیەی لەگەڵ خاك تەخت کردووە ناچار بوو بەرەو قوولایی کوردستان سەفەر بکا. دەرکەوت کە ڕاپۆرتەکە هەڵە بووە: ڕانیە زەق و زۆپ لە جێی خۆی چەقی بوو، شاری کاول کراو، بازێری "قەڵادزێ" بوو کە ٧٠٠٠٠ کەسی جەماوەر هەبوو.

خاتوونی باڵوێز (گلاسپی) گوتی لە مەودای سەفەرەکانیدا بۆ کوردستان، ئەو کوردانەی کە دیداری لە گەڵا کردوون بەرهەڵست بوون هەتا چۆنیەتی هەوڵ و تەقەلای خۆیان لە لای کاربەدەستانی ئێراقی بە مەبەستی بەرگری لە خاپوورکرانی گوندەکانیان بۆ وی بگێڕنەوە. لە هاوینی ١٩٨٩دا خاتوونی باڵوێز بە لە سایەی تۆپ و تەشەرانەوە خۆی گەیاندە بازێری ئامێدی، کە بازێرێکە هەڵکەوتوو لەسەر بەرزایی: شەوی هەینی بوو، چاکی بۆچووبوو، دەیزانی کە کاربەدەستانی ئێراقی ناوێرن ئەم موسافیرەی کە شەوی جومعە دەچێتە شوێنێك بە پێچەوانەی داب و نەریتی میوانگریی ئیسلامی لە شوێنەکە دەریبکەن. کەس ئامادە نەبوو کە پێی بڵێ چ قەوماوە، بەڵام یەکێك لە کاربەدەستانی شار لەسەر مێزی شێو گوتی: "دوو ساڵ بەر لە ئێستا ملوانکەیەکت لە ڕووناکایی گوندەکانی دراوسێ بە دەوری شارەوە دەدیت." خاتوونی

باڵویز تەنیا ڕووناکاییەکی دیتی ئی باڵەخانەی کۆشەکەکانی سەددام حوسێن بوو لە نیزیك سەرسەنگ. هەر ئەم کورتە باسە بۆ ئاگادار بوونەوە لە بارودۆخەکە بەس بوو.

خاتوونی باڵویز گوتی: "سەیر ئەمەیە کە هیچکام لەم کوردانەی من توانیومە چاوم پێیان بکەوێ چ شتێکیان سەبارەت بە کۆمەڵکوژی و پەلامار و هەڵمەت بە چەکی شیمیایی باس نەکرد." باوەڕ ناکرێ کە ئەمانە لە ڕووداوەکان بێخەبەر بووبن. داخوا ئەم کەسانەی کە خاتوونی باڵویز دواندبوونی تۆقیبوون لەمە کە بڵێن چ قەوماوە؟ داخوا جاش و سەر وە حکوومەت بوون؟ یان تەنیا کوردانی شارنشین یان کەسانێ بوون کە پێشتر لە شارۆچکەکانی "سەرکەوتن"دا نیشتەجێ کرابوون و بە شێوەی ڕاستەوخۆ نەکەوتبوونە بەر هەڵمەتی شیمیایی یا ڕاوەدوونان و گیران لە گوندان؟ ئەو کوردانەی بە مەیلی خۆیان لە باژێران دەژیان یا بە زۆری لە شارۆچکان پەستێورابوون لە پڵیشانەوە و تێداچوونی خولی ئاخری هەڵمەتەکاندا کە ئاوقای ئامۆزا گوندەکییەکانیان ببۆوە، بە سلامەتی قوتار بوون. خاتوو گلاسپی وە یادی دێتەوە کە لە دەسپێکی سێپتامبری ١٩٨٨دا، لە مەودای یەکێك لە خولەکانی لێبووردنی دەوڵەتی ئێراقا کە پاش هەڵمەتی ئەنفال ڕاگەیاندرابوو، لە سلێمانییەوە بەرەولای ڕۆژاوا سەفەری دەکرد؛ گوتی کە لە مەودای ئەم سەفەرەدا تووشی تاقمێك ژن و زارۆکی خەمباری پەرێشان هاتووە کە لە قەراخ ڕێگا لە تەنیشت کەلوپەلەکەیان وێستابوون. "پیاوێکیان لە بەینیدا نەبوو و من وای بۆچووم کە کارەبەدەستان بە ئانقەست ویستوویانە کە بیانبینم." سەددام کەسێك نەبوو کە ئەم چەشنە وێك کەوتن و تووشبوونانە بە دەست هەڵکەوت بسپێرێ. ئەو بنەماڵانەی کە پەرۆشی چارەنووسی کەس و کاریان بوون و دەیانویست هەرچۆنێك بێ خەبەرێکیان وە دەس کەوێ و سەر و سۆراغێکیان بکەن، لە بێهەواڵی و تەم و مژی دڵەڕاوکەدا ڕادەگیران. حوکمات بە لاسایی شێوەی کاری نازییەکان کە هەوڵیان دەدا پەردەیەکی لێڵ بە سەر چارەنووسی گیراوەکاندا بکێشن، بە ئانقەست باس و هەواڵێکیان وە دەس خاوخێزانەکانیان نەدەدا. بەڵگەیەکی بە خەنیمەت گیراوی ٢٠ی سێپتامبری ١٩٩٠, یانی پتر لە دوو ساڵ پاش

هەڵمەتی ئەنفال، نیشانی دەدا کە دەبێ ڕستەی "بە چارەنووسیان نازانین" لەگەڵ ڕستەی پێشوو کە دەیگوت: "لە گەڕیانی چالاکی سەرکەوتوانەی ئەنفالدا دەردەست کراون و ئێستا کە گیراون." جێگۆڕکێیان پێبکرێ.

بەم شێوەیە ئاگاداری هەم کەم بوو هەم زۆر. وێڕای تەواوی ئەمانەش هیچ کوردێك کە کەوڵی پووڵەسووتاوێك بێنێ باوەڕ ناکا کە دەوڵەتانی ڕۆژاوایی، بەتایبەت ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تەنانەت ئەگەر تەنیا قسەی کوردانیان کردبایە پێودان، لە ڕووداوەکانی کە لە کوردستان ڕوویان دابوو، بێخەبەر بووبن. تاڵەبانی سوێند دەخوا کە لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ واشینگتۆن لە ژوەنی ١٩٨٨، دەربارەی کەلك وەرگرتنی ئێراق لە چەکە شیمیایییەکان و تاپۆ کرانی گوندەکانی کوردستان زانیارییەکی لە ڕادە پێویستی داوەتە سێ کەس لە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و وێڕای ئەمەش ئەوانی لە چۆنیەتی وتوویێژی پێشووی لەگەڵ سەددام حوسێن ئاگادار کردۆتەوە و هۆی سەرنەگرتن و شکانی وتوویێژەکانی بۆ تەتەڵە کردوون، بەم هیوایەی کە بەڵکوو بتوانێ تەکانێك بداتە ئەم دەوڵەتەی کە لە باری ئەخلاقییەوە وەك بەردی لێهاتبوو، هەتا وای لێ بکا کە دەس بداتە لە قاودانی ئەم زوڵم و دەسدرێژییانەی دەوڵەتی بەغدا. تەلگرافەکانی باڵوێزخانە بۆ وەزارەتی دەرەوە – کە ئێستا لە ڕیزی بەڵگە نەهێنییەکان هاتوونەدەر و هەموو کەس دەسی دەیانگاتێیە – لە چوارچێوەی وتە و واتای زۆر بێجەمسەر و گشتیدا بەیان کراون، کە خۆی نیشانەی ئەم تەنگەژانەن کە دەکەونە سەر ڕێی سەلماندنیان و بە کردەوە زانیارییەکی پتریان لە بەیانییە ڕەسمییەکانی دەوڵەتی ئێراق تێدا نیە. لە تەلگرافێکی ڕێکەوتی ١٩ی ئاوریلی ١٩٨٨دا حیساب کراوە کە ١/٥ میلیۆن کەس کورد لە شارۆچکەکانی "سەرکەوتن"دا نیشتەجێ کراون و دەیانهەوێ شوێنی ٧٠٠ تا ١٠٠٠ گوند "وەگوێزن". مانگە دەسکردەکانی ئەمریکایی کە بەسەر ئێراقا دەفڕین ڕادەی ئەم خەسارەیان بە وردی دیاری دەکرد. (ئەو نەخشانەی کە لە گەڕیانی ڕزگار کرانی کووەیتا لە نێو هێزەکانی ئەمریکایدا بلاو کرایەوە، ئەم مەبەستە بە ڕوونی دەردەخەن. نەخشە هەڵگرانی نیزامیی ئەم خاپوورکرانە بەربلاوەی ناوچە گوندییەکان

لە لایەن سەددام حوسێنەوە بە دیاری کردنی گوندە ویران کراوەکان بە ناوی "خاپوور کراو" نیشان دەدەن.) "بە گوێرەی ڕاپۆرتەکان تاقمێکی نادیار بەڵام یەکجار زۆریان لە کوردان لــە ئۆردووگاکـانی لای سـنووری ئـۆردۆن و عەرەبـستانی سـعوودی مـرزەم کردووە." خودی باڵادەستانی کوردیش کە ئەوان سـەردەمان لــە فەرانـسە و سـووریا چاوم پێیان کەوت وێنایەکی ڕوونتریان لە چارەنووسی ئەم خەڵکە بـە دەسـتەوە نـەبوو. یەکێك لە پەیامەکانی تەلگرافی باڵوێزخانە لە ڕێکەوتی ١٥ی ئـووتی ١٩٨٨دا، یـانی بەر لە دەسپێکی ئاخرین کەلك وەرگرتنی ئێراق لە چەکە شیمیایییەکان دەڵێ: "ئێران و کوردان، ئێراقییەکانیان بە کەلك وەرگرتن لە چەکە شیمیایییەکان لــە هێرشەکاندا تاوانبار کردووە."

ئەو کات خەساری یەکجاری وڵاتی تەنیبۆوە و ئەویش چ خەسارێك! مـن گـەلێکم ناوچەی شەڕ لـێ کراو دیوە و تێیگەڕاوم، زۆر پتر لـەوەی کە وە بیریـان بێنمـەوە یـان تەنانەت بـمهەوێ کە بیانهێنمەوە بیر. بەڵام بەربڵاوی وێرانی و خاپوورکرانێکی کە لە کوردسـتانی ئێـراق دیتوومـە نیـشاندەری شۆڕوشـەوقێکە کـە سـەددام حوسـێن لــەم گەڕیانەدا نواندوویەتی. چاکم لە بـیرە کـە لــە ئۆکتـۆبری ١٩٩١دا بـە ئوتۆمبیـل بـە کوێرەڕێیەکی دۆڵی "جافایەتی"دا لە کوردستانی ئێراق تێدەپەڕیم و گوێم دابوویە وتەی کوردێکی مرچ و مۆنی ڕێنـوێنم؛ ئـەم بەڵــەدە بـیرەوەری و یادداشـتەکانی خـۆی وەك پێشمەرگەیەك دەێناوە بەر بیر و دەیگێڕاوە: ئێرە گوللـەباران کرابوو، برێـك پێـشەوەتر کەوتبووە بەر پەلاماری شیمیایی، پاشەکشەی تێکەڵ بـە تـرس و تـۆقین بـە کـوێرەڕێی مێگەلـەمەڕی کێوپاراندا کە دەچۆوە سەر ئەو تەپڵۆکەی تر. کابرای بەڵەد تەواوی ئەم شوێنانەی بە وردی نیشان دەدام. پایزی ئەو ساڵە لە دەرەوەی شاری هەولێر و دهـۆك و سلێمانی، هەموو شوێنێك جوقەواری لـێبڕابوو، جگە لە سەدان و سـەدان خێـوەت. ئەوانە خێوەتی ئەو کەسانە بوون کە ماڵ و حاڵی خۆیان لە بەهارا خـۆڕایی کردبـوو و ئێستا بە نیگەرانییەوە چاوەڕوان بوون هەتا بە خۆ نواندنی کەمترین مەترسـی دیـسانەوە بەرەو سنوورەکان تێیتەقێنن.

ئەندازیارەکانی سپای ئێراق، تەیار بە بولدزێر و تەقەمەنی، لە مەودای ساڵانی پڕ هەڵمەت و دەس‌وەشاندنا، لە شۆڕوشۆڕقێکی شێتانەی خاپوور کردنا، خانووبەرەکانیان تەخت کردبوو و لوولە ئاوەکانیان تەقاندبۆوە و سەری چاڵاوەکانیان سمیت‌ڕێژ و باخی لەبەریان خاشەبڕ کردبوو. بەلای خۆمەوە گوتم، تۆ بڵێی لە خاکی کوردستان، لە دەشتان، لە کەناری ڕووباران، لەسەر ئەم تەپك و کێوە ڕووتەن و بێداروردرەختانەدا، چەند کەسێکی ئەوتۆ لە چەشنی ئەم کابرا بەڵەدە هەبن کە زەینێکی وایان هەبێ و ئەم خەڵکە گوندەکییانە وەبیر بێننەوە یام خۆیان لە بیرگەی خۆیانا زیندوویان کەنەوە؟ مرۆڤ چۆن دەتوانێ، دێیەکی خاپوورکراو لە کاول و هەرەسی دەیان دێی وێران کراوی تر یا ئەم قەڵا بەردینەی بە دابی ڕووسی لە قەڵایەکی تر کە هێندێك ئەولاتر دەیبینێ لێك‌کاتەوە ؟

دەوڵەتی ئێراق لەوپەڕی تووڕەیی و ناڕەحەتیدا، بێ ئەوەی بیهەوێ خۆی وڵامی ئەم پرسیارانەی داوە: ئەم هەژدە تۆن بەڵگە و سەنەدە دەوڵەتییانەی کە لە مەودای ڕاپەڕینی مانگی مارسی ١٩٩١دا لە کۆلکەخانە و دەزگا جۆراوجۆرەکانی پۆلیسی نەهێنی حیزبی بەعس بە خەنیمەت گیرابوو، سەرچاوەیەك بوو لە بەڵگە و بۆنەی باوەڕپێکراو کە پەردەی لە ڕووی ئامانج و پیلان و ویست و کرداری دەوڵەتی ئێراق لا دەدا. هێندێك لەم بەڵگانە دەستیان لێ‌نەدرابوو، هێندێك شڕوپەتوور و تەپوتۆزاوی و بەشێکیش لە گەڕیانی هەڵمەتی کوردان بۆسەر ناوەند و یانە بێزراوەکانی بەعس و ئاگردرانی باڵەخانەکان تووشی خەسار هاتبوون. ئەم بەڵگانە لە سایەی هەوڵەکانی کومیتەی پێوەندییەکانی دەرەوەی مەجلیسی پیرانی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ڕێکخراوی چاوەدێری مافی مرۆڤ و هێزی ئاسمانیی ئەمریکا بە مەبەستی پارێزران ڕاگوێزرانە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بە ناوی بەڵگەنامەی ڕەسمی کۆنگرە لە "کۆلکەی بەڵگەنامەکانی میللی"دا ڕاگیران و ئێستا خەریکی وەرگێڕان و پێکگرتنیانن. ئەم بەڵگەنامانە ئەم مەبەستانە ڕوون دەکەنەوە کە لەمێژ ساڵ بوو ڕێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی گوتبووی و هیچکام لە وڵاتە ڕۆژاوییەکان گوێیان پێی نەبزووتبوو، هەروەها ڕاستی و دروستی ئەم وتوویژە دوور

و درێژانــە دەسەڵـــمێنن کــە کــوردان و ڕێکخــراوی چــاوەدێری مــافی مــرۆڤ و ڕۆژنامەنووسان لـە کوردستان کردبوویان. بۆ یەکـەم جـار لــە مێـژوودا، ڕژێمێـك لــە حاڵێکا کە هێشتا لـەسەر دەسەڵات بوو بە بەڵگە و بۆنەکانی خۆی پـەردەی لــە ڕووی چەپەڵکارییەکانی کە لـە بواری پێشێل کردنی مـافی مرۆڤـا ئەنـــجامی دابـوو، لا دەدا. بەغدا بە تێماوی ئەم بەڵگانەی وە درۆ خستەوە و گوتی هیچی ئی وی نـین و تـەواوی ساز کراون و لـەسەر کاخەزی نیشانەداری دەوڵەتی نووسراوەنەوە. بەڵام ئـەم وەرام و وە درۆخستنەوە چەن پاتانەی کە دەوڵەتی ئێراق زۆر جاران لـە بەستێنی دەسدرێژی بـۆ سەر مافی مرۆڤ دەریبڕیبوون ئەم کـەرەت بەتایبـەت بـە پـووچ دەرچـوو. بارسـتایی قەبەی ئەم بەڵگەنامانە کە نیزیك چاردە میلیۆن پەڕ بوو زانیارییەکی نوێی سەبارەت بـە کاغەزبازی سەرکوتێك دەدایە دەس کە هەتا ئێستا لـەمپەری ئەم حاشا لـــێ‌کردن و وە درۆخستنەوانە بوو.

دەستەی کارناسانی مافی مرۆڤ کە کاریان لـەسەر ئەم بەڵگانە دەکـرد، باوەڕیـان بەم مەبەستە هێنا کە ئەم کردەوانەی بە گوێرەی ئـەم بەڵگانـە کـراون دەگەنـە پلــەی "تۆوبڕکردن" و تەنیا کردەیەك نین کە وەك زوڵـم و جینایەتـەکانی شـەڕ یـان جینایـەت دژی مرۆڤایەتی بێنە حیساب. بەڵام "ناسکی و وردەکاری" مافی نێونەتـەوەیی جۆرێکـە کە دەبێ دەوڵـەتێکی تر دژی سەددام حوسێن شکایەت بکا هەتا بکرێ بکێـشرێتە پـای مێـــزی مـــحاکەمەی دادگــای نێونەتـــەوەیی لاهـــە. لـــە بڕیارنامـــەکانی ڕێکخـــراوی نەتەوەیەکگرتووەکاندا سەبارەت بە ئێراق نە ئەیالـەتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا و نـە هیچکام لـە وڵاتـانی ڕۆژاوایـی خوازیـاری وەهـا مـــحاکەمەیەك نـەبوون. لایـەنگرانی سەددام حوسێن لـە ئێراق و تەواوی وڵاتانی عەرەبی‌دا بێ‌شـك وەهـا کردەیـەکیان بـە "دادپەوەری سەرکەوتوان" مانا دەکردەوە. بەڵام پێشینەیەك لـەم بارەدا بە دەستەوە بوو، ئەویش کوشتاری ئەرمـەنییان. لــە سـاڵی ١٩١٩دا دادگـای نیزامیـی خـودی وڵاتـی تێشکاوی عوسـمانی لـە ژێر تەوژمی ئینگلیسییەکاندا ئەنـــــــدامانی ســـــــەرەکی و هەڵسووڕێنی خولی کوشت‌وکوشتار و بەرپرسی "تۆوبڕکردن"ی ئەرمەنییان و تـەواوی جینایەتـەکانی شـەڕیی کێـشایە پـای مێـزی مـــحاکەمە و مـەحکوومی کـردن. ئـەو

محاکەمانە "نیشانی دا کە بووز دەخوا و دەکرێ ئینسان چاوی لە دادگاکانی وڵاتی تێشکاو بێ کە تۆڵەی شەڕەنگێزی و چەپەڵکاری لەم ڕێبەرانە بستێننەوە کە سەردەمانی شەڕ بە دژی نەتەوەکانی تر کردوویانە."

ئەم بەڵگە و بەڵگەنامانەی بە دەستەوەن هاشایان لێناکرێ: توێژەران پەستاپەستا لە سەنەدەکانی سەر بە کۆلکەخانەی ناوەندەکانی سەرکردایەتیدا کە زۆر جارانیش گەلێك لێكدوورن دەگەنە بەڵگەی یەك چەشن. باشترین وێنەی ئەم چەشنە بەڵگانە، بەڵگەکانی سەر بەم یەکەم جارەن کە لە ئاوریلی ١٩٨٧دا دژی پارتیزانان و خەڵکی ئاسایی کورد لە چەکی شیمیایی کەلك وەرگیراوە و نیشانی دەدەن کە لە مەیدانی شەڕ چ شتێك ڕووی داوە. ئەگەر ئایەتوڵڵا خومەینی بەو کەللەڕەقییەی لە ئاست ڕاگرتنی شەڕ سەری با نەدابا و لە کوردستان تەوژمی زیاتر نەکردبا، زۆر وێدەچی عەلی شیمیایی ئەو فەرمانە توند و تیژانەی بۆ نەچووبا. لە وەختایەکی کەم مەترسیتر لەو کاتی, سەددام حوسێن بە هیچ چەشنێك ئامادە نەبوو دەسەڵاتی تەواو بداتە هیچ کەس، تەنانەت بە ئامۆزا تەکریتییەکەشی.

***

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٧دا تاڵەبانی پاش دڵاودڵییەکی زۆر ئاخرییەکی بەختی خۆی لە بەختی ئێران گرێ دا. ئەو کە خۆی زەمانێك لە سەردەمی مەلامستەفا بارزانیدا ببوو بە "جاش" و "یەکێتی نیشتمانی کوردستان"ی لەسەر کەلاوە و هەرەسی تێكشکانی سەرشۆڕانەی ساڵی ١٩٧٥ی ژێنێراڵ بارزانی ڕۆنا بۆوە, ماوەیەك بە توندی لەگەڵ کوڕانی بارزانی کەوتبووە شەڕ و ئەم تێکهەڵچوونانە خەسارێکی گەورەی لە هەردوولا دابوو. بۆیە پێکهاتن لەتەك پارتی دێموکراتی کوردستانی "بارزانی"دا ماوەیەکی زۆری خایاند. یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ماوەی شەش ساڵ شەڕی ئێران و ئێراقدا خۆی لە چوونە ڕیزی پارتی دێموکراتی کوردستان بۆ هاوکاری نیزامیی ئێران بە دژی ئێراق پاراست. (لە ڕاستیدا ساڵی ١٩٨٤ ڕێبەری یەکێتی نیشتمانی وتوویژێکی لەگەڵ بەغدا ئەنجام دابوو.) ئەم هەڵوێستەی تاڵەبانی جاری وابوو دەگەڕایەوە سەر پارێز کردن و کەڕەتی واشبوو دەچۆوە سەر ئەم چاوەڕوانییەی

کە ڕەنگە بتوانێ قانێك لە دەوڵەتی ئێراق وەربگرێ و بە هۆی ئەوەوە پارتی دێموکرات ڕاداتە پێوار. تاڵەبانی ئیددیعای دەکرد کە نوێنەری توێژی خوێندەوار و پەروەردە کراوی خەڵکی شارنشینە و لەگەڵ مافی "خاوەنێتی" بارزانییەکان لەسەر ڕێبەرایەتی تەواوی خەڵکی کوردی ئێراق یەکێتییەکەی دیکەیان لەگەڵ ئێران بە توندی دژایەتی دەنواند.

حەول و تەقەلاکانی یەکێتی نیشتمانی بۆ ئەوەی مامەڵەیەکی باشتر لە بابەت خودموختارییەوە لەگەڵ ڕژێم بکا بێئاکام مابۆوە. دژایەتی تورکیا لەگەڵ هەر چەشنە پێکهاتن و سازانێك لەتەك کوردەکانی دراوسێ — هەر واز لە کوردەکانی خۆی بێنین — وەزیری دەرەوەی ئەو وڵاتەی بە پەلە و بە پەیامێکی ئاشکراوە هەنارده بەغدا: دەوڵەتی ئێراق دەبێ وتوویژی سەبارەت بە خودموختاری نوێ لەگەڵ کوردان ڕابگرێ، دەنا تورکیا ئەم لوولە نەوتەی کە تەنیا سەرچاوەی بەرچاوی دابین کردنی دراوی بیانی ئێراق بوو دەبەستێ. (ئەم لوولە نەوتە هەروەها سێیەکی نەوتی پێویستی تورکیاشی دابین دەکرد و ساڵێ ٣٠٠ میلیۆن دۆلار داهاتی هەقی پێداڕۆیشتنی وێدەدا.)

ئەم هەڵسوکەوتە بەپارێزانەی تاڵەبانی لەگەڵ سەددام حوسێن تەواو بەجێ بوو: ڕێبەری ئێراق لەبەر یارمەتیدەرانی ئێران لە لایەن پارتی دێموکراتی کوردستانی ئێراقەوە بە مەبەستی گرتنی بنکەی حاجی ئۆمەران لەسەر بەرزاییەکانی زاگرۆس، لە ژووئیەی ١٩٨٣دا تۆڵەیەکی زۆر توندی لەم حیزبە کردبۆوە: تاقمێکی پێنج هەتا هەشت هەزار کەسی لە نێرەوەزانی بارزانی، کە هێندێکیان تەمەنیان لە دە ساڵ کەمتر بەڵام زۆربەیان پتر لە پازدە ساڵان بوون و هەروەها ٤٢ کەس لە خزم و کەسانی نیزیکی مەسعوود بارزانی دەردەست کرد: ئیتر کەس ئەم تاقمەی نەدیتەوە. مانگێك دواتر سەددام حوسێن ڕایگەیاند کە "ئەم تاقمە بە توندی سزا دراون و چوونە جەهەننەم." ئەمەش باس کردنێکی ڕەمزاوی بوو لەسەر چارەنووسی دەیان هەزار کوردی دی کە دواتر "بێسەروشوێن" بوون. وەك دیمان ئەم "تۆڵە ئەستاندنەوە لە بارزانییەکان" ڕووداوێکی تازە نەبوو.

قوربانییەکانی بارزانی ئیتر ئەو شەڕکەرە ئەفسانەیانەی پێشوو نەبوون. ژنان و منالآنی پاشماوەی بارزانییان لە ئۆردووگاکانی قەراخ ڕێوبانی سەرەکی وەك "قوشتەپە" یان گەورەڕێی نێوان هەولێر و کەرکووك نیشتەجێ کردبوون. هێندێك لە کوردان گەیشتوونە ئەم ئاکامە کە گیرانی سووك و سانای ئەم گشتە بارزانییە غەیرەشەڕکەر و بێتاوانە بەڵگەیەکی تەواوە لەسەر ئەمەی کە "داب و نەریتی شەڕکەرانە و نەبەزین"ی بارزانییەکان ئیدی وەکی ڕابردوو پتەو نەماوە. سووکایەتی لە هەمووان خراپتر دەسدانە خۆ فرۆشیی تاقمێك لە ژنانی لێقەوماوی بارزانی بوو. لە کۆمەڵێکی ئیسلامیدا کە کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی شەرم و شوورەیی, چارەنووسی ئەم ژنە لێقەوماوانە سەلمێنەری پەندێکی خۆفناکە کە سەددام حوسێن بەسەر ئەم خەڵکەی هێناوە و هەروەها چارەنووسی ئەم زارۆکانەی کە پاش ساڵی ١٩٨٣ لە دەرەوەی جەغزی ژن و مێردایەتی هاتوونە دنیا. زۆرێك لە پیاوانی بارزانی لە ئاکامی هەست بە سووکایەتی و سەرشۆڕی کردنا جامانای سووریان کە نیشانەی بارزانی بوونیان بوو فڕێ دا و چەشنی خەڵکانی هۆزانی تری کورد جامانەی ڕەشی ئاسایییان کردە سەر. کوردانی دی بێدەسەڵاتی و تێماوی ئەم خەڵکەیان بە چاوی خۆیان دەبینی.

ڕۆژی ناخۆشتر بەرێوە بوون, چونکە حوکمات بە ناچار کردنی کوردانی ئاسایی بۆ بەشدار بوون لە جینایەتەکانیدا شێوە توند و تیژەکانی دەسوەشاندنی هەتا پۆپە پێهەڵابرد. یەکێك لەم کوردانەی کە لە جوندێتی ڕایکردبوو و من بە هەڵکەوت لە ١٩٩١دا تووشی هاتم، نەقڵ و نەزیلەی باری ئەم گوناه و ئازارانەی بۆ ماوەی سێ ساڵان لەسەر ویژدانی پاپۆکەیان خواردبۆوە, بۆ گێڕامەوە. گێڕانەوەی ئەم سەربوردەیە تەنانەت بۆ غەوارەیەك باری لەسەر ئەو سووك دەکرد. ئەم کوردە لە ١٩٨٨دا ئەندامی ئەم تیپە بووە کە زۆر بە توند و تیژی دژی کوردانی هاوڕەگەزی کەلکی لە چەکی شیمیایی وەرگرتبوو. دەیگوت چاری ناچار بووە و لێکدالێکدا چەنپاتی دەکردەوە: "بێتوو فەرمانم بەرێوە نەبردبا لەرێوە گوللەباران دەکرام و کەسێکی تر لە جیاتی من ئەم کارەی هەر دەکرد."

جاشەکان ئەگەر وەها گوناهێکیان هەست پێدەکرد بە دەگمەن دەریاندەبڕی. زۆرێك لە عەشیرەتەکان — بۆ وێنە زێباری و سوورچی و برادۆستی — بە سەروبەرەوە لەم گەڕیانە وەردرابوون. ئەم تاقمانە لەم بابەتەوە خاوەن پێشینەیەکی دوور و درێژ بوون: هەر لە کۆنەوە بە دژی کوردان ببوونە خزمەتکار و ئیکلامکێشی عوسمانی و ئێران و ئینگلیسییان و عەرەبەکانی جێنشینی ئەم دوو ئیمپراتۆرییەتییە. بەلام ئەم مەبەستە ڕێی لەوە نەگرت کە عەلی کیمیاوی لە وتارێکی دوور و درێژیدا کە لەسەر شریت تۆمار کرابوو بلێ: "ئەگەر هەر بە قسەش وێچێ ڕەنگبێ کوردێکی باش لە نێو کورداندا هەڵکەوێ، ئێمە بە کردەوە تووشی ئەشتەکی ئەوتۆ نەهاتین." سەددام حوسێن سەرکردە جاشەکانی بۆ تەسەل کردنی جاشان پڕ دەکرد و هەوساری بە دەستەوە دەگرتن. ئەم جاشانە کەسانێ بوون کە بە مەبەستی خۆ بواردن لە خزمەتی سەربازی لە بەرەکانی شەڕی ئێران و ئێراقا دەچوونە ڕیزی "تیپەکانی یارمەتیدەر"ی سپای ئێراقەوە. ئەوانەی تازە دەهاتن بە دانی بەرتیل دەچوونە ڕیزی جاشەکان و لە شەڕ لەگەڵ پێشمەرگەدا دەبوونە کەوا سووری بەر لەشکر و گۆشتی بەر لوولە تۆپان لە هەڵمەتی سپادا بۆ سەر دێهاتە کوردنشینەکان بە تالانوبڕۆی ماڵ و سامانی دێهاتییەکان چاکەیان دەدراوە. کەلك وەرگرتن لە جاشان بۆ بەغدا سەرفەیەکی دیکەشی هەبوو، ئەویش ئەمە بوو کە سەرچاوەی دابین بوون و پەرەگرتنی هێزی پێشمەرگەی کەم دەکردەوە. هەروەها درێژ کردنەوەی وتوویژ لەگەڵ تالەبانیش زۆر بە قازانج تەواو بوو، چونکە "یەکێتی نیشتمانی کوردستان"ی کە دەسەلاتداری سەر سنوورەکانی ئێران و ئێراق بوو لە فڕە خست.

کاتێك وتوویژ لەگەڵ بەغدا بەرەوڕووی شکست بۆوە تالەبانی بە ناچار ڕووی کردە تاران و تاران لەڕێوە هەڵپێچا کە بە ناوی "وە دەس هێنانی سەرکەوتن" لەگەڵ پارتی دێموکراتی کوردستان ئاشت بێتەوە. ئێران بۆ کەم کردنەوەی تەوژمی سپای ئێراق لە باشوور، تەواو نیازی بە کردنەوەی بەرەیەکی نوێ بوو لە کوردستان. لەتەك ئەمەشا لە ئۆکتۆبری ١٩٨٧دا سەربازانی سپای ئێران و هێزەکانی پێشمەرگە پەلاماری دامەزراوە نەوتییەکانی کەرکوکیان دا و بە هەڵبواردنی "هێڵی سوور" ئەم کانگا

ئیستراتژیکەیان خستە مەترسی. لە ژانویەی ١٩٨٧دا جارێکی دی ئێران دەسی دایەوە پەلامارێکی دیکەی مێشکپرووکێنی شەپۆلی ئینسانی: ئەمجار ئامانجی پەلامارەکە "بوحەیرەتوسسوموك" بوو لە خوارووی ئێراق، کە ئاشکرا بوو ئاخرین هێرشی گەورەی سپای پیادەی ئێرانە؛ هەڵبەت ئەو کات هیچکەس شتێکی لەم بارەدا نەدەزانی. لەم وەختەدا کوردستان پڕ بوو لە ڕاکردوانی سپا و ئەم کەسانەی ناویان بۆ سەربازی دەرکەوتبوو و خۆیان بە دەستەوە نەدابوو و هەڵاتبوون و لە ئەشکەوت و ڕەندۆڵاندا خۆیان شاردبۆوە. عەلی کیمیاوی زۆر لەم بابەتەوە پەرۆش بوو، دەیگوت: "بە بێ ترۆمبێلێکی زرێپۆش ئێوە ناتوانن لە هەولێرەوە بچنە کەرکووك!" کاتێك لە مانگی مارسا سەرکردایەتی گرتە ئەستۆی، پێشمەرگە و هێزەکانی ئێرانی لە دوازدە سێزدە کیلومیتری ڕەواندز بوون، کە شارێکی گەورەیە لە باکووری کوردستان و لە سنوورەوە دوورە و پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە دۆڵی جافتی [جافایەتی] هەڵکەوتوو لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانی، خۆیان ساز دابۆوە.

هەر دوا بە دوای ئەوەی کە فەرمانی ژمارە ١٦٠ لە ٢٨ی فێوریەی ١٩٨٧دا لە لایەن سەددام حوسێنەوە ئیمزا کرا و بە پێی ئەو عەلی کیمیاوی دەسەڵاتی تەواوی درایە، ناوبراو سێ‌ودووی لەم دەسەڵاتە نەکرد و هەتا ئەوپەڕی پێهەڵابرد و کەڵکی لێوەرگرت. ئەم فەرمانە بە دوو بەڵگەنامەی گرینگی تر تەواو کرا کە وەك ڕێ‌وشوێنی کاری ڕۆژانەیان لێهات. یەکێك لەم دوو بەڵگەنامانە کە ڕۆژی سێی ژوەن درایەدەر لەمەڕ "ناوچە بەربەست کراوەکان"ەوە بوو – یانی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە – کە گەمارۆی کڕین و فرۆشتن و هات‌وچۆی لەگەڵ پاشماوەی خاکی ئێراق دەکەوتە سەر. (بە گوێرەی ئەم بەڵگەنامەیە) وا دانردرا بوو کە گوندەکان خاپوور بکرێن و دانیشتووەکانیان لە "شارۆچکەکانی سەرکەوتن"دا نیشتەجێ بکرێن. بە پێی بەڵگەنامەی ژمارە ٢٨/٣٦٥٠: "هێزە چەکدارەکان" دەسەڵاتیان هەبوو کە هەموو مرۆڤ یا گیانلەبەرێکی ئەم ناوچە بەربەست کراوانە بکووژن. ئەم ناوچانە سەر لەبەر "بەربەستن." بەڵگەنامەی دووهەم، بە ژمارەی ٤٠٠٨،

ڕێکەوتی ٢٠ی ژوەن دەستووری دەدا بە فەرماندەرانی سپا کە "لـە تەواوی ماوەی شەو و ڕۆژدا، نێوەنێوە و بە ڕێکەوت، بە تۆپـخانە و باڵـەفڕ و فڕۆکە ئەم ناوچانە بدەنە بـەر تۆپ و بۆمبا کە نیزیك هەزار دێیەکی دەگرتەوە و ئەوەندی دەتوانن ژمارەیـەکی زیـاتر بکووژن." بە گوێرەی ئەم بەڵگەنامەیە تەواوی ئەم کوردانـەی لـەم ناوچـە بەربەسـت کراوانە دەردەسـت کرابـان دەبوایـە لـە لایـەن دەزگـا زانیارییەکانـەوە بکەونـە بـەر هەڵپێچران و لـێ پرسینەوە و پاش دەرکێشانی زانیاری بە کەلك لێیان، کەسانی نێـوان پازدە هەتا حەفتا ساڵە ئیعدام بکرێن. سەرۆك جاشەکان – کە بە "موستەشار" مەنشوور بوون – بۆیان هەبوو ماڵ و سامانی بە تالانبـــراوی کـــوردانی دانیـــشتووی ناوچـــە بەربەستکراوەکان وەك گاگەل و مێگەل و ژن و چەکی سـووکی ئاوربـار, جگـە لـە چەکە قورسەکان و نیمچە قورسەکان بۆ خۆیان گل دەنەوە.

بە گوێرەی یەکێك لـە بەڵگەنامـەکانی جبەخانـەی فەرمانـەکانی ئەلـــمەجید کـە پەستاپەستا بە فەرمانی تازەتر دەئـاخنرا هـەر کوردێـك کـە لـە سـەرژمێری ١٩٨٧دا بەشداری نەکردبوو مافی ئێراقی بوونی لـێدەستێندرایەوە. جا چونکە تـەنیا کەسـانێك وەبەر سەرژمێری هاتبوون کە دانیشتووی ئۆردووگاکانی دەوڵەتی بوون، ئەم بەڵگەنامە باقی خەڵکانی تری کە لـە گوندان یان ناوچە بەربەست کراوەکاندا دەژیـــــان لـــــە خەڵکایـەتی ئێـراق دەخـست: "ئـەم خەڵکـە لـە "گەڕانـەوەدا بـۆ ڕیـزی گـەل" کەمتەرخەمییان کردبوو و هەر بۆیە وەبەر "ڕێوشوێنی زەرووری کەوتبوون." لـە مانادا بە ڕاوێژ و لێکدانەوەی جوانی حکوومـەت وە بـەر تێداچـوون دەکـەوتن. (کەمینـەی ئاسۆرییەکانی مەسیحی و کوردانی یەزیدی لـە خـۆوە پێـوە ببـوون. ئـەم خەڵکـە لـە سەرژمێریدا بە ناوی عەرەب خۆیان پاراستبوو و هەر ئەم خۆ لادانە ئەوانی لـە جەغزی "خەڵکی وڵات" دەرهاویشتبوو و زۆر بە زەرەدیان تەواو بوو. یەزیدییـەکان سـەرەڕای پاڕانەوەیەکی زۆر ڕێیان نەدرا بە ناوی کورد سەرژمێری بکرێن و بە گوێرەی ئەم هۆ و هۆکارانە وە بەر فەرمانی لێبوردنی سێپتامبری ١٩٨٨ نەکەوتن کـە تـەواوی کـوردانی دەگرتەوە و لـە ڕاستیشدا تەنیا دەهۆیەك بوو. ئەم فـەرمانی لێبووردنـەش یـەکێك لـەم زنـجیرە لـێخۆشبوونانە بوو کە دەیویست هانی ئەو کوردانە بدا بۆ گەڕانەوەی وڵات

كە ببوونە پەنابەری توركیا. كاربەدەستانی ئێراقی هەزاران ئاسۆری و كوردی یەزیدی كە لە توركیاوە گەڕابوونەوە لەسەر سنوور گرتیانن و قوڵبەستیان كردن و ئیتر كەس چاوی پێیان نەكەوتنەوە.)

عەلی كیمیاوی لە ماوەی شەش مانگ پاش هەڵبژێرانی، نازناوی خۆی وەرگرتبوو. لە ١٥ی ئاوریلی ١٩٨٧دا فڕۆكەكانی ئێراقی بار و بۆمبا شیمیایی‌یەكانی خۆیان لەسەر ناوەندەكانی سەركردایەتی پارتی دێموكراتی كوردستان و یەكێتی نیشتمانی كوردستان كە مەودایەكی زۆریان پێكەوە هەبوو، هەڵڕشت. ڕۆژی دواتر دێیەكانی شێخ وەسان و بالیسان، لە لای باكووری سلێمانی كەوتنە بەر پەلامار. ئەمە هەوەڵ پەلامار لە نیزیكەی ئەو شێست پەلامارە شیمیایی‌یانە بوو كە لە ماوەی هەژدە مانگی دواترا كرایە سەر ئامانجە غەیرەنیزامییەكان. خەڵكی ئەم گوندانە، یەكەم تاقمی كوردان بوون كە بەرەوڕووی هەوری ڕەنگاوڕەنگی گەواڵە كراوی گازە شیمیایی‌یەكان بوونەوە كە بۆنی سیر، سێوی گەنیو، سوورەگوڵ، نەعنە، گڕكە، خەیار یان عەتریان لێ‌دەهات. بەركەوتوان هەر خێرا تووشی ئاوسانی باتوو و مەمك هاتن؛ هێندێك هەر خوێن دەمیزتن و تاقمێك بە شێوەی كاتی كوێر بوون یا چاویان تارمایی بە سەركشا و كەوتە ڕەشكەوپێشكان یان زردكاویان لە چاو و دەم دەتكا. پێستی لەشیان ڕەش هەڵگەڕا یا بلۆقی دا. دەستەیەك لەڕێوە كەوتن و پاش ئەمەی كە بە توندی تووشی لەرز و سەرەگێژە یا پێكەنینی دەمارپرووكێن هاتن، مردن. ئەم چەشنە نیشانە و دیاردە بەرچاوانە هی ئەو گازە خەردەلە نەبوو كە بە لێشاو دەكار كرابێ، بەڵكوو دەگەڕاوە سەر دەس بردن بۆ هۆكارێكی شیمیایی دی بە ناوی "سارین" كە شوێنی دەكردە سەر دەمار و نازییەكان قەت كەلكیان لێ‌وەرنەگرتبوو.

لەو دوو دێیەدا كە باسیان كرا لە ماوەی كاتەژمێرێكا ١٢٠ كەس مردن و نیزیكەی ٢٠٠ كەسێك شەلوكوت بۆ تیمار كران لە پێشا ڕاگوێزرانە ڕانیە و پاشان هەولێر. لە هەولێر ئەم خەڵكەیان ناچار كرد كە بڵێن لە لایەن ئێرانەوە كەوتوونە بەر پەلاماری شیمیایی. بەڵام ئەمە هەروا نەبڕایەوە. دەزگای پاراستن بە زۆری سەرنێزە لە

نەخۆشـخانەی هەولێرەوە کە بۆ تیماری بلۆق و داپلۆخاوی ڕاگیرابوون، دەریکێشان و ڕایدانە بەندیـخانەی پۆلیسی نەهێنی. لەوێ پیاوەکانیان لە ژن و زارۆکان هـەڵاوارد و هەموویان بە بێ چاوەدێری دوکتۆر و خورد و خۆراك هەروا دەس بەسەر ڕاگرت. لێرە بەینی ٦٤ هەتا ١٤٢ کەس بە برینانەوە مردن، حەفتا کەسێکیان بە سواری ئوتووبووس لــە بەندیــخانە ڕاگــوێزت و ئــەوانیش وەك بارزانییــەکان ئیــدی کــەس چــاوی پێیــان نەکەوتەوە. پاشـماوەی ژنان و منالانیان لە دەشتی هەولێر بەرەڵڵا کرد تا هەرچـۆنێك بۆیان دەکرێ خۆیان بەخێو کەن. یەکێك لە فەرمانبەرانی مردووشـۆرخانەی شـارەوانی کە بە گوێرەی ئەرکی سەرشانی حیسابی مردوانی ڕاگرتووە کە زۆربەیان پـیر و زارۆك بوون، دەڵێ خۆی لە یەکێك لــە کاربەدەسـتانی بەشـی زانیـاری سـپای بیـستووە کـە گوتوویەتی: "ئەوانە ئاژاوەگێڕن ... هـەموویان ئاژاوەچـین. ئێمـە بـە چـەکی شـیمیایی پەلامارمان داون."

وەها دەقودۆغربێژییەك شتێکی نائاسایییە، چونکە باسوخواسـی چـەکی شـیمیایی بە شێوەی ڕەســمی بەربەنـد کرابـوو. بـەڵام دەی، هەڵــەش دەکـرێ و بـە دەگمــەن بەڵگەنامە بە خەنیمەت گیراوەکان بە ئاشکرا باسـی "پـەلاماری شـیمیایی" یـا تەنانـەت "چەك و تەقەمەنی تایبەت" دەکەن کە ناودێر کردنێکی جـوانی گـازە ژاراوییەکانـە لــە لایەن حوکماتەوە. عەلی کیمیاوی لە وتارێکی تۆمـار کـراوی لەسـەر شـریت ئامـاژە دەکاتە ئەم یەکەم پەلامارە شیمیاییییە و پێشنیارە بێهوودەکەی تاڵەبانی کـە گوتوویـەتی ئامادەیە دەس لە هاوکاریی ئێران هەڵگرێ بـە مـەرجێ کـە دەوڵـەت خـاپوور و تـاپۆ کردنی کوردستان ڕابگرێ. تاڵەبانی ئەم ڕاسپاردەیەی بە دوو ئەفسەری پایەبـەرزی بـە دیل گیراوی ئێراقیدا بۆ خودی سەددام حوسێن نارد. عـەلی کیمیـاوی لــەم شـریتەدا دەڵێ: "تاڵەبانی داوای لــێ کردم لەگەڵی بکەومە وتوویژ. من هەر ئەو شەوە چوومە سلێمانی و ئەوانـم بە چـەك و تەقەمـەنی تایبـەت پـەلامار دا." لــە شـریتێکی دیکـەدا دەقودۆغر بە کۆمەڵێك لە جاشەکان دەڵێ: "من ناتوانـم دەس لــە گوندەکـەی ئێـوە بپارێزم، چونکە نازانـم ئەگەر بە چەکی شیمیایی پەلاماری بەرمێ چ دەقـەومێ ... کـە

وا بێ خاوخێزانتان قڕ دەبن. ئێوە دەبێ هەر ئێستا لەوێ باركەن، چونكە نازانم كەنگێ دەیدەمە بەر هەڵمەتی شیمیایی."

لە مابەینی ٢١ی ئاوریل و ٢٠ی ژوەنی ١٩٨٧دا مەجید پتر لە ٧٠٠ گوندی كوردستانی كە زۆربەیان كەوتبوونە جەغزی دەسەڵاتی حكوومەت و لەسەر شارێیان هەڵكەوتبوون، تاپۆ كرد و تەنیا نیازە سەربازییەكان لە شوێنەكانی دیكە بوونە هۆی ڕاگیرانی هەڵمەت و بەرێوەنەچوونی گەڵاڵەیەك كە بە گوێرەی ئەو قەرار وا بوو هێرش بۆ سەر ناوچە بەربەست كراوەكانی ژێردەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە بگاتە سەرەنجام. بەڵام هەتا ئەو كات عەلی كیمیاوی ئەزموونی كەلك وەرگیران لە چەكە شیمیایی‌یەكانی بە دژی خەڵكی ئاسایی و بێسەروشوێن چوونی نێرەوەز و كۆچ پێدانی بە كۆمەڵ و "شوێنی دوورخرانەوە" و هەڵاواردنی نێر و مێ و بێبەش كردن لە چاوەدێرییەكانی تەندورستی و خۆراك و تاقمەكانی بكوژ و گۆڕە بە كۆمەڵەكانی لەسەر پشتی بوو. ئەو لە وتارێكدا بۆ كادرەكانی باڵای حیزبی بەعس باسی پیلانێكی ڕێك‌وپێك دەكا كە "بە مەبەستی گەمارۆدانی پێشمەرگەكان لە ناوچەیەكی بەرتەسك و خاشەبڕ كردنیاندا" دایڕشتووە. "من هەر تەنیا ڕۆژێك نایاندەمە بەر پەلاماری شیمیایی، هەڵمەتەكە بۆ ماوەی پازدە ڕۆژان درێژە پێدەدەم."

وا بەم شێوەیە لە دوایین پەلامارێكدا كە لە فێوریەی ١٩٨٨ەوە بە دژی كوردان دەستی پێكرد، تەواوی هێز و دەسەڵاتی ئیداری و نیزامیی سەركوتكەر كە بە كردەوە تاقی كرابوونەوە، هاتنە مەیدان. ناوی ئەم پەلامارە "ئەلئەنفال" بوو كە بە نیشانی ڕێزگرتن لە ئیسلام لە لایەن حوكماتێكەوە كە سەردەمانێكی زۆر دوورەدین بوو هەڵبژێرابوو. ئەلئەنفال هەشتەمین سوورەی قورئان و بەسەرهاتی سەركەوتنی ٣١٩ كەس لە پەیڕەوانی دینی تازەی ئیسلامە لە شەڕی "بەدر"دا، (٦٢٤ زایینی). ئەم دەستەیە بەسەر تاقمێكی سێ‌هێندی خۆیانا زاڵ بوون. لەبزی "ئەلئەنفال" بە مانای خەنیمەتەكانە و هەر بۆیە ڕەنگە بۆ پەلامارێكی كە مەبەستی خاپوور و خاشەبڕ كردن بێ، شیاوترین ناو بێ؛ بۆ؟ چونكە هەڵمەتی عەلی كیمیاویش ئەشتەكی ئەوتۆ بوو: بە

پێی چەند فەرمان گڵدانەوەی مەڕ و ماڵات و چەکی دەسکەوت – جگە لە چەکی قورس – و تەنانەت ژنی تاڵان کراوەکان بە شێوەی شەرعی حەڵاڵ کرابوو.[١]

گەڵاڵەی پەلاماری ئەنفال زەمانێك دارِژا و سەرەتای قۆناخەکانی زەمانێك دەستی پێکرد کە حکوومەت تەواو تۆقیبوو. بە هەڵە لای وابوو کە ڕەنگە ئێرانییەکان سەرلەنوێ خۆ بدەنەوە پەلامارێکی گەورەی تری زستانی. جا هەر وەك دیمان لەم بابەتەشەوە زۆر پەرۆش بوون کە وا دیارە کوردان خەریکن واز لە نێوانگرژی کۆنی خۆیان بێنن. لە ڕاستیشدا، لە مانگی نوامبرا ئێران پێکهاتنێکی لە نێوان پارتی دێموکرات و یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا ڕێکخست و ئەم دوو ڕێکخراوە بۆ پێکهێنانی "بەرەی کوردستانی" کەوتنە خۆ، کە لە ڕاستیدا سێ حیزبی بچووکی تریشی دەگرتەوە. بەڵام ئێستا ئیدی سپای ئێران بەرەو "لێکهەڵوەشان" دەچوو. لە زستانی ١٩٨٨دا لە ژێر تەوژمی فێڵ و دەهۆی تۆقاندنی "شەڕی شاران"دا کەتبووە سەرەگێژە و ئەم تاکتیکە بریتی بوو لە پەلاماری "کوێرانە" بە مووشەکی زەوی بە زەوی ئێسکاد بۆ سەر شارەکانی ئێران. لە نێوەڕاستی ئاوریلا تێکشکانی ئێران ئیتر شتێکی سوور و ئاشکرا بوو و ئەمەش وەختایەك بوو کە هێزەکانی ئێران بەندەری "فاو"یان لەسەر یەکاویعارەبان و شوێنی ناردنی نەوتی ئێراق بۆ دەرەوە، پاش گرتن و لە ڕاستیدا دوای گەورەترین سەرکەوتنی ئێران لە خاکی ئێراقا چۆل کرد و کشانەوە.

پەلاماری ئەنفال کە بە ئامانجی داماڵین و پاك کردنەوەی ناوچە گوندییەکانی کوردستان و دەرپەڕاندنی خەڵك و پێشمەرگە بوو لە ٢٣ی فێوریەی ١٩٨٨دا بە

---

١– سەر وەبەر ئیسلام هێنان و ڕێوشوێنی ئیسلامی "دەسکەوتێك"ی نوێ بوو. ئەوانەی بەر لە شەڕی ئێراق لەگەڵ ئێران، سەردانی وێندەرێیان کردبوو باسی ئۆگریی توند و تیژی حیزبی بەعسیان دەکرد سەبارەت بە مەبەست و بایخە دوورەدینییەکان. هێندێك لە شیرۆڤەکارانی سیاسی پێیان وایە کە میشێل عەفلەقی مەسیحی لە دەیەی ١٩٥٠دا بیر و بڕوای غەیرەدینی حیزبی بەعسی بەتایبەت بۆ خاتری ئەم مەبەستە داهێنا کە ڕێ بۆ کەمینە غەیرەمسوڵمانەکان خۆش دەکا لە سیاسەتەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا دەور بگێڕن. بەڵام وەختایەك شەڕ لەگەڵ ئێرانی ئیسلامی درێژەی کێشا، سەددام وای بە بەرژەوەند زانی کە بڵێ بە ڕەگەز دەگاتەوە پێغەمبەر و بچێتە زیارەتی خانەیخودا و لەوێ وێنە بگرێ ...

پەلاماری بەربڵاوی سپای ئێراق بۆ بنکەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە دۆڵی "جافایەتی" لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانی و نیزیك سنووری ئێران دەستی پێکرد. هێشتا یەکەم قۆناخی هەڵمەت و پەلامارەکە لە ١٩ی مارسا کۆتایی پێنەهاتبوو. کە هێندێك لە ئامانجە سەرەکی و بەرچاوەکانی دەرکەوتن:

پەلاماری بەربڵاو لە زەوی و ئاسمانەوە، خاپوور کردنی گوندەکان، کەلك وەرگرتن لە چەکە شیمیاییەکان، ڕاگەیاندنی لێبوردنی بە دەهۆ بە مەبەستی هانی خەڵکی ساکار و بێخەبەر بۆ تەسلیم بوون و پاشان مەحکووم کردنیان بە "شوێنبزربوون" و سەرەنجام نەمانی یەکجارەکی.

"ئەنفال"ەکان سەرجەم هەشت پەلامار بوون و هەشت مانگیان کێشا. ئێراقییەکان لە گەڕیانی پەلامارەکانا وردەکاری و زیرەکی تایبەتی پتریان نواند: خاوخێزان کرانە ئامانج، ژن و زارۆك لە گەڕیانی پەلامار و پشکنین و تاپۆ کردندا، کە بە مەبەستی خاشەبڕ کردنی تەواوی خەڵك گەڕی دەدا، گیران. ئەم خەڵکەیان لە "قەڵایان" پەستاوت، پیاوەکانیان لە ژنان و منالان جوێ کردەوە، لێیان دان، ڕووتیان کردنەوە بە شێوەیەك کە جگە لە جلی ژێرەوە چیان لەبەردا نەبوو، خواردنی تەواویان نەدانێ، بەر لە بزر بوون قەت بۆ ماوەیەکی زۆر لە شوێنێك نەمانەوە، کەلەبچەیان کردن و لە ئامرازی هاتوچۆی پیس و پۆخڵیان پەستاوتن و بردیاننە ئەم کوشتارگایانەی کە سەدان میل لە مەیدانی شەڕ دوور بوون. بنەماڵەکانی ئەم خەڵکە ئەو "ڕێگا"یەیان زۆر لەسەرەخۆتر پێوا. چەند کەسێك لەوانەی مابوون بەسەرهاتی خۆیان بۆ گێڕامەوە: لە تەواوی ئەو ماوەیەدا بە بێ نان و ئاو بەرەو سارا و چۆڵگەکانی باشوور کەوتنە ڕێ؛ لە شوێنی مەبەست، لە بوولێڵی ئێوارێ و تاریکانێدا، ئەوانیان لە ئوتووبووسە بێ پەنجەرەکان دابەزاند، کەلەبچەکانیان بۆ کەلك وەرگرتنی داهاتوو لە دەستیان کردنەوە؛ دەستیان بە تەناف بەستن؛ پاشان ئەوانیان بردە سەر لێواری کەندالۆکان و لە وێندەرێ لەبەر ڕووناکایی چرای بۆلدزێرەکان ڕایاندانە نێو قوڵکەکانەوە و دەستەی بکوژان بە چەکی خۆکار دەسرێژیان لێ کردن.

درندانەترین پەلاماری ئێراق دژی کوردان بە شێوەی ڕەسمی بەشێك لە هەڵمەت و چالاکی "ئەنفال" نەبوو، چونکە وەك ئامانج گوندەکانی کوردستانی وە بەر خۆ نەدەدا بەڵکوو ڕاستەوخۆ بۆ سەر شاری هەڵەبجەی پڕ لە ئاوارە بوو: شاری هەڵەبجە کەتبووە لای سنووری ئێران و نیزیك بەنداوی گرینگی "دەربەندی خان". لە نێوەڕاستەکانی مانگی مارسا سپای پاسدارانی شۆڕشی ئێران بە یارمەتی پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان چووە نێو هەڵەبجە, خەڵکی هەڵەبجە زۆر لەم کردەیە تۆقین، چونکە زۆرێك لەوان لاگیری حکوومەت بوون. ڕادیۆ تاران بە دەهۆڵ و زوڕنا هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی بڵاو کردەوە و هەڵمەتەکەی بە تۆڵەی پەلامارە شیمیایی‌یەکانی ئەو وەختی بە دژی کوردان دانا. لە ١٥ی مارسا ڕادیۆ تاران هەواڵی دا کە پاسدارانی شۆڕش سەرکەوتنی خۆیان لەم شارە پەنجاهەزار کەسییەدا کردۆتە جێژن. هەر ئەو ڕۆژە ئێراق دەستووری دا بە فەرمانبەرانی حکوومەتی کە شار جێبێڵن و ئەم وریایی دانە خەڵکی پتر تۆقاند. لەم بەڵگەنامانەدا کە لە دەزگا زانیاریی‌یەکانی ئێراقەوە بە خەنیمەت گیراون فەرمانی "نواندنی زەبر و زەنگ و توند وتیژی سەربازیی" دراوە. ڕێکەوتی ئەم بەڵگانە ١٦ی مارسە.

هەر بەیانەی ئەو ڕۆژە فڕۆکە دروشم کراوەکانی سپای ئێراق گڕگڕ بۆمبای ئاگرینیان بەسەر شارا باراند. دانیشتوانی شار لە پەنا و پەسیوی بەرفرەوان و لەرزۆك و خۆنەگردا پەنایان گرت. لای دوانیوەڕۆ فڕۆکەکان بە بار و بارخانەی بۆمبای شیمیایی‌یەوە گەڕانەوە و لەسەر شاریان هەڵڕشتن. ئەوانەی هێشتا لە حەشارگەکاندا بوون هەوڵیان دا قەڵش و کەلێنان بە قوماش و خاولی تەڕ بئاخنن و پارچەی تەڕیان لە دەموچاویان ئالاند و بۆ ڕەواندنی گازەکان ئاگریان کردەوە. بەلام زۆران لە حەشارگەدا مردن. ئەو فریاڕەسانانەی تەقەلایان دەکرد مەیتی نیزیك چوارسەد کەسێکی لە عەمبارێکا دۆزیبوویاننەوە، بیانێژن دەستیان لە تێکۆشانیان شرد، چونکە دەستیان بۆ هەر کوێی کەلاکەکان دەبرد، دەس یان پێ یان سەر لە لەش جیا دەبۆوە. ئەوانەی لە حەشارگەکاندا بە زیندوویی مابوون، بە ناچار لە پەناگا دەرکەوتن و

بەرەورووی وێنەیەکی "پەمپەئی"[1] سەردەمی نوێ بوونەوە: هەزاران هاووڵاتی کوردیان هاتە بەرچاو کە وشك هەڵاتبوون و مردبوون. دەستەیەك لە پشت سوکانی ئەو ئوتۆمبیلانەی کە نەیانتوانبوو بیانگەیەننە شوێنێکی هێور و ئارام، بە لادا هاتبوون و لەرێو گیانیان دەرچووبوو. تاقمێکی پتر بە رووخساری شڵەقاو و خوار و خێچ لە شەقامان کەوتبوون و تاقمێك دەتلانەوە و دەگەوزین و قاقای شێتانەیان دەکێشا، کە خۆی حیکایەتی نەهێنەدرکێنی پیاڵەی مەرگی پڕ گازی کوشندەی "سارین" بوو.

شۆڕش ڕەسوول، توێژەری وردبینی کورد، ژمارەی کوژراوەکان بە ٣٨٠٠ کەس دێنێتە حیساب، کە بەراوردێکی بەپارێزە و دیتران لایان وایە کە ٧٠٠٠ کەس لە هەڵەبجە کوژراون. هەزاران کەسی دەربازبوو بە شاخاندا ڕایانکردە ئێران. لەوێ تاقمەکانی پزیشکی کە ساز و تەیار کرابوون بۆ بردنەوە پاش و نەهێشتنی شوێنەواری "سارین" بە "ئاترۆپین"ەوە چاوەڕوان بوون. هەواڵنێرانی دەرەوە کە چەند ڕۆژ دواتر بە باڵەفڕانی ئێرانی گەیشتنە هەڵەبجە چەند ڕاپۆرتێکیان سەبارەت بەم کوشتارە ئامادە کرد. لە پێشدا بەغدا کەلك وەرگرتنی لە چەکە شیمیایییەکان وەدرۆ خستەوە و هەوڵی دا تاوانی ئەم کارە باوێتە ئەستۆی ئێران، بەڵام بەڵگە بە خەنیمەت گیراوەکانی ئێراقی وەها تۆماتێك ناهێننە گۆڕ. لە پەیامێکی بە دەسکەوت گیراوی دەزگای زانیاری سپای ئێراق لە ڕێکەوتی ١١ی ئاوریلی ١٩٨٨دا، لە بابەتێکی زۆر دەگمەندا، دەستووراتی تایبەت بە گازە شیمیایییەکان پێشێل کراوە: پەیامەکە ئاماژە دەکاتە سەر شریتێکی ڤیدۆیی کە لە سلێمانی دەفرۆشرێ و "پەلاماری شیمیایی ئێراق بۆ سەر هەڵەبجە" نیشان دەدا. سەرەڕای بوونی وەها بەڵگەیەك کۆڵێژی شەڕی ئەیالەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە "کارلایل"ی پێنسیلوانیا بەوپەڕی لاسارییەوە پێداگری دەکرد کە هەر دوو لایەنی کێشەکە – واتە ئێران و ئێراق – لە شازدەی مارسا چەکی شیمیاییان دەکار کردووە!

---

١- کۆنەشاری پەمپەئی لە باشووری ئیتالیا، لەسەر لێواری کەنداوی ناپل، لە ساڵی ٧٩ی زایینیدا بە گڕکانی چیای ویزۆ خاپوور بوو.

ڕووداوی هەڵەبجە بۆ ڕێبەرایەتی "پێشمەرگە" زەبرێکی گورچووبڕ بوو و "بەرەی کوردستانی ئێراق" کە تازە خەریك بوو خۆی دەگرت تلپاتیتەری هێز تێدا نەهێشت و برەو و زاکوونی ئەوی لە نێو ڕیزەکانی کۆمەڵی کوردەواریدا تەواو کەم کردەوە. هاوبەندی لەگەڵ ئێران بۆ چەندەمین جار کارەساتی لێکەوتبۆوە. ماوەیەك پاش ڕووداوی هەڵەبجە من لە دەمیشق بووم کە بە ڕێکەوت تووشی ڕێبەرانی پایەبەرزی کورد هاتم و دیدارێکی پڕ ژان و ئێشم لەگەڵ کردن. ئەم تاقمە بەوپەڕی ناهومێدییەوە لە بابەت هەڵسەنگاندنی بارودۆخەوە پێیان لە هەڵەی خۆفناکی خۆیان دەنا و جار لەگەڵ جار پتریان بۆ ڕوون دەبۆوە کە ئێران شەڕەکە دەدۆڕێنێ. دوکتۆر مەحموود عوسمان, لە گەورە ڕێبەرانی حیزبی سووسیالیست و هەڤاڵ و یاریدەدەری پێشووی ژێنێراڵ بارزانی, گوتی: "خەڵك تۆقیون و لە ئێمەش تووڕەن ... هەقیشیانە." بەڵام ئەو و دیتران خۆیان دابوویە دەس چارەنووس و دەیانزانی کە "سزا"دانی پتریان لە پێشە و بە ئیماوە باسی چالاکی پارتیزانی نێو شارانیان دەکرد. دوکتۆر عوسمان گوتی: "هەر دەڵێی ڕووداوی ساڵی ١٩٧٥ دووپات دەبێتەوە." پاش ڕووداوی هەڵەبجە, ئەو بە پایەبەرزانی تارانی گوت: "هاوبەندی ئێمە لەگەڵ ئێران یانی درێژەی شەڕ هەتا خاشەبڕ بوونمان." هەر وەها درێژی دایە: "ئەم قسەیان زۆر پێخۆش نەبوو." لە نێو ڕێبەرانی کوردا ئەو تەنیا کەسێك بوو کە بە ڕوونی دەیدیت ئەگەر بێتوو سەددام حوسێن لە شەڕا سەرکەوێ "ئێمە دەکەوینە بارودۆخێکی تەواو تاڵوتوون, چونکە دێت و بنەبڕمان دەکا. ئێمە لەبەر چاوی ئەو پۆلێك جڕو جانەوەرین."

ڕێبەرانی کورد لەسەر ئەو مەبەستە پێداگر بوون کە بە بێ هیچ هەڵخەڵەتان و لەخشتەچوونێك دەستیان لەگەڵ ئێران تێکەڵ کردووە و تەنیا بە هۆی نەبوونی ڕۆچنەی هیوایەك لە لای ڕۆژاوا یان قۆڵی وڵاتانی کومۆنیستی یان دنیای عەرەبەوە ئەمەیان کردووە. دیسان هەر نەقڵی گۆرین کە دەڵێ: "دوژمنی دوژمنم دۆستی منە." کوردەکانی ئێراق لەم قۆناخە پتر وێوە نەچوون. ئێستا زیاترین کارێکی کە لە دەستیان دەهات ئەمە بوو کە بە بێ بەرعۆدە بوونێکی ڕوون لە لایەن ئێرانەوە, خۆیان لە هاوکاریی پتری چالاکی هاوبەشی بپارێزن. یەکێك لە کادرەکانی پێشمەرگە لە

گەڕیانی دیدارێکا لە ئوورووپا وتی: "هیچ کەس تەنانەت قامکێکی بۆ پشتیوانیمان لێ‌هەڵنەهێناین. دیتنی فیلمی هەڵەبجە وەك بینینی ئەو ڕووداوانە بوو کە چلوپێنج ساڵ لێرەوبەر بەسەر جوولەکان هاتبوو."

هەمووشتێك تلّپاتی‌تەڕی مانا تێدا نەما: قسەکان وەك خەیاڵاتی موعتادێك وا بوون و ڕێبەرانی کورد وایان دەنواند کە هەموو شتێکیان لە پێشا زانیوە. بەڵام... تاڵەبانی هەر لە دەسپێکی پەلامارە شیمیایی‌یەکانی ١٩٨٧ڕا شتەکەی لێ‌حاڵی ببوو, ئەو پێشنیاری بڕانەوەی ملانەی دابوو. بەڵام عەلی کیمیاوی نەوی نەکێشابوو. لە ڕاستیدا ڕژیم تەنانەت وەختایەکیش کە هەڵمەتی ئەنفال لە سێپتامبری ١٩٨٨دا کۆتایی هات درێژەی بە کەلك وەرگرتن لە چەکە شیمیایی‌یەکان دا. بەهاری پاش کارەساتی هەڵەبجە, لە دەمیشق لێم حاڵی نەبوو کە بۆچی پێشمەرگەکان بۆ پارێزران لە چەکی شیمیایی پەنا نابەنە بەر ئێران. ئەوکات ڕەسووڵ پێی‌گوتم: "تەواوی کوردان دەیانزانی کە چەند ناوچەیەك کەوتوونە بەر پەلاماری شیمیایی, بەڵام لەمە تۆقیبووین کە ئەگەر بێتوو دەس لە خەبات هەڵگرین خەڵکەکەمان پەند و گۆڵمەزی خراپتری بە سەر بێ. ئێستا ڕاسپێراویی پێشمەرگە لە جیاتی پەلامار دانی هێزەکانی ئێراقی پاراستنی خەڵك بوو."

ئەم چەشنە بۆچوونانە بە خەیاڵات دەرچوون. هەر پاش لە دەس دانی "فاو", ئێرانییەکان ڕۆژ بە ڕۆژ لاوازتر بوون و لەشکری پتر لە بەرەکانی باشوور و ناوەندەوە بۆ ڕاپەڕاندنی پەلاماری ئەنفال ڕەوانەی کوردستان کران. لە قۆناخێکی پەلامارەکەدا, ئێراق لە پێکگرتنی ئەو هەشت لەشکرەی کە لە دەیەی ١٩٧٠دا بەرەنگاری ژێنێراڵ بارزانی ڕاوەستا بوو, چلوشەش لەشکری هێنایە مەیدان. لە مانگی ژووئیەدا, ئەو کاتەی کە ئایەتوڵڵا خومەینی "بۆ خواردنەوەی پیاڵەی ژار ڕەزامەندی دەربڕی" و بڕیارنامەی ئاگربەسی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی قبووڵ کرد کە ساڵێکی لێ‌بەسەرچوو بوو, ئێران ئیدی دەربەسی ئەمە نەبوو کە بەر لە مۆر کردنی پەیمانێکی ئاشتی بە جودا, بەڵێنی خۆی بەرێتە سەر و لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستان بکەوێتە ڕاوێژ. ڕووداوی هەڵەبجە هەڵکەوتی زۆر شومی تریشی بۆ کوردان – لە

تەواوی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و ناوچە کۆچەرنشینەکانی ئەو بەریـدا — بـە شـوێنەوە بوو. ئەگەر کوردان زانیبایان کۆمەڵی نێونەتـەوەیی ناتوانـێ بـەر بـە ڕووداوێکـی وەك ڕووداوی هەڵەبـجە بگرێ — و ئامادە نیە لەم بـوارەدا برِشـتێك بنوێنـێ و بەرپرسـانی کارەکە بەرێتە پای مـحاکەمە و بەردەمی عەداڵـەت — وردتر سەری خۆیان دەخوێندەوە و پتریان لـێ سوور دەبۆوە کە دەبێ تەنیا پاڵ وەخۆیان بدەن. جارێکیتر هاتنـەوە سـەر گوتەی کۆنەباوی خۆیان: "هەرزن و بزن چیایە مەزن." دانوستان, مامەڵە, هاوبەنـدی, پشت بەستن بە یارمەتی دەرەکی و چالاکی لە نێوخۆی حکوومەتدا... بـەڵێ ئێـستا ئەوانە لێکرِا خرانە زبڵدانی مێـژوو. جووتیـاران, ئەنـدازیاران, مافناسـان, ڕاننـدەکان, دوکتۆران و مامۆستایان وێکرِا لە نێو پەنـجەی توورەییدا باسی خـەباتی چـەکدارییان دەکرد.

ئێستا ئیدی ئەم مەبەسـتە گـرینگ نـەبوو کـە وەختایـەك فەلەسـتینییەکان توانیـان پیشتیوانی و سەرنـجی کۆمەڵانی دەرەوە وە دەس بێنن, بە قازانـجی سـازانی سیاسـی و هەڵڵابەردێن "ئینتیفازە"[1], وازیان لـە چـەك و تونـد و تیـژی هێنـا. سـەیر ئەمەیـە کـە تەنانەت ئەم مەبەستە بە لای کوردانی خوێندەوار و پەروەردە کراویشەوە گرینگ نەبوو کە ئەم وەرچەرخانە زۆر گرینگـەی سیاسـەتی فەلەسـتینییەکان پـاش هـەڵبواردنی دوو وەچە ڕووی دابوو. هەمێت و قەدر و قیمەتی ڕێکخـراوی ڕزگاریـدەری فەلەسـتین بـۆ کوردان تەنیا لەوە دابوو کـە یارمـەتی پـەروەردە کـردن و ڕاهێنـانی ئەنـدامانی پـارتی کرێکارانی کوردستان (پ.ك.ك)ە کەی دابوو. لە حاڵێکدا ئەمە خزمەتێك بوو کە ئەم ڕێکخراوە دەرهەق دەیان تاقم و دەستەی تونـدڕەو و بنیاتـخواز, بـە بـێ سـرنج دانـە هەڵوێست و بۆچوونە سیاسـییەکانیان ئەنـجامی دابـوو. ئـەم زانـستە سیاسـییەی کـە کوردان لە ماوەی سەدەیەکدا بە نرخێکی زۆر قـورس و گـران وە دەسـتیان هێنـابوو, ئێستا وەك لاوێچێك پووڵی بێنرخ و چـرووك وابـوو لـە سـەردەمانی ئاوسـانی فـرەی

---

١– لەرزاندن, وە لەرزە خستن.

قەیرانی ئابووریدا. ئەوەی گرینگ بوو ئەمە بووکە ڕووداوی هەڵەبجە ئێستا وەك بانگەوازێك وابوو بۆ کردەوە و ئەم کردەوە هەرچەندی پتر برشت بوایە, ئەوەندە چاکتر بوو.

ئەگەر لەم بارەوە گومانیشم هەبوو, پاش ئەو شەوە درێژەی لەگەڵ پۆلێك لە دۆستانی کورد لە قامیشلی ڕامبوارد, ڕەوین. (قامیشلی شارێکی کوردنشینی سووریایە و کەوتۆتە سەر سنووری تورکیا و چی واش لە ئێراق دوور نیە.) یەکێك لە ئاشنا کوردەکانی ئێراقیم ئەم دیدارەی پێکهێنابوو. خانەخوێیەکانم یەکجار ماقووڵ و دلۆڤان بوون, بەڵام ئەم ئەندازیار و پزیشکانە لە جوابی تەواوی ئەم ڕەخنانەی سەبارەت بە توند و تیژی پ.ك.ك. دەمگرتن, تەنیا بە لەبزی "هەڵەبجە" وڵامیان دەدامەوە. لە وتەکانیانڕا بە ڕوونی دیار بوو کە تەنیا ڕێکخراوێکی لە تەمای تۆڵە وەرگرتنەوەیاندا قازانج دەکا "پ.ك.ك"ەیە.

ئەم هەڵبژاردنە بە ڕواڵەت هەڵبژاردنێکی سەیر بوو. عەبدوڵڵا ئۆجالان, یەکێکە لە کوردانی تورکیا کە بە باری فەرهەنگیدا وەهای کەسایەتی لێ ئەستێندراوەتەوە کە نەك بە کوردی, بەڵکوو بە ترکی دێتە ئاخافتن.[1] ئاپۆ کە خۆی پێیخۆشە وای پێبڵێن, خۆی بە بیردۆز دەزانێ. کەچی سەرەڕای تەواوی ئەمانە, من بە پێی چاوپێکەوتن و وتوویژێکی کە لە شازدەی مارسی ١٩٩١ لە دەمیشق, لە یەکێك لە ماڵە پارێزراوەکاندا, لەگەڵیدا بووم, لە ماوەی ئەو چوار سەعاتەدا کە دواندم ڕێوشۆێنێکی ڕوون و ئاشکرام لە بابەت بناغەی فکری ئەم شەڕەی کە بۆ دابڕان لە تورکیا دەستی پێکردووە, وە بەرچاو نەهات. ئەو خۆی بە مارکسیست دەزانی, بەڵام نەك کومۆنیست. جا هەر وەك خۆی بە ئاشکرا گوتی, بێگومان کومۆنیستێکی "کلاسیك" یا کومۆنیستێك نەبوو بە دابی سۆڤیەت. ئەو لەگەڵ ئیسلام بە شێوەیەکی کە ڕەچاو دەکرا هاودەنگ نەبوو, بەڵام دانی بە گرینگایەتی ئیسلامدا دێنا بۆ زۆرێك

١ – هاروی مووریس, لە ڕۆژنامەی "ئیندیپێندێنت"ی "لەندەن"ەوە, لە ڕا پۆرتێکدا دەڵێ لە سەردانێکی چەند مانگ لەوە پێشیدا بۆ قامیشلی, وێنەی ئۆجالانی لە پەنا وێنەی سەرەك حافز ئەسەد دیوە.

لە کوردانی گوندەکی و نەریتخواز. (پ.ك.ك. لەم بوارەدا بە کـردەوە لێوەشـاوەیی و چـازانییەکی زۆری نوانـدووە: لـە تێکەوتنی‌ـدا لەگـەڵ خـەڵکی پـەروەردە کـراوی شـارەکی‌دا کـەلکی لـە مارکـسیزم وەرگرتـووە و لـە وێککـەوتن لەتـەك کـوردانی دێنشین‌دا یارمەتی لە ئیسلام وەرگرتـووە.) ئـەم کـوڕە جووتیـارەی بـاوك تێـشکاوە, مەیلێکی سەیری لە کـردەوەی تونـد و تیـژە کـە مـن لەمێـژ سـاڵە بـە شێرپەنـجەی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستی دەزانـم. من ئەم دەس‌وەشاندن و تونـد و تیژییـەم لـە ڕیزەکـانی "دەمارگرانی جوولەکە, سەرکردەکانی تاقمـەکانی مەسـیحی لوبنـانی و بنیاتــخوازانی ئێرانی ئیسلامی‌دا دیوە. دەوڵەتانی تورکیا و ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا "ئـاپۆ" بـە تڕۆریست دەزانن – وڵاتانی ڕۆژاواییش وەوتۆیان کردووە – بەلام هەڵبـەت جگـە لـە هەڵکەوتێکی بەرچاو: هەر شتێك کە تورکیـا – ئـەم کۆنـە دوژمنـە – لاواز بکـا لـە ڕوانگەی یۆنانەوە بەجێیە. یەکێك لە دیپلۆماتەکانی یۆنانی کە ئاپۆی چاك دەناسی, لـە دەمیشق دەیگوت: "ئاپۆ خاوەنی زەینێکی چەق‌بەستوویە و پیاوێکی زۆریـش درەوشـاوە نیە, بەلام زۆر چاك لە تركکوژی دەزانێ."

ئاپۆ کە کراسێکی بۆری تایبەتیی سەربازانی ئینگلیسی لەبەردا بوو, وتەکانی خـۆی بە هێنانەوەی قسەی مارکس, ئێنگڵس, فریدریش نیچە, ئارنولد توین‌بــــی, هـــانری بێرگسۆن و ئیمیل دورکهـایم دەڕازانـدەوە. گـوتی شـوێنەواری ئـەم گەورەگەورانـەی زەمانێك خوێندۆتەوە کە لـە زانکۆی ئانکارا بە خەرجوبەرجی دەوڵــەتی, وانـەی مـافی دەخوێند. هەر ئەمەی کە کوڕێژگەیەك لەسەر مەزرای بێڕێژەو و بەرهـەمی "ئۆرفـا"وە توانیویەتی ئەم گشتە ڕێیە ببڕێ و بگاتە پلەی بالای خوێندن,خۆی تاریفاتێکە سـەبارەت بەم سیستەمە سیاسییەی کە ئەو دەیەوێ لە کۆڵ خۆی کاتەوە. ئەوانەی کە لە زانکـۆ دەیانناسی, دەیانگوت زەمانێك ڕووی کردۆتە ناسیۆنالیزمی کورد کە تیژڕەوانی چـەپی جوولانەوەکانی خوێندکاریی سالانی دەیەی ١٩٧٠ ئەویان لە ڕیزی خۆیاندا ڕێ نەدا.

"گومان"ی ئاپۆ ئاکامی ئەم نیوسەدەیە بـوو کـە تێی‌ـدا کۆمـاری تورکیـا پەیتاپـەیتا حاشای لە بوونی زمان و فەرهـەنگ و تەنانـەت پێناسـەی کـوردی کردبـوو. گـوتی: "ترکان کارێکی وایان کردووە کە ژیانی ئێمە لە ژینی پاتاڵیش نزمتـرە." لـە ڕاستیش‌دا

هەتا پەیدا بوونی سەروسۆراغی سەددام حوسێن و دادکوژییەکانی, زۆربەی کوردان تورکیایان لەبەر سەرکوتی توند و تیژی ڕاپەڕینەکانی کورد و هەڵوێست و سیاسەتێکی چەقبەستووی کە سەبارەت بە تواندنەوەی کوردان و وە ترک گێڕانیان ڕەچاوی کردبوو, بە خراپترین نەیاری خۆیان دەزانی. گوتی: "من لەبەر قبووڵ کردنی ڕەگەزی کوردێتی خۆم, تووشی گەلێك گیر و گرفتان بوومەوە. گوتنی ئەمەی کە من کوردم بەم مانایە بوو کە دەبوو خۆم بۆ بەرەوڕوو بوون لەگەڵ تەنگوچەڵەمەی زۆر ئامادە کردبایە و هەموو دەرگاکانم لە ڕوو دادەخران."

ئێستا مەودایەکی زۆر کەوتبووە نێوان ئاپۆ و ئەم گومانانە, مەگین ئەمەی کە ئۆگریی ئەو سەبارەت بە شاتوشووت و خۆهەڵکێشان وەك دیاردەیەکی بەردەوامیی ئەم گومانە دابنێین. بێ ئەوەی هیچ خۆنواندێکی لە قسەکانیدا بێتە بەرچاو گوتی: "من بەتواناترین پیاوی کوردستانم و خەڵکی کورد وەك پێغمبەرێك چاو لە من دەکەن." ئەو ئیددیعای دەکرد کە حیزبەکەی گرینگترین و لە واتادا تەنیا حیزبی ڕاستەقینەی خەڵکی کوردە, چونکە بە شتێکی کەمتر لە سەربەخۆیی ڕازی نیە و قەرزداری هیچ هێزێکی دەرەکیش نیە. بە بڕوای ئاپۆ "بەسترانەوە بە وڵاتێك" گوناه و کەڵکەڵەیەکە کە بیری تەواوی ڕەقیبانی وی لە ئێران و تورکیا و ئێراق و شوێنەکانی تر کردۆتە مەیانی ڕمبازێنی خۆی.

وا قاو بوو کە ئاپۆ لە دۆستانی گەرموگوڕی جەمیل ئەسەد, برای سەرکۆماری سووریایە. بەڵام ئەگەر سەبارەت بە درێژەی پشتیوانیی سووریا — و لەو سەیرتر پشتیوانیی — سەددام حوسێن — پرسیارێکی گوماناوی لێدەکرا بە زەحمەت تووڕەیی خۆی دەخواردەوە. من بێ ئەوەی بزانم لەم بارەدا کە داخوا ژنی هێناوە و ئەگەر هێناویەتی ژنەکەی لە شۆڕشدا خاوەنی چ دەورێکە, پرسیارم لێکرد و قامکم لەسەر شوێنێکی بارناسکتر دانا. هەڵبەت هیچ مەبەستێکی تایبەتیم نەبوو. ئەو بڕوای بە یەکسانی ژن و پیاو هەبوو و زۆربەی گریلاکانی ژنان و کچانی لاو بوون و باسی ژنەکەیم بۆیە هێنا گۆڕ واز لە قسە و باسی ئایدیلۆژیانەی پڕ لە ڕەمز و ڕاز بێنێ. کەچی ئەوم تووشی وتاردانێکی دوور و درێژ و تووڕانە و بێ سەرە و بەرە کرد, کە

تێیدا ژنەکەی کە وا دیار بوو لـە چینی مامناوەندییە, تاوانبار کرد کە ویستوویەتی لــە لای کاربەدەستانی تـرك ڕاسـتی لــێ بلـێ و بـە گرتنـی بـدا و هـەر وەهـا فـەرمانی بەڕێوەچوونی دەسوەشاندنی لەزەبری وەهای داوە کـە کەنـد و کۆسـپێکی یـەگجاری ناوەتەوە.

ئەو درێژدادرییەی کردی من زۆری تێنەگەیشتم, چونکە زانیارییەکم سەبارەت بـە بەستێنی وتەکانی نەبوو, هەستم کرد کە شتێکن وەك "پارانۆیا".[١] پێم نابوویە هـەرێمێك کە ئەو بە لایەوە باشتر بوو لـە بیری بەرێتەوە. هاوسەرەکەی هەر دەورێکـی لـە ژیـانی یان پ.ك.ك.دا گێڕابووی, ئێستا لـە بیر چووبۆوە. ئەمە ئیدی جێی گۆمان نەبوو. چەند چرکەیەك بێدەنگ بوو کە من تێیدا تەواو دڵنیا نەبووم کە نەکەوتـبمە مەترسی. بەڵام ئەو وەك ئەوەی هەر هیچ نەقەومابێ مەبەستی باسەکەی گۆڕی. تەقینەوەی تووڕەیی ئەو و نارەحەتی خۆم دەستیان تێکگرت و مەبەستێکیان هێنایە بەر سێرەی سەرەنـجم کە لـە تەواوی ئەو شەوەدا هەوڵم دابوو لـە بنج و بناوانی حاڵی بـم و بزانـم کێیە: ئەم پیـاوە قوڵــە و قایــمە, بــەو چـاوە ڕەشـانە, بـەو سـەر و سـمێڵە قەترانییـەی, قەڵاقـەتی "ئیستالین"ی دێناوە یاد کە ڕێوشوێنی پەرستنی کەسایەتی خۆی بەم گشتە تەبلیغات و وردەکاری و تەڕدەستییە هونەرییەی لـە بیری خەڵکا بنەگر کردبوو.

ئاپۆ زۆر توند بڕوای بە ڕێكوپێکی بیر و ڕاهێنانی ڕامیـاری بـوو. لــە ئۆردووگـای پەروەردە و ڕاهێنانی لـە دەرەی "بیقاع"ی لوبنان, پەروەردەکرانی بیر و باوەڕ لـە پەلـەی یەکەمدا بـوو. ئـەو داخـوازەرانی ئەنـدامێتی "پ.ك.ك"ەی — کـە بریتـی بـوون لــە کوردەکانی تورکیا, ئێراق, ئێران و سـووریا و تەنانـەت کوردەکـانی ئورووپـای — بـە چاویسووك, وەك کاڵایەکی عەیبدار و خەسارۆمەند دەبینی. کوڕ و کـاڵی گونـدەکی شـڕ و دڕ, خوێنــدکارانی زانکۆکـانی تورکیـا و ژنـانی لاوی خوێنــدەواری شـوێنە دوورەدەستەکانی چەشـنی ئوسـترالیا و بلـژیك و ... تێکـڕا دەکەوتنـە بـەر شـەپۆلی

١– شێتیی شوێن لـە دووگێڕان و خۆ بە زل زانی...

ڕاهێنانێك کە پتر وەك شۆردنەوەی مێشك دەچوو. ئاپۆ لە ماوەی دیدارەکەماندا قەت وەها وتەیەکی بە زاریدا نەهات, بەڵام ئاشکرای کرد کە چەندین مانگ ڕاهێنانی سیاسی گەلێك گرینگترە لە پەروەردە کرانی پێشمەرگایەتی یا ڕاهێنانی لەش بۆ حاوانەوە و خۆڕاگری لە ڕۆژگارانی سەخت و دژواردا. گوتی کە سەرمایەنانەوە لەسەر بیر و باوەڕ پتر بەم بارەدا گرینگە کە ئێمە دەتوانین لە ماوەی ساڵێك پاش تەواو بوونی پەروەردە و ڕاهێنان, لە سەتا حەفتای داخوازەران لە مەیدانی شەڕا لە دەس بدەین." بەڵام ئەمە شتێك نەبوو کە ئەو خۆی لێبدا و مەترسیی بەرەوڕوو بوونەوەی بسەلمێنێ: وێڕای تەواوی ئەم وتانە ئاپۆ کەسێك نەبوو کە ڕاستەوخۆ بێتە مەیدانی شەڕ و سەرکردایەتی تێکهەڵچوون وە ئەستۆ بگرێ. ئەو پاش ئەمەی کە سپای تورکیا لە ماوەیەکی نیزیك بە سی ساڵاناندا بۆ سێهەمین جار گۆدەتای کرد, لە تورکیا بازرە بوو و ئیتر قەت نەگەڕاوە وێندەرێ.

وێڕای تەواوی ئەمانەش, لێبڕانی لاوانی پەیڕەوەی بۆ کوشتن — و کوژران لە مەیدانی شەڕا — بوو کە ئەو کۆمەڵە پزیشك و ئەندازیار و مافناسە سەرکەوتوانەی کە لە قامیشلی دیتمن, بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. هەر وەك چۆن باڵادەستانی تورکیا قەت سەبارەت بە سوور بوونیان لەسەر ئەمە کە لەگەڵ تاقمێك ترۆریست کەوتوونە شەڕ هەستیان بە ماندوویەتی نەدەکرد و بێ پسانەوە ئەم مەبەستەیان چەنپات دەکردەوە, شێوەی ئاکار و جووڵانەوەی پ.ك.ك. لەوپەڕی توند و تیژی و دوورە ڕوحمی و بەزەییدا بوو. تەنیا ژاندرمەکانی ترك ئامانجی پەلاماری پ.ك.ك. نەبوون, بەڵکوو سەرباز و چەکدارانی هێزی تایبەت یان بە واتەی خۆی "کۆماندۆکانی کۆنترا" و گوندپارێزان یان بە واتەیەکی جاشەکانی خۆجێییش بوون. لەو وەختەوە کە پ.ك.ك. لە ١٩٨٤ەوە شەڕی سەربەستیخوازانەیان دەس پێکرد, پەیڕەوانی ناوبانگیان بە کوژەری ژنان و زارۆکان و سووتێنەرانی قوتابخانان و بکوژانی مامۆستایانێك کە بە زمانی ترکی قوتابییانی کوردیان ڕادێنا, دەرکرد. ئاپۆ بە شێوەیەك کە نەیدەتوانی بڕوا بە بیسەر بێنێ تاوانی ئەم دڕندایەتی و توند و تیژییەی دژی هاووڵاتییانی کوردی دەخستە ئەستۆی ئەو خەیانەتکارانەی کە خۆیان خزاندبووە

ڕیزەکانی پ.ك.ك. بەڵام ئەوکەسانەی کە مـن لـە قامیـشلی دیـتمن – و هـەر وەهـا کوردەکانی شوێنەکانی دی – فریوی ئەم گوتە خۆفریودەرانەیان نەدەخوارد. ڕاسـت و ڕەوان گوێیان نەدەدایە ئەم شتانە.

سەبارەت بە زەبروزەنگـی هێزەکـانی ئاساییـشی تورکیـاش پەرۆشـی و پەرێـشییان نەدەنواند. ساڵ بە سـاڵ شـەڕی پ.ك.ك. قەڵافـەتێکی دزێـوتر و بێـزۆکترى لـە خـۆ دەگرت و تۆڵە ئەستاندنەوەی هێزەکانی سپا و ئاساییشی تورکیاش بەو ڕادەیە ناحـەزتر و بێزراوتر دەبوو. تەنیا لە یەکەم دە ساڵی شەڕا – کە ڕۆژ بە ڕۆژ توند و تیژتر دەبـوو – پتر لە ١٦٠٠٠ کورد کوژران,[1] پتر لە هەزار گوندی کوردان لەگەڵ خاك تـەخت کران یا بە کەڵەزەڕی جووقەواریان تێدا نەما و سەدان هەزار گوندنشینی کـورد ناچـار بوون پەنا بەرنە بەر باژێرەکانی دیاربەکر و ئەسـتەمبووڵ و ئیـزمیر لـە ڕۆژاوای وڵات. ئاپۆ گوتی: "پاش ڕووداوی هەڵەبـجە ئێمە بەهێزتر بـووین و داخـوازەری پـتر ڕوویـان تێکردین."

لـە فێوریـەی ١٩٩٣دا, دووسـاڵ پـاش دەیـدەنیم لەگـەڵ ئـاپۆ, بـۆ دیـداری ئۆردووگایەکی پ.ك.ك. کە لە لێواری سنووری ئێران ڕۆنرا بوو و ناوەندی پەروەردە کردنی لاوانی کورد بوو بـۆ شـەڕ لـەتـەك تورکیـا, ملـی کوێرەڕێیـەکی بـەفرگرتووی کوێستانیم وەبەر خۆ دابوو. نەمدزانی چلۆنـم وەردەگرن و داخوا ڕێم دەدەن یـان نـا. لـەو دووسـاڵەدا ئـاڵوگۆڕێکی زۆر ڕووی دابـوو: کووەیـت بـە دەسـتی هێزەکـانی هاوپەیـمان بە ڕێبەرایەتی ئەمریکا لە دەسدرێژی و داگیرکرانی بە چنگ ئێـراق, قوتـار ببوو؛ کوردەکانی ئێراق لە کۆتایی شەڕا ڕاپەڕیبوون و بە دەسی پاشـماوەی هێزەکـانی سپای سەددام حوسێن سەرکوت کرابوون و بازرەی کێو و کەژان ببوون؛ دەرفەتیان لە چەتری ئاسـمانیی هاوپەیـمانان هێنا بوو و لە مانگی مەی ١٩٩٢دا یەکەم هەڵبـژارانی ئازادیان بۆ پێکهێنـانی ئەنـجومەنی هـەرێم بـەڕێوە بردبـوو. بـەڵام ئـاپۆ ئـەم بۆشـایی

١– سەرچاوەکانی ترك و کورد ڕێژەی کوژراوان هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٩٦ بە ٢٣٠٠٠ کەس دەقەبلێنن.

دەسەلاتەی کە شوێنکەوتی ئەم ئالۆزبلۆزییە بوو بە دەرفەت زانیبوو و باکووری ئێراقی کردبوو بە بنکەی سەرەکی چالاکی بە مەبەستی پەلاماردانی تورکیا. پەرە گرتنی چالاکی و شەڕ و پێکدادانی تورکیا ئاپۆی لەگەڵ هێزەکانی پێشمەرگەی باکووری ئێراق یەکڕوو کردەوە کە بوو بە هۆی کوژرانی سەدان کەس, کە زۆربەشیان ئی پ.ك.ك. بوون. کوردەکانی ئێراق لەخۆوە تێکۆشابوون خۆ لەم تێکهەڵچوونە بپارێزن. ئەمانە لە ژێر گەمارۆی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و گەمارۆیەکی ئابووری و ئیداری تایبەت کە سەددام حوسێن لە ئۆکتۆبری ١٩٩١دا خستبوویە سەر باکووری ئێراق, بۆ بەرێوە بردنی هەرێمی وێرانی خۆیان تووشی کەندوکۆسپێکی بەربلاو ببوون؛ [کوردان] خوازیاری سەرێشە و تێکگیران لەتەك تورکیادا نەبوون کە ڕۆژ بە ڕۆژ بە پەرەگرتنی پەلامارەکانی پ.ك.ك. بۆ ژوورەوەی تورکیا زیاتر دەبوو. ڕێبەرانی کوردی ئێراق کە وازیان لە شەڕ و لێکدان نەبوو لەگەڵ هاونیشتمانانی کوردی خۆیان بەوپەڕی سەبر و دان بەخۆ داگرتنەوە تەقەلایان کرد نەهێڵن کە پ.ك.ك. خاکی ئێراق بکاتە بنکە و پەنا. بەلام خۆ بەزل زانی و فرسواری ئۆجالان وەها بوو کە گوێی نەدایە ئەم بانگ و هاوارانە. بە لای ئەوەوە کوردستان هەمووی یەك بوو و سنوورە حکوومەتییەکان بێ مانا بوون. وای هەست پێدەکرد هەقی بە دەستە و دەتوانێ هەرچی پێیخۆشە بیکا و لە سایەی ئەم نیو میلیۆن کوردەی کە لە تورکیاوە چووبوونە ئورووپا و نیشتەجێ ببوون, پوولی تەواوی بە دەستەوە بوو. هەر وەها ئەو لێی سوور بوو کە ناوبانگ و خۆشەویستیی لە نێو کوردەکانی ئێراق بە ڕادەیەکە کە بارزانی و تاڵەبانی ناوێرن دژی پ.ك.ك. پەل بزێون. بەلام کوردانی بەسەر هەژاریدا کەوتووی ئێراق, جگە لە پەلاماری پ.ك.ك. چارەیەکی تریان نەبوو. بۆ دەس ڕاگەیشتن بە تەنیا ڕێگای جێی متمانە بۆ دنیای دەرەوە پاڵیان بە تورکیاوە بوو و داهاتی ئەو گوومرگانەیەی کە لە بابەت فرۆشی بە قاچاخی گازۆڵ بە تورکیا گیریان دەکەوت تەنیا بازگەیەك بوو کە دەیانتوانی دەزگای لەرزۆکی ئیداری خۆیانی بێ ڕابگرن.

تورکیا لـە پێشدا هەوڵی دابوو بە بۆمبارانی گوندەکانی باکووری ئێـراق، کـوردان کە خۆیان لـە شەڕی پ.ك.ك. لا دەگرت، تێوە بـدا. چـاوەدێرانی نیزامیـی ڕۆژاوا لــە باکووری ئێراق لـەسەر ئەم بڕوایە بوون کە بـەرز و تیـژفڕینی فڕۆکـەکانی تورکیـا لــە گەڕیانی ئەم بۆمبارانەدا زیاتر لـەمە بووە کە فڕۆکەوانان بزانن بۆمباکانیـان وە گونـدان دەکەوێ یان وە بنکەکانی پ.ك.ك. بەڵام هەرچۆنێك بوو "نیشانە" بۆ ترکان داکرابـوو و ئەم ڕەوتـە بـۆ ترکـان شـێوەیەکی تـازە نـەبوو. (لـە سـاڵی ١٩٨٩دا فڕۆکـەکانی شـەڕکەری تورکیـا بـە تۆڵـەی چـالاکی پ.ك.ك. بنکـەکانی بارزانییـان پـەلامار دا و تورگوت ئوزەل ، سەرەك وەزیری ئەوسای تورکیا، لـە نێوەڕاستەکانی مانگی ئووتی ئەو ساڵەدا گوتی: لێی گەڕێ با ئەوانەی پەنای سەرهەڵداوان دەدەن لـە خۆیان حاڵی بـن.) سەرەڕای تەواوی ئەمانە چالاکی دوورە کەوشەنی پ.ك.ك. ئەوەندەی درێژە کێشا کە تورکیا سنووری بەست. بۆ چەند ڕۆژ دواتر کوردەکانی ئێراق سەرەنـجام لـە پ.ك.ك. وەخۆ کـەوتن و سـپای تورکیـا بـە هێزێکـی زۆر و زەوەنـدەوە لــەم پـەلامار و زەبـرە کاڵوکرچەدا کە ئیددیعای "پ‌ك‌ك"ەی لــە بابــەت سەرســپێراوی پێــشمەرگانەوە بــە تورکیا دەسەلــماند، خۆی تێوەدا. ئەم هەڵمەتەی تورکیا یەکـەم دەســدرێژی بـوو لــەم زنـجیرە دەسدرێژییانەی کە ئاخرییەکەی ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاشی نیگـەران کرد، بەڵام ئەمریکا بە نیشانەی هاودەنگی لـەگەڵ هاوپەیـمانی ناتۆی خۆی لـەم بوارەدا هیچ کارێکی نـەکرد و لــە مانـادا بـەم کردەیـە پـشتیوانیی ڕۆژاوای لــە کوردەکـانی باکووری ئێراق تەنیا خستە جەغزی پاراستن لـە بەرامبەر سەددام حوسێندا.

پ.ك.ك. بە گێلۆکەیی وەیدەزانی کە ڕادەی پشتیوانی لــێ‌کردنی لــە کوردسـتانی ئێراق ئەوەندەیە کە ڕێبەرانی پێشمەرگە لـە ترسی تاوانی بەشـدار بـوون لــە سـەرکوتی هاونیشتمانانی کورد ناوێرن لێی‌هەڵگەڕێنەوە. ئـاپۆ یـان لـــەم دۆزە نالــەبارەی ئاوقـای پێشمەرگان بێوەوە حاڵی نەبوو یا لای وابوو کە لـە بار و پلـەیەکی وەها قایم و پتەو دایە کە دەتوانێ لـەم ئاڵۆزییەی کە خۆی سازی کردووە بـەهرە وەربگـرێ. ئـەو هــەروەها هیــوادار بــوو کــە بــەم دۆســتایەتییەی وا لـەگــەڵ یــەکێتی نیــشتمانی کوردســتان دایگیرساندووە بتوانێ دووبەرەکی بـخاتە ڕیزی کوردەکانی ئێراق. لـە بـیری چـووبۆوە

كە بەشی زۆری سنووری گەڵ توركیا لە ژێر دەسەڵات و حوكمی پارتی دێموكراتی كوردستان دایە و یەكێتی نیشتمانی لە وێندەرێ برەوێكی نیە. ئەگەر بارزانی و تاڵەبانی قبووڵیان كردبا كە پ.ك.ك. خاكی ئێراق بكاتە بنكەی خۆی، تێزی "كوردستانی یەكپارچە"ی ئاپۆ پتر بە زەرەدی ئەوان دادەشكا. لە ئۆكتۆبری ١٩٩٢دا وەختایەك پارتی دێموكراتی كوردستان و یەكێتی نیشتمانی كوردستان لە پەلامارێكی یەكدەست و خوێناویدا بە هاوكاری نزیك لەگەڵ توركیا "پ.ك.ك"ە یان لە سنووری توركیا ڕادا، ئاپۆ بەڕاستی سەری سوڕما. هەر لەبەر هەندێ بوو كە تەنیا بنكەی پ.ك.ك. لە ئێراق، یانی بنكەی پەروەردەی برای ئاپۆ، كە بە ناسەرسەنگی قبووڵ دەكرا، ڕاگوێزرایە شوێنێكی دوور لە توركیا. بۆ ئەوەی كە پ.ك.ك. ئەم پەیامە لە یاد نەباتەوە فڕۆكەكانی توركیا نێوەنێوە ئەم بنكەیە بوردمان دەكەن.

لەبەر هەڵسەنگاندنی ڕەفتار و ورەی پ.ك.ك. بوو كە لەو زستانەدا ڕەنج و كوێرەوەری ئەو ڕێبرینەم لە سنووری توركیا وە بەر خۆم نا. شەوێ بەفرێكی قورس باریبوو و من كازیوە وەڕێ كەوتم، هەتا ئەگەر دیدارەكەم بۆ نەكرا بۆ ئێوارێ بتوانم بگەڕێمەوە شوێنی خۆم، ئەو جێیەی كە پێشمەرگەی پارێزەرم لە بازاڕی قاچاخفرۆشان چاوەڕێم دەمایەوە. نیوەی هەوەڵی ڕێگاكە, زۆر خۆش نەبوو و پڕ بوو لە خوارەكە و پێچەكە. پاش دوو كاتەژمێر ڕێڕۆینی بێوچان، دیلمانجەكەم – موئەیید یۆنس – و من و پێشمەرگەی پارێزەرم گەیشتینە یەكەم بنكەی پشكنینی پ.ك.ك. كە دێیەكی بچووك بوو بە ناوی زەڵێ لەسەر سنووری ئێران.

لاوێكی كوردی سووریا، لەسەرەخۆ وەرەقەی دیدارەكەمی، وەك دەركەوانی خانووبەرەیەكی ئاغاوەتی لە شەقامی پێنجەمی دەسپێكی ئەم سەدەیە، وەرگرت. بە تكای من دیداری پێشوومی لەگەڵ ئاپۆ بە وردی یادداشت كرد و ونبوو. كاتەژمێرێك پێچوو. ئۆقرەم لێهەڵگیرا، ماوەی مانەوەی زیادیم بنەی دەهات. ئێستا لە قسان دەبوایە "گەیبامە ئوتووبووسی سەعاتی دە." شەیتان بە لەعنەت بێ! وەختایەك كار دەگاتە تەشریفات شۆڕشگێڕانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دەتوانن شانبەشانی شاژنی

ئینگلستان پێبەندی ڕێوشوێنی تەشریفات بن و من لە پێشدا چوونی خۆم بە پ.ك.ك. ڕانەگەیاندبوو، هۆیەکەشی ئەمە بوو ئەگەر ویستباشم ڕێیەکم نەبوو بۆ ئەم کارە.

"وەسمان"، برای ئاپۆ کە وا دیار بوو لەم کارە و لەمەی کە دەیبینی دە نێوەوە چووم سەری سوڕما و من کە میوانێکی بانگهێشتن نەکراو بووم ڕێی دامە سەر مێزی نانی نیوەڕۆ. دەیەویست لەبەر ئەوەی کە ماوەیەك پێچووە و نەکراوە زووتر من لەم هۆدە سارد و سڕە ڕزگار کا، قبوولّی بکەم بۆ خاتری ئەمە بووە کە بۆ دەسڕاگەیشتن وە براکەی لە سووریا تووشی تەنگەژەیەك هاتووە. بەڵام من دوودڵ بووم کە بۆ ئەم کارە زەحمەتی وە بەر خۆی نابێ یان وەختی بە فیڕۆ دابێ یان ئاپۆ دیدارەکەمانی لە بیر مابێ. لە باری ڕواڵەتی قەڵافەتەوە نەدەگەیشتە خۆفناکی کاکی. وای بۆ دەچم چاوپێکەوتن لە لایەن هەواڵنێرێکی ئەمریکایی و چاوەڕوانی بۆ بیستنی هەواڵەکانی جیهان، ئەم زستانە بەفرگرەی لە چەقوەستاوی و وەڕەزی دەرباز کرد.

هەروا کە گوێم دەدایە وتەکانی کاك عوسمان، ئاڵوگۆڕێکم لەسەر پێداگری هێندێك لە ویستەکان هەست پێدەکرد. پ.ك.ك. هێندێك لە داخوازەکانی وەلا نابوو، بەڵام نەك هەموویان. عوسمان زۆر دەقودۆغر گوتی کە ئاپۆ "ئەوپەڕی" داخوازەکانی هێناوەتە گۆڕ. ڕەنگە هەروەك عوسمان بۆخۆی وتی لەبەر "لێکدانەوەی هەڵەی" بووبێ. قسەکانی سەر نان خواردنمان وا ویشك و ڕەسمی نەبوون کە من چاوەڕوانی بووم. عوسمان لە تەم و مژێکی قورسی تێکەڵ بە شۆق و زۆقی کوردانی سەر مێزی نیوەڕۆژ، لێکدانەوەی خۆش، بەڵام کرچوکاڵی لەسەر مارکسیزم کرد، کە ڕەنگە ئیلهامی لەم کۆمەڵە وتارانەی ئیستالین وەرگرتبێ کە لەسەر ڕەفحەی کتێبەکانی ژووری چاوەڕوانی دیبوومن. دوو ژنی جحێڵ لە جلکی یەکدەستا، بە فانووسقەی سەر پشتێن و دەمانچە و نارنجۆکی کەلەکەیان زۆر بەگەرمە بە دەوری نان و خوانەکەدا دەهاتن. ئەم دوو ژنە لە کوردانی تورکیا بوون. لەم هۆردووگایەدا کوردانێك لە سووریا، لوبنان و خودی ئێراق و ئورووپا و تەنانەت ئوستڕالیاشی لێبوون کە پەروەردە دەکران.

عوسمان لە ژێر پەساری ئەو عیمارەتەی کە بە دە ساڵ بەر لە ئێستا بنکەی نەهێنی جەلال تاڵەبانی بوو، نیمچە ئاسوودە ڕایدەبوارد. هەزاروسێسەد خوازیاری لاو کە زۆربەیان ژن و کچ بوون لە ژێر خێوەتاندا دەژیان. سەرەڕای تۆف و بەند، ئەم ژنانە کەوشی سووکەڵەیان لە پێ دابوو. بێگومان ئەم کارە بە مەبەستی ڕاهاتن و تابشت هێنان بوو لە بەرامبەر گرژی و تاڵی ڕۆژگارا، ئەگینا پ.ک.ک. دارا و دەسڕۆیو بوو، ئەوجەل هەر وای کردبا سنووری ئێران بوو، هەروا بێتەوە کوردان هەر لە قەدیمەوە کە بە بیری کەس نەبوو، لە زستاناندا کاڵە و پێتاوی وەها گەرمیان دەکردە پێ کە لەگەڵ هەوای سارد و سۆڵی چیا پتریان یەکتر دەگرتەوە. بە بێ دنە و گاڵدانی من زۆر جاران لەبزی "هەڵەبجە" دەکەوتە نێو وتەی ئەم داخوازەرانە و هەر ئەمە هەوێنی شۆر و سەرسپێراوی ئەوان بوو سەبارەت بە پ.ک.ک. ئەم لاوانە خر و پتەوون ببوونە دەسکردی پەروەردەکراوی ئاپۆ، ئەمانە پیاوان و ژنانی تازەی پ.ک.ک. بوون.

موئەیید، دیلمانجی کوردم کە پیاوێکی ئاوەزمەند و ئارام و لەسەرەخۆ بوو، لەو ماوەیەدا کە لە ژووری چاوەڕوانی ڕۆنیشتبووین و چاوەڕوانی ئیزنی دیدار بووین، لەگەڵ سێ کەس لەم لاوانە کەوتە دمەتەقەیەکی بێهوودە. ئەو بەتایبەت زۆر لەمە توورە بوو کە ئەوان هیچ هەمێتێکیان بۆ ئەم هەلومەرجەی قبووڵیان کردبوو و پتر وەك خۆ بە دەستەوەدان وە هێزەکانی پێشمەرگە دەچوو، دانەدەنا. ئەم تاقمە بە چاوی‌سووك دەیانڕوانییە پێکەوە سازانی کوردەکانی ئێراق، ئەویش بۆ پاراستنی ئەم خودموختارییە نەبەگەیە. ئەم داخوازەرانە گوتیان کە تەنانەت ئێستاش پ.ک.ک. دارودەستەکەی بە ئێراقا دەنێرتە نێو تورکیا: بە دانی بەرتیل لە سنووری ئێرانەوە دیانپەڕێنێتەوە ئێراق. (دواتر لێم حاڵی بوو کە پ.ک.ک. بە پووڵ بنکەی پشکنین و چاوەدێری کوردەکانی ئێراقی کە بە مەبەستی ڕاگیرکردنی ئەوان لە زەڵێ ڕۆنرابوون، کڕیبوو. شەڕکەرانی پ.ک.ک. دەیانتوانی ڕاستەوخۆ بچنە خاکی ئێراق و لە سنوور نزیك ببنەوە و دژی ترکان دەس بکەنەوە بە هەڵمەت و چالاکی.) بینینی هەڵچوونی موئەیید، ئەم پیاوە ئارام و ئاوەزمەند و سینگ فرەوانە، لەو بەرزاییە هەشت هەزار پاییەدا (٢٤٣٨/٤میتر) و لەو دۆڵە لاپەڕەدا، لەو چلەی زستانەدا، بڕوای بێهێنام کە

پ.ك.ك. هێزێكی خۆفناكە؛ ئەویش نە تەنیا لەبەر ئەمە كە ئەم سێ داخوازەرەی وایان دەگوت و چەنپاتیان دەكردەوە.

دوای نانی نیوەڕۆ گەڕاینەوە شوێنی هەوەڵێمان، ئێستا بە پەلە بووم بەر لە تاریكانێ بگەینە شوێنی مەبەست. گەڕانەوەمان زۆر بە زەحمەت بوو: بەفر لەبەر تاوی نێوەڕۆیە شلكەی كردبوو، دەبوو لەو جۆگە و جۆبارانە بدەین كە ئیتر توابوونەوە. توولەڕێی باریك خۆی لە شانی كێوی قایم كردبوو و لە ترسی پسانی ڕنوو دەبوو بە پارێز ڕچەمان كوتابا. لە شوێنێك، لە دەرەوەی گوندێكی چۆلكراو، بە لای پۆلێك شینكەی كرژهەڵگەڕاوی سەرمابردوو و پۆلێك ئالای ڕەشا تێپەڕین كە نیشانەی گۆڕستان بوون: گۆڕستانی شەهیدان، [ئی ئەو] پێشمەرگانەی كە بە درێژایی دەیان ساڵ بۆ كوردستان بە شەڕ هاتبوون و مردبوون. ئەم ئالا ڕەشانەی كە بە گڤەی بای تێژبەزی زستان ڕادەوەشان و فڕەیان دەهات منیان خستە سەر ئەم بیرە كە كوردانیش خەڵكێكی سەیرن: جاری وایە ئەوەندەی پابەندی مردوانن لە خەمی زیندواندا نین! هیچ بیرم لەوە نەكردەوە كە ڕەنگە ئەمە هەستێكی تەواو ڕۆژهەلاتیی بێ لەسەر تێگەیشتنی چارەنووس یا شێوە سڕبوونێك سەبارەت بە ئازاری تاكەكەسی لە شەهید بوونی بێبڕانەوەدا بۆ كوردستان.

تەواو ساڵێك لەمەوبەر، ڕۆژێكی تۆفانیم لەگەڵ تەیموور عەبدوڵلا تێپەڕ كردبوو كە ناسكەلاوێكی شازدە سالانەیە و لەگەڵ ئەوەشدا كە تازە خەتی سمێڵی داوە، وەك مێرمناڵێكی سێزدە چاردە ساڵە دەچێ. لە جەنگەی شلێوەیەكی قورسا، لە سلێمانیڕا چووبوومە لای باشوور و كاتەژمێرێكم بە سەرلێشێواوی ڕابواردبوو، هەتا ئاخرییەكەی لە یەكێك لە "شارۆچكەكانی سەركەوتن"ی دزێوی سەددام حوسێنا لە قەراخ كەلار، كە شتێكی وا لە سنووری ئێرانەوە دوور نیە، سۆراغیم كرد. هەتا ئەو كات وا دەزانرا كە تەنیا كەسێكە كە لەبەر دەستی تاقمەكانی بكوژی "ئەنفال" قوتار بووە – دواتر چەند كەس لەم قوتاربوانە سۆراغیان پەیدا بوو.) لەبەر ئەوەی كە پیاوكوژانی سەددام حوسێن بە ئازادی لە "كوردستانی ئازاد"دا ڕاویچكەیان دەكرد، ژیانی ئەم لاوە هەمیشە لە مەترسیدا بوو. لەگەڵ ئەمەشدا تەیموور بە بێپەسار لە

دە میلی هێڵەکانی بەرەی حکومەتێکا دەژیا کە داهێنانەکانی لە شێوەکانی تۆڵە ئەستاندنەوە لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا خاوەنی ناوبانگێکی ئەفسانەیی بوو.

زۆر پێشتر، چەند جاران ئەویان بۆ وتوویێژ لەگەڵ ڕایەڵەی تەلەفیزیۆنەکانی دەرەوە، بە جل و بەرگی پێشمەرگەوە — بە ڕانك و چۆغە و پشتێن و جامانە و تفەنگەوە — بردبوو بۆ سلێمانی. لە پێشدا وامزانی ڕەنگە بۆیە وا بە لەسەرەخۆیی و ڕەوانی نەزیلەی دەرد و مەرەدی خۆی دەگێڕێتەوە، هی فیزی تافی لاوی یان لە ڕاستیدا هی هەمان ئازایەتییە چاوناسانە کوردانەکەی بێ. لێکدالێکدا دەستی بە سۆبە نەوتییەکە ڕادەداشت کە بە کەساسی تەقەلای دەکرد ژوورەکە گەرم دابێنێ. لەسەر دۆشەگێك دانیشتبوو و کایەی بە فینجانە چایەکەی دەکرد و دەنگێکی نێر، بەڵام لەسەرەخۆ نەقڵی بەسەرهاتی خۆی دەگێڕاوە، وەك ئەوەی قوتابییەك وانەی شیمی چاك لەبەر کردبێ و بۆ مامۆستاکەی بڵێتەوە. گوتی بەیانی ئەو ڕۆژەی ئاوریلی ١٩٨٨ جەیشەکانی ئێراقی کە لەوان دەوروبەران بەرەنگاری پێشمەرگە وێستابوون، لە یەکێك لەو هەڵمەت و چالاکییانەدا کە جاروبار بۆ "جاش گرتن" ئەنجامیان دەدا، هاتنە گوندەکەی وان. وتی بە پێچەوانەی پێشوو کە ڕاماڵیان دەبردە ماڵان و مەشموولەکانیان بە زۆرەملی بۆ جاشێتی دەبرد، ئەمجار "درۆیان لەگەڵ کردین." ئەو و باوك و دایك و سێ خوشکی چکۆلەتری لە ڕیزەی ئەو شەشسەت گوندییەدا بوون کە بردیاننە قەڵای سپا لە "خۆرەتوو"؛ کوردی دیکەشی لێبوون؛ ئەوانیان بۆ ماوەی دە ڕۆژان لە هۆڵێکی بەرزەمیچا ڕاگیر کرد. گوتی: "ئێمە تەنانەت ئەو وەختیش دەترساین و هەستمان پێدەکرد دەمانکوژن، چونکە دەمانزانی وەختایەك ئینسان لە گوندەکەی دەرکێشن ئیتر چارەڕەشی لە دوورەوە هاوار دەکا."

پاشان ئەوانیان لە لۆرییان پەستاوت و بردیاننە ڕۆژهەڵات، بۆ پێگەیەك لە "تۆبزاوا" لە دەرەوەی کەرکووك. پیاوەکانیان لە ژن و زارۆکی کەمتر لە هەژدە ساڵ هەڵاوارد، ڕووتیان کردنەوە و هەر جلی ژێرەوەیان لەبەرا هێشتن، تێانهەڵدان و سەرەنجام کەلەبچەیان کردن و بە سواری لۆری بەرەو چارەنووسێکی نادیاریان بردن. باوکی

تەیموور و دەستەیەك لە پیاوەکانی تر پاش بیست ڕۆژ مانەوە لە تۆبزاوا بەم شێوەیە شرتوگوم بوون. پاش دە ڕۆژی تر نۆرەی تەیموور هات، وەختایەکی کە ئەو و دایك و خوشکانی و سەدان کەس لە خێزانەکانی تریان بە کەڵەزەری پاڵ دایە نیزیك سی لۆرییەکی سەرداپۆشراو و بردیانن بۆ باشوور. ئەو ڕۆژە یەکبین ئاژاوتیان. نان و ئاوێکیان نەدانێ و بە ناچار هەر لەو لۆرییانەدا کاری سەر پێشاویان کرد. یەکەم کەسانێ نەبوون کە وەوتۆیان دەکرد. نیزیك تاریکانێ لۆرییەکان لە شوێنێك ڕاگیران. ئاوێکیان پێدان، پاشان سەفەرەکە ساعەتێکی دیکەشی کێشا. کاتێك ئاخرییەکەی لۆرییەکان ڕاگیران شەو بەسەر دەستاندا هاتبوو، بەڵام تەیموور لەبەر تیشکەی ڕووناکیی چرای لۆرییەکان توانی بەر لە پیادە بوون چاوێك بە وڵاتیدا بگێڕێ. جەیشی چەکدار دەورەیان دابوون کە هەڵ نەیەن.

هەر لۆرییەك لەسەر لێواری کەندالێکی پەل ڕاوەستابوو. جەیشەکان ڕایاندانە خوار تەپۆڵکە خۆڵەکان. تەنانەت ئەوانەی کە دەشگریان ئێستا بێدەنگ بوون. تەیموور گوتی هەروا کە لەگەڵ دایك و خوشکەکانی ڕۆنیشتبوون و دەستیان تێکگرتبوو، هەستی کرد هەر ئێستا دەمرێ. گوتی: چرکەی زەمان ڕادەبردن، "بەڵام بیرم تەنیا لەسەر ئەمە گیرسابۆوە." پاش ماوەیەك کە لام وایە نیو سەعاتێك دەبوو، جەیشەکان دەسرێژیان کرد. گوتی: "بۆ ماوەیەکی زۆر هەرکەس جووڵەی هاتبا تەقەیان لێ دەکرد." تەیموور کە فیشەکی وە شانی چەپی کەتبوو و لە ژێر هەنگڵی هاتبۆوە دەر، لە قوڵکەڕا بە زگەخشکە هەڵکشا؛ ئەفسەرێك نەڕاندی و تەیموورمان گلۆر کردەوە. ئەمجار فیشەکێکی وە مووغەرەی پشتی کەوت. سەربازەکان ڕۆیشتن بۆلدزێران بێنن هەتا قوڵکەکان پڕکەنەوە و تەیموور ڕاستەوە بوو. کیژێکی بریندار دیت کە هێندێك لە خۆی باو خۆشتر بوو؛ شەقاوێکی لێدوور بوو و لە نێو کوژراوەکاندا کەوتبوو.

تەیموور گوتی: "لەگەڵم وەرە ..." کچە گوتی: "نا لە جەیشەکان دەترسێم." هەستی ژیان و مانەوە زاڵ بوو. خۆی مات کرد هەتا ئەو لۆرییەی بە تیشکی چرا لە

دووی بە دەگمەن نەکوژراوەکان دەگەڕا، تێپەڕی، پاشان بە چـنگەکرە لــە قوڵەکـەوە هەڵکشا. بە چنگان لـەسەر ئـەم تەپۆڵکانـەی بۆڵــدزێران هەڵیاندابوونـەوە بـوودرێکی بچووکی لـێدا و خۆی تیا حەشار دا. هەر جارێـك کـە تیـشکەی چـرای لۆرییەکـەی بەسەر دەکشا، خۆی داویشتە قوڵکەیەکی تر و بەم شـێوەیە خـۆی دەشـاردەوە. پـاش ئەمەی کە لـە نیزیك چوارەم قوڵك خۆی مەڵاس دا دڵی دەبوورەوە هات و لـەسـەرخۆ چوو، کاتێك هاتەوەخۆ قوڵکەکانیان پڕ کردبـۆوە، بـەڵام جەیـشەکان هـەروا لــە وان دەوەروبەران بوون. چوارڕێیانێکی وەبەر چاو هات و ئـەو ڕێیـەی کـە بـە لایـەوە لــە هەموان تازەتری دەنواند، دایە بـەر خـۆی و دوو سـەعاتێك ئـاژوای. هەنـدێك دواتـر سەگوەڕی بیست و عەرەبێکی دەشتەکی بە عەلـەتریکێکەوە لـە خێوەتێك دەرکـەوت و دەستی گرت.

تەیـموور گوتی: "برینەکەم خوێنی لـەبەر دەڕۆیی؛ من عــەرەبیم نــەدەزانی، ئــەویش کوردی." بە ئیما و ئیشارە تێیگەیاند کە برسییەتی؛ شێویان دایـە. عـەرەبی دەشـتەکی زامەکەی شۆردەوە. ئەم بنەماڵەیە سـێ ڕۆژ دواتـر جلکـی عـەرەبییان کـردە بـەری و بردیانە ماڵی یەکێك لـە خزمەکانیان لـە "سەماوا". داڵدە دانی تەیـموور ژیـانی کـابرای سارانشین و خاوخێزانی لـە ئێراقـی سـەددام حوسـێنا تـەواو دەخـستە مەترسـی، بـەڵام ماڵەکە کۆچباری لــێنا و گوێزتییەوە. خزمەکانی ئەم پیاوە بۆ ئەمەی لـە سـەماوا شـك نەهێننە سەر خۆیان، بە ناچار سەدان "میل"یان ڕێبڕی هەتا لـە بەغداوە دەوا و دەرمـان بێنن بۆ برینەکەی. پاشان بۆ مـاوەی دوو سـاڵ و نیـوان تەیــموور قـەت لــەو ماڵــەی سەماوا ترازا نەبوو. زمانی عەرەبی فێر بوو؛ تا ئەو جێیەی کە ئیدی کوردی لـە بیرچۆوە و لـەگەڵ مناڵـەکانی ئەم خێزانە کە ڕازی مانەوەیان نەدرکاند، کایەی دەکرد.

یەکێك لـە کوڕانی تایفەی بنەماڵـە لـە زاخۆ سەرباز بوو، کە شارێکە لـە کوردستان، لـە سنووری باکووری ڕۆژاوا لـەگەڵ تورکیا. ئـەم لاوە لـەگـەڵ یـەکێك لــە سـەربازە کوردەکان بوو بە ئاشنا و ئاخرییەکەی بە وەیدا لـە مامی تەیـمووری ڕاسـپارد؛ بـاوکی ئەم سەربازە ڕاسپاردەکەی گەیاندە مامی تەیـموور. جارێکی تر خەڵکی ئاسایی عەرەب

و کورد ژیانی خۆیان بۆ خاتری کەسانێك دەخستە مەترسی کە نەیاندەناسین. مامی تەیموور دڵنیا بوو کە تەیموور و تەواوی خێزانەکەیان مردوون، بەڵام سەرەڕای تەواوی ئەمانە بە بیانووی کڕینی تەراکتۆرێکی کۆنەوەنوێ بەرەو سەماوا کەوتەڕێ. یەکەم جار تەیمووری سۆراغ نەکرد. دواجار دوو کەس لە مامەکانی تەیموور وێڕای سەربازەی خزمی خێزانەکە و سەربازە کوردەی ئاشنای چوونە سەماوا؛ تەیموورِیان سواری ئوتۆمبیلێك کرد و لای نیوەشەو هێنایانەوە "کەلار". ئەم ڕووداوە لە سێپتامبری ١٩٩٠دا، هەندێك پاش پەلاماری ئێراق بوو بۆ سەر کووەیت. پۆلیس هێشتا لە شەقامەکانی هەموو شار و شارۆچکەکاندا دەسووڕانەوە. لە شەو و ڕۆژدا یەکبین خەڵکیان دەپشکنی و پێناسیان لێدەخواستن.

تەیموور گوتی: "بە دیتنی مامەکانم کەیفم سازبوو، بەڵام بە ڕادەیەك لە سیخوڕ و خۆفرۆشان دەترسام کە نەمدەتوانی بچمە قوتابخانە. لەو سەردەمانەی دەسەڵاتداریێتی حکوومەتی بەعس لە باکووری ئێراقا، بنکەکانی پۆلیس کەلێن و قوژبنی شەقامەکان و تەواوی دانیشتوانییان بە توندی خستبووە ژێر چاوەدێری. کاتێك بنەماڵەکەی بیستی کە پۆلیس لە دووی تەیموور دەگەڕێ, ڕایانگوێزتە شوێنێکی هێور لە چیا و دایان بە شوان؛ کەس‌وکاری کردیانە دەنگۆ کە بۆ کار کردن لە ڕستوورانێك چۆتە بەغدا. ئەو تەنیا لە فێوریەی داهاتوودا، پاش ئازاد کرانی کووەیت گەڕاوە ماڵی مامی. ئێستا مامۆ و سێ پیاوی تر و تەیموور تێکرا چەکدار بوون. مامی گوتی: "بەڵام لەبەر نیزیك بوونی مەودای سپای سەددام و پیاوەکانی – کە لە هەموو شوێنێك هەن – ئێستاش دڵمان لێیدەترسێ." بۆ پەیوەندی کردن بەو ماڵە سەماوایییە و بەجێهێنانی شوکرانەیان، کە هەروا لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتا بوون، هێشتا زوو بوو. چوونی تەیمووریش بۆ قوتابخانە زۆر پڕمەترسی بوو و ئەمە تەنیا شتێك بوو کە تەیموور ئاواتی بۆ دەخواست. تەیموور لەنەکاو سەری هەڵبڕی، لە وێنەی ڕەش و سپی هەڵواسراوی سەر دیواری باوك و مامی ڕوانی و گوتی: "زۆر پەشێوم. هەرگیز

ناپرسم كە چلۆن ئەم شانسە ڕووی تێكردم." درێژەی دا: "ژانـم هەیە و دەمەوێ بچمە لای دوكتۆر ..." و بێئیختیار كراسەكەی هەڵداوە و جێ گولـلـەكانی نیشان دا.

بە بیستنی بەسەرهاتی تەیـموور دڵـم لـەرزی و سەبارەت بـە كەترەخـەمی ڕێبـەرانی كورد كە وا دیارە سەرنـجیان بۆ سەر ئەم لاوە تەنیا لـە دەوری نیشاندانـــی لـەســـەر شاشەی تەلـەفیزیۆن و تەبلیغات پێكردنیدا خولی دەخوارد، هەستم بە ناڕەحەتی كرد. بە بێ متەق كردن لـەتەك دیلمانـجەكەمدا گەڕاینـــەوە بـاكوور. دەتگـوت پەرۆشـی و پەرێشم لێوەگر بوو، چونكە دیلمانـجەكەم گوتی: "ئەگەر توانیبام تەیـموورم لـە كـۆڵ دەكرد و دەمهێنا." دەستەوداوێنی تاڵـەبانی و بارزانی و زۆر كوردی بەدەسەڵات بووم و لـەبەریان پاڕامـەوە كـە دەبـێ تەیـــموور وەك تـەنیا پاشـــماوەی پـەلاماری ئـەنفال لــە دەسرەسی سەددام حوسێن دوور بكرێتـەوە و بـۆ چارەســەر كـران و خوێنـدن بـەڕێی دەرەوە بكرێ. وەك هەواڵـنێرێك، وەك غەوارەیەك، هیچ داخلێی بـە منـەوە نـەبوو كـە كوردان چ دەكەن و چ ناكەن، بەلاّم لـە ڕووی سافیلكەییەوە وای بۆ چووم كـە ڕنگـە دواتر، ڕۆژایەك حوكماتی سەددام حوسێن لـەبەر ئەنـجامدانـی ڕەگـەزكوژی شـكایەتی لـێبكرێ و جا كە وا بێ بوون و مانی قوتاربوویـەكی وەك تەیـــموور زۆری كـەلك و بایخ دەبێ.

لام وایە هێندێكم پێ لـێهەڵێنابوو. تاڵـەبانی پاش ئەمەی كە وتەكانی بیـستم، پیلـی گرتـم و لـەسەرەخۆ گوتی: "سەدانهەزار تەیـموور لـە كوردستاندا هەن." هەڵبەت كە بـە ڕواڵـەت بڕوانـی قـسەكەی وا نیـە. ئەمـــجۆرە بـیر كردنـەوە لـەوپـەڕی خۆیـدا لێكولـووس كردنی دمە تیژەكانی مێژووی نـاودێركراو بـە ڕاسـتەقینەكان بـوو و هـەر چەشنە هەستی بەرپرسایەتی تاكەكەسی تێدا دەبـرد. ئـەم مەنتیقـە بـۆ كەسـانێكی وەك سەددام حوسێن — و تەنانەت بارزانی و تاڵـەبانیش كە بۆ ماوەی دەیـان سـاڵ خـەریكی بەربەرەكانی دەسەڵاتێك بوون كە زۆرتر ئالوودە بە شەڕەنگێزی و چەپەڵكاری بووە — قبووڵ دەكرا. وە هەر حاڵ، لێپرسینەوە و هەڵپێچانی حوكمـاتی سـەددام حوسـێن لــە بابەت چەپەڵكاری و شەڕەنگێزییەوە بە هیچ بارێكدا گرنگایەتی خۆی بۆ كـوردان لــە دەس نەدابوو و شاهیدی دانی تەیـموور بەم قۆڵـەدا كارێكی ژیانەكی بوو. بـەلاّم وتـەی

تاڵەبانی بەم واتایە بوو کە تەواوی کوردەکانی ئێراق کوێرەوەرییان دیوە و ئەم خەڵکە چەوساوەیە تەنانەت پێویستییان بەمە نیە کە غەوارەیەکی نیازپاك لە شتێك حاڵی بێ کە خویایە و پێویست بە گوتن ناکا.

بێپسانەوە بیرم لەم ڕەوت و ڕووداوە دەکردەوە ... دوو هاوین دواتر لەسەر ڕێی گەڕانەوەم بۆ تورکیا، لە بارزان ئیستێکم کرد هەتا چاوێك بە هەرەس و کاولەکانی ئەم گوندەدا بگێڕم. بارزانییەکان چ لە سەردەمی عوسمانییەکاندا و چ پاشی وی لە زەمانی حکوومەتی ئینگلیسی و حوکماتی پاشایەتی و ڕژێمە هەمەڕەنگەکانی کۆمارییدا زۆر جاران بە هۆی سەرهەڵدانی یەك لە دوای یەك وەك "نموونەیەك بۆ تەمبێ گرتوویی" هەڵبژێراو و دیاری کرابوون. بەڵام وەختایەك سەددام حوسێن لە سزادانی کوردستان بۆوە, "بارزان"یش ئیتر گوندێکی وێران بوو چەشنی هەزاران گوندی تر کە خاپوور کرابوون و دوای ئەوەش گوندێك بوو کە زەوی بەرێژەوی نەبوو. لە بەرەکەتی خێر و خێراتی ئەڵمانییەکانەوە سەد خانووبەرەیەك خەریك بوو ساز دەکراوە و ژیانی گوندەکی وردە وردە دەیەویست ڕەگاژۆ بکاتەوە.

هەروا کە لەگەڵ دوو کەس لە دۆستانی ئەمریکایی، کە یەکەم جار بوو دەهاتنە سوێی کوردستان، بە دەوری کەلاوەکاندا دەسووڕاینەوە، تووشی عەبدوسسەلام بارزانی هاتین لە گەرمای ١١٥ پلەی فارانهایتدا، خۆی وە پەنا دارێك دابوو. عەبدوسسەلام کە بە ناوی باوەگەورەی بەناوبانگییەوە کرابوو کە عوسمانییەکان لە دەسپێکی شەڕی یەکەمی جیهانیدا لەبەر دەس تێکەڵ کردن لەگەڵ ڕووسیا لە داریان دابوو، بەر لە گەڕانەوەی بۆ بارزان لە ١٩٩١دا لە سەردەمانی دوورخرانەوەی درێژخایەنی لە ئێران، مامۆستای عەرەبی و ئینگلیسی بوو. ئەو لە ساڵی ١٩٣٩دا هەر لەم گوندە لە دایك ببوو و "بارزان"ی بە کۆمەڵانی مەسیحی و جوولەکەوە وە بیر دەهات کە لەمێژ بوو ڕۆیبوون. شوێنی کلیسا و مزگەوت و کەنشتێکی نیشان دام کە بەر لە خاپوور کران بە کەرەسەی تەقینەوە، لە پەنا یەکتر بوون. گوتی: "ئیسحاقم دێتەوە بەر زەین کە بە گاجووتان مەزراکەی دەکێڵا." ئاماژە بۆ ئەم مەبەستە بوو کە بە

پێچەوانەی زۆرێك لە شوێنەكانی جیهان، كوردستان ڕێی جوولەكانی دەدا كە خاوەن زەویوزار بن و كاری لەسەر بكەن.

گوتی: "هەموو ئاواتمان دەخواست بگەڕێینەوە ئێرە — خۆی و نۆ منداڵەكەی كە گشتیان خوێندەوار بوون و لە جێی وەك تاران هەتا "ئۆرلاندۆ"ی فلۆریدا، پەراگەندە بوون. بەڵام لانیكەم بۆخۆی گەڕابۆوە، وەك دەمانبینی. گوتی: "ئێستا دوودڵین و لەم درندەیە تۆقیوین." مەبەستی سەددام حوسێن و ئاماژەی بەم هەلومەرجە متمانە بێنەكراوە بوو كە "شەڕی ناتەواو"ی بووش لە كوردستان پێكیهێنابوو. لە ڕاستیدا تەواوی ژیانی ئەم پیاوە لە لێقەوماوی و دەربەدەریدا تێپەڕیبوو.

مەلا مستەفا بارزانی و شێخ ئەحمەدی كاكی كە پیاوێكی یەكجار زۆر خاوەن ڕێز، بەڵام سەمەرە بوو،[1] بۆ یەكەم جار لە سەرەتای ساڵانی دەیەی ١٩٣٠دا "بارزان"یان خستە بەر سەرنجان و سەرێشەیان بۆ نایەوە. ئەم دووە دژی نەخشەی ئینگلیسییەكان كە دەیانویست هۆزە مەسیحییەكانی هەكاری لە بارزان و دەوروبەری بنەگر كەن ڕاستەوە بوون. (هەكاری ناوچەیەكی شاخاوی و زۆر چڕ و سەختە و كەوتۆتە باكوور و ئەوبەری سنوور.) لە شەڕی یەكەمی جیهانیدا مەسیحییەكانی هەكاری شانبەشانی ڕووسیای هاوئایینیان دژی عوسمانی كەوتبوونە شەڕ، لە چیاكانیان ڕاو نرابوون و پەنایان بۆ دەوروبەری گۆلی ورمێ بردبوو. بریتانیا ئەم شەڕكەرە چیاییانەی بە ناوی "تاقمەكانی چەكداری ئاسۆری" هێنایە ژێر ڕكێف. ئەم شێوەیە، واتە كەڵك وەرگرتن لە كەمینە نەتەوەكان بۆ پاراستنی هێمنی و هێوری، شێوەیەكی كۆلەداریی باو بوو. ئەم

---

١– عەبدوسسەلام دێتەوە بیری كە جارێك یەكێك لە مریدانی شێخ پێیگوت كە خەڵك بە خراپ دەدوێن و دەڵێن شێخ ڕۆژوو ناگرێ و نمێژ ناكا. گوتی: "گوتم هەر ئەوەندە دەڵێن؟" كاتێك پرسیم ئەو شێخە فیرقەیەكی تایبەتی ساز كردووە، بە ڕاوێژێكی زیرەكانە گوتی: "ڕەنگە ئەم باسە زۆر دوور نەبێ لە ڕاستی." پاشان ئایەتێكی قورئانی خوێندەوە: "نمێژ بكەن هەتا منتان بێتەوە بیر." هەروەها درێژەی دا: "ئێمە داكۆكی دەكەینە سەر وەبیر هێنانەوە هەتا نمێژ كردن. هێندێك دەڵێن دەبێ مرۆڤ لە شەو و ڕۆژدا سێ یان پێنج جاران نمێژ بكا، بەڵام ئەگەر خواوەند هەمیشە لە بیری ئادەمیزادا بێ، هەمیشە هەیە، چ لە خەودا، چ لە بێداریدا، چ لە وەختی كار و ڕێڕۆیشتندا.

تاقمە چەکدارانە لەگەڵ سپای تازە پێ‌گرتووی ئێراقدا بە سەرکردایەتی ئەفسەرانی ئینگلیسی چوونە شەڕی سەرهەڵداوانی کورد.

ئاخرییەکەی ئینگلیسییەکان تاقمە چەکدارەکانی ئاسۆرییان بەرەڵڵا کرد. ئەم کارە ئاکامی ئاڵوگۆڕی ئیشە سەرەکییەکانی ئیمپراتۆریێتی بوو و ڕووداوی تاڵی لێ‌کەوتەوە. بریتانیا سەرەنجام ڕەزامەندی کۆمەڵی نەتەوەکانی سەبارەت بە نەوتی کەرکووك لە ساڵی ١٩٢٦دا وەرگرت و بە گۆڕینی سەرپەرستێتی بۆ ناسینی ڕواڵەتیی ئێراق وەك وڵاتێکی سەربەست لە ١٩٣٢دا تەقەلای کرد ناسیۆنالیزمی عەرەب بێدەنگ بکا. ڕاگوێزرانی دەسەلات بۆ دەوڵەتی هەوسارکراوی ئێراق بە واتای کۆتایی هاتنی پشتیوانیی بریتانیا بوو لە تاقمە چەکدارەکانی ئاسۆری، کە کەوتبوونە بەر نادلۆڤانی هەردوو کۆمەڵی عەرەب و کوردی ئێراق. کوردانیش بە هەق لەم بارودۆخە تۆقیبوون و ئەویان وەك کۆتایی هاتنی خەیاڵاتی خۆشیی خودموختاری – ئیدی چ بگا بە سەربەخۆیی – دانا و تەواو پەرۆش بوون. ئەم ڕاگوێزرانی دەسەڵاتە بۆ دەوڵەتی هەوسارکراوی ئێراق – زیادە لەم نەخشەیەی کە ئینگلیسییەکان بۆ بنەگر کردنی ئاسۆرییەکان بوویان – یارمەتی هەڵگیرسانی ئاگری شۆڕشی دووبرالەی بارزانی دا.

لەوان سەردەماندا کە لێوردنی زیاتر باو بوو, دووبرالە و پەیرەوانیان دوورخرانەوە بۆ خوارووی ئێراق و دواتر ماوەیەك لە سلێمانی خرانە ژێر چاوەدێریٚ. شێخ ئەحمەد ڕێبەری دینی و دنیایی بارزانییەکان بوو, بەلاّم ئەمە مەلامستەفا بوو کە لە سلێمانی ڕایکرد و ئالاّی شۆڕشی سەرەتا لە ١٩٤٣ و پاشان لە ١٩٤٥دا هەڵکرد. ئینگلیسییەکان لە گەرمەی شەڕی دووەمی جیهانیدا, زۆریان خۆش لەم ڕەوت و ڕووداوانە نەهات. هێزێکی سزادەری زەبروەشێنیان بۆ سەرکوتی دووبرالان هەنارد. عەبدوسسەلام کە منالۆچکەیەك بوو لەگەڵ مامەکانی بە شاخەکانی ئێراقا ڕایکردە ئێران و لە ئێران بارزانییەکان بوونە یەکە پاڵپشتی "کۆماری کەم تەمەنی مەهاباد."

لە ١٩٤٧دا کاتێك ژێنێراڵ بارزانی لە باتی گەڕانەوە ئێراق و بەرەورووی تاوانی سەربزێوی بوونەوە یا پەنا بردنە بەر ئێران بەری دایە ڕێپێوانە حیماسییەکەی خۆی بۆ

یەکێتی سۆڤیەت, باوکی عەبدوسسەلام لەگەڵیا چوو. بەڵام عەبدوسسەلام و شێخ ئەحمەد و زۆربەی مێران و تەواوی خێزانەکان ئاودیوی سنوور بوونەوە و گەڕانەوە ئێراق و خۆیان بە دەستەوە دا. سەرەتا ئەوانیان لە کوردستان زیندانی کرد, پاشان ناردیانن بۆ کەربەلا — شاری پیرۆزی شیعان — و جا ئەوجار دوورخرانەوە بۆ بەندەری بەسرە و بەغدا. لە ١٩٥٨دا باڵادەستانی شۆڕش کە حوکماتی پاشایەتی ئێراقیان ڕووخاندبوو, شێخ ئەحمەدیان ئازاد کرد و ئەویش بێ ڕاوەستان لە بابەت گەڕانەوەی مەلامستەفا و هاوڕێیانی کەوتەخۆ. عەبدوسسەلام گەڕایەوە بارزان; باوکی لە ١٩٦١دا چووە پاڵ شۆڕشی بارزانی; لە ١٩٧٥دا بازرەی ئێران بوو, هاتەوە ئێراق و دوورخرایەوە بۆ باشوور.

عەبدوسسەلام لەسەر یەك تەنیا چواردەساڵان لە بارزان ژیا بوو و سەرەڕای نارەحەتییەکی کە لە بابەت دەستێوەردانی غەواران لە کاروباری کوردستانەوە هەیبوو, تاوانی ئەم خەتا و هەڵانەی کە خەڵکی تووشی وەها چارەنووسێك کردبوو لە چاوی خودی ڕێبەرانی کوردی دەزانی. بە داخ بوو بۆ ئەو هەشت هەزار بارزانییەی کە ١٩٨٣ بێسەروشوێن چوون. بۆ ئەمەی کە بتوانێ باشتر ڕێبەرانی کورد بداتە بەر ڕەخنە, خۆی لە جێی ئەوان دادەنا و ئەم دەنگەی دەبردەوە پاش کە لاوەکی بەرپرسی ئەم ڕووداوەیان پێکهێناوە. دەیگوت: "ئێمە نابێ جگە لە خۆمان کەسیتر سەرکۆنە بکەین. وەختایەك ئێمە یاریدەی دوژمنانی سەددامـمان دەدا و خەڵکەکەمان لە ژێر حوکم و دەسەڵاتی ئەوا بوون و ئێمە تەنیا بە دووی قازانجی خۆمانەوە بووین, کوا بیرمان دەکردەوە کە سەددام حوسێن بڵێی چ بکا؟ من کە لە ئێران بووم دەستی وێمرانەدەگەیشت, بەڵام خۆ دەستی دەگەیشتە ئەوانەی لێرە بوون و بەداخەوە هاوناوی من بوون و پێیان دەگوترا بارزانی."

فاتم حەمەساڵە — کە یەکێك لەم خانووبەرە ساکارانەی وێدرا بوو کە بە پووڵی ئەڵمانییەکان چێ کرابوو — خۆی بە یەکێك لە بارزانییە بەختەوەرەکان دەزانی. کاتێك دایك و باوکی چوونە مەهاباد, ئەو منداڵ بوو; دواتر لەگەڵیان گەڕاوە ئێراق; لە

وەختی شکستەکەی ساڵی ١٩٧٥ لە ئاخرین دەما تـەمای گـرت کـە ئـیتر نەچـێتەوە ئێران. گوتی: "یەستـرێکمان نەبوو, هەتا سنووریش ڕێیەکی دوور و درێژ بوو." ئـەویان لەگەڵ بنەماڵەکـەی دوور خـستەوە بـۆ باشـوور. "هـەر خێزانـە کوردێکیـان بەسـەر گوندێکا دابەشی, بۆ ئەوەی لێکدابڕێین." بەڵام پاش پێنج ساڵان خـۆی و بنەماڵەکـەی ئیزن دران بگەڕێنەوە کوردستان و نێردرانە "قوشتەپە".

وەختایـەك سـەددام حوسـێن لـەو بەرەبەیانـەی ژووئیـەی ١٩٨٣دا بـە بـێ هـیچ ورپایی‌دان و بێ‌ڕاگەیاندنێك ئەو ٨٠٠٠ بارزانییەی کۆ کردەوە, شـووەکەی لـە مـاڵ نەبوو, چووبوو بۆ لای دوکتۆر و لـە ئاکاما توانی خۆی حەشـار دا و زینـدوو وەمێنـێ. بەڵام کوڕە یازد ساڵانەکەیان "بزر بوو. گوتی: "پێیان‌گـــوتین پیاوەکانیـــان بـــۆ کۆبوونەوەیەك دەوێ و سێ ڕۆژی دی دەگەڕێنەوە. بەڵام کەس فریـوی ئـەم گوتانـەی نەدەخوارد. ئەو ژنانەیان کوشت کە دەیانویـست پێـشی بردنـی شـووەکانیان بگـرن و زەحـمەتیان وە بەر هێزەکان نابوو. ژاندرمەیان نارد و ئێمەیان کوتا و ئـاو و کارەبایـان لـێ‌هەڵبڕین. هەتا دوو مانگان هەر دەهاتنەوە هەتا بزانن داخوا پیاوێك مـاوە یـان نـا و پێیان‌گوتین ئێوە دەبێ لێرە بـمرن." ئەم ژنە لەسەر یەك نیزیکەی ٣٠٠ کەس لـە کـەس وکار و ئەقرەبای دوور و نیزیکی تێدا چوو بوون, بەڵام دوو کوڕ و پێنج دۆتی مابوون. لـە ١٩٩١دا هەر کە توانی گەڕایەوە بارزان و دوو زستانی سەخت و ساردی لـە ژێـر خێوەتا ڕابوارد. گوتی: "تەواوی ڕەز و باخەکان تێك‌ومـــەکان دراو و ســـووتابوون, گایەکیشمان نەبوو جووتی پێ‌بکەین." دەست‌وپلی بە کاروبـاری مـەزرا و بـژارەوار و هەڵکەندنی دڕك‌وداڵ و خۆش‌کردنی زەوی‌ـوزار بـۆ ناشـتنی دارەسـێو و هەنـجیـر و چاندنی بێستان و چەقاندنی هەنار و پستەیەکی کە تەمای وا بوو دیسان ڕەنێویان بێنـێ, شەقار شەقار ببوو. گوتی:"لە ڕابـردوودا بارزانییـەکان پـتر لـە کـوردانی دی تووشـی دەرد و ئازار هاتبوون؛ بەڵام ئەمـجار هـەموو لایـەك چەوسـانەوە, تێکـڕا زەحـــمەتیان ڕێنیشت."

## بەشی ٩

# بوولەرزەی کۆمەڵایەتی تورکیا

*ئانکارا ڕەنگە بتوانێ دەریا وشك‌کا, بەڵام ناتوانێ ماسی بگرێ.*
*یاشار کەماڵ*

تەنیا وڵاتێکی کە وەکوو کۆیلان سەبارەت بە ڕەگ و ڕیشەی ویشك و کرژهەڵاتووی بنەڕەتیی خۆی خاوەن ئیمان و وەفادار بووبێ توانیویەتی وەك تورکیا ئا بەم شێوەیە لە دوایین دەیەی سەدەی بیستەما خۆی بخاتە تەنگەژەوە. جا چاوت لە گاڵتەی ڕۆژگار بێ, هەر ئەم کوردانەی لە تورکیادا کرانە یەکەم قۆچی قوربانیی, ئێستا پاش حەفتا ساڵان خۆیان لە بارودۆخێك‌دا دیوەتەوە کە کەوتوونە ریزی پێشەوەی ئەم هۆکارانەی وا پەیتاپەیتا حوکماتێك بەرەو باریك و بنێسی دەبەن کە مستەفا کەمال ئاتاترك بناغەی ڕۆنا. بە کاو نەگەینی دەوڵەتیش لە شوێنی خۆی بۆتە هۆی ئەوەی هەتا ئاواتی زۆرێك لەم ترکانەی هیوادار بوون باشترین هەلی ڕێککەوتوو بۆ وە پیشەسازی گەڕانی پتر و پەرەپێدانی دێموکراسی لادینی و گەشەی سامان و ئێروو وڵاتی لێ‌بکەوێتەوە,تووشی مەترسی بێ. تەواوی ئەم ئاواتانە لەگەڵ ناکامی ئەو دەوڵەتانەی کە پاش ١٩٤٨ هاتنە سەر دەسەڵات و نەیانتوانی کۆتایی بە شەڕی نێوخۆ بێنن کە

خەریك بوو لە وڵاتا تەشەنەی دەکرد و زۆریش پڕ خەرجوبەرج بوو, وە ناهومێدی گەڕان.

لەگەڵ ئەمانەشدا ئەم دەرفەتانەی کە لەسەر کاغەز بۆ تورکیا ڕێککەوتبوون, قەت لەمە باشتر نەبوون. وێڕای کۆتایی هاتنی شەڕی سارد ولێکهەڵوەشانی یەکێتی سۆڤیەت, تورکیا بۆ یەکەم جار لە ماوەی دووسەت ساڵی ڕابردوودا ئیدی لە لایەن دراوسێی بە دەسەڵاتییەوە – ڕووسیا – نەدەکەوتە بەر هەڕەشە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەم ئاواتانە نەهاتنە جێ و خەیاڵاتی وە دەس هێنانی توانایی و سەروەت و سامان لە کۆمارە ترکزمانەکانی کە لە ژێر دەسەڵاتی درێژخایەنی مەسکەو ڕزگاریان ببوو پووچ دەرچوو. کۆماری تورکیا بە دڵبەستن بە ڕواڵەتی دێموکراسی و ئەندام بوون لە پەیمانی ئاتلانتیکی باکووریدا و کەوتنە ریزی هەرە پێشەوەی ئەم بەرەیە و بەشدار بوونی لە دامەزراوە هەمە چەشنەکانی ئورووپاییدا, خۆی بەستبۆوە و بێپسانەوە مەیل و تاسەی ڕۆژاوایی خۆی وەك وەفاداری بە خەیاڵاتە "نوێخوازی"یەکەی ئاتاترك بە تەڕیعالەم دەکوتا. بەڵام بە تێپەڕ بوونی زەمان, کەمالیزم وا بوو بە شوێنی ڕەنگدانەوەی بیرۆکە هەمە چەشنەکان و خوازراوە لە شۆڕشەکانی فەڕانسە و ڕووسیا و شێوەی بیری "مووسوولینی" لەسەر وڵاتی یەکپارچە, ئیتر واتایەکی "نوێ" نەبوو... ئەو شتەی کە وا زۆر بەگەرمە شوێنی لەسەر مستەفا کەمال دانابوو بۆ بنیاتنانی کۆماری تورکیا لە **١٩٢٣**دا, بیروڕاکانی مووسوولینی بوو.

ڕێز و کڕنۆشی باوی حکوومەتیی بۆ ئەم "ناوەند"انەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ قاڵورتر دەبوون, لەسەر سندووقەکانی دەنگدانا وە درۆ دەخرایەوە. لەنگ و لۆری کارەکە هەر چۆنێك بوو بێ تورکیا – لە مابەینی گۆدەتاکاندا – هەروا وڵاتێکی بە ڕواڵەت دێموکراتیك بوو کە بیروڕای هەڵبژاردنی ئازاد و فرەحیزبی دەپاراست. ئەمەش خۆی لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ ئێران و ئێراق و سووریادا کە هەر کام جەماوەرێکی گەورەی کوردیان لە خۆ دەگرت, جیاوازییەکی بەرچاو بوو. بەڵام لە هەڵبژاردنی ساڵی **١٩٩٥**دا لە سەتا چلوشەشی خاوەنانی حەقی بەشدار بوون لە هەڵبژدندا, دەنگەکانی خۆیان زایە کرد: سەرەڕای لە گۆڕا بوونی کەڵەزەربی قانوونی بۆ بەشداری لە هەڵبژاردنا, بەشدارییان نەکرد, دەنگەکانیان بە لاڕێدا برد و دایان بە پاڵێوراوانی

ئیسلامی یان بەو گچكە حیزبانەی كە لەبەر وە دەس نەهێنانی لە سەتا دەی تەواوی دەنگەكان و نەگەیشتنە ڕادەی پێویست بۆ چوونە پارلەمان, قرت بوون. ڕۆژنامەی "حورریيەت" كە سەر بە "گەڕیانی سیاسی بەرفرەوانی" وڵاتە بە داخ و كەسەرەوە بەم ئاكامە گەیشت كە تركان بۆ یەكەم جار كەوتوونە دژایەتی كردنی بیروڕای ئاتاترك و "ناوەند"ەكانی كۆماری توركیا. تەریق بوونەوە و تێشكاویی هەڵبژاردن بە ڕادەیەك بوو كە یەكێك لە ڕۆژنامەنووسانی بە ئەزموون نووسی: "ئەو دەزگایەی كە لە توركیادا حكوومەت دەكا, دەوڵەتێكی هەڵبژاردە نیە, بەڵكوو "حوكماتێكە" كە لە لایەن هێزەكانی "پەنامەكی"یەوە هەڵدەسووڕێ كە بۆ قوتار كردنی خۆیان و "سیستمی ئیدئۆلۆژی باو" پاروان داوێنە بەردەمی دەوڵەتانی بەدرۆ."

لە سەرەتای نوامبری ١٩٩٦دا كارەساتێكی ئوتۆمبیل لە یەكێك لە شارێیەكانی سەد میل ئەولاتری باشووری ڕۆژاوای ئیستامبووڵ ڕووی دا كە ئەم مەبەستەی بە شێوەیەكی وا ڕوون دێنایە بەرچاو كە هیچ "نیشتمانپەرستێكی" توند و تیژیش نەیدەتوانی دەسكیسی دەزگای حكوومەتی توركیای تێدا وە درۆ بخاتەوە. ئەو كەسانەی كە لەم ڕووداوەدا لەڕێوە مردن بریتی بوون لە یەكێك لە شاجوانانی پێشووی توركیا و پاسەوانە پیاوكوژەكەی كە لەبەر ڕاكردن لە زیندانی سویس بە تاوانی دەس تێدابوونی لە كڕین و فرۆشتنی مەوادی موخەدیردا, پۆلیسی نێونەتەوەیی بە بێ‌وشوێنییەوە بوو؛ سێهەم كەسی كوژاو لەم ڕووداوەدا, یەكێك لە باڵادەستانی دەزگای ئاساییش بوو كە ماوەیەكی درێژ لە شاڵاوی دژی پێشمەرگەدا لە كوردستان چالاكی نواندبوو و لەم بابەتەوە بەناوبانگ بوو. تەنیا پاشماوەی ئەم ڕووداوە "سیدات بوجاك", دەربەگی كورد و ئەندامی پارلەمان بوو كە سپایەكی تایبەتی جاشانی بۆ حكوومەت تەیار كردبوو و دەوڵەتی توركیا بە دانی مانگانەیەكی یەك میلیۆن دۆلاری بۆ مووچەی جاشەكانی ڕێ‌وشوێنی "حیسابدارێتی" خۆی ژێر پێ خستبوو. دوكتۆری چارەسەركەری بوجاك گوتی كە نەخۆشەكەی تووشی فەرامۆشیی كاتی هاتووە كە جارێ ناهێڵێ ئەشتەكی باش و بە كەلك وە بیر بێنێتەوە. بەڵام چەند ڕۆژێكی نەكێشا كە دۆستی لەمێژینی ئەم تاقمە چواركەسییە, یانی "محەممەد ئاگار", وەزیری نێوخۆ,

ناچار بوو دەس لە کار بکێشێتەوە. ڕاگەیەنەرە گشتییەکانی تورکیا لەپەستا پەردەیان لەسەر بێئابڕوویی و چەپەڵکارییەکان لا دا: ئەم کارەیان لە چەك‌وچۆڵ و چەکی دەنگبڕدار و دەرکردنی چەند پەساپۆرتی ڕەسمی و پسوولەی ئیزنی چەك هەڵگرتن و پێنج شەش وەرەقەی پێناسین بۆ "عەبدوڵڵا جاتلی" بە ناوی جۆراوجۆرەوە دەس پێکرد. یەکێك لە خاڵە زەقەکانی ئەم ڕەوت و گەڕیانە دەریدەخست کە عەبدوڵڵا جاتلی پتر لە دە ساڵان یەك لە خافڵکوژە ڕەسمییەکانی دەوڵەت بووە و ئەمە سەرەڕای دەورێك بوو کە لە ساڵی ١٩٧٧دا بۆ قوتار کردنی "محەممەد عەلی ئاگجە" لە زیندان گێڕابووی: محەممەد عەلی ئاگجە هەر ئەو کەسە بوو کە دواتر پەلاماری گیانی "پاپ"ی دا. بەڵام لەم نێوەدا و لەم ڕەوت و ڕووداوانەدا هەمیشە یەکانگیری و خاڵێکی هاوبەش بەدی دەکرا: پەرەگرتن و بڵاو بوونەوەی جیناياتی ڕێکخراو لە سپا و هێزەکانی ئاسایش و دەوڵەت و پارلەماندا, کە زۆر جاران قاچاخگەرێتی مەوادی موخەدیر و کوشتن و بێ لێ‌هەڵێنانەوەی ئەو چەند بەختەوەرەی کە لەم "حکوومەتە نێو حکوومەتییە"دا چالاك بوون, وە بەرچاو نەدێنا. ئەمانە سەرجەم نێوك و نێوەندی هەر ئەو شتەیان پێك‌دێنا کە لە قساندا بە تاقمی "لایەنگرانی شەڕ" مەنشوور بوو, کە چاوچنۆکی ماڵ‌کۆکردنەوەی خۆیان بە "نیشتمان‌پەرستی کەمالیستی" پەردەپۆش دەکرد و دژبەری چارەسەری کێشەی کوردستان بوون بە باری سیاسی‌دا. شتێکی کە بەتایبەت کەمالیستەکانی تەواو داخورپاند, سەرهەڵدانی حیزبی ئیسلامی ڕیفاه بوو, کە وەك تەنیا حیزبی بەربڵاوی وڵات هاتە مەیدان: ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنا ٢١٪ تەواوی دەنگەکانی وە دەس هێنا کە سێ‌بەرابەری ڕێژەی ئەو دەنگانە بوو کە لە هەڵبژاردنی ١٩٨٧دا کۆی کردبۆوە. لە ١٩٩٤دا ڕیفاه زۆربەی شارەوانییەکانی گەورەی شارە قەوغاکانی تورکیای وەك ئانکارا و ئیستامبووڵ و ئیزمیری خستە ژێر ڕکێف.

زۆربەی کوردان بۆ تەمێ کردنی حیزبە گەورە لادینەکانی وڵات کە ئەوانیان بە بەرپرسی بارودۆخی تاڵ‌وتوونی کوردستان دەزانی, دەنگیان دا بە ڕیفاه. بەڵێنەکانی ڕیفاه و وادەی کۆتایی هێنان بە شەڕی کوردستان و ئیزنی کەلك وەرگرتن لە زمانی کوردی لە ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن و قوتابخانەکانا, گەشەی بەم ڕەوتە دا. دەوڵەت بە ڕادەیەك لە دەسەڵات وە دەس هێنانی "ڕیفاه" تۆقیبوو کە مانگێك بەر لە هەڵبژاردن بۆ

شێواندنی كاروباری ئیسلامییەكان لـە كوردسـتان, ئیزنـی دا بـە هـادپ (HADEP)، ئاخرین حیزبی ئازادی كورد كە پاڵێوراوەكانی بۆ هەڵبژاردن بناسێنێ. سەرەڕای شەڕ و سەركوتێكی دە ساڵانە لـە كوردستان, چالاكی هەڵبـژاردن زۆر گـەرم و لـەگوڕ بـوو. ژنانی كورد كە بە گوێرەی دابی كۆن دەكەوتنە پشتەوەی شانۆ, بۆ یەكەمجـــار ئـــەم نەریتەیان وەلا نا و لـە كۆبوونەوە سیاسییەكان لـە دیاربەكر و باژێرە كوردنشینەكانی ترا بەشداریان كرد و بوونە لاگیر و خوازیاری كۆتایی هێنان بە سەركوت و زۆرەملی.[1]

لـەم بەینەدا شتێكی تازەی دیكەش سەری هەڵـدا: بنكـە و دامـەزراوە گـەورەكانی پیشەسازی و بازرگانێتی, یانی ئەو بەشە لـە توركیای تـازە كـە تـەمای وابـوو كـۆت و بەندی بە بێنەوبەرەی شێوازی كەمالیستی هەڵپسێنێ و خۆی قوتار كـا و وڵات بـەرەو بارێكی ئاواڵـەتر باژوێ, بۆ یەكەم جار گوتیان كە دەبێ شەڕ دژی كوردان كۆتـایی پـێ بێ. لـە **١٩٩٥**دا, یەكێتی گەورەی خاوەنكـاران ئاكـامی "توێژینـەوە و موتـاڵا"یـەكی لـەسەر ڕاسپاردەیی خۆی دەرخست كە نیشانی دەدا كـوردان بـە پێـچەوانەی كوتـەی پ.ك.ك. و داكۆكی دەوڵـەت لـەسەر ئەمـەی كـە بـە خـەڵك بـسەلـمێنن خوازیـاری سەربەسـتین, داواكـاری جیـا بوونـەوە نـین و بـەڵكوو دەیانـەوێ كـە لـە پارێزگـا كوردنشینەكاندا لـە مافی سیاسی هاووڵاتییانی "پلـە یەك" بەهرەوەر بن و ئەمـە هـەق و خواستێك بوو كە زۆر وە درەنگ كەوتبوو. ئاشكرا نیـە چ بـوو و چ هاتـە پـێش كـە

---

١–سەرەڕای دەربڕینی ڕەزامەندی درەنگوەخت لـە بابەت پاڵێوراوەكانی "هـادپ"ەوە, ڕیفـاه ٢٧٪ی دەنگـی پارێزگا كوردنشینەكانی وە دەس هێنا و لـە كوردستاندا كەوتە پلـەی یەكەم یـا دوو. بـەڵام هـادپ لـە ناوەنـدە قەوغاكانی كوردا زۆر سەركەوتوو بوو: هەكاری ٥٤٪, دیاربەكر ٣٧٪. لـەم ناوچانە دەنگدەران بڕوایان وابوو كە هادپ پارێزگاری لـە پێناسەی كوردی دەكا. بەڵام لـە شارەكانی ڕۆژاوای توركیا گەلێك ناسەركەوتوو بوو. ئەم ناكامییە, یانی (٤/١٧٪ لـە تەواوی وڵاتا) لـەبەر هێندێك هۆ و هۆكاری جۆراوجۆر بوو: ناونووس نەكردنی ئەو كوردانەی بۆ شارەكانی تر دوور خرابوونەوە, كەم بوونی هەل و مەودا بۆ هەڵسووڕانی چالاكی هەڵبژاردن, مەیلی خەڵك بۆ زایە نەكردنی دەنگەكانیان و ترس لـە پشتیوانی هادپ بۆ پ.ك.ك. و هاوبەندی هادپ لـەگەڵ حیزبە بچووكەكانی باڵی چەپ. (بە وە دەس نەهێنانی لـە سەتا دەی دەنگە پێویستەكان بۆ چـوونە پارلـەمانـەوە) ئاكامەكەی ئاوای لێهات كە زۆرێك لـە كوردان, بەتایبەت لـە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهـەڵات بـەم ئاكامـە بگەن كە لـە بەشدار بوونی ڕاستەقینە لـە هەڵبژاردنا بێبەش كراون.

کۆمەڵی پیشەیی و بارزگانێتی ئاخرییەکەی ئەم غەیرەتەی وەبەرهات کە بڕوای خۆی دەقودۆغر دەربڕێ؛ باشە بۆچی ئەم گشتە ساڵە سەری دە قاپێلکی خۆی نابوو و متەقی نەدەکرد؟ هەرچۆنێك بوو ئەم خورد بوونەوە لە قازانجی تاکەکەسی سەرەنجام باسەکەی کێشایە ڕۆژنامە و ڕاگەیەنێرەکان.

سەرکەوتنە تازەکانی تورکیا لە کاروباری بانکداری و قوماشتەنی و سازکردنی کەلوپەلی هەمە چەشن لە ئوتۆمبیلەوە بگرە هەتا یەخچاڵ, بە هۆی هەڵوێستی بیرتەسکانەی دەوڵەت کە چارەسەریی ئەم شەڕە درێژخایەنەی بۆ نەدەکرا, کەوتە مەترسی. بەڵام تەنانەت کۆمەڵی سەنعەتی و بازرگانێتیش بە ڕادەی پێویست پتەو و خۆڕاگر نەبوو. ئەم کۆمەڵە وەها لە داهاتووی هاتنە سەر دەسەڵاتی حیزبی ڕیفاه تۆقی کە پاش ڕاگەیەندرانی ئاکامی هەڵبژاردن لەڕێوە دەستی یەکێتی دایە نیزامییان. دوو باڵی گەورەی سیاسی وڵات, یانی حیزبی "دایکی وەتەن"ی مەسعوود یەڵماز و حیزبی "ڕێی حەقیقەت"ی تانسوو چیللەر پاش دوو مانگ چەنە لێدان, ئاخرییەکەی یەکایەتێکی لەرزۆکیان پێکهێنا. کەم بوون ئەو ترکانەی لایان وابێ کە ئەم دەوڵەتەی وا قەرارە هەر بە چەن مانگان سەرۆکی یەکێك لەم دوو حیزبە سەرۆکایەتی بگرێتە ئەستۆ, بتوانێ هەتا کۆتایی دەوری پێنج ساڵەی پارلەمان خۆڕابگرێ, جا چ بگا بە وەی کە ڕێیەکی باش و بەجێ بۆ شەڕی کوردستان یان تەنگەژە و گرێ و کۆسپەکانی دیکەی تورکیا وەدۆزێ.

لەبەر ئەمە کاتێك دەوڵەتی هاوبەندی نوێ هەر لە سەرەتاوە سیاسەتێکی ڕاگەیاند کە وا دیار بوو ئاڵوگۆڕێکی گەورەی لە بەستێنی سیاسەتی حکوومەتا سەبارەت بە کوردان نیشان دەدا, زۆرێك لە ترکان و کوردان کەوتنە شك و دوودڵی. یەڵماز هەندێك پاش ئەوەی کە لە مارسی ١٩٩٦دا وەك یەکەم سەرۆکوەزیری بە نۆرە و دەورە دەس بە کار بوو, لە نەورۆزا, لە ڕۆژی جێژنی نەتەوەیی کوردانا, کە کەمالیستەکان بە مەبەستگەلی تایبەت بە باری ترکانەیاندا خستبوو, چەند بەڵێنییەکی تەماوی لە بابەت هەڵسوکەوتی تازەی دەوڵەت لەگەڵ کێشەی کورد و کۆتایی هێنان بە باری نائاسایی لە کوردستاندا دەربڕی. گەلێك ترك و کورد بە

چاوی گومانەوە ڕوانییانە ئەم بەڵێنانە. یەڵماز ڕووی کردە ئەنجومەنی گەورەی نەتەوەیی (پارلەمانی تورکیا) و گوتی: " ئێمە بەم ئاکامە گەیوین کە ئەم کێشەیە بە باری نیزامییدا چارەی نایە و بەڵکوو دەبێ بە ڕێگایەکی هێمنانەدا چارەسەر بکرێ." ئەو یەکەم ڕێبەری ترك نەبوو کە لە وەختی هاتنە سەر دەسەڵاتیدا ئەم چەشنە بەڵێنانەی دەدا و هەر وەها تەمای بۆ لا بردنی قەدەغە و قۆرغ لەسەر زمانی کوردی و کۆتایی هێنان بە باری نائاسایی لە کوردستانا بەم واتایە نەبوو کە دەوڵەت دەیهەوێ لە ڕێی وتووێژەوە کۆتایی بە شەڕ بێنێ لە کوردستان.

هەرچۆنێك بوو, دەوڵەتی هاوبەند لە ئاکامی تۆڵە ئەستاندنەوەی نەجمەدین ئەربەکان, ڕێبەری حیزبی ڕیفاه کە لە دەسەڵات کەوتبوو, دروست بەر لە هەڵبژاردن ڕووخا: ئەو شتەی کە ڕووخانی دەوڵەتی هاوبەندی خێراتر کرد, تاوانێك بوو کە ڕیفاه خستیە ئەستۆی خاتوو چیللەر, یەکەم سەرۆکوەزیری ژنی تورکیا و ڕایگەیاند کە ٦/٥ میلیۆن دۆلاری بەرتیل وەرگرتووە. داب و ئەخلاقی سیاسەت لە تورکیادا کەوتبوە سەر وەها بارێك کە وێڕای تەواوی ئەمانە ئەربەکان و چیللەر خێرایەکی پێکەوە دەوڵەتێکیان پێکهێنا, کە لە ١٩٢٣ڕا بۆو لایە بۆ یەکەم جار سیاسەتمەدارێکی ئیسلامی وەك سەرۆك وەزیر کردە نێرۆی تورکیایەکی کە پەیڕەوی لە ڕێ و شوێنی جودایی دینی دەکرد لە سیاسەت. چیللەر لەپڕ ئەم شوێن و دەورەی کە پروپاگەندەی زۆر بۆ کرابوو و ئەوی وەك بەرهەڵستێك دادەنا لە بەرامبەر ئیسلام دا وەلا نا: ئەمەش هەڵوێستێك بوو کە ئەو لە واشینگتۆن و پایتەختەکانی تری ڕۆژاوایی بە چڕ و پڕی دەریبڕبوو. ئامادە بوونی خودی ئەربەکان بۆ شل کردنەوەی هەڵوێستە سیاسییەکانی پێشووی دەربارەی کوردان و نێوخۆی وڵات و گەڕیانەکانی پێشتر, دەگەڕاوە سەر نیازێك بۆ ڕەواندنی دڕدۆنگی سپا سەبارەت بە خۆی کە زۆری تەبلیغات لەسەر کرا بوو.

ئەم پارێزکردنە جوان دیار بوو. لە سیاسەتا ڕەمزەکان گرینگن, بەڵام ئەم ڕەمزانە زۆر جاران ئینسان لە ئەزموونی بەکەلك دەگێڕنەوە. ئۆگری و مەیلێکی تێکەڵاو بە پیرۆز دانانی شۆڕشی فەڕانسە لە لایەن ئاتاترکەوە, یارمەتی شی کردنەوەی تامەزرۆیی بەردەوامی تورکیای دا لەسەر ژاکوبینیسم, یانی بڕوا بە وڵاتێکی کۆدەسەڵات و جیا

لە دین کە گەلە جۆراوجۆرەکانی لە جەغزی ئایینی پەرستنی تاقە گەلێکدا, تەنانەت بە زەرەدی فەرهەنگ و زمان و مەزەب و گشت داب و نەریتی نەتەوەیی ئەم نەتەوانەی بە یەکەوە دەلکاند. دوای شەڕی یەکەمی جیهانی ژاکوبینیسم وەك تەنیا ڕێوشوێنێك هاتە بەر چاو کە بتوانێ ڕێ بۆ تورکیا تەخت کا هەتا ڕوو لە نەریتی بێشەرمانە و ئابڕووچووانەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی وەرگێڕێ, ئەمەش وەختایەك بوو کە پەیمانی "سێڤر" هەرێم و ناوچەکانی پاشماوەی عوسمانی لە نێوان یۆنان و ئیتالیا و ئەرمەنی و تەنانەت کوردانا دابەش دەکرد.ئەم پەیمانە و دەستێوەردانی لێژنە ئایینییەکانی مەسیحی لە کاروباری عوسمانی سەدەی نۆزدەهەما وەها "پارانۆیا"یەکی لە نێو ترکانا بەدیهێنا کە پتر بە چاوی وێنەیەکی تازە لە پیلانێکی لەمێژین کە دەیڕوانیە دابەشینی تورکیا, تەماشای ئەم پشتیوانییەیان دەکرد کە بە سەرکردایەتی ئەمریکا لە کوردان دەکرا لە بەرامبەر سەددام حوسێنا.

لەگەڵ هەمووی ئەوانەدا "گرژهەڵاتنی" شادەمارە سیاسییەکان لە ساڵانی ڕابردۆوە, هەنتەشی کەڵەزەریانەی پەیکەرە و وێنەکانی ئاتاترك لە شوێنەکانی گشتیی و گەرەك و کۆلانان بوو بە سەمبولی بێ چەقاندن و مل نەدانی حکوومەت بۆ قبووڵ کردنی ئاڵوگۆڕ لە داب و ڕەسمە بنیاتنراوەکانی ئەوا, کەچی تەنیا سەلماندن و دەربڕینی ڕەزامەندی لەسەر ئاڵوگۆڕی ئەم داب و ڕێوشوێنانەیە کە دەتوانێ داهاتووی حکوومەتێك دەستەبەر بکا کە ناوی ئەو [ئاتاترك] تێیدا تواوەتەوە. تورکیا کە کەوتبووە ژێر پاپۆکەی سیاسەتێك کە ماوەیەکی درێژ مەیلی نەبوو ئەو شەریکە و دامەزراوە دەوڵەتییانەی زەرەبار بوون بداتە دەس بەشی ئەهلی و یان ڕایەڵوپۆی سیاسی پەككەوتە و داڕزاو لە شكڵ و شێوەی کۆجێیی و یەكبنەکی دەرباز کا, بۆ هەڵس‌وکەوت لەگەڵ کوردان کەوتە توند و تیژی. پاش ئەوەی پەنجا ساڵێك بەسەر حاوانەوە و خۆ بە دەستەوە دانی کوردانا تێپەڕی, چالاکی بچووکی پارتیزانی لە ١٩٨٤ەوە لەسەر دەستی عەبدوڵڵا ئۆجالان و پارتی کرێکارانی کوردستانەکەی لە بنکەکانی سووریا و پاشان ئێراق و دواتر لە ئێرانەوە وردە وردە لە پارێزگاکانی ڕۆژهەڵاتی و باشووری ڕۆژهەڵاتیی وڵاتەوە پەرەی گرت. پێشمەرگەکانی پ.ك.ك. بەوپەڕی توند و تیژی, بە مەبەستی تۆقاندنی دەربەگ و مامۆستایانی قوتابخانە و

تەواوی بەشەکانی حوکمات و هەر وەها کوردانی ئاسایی, بۆ وێنە دژی ژمارەیەکی بەرچاوی ژن و زارۆکی خێزانە جاشاکان, دەستیان دایە پەلاماری خافڵکوژی. پ.ك.ك. بۆ وە دەس هێنانی پووڵ بە مەبەستی درێژەی خەبات ڕۆژ بە ڕۆژ پتر کەوتە نێو ڕایەڵەی قاچاخی هێرۆئین بۆ ئورووپای ڕۆژاوایی.[1]

***

لە ساڵی ١٩٨٧دا, سەرەتا لە گوندان و دواتر لە سێزدە پارێزگای دراوسێدا, لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا باری نائاسایی و تایبەتی ڕاگەیەندرا, کە شتێکە وەك حکوومەت نیزامیی, کە ئەم هەرێمە لە ١٩٢٥ەوە تا ١٩٥٠ گیرۆدەی بوو و پاش وی لە ١٩٦٠ ڕا تا ١٩٦٣ و دیسان لە ١٩٧٠ڕا تا ١٩٧٤ نەپسایەوە. لە ١٩٩٠دا ئیزن درا بەم "قایمقامێتییە گشتییە"ی بنکەی لە دیاربکر بوو کە دەس بەسەر بڵاڤۆکی کوردی لە کوردستان و شوێنەکانی تری تورکیادا بگرێ و چاپخانەکانیان دابخا, کارمەندانی نێوخۆ جێگۆڕکە پێ بکا, گوندان بکاتە چۆڵەوار و بە تەگبیر و بەرژەوەندی خۆی خەڵك دوور بخاتەوە. (زۆر بە هەڵکەوت و دەگمەن) تەنیا ئەو ڕووداوانە لە ڕۆژنامە ڕەگەزپەرستەکانی تورکیادا بڵاو دەکرانەوە کە ئەم قایمقامێتییە بە سەلاح و پێویستی دەزانین و ئەم گۆڤار و ڕۆژنامانە بۆ هەڵپەرتاوتن و دەرهاویشتنی بەشێك لە هەواڵ و ڕووداوەکان نیازیان بە گاڵ دان نەبوو, بەتایبەت کە مەترسی دەس بەسەر داگیرانی چاپخانەش لە گۆڕێدا بوو. (دیسانیش جگە لە

---

١-کوردستان لەمێژە بەهەشتی قاچاخچییانە. بەناوبانگترین ناوەندەکانی قاچاخ "یووسکە کوا" لە تورکیا و "زاخۆ"یە لە ئێراق. بەر لە شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە ١٩٧٩دا, بۆ ڕووخاندنی حکوومەتی پاشایەتی چەك لە باکووری ئێراقەوە بە قاچاخی دەچوو بۆ ئێران. لە ساڵانی دەیەی ١٩٨٠, بە تایبەت دەیەی ١٩٩٠دا هێرۆئین کە لە ئێران و ناوچەکانی ئەولاتریڕا دەهاتە تورکیا, ئاخرییەکەی بە دانی دمچەورانە بە کاربەدەستانی پۆلیس لە هولەند دەگەیشتە دەس کلۆ فرۆشانی پ.ك.ك. تێوەدرانی پ.ك.ك. لە کاروباری قاچاخی موخەدەراتا شتێکی تازە و بێ پێشینە نیە. نموونە بەرچاوەکانی ئەم کارە ئینگلیسییەکان بوون کە بارزگانێتی تریاکیان بەسەر چیندا دابڕی (شەڕی تریاك ١٨٤٢). ئەوان تریاکی هیندووستانیان دەنارده چین و پاشان فەڕانسەوییەکان بەشێك لە خەرجوبەرجی شەڕی هیندو چینیان (١٩٤٥ – ١٩٥٤) لەم ڕێیەوە دابین دەکرد. ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لە گەڕیانی شەڕی وێتنام دا (١٩٦٣ – ١٩٧٤) بەم کارە تاوانبار بوو.

هەڵکەوتی دەگمەن) مەودای چالاکی بلاڤۆك و ڕاگەیەنەرەکانی ڕۆژاوایش لەمە باشتر نەبوو. سەرەڕای سووراوسپیاوێکی بە مەبەستی ئاڵوگۆڕی سەرسەرەکی لە ڕوخساری سیستمی دادوەری تاڵ و توندی تورکیا دەپژا – کە ئەویش دەگەڕاوە سەر زەختێکی وا وڵاتانی ڕۆژاوایی لە ١٩٩٢ خستیانە سەر تورکیا – بە کردەوە هیچکام لەم "چاکسازییانە" ئەو ناوچانەی نەدەگرتەوە کە باری نائاسایی و سنووردااریان بۆ دیاری کرابوو. بە گوێرەی ڕاپۆرتی چالاکانی خۆجێیی مافی مرۆص, ڕێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی, نێرەڤانی مافی مرۆص و ڕاپۆرتەکانی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە بابەت باری مافی مرۆص لە جیهانا, لەم ناوچانە پۆلیس و تاقمەکانی ژێربالی لەوپەڕی بێخەیالی و تەناهیدا خەڵکیان ئەشکەنجە دەدا و دیانکوشتن. هەزاران کەسیان لە "گومان لێکراوان" کێشایە پای محاکەمەی دەزگای ئاساییش کە تۆڕەمە و پاشکەوتەی دەزگاکانی "مەحکەمەی ئیستقلال" بوون کە پاش شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە ١٩٢٥ەوە کەوتبوونە گەڕ.

لە دەسپێکی دەیەی ١٩٩٠ڕا بۆو لایە ڕێژەی کوژراو و برینداراکانی شەڕی نێوان ترکان و کوردان ساڵبەساڵ پێهەڵاچوو. چ لەبەر دەسبزاوتنی پ.ك.ك. کە مامۆستایانی قوتابخانەی وەك بڵاوکەرەوەی فەرهەنگی بێزراوی ترك خستبووە بەر سێرە و پەلاماری یان لەبەر ئەمە کە دەوڵەت مامۆستای وای وەگیر نەدەکەوتن کە ژیانی خۆیان بخەنە مەترسی و لە کوردستان خەریکی وانە گوتنەوە بن, هەتا ساڵی ١٩٩٤ نیزیکەی ٤٠٠٠ قوتابخانە لە کوردستان داخران. لە ئاخروئۆخری ساڵی ١٩٩٤دا شەڕ و دەسوەشاندنی هێزەکانی ئاساییش پتر لە ٢٦٠٠ گوند و کۆخی بە چۆل کردن دابوو[1] و نیزیکەی دوومیلیۆن گوندەکی کوردی بەرەو باژێرەکانی دوور و

---

١– ژمارەی سەرڕاستی ئەم گوندە چۆل کراوانە بەشێکن لە نەهێنییەکانی نیزامیی, بەراوردی بە جوێی چالاکانی کوردی مافی مرۆص, سیاسەتوانانی کورد, مامۆستایانی ترکی زانکۆکان و سەرچاوەکانی ڕۆژاوایی, بۆ وێنە دیپلۆماتەکان, زۆر لێك دوورن. ناهید مێنتسە, وەزیری نێوخۆ, لە کورت کراوەی ڕاپۆرتێکا کە لە ٢٧ی ژوەنی ١٩٩٥دا خستییە بەردەستی پارلەمان باسی ٢٠٠٠ گوندی کرد کە یان خرۆپتوون یا تەکولۆ چۆل کراون؛ هەر ئەم کاربەدەستە ڕادەی کوژراوانی لە نیزامیی و غەیرەنیزامیی بە ١٩٠٠٠ کەس دانا و ڕادەی کوژراوە گومان لێکراوەکانی بە ٢٠٠٠ کەس دانا. ئەو سەرچاوە ڕەسمییانەی باسی شەڕ و هەڵمەتی

نیزیك پاڵ پێوە نابوو؛ ئەو شوێنەی كە كارێكی بنەڕەتی بۆ دابینی ژیان و حەسانەوەیان بەڕێوە نەچووبوو. ئەم خەڵكە بێبەشە كانگایەكی حازر و ئامادە بوون لە بۆ "ئەندام گرتن"ی پ.ك.ك. هەنتەشی ئەم جەماوەرە بەرفرەوانە لە شارەكانی باشووری و ڕۆژاوایی توركیادا بارودۆخەكەی پتر شڵەژاند, چونكە كوردان گلە و گازندەیان بوو كە لە وە دەس هێنانی خانووبەرە و شۆڵ و شوێن بۆ مناڵەكانیان لە قوتابخانەدا دەكەوتنە بەر شەپۆلی فەرق و جودایەتییەوە. چەن گەلاڵەیەكی نارێكوپێك بۆ بەربەرەكانی لەگەڵ ئەم بارودۆخە ڕاگەیەندرا, كە لاسا كردنەوەیەكی عەمتەرانە بوو لەم ئۆردووگایانەی كە سەددام حوسێن بە ناوی "شارۆچكەكانی سەركەوتن" لە لێواری شارێیان هەڵێخستبوون. بەڵام ئەم گەلاڵانە لەبەر نەبوونی پوول قەت ڕووی هەڵخرانیان بەخۆوە نەدیت. توركیا ئێراق نەبوو كە لەسەر دووهەمین كانگا لە كانگا گرینگە ناسراوەكانی نەوتی جیهان ڕۆنیشتبێ.

لە ئاوریلی ١٩٩٤دا ئەم شەڕە لە ساڵدا ٨/٢ میلیارد دۆلاری بۆ توركیا خەرج هەبوو و بە گوتەی "عەلی ساوكی ئەرك", وەزیری نێوخۆی پێشوو, دەگەیشتە لە سەتا ٢٠ی بودجەی وڵات و نیزیكەی دوو بەرامبەر كەم هێنانی بودجەی ساڵانەی وڵات. لەم شەڕ و لێكدانەدا كە لە نێو مەكۆی نێوخۆ و تایبەتیدا لەگەڵ شەڕی ئەمریكا لە ویێتنام پێكدەگیرا, ڕادەی ئەو فڕۆكە و باڵەفڕ و تانك و تۆپخانەیەی دژی سەرهەڵداوانی سووكەڵەچەكی كورد دەچوونە مەیدان, بە گوێرەی بەراوردی خودی توركیا, تەنانەت بە سەرجەم تاقمەكانی پشتیوانیشەوە, نەدەبوونە شەشهەزار كەس. خەرجوبەرجی ئەم شەڕە كە لە دەسپێكەوە بە ٤٠ میلیارد دۆلار بەراورد دەكرا, لە ١٩٩٣دا لە پڕ بە خڕهەڵدان و تەیار كردنی هێزەكانی ئاسایش لە كوردستان و دامەزراندنی ٣٠٠/٠٠٠ سەرباز لە وێندەرێ, زۆر سەیر پێهەڵاچوو: هێزەكانی سپا و

---

سەربازی دەكەن هەتا ساڵی ١٩٩٤ و ژووئیەی ١٩٥٥ بڵاوكرایەوە, ژمارەی گوندە چۆڵ كراوەكانی بە ٢٦٠٠ دێ هێنایە ئەژمار. لە فێوریەی ١٩٩٦دا ئەو بەراوردانەی دایانە دەس من بریتی بوو لە ٢٧٠٠ هەتا ٣٠٠٠ گوند. ئەم كەمە جیاوازییەی نێوان ژمارە ئاشكرا كراوەكان لەبەر هەبوونی ئەم كۆخانەن كە زیاتر وا باوە بە گەورەدێ دێنە حیساب.

ژاندرمەیان لە "تەراکیە" و لێوارەکانی "ئێژە" کەم کردەوە و ناردیانن بۆ کوردستان. دەوڵەت لاپەڕەیەکی دیکەی لە کتێبی سەددام حوسێن ڕوونووس کردەوە و دەستی کرد بە دامەزراندنی "هێزەکانی گوندەکی" کە شتێك بوون وەك جاشەکانی ئێراق. هەتا ١٩٩٥ نیزیکەی ٦٠/٠٠٠ کەس لەم چەکدارانە بە کرێگیرا بوون, کە هەرکام مانگێ ٢٠٠ دۆلاریان وەردەگرت, کە بۆ شوێنێکی وەك کوردستان کە لە باری ئابوورییەوە گەشەی نەکردووە, داهاتێکی شاهانە بوو. ئەم تاقمە بە بێ ئەوەی کەس لێیان بپرسێتەوە دراوسێ کوردەکانی خۆیان ئازار و ئەشکەنجە دەدا و کۆنەرقی ڕابردوویان بێدەرشتن و تاوانیان دەخستە ئەستۆی پ.ك.ك. نەچوونە پاڵ ئەم چەکدارە گوندییانە — کە زۆرێك لە کوردان لە ترسی گێرە وکێشەی نێوخۆ لووتیان لێهەڵدەقرچاند — وەکوو لاگیری لە پ.ك.ك. حیساب دەکرا و دەبوو بیانوویەك بۆ خاپوور و چۆل کرانی گوندان.

لە مەودای ساڵانی ١٩٩٣ و ١٩٩٤دا نیزیکەی ٣٢٠٠ کەس لە گەریانی ئەم قەتڵە بە ڕواڵەت ڕەمزاوییانەدا کە چالاکانی مافی مرۆڤی تورکیا و دەرەوە لە چاوی تاقمەکانی بکوژی داردەستی حکوومەتیان دەزانین, بێسەروشوێنچوون. ئامانجی بەر پەلاماری ئەم تاقمانە چالاکانی سیاسی و حیزبی, چالاکانی بواری مافی مرۆڤ, ڕۆژنامەنووسان, مامۆستایان و بە گشتی ئەندامانی دامەزراوە ڕووناکبیرییە کوردییەکان بوون. بە کردەوە هیچکام لە بابەتەکان وەدی نەهاتن و نەکەوتنە بەر لێکۆڵینەوەی دروست و — چ بگا بە بێڕاگەیشتنیان لە مەحکەماندا — هیچکام لە تاوانباران سزا نەدران. جا لەبەر وەی کە دەوڵەت بە لانی تۆقاندنی چالاکاندا هەنگاوی دەنا, ئەم مافناسانەی کە دەکەوتنە بواری پارێزگاری کردن لەم کوردانەی تاوانی سیاسییان بە ئەستۆدا هاتبوو, زۆر جاران تاوانبار دەکران و بە تاوانی لەم چەشنە, وەك "دنەدان و تەبلیغ بۆ جیا بوونەوە" گوناهبار دەکران و زیندانی درێژخایەنیان بۆ دەبڕایەوە.

تورکیا بە چاولێکەری لە کردەوەیەکی نەفامانە کە ئیسرائیل و وڵاتانی عەرەبی بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ هێزە چەپەکاندا ئەنجامیان دابوو, کەوتە دنەدانی تاقمێکی ئیسلامی توندڕەو بە ناوی "حیزبوڵڵا" و — کە هیچ پێوەندییەکی بە حیزبوڵڵای بەرپشتیوانی ئێرانەوە نەبوو — بە دەستی ئەم تاقمە دەسی دایە کوشتنی ئەوانەی گومان

دەکرا ئەندامی پ.ك.ك. بن و تەنانەت کوردانی ئاسایی. هێزەکانی ئاساییشی تورکیا لە ١٩٩٤دا لە ناکاو وایان بە بەرژەوەند زانی کە بەری دەس‌وەشاندنی ئەم حیزبوڵلایە بگرن؛ بە سەدان کەس لە ئەندامانیان گرت و گوناهی کوشتنەکانیان خستە سەر ئەم لێك‌دابڕان و جیابوونەوەی کە گۆیا تیا ڕووی دابوو, بەڵام وسکوتی لەسەر کرابوو. کەچی لەمەڕ زبروزەنگی نێو بەندیخانەی ئەم حیزبوڵلایە کە هەر وا پەنجا گەزێك واوەی بنکەی پۆلیسی "باتمان" بوو و لە وێ خەڵك دەکەوتنە بەر ئازار و ئەشکەنجە و بە سەدان کەسی تیا کوژرا بوو, هەروەها لەم بارەوە کە چلۆن و لەبەر چی پێشتر ئەم گشتە بێ‌فەزیحەتییان قبووڵ کردبوو, متەقیان نەکرد.) ئەگەرچی سپا بە حوکمی خۆی پارێزەری کۆماری "لادینی" بوو, خۆی لە بەرەگەی هەرە پێشەوەی ئەم هەڵوێست و سیاسەتە ئیسلامخوازەدا بوو: ئەم سیاسەتە لە سەردەمانی دەسەڵاتدارێتی دەوڵەتانی پاش گۆدەتای نیزامیی ساڵی ١٩٨٠وە هەڵگیرسا. لەم ساڵەدا بوو کە پەروەردەکرانی ئایینی لە قوتابخانە و حوجرەی سەدان مزگەوت لەسەر خەرجی دەوڵەت دەستی پێکرد. ڕێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی, ڕاپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا, نێرەڤانی مافی مرۆص و زۆرێك لە ترکان و تاقمەکانی تر هەموو ساڵێ گەلێك بەڵگە و بۆنە سەبارەت بە پێشێل کرانی مافی مرۆص لە تورکیادا بڵاو دەکەنەوە. ئەم تەنگ‌پێ‌هەڵچنینانە لە ئەشکەنجەی ئاسایی چەشنی دەسدرێژی لە پێش و پاشەوە بۆ ژنان و کچان و فەلاقە کردن و دەردەس‌کردنی دڵخوازەوەڕا بگرە هەتا شێوەی ئەهوەنتری سووکایەتی پێکردنی وەك ئەم ڕووداوەی کە لە ١٩٨٩دا ڕووی دا, دەگرنەبەر: لەم ڕووداوە بەر باسەدا هێزەکانی سپا تینیان بۆ کوێخادێیەك هێنا و لە تەویلەدا پەیینیان دەرخوارد دا. لەبەر ئەمە کە قانوونی سزادانی تورکیا ئەو تاوانانەی کە لە ناوچەکانی گوندەکی ژێر "دەسەڵاتی نیزامیی" ڕوو دەدەن لە بێ‌ڕاگەیشتنی قانوونی لە دادگاکاندا هەڵداوێرێ, هەر وەها دادگاکانی "پێداچوونەوە" سەبارەت بەم چەند بابەتەی پێیان سپێرابوو بێ مەیلییان نواند, تەنیا ڕێ‌چارەی پێخوست کراوانی وەها ڕووداوگەلێك پەنا بردنە بەر "کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی ئورووپا" بوو. تورکیا

وەك ئەندامێکی شوورای ئورووپا, بە پێی پەیمان لە ئەستۆی بوو کە داوەری شوورا بسەلمێنێ, بەڵام ئەم کۆمیسیۆنە تەنیا پرژایە سەر بەشێکی ناچیزەی ئەم سکاڵایانەی کە پێی سپێرابوون و ملی بۆ راکێشا. تەماگرتن گەلێجار ساڵگاران درێژەی دەکێشا, بە تایبەت ئەگەر وڵاتی لایەن لە کێشەکەدا, داوەریی کۆمیسیۆنی نەدەسەلماند و کێشەکەی دەبردە دادگای شوورای ئورووپا. (بۆوێنە پەروەندەی "پەین خواردن" پێنج ساڵ دوای درانە دەس کۆمیسیۆن, بە دانی ۳۰۰/۰۰۰ فرانکی فەرانسە بە سکاڵاکار کۆتایی هات.) کوردانی تورکیا بێشك چارەنووسی خۆیان لەگەڵ چارەنووسێك پێکەدەگرت کە سەددام حوسێن بۆ کوردانی ئێراقی خرهەڵدابوو. راستە, ناپاڵمەکانی تورکیا کوژراو و زامارێکی کەمتریان لە چەکە شیمیایییەکانی ئێراق یان پەلاماری ئەنفالی لێدەکەوتەوە, کە ئامانجیان خاشەبڕ کردنی تەواوی کوردان بوو, بەڵام هەردك حکوومەت بە دەستی ئاوەڵا و دڵفرەوانییەوە گوندەکانیان خاپوور و چۆڵ دەکرد و هەرتك مافی مرۆڤەکانیان بە شێوەیەکی بەربڵاو و بە پۆل دەخستە ژێر پاوە. تەنانەت وەزارەتی دەرەوەی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دانی بەم وێکچوونانەدا هێنا: "جان کورن بلووم", یاریدەدەری جێگری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا وەختایەك لە ۱۹۹٦دا پرسیاری لێکرا کە خاپوور کرانی ماڵی خەڵکی کورد لە تورکیا چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ تێکدان و تەخت کردنی گوندان لە ئێراق, وڵامی داوە: "ئەگەر ئینسان لە گوند بێ, هیچ فەرقێکی نیە."

دەسدرێژی و کرداری نالەبار لە ناوچەی تونجلی (درسیمی پێشوو) لە پایزی ۱۹۹٤دا بە رادەیەك بوو کە "عیسمەت کۆیلۆغڵوو" وەزیری بەرپرسی مافی مرۆص, رێوراست پێی لە دەسدرێژی و زوڵم و زۆری هێزەکانی ئاساییشی وڵات نا؛ هەڵبەت ئەمانە شتێك بوون کە چالاکانی مافی مرۆص لەمێژ بوو گوتبوویان. کۆیلۆغڵوو گوتی: "زەبری خافڵکوژانەی ناوچەکانی تر کاری "پ.ك.ك"ەیە, بەڵام لە تونجلی ئەم خافڵکوژییە, خافڵکوژیی حکوومەتییە؛ لە تونجلی ئەوە حوکماتە کە گوندان چۆڵ دەکا و ئاگریان تێبەر دەدا. لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵات دوو

میلیۆن كەس لـە ماڵوحاڵ بوون. ئەم گوندییانەی ڕاگوێزراون دەبێ خورد و خۆراك و پەنا و پەسیویان بۆ دابین بكرێ." كە ئەو جۆرەی پێویست بوونەیاندانێ. بەڵام هەر ئەم وتانەی كۆیلۆغلۆو خۆی بناغەی پێشینەیەكی ڕۆنا, ئەگەرچی ئەو بە شێوەیەكی دوور لـە ڕاستەقینە و ناڕاستەوخۆ "پ.ك.ك"ەی لـە بابـەت زەبـرە تیرۆریـستییەكانی تـر لــە كوردستانا بە تاوانبار ناساند. بەر لـەوی هیچ باڵادەستێكی حكوومەتی هەتا ئەم ڕادەیـە پێی لــەم تاوانانــە نــەنابوو و پــاش ویــش كــەس ئـەوتۆی نــەكرد. لــە حەقیقــەتا ئــەم وەزارەتـــخانەی ئـەو بەرپرسـیاری بـوو و چ بودجـە و بەرپچوونێكیـشی نـەبوو, لــە ١٩٩٢دا لـە وڵامی ڕەخنەی پەرەگری وڵاتانی ئورووپایی و ئەمریكا لـە كارنامەی مافی مرۆڤی توركیا بنیاتنرا, ئەویش بەم ئامانـجە كـە بـێ ئـەوەی هـیچ گیروگرفتێـك بـۆ دەوڵەت بنێتەوە لـە ڕادە و چۆنیەتی ڕەخنەكان كەم كاتەوە.

تونـــجلی كــە خەڵكەكــەی كــوردانی زازا لـەهجــەی عەلــەوی مــەزەب بــوون, پارێزگایەكی ئاسایی و گۆترەكی كورد نەبوو. تونـجلی كە ناوچەیەكی زۆر سەخت و شاخاوییە و پڕە لـە دۆڵ و دەرەی قووڵ, تەنانەت بە پێوەدانی كوردانـەش ناوچـەیەكی زۆر چڕ و دڕ وكێوییە. ناوی پێـشووی وی بـەر لــەوەی كـە تركـان نـاوی كـوردی شوێنەكان بگۆڕن درسیم بوو و تەنیا لـە مەودای ساڵانی ١٩٣٧ – ١٩٣٨ڕا هاتە ژێر ڕكێفی حكوومەت. سروشتی شاخاوی ناوچە و لـە ئاكامدا بە هیچ دانەنانی حوكمـاتی ناوەندی و خۆ دزینەوە لـە دانی خەرج و پتیـاك, بیـانووی وە دەس ئاتـاترك دا تـا ئـەم ئاخرین قەڵایەی كە بەربەرەكانی حكوومەتەكەی دەكرد, تێكبكوتێ. لـەبـەر وەی كــە كۆلكەخانەكانی توركیا هەر وا پنجومۆر كراو مانەوە, هیچ شتێكی ڕوون و ئاشـكرای دوور و درێژی ئەوتۆ بە دەستەوە نیە, بەڵام دەستەیەك لـە كوردان بەردەوام دەمگـۆی ئۆباڵ بۆ نەكێشراو لـە بابەت كەلك وەرگرتنـی دەوڵــەتی مـستەفا كــەماڵ لــە گــازە ژاراوییەكان بۆ سەركوتی ئەوان, دێننەگۆڕێ.

كەس حاشا لـەم حەقیقەتە ناكا كە ئەم زبـر و پـەلامارە سـەربازییەی درسـیمی بـە چۆك داهێنا بە ڕادەیەك ترسێنەر بوو كە ناسێونالیزمی كوردی لـە توركیادا بـۆ مـاوەی پەنـجا ساڵان قڕوقپ كرد. بە حەوت ساڵ پێشتر, عیسمەت ئینۆنوو كە خـۆی كـورد و دەستەڕاستی ئاتاترك و جێنشینی ئەو بوو, هیچ گومانێكی لـەمـەڕ تـەمای كۆمـارەوە

نەهێشتبۆوە. ئەو ئەگەرچی خۆی کورد بوو بانگەشەی کرد و گوتی: "ئەوە تەنیا گەلی ترکە کە مافی هەیە لەم وڵاتەدا خاوەنی مافەکانی نەتەوایەتی و نەتەوەیی بێ. هیچ کەس لە رەگەزێکی دی مافێکی ئەوتۆی نیە." هەر ئەم بیرە ساکارە بوو بە بەردی بناغەی پەروەردە و راهێنانەکانی "کۆمار" و لە راستیدا ئینۆنوو بوو کە بۆشەری "درسیم" راسپێرا.

بۆ وێنە "سەبحە گوکجێن", زڕ کچی ئاتاترك و یەکێك لە لایەنگرانی سەرەتای داگیرسانی کاری کۆمار, پەنجا ساڵ پاش بۆمبارانی راپەڕیوانی درسیم دەڵێ کە نە ئەوکاتی و نە دواتر قەت لەم بابەتەوە مغابەتی هەست پێنەکردووە: "ئەم کارە بۆ پاراستنی ژیان و مافی کۆماری لاو پێویست بوو." ئەو ئەم مەبەستەی بۆ دیفاع لە بیروبڕوای نوێخوازانە و لاگیری جودایی دین لە سیاسەت بە دژی پەرەگرتنی بیرۆکەی ئیسلامخوازانەی تاریکبیرا دێنێتە گۆڕ, کە کۆماریخوازان دەیانگوت هێزەکانی کوردیان دنە دابوو. ئەم ژنە زیادی دەکا: "ئەمە راسپێراوییەك بوو کە ئاتاترك خستیە ئەستۆی من و منیش بەرێوەم برد." لە سەرکوتی درسیمدا زارکی ئەم ئەشکەوتانەیان بە قوڕ گرت کە پیاوان و ژنان و زارۆکی کورد پەنایان بۆ بردبوون و تێکرایان بە زیندوویی سووتاندن؛ ئەم لێرەوارانەی خەڵك خۆیان تێدا حەشار دابوون ئاگریان دان و جەماوەری پەناگرتوویان کوشتن. (ئەم کردەیە لە ١٩٩٤دا دووپات کرایەوە و خۆش ئەمەیە کە ئەم ناوچەیەی کە سووتێنرا, شوێنێك بوو کە کرابوویە "پارکە لێرەوار" و قەرار وابوو دارەکانی بپارێزرێن.) کوردانی درسیم شەریان کرد هەتا تەقەمەنیان بنەی هات. گوندەکان سەر لەبەر خاپوور کران و هەزاران کەس لە پاشماوەکان مشەختی بوون و بۆ بەرێوەچوونی ئەوەی رۆژنامەکانی ترك بە سەردێڕی درشت نووسیان و پتر وەك بە پیرەوەچوونی وتەیەکی مەنشووری "کاتوو" سەبارەت بە "کارتاژ" دەچوو, سەرپەڕی خۆیان رازاندەوە: "درسیم لەگەڵ خاك تەخت کراوە."

زۆربەی ئورووپاییەکان بە ئامادە بوونەوە ئەم ڕوانگە کەمالیستییەیان سەبارەت بەم "جیهادی نوێ بوونەوە"یە قبووڵ کرد.[1] ئەو کوردانەی کە لە درسیم ڕادرابوون تەنیا لە **١٩٤٦**دا, یانی وەختایەکی ڕێوشوێنی زەرووری هەڵوەشایەوە, ئیزن دران بگەڕێنەوەماڵی خۆیان. دووساڵ دواتر هەواڵنێرێکی ترك سەردانێکی ناوچەی کرد و نووسی: "ئەگەر لەگەڵ خەڵك باسی دەوڵەت دامەزرێنی, ئەوان لەڕێوە "دەوڵەت" دەبەنەوە سەر کاربەدەستی وەرگرتنی باج و پیتاك و پۆلیس..."چونکە لە درسیمدا "قوتابخانەیەك نیە, پزیشکێك نیە. ئێمە هیچ نادەین بە خەڵکی درسیم, تەنیا لێیان وەردەگرین. ئێمە هەقمان نیە ئاوایان لەگەڵ بجووڵێینەوە."

نیوسەدە پاش وی, وتەکانی "بت شکێنانە"ی "کۆیلۆغلو"ی وەزیریش دیسان شوێن و ئاکامێکی بنەگری لێنەکەوتەوە. هەڵوێست و سیاسەتی چۆل کردنی گوندان ڕانەگیرا, ئەگەرچی لە **١٩٩٥**دا هەوا و هەرەمەی چۆل کردنی گوندان و کوژرانی ڕەمزاوی و ئازار و ئەشکەنجەی حکوومەت لە کوردستانا کەوتە سەر بارێکی نەرم و ڕەنگە لەبەر ئەمە بووبێ کە حکوومەت بۆ دۆزینەوەی "قوربانییەکان" کورتی هێنابووبێ. لە ساڵی **١٩٩٤**دا هەر خودی ئەو وەزیرەیان نەهێشت سەردانی گوندە چۆل کراوەکانی تونجلی بدا. هەر وەها سپا ڕێی نەدا خاتوو چیللەری سەرۆك وەزیر چاوی بەم گوندانە بکەوێ, ئەگەرچی خاتوو چیللەر خۆی یەکێك بوو لە لایەنگرانی زەبروزەنگ. خاتوو چیللەر لە وڵامی سکاڵای دێهاتییەکاندا کە گازندەیان بوو لەمە کە باڵەفڕەکانی سپا دەسڕێژ دەکەنە خەڵك و ماڵان, ڕووی کردە وە درۆ خستنەوەیەکی "سووررێئالیستی" و گوتی: "بێ و نەبێ ئەم باڵەفڕانە یا ئەفغانی یام ئەرمەنی یان ڕووسی بوون, بێگومان ترك نەبوون." یەکێك لەم دیپلۆماتە

---

**١– دەگمەنەکان کەم بوون. بازیل نیکیتین, دپیلۆماتی پێشووی حکوومەتی خونکاری و خاوەنڕا لە کێشەی کوردانا, لە نامەیەکی ڕێکەوتی ١٦ی ژووئیەی ١٩٣٧دا نارەزامەندی خۆی سەبارەت بە سەردێرێکی ڕۆژنامەی تایمزی لەندەن کە ڕیس‌وگوریس و پاساو هێنانەوەی کەمالیستی ئیشەکەی سەلماندبوو, دەربڕی: "ئەوانەی کە دژ بە پەروەردەن, ئەو شۆڕشەی کە بە دەس هێزەکانی سپا سەرکوت کرابێ." , "خەتایە بێتوو لامان وابێ کە کوردان دژی پەروەردەن, ئەوەی بەرەوڕووی وێستاون و دژایەتی دەکەن, بوون بە ترکە."**

ئەمریکاییەیانەی کە ڕاسپێرابوو هەتا بە باڵادەستانی ترك بسەلمێنێ تاکوو دەس لەم دەسدرێژییانە بۆ سەر مافی مرۆڤ هەڵگرن, پاش چەند ساڵ تێکۆشان بە دڵئێشاوی گەیشتە ئەم ئاکامە کە "تورکیا خراپترین دوژمنی خۆیەتی." بەڵام چیللەر لەم وە درۆ خستنەوە و حەشار دانانەدا بە تەنیا نەبوو.

هاوپەیمانانی ناتۆی تورکیا بە دڵەڕاوکێ و دڵپەرۆشییەوە دەیانڕوانیە شەڕی کوردستانی تورکیا, بەڵام خۆیان تێوەرنەدەدا هەتا کۆتایی بێنن بەم شەڕەی کە تورکیای کردبوو بە گاڵتەجاڕ: ئاخر تورکیا بە قسە دەیگوت کە هاوپەیمانی هەرە پێشەوەی بەرەی ناتۆ و مەتەرێز و بەرگێڕەوەی ناوچەیی ئەوە لە بەرامبەر کومۆنیزمدا. هەڵبەت ئەڵمان جارناجارێك ناردنی چەکی دیاری و پێشکێشی ڕادەگرت, هەر وەك لە ١٩٩٣دا وەو تۆی کرد و ئەمەش وەختایەك بوو کە پێی زانی ئەم چەکانە بە دژی کوردان کەلکیان لێوەردەگیرێ. بەڵام لەسەر یەك چاو لێپۆشین هەر وا بەردەوام بوو. لە ئێراقا, لەبەر ڕقبەرقەی بازرگانێتی و بەر گرتن لە تەنینەوەی دەسەڵاتی ئێران لە ناوچەدا نەیدەویست زەخت بخاتەسەر ملهوڕی ناو زراوی ئێراق لە بابەت ئاکاری نالەباری سەبارەت بە کوردان. ئەو جار دەربارەی تورکیاشەوە یەکێتی ناتۆ لەبەر ئۆگریی ژێئۆئیستراتژیك و لەبەر دڵی هاوپەیمانێك و ململانییەکانی بازرگانی بۆ هەڵوێست گرتن لەبەرامبەر دەوڵەتێکا کە بە شێوەیەکی دێموکراتیك هەڵبژێرابوو, تێما.

لە ١٩٩٢ڕا بۆو لایە من لەم سەفەرەدا کە لەگەڵ دوو هەواڵنێری ئینگلیسی چووبوومە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا, تێگەیبووم کە ئاژوانی چەرخی سەرکوت پتر وە سەر گەڕ کەوتووە. لەم سەفەرەدا بۆ دیاربەکر, ناوەندی چالاکی و هەڵسووڕانی پ.ك.ك. لەسەر کەوانەیەکی بەرفرەوانی دەشت و دۆڵ و کێوپاراندا سەرنجمان کەوتە لای ڕۆژهەڵات: یانی لیجە, باتمان (کانگای نەوتی تورکیا کە لەبەر ئەم قەتڵە ڕەمزاوییانەی تیا ڕوو دەدا بۆتە گای قەشان), سیلوان, سیرت, ئەلوەندەرێ (ئەو شوێنەی کە وا زۆرێك لە کوردەکانی ئێراق لە ١٩٩١دا لێی ببوونە پەناگر)؛ لێرەوە بەر لە چوون بۆ باکوور و سەردانی سەرلەنوێی ماردین و دیاربەکر, گەڕاینەوە

ڕۆژاوا و شانبەشانی سنووری ئێراق و سووریا هاتینە سیلۆپی, جزیرە, میدیات, ئایدیل و نوسیبین. لەگەڵ یەکێك لە دۆستانی کوردی دانیشتووی ئانکارا قەرارمان دانابوو کە دیلمانجێکیم بۆ وەدۆزێ. ئەم دیلمانجە لاوێك بوو کە زۆر سەرسەرەکی ئینگلیسی دەزانی و گەلێك ئاشقی پ.ك.ك. و بیروڕای ئۆجالان بوو. حاڵی بوون لە وتەکانی جاروبارە زۆر دژوار بوو, بەلاّم وتەکانی نیشاندەری ئەم ئیمان و بڕوا چاوبەستراوانەیە بوو کە من گەلێ جار لە شەڕاندا دیبووم کە لاوانی بەرەو گیانبەختکردن پاڵ پێوەدەنا. ئەونده ساویلکە بوو کە دەبوو بە هۆی ئەوەی جاروبارە لەخۆوە ڕقیهەستێنم. دەقودۆغر دەیگوت کە من بە کابرایەکی ئەمپریالیستی تەواو عەیار دەزانێ; دیارە ئەمەش لەبزێك بوو کە پاش لێکهەڵوەشانی یەکێتی سۆڤیەت لە شوێنەکانی تری ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاستا برەوی نەمابوو. ئەو قسانەی کە پێکەوە کردمان لە دڵنیگەرانیمی کەم کردەوە, چون دڵپەرۆشی ئەمە بووم ئەگەر هاتوو لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشی تورکیا تێکگیراین ئەم لاوە چی بەسەر دێت, چونکە زۆر جاران ئەمجۆرە گیروگرفتە بۆ ڕۆژنامەنووسانی دەرەکی و ترك و دیپلۆماتەکان و نوێنەرانی مافی مرۆڤ و ئەو چەند کوردەی کە هێشتاش دەیانوێرا لە ناوچە گوندەکییەکانی ژێر دەسەلاّت و ڕێوشوێنی باری نائاسایی‌دا هاتوچۆ بکەن, دەهاتە پێش. بۆ ئێمە لە تاڵترین بارودۆخا مەترسی دەرکران و لام وایە تێهەڵدرانیش لە گۆڕێدا بوو, بەلاّم ئەم لاوە بۆ یارمەتی دانی چەند غەوارەی خۆ بەزلزانی بەرزەدەماغ کە دەیانویست سەرێشەیەك بۆ حکوومەت ساز بکەن, گیانی خستبووە مەترسی. زۆربەی ڕێگاکان ناخۆش بوون و پشکنینی لێکدالێکدا لە بنکەکانی پشکنین توند وتیژ و ئاڵۆز بوو و کەش و هەوای گشتیی لە باشترین بار و هەوادا تەمگرتوو بوو. بەلاّم سەیر ئەمە بوو بۆ هەر شوێنێکی مەیلمان لێبا دەمانتوانی بچین و ئەمە شانسێکی گەورە بوو.

دیلمانجەکەمان بۆ ڕاکێشانی سەرنجی ئەو کوردانەی کە ئێمە ئانقەستە بە"ڕێکەوت" وتووێژمان لەگەڵ دەکردن چاکی لێدەزانی. (زۆر جاران لە شوێنەکانی کەم هاتوچۆ کە لامان وابوو بە شوێنمانەوە نین و گیروگرفت بۆ خەڵك

نانێینەوە, وەوتۆمان دەکرد.) لە نزیك "ئێروح", ئـەو شـوێنەی کـە وا یەکـەم زەبـری چەکداری پ.ك.ك. لە ١٥ی ئووتی ١٩٨٤ دژی بنکەی ژاندرمە وەشا, جووتیارێـك لـە دەس گریلا و هێزەکانی ئاساییش ملیـنا لـە گلـە وگازنـدان, بەتایبـەت لـە چـنگ تاقمەکانی "تایبەت" کە زۆرتر جلوبـەرگی غـەیرەنیزامییان لەبـەر دایـە و گـوێ بـە گوارەن و هاواری خەڵك لەبەر زەبروزەنگیان گەیوەتە تەشقی ئاسـمان.

ڕوونتر لەم زوڵم و چەوساندنەوە باوە پەرەگرەی زەبروزەنگـان, نیگـای ڕامـاو و بەمۆلـەقی چاوانی بوو, وەختایەك کـە پرسـیمان چـلۆن دەتـوانین بـچینە شارۆچـکەی ئەولاتر. چەن جار پرسیارەکەمان دووپات کردەوە, هەتا خۆم تێگەیـشتم زۆرنـین ئـەو کوردانەی لەگەڵ ئەم ناوانە ئاشنا بن کە دەوڵەت لە مەودای چەن ساڵاندا لە جیاتی ناوە کوردییەکان لەسەر شار و گونـدانی دانـاوە. (دواتـر زانـیم کـە دەوڵـەت نـاوە ئەرمـەنی و عەرەبییەکانیـشی جگـە لەوانـەی کـە لەسـەر شـارێیان یـان نەخـشەکانی ئـاوەدێری بـوون گۆڕیـونی؛ لێـرەدا مەبەسـتی بەکـەلك بـوون بـۆ ڕۆژگـار بەسـەر بیروباوەڕدا زاڵ ببوو.) جا ترکان بە کردنـی ئـەم کارانـە و کێـشانی کارەبـا و هێڵـی تەلەفۆن – کە کارێکی بەکەلك و جێی ڕێزە – ڕواڵەتی کوردستانیان گۆڕیبوو, بەڵام نەك خودی کوردان کە تەنیا ئۆگریی بەربڵاویان بە تورکیـاوە, ئەگـەر هێـشتاش لـەم ئاسـتەدا مابـێ, هـەر ئەمەیـە کـە لـە سـەرمایەنانەوەکانی دەوڵـەت قازانـجێکی بـە ئینسافانەیان وەگیر کەوێ, چونکە لێیان حـاڵی بـووە ئەگـەر بێتـوو ئانکـارا بیهـەوێ دەتوانێ چیهایان کار بۆ بکا. ئەوەی هێشتا, ئەم چەشنە خەڵکەی کە وتووێـــــژمان لەگەڵ کردن و لێی حاڵی نەببوون ئەمە بوو کە حکوومەت خۆی خەریکی ئەمە بـوو کە ئەوان پتر لە هەر زەمانێکی پێشووتر داپڵۆسێ و وردوپردیـان کـا. بـۆ ئـەوەی بـە وردی لـەم مەبەسـتە حـاڵی بووبـای کـە کـوردان دەسـتەویەخەی چ بـوون, دەبـوو چووبایەوە سەر ڕەوتی کوشت و کوشتار و دوور خرانەوەکانی سەردەمانی عوسـمانی و سەفەوی لە سەدەی شازدەدا. چەن ساڵێك دواتـر بـوو کـە "ئەحـــمەد تـرك" ئـەم سەرکوتەی بۆ شی کردمەوە و گوتی: "باب و باپیرانـــمان کـە لـە سـەرکوتی دوا بـە دوای شۆڕشی شێخ سەعید گیانیان قوتار کردبوو, بێ پسانەوە وریایان دەکردینـەوە و

بیریان دێنایینەوە کە حوکمات بێڕوحـــمە, بـەلاَم لـەمـە دژوار و تـاڵوتوونتر ڕۆژگـار بوو." ئەو کوڕی گەورەماڵێکی عەشیرەتی و ساڵگاران ئەندامی پارلـەمان بوو. بـاوکی بە درەنگەوە کەوتە ڕیزی شۆڕشی ١٩٢٥ی شـێخ سـەعید. لــە گــەڕیانی سـەرکوتی شۆڕشا, شانس وە فریای هات و گیانی خۆی لـەم هەڵلاَیە قوتار کرد. گوتی: "زەمـانی پێشوو خەڵکێك سزا دەدران کە ڕاستەوخۆ بەشداری شۆڕش ببوون, یان تاقمێـك لــە سەرۆك هۆزەکانیـان سـزا دەدا هــەتا ڕێبەرایـەتی کـورد لاواز کـەن. بـەلاَم ئەمــجار خەڵکێکی ئاساییش کە هیچ فریان بەسەر شەڕەوە نەبوو دایـە بـەر شـالاَوی سـزادان, هەر لـەبەر وەی لــە شــەڕا لاگیریـی حکوومـەتیان نـەکردبوو! لــە ڕابـردوودا ئامـانج وسکوت بێهێنانی شـۆڕش بـوو, ئەمــجار مەبەسـت و ئامـانج سـەرکوتی خـەڵك و تێکهەڵـشێلانی کەسـایەتی و پێناسـەیان بـوو." پ.ك.ك. شـتێکی وەوتـۆی لــە خـوا دەویست و پێشتر دیاردەگەلێکی بە نیشانەی سەرمەستیی سەرکەوتن درکانـدبوو. لــە ١٩٩٠ڕا بۆو لایە خۆپیشاندان بە لایـەنگری لــە پ.ك.ك. و گاڵـەدانی دووکـان و بازاڕ و تەبلیغاتی بە ئاشکرا, بوو بە هۆی هەڵگرانەوەی شـالاَوی تونـد و تیـژی تۆڵــە وەرگرتنــەوەی هێــزە چــەکدارەکانی تورکیـا. لــە بــاژێری "شــیرناك" کــە قــەلاَی نەتەوەخوازیی کوردستانی تورکیایە, دروست چەند حەوتوو پێشتر سپا لــە شـالاَوێکی توند وتیژا خەڵکی شاربەدەر کردبوو. ئەم لاوژۆ تۆقیوانەی کە لـە پێچ و پەنای کۆلاَن و کۆلاَنۆکان تووشیان دەهاتین بە سرتوخورت پێیاندەگوتین کـە چـلۆن پیاوەکـانی پۆلیس و تاقمە چەکدارەکانی سپا ئەڵلاَبەختەکی تەقەیان لـە هەر کەس و هەر شوێنێك کردووە. تەنیا باڵەخانەکانی دەوڵەتی تووشی خەسار نـەهاتبوون ( کــە هــەر ئەمــە بـۆ خۆی ئیددیعای دەوڵەتی لـە هورم و بایخ دەخست کە دەیگـوت تـاوانی ئــەم خـاپوور کرانانە لـە ئەستۆی "پ.ك.ك"ەیـە.) ئێمــە خۆمــان بــە بــەختیار دانـا کــە توانیبوومـان ڕێیــەك بــەرەو شار بکەینەوە, کە زۆر لـەمێژ بوو بە ڕووی غەوارە و ڕۆژنامەنووساندا بەســترابوو. لــەوێ تووشــی کۆبوونەوەیــەکی ســەمەرە هــاتین و پیــاو و ژن و زارۆك لـەدەورەی پەیکەرەی لـە هەموو شوێنان قوت بۆوەی ئاتاترك هالاَبوون. بەشدار بــووان لـەم ڕێوڕەســمەدا – چەکدارانی گوندەکی و خێزانەکانیان و دەستەیەك مووســیقار – بە قەلاَفەتێکی شێلگیرانە و شێوەیەك ڕاوەستان و جوولاَنەوەی ڕوســمی ســەبارەت بــە

کۆمار وەفادارییان دەردەبڕی. خۆم گەیانـدە قایـــمەقامەکەی وێــدەرێ و ئەوەنــدەم پێداگری کرد کە ئاخرییەکەی بــە ناسەرســەنگی ڕازی بــوو وەرمــان بگــرێ. بــە نێــو گەمارۆی پاسەوانە چەکدارەکانیدا بە ئوتۆمبیلـەکەی چووینە شــوێنی کارەکــەی. لــە پشت مێزەکەی دانیشت و گوێی دایە پرسیارەکانــمان, پاشان دە دەقیقەیــەك هێنــدێك شتی بێ سەرەوبەرەی تێككردەوە, دوایە لەپڕێك دەستووری دا لـە شــار دەربــاز بــین. لـەسەر هەوایەك نەبوو دمەتەقەی لـەگەڵ بکرێ. دەرباز بووین.

چەند ڕۆژ دواتر, پاشنیوەڕۆیــەکی درەنــگ لــە نوســیبین بــە ئوتۆمبیــل دەچــووینە چوارڕێیانێك کە لـە پــێش تــەلاری شــارەوانی بــوو: نوســیبین شــارێکی هاوکەوشــەنی قامیشلی سوورییایە. ڕێیەکی دوورمان کۆتابوو و هەوای زۆر گەرم بوو. لـە یەکێك لـە کافەکانی "ســەر شــەقامان" لــە دەوری مەیدانەکــە ویــستمان ســاردەمەنییەکی فێنــك وەخۆین. هەر ئێمە گەیشتینێ ئــەو دەنــگ و زەنایــەی وەختــی ڕاگرتنــی ترۆمبێلـەکـە دەهاتە گوێ, بڕا و ئێمە لـە نێو پۆلی دە دوازدە پیاو کە بە قەڵافـەتێکی ســر و کــر و شێلگیرانەیان لـەخۆگرتبوو, دانیشتین. زۆربەیان دەمانچەی ڕووتیان بە دەستەوە بــوو و هێندێکیشیان دەمانچەیان لـە خۆ شەتەك دابوو. هەوڵمان بۆ هەڵگیرساندنی وتوویـــژ بڕی نەکرد: لــە پێــشتردا لـەگــەڵ ڕۆژنامەنووســانی دەرەکــی تێکــەڵاو نــەبوون و چ مەیلیان لــێنەبوو کە لـە ئێمەڕا دەس پێبکەن.

چووینە ئەوسەری مەیدانەکــە و ســەرۆکی شــارەوانی لــە تــەلاری شــارەوانی بــە ڕوویخۆشــە وەریگــرتین. نوســیبین لـەبــەر ئــەو قەتڵــە ڕەمزاوییانــەی تیــا ڕووی دەدا کەوتبووە بەر زار و زمانان. کوژراوەکان جاری وابوو کەسانێك بوون کە دیار بوو بە دانـــستە کەوتوونـــە بـــەر پـــەلامار: چـــالاکانی سیاســـی کـــورد, بڵاوکـــەرەوە یـــان ڕاپۆرتنووسانی ڕۆژنامەکانی مەیلەو کوردی کــە لــە ئیــستامبووڵ چــاپ دەبــوون و جاری واش کەسانێك کە چ دەورێکیان لـە هــیچ گــەڕیانێکا نــەبوو و تەرمەکــەیان بــە نیشانەی دەسەڵاتی حوکمات بە چەند سەعاتان لـە شەقاماندا دەکــەوت و دەمایــەوە. پرسیم ئەوە چۆنە کە بەرۆاڵـەت کەس لـەبەر ئەم قەتڵە سیاسییانە نــاگیرێ؟ بۆچــی بــە قەولی ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی, تاوانی سەبارەت بە "ئەشکەنــجەی بــەربلاو و لـەسەر ڕێوشوێن و شێواز" قەت لێینــاپرســرێتەوە و توێژینــەوەی لـەســەر نــاکرێ؟

سەرۆکی شارەوانی کە پیاوێکی زۆر خاوەن ڕێز و فامیدە بوو و تەمەنی لە مابەینی سی وچلاندا بوو, وڵامی داوە کـە زۆر سـاکارە... زۆر بـە نـەرمی و لـەسـەرەخۆیی شـی کردەوە کە ئەم چاکسازییەی کە بەم زوانە لـە قانوونی سزدانی تورکیادا هاتۆتە ئـاراوە و دەهۆڵ و زوڕنای بۆ هەڵگیراوە, ئەو ناوچانە ناگرێتەوە کە "باری نائاسایی"یان تێـدا ڕاگەیەندراوە. فەرمانی هەڵپێچان و لێپرسینەوەی کارمەنـدانی دەوڵـەت لــە ئەسـتۆی "قایـممەقامی گشتی"یە لـە دیاربەکر و ئەویش بە کردەوە لەم بارەدا دەسەڵات دەداتـە دەس سەرکردەی نیزامیی و ئەویش هەر وەك چۆن باوە هیچ کارێك ناکا.

بەڵام بە دڵنیایییەوە ئەم تاوانانەی کە دێنەگۆڕ و بە گوێرەی ئەوان سەربازەکان و ژاندرمە و تاقمەکانی تایبەت بێ نێوبڕ مافی مرۆص لـە جەغزێکی بەرفرەواندا پێـــشێل دەکەن, ناوبانگی حوکمات دەزڕێنێ؟!

سەرۆکی شارەوانی هەرتك دەستی بەرز کردنەوە, وەك ئەوەی ویستبێتی بڵـێ کـە ئەو قانوون دەبا بەڕێوە و لـە گەرمەی شـەڕا بۆچـی دەبـێ لێپرسـراوێك بیهـەوێ لــە دۆخی قانوون لا بدا و ساڵمەخەتە بکا؟

هەڵتەزینەوەی ئەم لێپرسراوە حکوومەتییە نەقڵێکی بیر هێنامـەوە کـە یـەکێك لــە ڕۆژاوییـەکانی دوو وەچـە پێـشتر باسـی پیـاوانێکی تـەنیا و تێمـاو دەکـا کـە لــە "کوردستانی کێوی"دا فەرمانی حوکمات دەبەن بەڕێوە: ئەم مامۆستایانەی کە کوردانی کێوی پەروەردە دەکـەن, سـەربازانێك کـە تـەکووز و هێـوری سـەقامگیر دەکـەن و دادوەرانێك کە حوکمـە تونـد و تیـژەکانیان بـەڕێوە دەبـەن؛ [ئـەوان] شـەوانە هـەتا بینەقاقەیان ئارەق هەڵدەقۆڕێنن و ئەو دووپشکانەی کە لـە جێوبانیاندا خۆیان مـەڵاس داوە دەدۆزنەوە. هەروا کە گوێم بۆ وتەکانی شل کردبوو لـەپڕ کەوتـمەوە بیر شتێکی تر: قانوونی ژمارە ١٨٥٠ کە لـە ١٩٣٠دا بۆ ماوەی شەش مانگان تـەواوی ئەوانـەی کە لـە سەرکوتی شۆڕشی ئاراراتدا بەشدار ببوون لـــە شوێنکەوتن و لێپرسـینەوەی قانوونی عەپوولیان لـــێدەکرا. پـاش ئـەم دیـدارە لـەگـەڵ ئـەم لێپرسـراوە, بـە پێـی ڕێوشوێنی ڕێزلـێنان چووینە دیداری قایــممەقام, کـە دڵنیـای دەکردینـەوە هێمنـی و

هێوری تەواو باڵی بەسەر نوسیینی کێشاوە و سێ‌مانگە بچووکترین ڕووداو تیا ڕووی نەداوە.

بۆ خواردنەوەی ئابجۆیەك هاتینەوە هەمان کافەی سەرشەقام. پیاوانی چەکداری دان بە خۆداگر وا دیار بوو برێکیان نۆشیبوو و ئێستا ڕووگەشتر بوون لە پێشوو, گەرچی خوڵك‌وخوویان لە جاری پێشوو خۆمانەتر نەبوو. پێیان‌گوتین بەر لەوەی شەو بەسەر دەستاندا بێ شار جێ بێڵین. بەڵام ئێمە خەیاڵمان نەبوو گوێ بدەینە ئەم ڕاسپاردەیە, چونکە نەماندەتوانی بەر لە ڕۆژاوا بوون بگەینە ماردین, کە باژێرێکی ئەوان دەورروبەران بوو و میوانخانەی لێ‌بوو. هیچ پێمانخۆ ش نەبوو بە شەوڕەوی خۆمان بدەینە دەس چارەنووس و بە هەر حاڵ شەکەت بووین و تەمامان گرتبوو کە شەو لە نوسیبین وەمێنین. لە چێشتخانەیەکی هەرزانبایی شێومان خوارد و بۆ خەوتن هاتینەوە میوانخانەیەك کە لەویش هەرزانتر بوو.

هەندێك پاش سەعاتی دە گرمەی تەقینەوەیەکی لەزەبرمان بیست و دوا بە دوای ئەو شریخ و هۆڕی دەسرێژ. چوومە سەر پێگۆڕکەی پلیکانان هەتا بزانم دەنگی تەقە لە کوێوە دێ و هێندەی نەمابوو کە بکەومە ژێر پێ‌وپلی ئەو دە دوازدە کەسەی بە هەڕەمە لە پلیکانەکان دەهاتنە خوار و هەر بەڕێوە چەکەکانیان لە خۆیان شەتەك دەدا. بۆ دیدەنی ئەو شوێنەی وێدەچوو تەقەکە لە وێوە بێ, چووینەدەر: وێسگەی شەمەنەفەر بوو, هەر ئەو ئاسنەرێیەی بە هێڵی بێرلەن – بەغدا ناسرابوو, کە ئەلمانییەکان لە سەرەتای ئەم سەدەوە دەستیان دایە کێشانی و قەت تەواو نەبوو.

بەڵێ ئەمەش لە باس‌وخواسی حکوومەت سەبارەت بە هێمنی و هێوری لە ڕۆژهەڵاتی کێوی‌دا. وەختایەك هاتینەوە دیاربەکر زانیمان کە دوو کاتژمێر بەر لە چوونەوەمان هەواڵنێرێکی جوانکەی ئاواڵی نیزیکی دیلمانجەکەمانیان, لە کاتی چوون بۆ سەرکار, لە ناوەندی شار داوەتە بەر دەسرێژ و کوشتوویانە.

چوارساڵێك دواتر وەختایەك هاتمەوە دیاربەکر نیشانەگەلی سەرکوت لە گوندان و – هێوری لە شاران دا – لە هەموو جێیەك وەبەر چاو دەهات. چەرخ‌وخولی چۆل کردنی گوندان وەهای دەور گرتبوو کە جەماوەری پایتەختی غەیرەڕەسمی کوردستانی تورکیا لە ١٩٩٠ڕا بۆو لایە, لە ٣٠٠/٠٠٠ کەسەوە

بۆ ١/٥٠٠/٠٠٠کەس پێهەڵاچوو بوو. زۆربەی ئەو تازەکۆچەرانەی کە لە دێهات هەڵکەندرابوون و پەنایان هێنا بوویە شاران کارێکی یەکسەرە و سەقامگرتوویان نەبوو و لە سایەی دڵاوایی و پیاوەتی هاونیشتمانی کوردیان دەژیان، چونکە یارمەتی حکوومەتی بڕابڕ هەر لە گۆڕێدا نەبوو. مافناسێکی کە خەریکی ڕاپەڕاندنی کاروبار و سکاڵای سەر بە مافی مرۆڤ بوو و لەبەر ئەم سەرێشەیەی دەینایەوە بێ بڕانەوە دەکەوتە بەر شاڵاوی ئازار و ئێشاندن، منی بردە دیدەنی ئەو تەنکەئاوایانەی کە لە دەوری ئەم کۆنەشارەی سەر ڕۆخی دیجلە پەرەیان دەگرت.

یەکەم ڕاوەستانمان لە نێو کۆمەڵەی ئەو ٤٥٠ خانووبەرانە بوو کە تێکڕا باڵەخانەی چوارنهۆم بوون و لە ڕاستیدا بۆ نیشتەجێ کردنی ئەو گوندییانە ساز کرابوون کە لە بوومەلەرزەی ١٩٧٦دا ماڵوحاڵیان نەمابوو. ئەمانە جەماوەرێکی بەختەوەر بوون، ئەم گوندییانە بوون کە لە گوندەکانی خۆیان ڕەپاڵ نرابوون و خاوەنی پەنا و پەسیوێك بوون. بەڵام زۆربەیان بێکار بوون و بە چاوی تێکئاڵاو و ڕوانینی ورماوی تایبەتی جووتیارانی بێڕیشەی هەموو شوێنان، بە کۆڵانی قوڕوچڵپاویدا ڕاوێچکەیان دەکرد. منداڵانی چڵمنە لە پەنا کۆمای چرپیوچاڵ و لیژەی ویشکەڵ و مووروەداری بەر دەرکان، کایەیان دەکرد، لێر و لەوێ کەرێك یا بزنێك ئەم دیمەنە گوندییەی دەڕازاندەوە، ئەمانە ئەم ماڵاتانە بوون کە ئەم دێهاتییانەی بە کەڵەزەری لە ماڵی خۆیان ڕادرابوون، توانیبوویان قوتاریان بکەن. خۆش ئەوەیە ڕێنوێنەکە گوتی کە ئەم گوندییە پەرەوازەکراوانە ببونە جێنشینی ئەو کوردانەی کە لەبەر شاڵاوی سەرکوتی سەددام حوسێن ڕایانکردبوویە تورکیا. (ئەم کوردە ئێراقییانەی کە لەبەر پەلاماری شیمیایی سەددام حوسێن لە ئووتی ١٩٨٨دا گیانیان بە سلامەت دەرباز کردبوو و بەرەو تورکیا تەقیبوون، هەر لەم شوێنە – هەر لەم کۆمەڵە باڵەخانەی کە بە ٤٥٠ دەزگا ناودێر کرابوو – نیشتەجێ کرابوون، هەتا ئەوەی ئاخرییەکەی لە ١٩٩١دا گەڕا بوونەوە ئێراق.)

بە کووچە و کۆڵاناندا لە شار نیزیك بووینەوە؛ لێرە تووشی خانووچکەی لاروکۆمی تەنەکەئاوای سەر گرد و تەپۆڵکەی قەراخ شار هاتین، کە ئاو و کارەبایان

نەبوو. لەناکاو کۆمەڵێك باڵەخانەی پاك و خاوێن و ڕێكوپێك و تەیار بە پارکینگ و ڕێی هاتوچۆمان لەبەر چاوی قوت بوونەوە کە هێشتا کەسیان تێدانیشتەجێ نەکرابوو. لە ئاخرین سەردانی پێشوومدا بۆ دیاربەکر شوێنەواری ئەم باڵەخانانە بەدی نەدەکران. بە دیتنی ئەم خانووبەرە تازە و تەیارانە سەرم سوڕما, خانووی لەم چەشنەم لە ناوەندی شار و دەوروبەرەکەی بینیبوو. کێ لە کوردستان دەیتوانی باڵەخانەی ئاوا ساز بکا؟! ڕێنوێنەکەم گوتی: "دەوڵەت ئەمانەی بۆ خێزانی ئەو ژاندرمە و سەرباز و پۆلیس و پیاوانەی دەزگای ئاسایش ساز کردووە کە بۆ شەڕ هێناونی بۆ کوردستان." دۆستێکی ئەندازیار کە لە کاری حیسابگەریدا ئەشتەکی لێدەزانی دەفتەری یادداشتەکەی دەرهێنا و لەبەر خۆیەوە هێندێکی حیساب لێکدانەوە و گوتی: "بە هێندێك پتر لە نیوەی ئەم پووڵەی کە لەم ٤٠٠٠ یەکە خانووبەرەیەی دیاربەکر خەرج کراوە دەوڵەت دەیتوانی ئەو ٢٢٠٠ گوندە چۆل کراوە سەرلەنوێ بکاتەوە شوێنی ژیان و هەر خێزانێك لینگێك گا, مانگایەك, دوو سەر کاوڕ و دوو بزنیان وێبدا." ئەو پەناگرتووانەی دواندمن گوتیان بە ئاواتن وەگەڕێنەوە دێی خۆیان, بەڵام دەزانن کە هێزەکانی ئاساییش ئیزنیان نادەن. ئەم خەڵکە هەر نەبێ ئەوەندەیان دڵخۆشی هەبوو کە لە گوندەکانیان نیزیکن و ئەگەر شەڕ کۆتایی پێهات و کاربەدەستان بەزەیییان بزووت و دەستیان لە پرکێشی کێشایەوە, دەتوانن بگەڕێنەوە گوندەکانیان. ئەم خەڵکە لێرە لە شوێنەواری ئەو زەخت و تەوژمانە پارێزرابوون کە دەبووە هۆی ئەوە چەشنی ئەو کوردانەی پەنایان بردبووە ناوچەکانی ڕۆژاوا و باشووری وڵات، زمان و داب و نەریتی خۆیان لەبیر بچێتەوە. ڕێنوێنی مافناسم ئەوەندی هەڕەشە لێکرابوو کە هەوڵی دەدا بێونەبێ سەری سەعات شەشی پاش نیوەڕۆ لەماڵەوە بێ. بەڵام بۆو کەسانەی کە نەکەوتبوونە بەر سێرەی ڕاستەوخۆی حوکمات, ژیان لە شاردا لە "سایەی سەری" هێزەکانی ئاساییشەوە وەك ڕابردوو هاڵۆز و پڕکارەسات نەبوو. بەیانان, پاشنیوەڕۆیان و سەر لە ئەنگۆران بە قەراخ دیاربەکردا, بە خۆی و بە کۆنە شوورەیەکی هەڵچناوی بەردینی مەرمەری ڕەشا دەرۆیشتم و لە هەموو شوێنان خەڵکێکم دەدیتن کە لە تەواوی وەختاندا بە شوێن کار و سەیرانی خۆیانەوە بوون. لە ڕابردوودا بەر لە تاریکان کەس لە شەقامان بەدی

نەدەكرا. ئێستا پۆلیسێكی زۆریش لـە شەقامان وەبەر چاو نەدەهات. داخوا حكوومەت بناغەی "پ.ك.ك"ەی هەڵتەكاندبوو و ئەوی ڕادابوویە ژێرخان و نەهێنگاوە؟

ئەو ماوەیەی كە لـە ڕابردوودا دەبوو بە پاشنیوەڕۆیەكی دەمارپرووكێن, كەوتـــمە شوێن دۆزینەوەی مـووزەی "زیـا گۆكاڵــپ" و زۆر بــە كـوێرەوەری, لــە كـۆڵانێكی لاپەڕی دوور لـە بازاڕی ناوەندیدا دیـمەوە. گۆكاڵپ لـە ١٨٧٦دا, لـەم شـارە, لــە بنەماڵەیەكی كوردا پێی نایە ژیانەوە, باوكی كارمەندێكی ئاسایی بـوو. نەیـــخوێندبوو, خــۆ فێركــردە و شــاعیرێكی گڕگرتــوو و كۆمەڵناسـێكی هەڵبــژاردە بــوو. بــوو بــە بیردۆزێكی هەڵكەوتەی ناسیۆنالیزمی شەڕخوازی ترك.

گۆكاڵپ كە كەتبووە ژێر بیروڕای ئیمیل دوركـیم و بیرمەنـدانی تـری فەڕانــسە و خاوەنبیرانی ئەڵــمان, لـە ساڵانی بــەر لــە شــەڕی یەكــەمی جیهانیــدا لــە حوكمـاتی تركانی لاودا بوو بە جێی باوەڕ و ناوبانگی دەركرد. بڵاوبوونەوەی ئەم بەرهەمەی بــە نـاوی "ڕێوشـوێنی توركیـسم" لــە ١٩٢٠دا تـوانی بەڵگــە و بۆنــەی ســەرەكی بـۆ دامەزراندنی حكوومەتێكی كۆدەســەلات و جیـا لــە دیـن و بــە بـێ لا كردنــەوە لــە كەمینەكانی نەتەوەیی و قەومی و وە تركگێڕانی ئەوان بـخاتە بەر دەسی ئاتـاترك. ئــەو دەڵێ: "گەل تاقمێكی ڕەگەزی یان قەومی یا جوغرافیایی یان سیاسی یان بەكەیفە نیــە, بەڵكوو تێكەڵاوێكە لـەم كەسانەی كە زمان و دین و ئەخلاق و جوانناسیی هاوبەشیان هەیە, یانی لـەسەر شێوەیەك پەروەردە كراون." گۆكاڵپ لـە ١٩٢٤دا و بــەر لــەوەی كە ئاتاترك ئەم بیرۆكانە بـخاتە گەڕ كە ئاكامی ئەوتۆ مەترسـیداریان لــە بـۆ كـوردان لێكەوتەوە, مرد.

"گۆكاڵپ"یـش وەك زۆرێـك لــەو كـوردە هەڵكەوتوانــەی كــە ڕاژەی كۆمـاری توركیایان كرد, خۆی بە كورد نەدەزانی. ئەم هاشا لـە بنچاغ كردنە لـەگــەڵ بـیروڕای عوســمانییەكان كە تەواوی جەماوەری مەسیحی و جوولـەكـە و مـسوڵمانی وڵاتیـان, وێڕای پاراستنی زمانی زگماكی و زێدی باب و كاڵان و تایبەتـمەندییەكانی فەرهەنگی, بە عوســمانییان دەزانین, یەكتری نەدەگرتەوە. گۆكاڵپ دەیگوت: "من ئەگەریش بـۆم دەركەوتایە كە باوك و باپیرانـم لـە ناوچەكانی كوردنشین یا عەرەبنـــــــــــــشینەوە هــاتوون, دیسانیش لـە ترك بوونی خۆمدا ئەوندووكەم دڵاودڵ نەدەكرد, چـونكە بــە

گوێرەی موتاڵا و خورد بوونەوەکانی کۆمەڵایەتی خۆم بۆم دەرکەوتووە کە بناغەی نەتەوەیی لەسەر پەروەردە کران سەقامگیرە." ساڵگاران لەسەر ڕاستە شەقامی چوارڕێیانێکی شار تابلۆیەکم دیبوو کە ڕەوگەی گشتیی بەرەو مووزەی نیشان دەدا. هیوادار بووم کە چوونە سوێی وێندەرێ بۆ ڕەها کردنی ئەو گرێ و گۆڵە, واتە حاشا کردن لە تۆرەمە و ڕەگەزی کوردی بە ناوی ناسیۆنالیزمی پەرەگری تورك, کە بە لامەوە سەیر بوو, یارمەتیم بکا. وێنە و نموونەکان زۆر بوون, تەنیا گوکاڵپ و عیسمەت ئینۆنوو نەبوون... کە دواتر بوو بە سەرکۆمار. یەکی تر لەم تاقمە ژێنێراڵێکی کورد بوو بە ناوی "جەمال گورسێل" کە بوو بە سەرکۆمار و یەکەم گۆدەتا لەم سێ گۆدەتایەی تورکیا بە ڕێبەرایەتی ئەو بوو, کە لە ١٩٦٠دا دەسەڵاتی گرتە دەس. هەر ئەویش گەفی لە نەتەوەخوازانی کورد کرد: "سپا بۆ بۆمباران کردنی شاران و گوندانی کوردان دلاودڵ ناکا و وەها خوێن دێ و سەران دەبا ..."

وەختایەکی ئاخرییەکەی مووزەم دیتەوە ئەو شتەی سەرنجی ڕاکێشام ڕەنگوڕووی کاڵەوەبووی ئەو بوو: لە دەوری حەوشۆکەیەك ساز کرابوو کە جگە لە چەند مریشك و جووچکە شتێکی تێدا وەبەر چاو نەدەهات. بە تاقیتەنێ لەم بینایەدا کە تازە ڕەنگ‌کرابۆوە کەوتمە گەڕ, هەتا زێوانێکی ژاکاو و بێواز گوتی کە وا خەریکن دەستێك بە سەر و ڕووی مووزەکە دابێنن و کەڵتەی کەنەوە. لە ڕاستیش‌دا جگە لە بەژنی پەیکەرەی ئاتاترك کە ڕازینەوەی بینا نەتەوەیی و دەوڵەتییەکانە, پێنج شەش دیوی مووزە و سندووقچە شووشەبەندەکانی تێکڕا بەتاڵ بوون. سەرەتا تەریق بوومەوە, بەڵام ئێستا زۆریش دڵنیا نیم کە ئەو وڵامەی بە لێی دەگەڕام، نەمدۆزیبێتەوە.

***

ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك کەڵەئەندامی ناتۆ بۆ تورکیا خاوەنی گرینگایەتییەکی تەواو بوو. تەنانەت پاش بڕانەوەی شەڕی سارد, تورکیا بۆ ماوەی چەند ساڵان لە ڕیزی سێهەمی یارمەتیوەرگرانی دەرەوی ئەمریکا چەقیبوو, ئەگەرچی لەم پلەیەدا مەودایەکی زۆر لە ئیسرائیل و میسرەوە لە دوا بوو. لە ١٩٩٤دا کە

ناخۆشترین ساڵی سەرکوتی پارێزگا کوردنشینەکان بوو, تورکیا گەورەترین خوازیار و مشتەری چەكوچـۆڵی ئـەمریکایی بـوو. بـەم شـێوەیە گـەورەترین کڕیـاری چـەك و تەقەمەنی بوو لـە جیهان دا. جبەخانەی تورکیا کە لـە سەتا هەشـتای ئـەمریکایی بـوو, بریتی بـوون لــە تـانکی ئـێم – ٦٠, فڕوکـەی شـەڕکەری بۆمباوێـژی ئێـف – ١٦, باڵەفڕی تۆپداری گەورە و باڵەفڕی سووکەڵەی بلاكهاوك, کە تەواوی ئەمانە بە دژی کوردان کەلکیان لێوەردەگیرا. پێنتاگۆن لـەپەستا تورکیای بۆ کڕینی چەكوچـۆڵ دنـە دەدا, جگە لـە ماوەیەکی کورت کە تێیدا فرۆشتنی بۆمبا هێشووییەکانی دژی مـرۆی ڕاگرت. وەختایەك تاقمەکانی مافی مرۆص ئاشکرایان کرد کە فڕۆکـەکانی "ئێـف – ١٦ ئێس"ی تورکیا دێهاتە کوردنشینەکانیان بۆمبـاران کـردووە و پۆلێکیـان خـەڵکی ئاسـایی داوەتـە بـەرخۆ و جـەماوەرێك کـوژراو و برینـدارن, واشـینگتۆن هێنـدێکی سەرلـێشێوا. بەڵام پێنتاگۆن بـە دۆزینـەوەی "ڕێیقوتـار بـوون" کـارێکی کـرد کـە دەوڵەتی کلینتۆن سەرەڕای بوونی قانوونێك کە دانی چەكوچــۆڵی لــەو جێیانــەدا بەربەست دەکرد کە بە نابەجێ کەلکیان لێوەردەگیرا, هەر وا دانی چەكوچــۆڵ بــە تورکیا نەپسێنێتەوە. بەڵێ، هەرچی گرینگترە لـە پێشترە.

چەندین هەزار ئـەمریکایی کـە دەزگـا و دامـەزراوەکانی کۆکردنـەوەی زانیـاری ناتۆیان دەگێڕا، لـە گۆشــە و کـەناری تورکیـادا بڵاوببوونـەوە، ئـەم دەزگـا و بنکانـە بێگومان لـە سەردەمانی شەڕی ساردا یەکجار گرینگ بوون، بەتایبەت پـاش شۆڕشـی ئیسلامی ئێران کە بنکەکانی "دەنگدزیـن و گوێخەوانـدن"ی سـەر ڕۆخـی دەریـای خەزەری تێکەوپێچا، کە لـەوەش پڕبایـەختر بوون.

بەڵام لـەم هەنتەشی سەربازییەی ئەمریکا کە پێشینەی دەگەڕایەوە ساڵەکانی دەیەی ١٩٥٠، قەت بۆ ئاشنایەتی لـەگەڵ بـاری نالــەباری ژیـانی کـوردانی تورکیـا کـەلك وەرنەگیرا. هێزەکانی ئەمریکایی ڕاستەوڕاست دەستووریان پـێدرابوو کـە خۆیـان لــە دمەتەقە سەبارەت بە کێشە سیاسییەکان لـەتەك هاوپەیـمانی "دڵناسك"یان بپارێزن. من ئەم مەبەستە دەزانـــم، چـونکە لــە نێوەڕاسـتەکانی دەیـەی ١٩٨٠ڕا بـێ نێـوبڕ ئـەو ئەفسەرە ئەمریکاییـیانـەی لــە تورکیـا خزمـەتیان دەکـرد، لــە بابـەت کوردسـتانەوە هەڵمدەپێـچان و پرسـیارم لـــێدەکردن، کـە هێنـدێك لــە دامـەزراوە گرینگـەکانی

ئەمریکای لــێدامەزرابوون. هەمیشە لە نــەبوونی ئــۆگریی و لا لــێنەکردنەوەی ئــەم ئەفسەرانە ســەرم ســوڕمابوو. هەڵس‌وکــەوتی ئــەم ئەفــسەرانە لــە بەرچــاوم چەشــنی گەڕانەوە بۆ سەر نەبوونی ئۆگریی و لا لــێنەکردنەوەیەك قوت بۆوە کە هاوتا نیزامیی و سیاسییەکانیان لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تارانی ساڵانی دەیــەی ١٩٧٠دا پێیانــەوە دیار بوو: ئەم کاربەدەستانە لەبەر ڕاگرتنی ڕێزی شا لە رووی زانینەوە و بــەپارێز، لــە هەوڵ دان بە مەبەستی تێگەشتن لە کەش و هەوای دژی ئەو خۆیــان دەپاراســت. جــا ئەم ســەرنج نەدانــە بــۆ قــازانج و بەرژەوەنــدی نەتــەوەیی ئــەمریکا کۆئاکــامێکی پــڕ کارەساتی بە دواوە بوو.

بە درێژایی ساڵگاران دەوڵەتەکانی ئەمریکا یەك لە دوای یەك، هەر کام بەڵگــە و بۆنەی جیاوازیان بۆ پاســاو هێنانــەوە لەمــەڕ خــۆ گێــل کــردن لــە بابــەت ســەرکوتی کوردانەوە نیشان داوە. لــە ســاڵانی دەیــەی ١٩٥٠دا، پەیــمانی بەغــدا (کــە دواتــر وەختایەك ئێراق دوابەدوای حکوومەتی پاشایەتی لــە ١٩٥٨دا لێی‌ــچووەدەر، نــاوی بوو بە ڕێکخراوی پەیــمانی ناوەندی) لە ڕاستیدا سەلــماندنی هــەمان ئامانـــجەکانی دژ بە کوردان بوو کە لە پەیـمانی ١٩٣٧ی سەعدابادا ڕەنگی دابۆوە. نەتەوەخوازی، بەتایبەت لە نێو کەمینەکانی نەتەوەیی وڵاتانی مەیلەو ڕۆژاوای ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاســت و هەڵکەوتوو لە پەنا "شــوورەی پــۆڵایین" گومــانی خراپــی لــێدەکرا، هــەروەك لــە ئیمپراتــۆریێتی سۆڤیەتیــشا وەوتــۆ بــوو. بــە دامرکــانی شــەڕی ســارد لــە ١٩٩١دا و سەرقوت کردنەوەی ئێرانی خومەینی، تورکیا بۆ پلەی ژاندرمێتی "لادینی" پێهەڵاچوو، بـــەم ئەرکـــەوە کـــە دراوســـێ ئیـــسلامییەکانی خــۆی لەســـەر هێڵـــی پاراســـتنی بەرژەوەندییەکانی ڕۆژاوا ڕابگرێ. برانەوەی ئاڵۆزکاوانەی شەڕی کەنداوی فارس لــە ١٩٩١دا، ئەیالــەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کردە زیندانیی ئانکارا و سیاســەتەکانی خودی واشینگتۆن، کە پتر پێکەوە دژاودژ دەکەوتن. ساکارتر گوتبێتمان، واشــینگتۆن بۆ هەڵدانی چەتری ئاســمانیی بە مەبەستی پشتیوانی لە کوردەکانی ئێراق و کڕینەوەی ناوبانگی زڕاوی خۆی پێویستی بە ڕەزامەندی تورکیا هەبوو بۆ کــەلك وەرگــرتن لــە بنکەی ئاســمانیی ئینجیرلیك – لە نزیك ئادەنە – کە سەرکوتی پەرەگری کوردانی لە خودی تورکیادا وەبەر چاو نەدێنا.

ئەم سیاسەتەی چەتری ئاسمانیی کە بە ناوی "دابین‌کەری ئاسایش" و جاروبارە بە "چەکوچی پارسەنگ" دەهاتە ناسین، بە کردەوە لە لای سیاسەتبازانی تورکیا هورمێکی نەبوو. ئەم سیاسەتوانانە بە هەڵە بە خۆیان سەلماندبوو کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ئانقەست هەوڵ دەدا پەنا و پەسیوێك بۆ پ.ك.ك. لە باکووری ئێراق جێبەجێ کا. (تەنیا ناوەندی سەرکردایەتی و بەدەسەڵاتی سپای تورکیا بوو کە بە واقع‌بینییەوە چالاکی دابین کردنی ئاسایشی پێ لە گەڕانەوەی میلیۆنان کورد و کۆ بوونەوەیان لەسەر سنووری تورکیا بە باشتر دەزانی و هەر ئەویش بوو کە دەوڵەتەکانی تورکیای بۆ نوێ کردنەوەی قەراروبڕی ناچار کرد.) بە دەیان ساڵی بێ‌پسانەوە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا شان‌بەشانی کۆڵەکەی بڕوای چەقیوی تورکیا ڕەق ڕاوەستا بوو و لێکدانەوەی وی لەسەر کوردان بە ناوی "ترکی کێوی" سەلماندبوو و حاشای لە بوونی کردبوون و ئێستاش ئەم ئیددیعایەی تورکیای لەسەر وەی کە پ.ك.ك. ڕێکخراوێکی تیرۆریستییە و لەوە زیاتر نیە بەگەرمە دەسەلماند. سەرەڕای تەواوی ئەمانەش سەرکەوتنی پ.ك.ك. بۆ دەرفەت هێنان لەسەرکوتی تورکیا بۆ بەرەوپێش‌چوونی ئامانجەکانی خۆی و پەرەگرتن لە نێو جەماوەری خەڵکی کوردا، بێ‌گومان ببوو بە هۆی دڵپەرۆشی واشینگتۆن و گشت پایتەختەکانی ڕۆژاوایی تر.

زۆرێك لە کوردان هەر بەڕاستی لە پ.ك.ك. تۆقیبوون و لەبەر هۆکاری مرۆڤ‌دۆستانە دژی شێوە و شێوازی کردەوەکانی بوون و دەیانزانی کە چلۆن دژکردەوەیەك لە نێو دەوڵەتا بۆ سەرکوتی خەڵکی ئاسایی کورد هەڵدەپێچێ. سەرەڕای ئەمەش خەڵکی دانیان بە گرینگایەتی ئۆجالاندا دێنا. ئەم پیاوە (ئۆجالان) بە تاقی تەنیا ئەم پێناسە ڕەگەزییەی کوردی کە لەمێژ ساڵ بوو حاشای لێ‌کرابوو، زیندوو کردبۆوە. بەڵام واشینگتۆن قەت جگە لە دەس پێکداسوونی دیپلۆماتیك هیچی دیکەی نەکرد. یارمەتیدەرانی وەزارەتی دەرەوە لە بەشی مافی مرۆڤا زۆرجاران چوونە سەردانی تورکیا و زوڵم و دەسدرێژییەکانی دەوڵەت و پارتیزانەکانیان مەحکووم کرد. لەسەر ئەوەش‌ڕا ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەروا بەلایەوە باشتر وابوو کە "فینجانی تورکیا بە نیوە پڕی" ببینێ، لە حاڵێکا زۆرێك لە ترکان

دەیانزانی کە ئەم فینجانە لە باشترین باری خۆیدا "نیوە بەتاڵ"ە و ئاو دەدەڵێنێ. دەوڵەتی ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لێژنەکانی ئەمریکایی هان دەدا بچنە تورکیا و دەوڵەت دنە بدەن هەتا ئاڵوگۆڕ و چاکسازییەك بەسەر قانوونی سزادان و شێوە و شێوازەکانی لێپرسینەوە و هەڵپێچان دابێنێ کە بە پشتبەستن بەوانەوە و بە ئەشکەنجەدانی گیراوەکان قسەیان لێدەردەکێشن. بەڵام سەرەڕای بە دەستەوە بوونی بەڵگە و بۆنەی پەرەگر لە بابەت پێهەڵاچوونی زوڵم و زۆرەوە، باڵادەستانی ئەمریکایی ئومێدی خۆیان هاویشتە سەر ئەم مەبەستە کە گۆڕین و باش کردنی شێوەکانی ڕاهێنانی پۆلیس و فەندەکانی دادوەری یان پێکهێنانی وەزارەتخانەیەکی "بێ دەسەڵات"ی بەرپرسی کاروباری مافی مرۆڤ و ئاڵوگۆڕە سەرسەرەکییەکان کە بە بڕوای زۆرێك لە ترکان فرت و فێڵ یام دەستێوەردانی نێوخۆی وڵات بوو، دەتوانێ بەکەلك و شوێندانەر بێ. ئەمریکایییەکان هەمیشە لەسەر ئەم مەبەستە پێداگر بوون کە ئەم چاکسازییانە نەك تەنیا بۆ کوردان بەڵکوو بۆ تەواوی خەڵکی تورکیاش بە قازانجە. بەڵام ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە لە ڕەگەزپەرستی ترکان دەترسا و لە کێشە سیاسییەکانی ترا نیازی بە هاوکاریی تورکیا بوو بە ئاشکرا بە باری چارەسەر کردنی ڕامیاری کێشەکە و کۆتایی هێنان بەم شەڕە نێوخۆیییەی کە بە پانەوە خەساری دەگەیاندە ئێروو و بەختیاری تورکیا، کارێکی نەکرد.

پێوەندەکانی ئەمریکا و تورکیا تێکەڵاوی وەها دژاودژ کەوتنێك بوو. ئانکارا لەبەر گرفتێکی کە لەگەڵ پ.ك.ك. بووی بۆ جووڵانەوە لەتەك کوردەکانی ئێراقا تووشی هەڵسوکەوتی دژبەیەك دەهات: هەر ئەم کوردانە تەنانەت وەختایەك کە لە ١٩٩٤دا پێکەوە کەوتنە شەڕەوە دیسانیش لە جەغزی سیاسەتی واشینگتۆندا بۆ لێخستنی سەددام حوسێن — یان بەدیهێنانی وەها گومانێك — وەك هۆکارێکی بنەڕەتی مانەوە. سیاسەتی خودی تورکیا ڕێبازێکی دروست و دیاری نەبوو: تورکیا نارەزامەندی خۆی سەبارەت بە پێکهاتنی پارلەمان و دەوڵەتی هەرێمی کورد نەدەشاردەوە و ئەوی وەك دەوڵەتێکی ئاوەلەمەیی مەحکووم دەکرد و دەترسا کە پێشینەیەك لە بۆ کوردەکانی خودی تورکیا پێكبێنێ و گوتی کە بۆی قبووڵ ناکرێ. لەگەڵ ئەمانەشا یارمەتییەکی ساڵانەی ١٣ میلیۆن دۆلاری بۆ کڕینی خورد و خۆراك و پێتەویستی تر وێدان و

ئیزنــی دا بــە پــارتی دیمــوكراتی كوردســتان و یــەكێتی نیــشتمانی كوردســتان كــە "نووسینگەی پێوەندییەك" لـە ئانكارا بكەنەوە و سەرەڕای گەمارۆی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان كە ناردنی تەواوی یارمەتییەكانی مرۆڤدۆستانەی بۆ ئێراق بەربەست دەكرد، ڕێی لـە فرۆشتنی ئیـزن نـەدراوی سـووتەمەنی دزێلـی ئێـراق نـەدەگرت كـە دەكرایە خەرجوبەرجی مانگانە و پێویستییەكانی تری "دەوڵەتی هەرێم."

ئەم هەڵسوكەوتەی توركیا بە هەموو بارێكدا وەك جوولانـــەوەی دەوڵـــەتێك لـەگەڵ دەوڵەتێكی سەربەخۆی ترا دەچوو. وێڕای تەواوی ئەمانەش توركیا هــەوڵی دا پێوەندی سیاسی و ئابووری لـەتەك سەددام حوسێنا داگیرسێنێتەوە، بـە هیـوای ئـەوەی كـە ڕۆژایـەك سـەرلـەنوێ دەسـەلاتی خـۆی بەسـەر بـاكووری ئێراقـا بـسەپێنێتەوە و بەمـجۆرە پ.ك.ك. لـە دەس وێراگەیشتن وە پەناگا قوتبڕاو كا. توركیا لـە بیر خـۆی بردبۆوە كە لـە ڕابردوودا سەددام حوسێن لـە یارمەتیدانی پ.ك.ك. و تەنگەژەنانـەوە بۆ توركیا بۆنە و بیانووی تایبـەتی خـۆی هـەبوو: ئـەم دژاودژ كەوتنانـە بایـەخیان بـۆ دانەندرا. دیارە توركیا بە پەلاماری لـەپەسـتا بـۆ سـەر بـاكووری ئێـراق بـە بیـانووی تێكەوەپێچانی بنكەكانی پ.ك.ك. و تێدا بردنی گریلاكانی، نێوانناخۆشـــی مابـــەینی پێشمەرگە كوردەكانی ئێراقی كە پێشتر گرژ بوو گرژتـر كـرد. هیـچكام لـەم كـار و جوولانەوانە پەسندی واشینگتۆن نەبوون.

بە سەرنجدان بـــە سیاســـەتی هەوســـاری دوولایەنـــەی دەوڵـــەتی كلینتـــۆن و تاقكردنەوەی دەوڵەتانی ئێراق و ئێران، هەڵگیرسانەوەی سەرلـەنوێی دەسەلاتی ئێـران لـە باكووری ئێراق لـە ١٩٩٤ڕا بە مەیلی واشینگتۆن نەبوو. لـە دابـەش كردنـی ئـەم كارانەی لـە نێوان زلـــهێزانی جیهانیـدا كرابـوو، دەوڵــەتانی ئورووپـایی بـە ئاشـكرا پەلامار و هێرشەكانی توركیایان بۆ سەر خاكی بـاكووری ئێـراق دەدایـە بـەر ڕەخنـە، كەچی ئەمریكا لـەبەر چاوی خەڵك پێـچی بـە قـسەكانی دەدا و بـەو كەسـانەی كـە ڕەخنەیان لـە سیاسەتەكانی دەگرت، دەگوت لــە بنـەوە خـەریكی كاروبارێكـە، (كـە هەڵبــەت ئــەو هەوایــە هەمیــشە دڵخــوازی ئەمریكاییــەكان بــووە.) كاربەدەســتانی پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا جارناجارێك لـەبەر چـاوی خـەڵك دەسـتێكیان

پێکدادەسوو و بە ڕاوێژێکی ئیماندارانەوە دەیانگوت کە بەڵێ، شەڕ لەگەڵ پ.ك.ك. تەنیا بە سەرکوت کۆتایی پێ‌نایە.

بەم شێوەیە ئانکارا و واشینگتۆن لە ناوچەدا گیرۆدەی کێشەیەکی وەها بەرزەخوازانە و پێچەڵفلۆوچ بوون کە بە ڕواڵەت چی بەسەر کوردانا نەدابوو، بەڵام وێڕای تەواوی ئەمانەش دەگەڕایەوە سەر ئەوان. ئەگەر لەم مامەڵەدا لایەنی تێوەچووی کێشەکە هاوپەیمانێکی پتەوی ئورووپایی بووبا ڕەنگە ئەم کایە دیپلۆماتیکە بێ‌شوێن و ئاکام نەبوایە. بەڵام لەبەر ئەم سیاسەتە چەندقۆڵییە کە هەر لە خۆیاندا بە باری لاواز کردنی کێشەکانیش‌دا دەکەوتن، سەرنجێکی ئەوتۆ نەدرابوویە تورکیا. تورکیا هێزێکی وانەبوو، ولاتێك بوو کە جگە لە کێشەی لەگەڵ کوردان، نێوانی لەتەك هەر هەشت دراوسێی یان زۆر لاواز یان تەنانەت فرە ناخۆش بوو. وێڕای تەواوی ئەمانەش دەوڵەتی کلینتۆن تورکیای وەك پاڵپشتێکی گەورە لە ناوچەدا بە مەبەستی بەڕێوەچوونی سیاسەتی هەوساری دوولایەنەی خۆی هەڵبژاردبوو و ئەو دڕدۆنگییەی کە سەبارەت بە نوێ بوونەوەی کۆبوونەوەکانی وەزیرانی دەرەوەی ولاتانی ئێران و سووریا — لەسەر شێوازی پەیمانی سەعداباد — هەیبوو، نەیدەدرکاند. ئێران و سووریا ولاتانێك بوون کە واشینگتۆن هیچ نەیدەویست دەستیان لەم گەڕیانەدا بێ. بەڵام وەزیرانی دەرەوەی ئەم ولاتانە لێك کۆ دەبوونەوە و قین و دوژمنایەتی خۆیان سەبارەت بە هەر شتێکی کورد و کوردی بوایە دەردەبڕی. (هەڵبەت دەربڕینی ئەم هەڤگرتنە ڕەسمییە دیپلۆماتیکە نەیتوانی ببێتە بەربەندی ئەم مەبەستە کە سووریا و ئێران و ئێراق جێ‌ڕێ نەدەن بە پ.ك.ك. هەتا لەوان بنکانڕا تورکیا بداتە بەر پەلامار.)

کردەوەی ئەم سێ دەوڵەتە شێوەیەك جەغز بەزاندن و قازانج لێ‌هێنانی پێچەوانە بوو لە ڕەوتەکە. ئەمانە دەیانویست حاشا کردن لە بنچاغی کوردان لە لایەن تورکیاوە "وەك نموونەیەکی سەلمێندراو" بۆ بن‌لیچ دانی مافی کەمینە کوردەکانی خۆیان بکەنە سەرمەشق. تورکیا فریوی ئەم ڕەوتەی خوارد و کەوتە داو. تورکیا بە ڕادەیەك سەبارەت بەم ولاتە بە کۆیلەکراوە عەرەبیانەی پێشووی عوسمانی هەستی بە سووکایەتی دەکرد و بە جۆرێك لەگەڵ ئێراق و سووریا دەجوولاوە کە هەر

**دەتگوت پێوەندی نێوانیان تەنیا دەگەڕێتەوە سەر کێشە و گرفتی هێمنایەتی و لەگەڵ قەڵەمڕەوی بالاتری دیپلۆماسی زاڵ بەسەر نێوان و تێکەلایەتی ولاتاندا هیچ فریان بەسەر یەکەوە نیە. ئاکامەکانی ئەم هەڵوێستە پڕ کارەسات بوو، ئەگەرچی کەمیش بوون ئەو بالادەستە ترکانەی کە لەوەیان پتر گلەیی هەبێ کە لەگەڵ "دراوسێیانی دڕ" بەرەوڕوون؛ دەتگوت لەسەر ئەم بنەڕەتە پاساویان بۆ کاڵی و نەکوڵیوی سیاسی خۆیان دێنایەوە!**

**لە هیچ شوێنێك ئاکامی کار چەتوونتر لە پرۆژەی عەنەدۆڵی باشووریڕۆژهەلاتی نەبوو، کە بە ناوی "گاپ" باشتر ناسراوە. لە سالانی دەیەی ١٩٨٠دا تورکیا بە شێوەیەکی یەك‌لایەنە دەستی دایە بەرێوە بردنی پەرەی ئەم گەلاڵە ئاوەدێرییەی کە بەری رووبارەکانی "دیجلە" و "فورات"ی دەگرت. تورکیا دەیگوت چونکە ئەم رووبارانە سەرینچاوەیان لە خاکی ئەوایە پێویستییەك نابینێ کە لەبەر بە دەستەوە نەبوونی قانوونێکی روونی نێونەتەوەیی، نیازی ولاتانی دراوسێ بۆ دابەش کردنی ئاوی ئەم دوو چۆمە وە بەرچاو بگرێ, لە وەختایەك‌دا کە بوونی ئەم ولاتانە بە چلۆنایەتی نەپسانەوەی ئاژوانی ئەم ئاوانەوە گرێ درابوو. ئانکارا بۆ لە کۆڵ خۆ کردنەوەی گلەیی ئەم ولاتانە لەسەر ئەم خاڵە پێداگر بوو کە بەڵێ لە چاکە و سایەی سازکرانی ئەم بەنداوە تازانە بووە کە دەروجیرانەکانی توانیویانە بۆ یەکەم جار بێ نێوبڕ و پسانەوە ئاو وەربگرن. دانیشتن و وتوویژی سێ قۆڵی و نێوەنێوە کە لە بابەت دابەشینی ئاوەوە کرا, نەگەیشتە ئاکام. سندووقی نێونەتەوەیی دراو, بانکی جیهانی و تەواوی سەرمایەدانەرانی دەرەکی, لە نێونەتەوەییڕا بگرە هەتا تایبەتی, لەبەر ئەمەی کە تورکیا پێشتر ئەم کێشە ناسکەی لەتەك ئێراق و سووریادا چارەسەر نەکردووە, لە ترسی تێوەگلان لە وەها گێرە و کێشەیەك لە دابین کردنی خەرجوبەرجی ئەم گەلاڵەیە ملیان بادا. ئەمە "ئەوپەڕی" پێمل نەبوونی ڕۆژاوا بوو.[1] کارناسانی**

---

**١– لە تەبلیغاتاندا باسی وەی دەکرا کە گاپ دەرگای خێرو بێرێکی زۆر بە ڕووی کورداندا دەکاتەوە, بەلام لە ڕاستیدا قەت ئاوای نەکرد. گاپ تەنانەت ئەگەر ئەمجۆرەی کە گەلاڵەڕێژانی لایان وابوو, تەواو بووبا دیسانیش قازانجێکی بۆ کوردانی پەروەردە نەکراو, لەم ناوچەدا کە ڕێژەی بێکاری زۆر لە سەرێیە, نەدەبوو, چونکە ملکایەتی زەوی هی دەرەبەگانی خۆجێیی بوو(!)**

نێونەتەوەیی لێکیان داوە کە بە تەواو بوونی پرۆژەکانی تورکیا, ڕەنگە سووریا تەنیا لە سەتا چلی ئەو ئاوەی کە پێشتر لە ڕووباری فوراتی وەرگرتووە, وەربگرێ, لە کاتێکا کە ڕادەی ئاوگرتنی ئێراق لە سەتا بیست پتر پێهەڵانەدەچوو. لە فێوریەی ١٩٩٦دا سیاسەتبازانی تورکیا هەوڵیان دا کە دەوڵەتێك بە ترەکەڵەك پێك‌بێنن, ناوەندی سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانی تورکیا بە شێوەیەکی یەك‌لایەنە – بە بێ ئیزنی دەوڵەت – قەراروبڕێکی لە بواری پەروەردە و ڕاهێنانەوە لەگەڵ ئیسرائیل مۆر کرد: ئەم کارە کە بە تۆڵەی پشتیوانی کردنی سووریا لە پ.ك.ك. بوو, سیاسەتی "گەڕانگەریی" ئیسرائیلی زیندوو کردەوە, ئەگەرچی ئەمجار وڵاتی جوولەکە بۆ زەخت خستنە سەر سووریا و ئێران کەلکی لە تورکیا وەردەگرت کە لەمەوبەر هاوپەیمانی بوو.

وەختایەك کێشەی کوردان ئاڵوزبڵۆزی سیاسەتی ناوچەی پێهەڵابرد, پاڵوێدانی دەوڵەتی کلینتۆن لەبەر هەندێك هۆ و هۆکاری سیاسەتی نێوخۆ, بە تورکیاوە پتر بوو. پاش ڕێککەوتنی "دەیتۆن" لە نوامبری ١٩٩٥دا, کە کۆتایی بە شەڕی چلوسێ مانگەی بوسنی هێنا, واشینگتۆن بۆ چارەسەری تەنگەژەیەکی بەرفرەوان کە هەڵبژێرانەوەی سەرلەنوێی کلینتۆنی لە ١٩٩٦دا بە توندی تووشی مەترسی کردبوو, ڕووی کردە ئانکارا. دەوڵەت ڕاگرتنی هێزەکانی ئەمریکایی لە بوسنیدا بۆ ماوەی پتر لە ساڵێك لەباری سیاسییەوە بە کردەوەی مەترسیدار دەزانی, چ بگا بەوەی کە بیەوێ کاری ڕاهێنانی سپای نوێسازی مسوڵمان کە وەختێکی زۆری دەویست وە ئەستۆ بگرێ؛ ئەم سپایە دەبوو لە بەرامبەر سێرب و کرۆواتاندا پارێزگاری لە بوسنی کردبا. لەگەڵ ئەمەش ئەم پەروەردە کردن و ڕاهێنانە دەکەوتە ڕیزی گەورە دەسپێشخەرییەکانی سیاسەتی نێوخۆی ئەمریکا. واشینگتۆن هاتە سەر ئەم تەمایەکە دەکرێ تورکیا کە پێشتر یەکێك لە دەسەڵاتە کۆلەدارییەکانی باڵکان بووە بێتە سەر نژمی دۆستێکی مەیلەو ڕۆژاوا و مسوڵمانێکی میانەڕەو و شەریکی ناتۆ و کاری ڕاهێنانی کرۆواتەکانی پێ‌بسپێردرێ و بڕوای وابوو کە تورکیا زۆر بە چاکی دەتوانێ ئەم ئەرکە گرینگە ڕاپەڕێنێ.

تورکیا چونکە هەتا ئەم "پلە" گرینگە هەڵکێشرابوو کە ڕێی بۆ خۆش دەکرد لە داهاتوودا بتوانێ ئیدەیعای جێ پێیەك بکا لە باڵکان, ڕازی بوو. کەس لەبەر چاوی خەڵك باسی ئەم دووشێوە هەڵسوکەوتەی نەکرد و نەیپرسی کە چلۆنە تورکیا کە خۆی بنچاغی کەمینەی کوردی خۆی هاڕیوە و پێخوستی کردووە ئێستا یارمەتی مسوڵمانانی بەر ئازاری کرۆوات و سێربان دەکا کە لە بەرامبەر "پارێزەرانی کرۆواسی و سێربستانی گەورە"دا لەسەر هەبوونی خۆیان وەجواب بێن؟ (ئاتاتورك ڕووی لە جیهانی ئیسلام وەرگێڕابوو و وازی لە کۆمەڵانی ترکی نێو وڵاتانی بە کۆیلەکراوی پێشووی عوسمانی هێنابوو. بەڵام تورکیا لە ساڵانی دەیەی ١٩٨٠دا لەسەر ئەم داوایە بوو کە هیچ دژایەتییەك لە نێوان سەرکوتی کوردەکانی خۆی و پارێزگاری کردنەکەی لە کەمینەکانی ترکی بوڵغارستان و یۆنان و قوبروسدا نییە.) شتێکی کە لە ڕاهێنان و مەشق پێکردنی سپای بوسنیدا بۆ ترکان بەتایبەت سەرنج ڕاکێش بوو ئەم ئەمەگدارییە بوو کە دەکەوتە ئەستۆی ئەمریکا و دواتر دەکرا کەلکی لێوەربگیرێ، بەتایبەت ئەگەر لە داهاتوودا هاوپەیمانانی ناتۆ لە بابت کوردان یان لایەنەکانی تری سیاسەتە ناجۆرەکانی زەختی بخەنە سەر. بۆ یەکەمجار تورکیا خۆی دایە مەترسی و بوو بە بەشێك لە سیاسەتی نێوخۆی ئەمریکا، کە خۆی لە خۆیا بۆ گەڵاڵەدارێژی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا زۆر مەترسیدار بوو. دیپلۆماتەکانی ئەمریکا لە ڕووی ئەم هەڵسوکەوتەی کە لەگەڵ تاقمەکانی لایەنگری یۆنان و ئیسرائیل لە کۆنگرەدا بوویان, چاك لەگەڵ ئەم گەڕیانە ئاشنا بوون و لە ڕەوتەکەیان دەزانی.

ئاخ, پێوەندەکانی ئەمریکا لەگەڵ تورکیا لەم چەند ساڵەی ئاخریدا چەندە پڕ پێچوفلۆوچ ببوو! لە تەواوی دەورانی سەرکۆماریێتی ڕێگاندا, باڵوێزی ئەمریکا لە تورکیا ڕابێرت ئیشتراوس هووپە بوو, کە لە ویەن پێی نابووە جەغزی ژیانەوە. ئەو دامەزراوی دەستی خودی ڕێگان و زەمانێك مامۆستای زانستی سیاسی زانکۆی پێنسیلوانیا بوو. نیزیك دە ساڵێك لێرەوبەر کە من لە دیدارێکمدا پرسیارگەلێکی ئازاردەرم لە بابەت کەمتەرخەمی ئەمریکاوە کرد سەبارەت بە پێشێل کرانی پەرەگری مافی مرۆڤ لە تورکیا, بەتایبەت لە کوردستان, هەشتا و چەند ساڵێك دەبوو. تەنانەت ئەو کاتیش پارێزگارانی مافی مرۆڤی ڕۆژاوا وێدانی ئەو گشتە چەكوچۆڵەیان

وە تورکیا بردبووە ژێر پرسیار و لەمە دەترسان کە هیچ دوور نیە لەم چەکانە بۆ گێرە و کێشەی نێوخۆ کەڵك وەربگیرێ. (زۆر دواتر لە ساڵی ١٩٩٦ هەر ئەم پارێزگارانەی مافی مرۆڤ بێهوودە هەوڵیان دا بە وەزارەتی دەرەوە بسەلمێنن هەتا بە گوێرەی بەندی ٥٠٢ "ب"ێی قانوونی یارمەتییەکانی دەرەوە هەڵوێست بگرێ کە دەقودۆغر دانی چەكوچۆڵ بە وڵاتانێکی کە پەیتاپەیتا مافی مرۆڤ پێخوست دەکەن, بەربەند دەکا — بەڵام سەیر ئەوەیە کە بە پێی دەسەڵاتێکی کە دراوەتە سەرکۆمار, ئەم چەکانە بەردەوام دەنێردران.) ئیشتراوس هوویە لە مەبەستەکەم حاڵیبوو. بەڵام ئەرکی سەرەکی ئەمە بوو کە لەوان ساڵانی سەختی شەڕی ساردا ترکان بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ "ئیمپراتۆریێتی شەیتانیی" ڕووس شانبەشانی ڕێگان رابگرێ. شتی زۆر بێ سەرەوبەرەی لەم چەشنەی گوت کە دەی, بڵا ئورووپاییەکان خەریکی "ئەرکی مافی مرۆڤیان" بن... پاشان ڕووی کردە فرت و فێڵی ناسراوی پیرەپیاوان: خەوی لێکەوت و یاریدەرانی کە لەسەر نووکی پەنجان دەرۆیشتن, منیان بۆ دەرەوەی ژوورەکە فەرموو کرد, کە نەکا خوای نەکردە وەخەبەر بێ.

ئەم سەردەمە هەر ئەو ساڵگارانە بوو کە باڵادەستانی ترك لە بابەت "ترکانی کێوی"یانەوە وسکوتیان کردبوو. لە ١٩٨٧دا گۆڤارێکی باڵی چەپ بە ناوی "ینی گوندیم" دەستی دایە کارێکی بوێرانە و تەواوی بابەتەکانی ژمارەیەکی بۆ باس سەبارەت بەم مەبەستە تەرخان کرد کە تەنگەژەی هەرەگەورەی تورکیا کێشەی کوردستانە, کە ئەویش تەنیا بە ڕێوشوێنی سیاسیدا دەکرێ چارەسەر بکرێ. هێندێك لە نووسەرانی بابەتەکان بریتی بوون لەم ئەفسەر و کاربەدەستە خانەنشینانەی کە لە باشووری ڕۆژهەڵات (کوردستان) کاریان کردبوو, بەتایبەت کەندالْ نزان, بەرێوەبەری خۆهەڵبژاردەی "ئەنستیتۆ کورد"ی پاریس. کەندالْ بە مەیلی خۆی لە تورکیاوە کۆچی کردبوو بۆ هەندەران و بیرهێنانەوەی ناویشی لە تورکیادا کفر بوو. هەر وەك پێشبینی دەکرا, ئەم ژمارەیەی گۆڤارەکە کۆکرایەوە و دەستی بەسەردا گیرا, بەڵام شەش ڕۆژان لە پێشخوانی ڕۆژنامەفرۆشان ڕۆنرابوو. جا هەر ئەم

وەدرەنگـی کەوتنــە بـۆ کـۆ کردنــەوەی وەك چاوپۆشــی و خۆبــواردنی حکوومــەت لێکدرایەوە.

***

ساڵێك دواتر یان ماوەیەکی ئەوتۆ, کایا توپری, گوتەبێژی ڕۆژنامەوانیی "ئـوزەل"م لـە نووسینگەی کارەکـەی لــە ئانکـارا چـاوپێکەوت. لـەمێـژ سـاڵ بـوو دەمناسـی و خۆشەویستی نواندبوو و چاوپێکەوتنێکی لـە دیاربەکر لـەگەڵ قایـممەقامی گـشتیی بـۆ پێکهێنابووم: قایـممەقام پیاوێکی زۆر غلـلوور بوو و بە قەڵافەتێکی بەدگووزانەوە کـە تاڵ بـوونی ئـەم دیـدارەی لــێ‌دەباری, ڕێی‌ـدام و لــە دانـەوەی وڵامـی ئاسـایی بـە پرسیارەکانــم خۆی پاراست. ئەو وڵامانەی کە دەیدانــەوە هـیچ وە ڕاسـتی نەچـوون. ئەوەندە لـەگەڵ توپری ئاشنا بووم و دەمناسی کە وریای کەمەوە کە ئەم چەشنە ئاکـار و چـارەڕەش کردنــەی کــوردان کـارێکی مناڵانــە و نیــشانەی تێماوییــە. ئــەو شــوو لــێ‌هەکێـشان و زێدەڕەوییــەی کــە خــۆم دیبــوومن بــۆم گێڕایــەوە و گوتـــم تورکیـا بێ‌گومان زۆر کاری لـەوە باشتر و واجبتری هەیە کە کوردان لـەبەر فرۆشتنی "شریتی" مووسیقی یان گۆرانی خۆیان بـخاتە بەندیـخانەوە, مەگین ئەمەی دەستی وا هــەبن لــە دەوڵەتا کە بیانهەوێ بە لاڕێ کردنی خواستەکانی حکوومەت لـەم بـوارە دا یاریـدەی پ.ك.ك. بکەن. نەچوومە نێو جـەغزی باسـی ئاکـاری تونـد و دڕانــەتری هێزەکـانی ئاساییش: لـە ڕووی ئەم هەڵتەزینەوەڕا کە لــە نارەحـەتییان دەینوانـد, ئــەم کــارەم بــە پێویست نەزانی. گوتــم ئەگەر بێتوو ئەم وت‌وویژانــەی کــە لــە ناوچـە گوندییــەکان کردوومن,پێوەر و بێ‌ودانێك بن بۆ ئەم گەڕیانە, ئازار و ئێـشاندنی خـەڵکی ئاسـایی و سووتاندنی گوندان ئەم مەترسییە دەنێتەوە کە کوردان لـە تورکیا نەبان بن و درێژەم دا کە زۆربەی هەرە زۆری ئەو خەڵکەی چاوم پێیان‌کــەوتووە و دوانــدوومن خوازیــاری سەربەستی نین, (کە هێشتا داخوازی سەرەکی پ.ك.ك. بوو) هەر وەهـا لــە ئـۆگریی "ئاپۆ"دا سەبارەت بە مارکسیزم بەشـدار نـین. ئـەم خەڵکـە تـەنیا دەخـوازن کـە وەك هاووڵاتییەکی پلـە یەك هەڵس‌وکەوتیان لـەگەڵ بکرێ و ڕێز لـە کەلتووریان بگـیرێ و ناوچەی دواکەوتوویان بەشێکی شایانی لـە سەرمایەنانەوەی ئاوەدانی بەرکەوێ. گوتـم من ساڵگاران بە چاوی خۆم سەرهەڵدانــم لــە وڵاتـانی جیهـانی سـێهەما دیـوە و پـێم

سەیرە کە بۆ چی وڵاتێکی وەك تورکیا کە لە سەر ڕێ‌وشوێنی ڕۆژاوا بەڕێوە دەچێ و ئەندامی ناتۆیە, دەبێ ئەم دیاردە ئاشکرایانەی کە لەسەر دیوار بوونە نەخش, ئەوتۆ بە نادروستیان دابنێ. هەڵبەت ترکان خۆیان ئەوەندە وریان کە تێبگەن کە سەرکوتی دەوڵەتی تەنیا یارمەتی ئاوسانی ڕیزی سەرهەڵداوان دەکا...

ڕەخنەکانم ئەوەند درێژە پێدا کە سەرەنجام بە بیرمدا هات ڕەنگە سەرەڕای دۆستایەتییەکی چەندساڵەی کە لەگەڵ توپری‌دا هەمە, داوام لێ‌بکا نووسینگەی کارەکەی جێ‌بێڵم. کاتێك وتەکانم کۆتایی پێ‌هێنا توپری بە ڕاوێژێکی وەك ئەوەی سرتە بکا گوتی: "دەزانم, دەزانم. بەڵام سپا کۆسپی سەرڕێمانە و تەنیا ئوزەل دەزانێ کە چلۆن لەگەڵیان هەستێ و دانیشێ."

ئەوەی توپری دەیەویست بیڵێ ئەمە بوو کە ئوزەل – کە لە خودی ئاتاترکەوە بۆو لایە بیرمەندترین و بتشکێنترین سیاسەتوانی تورکیا بووە و پیاوێك بوو کە ژێنێراڵەکان دوای گۆدەتای ساڵی ١٩٨٠, کە سێهەمین گودەتا بوو لە ماوەی سێ‌ساڵاندا, ئەویان کردبوو بە سەرۆکی دەوڵەتێکی بە ڕواڵەت غەیرەنیزامیی – ئەگەرچی لە ١٩٨٣دا بە دەنگی خەڵك هەڵبژێرا بوو, هێشتا وەك دەبوو بێ, بەسەر کاراندا سوار نەبوو. ئەم وتەیەی توپری بۆخۆی لە هەڵەدەر بوو: ئاتاترك لە ١٩٢٣دا پێکهاتەی حکوومەتی بە یارمەتی سپا تێك‌وەکان داب‌وو و بناغەی کۆمارەکەی ڕۆنابوو. وڵاتانی تر دەوڵەتەکانی خۆیان لەسەر چینی مامناوەندی سیستمی دەرەبەگی یا هێزەکانی کۆمەڵایەتی تر دانابوو, بەڵام لە تورکیادا ئەوە سپا بوو کە کۆماری دامەزراندبوو. دیارە تورکیای ئەو زەمانی وڵاتێکی لاواز و دڵپەرۆشی لێکدابڕانی خاکەکەی بوو کە کەتبووە بەر دەسدرێژی مەسیحییان. لە ڕۆژاواوە کەوتبووە بەر پەلاماری یۆنانییەکان و لە ڕۆژهەڵاتەوە بەر شاڵاوی ئەرمەنییەکان, کە بە تۆڵەی کوشتاری ئەرمەنییەکان لە لایەن عوسمانییەوە و بە مەبەستی وەرگرتنەوەی هەرێمە مێژوویی‌یەکانی خۆیان هێرشیان کردبوویە. جا تاقمی ئەفسەرانی ئاتاترك لە ڕاستی‌دا یەکە پاڵپشتی حکوومەت بوون, لە لووتکەوە تا داوێن و ئەم کۆمەڵە تەمایان وابوو کە بە بێ گوێ دانە پێخۆشی و پێناخۆشی خەڵك, هەرێمی سەرەکی

عەنەدۆڵی دواکەوتوو لە بنج‌وبناوانە ئیسلامییەکانی خۆی دابـڕن و بە یەکـجارەکی بەرەو ڕۆژاوی وەرسووڕێنن.

شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ی شێخ سەعید کە ڕەنگی مەزهەبیی لە خۆ گرتبوو, دەماری زاڵمانەی حکوومەتی ئەستوورتر کرد. شۆڕشـێکی تـریش[1] کـە لـە سـاڵی ١٩٣٠دا ڕووی دا و سەیر ئەمە کە ئەمـجار شۆڕشی هاوبەشی کوردان و ئەرمەنییان بوو کە لە پێشتردا بۆی ببوونە قوربانیی، ئەم ڕەوتەی دیسانیش بەهێزتر کـرد. وەختایـەك ڕەزاشـا ئیزنی هێزەکانی ترکی دا کە سنووری ئێران ببەزێنن و سەرهەڵداوانی ئارارات گەمارۆ دەن, ڕاپەڕین بە شێوەیەکی کارەساتاوی کۆتایی پێهات. (چل‌وپێـــنج ســـاڵ دواتـــر مـحەمـمەد ڕەزاشاە پەهلەوی ئەم خەیانەتەی ڕەزاشای باوکی دووپات کـردەوە, ئـەو دەمەی کە لە ١٩٧٥دا لانی ژێنێراڵ بارزانی بەردا.) ئەم ڕووداوانە لەگـەڵ شۆڕشـی درسیم,[2] دڕدۆنگیـی سـەبارەت بـە ناسـیۆنالیزمی کـورد لـە هەرێمـە بـەربڵاوەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا زیندوو ڕاگرت و ئەم ناوچانە هـەتا ١٩٥٠ کەوتبوونە ژێر ڕکێفی حکوومەتی نیزامیـی و لـەوی بـە دوا هـەتا سـاڵی ١٩٦٥ لـە ڕووی غەوارانی وردبیـن و قوژبن‌پشکنا بەستـران.

لە سەردەمانی شەڕی ساردا و پێش و دوای ئەویش, هێزە چـەکدارەکانی تورکیـا هەمیشە بۆ ڕیس‌وگوریس هێنانەوە لەسەر دەوری گرینگـی خـۆی لـە ژیـانی سیاسـی تورکیادا "بەرگی بەرندە"ی کوردسـتانیان لـە باغـەڵدا بـوو, یـانی ئەگـەر وجـوودی هەشت وڵاتی ناجسنی دراوسێ بۆ ئەم کارە کیفایەتی نەکردبا. بۆ چما هەر لە مابـەینی ئەم دوو شەڕە جیهانییەدا کوردان بەشداری هەژدە ڕاپەڕین لەم نۆزدە ڕاپەڕینە نەبوون کە لە تورکیادا ڕووی دا؟ دوودڵییە دەروونییەکانی توێژی نیزامییان لەم ساڵانەدا, لـە بابەت سەرکەوتنیانەوە لە درێژخایەنتـرین شەڕیاندا هەرچـی بووبـێ, ئێـستا سـوور و ئاشکرایە کە شەڕ لەگەڵ پ.ك.ك. ئەم توێژەی لە نێوەندی سیاسەتی تورکیادا بنـەگر

١– مەبەست شۆڕشی "ئارارات"ە.

٢– ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٣٧ی درسیم, بە ڕێبەرایەتی سەید ڕەزا, کە ترکان بانگهێشتنیان کردە سەر وت‌ووێـــژ و هەر لەم کۆبوونەوەدا گرتیان و لە داریان دا!

کردبوو. ئامرازی بەردەس و هەڵبژاردەی ئەم توێژە, یانی شوورای تەناهی نەتەوەیی, بە ڕواڵەت دەکەوتە ژێر دەسەڵاتی سەرکۆمار, کە لە ١٩٨٩ تا ١٩٩٣ سەرۆك ئوزەل بوو. ڕەنگە جگە لە خودی ئوزەل قورسایی و گرینگایەتی کەسایەتییە نیزامییەکان – یانی سەرۆکی ناوەندی سەرکردایەتی هاوبەشی سپا و سەرکردەکانی سپا و هێزی ئاسمانیی و دەریایی و ژاندرمە – پتر لە ئەندامانی غەیرەنیزامیی بوو, کە بۆ وێنە لەم جەللەیە وەزیری بەرگری و دەرەوە و نێوخۆشی دەگرتەوە. شووڕای تەناهی نەتەوەیی بە دەسەڵاتترین نێوەندە و دامەزراوەی تورکیا بوو. بە گوێرەی قانوونی بنەڕەتی تورکیا لە باری پلە و پایەوە سەرۆکی ناوەندی سەرکردایەتی هاوبەش باڵاترە لە وەزیری بەرگری و گشت ئەندامانی تری دەوڵەت.

پەیوەندی و نێوانی ئوزەل لەگەڵ سپا, کە ئەوی هێنایە نێو کاروباری بەڕێوەبەرایەتی وڵات, پێچاوپێچ و جاری واش تەنانەت تێکەڵ بە تانووت بوو, هەروەك جارێکیان بە بەشدار بوونی لە "ڕێژەیەکی نیزامیی"دا بە دوولینگەی کورتەوە قینی خەڵکی تورکیای هەستاند. لە ڕاستیدا ئەم هەڵسوکەوتە چاوەڕوان نەکراوانە یەکێك لەو چەکانە بوو کە ئەو نە تەنیا بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ نیزامییان بەڵکوو بە مەبەستی ملانە لەتەك زێوانانی نەریتە "پیرۆز"ەکانی ئاتاترك دەکاری دەکردن. ئەم خەڵکە هەمیشە حازر بوون بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر کردەوەیەکی کە بنەی دەچوووە سەر کرانەوە و [ئازادی] کۆمەڵی تورکیا, بیرەوەری ئاتاترك بێننەوە بەر بیران. تەمای ڕچەشکێنانەی ئوزەل – یانی وەرگرتنی پەناخوازانی کورد, وە قانوونی گێڕانی کەلك وەرگرتن لە زمانی کوردی لە ئاخافتنا, لە ساڵی ١٩٩١دا و بەتایبەت دانیشتن و وت وویژ لەگەڵ ڕێبەرانی کورد لە بەهاری هەر ئەو ساڵەدا – نیشانی دا کە دەتوانێ تەنانەت بە نرخی پەرێشاندنی ژێنیراڵەکان, نوێکاری و بەرژەوەندیی داهاتوو لەگەڵ سیاسەتی تورکیا تێکەڵ بکا. یەکێك لە دیپلۆماتە ڕۆژاوییەکان کە لەمێژ ساڵ بوو لە تورکیا ئەرکی لە ئەستۆ بوو, دەیگوت: "ئوزەل هەر وەك کە بیری لە زۆرێك لە کۆسپەکانی تورکیا دەکردەوە, بیری لە کوردانیش دەکردەوە, ئەویش بە شێوەیەك کە ئەم کۆمەڵە تەنانەت بە خەیاڵیشیدا نەدەهات, چ بگا بەمەی هەزمی بکا."

ئوزەل بە پێچەوانەی زۆربەی سیاسەتوانانی ترك هەمیشە لـە هێـزە چـەکدارەکانی ترك نەترۆقیبوو. مـحەمـمەد عەلی بیراند – ئەستێرەی تەلەفیزیۆن و بلاڤۆکان, کە لە ١٩٨٨دا وەك یەکەم ڕۆژنامەنووسی ترك دیداری کرد لەگەڵ ئۆجالان و هەڵلایەکی نایەوە – دەڵێ: "ئوزەل ڕێی بۆ کەسانێکی وەك من خۆش دەکرد کە لە ژێر سێبەریدا هەڵسووڕێین," هەتا دەرگایەك لە ڕووی باسی ئازاد دەربارەی پرسی کوردا بکرێتـەوە. سـلێمان دیـمیرێل, ڕکەبـەری لەمێژینـەی ئـوزەل, کـە ماوەیـەك دواتـر لـە پلـەی سەرەکوەزیر و سەرکۆماردا جێیگرتەوە, قەتی لـە بـیر نـەبردەوە کـە لـە دەیـەکانی سالآنی پێشوودا سپا دووجارانی لەسەر دەسەلآت کێشاوەتە خوار و بە پانـەوە بـڕوای لەسەر ئەمە بوو کە بە ڕایەدەیەك لە ڕوودانی گۆدەتایەکی تر دەترسێ کە بـە قـەولی یەکێك لە ڕۆژنامەنووسان هەر بـە خـەیالآتی ئەمـەوە "بەخۆیـدا دەڕی, نیزامییـەکان بۆگەنی هەست پێدەکەن و بە کەیفی خۆیان لێیدەخوڕن."

بەلآم ڕەفتار و کرداری ئوزەل لەگـەڵ نیزامییـان ئەوەنـدەش کـە تاریفکـەرانی بـە تێپەڕبوونی زەمان یادی دەکەنەوە سەرڕاست و بێ فڕ وفێلآنە نەبوو. ئەو پـاش ئەمـەی کە لە مارسی ١٩٩٢دا لە مەودای بەڕێوەچوونی جێژنی نەورۆزا – جێژنی سەرساڵی کوردان – سەت کەسێك کورد لە تێکهەڵچوونێکی یەکلایەنـە لەگـەڵ هێزەکـانی ئاساییش کوژران, بەرپرسایەتی ئـەو ناوچـانەی کـە کەتبوونـە بـەر "بـاری نائاسـایی" ڕاستەوڕاست ئەسپاردەی هێزە چەکدارەکانی کرد. هەر لە مانگی ئووتی ئـەو سـاڵەدا هێزەکانی ئاساییش بە پێی دەنگۆی بێبنەڕەت شالآویان بـردە بـاژێری شـرناك لەسـەر سـنووری ئێـراق و خەسـارێکی زۆریـان تـووش کـرد, تـا ئەوجێیـەی کـە تـەواوی بیستهەزار کەسەکەی دانیشتووی شار لە ترسی گیانیان ڕایانکرد.

بەر بەرەڵلآ کردنی هێزەکانی ئاساییش وێنەدەچوو کە سیاسەتێك بێ بتوانێ ئاکامی دڵخوازی لـێ وەبەر بێ. لـە ١٩٩٣دا ڕەوتـی کوشـتار و تـاپۆ کردنـی کوردسـتانی تورکیا گەیشتە چڵەپۆپەیەکی نوێ. ئێستا تەنانەت ئیتر کەمالیستە تونـد و تیـژەکانیش حاشایان لەم ڕاستەقینەیە نەدەکرد کە شەڕی کوردستان گرێ و کۆسپی پلە یەکـەمی تورکیایە, کە بڕستی لە هەموان بڕیوە. پاشان لەپڕ بۆ یەکەمجـار لـە ١٩٨٤ڕا بـۆو لایە, برووقە برووقی تیشکەی هیوایەك لە ئاسۆوە خۆی نواند: ئۆجالان بە هاندانـی

جەلال تاڵەبانی, لــە ١٧ی مارســی ١٩٩٣دا ڕایگەیانــد کــە پ.ك.ك. ئاگربەسـێکی شەش مانگــە لــە ٢١ی مارسـەوە بـەڕێوە دەبـا. ئۆجـالان پێـشتر — لــە ١٩٩٠دا — پێشنیاری ئاگربەسێکی دابوویـە تورکیـا, بـەڵام ئەمـــجار دەسـتی خـۆی ڕەپـێش دا و ڕایگەیاند کە پێشمەرگەکانی تەنیا بۆ بەرگری کردن لــە خۆیـان وە دەس دێـن. هــەر وەها تاڵەبانی چوار ڕۆژ پێش وی  بە یەکێك لە ڕۆژنامەکانی ترکی گوت کە ئۆجالان ئامادەیە بە ڕێککەوتن و پێکهاتنێکی کەمتر لە سەربەخۆیی دەس هەڵبگرێ لە خـەباتی چەکداری و تیرۆریزم, بە قازانج و بەرژەوەندی ڕێککەوتن لەسەر تەوەرەی گفتوگــۆ, هەروەتر درێژەی دا ئەگەر دەوڵەتی تورکیا ئۆجـالان وەك لایـەنێکی دانوسـتان و وت وویژ وەرنەگرێ, ئەم وتوویژە دەتوانێ لە لایەن نوێنەرانی کوردی پارلەمانەوە بکرێ کە بە نوێنەرایەتی وی دێنە کایەوە. دیپلۆماتەکانی ڕۆژاوایی لەسەر ئەم بڕوایـە بـوون کــە  پ.ك.ك. دەســەڵات و کــارتێکردنی سیاســی و نیزامیــی خــۆی پــەرە پێــدەدا. پ.ك.ك. زۆر بە قۆڕدەماغییەوە وریایی دا بــە جیهانگــەردانی ڕۆژاوایـی کــە بــەر لــە سەفەر بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتی لە نووسینگە ئورووپاییـەکانی ئــەو ویـزا وەربگـرن. غەیرەنیزامییەکان و زۆربــەی هێزەکـانی ئاسایــشیش نەیانـدەوێرا شـەوانە لــە شـار و شارۆچکان وەدەر بکەون — بەشی لای گوندانیش کـە هــەر مەپرســە. بـەڵام ترکـانی لایەنگری شەڕ کـە چـەند مانگێـك دەبـوو ئیـددیعایان دەکـرد کـە پ.ك.ك. لەبـەر کەڵەوەکێشی نێوخۆی پچڕپچڕ بووە و ئۆجالان لە نێو حیزبەکەیدا بڕشت و بـرەوی نەماوە, ئێستا دەیانگوت کە پێشنیاری ئاگر بڕەکـەی بـەم مانایەیـە کـە پ.ك.ك. لــە مەیدانی شەڕا تێکشکاوە و نابێ ئیزن بدرێ کە ئەم شکـستە بــە ســەرکەوتنی سیاســی قەرەبوو بکاتەوە. ئاشتیخوازان وەك هەلێك لەم پێـشنیارەیان دەڕوانـی کــە ڕەنگــە بــە دەرفەت لــێهێنانی بکرێ ڕۆچنەی هیوایــەك وەدۆزرێ. نێـوانی ئـوزەل لەگــەڵ هێـزە چەکدارەکان سەرەڕای نەویکێشانی پارەکەی لەپڕ کەوتە قۆناخێکی ناسك. لــە نێــو سیاسەتوانانی ترکا تەنیا ئەو بوو کــە خـاوەنی لێرانینـی سیاسـی و چێـشکە و بیرێکـی ئاوەڵە بوو بە لانی دەس بردن بۆ ئەزموونی "نەریتشکێنانە", داهێنــانی ڕێوشـوێنێکی هەردك لا پەسند و کۆتایی هێنان بە شەڕ زۆر پێویست بوو.

ئوزەل لە رێی ئەو هەواڵنێرە ترکانەی کە لە لوبنان پەیوەندییان بە ئۆجالانەوە دەکرد, ئاگادار کرایەوە کە بەم زوانە ئاگربەس رادەگەیەندرێ. ئوزەل لە سەرەتاوە دوودڵ بوو, لای وابوو کە سووریا گەورەپشتیوانی ئۆجالان, تەگەرە دەخاتە کارێکی وەوتۆ و خۆ ناداتە دەس مەترسی لە دەس دانی ئۆجالان کە بۆ ناکۆکی لەمێژینەی تورکیا و سووریا لەسەر ئاوی فورات گەورەترین لۆسەی زەختی ئەوە. بەلاّم لە ماوەی چەند رۆژێکی ترا مەیلێکی پتری نواند. ئەو تەنانەت هێڵە گشتییەکانی ئەو نەخشەیەی کە لە مێشکیدا بوو بۆ "گنجیز چاندار"ی شی کردەوە. گنجیز چاندار هەر ئەو رۆژنامەنووسە بوو کە ١٩٩١دا بوو بە بابیسی دیداری ئوزەل لەگەڵ رێبەرانی کوردی ئێراق و تازە لە دیدەنی ئۆجالان گەڕابۆوە. ئوزەل, شەودرەنگانێ لە ئانکارا رێی دا چاندار چاوی پێیبکەوێ و رەزامەندی لەسەر لێبوردنی بەربلاّو, بەلاّم بە پێخۆر دەربڕی: لە پێشدا خۆش بوون لە پێشمەرگەی سادە کە تاوانی تایبەتییان لەسەر نەبوو, ئەم تاقمە دەبەخشران و ئیزن دەدران کە لە ژیانی کۆمەلاّیەتی ولاّتا بەشدار بن؛ پاش دوو ساڵان رێبەرانی پێشمەرگان دەبەخشران و پاش پێنج ساڵان سەرکردە گەورەکان و تەنانەت خودی ئۆجالانیش دەکەوتنە بەر لێبووردن.

ئێستا ئەوەی ببوو بە هۆی پەرێشی ئوزەل و بیری ئەوی لە خۆی شەتەك دابوو ئەمە بوو کە چۆنچۆنی رەزامەندی پارلەمانێك وە دەس بێنێ کە لە ژێر رکێفی شەڕخوازنێكدا بوو کە رایاندەگەیاند حکوومەت "قەت لەگەڵ ترۆریستان دانوستان ناکا." ئوزەل بە خاترجەمییەوە بە "چاندار"ی گوت: "ئەوەندەی کە سیاسەتوانان هۆی دڵپەرۆشین, پیاوانی لەشکریی نین, چونکە ئەوان لە ریزی بەرەکانن و دەزانن کە تەقە کردن لە ئادەمیزاد یانی چی." ئەو هەروەها دڵنیا بوو کە دەتوانێ رەزامەندی ژێنێراڵ دوگان گوێریش وە دەس بێنێ. گوێریش سەرۆکی ناوەندەی سەرکردایەتی هاوبەشی هێزە چەکدارەکان و پیاوێکی "کەللەرەق"ی لەشکریی بوو. ئوزەل بە راوێژێکی "زیرەکانە" گوتی وەك سەرکۆمارێك دەسەلاّتی ئەوەی هەیە کە ماوەی سەرۆکاتییەکەی ساڵێکی تر درێژ کاتەوە.

تەواوی کوردان لـەم گەشبینییەدا بەشدار نەبوون. هێندێکان دەسەڵاتی ئوزەل یـان هەر کەسێکی تریان بۆ شوێندانانە سەر پیاوانی لـەشکرییان دەبردە ژێر پرسیار, چ بگـا بە وەی کە کەسێك پەیدا بێ و ئەوان بکاتە هاودەنگی خۆی. ئەحـمەد ترك, نوێنـەری [کوردی] پارلـەمان گوتی کە ئوزەل ئەوان دەمان پێی گوتووە "دەمەوێ هەوڵێك بـدەم هەتا گەورە ژێنێراڵـەکان بۆ چارەسەرییەکی ئاشتیخوازانە هان دەم و پێیان بسەلـمێنم." ئەحـمەد ترك ئەو کات وەهای لێکدایەوە کە ئوزەل زۆر دڵنیا نەبوو لـە دۆزی خـۆی لـەم بوارەدا, چونکە "گوتنی ئەمەی کە تێدەکۆشی پەیوەند و نێوانێکی خـۆش لـەگـەڵ پیاوانی لـەشکریی دامەزرێنێ, بەم مانایەیە کە دەسەڵاتی ڕاستەقینە لـە دەس ئەودا نیە."

ئوزەل لـە بواری باس لـەسەر کارەکانی داهـاتووی خـۆی پێـی لـەسـەر ئـەم خاڵـە دادەگرت کە حکوومەت نابێ لـە مامەڵـە لـەگەڵ "پ.ك.ك".دا پەلـە بکا: نابێ ئـەوان بێنە ڕیزەی حوکمات. حکوومت دەبێ "کۆتایی بەم دەوری پلـە دووهەمییـەی" خـۆی بێنێ لـە بەرامبەر ئۆجالاندا, دەبێ سەرلـەنوێ ڕاستەی کاران بگرێتەوە دەست.

ڕەمەزان, مانگی ڕۆژووی مسوڵمانان بەرەو تەواو بوون دەچوو و ئـوزەل وای بـە بەرژەوەند زانی کە حەوتەی داهاتوو کە حەوتەی پشوودان بوو, هیچ کارێك نەکا. بە ڕێکەوت نەورۆزیش تێکەڵی ئەم پشوودانە ببوو, کە لـە سایەی دەستووری ئۆجالان و فەرمانی ئوزەل بۆ هێزە چەکدارەکان بە بێ خۆێنرێژی بەسەرچوو.

وەختایەك چاندار دیسانەوە لـە ١٥ی ئاوریلا دیـمانەی لـەگەڵ ئوزەل پێکهێنا, ئـەم دیـمانەیە لـە فڕۆکەدا کرا: ئوزەل لـە سەردانێکی ڕەســمی بـۆ کۆمارەکـانی ئاسـیای ناوەندیی سۆڤیەتی پێشوو دەگەڕایەوە تورکیا. چاندار پێیگوت کـە سـبەینێ ئۆجـالان ڕەزامەندیی خۆی بۆ درێژ کردنەوەی بێ شەرتومەرجی ئاگربەس ڕادەگەیەنێ. ئـوزەل کەیفی پێیساز بوو بەڵام گوتی: "دەترسم ئەو نەفامانـە کارەکـە تێکدەنـەوە." چـاندار پرسی: "ئەو نەفامانە" کێن؟ ئوزەل لـەبەر خۆیەوە گوتی: "دەوڵەت." ئـوزەل لــە خێـرو بێری بەشدار بوونیان لـە تەگبیر و ڕای گەلاڵـەیەکدا کە بتوانێ چارەسەری کێـشەکان بکا, دەرچووبوو؛ بە چانداری گوت خەیاڵی وایە "جەغزیان بە دەوریـدا "بکێـشێ و بێ پرسی وان فەرمانی لـێخۆش بوونی سـەرکۆمار لــە دادگـای قـانوونی بنەڕەتیـدا

بگەیەنێتە پەسند کران." هەر وەها زیادی کرد: "هەر کـە گەیـشتمەوە ئانکـارا دەبـێ وەخۆ کەوم... و خێرا. چونکە ئەگەر بێتوو ئەم هەلـەش لە کـیس بـدەم دۆزەکـە لـە ئێستاش تاڵتر دەبێ." وا داندرا کە دوو ڕۆژی دی ڕێی دی چاندار بداتەوە هەتا چاوی پێی بکەوێتەوە و سەبارەت بەو بڕیارانەی کە دەبوو بدرێن, لەگەڵیا بکەوێتەوە قسان.

بەڵام سەرکۆمار لـە ١٧ی ئاوریلا بە هـۆی جەڵتـەی دڵ مـرد. ئـاخرین دیـداری – ١٦ی ئاوریل – لـەگەڵ دیـمیرێل بـوو, کـە لـە پلـەی سـەرۆك وەزیـرا ببـوو بـە جێنشینی و مانگێك دواتـر وەك سـەرکۆمار جێیگرتـەوە. سیاسـەتوانانی تـرك وەهـا لـەگـەڵ پرسـی جێنـشینیی سـەرکۆمار تێکگیرابـوون کـە سەرنـجێکیان نەدایـە ئاگربڕەکەی پ.ك.ك. چ بگا بەم داخوازانەی کە ئێستا دەیهێنانە گـۆڕ و زۆریـش لـە بەر و داوێنی ویستەکانیان کەم کرابـۆوە. ئـەزموونێکیش نـەکرا هـەتا بـزانین داخـوا ئۆجالان بەڕاستی ئامادە بوو بۆ دانوستان, هەڵبەت هـەتا ئێـرەش چ تاقیکارییـەك لـەم بوارەدا نەکراوە. وەختایەك پەیوەندی پرسەکان دەگەڕێتەوە سەر کوردستان, ترکان چ لە لانی بەهێزی یان کەم دەسەڵاتیدا, ئەگەر بێتوو چارەیەکیان هـەبێ ئامـادە نـین بـۆ وتوویژ. چەند کەس لـە ڕۆژنامەنووسانی چاوناس و خاوەن ئەزموون کە تـەنیا پـردی نێوان لایەنەکانی شەڕەکە بوون گومانیـان هەیـە لەمـەدا کـە کاربەدەسـتانی نـەهێنیی تورکیا لـە بنەوە نێوانێکیان لـەتەك ئۆجالانا هەبێ.

هێشتاش ڕوون نیە کە بۆچی ئۆجالان پێشنیاری ئەم ئاگربڕەی کە تاڵەبانی هێنایـە گۆڕ, قبووڵ کرد. ڕەنگە لێی حاڵی بووبێ کە "خەرجوبەرجی" درێژەی شەڕ خەریکە یەکـجار زۆر پێهەڵدەچێ. لـە مانگی مارسا بە چانداری گوتبوو کە بەم ئـاگربڕە یـەك لایەنەیە دەیەوێ "کۆتایی"بە هەڵوێست و سیاسەتی دەوڵـەت لـە بابـەت تـاپۆ کردنـی گوندەکان و ڕاگوێزتنی جەماوەر "بێنێ." ئەمە دەریدەخست کە "پ.ك.ك"ەش خـاوەن هەستە. بەڵام ئۆجالان پیاوێکی یەکـجار زۆر بە دەمار بوو. ئەو لـە درێژەدا گوتبـووی: "دەزانـم کە لـە بەرامبەر سپا دا سەرناکەوین, بەڵام دەتوانین خەرجوبـــەرجێکی زۆر قورســی بەســـەردا ســـەپێنین." ئەمــە شـێوەی دوانــی مـەنتیقی بـاوی جووڵانــەوە ڕزگاریدەرەکانی نەتەوەیی بوو, کە نیشانەیەك بوو لـە بڕستبڕ کردنی خەنیمی بەهێز و قەوەت. ئەو هەروەها بیری لـەمە کردبـۆوە کـە لـە داهـاتوودا بتوانـێ لـە سیاسـەتی

تورکیادا دەورێك بگێڕێ, بێ ئەوەی شی بکاتـەوە کـە چـلۆن دەسـتی دەگاتـە وەهـا ئاڵوگۆڕێك.

ئەحـمەد ترك مانگێك پاش دیداری لەگەڵ ئۆجالان لـە لوبنـان, گەڕایـەوە, بـەم باوەڕەوە کە "ئاپۆ" ئێستا بـۆی دەرکـەوتووە کـە ئـەمپریالیزم "شـێرە بەفرینـە"[1] نیـە, ئەگەرچـی بـە بۆچـوونی وی, ڕێبـەری پ.ك.ك. زۆری مـابوو هـەتا بگاتـە پلـەی سیاسەتوانێکی لـە کڵ دەرچوو. سەیر ئەمەیـە کـە داخـوازە بڵاوکراوەکـانی ئۆجـالان هەنووکە خودموختاریشی نەدەگرتەوە. ئەو لـە وەختی نـوێ کردنـەوەی ئاگربڕەکـەی نێوەڕاست مانگی ئاوریلدا داخـوازە ڕامیارییـەکانی خـۆی هـەتا پلـەی ئازادییـەکانی فەرهەنگی و تەنانـەت بڵاوکردنـەوەی بەرنامـەکانی ڕادیـۆ – تەلـەفیزیۆن بـە زمـانی کوردی و هەڵوەشـاندنەوەی ڕیزەکـانی هێـزی چـەکدارانی گونـدەکی و هـەڵگرتنی ڕێوشوێنی "باری نائاسایی" و دان هێنان بە مافی سیاسی ڕێکخراوە کوردەکانـا هێنایـە خوار. میانەڕەوانی ترکیش چیان لـەمە زیاترنەدەویست.

بیری ئۆجالان هەر چلۆنێك بوو, بە مردنی ئوزەل سەیر داترووسکا. لـە ١٩٩١دا گوتبووی "ئەگەر بێتوو کەسێك هەبێ کە چارەسەرێك بۆ ئەم کێـشەیە وەدۆزێ, ئـەو کەسە تەنیا ئوزەلـە." ئێستا بە وەبەر چاو نەگرتنی پێشینەی نەخۆشـیی ئەسـتەمی دڵـی ئوزەل, نوێنەرانی کوردی پارلـەمان کـە بـە دەسـتووری ئـوزەل چـووبوونە سـەردانی, پێیگوتن کە لای وایە ئوزەلیان دەرمانداو کردووە هەتا نەهێڵن ئاشتییـەك لـە نێواندا وەدی بێنێ. ئەمەش شتێکە کە تـەواو لەگـەڵ بـیروڕای تێکـەڵ بـە "پارانۆیـا"ی ئـەو ڕێكدەکەوێ.

لـەبەر وەی کە ترکان هیچ چەشنە مەیلێکیان سەبارەت بـە دەربڕینـی ڕەزامەنـدی لـەسەر پێشنیارەکانی ئۆجالان نەنواند, بە ناچار ئاگربەس بێ ئاکـام مایـەوە. لـە ٢٤ی مانگی مەیدا گریلاکـانی پ.ك.ك. لـە نیزیـك بینگـوول پێـشیان بـە ئوتووبووسـێك گرت و ٣٢ سەربازی بێچەك کە بۆ حەسانەوە دەچـوونەوە, لەگـەڵ چـوار کەسـی

---

١– ئاماژەیە بە وتەی مائۆ: "ئەمپریالیزم لـە شێرەبەفرینەیەك ویۆەتر نیە..."

ئاسایییان کوشت. مانگی دوایی ئۆجالان بە ڕەسمی کۆتایی ئاگربڕی ڕاگەیاند. پ.ك.ك. شالاوێکی دڕانەی دژی ترکانی لە ئورووپا و دژی ناوەندە گەشتیارییەکانی تورکیا دەس پێکرد کە هەموو ساڵێ چوار میلیارد دۆلاریان دەخستە سەر داهاتی وڵات. ئەم کردەوە توند و تیژە لێکدالێکدایە وای کرد کە دەوڵەتانی فەڕانسە و ئاڵمان نووسینگەکانی پ.ك.ك. دابخەن, بەڵام شالاو بە شێوەی نەهێنی هەر نەبڕایەوە. لە کوردستان بە هۆی هێرشی هێزەکانی حکوومەت بۆ سەر "لیجە" و "کولپ" لە لای دیاربەکر, کە قەڵای پ.ك.ك. بوون, شەڕ بەگەرمەیەکی پتر لە پێشوو هەڵگیرسایەوە. زۆرێك لە کوردان و ترکان لەم بڕوایەی ئۆجالاندا بەشدارن کە ئوزەل بە شوێن ڕچە و ڕێبازێکەوە بوو کە بتوانێ ڕێوشوێنێك بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ بدۆزێتەوە؛ ئەگەرچی بەڵگە و بۆنەی پتەو بۆ سەلماندنی ئەم بڕوایە بە دەستەوە نیە. بەڵام ئێستا تێکڕا بەوپەڕی نائومێدییەوە دەیانبینی کە هیچ کەسێك لە ئاسۆی سیاسی تورکیادا بەدی ناکرێ کە کۆتایی بەم شەڕە بێنێ, چ بگا بە وەی کە وەها کەسێك لەسەر دەسەڵات بێ و بیەوێ هەنگاوێکی بەجێ و پتەو لەم بوارەدا هەڵێنێتەوە. تاقمێك لە ترکان کە ئەویان (ئوزەلیان) دەناسی, لایان وابوو کە ئەگەر زیندوو بوایە کورد بۆیان هەڵنەدەخەڵەتا و قانێکی ئەوتۆی وێنەدەدان. بۆ وێنە, بیرانەد کە زۆری ئوزەل دەبینی, دەڵێ: "بێتوو ئوزەل زیندووبایە و خۆی دابایە سەر ئەم گەڕیانە — گێرە و کێشەکەی بە شێوەیەك کۆتایی پێ دێنا کە شتێکی لەوە کەمتری دەدا بە کوردان کە خۆیان لێ‌خۆش کردبوو."

خەمێکی کە منیش لە ئاخرین دیدارمان, لە شەشی ژانویەی ١٩٩٣دا تووشی هاتم, ڕاست هەر ئەمە بوو. ئەوان دەمان ڕێچارەی پێشنیارکراوی بۆ چارەسەری کێشەی کورد, بەر لەوە کە پێکهاتن و تەساڵحەیەکی سیاسی یا تەنانەت فەرهەنگی بێ, تێکەڵاوێك بوو لە گەشەی "ئابووری" و "ڕاکێشان" بەرەوخۆ. دەیگوت نیازمان بە دەرفەت و پشوو بە خۆ بوونە. بیست ساڵ لێرەوبەر لە سەتا ٩٠ی کوردان لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات دەژیان, ئێستا تەنیا سەتی ٦٠ تا ٦٥ی لە ڕۆژهەڵاتی ئانکارا بنەگر بوون. بیست ساڵی تر تەنیا سەتی ١٥ تا ٢٠ لەوێ دەمێنن."

ئەمە بە ڕواڵەت شیلە و هەوێنی بیری ئەو بوو یان لانیکەم ئەو هێندە بوو کە دەیەویست بە لای منەوە بیدرکێنێ. دەبێ هەمیشە بەپارێزەوە چاو لە سەرژمێرییەکانی تورکیا بکرێ و من هەتا ئێستاش نەمزانی کە ئەم ژمارانەی دەریخستن هەتا کوێی وان و وا نین.بنەوانی قسەی ئۆزەل ئەمە بوو کە لە ڕۆژهەلات و باشووری ڕۆژهەلات, واتە کوردستان, زەوی کشتوکاڵیی زۆر کەم و ڕێژەی جەماوەر فرە زۆر بوو.

ئۆزەل کە خۆی وەختایەکی یەکێك لە ئابووریزانانی شێلگیری بانکی جیهانی بوو, ئابووریی‌گەشەی خستە کایەوە. لە ساڵانی دەیەی ۱۹۸۰دا بۆ دابین کردن و ڕۆنانی بناغەی ئابووری و ڕاکێشانی سەرمایە بۆ ئەم ناوچە پاشکەوتوو و لە بیر کراوە کە زۆر پێویست بوو, کارەبا و تەلەفۆنی بۆ بچووکترین کۆخە کوردنشینەکان کێشا. دەوڵەت بە شێوەیەکی یەکلایەنە دەستی دابوویە گەلاڵەیەکی فرە بەرزەفڕانە و ئاژاوە لە دووش بە ناوی "گاپ". ئەم گەلاڵەیە **۳۲** میلیارد دۆلاری خەرج هەڵدەگرت و بنەی بە خەزێنەی دەوڵەت هێنابوو و گیر و گرفتێکی بەگەرمەی لەگەڵ ئێراق و سووریا ساز کردبوو؛ یانی ئەم دوو وڵاتەی پاڵ پێوە نابوو کە بە تۆڵەی ئەم کارەی ببنە پشتیوانی پ.ك.ك. وە هەر حاڵ, شەڕ ئەم ئومێدەی کە پەرەپێدانی ئابووری بتوانێ چارەسەری پرسی کورد بکا, خستبووە مەترسی. بەمجۆرە ئۆزەل بە بێ ئەوەی دەقودۆغر بیدرکێنێ, لێی حاڵی کردم کە کوردان بە کۆچ کردنیان بەرەو ڕۆژاوا خوایی‌نەخوایی "دەبنە ترك." هەر وەها بە گوێرەی حیساباتی وی لە داهاتوودا تەنیا سێ‌یەکی جەماوەری سێزدە تا پازدە میلیۆن کەسی کوردی تورکیا لە کوردستان دەمێننەوە, ڕەنگە لەوەش پتر دابەزێ. بەم شێوەیە زۆربەی ئەم خەڵکە و کەلتوور و پێناسە و بەتایبەت "نەتەوەخوازیی" توند و ڕقاوییان لە بیر دەبەنەوە. لە ۱۹۸۸دا لە تورکیا پەناخوازانی کوردی ئێراقی داڵدە دا, ئۆزەل پێی‌گوتن کە دایەگەورەی کورد بووە و تاقە کەلیمەیەکیشی ترکی نەزانیوە؛ کوردان کەیفیان پێی‌ساز بوو. هەر کە ترکان لە داچڵەکینی دەرکەوتنی ئەم ڕازە وەخۆ هاتنەوە, تەنیا شتێکی کە چاویان پێی‌کەوت ئۆزەل بوو کە سەرکۆماری وڵاتی تورکیا بوو و کوردیشی نەدەزانی.

بەڵام ئەو پرسی بنەڕەتی, واتە نێوەرۆكی ئاڵوگۆڕ كراوی كۆچ كردنی لەبەر چاوان ون دەكرد: كۆچی یەكەمی كوردان شتێك بوو بە مەیل و ئیشتیای خۆیان و دەگەڕاوە سەر باری ئابووری, بەشێك بوو لە جوولانەوەی گەورەتری جەمینی جەماوەری گوندنشین بۆ شارەكانی ڕۆژاوا. هەنووكە هێزە چەكدارەكان بوون كە بە ئانقەست دێیەكانیان چۆل دەكرد و دێهاتییەكانیان ڕادەدایە شاران. ئێستا ئوزەل بە چاوپۆشی كردن لە زیان و زەرەد و تەنگەژەكانی شەڕ بەگەرمە و هەڕەمە باسی ئەو كارانەی دەكرد كە لەشارەكانی ڕۆژاوا و لێوارەكانی باشوور, دەیاندایە كوردان. ئەمەش بەشێك بوو لەم خەیاڵاتە بەربڵاوەی كە دەیەویست هاوكاریی ئابووری دەریای ڕەش لە ئابووری وڵاتا دابین بكا. ئەم زمانبازییە و سەرمەقوڵاتانە فری بەسەر ڕاستەقینەوە نەبوو, بەڵام بە ڕواڵەت لە دڵان خۆشبوو, چونكە هەرچییەك بێ لەگەڵ هەواڵنێرێكی ئەمریكایی دەدوا, جا كە وابوو بۆچی تاڵی و ناخۆشی دۆزەكە نەخاتە بەردەستی تاقمێكی باش و خۆشەویست؟

شەش مانگ دواتر ڕوون بۆوە كە دروست پاش دیدارمان پێكەوە, نامەیەكی شەش لاپەڕەی بۆ دیمیرێل نووسیوە و تێیدا باسی كارتێكردن و شوێندانانی پەرەگری "پ.ك.ك"ەی كردووە لەسەر ئەو كوردانەی كە هەتا ئەو وەختی بێلایەن مابوونەوە. ئەو لەم نامەیەدا دەڵێ: "كۆمار بەرەورووی گەورەترین هەڕەشە بۆتەوە: بوولەرزەیەكی كۆمەڵایەتی دەتوانێ بەشێك لە توركیا لە بەشەكەی تری جیا بكاتەوە و تەواومان لە ژێر هەرەسی خۆیا بنێژێ." چارەسەرێكی "شێوەپەخشانی" كە بۆ ئەم تەنگەژەیەی دیبۆوە, هەڵگیرساندنی باس و دوان بوو دەربارەی كێشەكە و هاوكاتیش دوورخستنەوەی ۲۰۰/۰۰۰ كورد لەو ناوچانەی كە هێزە چەكدارەكان زووتر تووشی زەبر وێكەوتن و خەسار دەهاتن؛ ئەمەش سیاسەتێك بوو كە ماوەیەك پێشتر دەستی پێكردبوو. جا چ لە كاردانەوەی ئەم كردەیە حاڵی ببوو یان نا, هەرچۆنێك بوو ئاكامی ڕوون و پتەوی ئاوا دەهاتە بەر چاوان: بەم كارە ئەم جەماوەرە كوردەش لە شوێنی خۆیان هەڵدەكەندران و بەمجۆرە لایەنگران و شەڕكەرانی پ.ك.ك. نە تەنیا لە كوردستان بەڵكوو لە شارەكانی توركیاش‌دا بنەیان لێ‌دەخست.

ڕاگوێزتنی دەیان هەزار کورد ئەوسەرێکەی دەیتوانی گرفتی سەربازیی بە شێوەی کاتی ڕەها کا, بەڵام یارمەتییەکی ئەوتۆی بۆ وەدیهاتنی ئامانجی بەر سەرنجی ئوزەلی نەدەدا. لەم شێوە بیر کردنەوەدا — سەرنجێکی ئەوتۆ نەدرابوویە سەر واقعییەتەکانی هەلومەرجی وێندەرێ بە گوێرەی سەردەم. ڕاستە, کۆچ و پەرەوازە بوونی بەرەبەرە لە پێشا کێشەی تێکەڵ بوون و توانەوەی هاسانتر کردبوو: چونکە کوردان کاروباری, هەرچەندە سووکیشیان لە شاران وە چنگ هێنابوو و مناڵەکانیان لە قوتابخانەی ترکان خوێندبوویان. بەڵام ئێستا شەڕ,جەماوەر و ئاپۆرایەکی لە تەنەکاوای قەراخ شاران لێك‌کۆ دەکردەوە و ئەم خەڵکە چەندین "دوڕگە"یان لە ژیانی گوندەکی کوردی لەم شوێنانە قوت دەکردەوە کە لە بەرامبەر کۆمەڵی گەڕانگەریاندا و هۆکارەکانی توانەوەدا خۆڕاگر و پتەو بوون. خاوەن‌کارانی ترك لە دانی کار بە کوردان خۆیان دەپاراست و ئەمە ڕێسایەکی گشتیی بوو. زۆربەی ڕێوڕەسمی ناشتنی ئەو سەربازە ترکانەی کە لە کوردستان کوژرابوون دەبوو بە هۆی تێکهەڵچوون لەگەڵ کوردانی کۆچەری خۆماڵیدا. ئامانج و توانستی ئوزەل بۆ جێبەجێ کردنی گەلاڵە و نەخشەکانی هەر چەندێکیش بوو, لە هەر حاڵێکا بێ ئەو وەك "تورمزێك" مەیلی هێزە چەکدارەکانی بۆ تاپۆ کردن هێور دەکردەوە. پاش مەرگی وی جێ‌نشینانی بەرپرسایەتی خۆیان بۆ ڕابەرایەتی شەڕ یەکسەر دایە دەس هێزە چەکدارەکان. دیمیرێل ماوەیەك بەر لەوەی کە وەك سەرکۆمار بچێتە جێی ئوزەل, وتەکانی خۆی لە بابەت "ناسینی ڕاستەقینەی کورد" و بەڵێنەکانی سەردەمانی هەڵبژاردنی لە یاد بردبۆوە: وادەی دابوو کە بنکە ناو زڕاوەکانی پۆلیس بکاتە "کۆشکی بلوورین". ئەم قسانەی کە چەند حەوتوو پاش سەرکەوتن لە هەڵبژاردنی نوامبری ١٩٩١دا کردی, هیوایەکی زۆری خستە نێو کوردان و باڵوێزخانەکانی ڕۆژاواییەوە. بەڵام هەر خێرایەکی ئەم ئومێدانە بوونە بڵقی سەر ئاو. دیمیرێل لە دەسپێکی سێهەمین دەورانی سەرۆك وەزیری خۆیا نیشانی دا کە ئامرازێکی نەرم و ئادمیزادێکی گوێ لەمستی هێزە چەکدارەکانە — بەڵێنی دا کە لە پێشدا ڕەگ‌وڕیشەی پاشماوەی گریلاکان دەربێنێ و خاشەبریان بکا, ئەوکات لە بابەت

كوردستانەوە بە سیاسەت و هەڵوێستی خۆیا بچێتەوە – ئیتر لەم بارەشەوە هیچ متەق ناكا.

سەركەوتنی بۆ پلەی سەركۆمارێتیش ئاڵوگۆڕێكی بە سەر ئەم تەمایەدا نەهێنا. تەنسوو چیللەر كە جێنشینی دەسبژێركراوی بوو بۆ سەرۆكوەزیرایەتی, لە سەرەتاوە مەیلی نواند لەسەر ورد بوونەوە و موتاڵای ئەم "دابی باسك"ە كە ناوێكی ڕەمزیی بوو و توركیا بۆ "چەنبنەكی" سیاسی هەڵیبژاردبوو كە لە ئیسپانیا بەڕێوە دەچوو. خاتوو چیللەر لە بابەت وردەكاری كارەكەوە لەگەڵ "فلیپە گۆنزالێس" سەرۆك وەزیری ئیسپانیا قسەی كرد و بەینێكیش كایەی بە بیری بڵاوكردنەوەی بەرنامەی ڕادیۆ – تەلەفیزیۆنی كرد, بە زمانی كوردی. بەڵام تەنیا كۆبوونەوەیەك لەگەڵ دیمیرێل و سەرۆكی ناوەندی سەركردایەتی سپای توركیا, خاتوو چیللەری كردە شەڕكەرێكی لەزۆق و ڕایگەیاند كە چاكسازی دەبێ بۆ سەردەمانێك ڕابگیرێ كە ترۆریزم خاشەبڕ كرابێ. چیللەر كە خۆی خاوەنی هیچ جێگە و پێگەیەكی سیاسی نەبوو, تێگەیی كە یەكێتی و هاوبەندی چڕ و پڕ لەگەڵ هێزە چەكدارەكان دەتوانێ ئاستی دەنگەكانی لە هەڵبژاردنا فرە پێهەڵابەرێ و هەر ئەم هاوبەندییە بە نۆرەی خۆی یارمەتی ئەم خاتوونەی دا كە لە ئەمریكا خوێندبووی, هەتا لە بەلای كارەساتاوی كردەی چەپەڵی دەزگای ماڵیی وڵات بە سەلامەت بۆی قوتار بێ. بودجەی لەشكری لە دوو هێندان پتر پێهەڵاچوو و هەر ئەمە خۆی بوو بە هۆی چوونە سەری ئاستی سەرسوڕهێنەری ئاوسانی ئابووریی توركیا لە ١٩٩٤دا: ئاستی ئاوسان سەتی ١٢٤ بەرزبۆوە و ئەمە لە حاڵێكا بوو كە ئابووری توركیا كە زۆربەی وەختان چالاك بوو بە دابەزینی سەتیشەشی بەرهەمی خالیسی میللی ڕووی كردە باری پێچەوانە.

ئەم ڕەوگەیەی كە دەوڵەتی چیللەر پێیا تێپەڕی نیشاندەری سەرسووتانی سیاسەتوانانی "گەورە باڵی سیاسەتی" توركیایە. خاتوو چیللەر بۆ تووڕ هەڵدانی ئەوەی بە "ڕەوت و ڕێباز" ناودێر كرابوو نیازی بە پێسەلمان نەبوو. ئەو لەبەر ئۆگریی و مەیلی سەبارەت بە كەوتنە بەردڵانی, ئیددیعای دەوڵەتی غەیرەنیزامیی لەسەر مەشرووع بوونی لە وەندەی دیش كرد, یانی بێ ئەوە بۆخۆی بزانێ وای كرد كە پاساوی بۆ گۆدەتایەكی تر دایە دەس نیزامییەكان, واتە ئەگەر هێزە چەكدارەكان

بۆ ڕیسوگوریس هێنانەوە لە بۆ سەرکوتی خوێناوی خۆیان لە کوردستان بە ناچاری نیازیان بە بەلاگێڕەوە بووبا. ئەو هەمان "نەفامی بەکەلك"ی چیرۆکیی بوو, نەفامێکی بێ سێودوو. ئەو لە بەرامبەر هیچ چەشنە سەرکوتێکدا کەمترین نارەحەتی لە خۆی نیشان نەدا. چۆڵ کرانی گوندان, بێسەروشوێن چوونەکان, کوژرانە ڕەمزاوییەکان... تەواوی ئەم ڕووداوانە لە دووساڵەی هەوەڵی سەرۆکوەزیرایەتی ئەوا یەکجار زۆر پێهەڵاچوون. تاقمێکی بەرچاو لەو ڕۆژنامەنووسانەی کە بارودۆخی کوردستانیان دەکردە ڕاپۆرت, ون بوون, کوژران و سەدان کەسیان بە تاوانی بلاوکردنەوەی پڕو پاگەندەی جودایی‌خوازانە یان تاوانی زۆر خراپتر درانە دەس دادگاکانی ئاساییشی ئەوپەڕ کەمالیستی.[1] بلاوکەرەوەی ئەم ڕۆژنامانە و ڕووناکبیرانێکیش کە لانی پارێزکردنیان بەردابوو و ڕەخنەیان لە حکوومەت گرتبوو تووشی وەها چارەنووسێك بوونەوە. ئیسماعیل بێشیکچی, کۆمەڵناسی سەربەخۆ وسینگ فرەوانی ترك, کە یەکەم جار لە ١٩٧١دا بە تاوانی وەجواب هاتن لەسەر کوردان کەوتە بەندیخانە, لەبەر پێداگری لەسەر بیر و باوەڕی کە دەقودۆغر دەریدەبڕی, پتر لە دووسەت ساڵی زیندان بۆ بڕایەوە. تەنانەت یاشار کەمال , ناوبەدەرەوەترین ڕۆماننووسی ولات کە کوردە و بەلام ڕۆمانەکانی خۆی بە زمانی ترکی دەنووسێ و لەمێژ ساڵیشە پالێوراوی وەرگرتنی خەلاتی نۆبێلە, لە حەفتایەك ساڵیدا کێشرایە پای مێزی محاکەمەی دادگای تەناهی. ئەو لەبەر کردەوەی نالەبار سەبارەت بە کوردان لەگەڵ دەمارگرژانی کەمالیست تێکەوت. [یاشارکەمال] لە مقالەیەکدا کە لە گۆڤاری "ئێشپیگێڵ"ی ئەلماندا نووسی دەوڵەتی تورکیای هەر لە سەرەتای دامەزرانی

---

١– کومیتەی پارستنی ڕۆژنامەنووسان کە بنکەی ناوەندیی لە نیۆیۆرکە لە توێژینەوەی ساڵی ١٩٩٥ی خۆیا ڕایگەیاند کە تورکیا بە باری گرتن و زیندانی کردنی ڕۆژنامەنووساندا خاوەنی "پلەی یەکەم"ە. لە ١٩٩٥دا پەنجاوسێ کەس ڕۆژنامەنووس بە هۆی نووسینی ڕاپۆرت لەسەر ڕووداوەکانی کوردستان کەوتبوونە بەندیخانە. "کەتی مارتۆن" سەرۆکی کومیتەی پاراستنی ڕۆژنامەنووسان گوتی: "تورکیا لەم بارەوە – یانی لە باری زیندانی کردنی ڕۆژنامەنووسانەوە – پێشبڕکەی ولاتانی پاوانخوازی وەك چین و سووریای داوەتەوە. "مارتۆن" داوای لە دەوڵەتی تورکیا کرد کە قانوونی دژی خافلکوژی ڕێکەوتی ساڵی ١٩٩١ کە پتر بۆ سەرکوتی ڕۆژنامە و بلاڤۆکان بەهرەی لێوەردەگیرێ, هەڵوەشێنێتەوە.

کۆمارێتەوە هەتا ئێستا ڕاستەوخۆ تاوانبار کرد کە بە شێوەیەکی ڕێکوپێـــــــــــک و شێوازێکی دیاریکراو دەستی داوەتە سـەرکوتی خـەڵک کـورد و "کوشـتنی زمـان و کەلتووریان". وەختایەك لە مارسی ١٩٩٦دا بە تاوانی دنەدانی خەڵك بۆ ڕقەوەنی و دوژمنایەتی و تەبلیغاتی جودایی‌خوازانە بیست مانگی زیندانی "تەعلیقی" بـۆ بڕایـەوە, گوتی: "لـەم وڵاتەدا نە دێموکراسی هەیە, نە قانوون."

وەدەرخستن و لە قاو دانی ئەم زوڵـم و زۆرانە دەرهەق خەڵکی کورد – بەتایبەت شاهیدی دان لـە کۆبوونـەوەکانی توێژینـەوەکانی کـۆنگرەی ئـەمریکا و دامـەزراوەی وەقفی کارەنگی بۆ ئاشتی و پارلـەمانی ئورووپا یان شـووڕای ئورووپـادا – بـە کـورتی سەرجەم ئەم چالاکییانە، هەڵپێچران و وە شوێن کەوتن و زۆر جـاران کێـشرانە پـای مێزی مـحاکەمەی "دادگای تەناهی" بە دواوە بوو. لـە نێوەڕاستەکانی ساڵی ١٩٩٤دا چیللـەر حیزبی "دێموکراسی" کە حیزبێکی کوردی بوو هەڵوەشـاندەوە. پێـنج شـەش کەس لـە نوێنەرانی ئەم حیزبە لـە پارلـەماندا پەنایان بردە ئورووپا, شەش کەسی تر کـە مانەوە و سوور بوون لـەسەر هەڵوێستی خۆیان یام تەواوێك درەنگ وەخۆ کـەوتبوون, گیران و مـحاکەمە کران و زیندانیی درێژخایەنیان بۆ بڕایەوە؛ وا بـەم شـێوەیە کۆتـایی درا بەم ڕەوتە ناکامڵەی کە هەرنەبێ [ئەوە تەنیا]هەڵبـژاردنێك بـوو کـە لــە مـاوەی حەفتا ساڵی ڕابردوودا ئازادانە بـەڕێوە چـووبوو. شـتێکی ئـەوتۆ بـوو کـە دەتگـوت دەوڵەت و پارلـەمان قەت لـەم تەکانەی کـە ***"لـەیلا زانـا"*** لێیـدان, هـەرگیز وەخـۆ نەهاتنەوە, لـەیلا زانا کە "پاسیوناریا"[1]یەکی جوان و حجێڵ بوو لـە پارلـەمان بـە زمـانی کوردی و ترکی سوێندی خوارد. چیللـەر ئەگەریش پەرۆشی و چزەی ویـژدانیش لــە بابەت داخرانی ئەم ئاخرین دەربیجە متمانە قانوونییەی کە لـە وەختی سەرکوتی سیاسی کوردەکانی تورکیادا هەستی پێکردبوو, ئەم پەرۆشییەی قەت نەدرکانـد. لــە ئەیالـەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زاڵ بوونی ئەم سەرۆك وەزیرە "فۆتۆژێنیك"ە[2] بە سەر زمـانی

---

١– Pasionaria (پازیوناریا), گوڵی کاتژمێر "پاشناو"ی وەزیری دەرەوەی ئیسپانیای شۆڕشگێڕ.

٢– Photogenic, لە ڕاستیدا یانی پڕشەنگدار, بەڵام وەکی دی بەکەسێك دەڵێن کە لــە وێنـەدا جـوان و دڵگـر خـۆ بنوێنێ.

ئینگلسیی ئەمریکایی‌دا لە دیمانە تەلەفیزیۆنییەکانا, کردی بە کەسایەتی بەرسرنجی ئەم ڕایەڵەیە: هەموو بە تاسەوە لەم ژنە جوان و ڤژکاڵەیان دەڕوانی کە وڵاتێکی مسوڵمانی بەڕێوە دەبرد. تێکڕا تامەزرۆی بوون و کەس ڕاستی و دروستی سیاسەتەکانی نەدەبردە ژێر پرسیار. لە سایەی کایە و گەمەی شانۆکارانەی ئەوا هێزە چەکدارەکانی تورکیا توانیان سەرلەنوێ جڵەوی کاران بە دەستەوە بگرنەوە و تەنانەت ناوچەیەکی بەرفرەهی کوردستان کە پێشتر لە ژێر حوکم و دەسەڵاتی پ.ک.ک.دا بوو "هێور" کەنەوە, بەڵام قەت دەرەقەت نەهاتن شۆڕشی کورد دامرکێنن و بیهاڕن.

***

لە فێوریەی ١٩٩٦دا لە ئیستامبووڵ, کە وەها لە پەناخوازان ئاوساوە کە دەکرێ بە بێترس بە گەورەترین شاری کوردنشین ناودێر بکرێ, بنەماڵەی ئیریك لە ڕۆژێکی تۆف و تۆفانی‌دا منیان بردەوە ماڵی خۆیان. لە کلکەی کۆلانێکی بە قوڕوقاڵی گەڕەکی هەژارنشینی "کاناریە"دا بنەیان لێخستبوو کە بیست خولەکێك لە فڕگەوە دوورە و ٦٥٠٠٠ تازە دابەزیوی گوندەکی لێنیشتەجێن و زۆربەشیان کوردن. ماڵی ئیریك – چوار برا و پتر لە سی کەسی تری تەمەن خوار و ژوور – بە کردەوە تا ئەو شوێنەی دەخلی بەسەر تورکیاوە بوو, خەڵکێکی "وەبەر چاو نەهاتوو" بوون. ئەوانەش وەك زۆرێك لەم کوردانەی کە لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتەوە بە کەڵەزەڕی لە خانە و لانەیان تەوەلا دەکرێن گیر و گرفتی "قانوونی"یان هەبوو. دوو لە براکان دەیانگوت کە بە تاوانی یارمەتی‌دانی پ.ک.ک. لە دێیەکەیان, لە دەوارنپشتی شرناك, کەوتوونە بەندیخانە و ئەشکەنجە دراون. (شرناك یەکێ لە قەڵا چاوناسەکانی نەتەوەخوازانە و کەوتۆتە لای سنووری ئێراق و سووریا.)

عەبدوڕڕەحمان, برا گەورەکە کە چلویەك ساڵی تەمەن بوو, گوتی گرفتی وی لەگەڵ گیرانەکەی لەو ڕۆژەی مانگی ئووتەوە دەستی پێکرد کە پ.ک.ک. یەکەم شالاوی سەربازیی خۆی لە "ئیروح" ئەنجام دا. (ئیروح شێست میلێك لە گوندەکەیەوە دوور بوو.) گوتی هیچ فرێکی بەسەر پەلاماری "پ.ک.ک"ەوە نەبووە, بەڵام بە پێی دووشك بوونێکی لەخۆوە, لەسەر ئەندامێتی لە پ.ک.ک.دا

**١٩٣**ڕۆژ جەزرەبە دراوە, پاشان حەوت ساڵی زیندان بۆ براوەتەوە, چونکە (بە گوتەی خۆی) پێمل نەبووە کە بچێتە ریزی "هێزی چەکداری گوندی". بێ ئەوەی کە کەس لێی پرسیبی گوتی, بەڵێ کوڕێکی لە پ.ك.ك. دایە. گیرانی خۆی بوو بە هۆی گیرانی "خالید"ی برای کە لە دەرەوەی سنووری پارێزگا کوردنشینەکاندا سەرباز بوو. (سەربازی کردن بۆ کوردان لە دەرەوەی کوردستان ئەرکێکی دیاری کراوە.) خالید کە پیاوێکی سی‌وپێنج ساڵانە بوو گوتی مانگێکی لەو پێنج مانگەی کە لە زیندانی نیزامیی‌دا بووە ئەشکەنجە دراوە, پاشی وی دە جارێك دەردەس کراوە, چاکی لەبیر نەمابوو چەند کەڕەت گیراوە. پۆلیسی نەهێنی تورکیا هەوڵی دابوو بە زۆرەملی بیکاتە سیخوڕ و ڕاپۆرتچی.

هێزەکانی ئاساییش لێکدالێکدا دەچوونەوە گوندەکەیان, ئەو ماڵانەی دەسنیشان دەکران بە گاوگۆل و مێگەلەوە ئاگر دەدران و ئاخری بنەماڵەکە لە خۆی حاڵی دەبوو. لە **١٩٩٣**دا یەك یەك و دوو دوو دەستیان لە گوندەکانیان بەردا و هاتنە کانارىە, یەکێك لە ژنبراکان پێشتر هاتبوو. ژن و زارۆك بە ئوتووبووس هاتبوون, بەڵام پیاوەکان نێوەنێوە بە لۆری ڕێیان بڕیبوو: "چونکە ئاوا هەم هەرزان بوو, هەم پشکنینی دەزگاکانی ئاساییش کەمتر بوو." ناوی هیچکام لە ئەندامانی بنەماڵە وەك دانیشتووی کانارىە نەنووسرابوو. هەر وەك لە بابەت زۆرێك لەم کوردە مشەختییانەوە دێتە پێش ئەوەی بلووغیان ببوو نەیاندەتوانی بەشداری دەنگ دان بن. براکان کە زۆر وکەم قسەکانیان وەسەر خۆیان گێڕابوو, تاقمێك بوون لە لایەنگرانی بەدەنگ و هەرای هادپ (Hadep), چونکە بە قەولی عەبدورڕەحمان "تەنانەت ئەگەر سەربەستییەکیش کە شیاومانە, وێمان نەدەن, ئەم حیزبە دیسانیش پارێزەری بنچاغی کوردیمانە..." ئەو لە حاڵێکا کە وردترین خاڵی هاوبەشی دێنایەگۆڕ کە تەنانەت ئەوان کوردانە دەیهێننە گۆڕ کە دژی "پ.ك.ك"ەن, درێژەی دا: "لانی‌کەم دەبێ مافی یەکسان و بەشێکی دادگەرانە لە سەرمایەنانەوەکان بۆ کوردان دیاری بکەن."

بەبێ بە دەستەوە بوونی "بەڵگە"ی پێویست نە خۆی و نە هیچکام لە ئەندامانی بنەماڵەی بە گوێرەی قانوون نەیاندەتوانی کار بکەن. بەڵام خەڵکێکی چاونەترسی ئازا

بوون و هەمیشە لەو شەیتانەبازارەی کاردا, کارێکیان پەیدا دەکرد و دەبوون بە کرێکار یان ئیشی کەمداهاتیان دەدۆزییەوە کە پێویستی بە پسوولە و بەرگەی ڕەسمی نەبوو و نەیدەخستنە بەر ویژەی لێپرسینەوە. بەرتیلێکی جاروبارە پۆلیسی لە شوێنی بنەگربوونیان دوور دەکردەوە. ئەم خانووە یەك نهۆم و قەوغایە بێ سەنەد و قەباڵە بوو. ئەو شەریکە بیناسازییەی کە دوو براکانی بە کرێکار گرتبوو, لە بری هەقدەس یارمەتی ئەوانی دابوون و براکان خانووەکەیان پێکەوەنابوو. ژمارەیەك لە مناڵەکان لە سایەی چاکەی دۆستێکەوە – خاتوونێکی ترك – کە گوتبووی مناڵی خۆنی و بە ناوی خۆیەوە دەبەر خوێندنی نابوون, دەچوونە قوتابخانە.

لە ژووری دانیشتنی بەرەکراوی ماڵی برالانی ئیریك کە بە گڵۆپێك ڕوون دەبۆوە کە لە کارەبای شەقامەوە دزرابوو, جێگای شانازی تایبەتی بۆ دەزگا تەلەفیزیۆنەی ماڵێ تەرخان کرابوو. خاوخێزان هەموو شەوێ چاویان لە بەرنامەکانی "مێد" دەکرد کە پ.ك.ك. بڵاوی دەکردەوە و بڵاوکرانەوەی لە ١٩٩٤ڕا لە دەرەوەی وڵاتەوە دەستی پێکردبوو. هەوڵ و تەقەلای ڕەسمیی تورکیا بە مەبەستی داخستنی هەروا بێپسانەوە درێژەی هەبوو. (لە سایەی سەری دارشتی "ڕێسایەکی" یەکجار ورد و باریکی ڕایەڵەی ڕێکخراوی "ئاپۆ" لە پێنج وڵاتی ئورووپاییدا, تەنیا لە هاوینی ١٩٩٦دا بوو کە تورکیا توانی چالاکی ئەوپەڕسنووریی پڕ پێچوفلۆوچی ئاپۆ لە قاو بدا و بە وڵاتانی پەیوەندیدار بسەلمێنێ هەتا ئەم ئیزەگەیە گاڵە دەن. لەگەڵ تەواوی ئەمانەشدا لایەنگرانی کارزان و بیرمەندی هەر خێرایەکی سەرکەوتن و توانیان بڵاوکرانەوەی بەرنامەکان دەس پێبکەنەوە.) براکان بۆ کڕینی "دیکۆدۆر" (Decodor) بۆ خاتری جیا کردنەوەی ئەو بەرنامانەی کە بە زاراوەی کرمانجی, سۆرانی و زازا و بە زمانی عەرەبی و ترکی بڵاودەکرانەوە, نیزیکەی ٢٠٠ دۆلارێکییان کۆکردەوە. بۆ شاردنەوەی ئانتێلی دەرەوە و "دیکۆدۆر" لەبەر پەلاماری لەنەکاوی پۆلیس, وردەکارییەکی تایبەتیان دەکار کردبوو.

داخوا هەر ئەم تەماشا کردنەی بەرنامەکانی تەلەفیزیۆن بەس بوو؟ براکان و کەس‌وکاریان یەکبین دەیانگوت هەر خەیاڵی ڕۆژێکیان دێتە بەر بیر کە بگەڕێنەوە گوندەکانیان. خالید کە لە نێو براکانیدا تەنیا کەسێك بوو هەتا پۆلی دووەمی

دواناوەندی خوێندبوو, دەربارەی بایەخی دژایەتی لەگەڵ حوکمات بە حاڵودووبەلاش دوودڵ نەبوو. گوتی: "من پتر لە سەت کەس لە دۆستانم, بۆ وێنە بیست کەس زیاتر لە هاوپۆلەکانی دواناوەندیم, کوژراون... بەڵێ[خەبات] ئەوەندە دێنێ!" لە ڕاوێژی دەنگیدا کەمترین گومانێك بەرگوێ نەدەکەوت.

بڕوایەکی لەم چەشنەی وەك بە ڕاست و هەق زانینی ئامانجیان, کاردانەوەیەکی ئەوتۆی بوو کە هەواڵنێرێکی گەنجی ترك بە ناوی "قەدری گورسێل" پاش بیست ڕۆژ بە دیل گیرانی لە لایەن "پ.ك.ك"ەوە, پێیەوە دیار بوو. ئەو هەواڵنێری ئاژانسی "فرانس پرێس" بوو. زۆرتری ماوەی ئەم دیلایەتییەی لە دەورانپشتی زێدی ئیریك, لە لای شرناك ڕابردبوو. گورسێل نەقڵی ئەم ڕووداوەی لە **٣١**ی مارسی **١٩٩٥**دا بۆ گێڕامەوە. گوتی لە گەرمەی هێرشێکی **٣٧٠٠٠** کەسی هێزەکانی تورکیا بۆ باکووری ئێراق لە شالاوێکی ناودێر بە "شالاوی پۆلا"دا لە ڕێگیرانێکی نیزیك "نوسیبین"دا بە دەس پۆلێك پێشمەرگەی پ.ك.ك. بە دیل گیرا, کە تێکڕا کەڵەشینکۆفیان لە شانیدابوو.

خۆی و ژنەکەی کە وێنەگری ڕۆیتێر بوو، تاوانی خۆیان بوو کە تووش هاتبوون: دەیانزانی کە شەوانە ڕێگا پڕ مەترسییە، بەلام بە لەز بوون. پ.ك.ك. بە ڕووی‌خۆشەوە لەگەڵیان جوولاوە، بەلام بۆ ئەوەی کە بە جێ و مەکانیان نەزانن، بێ‌پسانەوە و پتر شەوانە ڕایاندەگوێزتن. جارێك کەوتنە داوی هێزەکانی حکوومەت و تەقە دەسی پێکرد. هەر خۆمپارە بوو کە لە گەڕانگەڕیان دەتەقینەوە، باڵەفڕەکان ڕاستەوڕاست لەسەر سەریان دەسووڕانەوە و ئەم دووە ئەوەندەی کە لە هێزەکانی تورکیا دەترسان قەت ئەوەندەیان ترس لە پ.ك.ك. نەبوو. کیژانی نەخوێندەوار تەنیا بە کوردی دەهاتنە ئاخافتن، جگە لەو تاقمەی کە کوردی سووریا و ئێراق بوون؛ پیاوەکان بە ترکی دەدوان و قسەیان لەگەڵ هەواڵنێرەکان دەکرد و گاڵتەیان پێدەکردن و دەیانگوت کە دەست‌وپێ سپیلکە و قزەن. جا هەر لەبەر ئەمە لەم پەیامانەدا کە بە بێ‌تەل دەیانگۆڕینەوە بە ناوی "دوو لقە گوڵاڵە" باسیان دەکردن.

فەرمانـدەران خوێنـدەوارییان زیـاتر بـوو و یـەکی حـەوت هەشـت سـاڵێك بـوو پێشمەرگە بوون و قسەیان لـە مارکسیزم دەکرد؛ ئەوانـەی کـەمتریان خوێنـدبوو تـەنیا سەبارەت بە ناسیۆنالیزمی کورد مەیلیان دەنواند. تێکڕا دەیانویست وڵاتی کوردستانی یەکپارچە بنیاتبنێن و کوردی هەموو شوێنەکان پێکەوە یەکگرتوو کەن؛ ئەوان لێیـان سوور بوو بەم خەسارەی بە باری ئینسانی و ماددیـدا بەسـەر تورکیـای دێـنن و بـەم گیروگرفتەی بۆیان ناوەتەوە سەرەنـجام ڕایدەکێشنە پای مێزی وتوویـێژ. ئەمانـە زۆر جاران بۆ دڵخۆشیدانەوەی خۆیان باسی شکستی ئەمریکایان لـە ویێتنام دەکرد. لـە نێو ڕیزی خەڵکی ئاساییدا کەم بوون کەسانێکی کە پتر لــە یـەك دوو سـاڵیان خزمـەت کردبێ، هەڵبەت دیارە بە سرنج دان بـەم کەرەسـتە هەمەچەشـنەی قڕکردنـێ کـە دەوڵەتی تورکیا بۆ کوشـتنیان لـەبـەر دەسـتی دایـە، ماوەیـەکی کـەم نیـە. خەسـاری قورس‌وگران خۆیان نەدەشاردەوە. ئەم هەواڵنێرانە بە نێو نیزیکەی بیست‌وپێـــــــــنج گوندانـدا تێپەڕین کە لـە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا حکوومەت خاپووری کردبوون یان خەڵك خۆیان دەستیان لـــێ‌بەردابوون و ڕۆیـشتبوون. ئەمـە نیـشانەی "سـەرکەوتنی" هێزەکانی ئاساییش بوو کە شۆڕشگێڕانی لـە دەس وێراگەیشتن بە سەرچـاوەی ژیـان و جەماوەر بێ‌بەش کردبوو.

خواردن ببوو بە هۆی بیرئاڵۆزکاوی پێشمەرگە ڕەنگ بزرکاوەکـان کـە ڕەنـگ و ڕوویان هاواری کەمخوێنی و کەمخۆراکی دەکرد. زۆر وەختان خۆیان لـە "چەکدارانی گوندەکی" لا دەدا، بەڵام جارجارە پەلاماری کەرکە مەڕێکیان دەدا کـە ئـەم جاشـانە نیگاداریان بوون و جارێکیان بۆ وە دەس هێنانی گۆشت هەشت کەسیان لـەوان جاشان کوشت. خواردنی پێشمەرگان بە لای زۆریدا برینج و ماکارۆنی و ... چایی بوو، کە لـەم ئازووخەیەی کە لـە ئەشکەوتاندا حەشار درابوو، دابین دەکرا. جارێکیـان پـەنایان بردە بەر ئەشکەوتێك کە پڕ بوو لـە قودوولـەی بـەتاڵی سـاردین و قاورمـەی ماسـی و ڕۆن زەیتوون و ساردەمەنی؛ وا دیارە بوو کە لـە ڕابردوودا ئـەوێ گـەورە هـەمارێکی پشتیوانیی و دابین کرانی پێشمەرگە بووە. یەکێك لـە پێشمەرگەکان زەمانێکی دێنایەوە یاد کە ئەم کەلوپەلانە بە سـالادی تـازە و زەیتـوون و پـەنیرەوە بـێ نێـوبڕ دەهـاتن و

درێژەی دا: "بە قەدرایە خودی دەوڵەت دەوڵەمەند بووین." تەنیا دیاردەی ئاشکرای خەمۆکی وەختایەك دەردەکەوت کە پاشەکەوتی شەکر بنەی دەهات. گاڵتەیان دەکرد بە هەموو چەشنە وەرەزی و لاوازی نوانـدنێك، بۆ وێنە دڵتەنگ بوون بۆ خاوخێزان ...

شوێنێکی کە گورسێل لەم تێکەوتنەدا کرایە سەری شێلگیری و تەما و "نامرادی" بوو. زۆرێك لەم کوردانەی کە لەم پەلە شێست کەسییەدا [پێشمەرگە] بوون، لاوانێ بوون کە خولی دواناوەندییان تەواو کردبوو، ماوەیەکی درێژ لە دیاربەکر و شارەکانی ترا بە دووی کارا هەلاتهەلاتیان کردبوو و وەختایەك هیچ کارێکیان گیر نەکەوتبوو، لێبڕابوون کە بچنە ریزی پ.ك.ك. و لەگەڵ حکوومەت بکەونە شەڕ. گورسێل پێی گوتم: "من پێم وایە درێژەی ژیان بۆ هەر کەسێکی تر بێجگە لەوان لە بارودۆخێکی وەوتۆدا زۆر دژوارە. بەڵام ئەمانە، تین و گوڕ و گڕێ و ئیمانێکی تایبەت بە خۆیان هەیە. بە بڕوای من بە باری سەربازییدا زۆر بەهێزن، شتێکن وەك جیوەی نەسرەوتوو، نەبەز و لە شکان نەهاتوو، چونکە ڕاستەقینەی ژیانیان لایەنێکی ترە لە ڕاستەقینە." ئەم وتانەی وی لەگەڵ ئەو شتانەی کە ئۆجالان لە دەمیشق لە بابەت شێوەی فێرکردن و ڕاهێنانێکدا هێنابوویە گۆڕ کە تازە داخڵبووەکانی پێ وەبار دێنا، یەکتریان دەخوێندەوە: گرینگترین مەبەست هەلومەرجی ماددی و جەستەیی نەبوو، بەڵکوو ڕاهێنانی سیاسی و ئامادە بوونی فکری بوو.

سەیر ئەمەیە کە وێنەی ئەم بۆچوونەم لە نووسینگەی کاری کامران ئینان، لە کۆشکی پارلەمانی تورکیا لە ئانکارا بەرگوێ کەوت. ئەم کوردە چاوناسە کە ئەندامی "چواربەندە"ی قەلافەتی حکوومەتە، گوتی: "شێوەی حکوومەتی کەمالیستی لەبەر هەڵەی دەوڵەتانی تووشی تەنگەژە بۆتەوە و لە ڕۆژهەلات و باشووری ڕۆژهەلات بە ڕادەی پێویست خۆیان نەدایە بواری پەروەردە و دابین کردنی کار و ڕێگا لێدان و ئەمجۆرە شتانە بۆ لاوانی کورد و "بەم شێوەیە خەڵکیان کردە ئەستێ و پووشووی تیرۆریستەکانی پ.ك.ك." پرسی: "پ.ك.ك. چیە، جگە لە تاقمێك لاو کە لە قوتابخانەی دواناوەندی دەرکەوتوون و نەچوونە زانکۆکان و ئیتر نەیانتوانیوە بگەڕێنەوە سەر مووچە و مەزرا یان کارێکیان گیر نەکەوتووە؟" گەنجانێکی کورد ئەم

شەڕەیان هەڵگیـرسانـد کــە لـە ماڵەوە بەرەورووی داهاتوویەکی تاریـك ببوونـەوە و دەیانزانی کە کۆچ کردن بۆ باژێرەکانی ڕۆژاوا و باشوور گەیوەتـە ئەوپـەڕی خـۆی و کەسی تر هـەڵناگرێ. لێکدانـەوە و شـیکردنەوەیەکی کـە لەسـەر هەلومەرجەکـە کردی یەکجار ورد و دروست بوو و من چاوەڕوانی ئەمە نەبووم کـە شـتی وای لـێ ببیستم، ئەویش بە ڕاوێژێکی ئەوتۆ و ئاوا توند و تیژ.

دە ساڵێك پتر بوو کە "ئینان"م دەناسی و ئەوم وەك "مام تام"[1] ێکـی کـورد لەسـەر لاپەڕەی بیرم کێشابۆوە. لە ڕابردوودا وام زانیبوو کە لە شێوە بـیر کردنـەوەی حـاڵی بووم، بـەڵام ئێـستا لـێم سـووره کـە تێینەگـەیوم یـان زەمانـە گۆڕابـوو. ئـەو کـە کۆماریـخوازێکی بێخەوشوخـاڵ بـوو، لـە ڕابـردوودا دەکـرا وەك وێنەیـەکی شیکردنەوەی ڕوونـی ڕێبـازی کەمالیـستی بیناسـێنی. [ئینـان] لـە بەشـی "مـاف"ی زانکۆی ژێنێو خوێندنی باڵای تەواو کردبـوو. ئـەو کۆنـە دیپلۆمـات، کۆنـە وەزیـر، پاڵێوراوی سەرکۆمارێتی و بێنێوبڕ ئەندامی هەردك مەجلیسی وڵات بوو. بە درێـژایی چەندین ساڵان، بەتایبەت ئەو کاتەی کە وەزیری وزە و سەرچاوە سروشتییەکان بـوو، زۆر جاران سەبارەت بە گەڵاڵەی وەبـەردڵ کـەوتووی، یـانی "گـاپ"ەوە وتووێـژم لەگەڵ کردبوو. ئەوەندەی دنیای خەیاڵ بڕ دەکا پیاوێك لەوی "دژاودژ"تر وە بەر بیر نەدەهات.

ڕەچـەڵاکی کـوردێتی "ئینـان" بـۆ ئـەم ڕۆڵـەی بنەماڵـەی شـێخانی نەقـشبەندی مەبەستێکی زۆر بارناسك بوو. دایکی لـەم ئەرمەنییانـە بـوو کـە لـە قڕکرانـی سـاڵی **١٩١٥** خەلەستبوو. ئەو لە ساڵی **١٩٢٩**دا لە واگۆنێکی گواستنەوەی ئـاژەڵدا کـە بنەماڵەکەیانی لە پارێزگای ڕۆژهەڵاتیی بدلیسەوە دەبردە تاراوگەی ڕۆژاوای تورکیـا، لــە دایـك بـوو. دوابـەدوای شـۆڕش و ڕاپـەڕینی یـەك لـە دوای یـەکی کـوردان، دوورخرانەوەی وەوتۆ شێوەیەکی "ئاسایی" لە خۆی گرت. کەمالیستەکان مامۆستایانی

---

**١- ئاماژەیە بە ڕۆمانی "کۆخی مام تام"، بە قەڵەمی هێنریت بیچێر ئوستوو؛ دەورگێڕی سەرەکی ڕۆمانەکە "مـام تام"ە. مام تام قولەڕەشێکە کە شێوەی ئاکاری لەگەڵ سپیپێستان وەك مەرایی کردن دەچێ.**

پایەبەرزی ئایینی یان سەرۆك هۆزەكانیان لەم شۆڕشانەدا بەشدارییان كردبا یا نەكردبوو، لە شوێنی خۆیان هەڵیاندەقەندن و دووریان دەخستنەوە. (ئیسكان عەزیز ئۆغڵوو، نوێنەری دیاربەكر لە پارلەمان، كە پیاوێكی زۆر لەبەردڵانە، لە بابەت ناوی خۆی واتە "ئیسكان" چاكەی ئەم كارەی لە ئەستۆیە كە لە **١٩٣٩**دا، لە ماوەی دوورخرانەوەی بنەماڵەكەی لە شاری سیلوان، كە لە **١٩٢٥** تا **١٩٧٤**ی كێشا، پێینایە جەغزی ژیان.) ئەم تاراندن و دوورخرانەوانە لەبەر وەی بوو كە ئیتر ڕێبەرێك لە نێو كورداندا نەمێنێ. ئەم دوورخراوانە لە پێكگرتن لەگەڵ ئەو بەڵایەی بەسەر سەدان خوێندەواری كوردیان هێنا كە بە گومانی پشتیوانی كردن لە شۆڕشی **١٩٣٠** ئارارات لە تەلیسانیان ئاخنین و شووژن‌دروویان كردن و لە گۆلی "وان"یان هاویشتن، چاكی بۆ قوتار بوون. ئەم دوور خرانەوەی نێوخۆ ئەگەرچی تاڵ و ناخۆش بوو، بەڵام تاڵتر لەم "سیاسەتە" نەبوو كە ئامانجی بەربیری ئاتاترك بوو. ئەو وای پێ‌باشتر بوو كە تەواوی كوردان لە جیاتی ڕاگواستن و دوورخستنەوە بۆ نێوخۆی وڵات، ڕایانداتە وڵاتانی دراوسێ و تەنیا شتێكی بەری بەڕێوەچوونی سیاسەتێكی ئەوتۆی گرت، بێ دراوی بوو.[1]

پاش ساڵی **١٩٥٠** "ئینان" و تەواوی كوردانی مەزنەماڵ، سەرەڕای ئەم ئێش و ئازارەی بە ئەستۆی خاوخێزانەكانیاندا هاتبوو، بۆیگرتن و كەوتنە سەر دەور. ئەمەش مەبەستێك بوو كە زۆرێك لە كوردان و تركان وەك بەڵگەیەك لەسەر دانەنانی فەرق و جیاوازی سیستمی حكوومەتی [لە مابەینی نەتەوەكاندا] دەیانهێنایە گۆڕ و پەسنیان

---

**١– تۆفیق ڕوشدیبەگ، وەزیری دەرەوی توركیا لە ١٩٢٦دا، بە "هێنڕی دابز"ی كۆمیسێری باڵای بریتانیای لە بەغدا، كە سەردانی ئانكارای دەكرد، گوت: "دەوڵەتی توركیا گەیوەتە ئەم ئاكامە كە قەت كوردی بۆ وەخۆی ناخرێن و دەبێ لە وڵاتیان وەدەربنێ. توركیای نوێ لەسەر مەیتی قڕكراوان بناغەی ڕۆنرا و دەبێ دەس لە توند و تیژی خۆی نەكێشێتەوە. وڵات لە چنگ گێچەڵی یۆنانی و ئەرمەنییان ڕزگار بووە و هەنگاوی دواتری ئەمەیە كە گێچەڵی كوردان لە كۆڵ خۆی كاتەوە". ڕوشدیبەگ پاساوی بۆ دەركرانی كوردان بە گوێرەی دواكەوتوویی هزریان دێنایەوە. گوتی: "توركیا پێویستی بە زەوی‌وزاری بەرێژەوی ئەوان هەیە و متمانە بە هەنتەشی ئەوان ناكا لە ناوچەكانی سەرسنووری. دابز لە درێژەدا دەڵێ، ڕوشدیبەگ گوتی: "كاتێك لە وڵات ڕەپاڵنران، ئیتر قەت ناهێڵین بێنەوە ژوور."**

دەدا. "ئینان" بوو بە خزمەتکارێکی ڕووڕاست و گیانیگیانی کۆمار. ئەم خزمەتکارییە تایبەتی کۆمار بوو و هیچ پەیوەندێکی بە کوردانی پارێزگای بدلیسەوە نەبوو، کە ئەو دەیان ساڵ لە مەجلیسی پیراندا نوێنەریان بوو. ئەویش وەك زۆرێك لەم کوردانەی کە لە سیستمی کۆمارێتیدا گەیبوونە پلە و پایەیەك، ئەو نێوانگرژییەی کە لەسەر وەفادار بوون بە کەمالیزم و ڕەچەڵاك و باپیرانیان سەری هەڵدابوو، دەیبردەوە سەر بارێکی دیکە و لە چاوپێکەوتنەکانی پێشوودا کاتێك باسی ئەو ڕەوت و ڕووداوانەم کردبوو خۆی لە باسەکە کلا کردبوو و وڵامی پرسیارەکانمی نەدابۆوە. ئەمجار وەختایەك دەقودۆغر لێم پرسی داخوا خۆی بە کورد دەزانێ یان تورك، وڵامی داوە: "من قەت ئەم پرسیارە لە خۆم ناکەم. من وەك سەیدێك – یانی تۆرەمەی پێغەمبەر – پێم وایە دەبێ بە عەرەبم دانێن."

ئەم وەرسووڕانە، زیوانێکی زیرەکانە بوو. لەگەڵ ئەمەشدا وەك لە وتەکانیڕا سەبارەت بە لایەنە دڵگرەکانی پ.ك.ك. دەرکەوت، وەکوو پیاوێك بە لایەنی دیار و نادیاری پتر لە ڕابردۆوە قوت بۆوە. ئاشکرایە ئەو هەتا ئێرە هیچ کارێکی بە پ.ك.ك. نەبوو. لە مەڵبەندی خۆی (خیزان) ئەوەندەی هێز و دەسەڵات هەبوو کە ساڵگاران ڕوو لەوێ نەکاتەوە و هەڵبژێردرێتەوە، جا چ بگا بە وەی کە خۆی ڕێبەرایەتی چالاکی هەڵبژاردن لە ئەستۆ بگرێ. بەڵێ تەریقەتی نەقشبەندی وای کار لەسەر خەڵکی مەڵبەندەکە کردبوو کە بێ ئەوەی خۆی لە هەوێڵدا بێ هەڵدەبژێرایەوە. بەڵام لە دەزگای حکوومەت توورە بوو، بەتایبەت لەبەر وەی کە چوار ساڵ بوو یەکبین خەرجی جێبەجێ کرانی گەڵاڵەی وەبەردڵ کەوتووی – گاپ – ی کەم کردبۆوە. دابین کرانی پووڵ لە لایەك بۆ کڕینی نان و لە لایەکیش بۆ فیشەك لە وزەی ئابووریی تورکیادا نەبوو. تەنانەت لە هەل و دەرفەتی زۆر باشتردا خەرجوبەرجی گاپ قەبارەی کەم هێنانی یەکجار زۆری بودجەی وڵاتی پێ پێهەڵابرد، وا ئێستا کەم کرانەوەی پەیتاپەیتای خەرجی گەڵاڵەکە دەریدەخست کە خەرجوبەرجی شەڕی کوردستان پێهەڵاچووبوو. لە ڕاستیدا تەنانەت یەکەم قۆناخی گاپ کە دابین کرانی ئاوی ئاوەدێری بوو، ئەویش نەك بۆ کوردستان بەڵکوو بۆ عەرەبانەی دەشتەکانی حەڕڕان لەسەر لێواری سنووری لای سووریا، قەتیس کەوتبۆوە و چ بەرەوپێشەوە چوونی نەبوو، چونکە بۆ کڕینی لوولە

گەورەكانی چیمەنتۆی پێتەویستی "میل"ێك مەودای كۆتـایی كارەكـە، هـیچ پوولێـك بـە دەستەوە نەبوو.

"ئینان" بە توندی ڕەخنەی لـە كاربەدەسـتانی دەوڵـەتی ئانكـارا دەگـرت. جارێكیـان ڕووی كردە تاقمێك كە خەریكی گەلاڵەیەكی ئاوەدان كردنەوە بوون و لێیپرسین داخوا چوونە بەشی ئورووپای ڕۆژاوا؟ هـەموویان جگـە لـە یـەك دوو كەسـان دەسـتیان بـەرز كردەوە. بە نارەحەتی و بێزارییەوە گوتی: "وەختایەك پرسیم چـەند كەسـتان چـوونە لای ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهـەڵاتی وڵات، تـەنیا كەسـێكتان دەسـتی بـەرز كـردەوە ... وڵاتەكـەیان نەدەناسـی. پرۆژەكانیـان هـەر لێـرە – لـە ئانكـارا – خـر هەڵـدەدا و ڕێكیاندەخستن؛ كە وایە هیچ جێی سەرسوڕمان نیە كـە پرۆژەكانیـان پووچـەڵ دەرچـن." گوتی ئەندازیارێكی ئیتالیایی كە لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتەوە گەڕابۆوە و سەردانی ئەو شوێنەی كردبوو كە بۆ سازكرانی كارخانەیەك وەبەر چاو گیرابوو، زۆر بـە ڕێـزەوە پرسـی داخـوا گەلاڵەدارێژان و ئەندازیارانی ترك چوونە وێندەرێ؟ چونكە لە گەلاڵەكانیاندا هەلومەرجی ئەستەمی مەڵبەند و وارووێخـی شـوێنەكەیان وەبـەر چـاو نـەگرتووە. (ئـەم هەڵكەوتە ماوەیەك بەر لە دەسپێكی شەڕی نێوخۆ بوو.) ئینان زیادی كرد: "نـا، كەسـێك نەویستبوو بچێ و چاوێك بە شوێنەكەدا بگێڕێ."

ئینان لە مابەینی قسەكانیدا گوتی كوردان ئەوەندەی كە زوڵمیـان لێكـراوە تاوانبـار نین و ئەوە ئیدیعایەكی تازە بوو. دەتگوت بە ئاشكرا پێیان دەخوڕی، ئەگەرچی بە "دابـی باو" وەباڵی زۆرێك لـە گیروگرفتەكانی توركیای دەخستە ئەستۆی وان: "هەمیشە لـەگـەڵ دوژمنانی نیشتمان دەس تێكەڵ دەكەن." ئەو بە بەرزەدەماخی باسی ئەو دەورە گرینگـەی كوردانی كرد كە لـە سـاڵانی بـەر لـە دامـەزرانی كۆمـارێتی بـۆ یارمـەتی دانـی ئاتـاترك گێڕابوویان. (ئەگەرچی بە شێوەی ڕەسـمی قسە لـەم دەور و ڕووداوانـە نـاكرێ.) ئینـان درێژەی دا: "ئەوە كوردان بوون كـە كۆماریـان دامەزرانـد و بـەخاتری ئاتـاترك لـەگـەڵ فەڕانـسەوێكان، ئینگلیـسێكان، یۆنانێكـان و ئەرمـەنێكان شـەڕیان كـرد. زۆربـەی ئـەو ڕێبەرانەی كە ئاتاترك لـە وتارێكا كە بە بۆنەی دەیەمین ساڵوەگەڕی دامـەزرانی كۆمـارێتی دای و نـاوی هێنـان كـورد بـوون." دەتگـوت "دەرزی گۆزەڵـەی حەقیقـەت"ی پێوەهەڵاوەسراوە و ئێستا بێ گرێ و كۆسپ غاری دەدا. بە پێداگرییەوە گوتی: "بڕوانـە! ٢٥٠ تا ٣٠٠ كەس لـە نوێنەرانی پارلـەمانی ٥٥٠ كەسی بە ڕەگەز كـوردن، ئەگەرچـی

لە ئیستامبووڵەوە هەڵدەبژێردرێن." ئەمە قانێکی باوە کە ئەو و تەواوی کەسانی هاوچین و تایەفەی زۆر جاران دەیهێننە گۆڕ هەتا دەریخەن کە چلۆن "سیاسەتی ڕاکێشان" گشت هاووڵاتیانی نیشتمان بە بێ فەرق و جیاوازی و سەرنجدانە تۆرەمە و ڕەگەز، کردوونی بە کۆماریخوازانێکی باش.

ئەو ئینانەی من ناسیبووم، لە ڕابردوودا لە کۆبوونەوە غەیرەڕەسمی و دۆستانەکاندا هەست و سۆزە کوردانەکانی خۆی وەلا دەنان یان تەنانەت دەکرێ بڵێی کە "دەیتەزاندن". بەڵام ئێستا واقم دەبردەوە، لە پێشدا قەت ژمارەی ئاوا بالاّم لێنەبیستبوو. ئینان وا دیار بوو دەیەویست بڵێ کە کوردان خاوەنی توانایی سیاسی تایبەتین و دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵك بە شێوەیەك کە لەگەڵ ڕێژەی جەماوەریان یەکتر ناگرێتەوە هەڵیانبژێرن. کەلکم لەم دەرفەتە وەرگرت و پرسیم داخوا ئەویش هاودەنگی بڕوای ئەو کەسانەیە کە وا پێشبینی دەکەن لە نێوەڕاستەکانی سەدەی داهاتوودا کوردان بە باری ڕێژەی جەماوەردا وە پێش ترکان دەکەون؟ وڵامی داوە: "بە سرنجدان بە ڕێژەی بالاتری زاوزێیان هیچ دوور نیە." ئەمەش ترازانێکی تر لە "تابوو"[1]ی کەمالیستی بوو بۆ هەڵاواردن و لێكجیا کردنەوەی ڕێژەکانی جەماوەریی بە گوێرەی سەرچاوەی ڕەگەزی و قەومی.

١- Tabou، کەسێك یا شتێکی پیرۆز کە دەس لێدان و لێنیزیك بوونەوەی قەدەغە بێ. "وەرگێڕ"

# بەشی ١٠

## لێر و لەوێ[١]

بەشی هەرە زۆری سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩٦م سەرفی وتووێژ لەگەڵ ئینان و کوردانی تری تورکیا کرد. بەڵام لە تەواوی ماوەی ئەو ساڵەدا، بەتایبەت لە چەند حەوتووی ئاخری هاوینا، ئەو کوردانەی دڵنیگەرانی دۆزەکە بوون لێکدالێکدا لە هەموو شوێنەکانی کوردستان، لە لەندەن و واشینگتۆنەوە تەلەفۆنیان بۆ دەکردم هەتا سەبارەت بە کارەساتێکی کە بەڕێوە بوو ئاگادارم کەنەوە. تەواو هەشت ساڵ لێرەوبەریش چەند کەسێك هەر لەوانە تەلەفۆنیان کردبوو و هەواڵیان دابوو کە سەددام حوسێن لە بادینان گازی شیمیایی دەکار هێناوە. ئەمە ڕێزگرتن بوو لە ئاگربەسی شەڕی ئێران و ئێراق بە دابی سەددام حوسێن. ئەمجار ئەم خەڵکە دەچۆقین و هەڵدەچوون و پەرۆشی ئەوە بوون کە ڕق و دوژمنایەتی ژان سارێژنەبۆوەی نێوان پارتی دێموکراتی بارزانی ویەکێتی نیشتمانی تاڵەبانی دەڵێی خەریکە ئەو بڕە هیوایەش کە بۆ وە دەس هێنانی خودموختارییەکی سەقامگیر لە سەدەی بیستەما لەگۆڕێ‌دابوو، بداتە دەم باوە. بەڵام تەنانەت وریاترین و خۆشخەیاڵترینی ئەم کەسانەی پێوەندییان

---

١– سەردێڕی بەشەکە ئەمەیە: **Dog's Breakfast**، سەولەی سەگ. (شتێك وەك چێشتی مجێور, شەڵپیتاو)

پێوەدەکردم نەیاندەتوانی ئـەم هێـرش و دژەهێرشـە هێزپرووکێنانـەی ئـەم دوو ڕێبـەرە شەڕخوازەی کە سەرمایەی هاوخەمی لەگەڵ کوردەکـانی ئێراقـی لـە دەرەوەی وڵات تەواو فەوتاند، لێکدەنەوە و بە پێش‌بینی لێی‌حاڵی بن. لە ماوەی مانگەکانی داهـاتوودا ئاغایان شێوە شەڕێکی ئەوبەرەوبەرەکێنەیان ساز کرد و لـە پێش‌دا پـــارتی دێمـــوکراتی کوردستان و پاشان یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان ناوچـەیەکی پـان و بـەرینی خـاکی کوردستانیان داگیر کرد. بەشی زۆری خەڵکی ئاسایی کورد وەختایـەك دەیـانبینی ئـەو کەسانەی کە ڕۆژگارێکی قارەمانی نەتەوەیی‌یـــان بـــوون، ئێـــستا بوونـــە داردەســـتی پـشتیوانانی ئێرانـی و ئێراقییـان، خۆیـان دەخـواردەوە و هەسـتیان بـە سـووکایەتی و شەرمەزاری دەکرد.

لە مانگی ئووتا سەددام حوسێن، لە ماوەی چەند ڕۆژی نەپساوەدا دەیانهـــــــەزار کەسی لە هێزە کارامەکانی خۆی – یانی گاردی سەرۆك کۆماریی لەگەڵ سەدان تانك و تۆپ – لە خـواروی هێڵـی ٣٦ کـە سـەرهەدی ناوچـەیەکی پـاوان بـوو و پۆلـە فرۆکەی ئەمریکایی و ئینگلیسی و فەڕانسەوی پارێزگارییان لێـدەکرد، کـۆ کـردەوە. من هیچ سـەرم سـوڕنەما. لـە مـانگی فێوریـەدا کـە لـە کوردسـتان بـووم، دەنگـوێ لێکدالێکدای ئەوەم بیستبوو کـە بـارزانی چـەند مانگێکـە لەگـەڵ سـەددام حوسـێن کەوتۆتە وت‌وویژ. بۆ چما هەر لەو زستانی‌دا دەیـان تانـك و زرێپۆشـی لـە بەغـدا نەکڕیبوو؟ ئەوانەی تەلەفۆنیان دەکرد ئێستا لەوپەڕی نائومێدی‌دا ئـــاخرین داوەکـــانی باریکی هیوایان لـە ویست و هەڵوێستی دەوڵەتی کلینتۆن گرێدابوو کە بـە مەبەسـتی بەرگرتن لە ڕوودانی کارەسات کەلك لـە هێزی ئاسـمانیی وەربگـرێ. مەبەسـت لـەم کارەساتە شاڵاوی هاوبەشی سەددام و بـارزانی بـوو، کـە لەوپـەڕی تـرس و تـۆقین و پەرۆشی ئەم خەڵکەدا، بەر لـە تاریك‌ورووني بەیانەی ڕۆژی ٣١ی ئووت دەستی پێکرد و خێرایەکی پاشـماوەی ناسـیۆنالیزمی کـوردی ئێـراق و ئیـدیعاکانی "پەڵـەگرتووی" تۆفانی سارای بە باری سەرکەوتنا خستە مەترسی.

لەساڵی ١٩٨٨دا، لە "مارتا وینیارد"ەوە بە پەلە، لە حاڵێکا کە دوعای بـەخێری ڕۆژنامەکەم, واشینگتۆن‌پۆست, بەسـەرمەوە بـوو, چـووبوومە سـنووری تورکیـا هـەتا

دەربارەی بارودوخێ تاڵوتوونی دەربازبوانی شالاّوە شیمیاییەکانی ئێراقەوە راپۆتـان بنووسم. ئێستا سەرنووسەری رۆژنامە سەرەرای ئەوەی بێوچان تینم بۆ دێنـا و دنـەم دەدا کـە وا باشـترە راپـۆرتی تـازە لەمـەر نیـشانەی ئاشـکرا و روو لـە زیـادبوونی ئامانـجەکانی ئێراقەوە ئامادە بکەین, کەمترین مەیل و سەرنـجێکی نەدەنوانـد. لەمـەش خراپتر ئەمەبوو کە وا دیار بوو دەوڵەتی کلینتۆنیش مەیل و سەرنـجێکی نەدەدایە سەر ئەم مەترسییەی کە هەرەشەی لە "هەولێر"ی پایتەختی غەیرەرەسـمی کوردەکانی ئێراق دەکرد کە هەر وا بیست کیلۆمتیرێك لە ناوەندی مۆڵگـەی هێزەکـانی ئێراقـەوە دوور بوو. دەوڵەتی کلینتۆن بە دڵنیایییەوە سوور بوو لەسەر ئەمـە کـە دۆزەکـەی — هـەر وەك جارانی پێشوو کە باسی هەرەشەی ئێراق هاتبووە گۆر و بە پـووچ دەرچـووبوو — لە ژێر چاوەدێری دایە. واشینگتۆن دیار بوو لای وایە کە سـەددام حوسـێنی بـە زلـلـە تەزیو, قەت ناخوازێ کە مامەڵەی "نـەوت بـە خـۆراك" کـە بـە کوێرەوەرییـەکی زۆر سەری گرتبوو و بە گوێرەی ئەو دەیتوانی لە ماوەی چەند حەوتەی داهاتوودا، بە هـەر شەش مانگان بایی دومیلیارد دۆلار نەوت بفرۆشێ, بـخاتە مەترسی.

مەبەست و ئامانـجە راستەقینەکانی واشینگتۆن هەرچییەك بـوو کارناسـان بروایـان وابوو کە دەوڵەتی ئەیالـەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا تـەمای گرتبـوو ئـەم مەترسـییە هەڵزەقاوە بێنێتە سەرشانی و لە سەردەمانی چالاکـی هەڵبـژاردنی سەرکۆمـاریتیدا دەس نەبزێوێ. بەلاّم لـە روانگـەی دەوڵەتـەوە کـارێکی ئـەوتۆش نـەدەکرا. ژمـارەی دەورگێرانی سەر شانۆ پتر لە رادەی پێویست بوو: ئێران, سووریا, تورکیـا, راپـەریوانی کوردی تورکیا, سەددام حوسێن و سەرۆکی دوو حیزبی بەشـەرهاتووی کـورد... جـا ئەم پۆلەش بە کەس رانەدەوەستان, ئەویش بە دانانی خەرجوبـــەرجێکی کەمـــەوە. دەستێوەردان بە دژی سەددام حوسێن و لاگیری هەرکام لە لایەنە کوردەکـان, شـتێك بوو کە سەرکەوتنی وێرا نەبوو: یەکیان سەر بە ئێران و ئەویتر هاوپەیـمانی ئێراق بـوو. بە درێژایی ساڵی رابردوو دەوڵەتی ئەمریکا لە چەند کۆبوونەوانەدا کە لە کوردستان و ئیرلـەنـد پێکهـاتبوون هـەوڵی دابـوو بـارزانی و تاڵـەبانی پێکـەوە ئاشـت کاتـەوە و سەرنەکەوتبوو. پێشینەی ئەم دوژمنایەتی و ئینکەبەرییە خوێناوییـە دەگەرایـەوە سـالاّنی

دەیەی ١٩٦٠ و ئەم دووە سەرنجیان نەدەدایە ئەم مەبەستە کە پشتیوانیێتی ئەمریکا بە یەکایەتی هەردك بەرەوە بەسراوەتەوە. ئەم دووە یانی پارتی دێموکرات و یەکێتی نیشتمانی کوردستان, ڕاست یان هەڵە, بڕوایان وابوو کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم تێکۆشانە ئاشتیخوازانەدا شێلگیر نیە, چونکە ئەو چەند میلیۆن دۆلارە پێویستەی بۆ دابینکردنی ئەم هێزە نێوبژیوانەی هەردوولا ملیان بۆ ڕاکێشابوو, دابین نەکرد.

لە باتیان چوارهەزار کەس لە بشێوی و چنگەپڕژەی هاوینی ١٩٩٦دا تێداچوون؛ زۆربەی ئەمانە خەڵکی ئاسایی بوون و هەزاران کەسی تر لە ماوەی خولی پاش ئەوا کوژران. لاگیری کردنی کوردان لە ڕۆژاوا کە وەختایەکی گەرموگوڕ بوو, ڕۆمرکا و ئیتر هەنگاوی کوردەکانی ئێراق لە "ڕاڕەوەکانی دەسەڵات"دا باشی پێشوازی لێنەدەکرا. (جارێکیان بە بۆنەیەك دیپلۆماتێکی ئەمریکایی کە ئەندامی لیژنەیەك بوو کە وتوویژی لەگەڵ کوردان کردبوو و لە کەللەشەقی کوردان وەگیان هاتبوو, بە شێوەی پەنامەکی گوتبووی: "ئەگەر لە پێشدا نەمدەزانی کە کوردان بۆچی خاوەنی وڵاتێکی سەربەخۆ نین, ئێستا دەزانم بۆچی وایە.") تامەزرۆیی ئەمریکاش بە باری لەشکرکێشیدا لە باکووری ئێراق دامرکا. ڕێبەرانی دوو تاقمی دژبەر, کاردانەوە و بەهرەمەندیی "کۆنگرەی میللی ئێراق"یان فەوتاند: ئەم کۆنگرەیە ئۆپۆزیسیۆنێك بوو کە "سیا" بەخێوی دەکرد و بنکەی لە کوردستان و ئامانجی لابردنی سەددام حوسێن و دابین کردنی دێموکراسی بوو لە ئێراق.

وێڕای تەواوی ئەمانەش ئۆگرییە ناوچەییەکانی دژاودژی ئەمریکا وای حوکم دەکرد کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا – سەرەڕای ئەم خوتخوتانەی تووشی دەهات کە کورد و کۆسپەکانیان سەرلەبەر بەرەڵڵا بکا و لێیان بێتەوە – لانی کەم هەنتەشێکی لە باکووری ئێراق هەبێ. دڵپەرۆشی گەورە و گران دەگەڕاوە سەر تورکیا. لە ئاوریلی ١٩٩١ڕا بۆو لایە پارێزگاری لە کوردەکانی ئێراق – تەنانەت لە وەختی پێویستا لە بەرامبەر ڕێبەرانیاندا – ئەگەر تەنیا هەر لەبەر ئەم مەبەستەش بووبێ کە دیسان سەددام حوسێن میلیۆنان کورد نەتۆقێنێ و پەڕەوازەی سنووری تورکیایان

نەکا، خاوەن گرینگایەتێکی تایبەت بوو. بە هەر حاڵ ئەوە ئاشکرایە کە لەسەر داخوازی سەرۆك ئوزەل بوو کە سەرۆك بووش سەرەڕای ئەم گشتە خۆگنخاندنە ئاخرییەکەی کوردەکانی لە چیا و کوێستانان ڕزگار کرد. هەر پاش ئەمە بوو کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لێبڕا کە لەبۆشایی پێکهاتوو بە دامەزراندنەوەی سەرلەنوێی کوردان و بەهرە لێوەرگرتنی وەك بنکەیەکی پێشەنگ بۆ ڕێکخستنی ئۆپۆزیسیۆنی دژی سەددام کەڵك وەربگرێ. جا [خۆش ئەمەیە] یەکەم هەنگاو بۆ دابین کرانی بودجەی ئەم ئۆپۆزیسیۆنە هاوبەندەی لایەنگری دێموکراسییە (کە پاشان بە "کۆنگرەی میللی ئێراق" ناودێر کرا) نەك دەوڵەتی بێمەیلی بووش، بەڵکوو کۆنگرە لە ١٩٩١دا هەڵیهێنایەوە، کە لێبڕابوو سەری سەددام حوسێن بە گۆمێ داکا.

ئەم پشتیوانییە بەم بارەدا پارسەنگی ڕادەگیرا کە نەکا کارێکی وا بکرێ کە ترکانی لە ڕادەبەدەر دڵناسك کە بە هۆی ناکامی بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ لەگەڵ سەرهەڵداوانی نێوخۆی وڵاتا — کە تووشی دڕدۆنگییەکی ئەوتۆ ببوون کە تەنانەت مەیلەو "پارانۆیا" بوو — دڵیان بێشێ.

تورکیا — ئیتر با کارمان نەدابێ بەسەر ئێران و سووریا و خودی ئێراقەوە — هەمیشە لەوە توقیبوو کە نەکا ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بنەوە بەستێنی دامەزرانی وڵاتێکی کورد لە ئێراقا خۆش بکا. بە بۆچوونێکی تر ترکان هەم خودایان دەویست هەم خورما: نابێ هیچ کارێك لە باکووری ئێراق بکرێ کە بۆنی دامەزرانی وڵاتێکی کوردی لێوەبێ، بەڵام ڕۆژاوا بەتایبەت ئەمریکا دەبێ نەهێڵێ سنوورەکانی تووشی ئاڵۆزی ببنەوە: ئاڵۆزییەکی کە ڕەنگە سەددام حوسێن سازی بکا، سەددام حوسێنێکی کە کردەوەکانی پێشبینی ناکرێن. بەم شێوەیە سیاسەت و هەڵوێستی ڕۆژاوا وای لێهات کە کوردستانی ئێراق بە باری ئابووریدا بخاتە تەنگەژەوە؛ ئەم کارە ژانی تورکیای هێور کردەوە، بەڵام بوو بە هۆی تەنینەوەی بێکاری و پەرێشانییەکی بەربلاو لە باکووری ئێراق و نێوانگرژی بارزانی و تاڵەبانی تەشەنا پێکردەوە. لە ئابوورییەکی لاوازی بەرەو مەرگدا بە شانادانی کلاشینکۆفێك بوو بە هاسانترین ڕێگای دابین بوونی بژبو و بەڕێچوون.

سیاسەتی ئەمریکا لە بەرەورووی بوونەوە لەگەڵ بۆشایی دەسەڵات لە باکووری ئێراق بۆ بەربەرەکانی لەتەك تەواوی ئەم بەرژەوەندییە دژاودژانە هەتا ئاستی کەمترین خاڵی هاوبەش دابەزی [کە بریتی بوون لە]: پێکهێنانی هاوسەنگی لە نێوان ئەم تاقمە کوردانەی لێك دوور دەکەوتنەوە، ڕاگرتنی ترکان لەسەر شانۆ و ڕاگیرکردنی کۆنگرەی میللی ئێراق وەك ناوەندی مەکۆیەکی دژی سەددام حوسێن. ئەم سیاسەتە بە مانۆڕەکانی ئێران – نێوەنێوەش هی سووریا – تینی بۆ هات. بەڵێ وەوتۆ بوو بێ‌تەمایی و دڵاودڵییەکی بۆ واشینگتۆن بە میرات بەجێ ما، [ئەویش] ئەو کاتەی کە دەوڵەتی بووش لە ١٩٩١دا قامکی نا بە دوگمەی کۆتایی شەڕەوە و کارەکەی یەکسەرە نەکرد. پاش ئەوەی کە چەتری پاراستنی ئاسمانیی ئەمریکا کۆکرایەوە, ئیتر بەڕێوە بردنی ئەم گەڵاڵەیەی کە "سیا" بۆ کەلك وەرگرتن لە کوردان بە مەبەستی وەڕێخستنی شۆڕشی دژی سەددام لە سپای ئێراقا لە مارسی ١٩٩٥ وەبەر چاوی گرتبوو، دژوار بوو. بارزانی کە ئێستا لەگەڵ تاڵەبانی دەستەویەخە ببوو، بە مەسەلەکەی زانی و لە ئاخرین پشوودا خۆی کەنار دا. ئەم هەڵکەوتە پارتی دێموکراتی کوردستان و "کۆنگرەی میللی ئێراق"ی لێك‌ترازاند و نێوانناخۆشیی مابەینی دوو ڕێبەری کوردی زیاتر کرد. هیچ سەیر نیە ئەگەر لە وەها هەلومەرجێك‌دا ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناچار بوو بە ئاگربەسێکی قرچۆك دڵخۆش بێ کە دیپلۆماتەکانی هەر ئەو هاوینە لە ئیرلەند پێکیانهێنابوو. (ئەم پێکهاتنە قەتی خۆ ڕانەگرت، بەشێکی لەبەر نەبوونی نیازپاکی لە دڵی ڕێبەرانی کوردا و بەشێکی تریشی بە هۆی نەبوونی ئەو دوو میلیۆن دۆلارە بوو کە دەبوایە بۆ دابین‌کرانی چارەسەرێکی بەردەوام درابایە کوردانی بێ‌لایەن و تەواوی هێزەکانی دژبەری حکوومەت. بە کوتەی هێندێکان ئەم نەبوونی پووڵە ئاکامی شەڕ و هەڵلایەك بوو کە لەسەر بودجە لە کۆنگرەدا لە گۆڕێدا بوو و کۆماریخوازان تێی‌دا خاوەن دەسەڵات بوون و بڕێکیان تین بۆ دەوڵەتی فێدراڵ هێنا. تاقمێکیش لایان وابوو کە واشینگتۆن لەسەر ئەم بڕوایە بوو کە دەبوایە خودی کوردان ئەم پووڵە پەیدا بکەن و لانی کەم پێشەکی نیوەی بدەن.)

چارەسەری کێشەکە لە قساندا زۆر سادە و ساکار بوو، ئەگەرچی وەك هەمیشەش جێی دڵنیایی نەبوو: تاڵەبانی دەس لە دەسەڵاتی بەسەر هەولێرا هەڵدەگرێ و ئیزنی دەوڵەت و پارلەمانی کورد دەدا سەرلەنوێ بکەونەوە گەڕ؛ لە بەرامبەردا بارزانیش لەو "بارانە" زۆر و زەوەندەی کە لە فرۆشی بە قاچاخیی سووتەمەنی دزێلی ئێراق بە تورکیا گیری دەکەوت، دانی بەشی یەکێتی نیشتمانی دەس پێدەکاتەوە. بە گوێرەی ئەم ڕێ و شوێنانە پشتبەستنی ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژ زیاتری تاڵەبانی بۆ سات و سەودا و هاتوچۆ لەگەڵ ئێران کە بە هێنانە ژێر ڕکیفی تەنیا ڕێگای گەیشتنە تورکیا لە لایەن بارزانییەوە، هەلومەرجی جوغرافیایی بەسەریدا سەپاندبوو، ئەگەر بە تەواویش خاشەبڕ نەبێ بە ڕادەیەکی زۆر دادەبەزێ. بەمجۆرە دۆخی جاران دەگەڕێتەوە.

واشینگتۆن کەوتە داوێك کە دەکرێ بە سیاسەتی "پارێز" ناودێر بکرێ و ئەویش شتێکە کە هەمیشە درەنگ یان زوو لێکهەڵدەوەشێ. تەنیا لە نێوەڕاستەکانی ئووتی ١٩٩٦دا بوو کە دەوڵەتی کلینتۆن دژکردەوەی بە ئاشکرای نواند و ئەمەش وەختایەك بوو کە لە ماوەی پتر لە ساڵێکا بۆ یەکەم جار شەڕێکی قورس لە نێوان پارتی دێموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانا هەڵگیرسا و دەوڵەتی کلینتۆن تەماشای کرد ئەوە خەریکە [دەبێتە پاشاگەردانی و] جڵەوی کاران لە دەس دەردەچێ. لە ٢٧ی ئووتا، ڕابێرت ئێچ، پێلترۆ، جێگری وەزارەتی دەرەوە بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك، تەلەفۆنی بۆ هەردك ڕێبەری کورد کرد و بە مەبەستی کۆششێکی تر بە لانی ئاشتی و پێکەوە سازاندا ڕەزامەندی وەرگرتن: بۆ بنی مانگێ قەراری چاوپێکەوتنێك لە لەندەن داندرا. بەڵام ئەم وەختە زۆر درەنگ بوو و بۆ سبەینێ شەڕ دەستی پێکردەوە. ئێستا تەواوی گەلاڵەی لەرۆزك و نەبەگەی پاراستنی کوردان خەریکبوو لێکهەڵدەوەشا. دەوڵەتی کلینتۆن بۆ تێگەیشتنی ڕادەی ڕق و دڕدۆنگی دوولایەنەی ڕێبەرانی کورد سەبارەت بە یەکتر تێما و ئەم ڕق و دوژمنایەتییە گەیبۆ پلە و شوێنێك کە ئیتر گەڕانەوەی لێوە نەدەکرا.

گەمارۆیەکی ئابووری کە دەوڵەتی بەغدا و خودی ڕۆژاوا بەسەر کوردستانیاندا سەپاندبوو — هەروا بێتەوە دەسدرێژی و شالاوی گەورە و بچووکی ئێران و تورکیا بۆ

سەر باکووری ئێراق – خودی بیرۆکەی "ناوچەی هێور"ی بۆ کوردان لــە واتــا و مانــا بێبەری کردبوو: ئەم بیرە داهێنانی "هاوپەیـمانان" بوو، کــە بــە پاڵپــشتی ئــەو بکرایــە پەناخوزان بۆ شۆڕبوونەوە و هاتنەخوار لـە چیا و چۆلان دنە درابان و لـە زەختی تورکیا سەبارەت بە پەنا دانیان کەم کرابایەوە. لـە وەها بارودۆخێکدا خزینی پەنامەکی بــەرەو سەربەستی، کە بیرۆکەیەك بوو جاروبارە دۆخی ناسـائایی بـاکووری ئێراقـی پێوەسـپ دەکرا، کاڵ بۆوە. هەم بارزانی و هەم تاڵەبانی، هــەردك بــە خۆیــان سەلــماندبوو کــە خودی "مانەوە"یان لـە مەترسیدایە و هەردووکیان ڕوویان کــردەوە ئــەو داوە کۆنــەی نەریتی کوردی: پاڵوێـدان وە ولاٌتـانی ئینکەبــەر. وتوویێــژە نامبارەکەکــەی بــارزانی لـەگەڵ سەددام حوسێن و وتوویێژەکانی تاڵـەبانی لـەگەڵ ئێران لـە ژوەنی هەمان ساڵدا دەستی پێکردبوو.

ئاخرین زەنگی مەترسیی بە دەسدرێژی سێ ڕۆژانەی پاسدارانی شۆڕشــی ئێــران بــۆ قوولایی کوردستانی ئێراق وەجرینگە هات. بــە گوتــەی پــارتی دێمــوکراتی (بــارزانی) ژمارەی ئەم پاسدارانە دوو هــەزار کــەس بــوون؛ ئامانــجی ڕواڵــەتی ئــەوان "بنکــە"ی پێــشمەرگەکانی حیزبــی دێمــوکراتی کوردســتانی ئێــران لــە هەشــتا میلــی قــوولایی کوردستانی ئێراق، لـە نیزیك کۆیە بوو. ئەم پێشمەرگانە ئێستا زۆر بێدەســەلاٌت بــوون و لـە ماوەی چەند ساڵاندا ڕۆژ بە ڕۆژ پتر لـەســەر سـنوورەوە ڕادرابــوون و ئــیتر وەك هەڕەشەیەك بۆسەر ئێــران نەدەهاتنــە ژمــار، کــە وابــێ مەبەســتی ئێــران لــەم پــەلامارە بێگومان شتێکی تر بوو. بارزانی لێی سوور بــوو کــە ئــەم هێــزە بــەم مەبەســتە چــۆتە کوردستان کە چەکی قورس بداتە دەس تاڵــەبانی. بــا لــە بــیری نەبەینــەوە کــە چــەند مانگێك بوو تاڵـەبانی شاتەشاتی دەکرد کە ڕاپــەڕینێك دژی پــارتی دێمــوکراتی بــارزانی بەڕێوەیــە و پ.ك.ك. یارمــەتی دەدا. بــەلاٌم ئــەم دەســدرێژییە ئــازادیی کــردەوە و جوولانەوەی ئێرانیشی لـە باکووری ئێــراق دەرخــست: تورکیــا و "پ.ك.ك"ش – کــە ئامانــجی وی بوون – لـەمێژ ساڵ بوو کە لـەم هەرێمەدا بە ئازادی هاتوچۆیان دەکرد. لـەمە گرینگتر، ئەم شالاٌوە پووچ بوونی ئیدیعاکانی دەوڵـەتی ئەمریکای لـەسەر بــەڕێوە بردنی سیاسەتی "هەوساری دوو لایەنە" کە قەرار وابوو بە گوێرەی وی ئێراق و ئێــران

هەردك ڕادرێنە سووچ و كەناران، بە ئاشكرا نیشان دا. بارزانی داخوازی كرد كە هەروەك لە وتوویژەكانی "ئیرلەند"دا قەرار كرابوو ئەمریكا دەسدرێژیكار دیاری بكا و بیناسێنێ؛ كەچی واشینگتۆن تەواو متەقی لە خۆی بڕی.

وا بەم شێوەیە بەستێن بۆ گرتنی سەیروسەمەرەترین تەما لە مێژووی كوردا ئامادە كرا. لە حاڵێكا كە ئەم مێژووە پڕە لەو شتانەی كە بە ڕواڵەت لەگەڵ مەنتیق نایەنەوە و وەك كایەی ئەسكەملە دەچن. تاڵەبانی كە لێی سوور بۆوە ئێران بەگەرمە پشتیوانی لێدەكا، شووی لێ‌هەڵكێشا و وەك زۆرێك لە ڕۆژگارانی ڕابردوو "زیرەكایەتی" لە تام بردەدەر. ئیدی گوێی بۆ ڕاسپاردەكانی دەرەوە كلۆر نەدەكرد. ئێران بە ئاشكرا دەست و دەسەڵاتی وەچنگ هێنابوو. تاڵەبانی بە چەند پات كردنەوەی ئەم قسەیە كە بارزانی تەنیا لە بنكەی سەرچیای [سەریڕەش] ڕا لە سەلاحەددین و لە گەروولەی لوولەی دووربینەوە دەتوانێ هەولێر بەدی كا و دەستی وێ‌ڕابگا، تانە و توانجی گرتە خەنیمەكەی.

وەختایەك تاڵەبانی لە ۱۷ی ئووتا بە هاوبەشیی ئێران دەستی دایە پەلامارێكی بەربڵاو، ئەم شاڵاوە هاوكات بوو لەگەڵ پەنجاهەمین ساڵهاتی دامەزرانی پارتی دێموكراتی كوردستان و پەنجاهەمین ساڵوەگەڕی لە دایك بوونی خودی مەسعوود بارزانی. پارتی دێموكراتی كوردستان زۆر جاران ئێرانی تاوانبار كرد كە پشتیوانی لە یەكێتی نیشتمانی دەكا و بە زەبری تۆپخانە و باڵەفڕ یاریدەی هێزەكانی دەكا و داوای لە ئەمریكا كرد كە ئێران و تاڵەبانی مەحكووم بكا. هەڵبەت كوردان لێیان ڕوون بوو كە ئێران لە گێرە و كێشەكانی پێشوودا – لە مابەینی یەكێتی نیشتمانی و پارتی دێموكراتا – ڕاست ئەم یارمەتییانەشی بە بارزانی كردبوو و هەر بە پێی نەریتی كۆن پارتی دێموكراتی كوردستان لە دەستەبەندییەكانی كوردستانی ئێراقا، حیزب و تاقمی بەر سەرنجی ئێران بوو.

لە حەوتەی كۆتایی مانگی ئووتا، ئەو دەمەی كە پێلترۆ ئامادە دەبوو هەتا لە لەندەن چاوی بە هەرتك ڕێكخراوە كوردێكە بكەوێ؛ بڵاوكراوەیەكی سەر بە پارتی دێموكرات دیسان كەوتە پاڕانەوە لەبەر وەزارەتی دەرەوە و شووڕای تەناهی نەتەوەیی

ئەمریکا و "سیا" و هەرکەسێکی تر کە لە واشینگتۆن گوێڕایەڵی ئەم مەبەستە بێ و داوای کرد کە " وریا کردنەوەی ڕوون و ئاشکرا دژی دەستێوەردانەکانی ئێران " بەرەورووی ئەم وڵاتە بکەنەوە. ئەم بلاڤۆکە داوای دەکرد کە دەوڵەتی ئەمریکا "لەم بابەتەوە ورياییش بداتە ئێراق." ئەمەش فەرتەنەیەکی سەیر بوو، چونکە هەرچی بێ تاڵەبانی بەم زوانە لە بابەت دەس تێکەڵ کردن و پێکهاتنی بارزانی و سەددام حوسێن چەند جاران وريایی دابوو. بابەتەکانی ئەم بلاڤۆکەی پارتی دێموکراتی کوردستان شوێنێکی بەتاڵی ئەوتۆی لە خەیاڵا نەدەهێشتەوە. بلاڤۆکەکە دەیگوت کە گردبوونەوەی هێزەکانی ئێراقی نیشاندەری ئەمەیە کە ئێراقییەکان "خۆیان دە دەسك دەنێن هەتا بە بیانووی بەرپەرچدانەوەی ئێران حوکم و دەسەڵاتی خۆیان لە باکوورا سەقامگیر کەنەوە." پارتی دێموکراتی کوردستان بە وردبوونەوە لەم مەبەستە کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وڵاتانی دراوسێی ئێراق تەنانەت حازر نین دەس بەرن بۆ کردەیەکی سیاسیش زەنگی وریا بوونەوەی لێدەدا: "تەنیا ڕێ چارەیەکی ماوەتەوە، گەڕانەوەی ئێراقییەکانە بۆ باکوور کە زۆر تامەزرۆن دەسەڵاتی ئێران بشکێننەوە. بێتوو هەڵکەوتێکی ئەوتۆ ڕووبدا پارتی دێموکراتی کوردستان بەرەگەیان لێناگرێ." خودی بارزانی هەر ئەو هەفتەیە لە وتووێژێکی تەلەفۆنیدا هەوڵی دا بە پێلتزۆ بسەلمێنێ کە "ئەم شەڕە کێشەیەکی کوردی نیە کە بکرێ خۆی لێ کەنار بدرێ، بەڵکوو شاڵاو و دەسدرێژی ئێرانییەکانە." گوتی: "من خۆم پێ لە ئاست ئەم تەوژمە ڕاناگیرێ. ئەگەر ئێوە دەستێك نەبزێون, ڕەنگە من داوای یارمەتی لە ئێراقییەکان بکەم."

بەڵام ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هێشتاش هەروا لێبڕا بوو کە لەم گێرە و کێشەیەدا لاگیری هیچیان نەکا؛ لەگەڵ تێکشکان و داگیرکرانی مەتەریزەکانی پارتی دێموکراتی کوردستان لە شانبەشانی جادەی بارناسکی نیزامیی هامیلتۆن, ئەویش لە سایەی سەری تۆپخانەی ئێران بۆ پشتیوانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان. بارزانی لێی سوور بۆوە کە هێزەکانی بەرەورووی مەترسی تەفروتونا بوونن, مەگین خۆ بداتە کارێك کە ڕاوێژکارانی نیزیکی بە "مامەڵە لەگەڵ شەیتان"یان ناودێر کرد. بارزانی

ئێستا كوژرانی سێ برا و پتر لە هەشتهەزار بارزانی و دەیان هەزار كوردی تری بە دەست سەددام حوسێن لە بیر بردەوە و بۆ وەدەرنانی یەكێتی نیشتمانی لە هەولێر داوای یارمەتی لێكرد. ئەو بلاڤۆكەی سەر بە پارتی دێموكراتی كوردستان كە باسمان كرد لە باشترین حاڵەتا هێندێكی خەوش‌وخاڵ تێكەڵ‌كردبوو: پارتی دێموكراتی كوردستان نە تەنیا بەری هێرشی "ئێراقییەكانی نەگرت" بەڵكوو وەك دواتر ئێراقییەكان ئاشكرایان كرد, هەر زۆر پێشتر, یانی لە ٢٢ی ئووتا داوای یارمەتی سەربازی لە سەددام حوسێن كردبوو... ئاشكرا بوونی ئەم نەهێنییە زۆری بارزانی پەرۆش كرد.

لانی‌كەم ئەمە شتێك بوو كە "تارق عەزیز", جێگری سەرۆك وەزیری ئێراق بە شێوەیەكی زیرەكانە لە قاوی دا. ئەو گوتی كە بارزانی لەو رۆژەدا (٢٢ی ئووت) نامەیەكی بە سەردێری "جەناب"ەوە بۆ سەددام حوسێن نارد و تێیدا پاڕایەوە كە "بێتە مەیدان و بە مەبەستی ڕادانی مەترسی دەرەكی یاریدەیان بدا." مەبەست لە مەترسی دەرەكی ئێران بوو. ئەم مەبەستە بە لای زۆربەی كوردانی ئێراقەوە ڕوون نەبوو كە بارزانی و "مەكۆی تایبەتی خۆی " هەتا كۆی كاردانەوەی كردەكەیان لێكدابۆوە و یان بە وردی چ وەختایەك گەیشتبوونە ئەم تەما بێ‌فەڕە. ئەوەی ڕوون بوو ئەمە بوو كە پارتی دێموكراتی كوردستان بە ئاشكرا گاڵتەی بە پێلترۆ كرد, ئەوی ڕاكێشایە لەندەن و لە كۆبوونەوەی ٣ی ئووتا بەشداری كرد و بە فێڵ و تەڵەكە و دووڕوویی قەراروبڕی چاوپێكەوتنێكی بۆ رۆژی دواتر لەگەڵا دانا, لە حاڵێكا وا داندرابوو كە پەلامار دانی هەولێر هەر ئەو ڕۆژە دەس پێبكا. بەڵام تەنانەت ئەگەر بڵێین كە واشینگتۆن هورمی بە وریایی‌دانەكانی پارتی دێموكراتی كوردستان نەكردووە, دەوڵەتی ئەمریكا بە گوێرەی ئەو وێنانەی لە ئاسمانەوە و لە ڕێی مانگە دەسكردەكانەوە لە بابەت خڕبوونەوەی هێزەكانی ئێراق دەگەیشتە دەستی, ناتوانێ لەم بارەوە هیچ بیانوویەك بێنێتەوە.

بۆ حاڵی بوون لەم سەمەدانەی پارتی دێموكراتی كوردستانیان بۆ ئەم كارە پاڵ پێوەنا, ڕەنگە ساكارترین وڵام ئەمە بێ كە بڵێین بارزانی ئەوەندەی ڕقی لە تاڵەبانی بوو, قەت هێندە لە سەددام حوسێن نەدەترسا یان بە گوێرەی كەونە دابی

ڕۆژهەلاتی‌نێوەڕاست کێشەکەی ئاوا دەبینی کە "دوژمنی دوژمنم دۆستی منە." بەلام ئەم تەمایەی بارزانی هەڵگری شتێکی پڕ لەمە بوو, چونکە هەرچۆنێك بێ هاوکاری لەگەڵ خراپترین و خۆفناکترین دوژمنی کوردان لە سەدەی بیستەما پەڵەیەکی پڕ شەرمەزاری سەیری خستە سەر دوایێی. بەلام تەواوی پاژە تاڵ و ناخۆشەکانی ئەم کورتە مێژوویەش گرینگ بوون: مەسعوود بارزانی قەت خەیانەتی‌کی‌سینجێری لە ١٩٧٥دا لە بیر نەبردبۆوە؛ قەت بە شێوەیەکی تەواو لە ژێر کاردانەوەی سووکایەتی پێکرانی سالانی دوورخرانەوەی بە زۆرەملی کە ئەو لەم بابەتەوە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای بە تاوانبار دەزانی, وەخۆی نەهاتبۆوە. ئەو بێ‌گومان لەو مەبەستە لێلانەی کە لە ساڵی ١٩٩١دا کوردانیان ڕزگار کردبوو, حاڵی ببوو. لەو دەمەی‌ڕا قەت لە بابەت سوور و پتەو بوونی ئەمریکاییەکان لەسەر قسەی خۆیان, سەرەڕای بەڵێنی لێکدالێکدای بالادەستانی ئەمریکایی, لە "برێنت ئیسکووکرافت" و "جیمز بێیکێر"ەوە لە دەوڵەتی بووشا بگرە هەتا "ئاڵ‌گۆر" جێگری کلینتۆن و "ئانتۆنی لیك" ڕاوێژکاری تەناهی نەتەوەیی, دڵپەرۆشی وەلا نەنا. وەك دەڵێن هێندێك لەم بەڵێنییانە بە نووسراوەشن.

ئیسکووکرافت کە ئێستا خانەنشینە بەم مەبەستانەی کە بەلای ڕۆژنامانەوە درکاندی ئەم دوودڵییانەی بە شێوەیەکی سەیر بەهێزکرد: "ئێمە دەمانزانی کە ئەم ئامانجە جوانەی قوتار بوون لە گۆڵمەزی سەددام حوسێن پرس و کۆسپەکان چارەسەر ناکا یان تەنانەت وەك پێویست ئارمانجەکانیشمان وەدی ناهێنێ. کەوایە بە ناچاری ڕێ‌چارەیەکی نەشیاوی ترمان هەڵبژارد کە زۆر جاران تەنیا ڕێگای بەردەستانە." لە درێژەدا بۆ پاساوی قسەکانی خۆی گوتی: "ئەگەر درێژەمان بە شەڕ دابایە و سەددامەمان لێخستبایە, ڕەنگە ئەمڕۆ وەزعمان لە هی ئەمڕۆ خراپتر بوایە." چونکە ئەم ڕووداوە "بۆشایی‌یەکی دەسەلاتی لە کەنداوی فارسا بەدی دێنا, کە ئێران پڕی دەکردەوە" و ئێمەی ناچار دەکرد کە هێزەکانی ئەمریکایی بۆ دەس بەسەر داگرتنی ناوچە بۆ ماوەیەکی نادیار لە وێندرێ سەقامگیر کەین.

لەم نێوەشدا بارزانی لێبــڕابوو کــە تــازە ڕوو نەکاتــەوە تاراوگــە. دەنگدانــەوەی وتەکانی کە لەو تاران و ڕەوینەی ڕۆژی یەکشەمـــــەی جێـــژنی "پـــاک"ی ١٩٩١دا بەرەوڕووی جەماوەرەکەی کــردی و هــانی دان کــە نــەتۆقن و "ڕا نەکــەن و چەشــنی ئەرمەنییان سەر وەبەر پەناخوازیی نەهێنن" هێشتا لە گوێمدا دەزرینگێتــەوە. هــەر ئــەم مەیلی مانەوەیەی لە ئیراقا, بە هــەر نرخێــك, یارمــەتی شــی کردنــەوەی خــۆڕاگری و هەوڵەکانی بۆ وتوویژ لەگەڵ سەددام حوسێن هــەتا ژانویــەی ١٩٩٢, دەدا, کەچــی هەر ئەو کاتی لێــی ڕوون بــۆوە کــە هــیچ هیوایــەك لــە گــۆڕێدا نیــە. وەهــا بەڵگــە هێنانەوەیەك قەت "باوەڕ پێکراویی نەتەوەیی" ئەوی تووشی خەســار نــەکرد, هــەر لــەو ژانویەی ١٩٩١دا, هەر لەو بنکە کوێستانییەی خۆیا پێی گوتبــووم کــە کــوردان بــە هەموو حیسابێك هەقیانە خاوەنی وڵاتێکی سەربەخۆ بن؛ هەڵبــەت دیــارە دەیزانــی کــە سرشتی سەرکوتکەرانەی وڵاتانی دەروجیران ئەوتۆ نیە کە گەیشتنە ئەم ئامانــجە بــەرزە هەتا تێپەڕ بوونی سەدەیەکی تر ئیتر ڕێی وەدیهاتنی بۆ خۆش بکرێ.

ئەو بــۆ ماوەیــەکی کــورت دوودڵــی خــۆی ســەبارەت بــە ســەمەدەکانی ئــەمریکا قەیتەرقوو کرد: لە ژانویەی ١٩٩٢دا کاتی سەردانی بۆ واشینگتۆن بەوپەڕی نیازپــاکی گەلاڵەی ئەمریکای بۆ کەڵك وەرگرتنی لە "کــۆنگرەی میللــی ئێــراق" بــە مەبەســتی ڕووخاندنی حکوومەتی سەددام حوســێن سەلــماند. بــەڵام سەرســەختی ئــەمریکا لــە کومیتەی گەمارۆکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دا, ئەو دەمەی کە خــۆی لــە ئەنــجام دانی هەر چەشــنە یارمەتییــەکی دابینــی ژیــانی کــوردان پاراســت, زۆر بێــزرا. چونکە کوردان لە لایەکەوە بەرەوڕووی کــوێرەوەری گــەمارۆی ڕێکخــراوی نەتــەوە یەکگرتووەکان ببوونەوە و لە لایەکی تــرەوە گــەمارۆی ئــابووری ســەددام حوســێنیان بەسەردا سەپابوو. پرسەکانی ئابووریش ئەوەندەی دیکە نێوانی لەگەڵ بــارزانی گرژتــر کرد. مانەوەی سەددام حوسێن لەسەر تەختی دەسەڵات تەنیا سووچ و تــاوانی بــارزانی نەبوو: ئەگەر لە جەنگەی گێرە و کێشەیدا لەگەڵ تاڵــەبانی و لــە مەترســی خــستنی دژبەرانی حکوومەت بەشە تاوانێکی دەگەڕاوە ئەســتۆی, ئــەویش هــەقی بــە دەس بــوو لەبەر خۆیەوە وا بیر بکاتەوە کە داخوا ئاکامی کارەکە "بە شێوەی پەنامەکی" بــە دڵــی

واشینگتۆن نەبوو؟ لە خولی چەند ساڵاندا وێڕای گەشە کردنی ئیسلامی بنیاتخواز لە عەرەبستانی سعوودی و وڵاتانیتری هاوپەیمانی واشینگتۆن, مەیل و تاسەی ئەمریکا بۆ خاشەبڕ کردنی سەددام حوسێن وا دیار بوو لە کزی دابوو. ئەمریکاییەکان ڕەنگە کەمتر لەوەی خۆیان دەیاننواند, لەم بوارەدا شێلگیر بوون.

وەختایەك ئاوا بوو داخوا کایەی واشینگتۆن دووپاتی هەمان کایەی کیسینجێر نەبوو؟ یانی بەهرە وەرگرتن لە کوردان بۆ لاواز کردن بەڵام نەك ڕووخاندنی دەوڵەتی بەغدا؟! بارزانی هەر تەنیا کوردێك نەبوو کە لە خۆی بپرسێ ئەرێ مانای "هەوساری دوولایەنە" چما هەر ئەمە نەبوو؟ هەرچۆنێك بوو, یەکێك لە دیپلۆماتە پایەبەرزەکانی ئەمریکا پێیگوتم کە تەنگەژەی بنەڕەتی کوردەکانی ئێراق سەددام حوسێن نیە, بەڵکوو ئەو ژێنێراڵە "سوننییە چاکەیە" کە ڕەنگە جێی بگرێتەوە. پاشان پرسی: "تۆ لات وایە چ دەقەومێ وەختایەك کۆمەڵی نەتەوەکان وەها کەسێك وەك "توماس جێفرسۆن"ێکی نوێ پەسن بدا و ئەو تەما بگرێ کە دەسەڵاتدارێتی ئێراق بەسەر تەواوی وڵاتا بسەپێنێتەوە؟ ڕەنگە کۆنگرە و دەوڵەت بەرەورووی تەماگەلی دژوار ببنەوە!؟"

ئەگەر ئەمریکاییەکان, هاوپەیمانە ڕۆژاواییەکانیان, کوردان و ئۆپۆزیسیۆن, تووشی کۆمەڵێك نیگەرانی وەها بڕستبڕ بوون, سەددام حوسێن تووش نەبوو. مامەڵەی "فرۆشی نەوت بە خۆراك" وە دوا خرا – ئەویش وەك دیمان هەتا مانگی دێسامبر – بەڵام ئەم کارە خەساری دەگەیاندە جەماوەری ئێراق و کاری نەدابوو بەسەر فەرمانڕەوا و بنەماڵەکەی و گاردی کۆماریی بە ناز پەروەردە کراوی یان دەزگاکانی پاراستن و ئاساییش کە خۆی و حکوومەتەکەیان لەسەر دەسەڵات ڕاگرتبوون. وەختایەك سەرەنجام تەمای گرت کە لە بەرەبەری ساتەکانی تاوهەڵاتی ڕۆژی شەممۆ, ٣١ی ئووت دەس بەکار بێ, بە لێبڕاویی تایبەت بە خۆی وەهای کرد. سەددام حوسێن لە خۆنواندنێکی دەسەڵاتا, هێزێکی گەورەی بریتی لە ٣٠٠ تۆپ, پتر لە ٣٥٠ تانك و سیچل هەزار جەیشێکی کە زۆربەیان گاردی کۆماری بوون, هێنانە مەیدان. ئەم قومارە ئاکامی بە دەستەوە دا: سەرەڕای ناوچەی "دژەفڕین" لە جەغزی

هێڵــی ٣٦دا, فرۆكــەكانی هاوپەیــمانان خۆیــان تێهەڵنەقوتانــد. چــەند ڕۆژ دوای وی وەزیری بەرگری, "ویلیام پێری", بۆ پاساو هێنانەوە لەسەر تەمای دەوڵــەت, كێــشە و ڕووداوەكانی بە "شەڕی نێوخۆی كوردان" لە قەڵەم دا و سەرۆك كلینتۆن بە دەربڕینی ئەم گوتەیە كە توانایییەكانی ئەیالەتە یــەكگرتووەكانی ئــەمریكا بــۆ ڕاگــرتن و پــەرچ دانەوەی ڕووداوەكانی ئێراق "سنووردار"ە ڕیسوگوریــسی بــۆ كــرد كەوتنــەوە و خــۆ تێوەنەدانی ئەمریكا هێنایەوە. دەوڵەتی كلینتۆن لانیكەم خــۆی بــەم بــیرەوە دڵخۆشــی داوە كە سیاسەتی دەس لەسەر دانان لە كوردستانا, لایكــەم ئــەم ئاكامــەی لێكەوتەوە كە دەسەڵاتی ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەگر و سەرودڵگری ئێرانی لە باكووری ئێراق كۆتایی پێهێنا. بەڵام ئەم دامركانەش بەكاتی و خۆنەگر دەرچوو.

سەددام حوسێن هەتا ئێوارەی یەكەم ڕۆژی شــاڵاوەكە بــێگرێ و بــە بــێ خــۆ لــە شەڕوەردانێكی ئەوتۆ, ئامانــجە گەورەكانی خۆی وە دەس هێنابوو: ئاڵای ئێراق لەسەر بانی بینای پارلەمان و دەوڵــەتی هــەرێم و دەزگــای ڕادیــۆ و تەلــەفیزیۆن لــە هــەولێر شەكایەوە. پارتی دێموكراتی كوردستانی بــارزانی بــە پــشتیوانی ئاگربــارانی هێزەكــانی ئێراقــی دەســتی دایــە پــەلامار و هێزەكــانی سووكەڵەچــەكی یــەكێتی نیــشتمانی كــە بەرەنگارییەكی ئەوتۆیان نەنواند, لەبەر یەك بڵاو كرد. سپای دووبارە ژیاوەی ســەددام حوسێن و پۆلیسی نهێنیشی هەوڵ و تەقەلای خۆیــان خــستە ســەر ئامانــجە گــەورە و گرینگەكان: تێكەوەپێچانی دژبەرانی ئێراق كە "سیا" خەرجوبــەرجی دابــین دەكــرد و بریتی بوو لە عەرەبەكانی شیعە مەزەب وئاشۆری و توركمان و تاقمەكانی تــر. بنكــەی ئەم دژبەرانە لە لای گەڕەكی مەسیحینــشینی "عــەنكاوە"ی هــەولێر بــوو. "ســیا" لــە جەنگەی خۆیدا دەسو پێوەندەكانی لەوێ ڕاگوێست, بەڵام ئامرازە ئەلەكترونیكییە بە نرخ و پڕ پێچەڵفلۆوچەكانی بە پەروەندەكانی تایبەت بە ئۆپۆزیسیۆنەوە بەجێهێشت.

ئەو كوردانەش كە لە دەزگا و دامەزراوەكانی ئەمریكاییدا لــە هــەولێر كاریــان دەكرد تووشی چەرمەسەری بوون. لەمێژ بوو كە ئەمریكا بەڵێنی ڕاگوێزتنی ئەم تاقمەی لە هەولێر دابوو, ئەم بەڵێنییانە بە پــووچ دەرچــوون. ســەدان كــەس لــە شــەڕكەرانی ئۆپۆزیسیۆن كە زۆریان ئەوان ئەفسەر و سەربازانە بوون كە ڕیزەكــانی ســپای ئێراقیــان

جێهێشتبوو و چووبوونە جەغزی دژبەرانــەوە, دەیــانزانی کــە نابــێ چــاوەڕوانی هــیچ چەشنە بەزەیی و دلۆڤانییەك بن لـە لایەن سەددام حوسـێنەوە,[بۆیــە] شــەڕیان کــرد و کوژران یان گیران و لەڕێوە گوللـەباران کران, یـام گـیران هـەتا لــە داهــاتوودا پــاش ئەشکەنـجەدران ئیعدام بکرێن. پۆلیسی نهێنی ئێراق کە جاری وابوو بەرگی کوردییــان لـەبەردابوو, لـە سـایەی زانیارییــەکی وردی کــە ســەبارەت بــە شــوێنی کــار یــا مــاڵی قوربانییەکانی خۆیان هەیانبوو, دەستیان دایە کوشتاری خەڵك. ئـەو خەڵکـە تۆقیـوەی لەم بگرە بەردەیە گیانیان قوتار کردبوو, دەبوایە خۆیان لـە بیری خۆیاندا بووبان؛ لێیان سوور بوو کە دەستە و دەیارەی پۆلیسی نهێنی ئێراق ڕەنگە هەر ئێـستا نـا تـاوێکی تـر بیانگرن و بیانکوژن. لـە بارزانیڕا بگـــرە هـــەتا کاربەدەســـتانی پایەبـــەرزی پـــارتی دێموکرات, وا دیار بوو کەسیان لـە بابەت ئەو خەیانەتەی بە هاوپەیـمانانی خۆیان "لــە کۆنگرەی میلـلی ئێراق"دا کردبوویان هەسـتیان بــە شــەرمەزاری نــەدەکرد. وتــەکانی ویلیام پێری لـە بابەت "شەڕی نێوخـۆوە" چـنۆکی بـوو لـەســەر درکانـدنی هەقیقـەت, چونکە "کۆنگرەی میلـلی ئێراق"ی لـەبەر چاوان نەدیو دەکرد: ئەمە شتێك بوو کە لــە لایەن پتر لـە دووسەت کەس لـە چالاکانی "کۆنگرەی میلـلی ئێراق" کە لــە هۆتێلێـك لـە سەلاحەددین ڕاگیرکرابوون, پێی لـەسەر دادەگیرا. ئەم شکست هێنانــەی گەلاڵــەی "سیا" — کە هێندێك لـە کارناسانی بەئەزموونی ئـەم شـێوە "بـەڕەڵڵا کردنانـە" ئـەویان لەگەڵ ڕووداوەکانی ١٩٧٥ی سایگۆن یا گەڕیانی کەنداوی خووگان[١] لــە ١٩٦١دا پێکدەگرن — بێ شك نەیتوانی یاریدەی هەوڵی داهاتووی دژبەران بدا یـا تەنانــەت بــۆ دابین کردنی هاوکاریی لـە هەر چەشنە چالاکییەك‌دا لـــە هـــیچ کـــوێی ڕۆژهـــەڵاتی نێوەڕاست پاڵپشت بێ.

خەسارێکی کە ئەم کردارەی سەددام حوسێن بەجێیهێـــشت هـــەر بـــەم هێنـــدە نەبڕایەوە. سستی و کڕ کەوتنەوەی ئەمریکا پووچ بـوونی حیکایــەتێکی زۆر بــە وردی دارڕژاو و لێك‌ولووس کراوی بە ڕوونی دەرخست, کە دەیگوت هێزەکـانی ڕۆژاوایـی

١-Bay of pigs, پەلاماری بەکرێگیراوانی کووبایی سەر بە ئەمریکا بۆ کووبا.

پشتیوانی لەم ٣/٥ میلیۆن کوردە دەکەن کە لە سەر ١٧ هەزار میلی چوارگۆشە پەراگەندەن. ڕاستە, لە نێوەڕاستەکانی ئاوریلی ١٩٩١ڕا فڕۆکە شەڕکەرەکانی هاوپەیمانان لەسەر ناوچەی دژەفڕینی باکووری هێلی ٣٦ سووڕابوونەوە, بەڵام ئەیالەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا سێمانگ دواتر بەهەشتاو هێزەکانی زەوینی خۆی لە ناوچە دەرباز کرد. لە سەردەمی پاش شەڕی ویتنام و کۆتایی شەڕی ساردا یەکە کەڵەهێزی جیهان ئەوەندە ئازا و بوێر نەبوو کە سیاسەتێکی دەرەویی بەهێز ڕەچاو کا و ئەو هێزە چەکدارانەی ئەوهەمووە پووڵەیان لێ خەرج دەکا بێنێتە مەیدانی کردەوە. لە باتیان, واشینگتۆن بۆ ئەوەی کە هەڵوێست و سیاسەتی خۆی لە بابەت باکووری ئێراقەوە بکاتە جێی باوەڕ دژی سەددام حوسێن دڵبەستەی هەڕەشەی هێزی ئاسمانیی بوو, کە بە شێوەی سەرزارەکی ئامانجی هەڕەشە کردن بوو لە دام و دەزگا نەوتییەکانی ئێراق کە بە زەحمەتێکی یەکجار زۆر سازی کردبوونەوە. بەڵام لە ڕاستیدا تۆڵەی ئەمریکا لە بابەت کردەی ئێراقەوە لە هەولێر, ئامانجە سەربازییەکان بوون: یانی لێدان و تێکشکاندنی سیستمی بەرگری ئاسمانیی بە مووشەکی کرووز وەك نیشانە هەڵبژێران کە سەددام حوسێن خێرایەکی سازی کردبوونەوە.

تەواوی ئەم ڕووداوانەی کە لە پایزی ساڵی ١٩٩٦دا قەومان, سەرنجیان بردەوە سەر دوور و درێژکەوتنەوەی پڕ گرێپووچکە و ناسراوی "چالاکی دابین کردنی ئاساییش" لە ١٩٩١دا کە ئێستا جەفەنگبازان بە تەشەر پێیاندەگوت "چالاکی خەیاڵات". بەڵێنی هاوپەیمانان بۆ پاراستنی کوردان لەسەر زەوی قەت پەلی ناویشتە دەرەوەی ناوچەی پارێزراو و ئەم ناوچە هێمنەی خۆی سێسووچەیەکی بچووك بوو لە باکووری ڕۆژاوای ئێراق کە ئەوەندە هەڵنەدەکشا کە تەنانەت "دهۆك"یش بگرێتەوە. زیادە لەمەش, دژبەرانی ئێراقی لێیان سوور ببۆوە کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانانی لە ژێر تەوژمی بێپسانەوەی تورکیادا – کە بوونی چەتری ئاسمانیی بە وێوە گرێ درابوو – ناچار بوون کە لە ١٩٩٥ڕا بۆو لایە باز و برستی ئەم ڕاسپێراوییە کەم کەنەوە و دەوری زەبروەشێنی فڕۆکە شەڕکەرەکان یەکجار بەرتەسك کەنەوە. ئێستا کە هێزە زرێدارەکانی ئێراق لە باکووری هێڵی ٣٦

کەوتبوونە ئاژوان, دیواری ڕواڵەتگەریی تەواو جمی. هەر کوردێك هەستی دەکرد ئەم کردارەی کە سەددام حوسێن بە بێ سزادران کردوویەتی دەکرێ دووپات بێتەوە.

جان دۆیچ, سەرۆکی سیا, ئەنگوستی نایە بان دڵپەرۆشی سەرەکی, ئەویش ئەو کاتەی کە گوتی سەرەڕای پاشەکشەی هێزەکانی ئێراقی "ئاشکرایە کە کارگێڕانی دەزگای زانیاری و داروەدستەی پۆلیسی نهێنی ئێراق لە ناوچەدا ماونەوە." کوردەکانی خوار هێڵی ٣٦, یانی ئەوانەی کە لە سلێمانی یان دوور لە وێ لە کفری و کەلار دەژیان و قەتیان چەتری ئاسمانیی هاوپەیمانان بەسەر نەکشابوو, ئێستێ پتر لە پێشوو کەوتبوونە بەر مەترسی. لە ڕابردوودا کاتێك دیپلۆماتەکان سەبارەت بەم کوردانەی دانیشتووی ناوچەکانی خواروورتری باکووری ئێراق پرسیاریان لێدەکرا, داکۆکییان دەکرد کە بۆ پاراستنی ئەوان دەکرێ بڕیارنامەی ٦٨٨ بێتەگۆڕ, کە یەکەم بەڵگەنامەی نێونەتەوەیی بوو کە لە پەیمانی "سێڤر"ەوە بۆو لایە ڕاستەوخۆ ناوی کوردانی دێنا.

ئەو ئاکامانەی کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بابەت بە هەنتەشی ئێراقەوە لە هەولێر پێیگەیشت هەم ڕەشبینانە و هەم لە ڕاستی بە دوور بوو. گەلاڵەدارێژانی ئێراقی چاوەڕوانی ئەوە بوون کە ئەمریکا دژی گاردەکانی کۆماریی هەڵوێستێکی گورج بنوێنن؛ ئەگەرچی ڕەنگە ئەم چاوەڕوانییە بگەڕێتەوە دوای پاشەکشەی ئەم هێزانە لە هەولێر, چونکە ئەمریکا لەم شەڕەدا نەیدەویست لای هیچکام لەم دوو تاقمە کوردە بگرێ. بەڵام وەها شتێك نەقەوما, چونکە دەوڵەتی ئەمریکا زەبرکوت کردنی سەددام حوسێنی لە کوردستاندا بە کارێکی بێهوودە دادەنا و هەر لەبۆیە بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە باشووری هەڵبژارد, ئەویش بەم دەلیلە هاسان و بێ بنج و بناغەیە کە ئامانجی ڕاستەقینەی سەددام حوسێن لە حەقیقەتا لە بری بێئیعتیبار کردنی "هاوپەیمانان" یان پەرە پێدانی دەسەلاتی ئێراق لە باکوور, ناوچە نەوتییەکانی کووەیت و عەرەبستانی سعوودی بووە. گوتەبێژانی دەوڵەت هەوڵیان دا بەرپرسایەتی ئەمریکا لەسەر پشتیوانی کردن لە کوردان بە کەم بنوێنن؛ کردەوەی نامەعقووڵ و بێفکرانەی بارزانی و تاڵەبانییان مەحکووم کرد و بە سەری زمانی درکاندیان کە ئەیالەتە

یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئێستا لەبەر هەڵەی ڕێبەرانی کورد بە باری ئەخلاقییدا بۆی هەیە لە پێوەندی لەگەڵ داهاتووی خەڵکی ئاسایی کوردا بەرپرسایەتی لە ئەستۆی خۆی دارنێ.

نێکۆلاس برۆنز گوتەبێژی وەزارەتی دەرەوە حاشای لەم ڕاستییە کرد کە گوێ‌خەواندن و کەترەخەمی ئەمریکا و ئاوڕ لێ‌نەدانەوە و چنۆکی ئەو بۆ یارمەتی دانی کوردان بە باری ماڵییدا بۆتە هۆی داگیرسانی ئەم قەیرانە. ئەو گوتی: "ئەگەر لە هەڵگیرسانی ئەم شەڕەدا بەرپرسایەتییەك هەبێ, ئەم بەرپرسایەتییە لە ئەستۆی دوو تاقمە کوردەکەیە نەك ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئێمە بۆ ماوەی پێنج ساڵان هەر چەشنە هەل و مەودایەکمان داوەتە کوردان. لە بواری سیاسیدا پشتیوانیمان لێکردوون, یارمەتی ئابووری و مرۆڤدۆستانەمان وێداون و ناوچەی پارێزراومان لە باکوور بۆ دابین کردوون کە دەیانتوانی کاروباری خۆیان بە شێوەیەکی تەواو خودموختار هەڵسووڕێنن. بەڵام کوردان نەیانتوانی لەم هەلە مەزنە مێژووییەی بۆ خەڵکی کورد ڕەخسابوو، کەلك وەربگرن."

ڕووداوە نەپساوەکانی کە لەسەر "زەوی" قەومان ئەم خەیاڵاتەی نەڕەواند کە لە ڕوانگەی واشینگتۆنەوە باکووری ئێراق ئیتر مەبەستێکی بڕاوە و قەڵەم بەسەرداکێشراوە. چەند سەعاتێك بەر لەوەی کە یەکەم شەپۆلی تۆڵە کردنەوەی مووشەکە کرووزەکان لە ٣ی سێپتامبر بەرەورووی دامەزراوەکانی بەرگریی ئاسمانیی ئێراق ببنەوە لە ناوچەی ژێردەسەڵاتی سەددام حوسێن، پێنتاگۆن فەرمانی چۆل کردنی "ناوەندی ڕێکخستنی نیزامیی" لە زاخۆ دەرکرد، کە دروست لەم بەرەی ڕووباری "خابوور"ە. من وەختایەك گەیشتمە ئەم ناوەندە کە چۆل کرابوو و ئەو کوردانەی بە ئاشکرا سەریان لێ‌شێوابوو پارێزگارییان لێدەکرد. ئەم ناوەندی ڕێکخستنە لەمێژبوو ئەو ئەرکە گرینگەی کە لە ١٩٩١ڕا بۆو لایە لە ژێر چاوەدێری سەرهەنگ "ناب" بەڕێوەی دەبرد وەلا نابوو. سەرهەنگ ناب یەکەم فەرماندەی ئەم ناوەندە بوو و پێی‌خۆش بوو وتوویژی خۆی لەگەڵ سپای تێکشکاوی ئێراق بە وتوویژ لەگەڵ "هیتلێر" بشوبهێنێ. لەو سەردەمیڕا بۆ دوایە ترکان یەکێك لە

ئەفسەرانی خۆیان لەم ناوەندە خزانـد و خـستیانە پـاڵ ئـەو تاقمـەی بریتـی بـوون لـە ئەفسەرانی ئەمریکایی، ئینگلیـسی، فەڕانـسەوی و هولـەنـدی، پاشـان لـە بـری ئیزنـی کـەلك وەرگرتنـی هاوپەیـمانان لـە بنکـەی "ئینجیرلیـك" چـوونە نێـو دەسـتەی سەرکردایەتی ناوەندەوە. بڕوای شێتانەی تورکیا لەسـەر ئـەم مەبەسـتە کـە "ناوەنـدی ڕێکخستنی نیزامیی" لە باکووری ئێراق یارمـەتی پێـشمەرگەکانی پ.ك.ك. دەکـا، بـە کردەوە کاری ئەم ناوەندەی شەلەل پێهێنا. وەختایەك لە ئاوریلی ١٩٩٤ هەڵەیەك لـە لایەن هێـزی ئاسـمانیی ئـەمریکاوە بـوو بـە هـۆی خرانـە خـوارەوەی دوو باڵـەفڕی ئەمریکایی هەڵگری پایەبەرزانی کورد و ئەفسەرانی ناوەندی ڕێکخستنی نیزامیی، ئەرك و ڕاسپێراوی ئەم ناوەندە لە هەموو بارێکەوە بە کردەوە کۆتایی پێهـات. ئـەم ڕووداوە بوو بە هۆی خەم و پەژارەی قووڵی کوردان، چونکە لایان وابـوو کـە هـەر هـەبوونی ئەفسەرانی ڕۆژاوایی لەوێ بارزانی و تاڵەبانی لە پێکهەڵپڕژان دەگێڕایەوە. ئەمریکا بـە سەرکەوتوویی داخوازی تورکیای بۆ ڕاگوێزتنی چالاکیی "ناوەند"ی بۆو بـەری سـنوور – بۆ سیلۆپی لە خاکی تورکیادا – لە کۆڵ خۆی کردەوە و دروست چـەند حـەوتوو بەر لە ڕووداوی هەولێر، تورکیا ڕەزامەندی خۆی لەسەر نـوێ کردنـەوەی چـالاکیی "چەتری ئاسـمانیی" هەتا کۆتایی ساڵ دەربڕی، بەڵام دەوڵەتی تورکیا لەبـەر پێخۆشـی بوونی ئێراق بە کردەوە "چەتری ئاسـمانیی" لە کاردانـەوە و بـرەو خـست: نەدەبوایـە لەوی بەو لاوە ئینجیرلیك بە مەبەستی شالاوی تۆڵە ئەستێنانەوەی ئاسـمانیی کـەلکی لێوەرگیرابا. تاقمێك لە کوردان گوتیان کە ترکان ئیزنیان نەدەدا فڕۆکەکان بۆمبـا یـان تەنانەت جاروبارە تەقەمەنیش هەڵبگرن.

چۆڵ کردنی لە نەکاوی "ناوەندی ڕێکخستنی نیزامیی" یەکەم دیاردەی ئاشکرا بـوو لەسەر ئەوەی کە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئیتر کوردستان بە شـوێنێکی ئـەمین نازانێ لەبەر پیاوەکانی سەددام حوسێن، هەر ئەوانەی کـە "برۆنـز" وەك "ئیـشکەڕنانی دەزگای زانیاری" وەسپی دەکردن. (پارتی دێموکراتی کوردستان "واقی بردەوە": ئەمـە یەکەم دان پێداهێنانی ئاشـکرای بـوو لەسـەر ئەمـە کـە جیهـانی دەرەوە ئیـددیعاکانی چەندپاتەی لەسەر ئەمـەی کـە هاوکارییەکـەی لەتـەك سـەددام حوسـێنا ڕووداوێکـی

دەگمەن و سنووردار بــووە و ئـیتر کۆتـایی پێهـاتووە، بـاوەڕ ناکـا.) ئێـستا "دەزگـای یارمەتییەکانی پێویست و خێرای دەرەکی" وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کە لە ۱۹۹۱ڕا بۆو لایە بایی ۷۹۵ میلیۆن دۆلاری خوردوخۆراك و یارمەتی دیکەی لــە نێـو کوردانـا دابەشیبوو، ئەوێندەرێی چۆل کرد و ڕۆیی. پاشی چەند حەوتەی تـر سـەدان کـەس لــە پارێزگاران و کـارگێڕانی "ناوەنـدی ڕێکخـستنی نیزامیـی" و "دەزگـای یارمەتییـەکانی پێویست و خێرای دەرەکی" و نیزیکەی ۲۰۰۰ کەس لە ئەندامانی, خێزانـەکانیان لــە پێشدا ڕاگوێزرانە تورکیا و پاشان بردیانن بۆ ئادەی گوام لە ئۆقیانووسـی ئـارام، هـەتا ئاخرییەکەی بیانبەنە ئەمریکا، بەلاّم جارێ هەتا پاش هەلّبژاردنی ئەمریکا با لەبەر چاوان نەبن. (لە نێوەڕاستەکانی ئۆکتۆبرا ۷۰۰ کەس لە ئەندامانی کۆنگرەی میلـلی ئێـراق و بنەمالّەکانیان ئاخرییەکەی پاشی ئەم تاقمە دەرباز بوون. من نیزیکەی پێنج حەوتوو بــەر لەو کاتە لە بابەت هەلومەرجی تـالّ و تـاریکی ئـەم تاقمــەوە مەترسـیم ڕاگەیانـدبوو؛ لەگەلّ ئەم خەلّکە ترساوانەی کە هێشتا لە سەلاحەددین لــە بنکـەی بـارزانی بـوون، وتوویژم کردبوو. بارزانی یارمەتییانی دا هەتا گەیشتنە شاری سەرسنووریی زاخۆ.)

ئەم بڕیارانەی ئەمریکا ئەو چەند ڕێکخراوە ناحکوومییە ڕۆژاواییيانەشی کە هێـشتا خەریکی یارمەتیدانی کوردان بوون، دنە دا لە کوردسـتان وەدەرکـەون. لــە کۆتـایی نوامبردا ۵۰۰۰ کەس لەو کوردانەی کە لە ڕێکخراوە فریاڕەسەکاندا کاریان دەکـرد – لەگەلّ خاوخێزانیان – بە سواری فڕۆکە ڕاگوێزرانـە "گـوام"، هـەتا لــەوێوە بـچنە ئەمریکا: ئەمە کردەیەك بوو کە ویژدانی ئەمریکای ئاسوودە کـرد، بـەلاّم کوردسـتانی ئێراقی لە وجوودی زۆرێك لە کارزانتـرین ژنان و پیاوانی بێبەش کرد. ئەم ڕێکخـراوە ناحکوومییان پاژێکی جوێوە نەبوو لــە سیاسـەتی ئـەمریکا بـوون و کارمەنـدەکانی کـە ئێراق ویزای وێنەدابوون زۆر چاك دەیـانزانی ئەگــەر بێتـوو بکەونـە دەس ئێراقییـەکان زیندانیی درێژخایەن چاوەڕوانیان دەبێ. دە ڕۆژ پاش گیرانەوەی هەولـێر، دەولّەتی ئێراق پتری تین هێنا. سەددام حوسێن بە بێ ئاگاداری پارتی دێموکرات کە زۆر نیگەران بــوو بەغدا پەردە لەسەر نێوانیان هەلّداتەوە، ئەو گەمارۆ ئابوورییەی شکاند کە پێـنج سـالّ لێرەوبەر خستبوویە سەر بـاکوور: (لــەم گــەمارۆ ئابووریيــەدا) مووچـەی کارمەنـدانی

نێوخۆی لە باکووری ئێراق بریبوو، ناردنی کەلوپەلی خواردەمەنی و سووتەمەنی بەربەست کردبوو و هەوڵی دابوو بەم زەختانە کوردان بە چۆك دابێنێ. لەگەڵ ڕاگەیاندنی هەڵگیرانی گەمارۆی ئابووری، بەغدا دانانی سێ سەرۆکی دەزگای پاراستنی بۆ سێ پارێزگای کوردنشینیشی ڕاگەیاند، کە دەرکەوت تەنیا هەر بۆ خۆنواندبوو. ئەم گەمارۆ ئابوورییە دەماری نەتەوایەتی کوردانی جووڵاندبۆوە، بەڵام کوێرەوەری و بەشمەینەتییەکی زۆریشی بە شوێنەوە بوو. ئێستا لابردنی ئەم گەمارۆیە مانای وابوو کە گەشت و گەڕان لە مابەینی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی حکوومەت و کوردستان بۆ هەموان، بۆ وێنە بۆ سیخوڕان، کە خەڵك زراوی لەبەریان چووبوو، ئازادە، لەگەڵ ئەوەدا ڕێوشوێنی لێبوردنی ڕاگەیاندراو، ئەو کوردانەی وەلا دەخست کە کاریان بۆ "ڕێکخراوە فریارەسەکان" کردبوو. هەروەها ئەم ڕێوشوێنانە ئەو کوردانەشی وەخۆ هێنایەوە و هێوری کردنەوە و خۆشحاڵ بوون کە ئیتر لەوی بەولاوە دەتوانن بێنزین, بەتایبەت نەوت بە نرخی لە سەتایەکی شەیتانەبازاڕ بکڕن و ماڵەکانیانی بێ گەرم دابێنن. تەنانەت لە بنکەی سەرکردایەتی بارزانی لە سەلاحەددین کۆنەئاشناکانم بە دزی ترسیان لە پەرەگرتنی دەسەڵاتی پۆلیسی نهێنی دەردەبڕی و لە مینان دەپرسی داخوا ئەمریکاییەکان و هاوپەیمانان بڵێی دیسان چەتری پاراستنی ئاسمانیی هەتا ساڵی ١٩٩٧ نوێ کەنەوە؟ ماوەی ڕا ئەنگاوتنی ئەم چەتری پاراستنە لە کریسمەسدا درێژ کرایەوە, ئەگەرچی لەسەر پێداگری تورکیا ئیدی پێی‌دەگوترا "چالاکی دابین کرانی ئاساییش" و تەنیا پاوان و تەرخانی وە دەس هێنانی زانیاری بوو لە ئاسمانەوە و فەڕانسەش لەپڕ فڕۆکەکانی لەم چالاکییە قرت کردبوو. ئەم دار و لەلە تازانە یەکجار زۆر ترس و دڵەڕاوکەی کوردانی پێهەڵابرد.

خەڵکی ئاسایی کورد باش دەیانزانی کە سەودای سەددام حوسێن لەگەڵ بارزانی هاوبەندییەکی کە بووش لە ١٩٩٠دا بە زەحمەت سەر و بنی وێکهێنابوو تۆزی لێبەبا کردووە: دوو لە وڵاتانی بەشدار، یانی فەڕانسە و ڕووسیا دە ساڵ پتر بوو کە چەندین میلیارد دۆلاریان لەسەر ئێراق بوو و هیوادار بوون لە داهاتوودا قەراروبڕی پڕ قازانجی نەوتی و بازرگانی لەگەڵ گرێ بدەن و ئێستا لە شووڕای تەناهی دا لە

ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکشانەوە. فەرەنسە بە ئاشکرا لە چوونە پاڵ ئەمریکا و ئینگلستان بۆ هەراوتر کردنی ناوچەی دژەفڕین لە باشوور، لە هێڵی ٣٢ڕا بۆ هێڵی ٣٣، لووتی هەڵەنگاوت و وتووێژی ڕاستەوخۆی نێوان سەددام حوسێن و پارتی دیموکراتی کوردستانی ڕائەسپارد و ئەمەش ڕاسپاردەیەك بوو کە واشینگتۆن هیچ پێیخۆش نەبوو هیچی دەربارەی بژنەوێ. گەورە هەڤگرانی ئەمریکا لە دنیای عەرەبدا – جگە لە کووەیت کە هێشتا لە داچڵەکانی پەلاماری ئێراق تەواو وەخۆ نەهاتبۆوە – سەبارەت بە پەلاماری مووشەکیی ئەمریکا بە تۆڵەی شالاوی هەولێر نارەحەت بوون، ئامانجە پەلامار دراوەکان زۆر لە کوردستانەوە دوور بوون. دەنگ و زەنای ئەوتۆ دەهاتە گوێ کە سەددام حوسێن بە مەبەستی گێڕانەوەی دەسەلات بۆ سەر باکوور، هیچ قانوونێکی نێونەتەوەیی پێشێل نەکردووە. عەرەبستانی سعوودی، ئەو شوێنەی کە وا هێزەکانی ئەمریکایی لە ماوەی کەمتر لە ساڵێکا کەتبوونە بەر پەلامار، تەنیا وڵاتێکی عەرەبی نەبوو کە نیگەرانی ئەمە بێ کە پێوەندی لەتەك واشینگتۆن دەتوانێ بە دەس دژبەرانی خەنیمی ڕۆژاوا و ئیسلامی ببێتە ئاڵقەی پەتی جەللاد. عەرەبستان بۆ دەمکوتی کردەی سەددام ئیزنی ئەمریکای نەدا کەلك لە بنکەکانی وەربگرێ.

لە ئانکارا، سەرۆکوەزیری ئیسلامخوا، نەجمەددین ئەربەکان کە بەم زوانە بۆ نێوانخۆش بوونەوەی تورکیا لەگەڵ ئێراق دوو وەزیری ناردبوونە بەغدا، بەرەورووی سێ حەوتەی قەیراناوی بۆوە؛ تەنسوو چیللەر، وەزیری دەرەوە و ناوەندی سەرکردایەتی سپا کە هەمەکارەی وڵاتە، بەهرەیان لەم "قەیران"ە وەرگرت و بە هێنانە گۆڕی ئەم دەلیلە کە پ.ك.ك. کەلك لە بارودۆخی نەچەسپیوی ڕووەو ئاڵۆزکانی باکووری ئێراق وەردەگرێ، چەند گەلاڵەیەکی بۆ دانانی "پشتێندەیەکی هێمنایەتی" لە باکووری ئێراق ڕاگەیاند، کە وێنەیەکی لاساکراوەی گەلاڵەیەك بوو وا ئیسرائیل لە خوارووی لوبنان بەڕێوەی بردبوو و خۆی پێی دەگوت "پشتێندەی هێمنایەتی". بەڵام هۆی هانی ئەم خەڵکە چ بڕ ڕوون و ئاشکرا نەبوو: دیپلۆماتەکان دەیانگوت بێتوو دەوڵەتی ئێراق ئاخرییەکەی بگەڕێتەوە کوردستان و ناوچە سنوورییەکان بگرێتەوە

سەددام حوسێن دەکەوێتەوە هەڵومەرجێك کە لەبەر وەی تورکیا لە ١٩٩١دا بنکەکانی خۆی نایە ئیختیار واشینگتۆنەوە، تۆڵەی لێبکاتەوە.

وە هەر حاڵ، گەلاڵەی "پشتێندەی هێمنایەتی" بە بێدەنگێکی وەلا نرا، تورکیا کە لە ماوەی پێنج ساڵی ڕابردوودا باکووری ئێراقی دابوویە بەر پەلاماری گەورە و بچووك و لەم شاڵاوانە ئەشتەکی وەچنگ نەکەوتبوو و قەت نەیتوانیبوو هەنتەشی پ.ك.ك. لەوێ بنەبڕ بکا، بە ناچاری پاشگەز بۆوە و شێواوی نێو جەرگەی هەڵوێست و سیاسەتی وەختایەك بە تەواوی دەرکەوت کە خاتوو چیللەر لە ئاخروئۆخری سێپتامبردا گوتی: لەمەدا هیچ گرێ و کۆسپێك نابینێ کە سەددام حوسێن بگەڕێتەوە سنوورەکان و زیادی کرد کە سەددام حوسێنیش ئا بەم شێوەیە ئاگادار کراوەتەوە. وەختایەك وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا سەبارەت بەم کردەیە نارەزامەندی دەربڕی، خاتوو چیللەر بە شێوەیەکی کە هیچ بڕوای پێنەدەهات گوتی هیچ ناکۆکییەك لە نێوان ڕوانگەی سیاسی ئانکارا و واشینگتۆندا نیە.

لە نێوخۆی کوردستانا بارودۆخێکی سەیروسەمەرەی ڕووحیی هەموو جێیەکی داگرتبوو. من توانیم زۆر بە سانی چاوم بە مەڵبەندەکان بکەوێ. لە پێنجی سێپتامبردا دۆستان و کۆنە ئاشناکانی پارتی دێموکرات تەنانەت وەرەقەیەکی هاتوچۆی تایبەتییان وێدام کە ئیزنی دەدا خەتوکووزی ئەوان هەڵبوێرم و بچمە لای تاڵەبانی، کە لە بنکەی خۆی لە قەلاچوالان، هەڵکەوتوو لە نێوان شاخەکانی سلێمانی و سنووری ئێران، دامەزرا بوو. بالادەستێکی پارتی دێموکراتی کوردستان داوای لێبووردنی کرد کە ڕێی لێ دوور کردوومەوە و بۆ شیکردنەوەی کارەکە گوتی: "ڕێی ڕاستەوخۆ گیراوە، چونکە هەر ئەمڕۆ لەم نیزیکانە دەستمان داوەتە شاڵاوێکی تر هەتا نەهێڵین تاڵەبانی تەما بکا دیسانەوە هەولێر بگرێتەوە." وەختایەکی کە هیو پاپ، هەواڵنێری ئیندیپێندێنت و من گەیشتینە قەڵەمڕەوی یەکێتی نیشتمانی، خەڵکی خۆجێیی گوتیان دەیان ئامبولانسی پڕ لە برینداریان دیوە کە بەرەو سلێمانی ڕۆیشتوون. لەم پەناگا چڕ و شاخاوییەدا تاڵەبانی و هێزی خێزانی – ئێمەیان وەك ئەندامانی بنەماڵە کە لەمێژ بێ نەیاندیبن – پێشوازییان لێکردین. هێزۆ لە وارگەی دەرەوەی هەولێریان کە ئێستا

خاپوور کرابوو، بە شێوەیەکی ئیعجازاوی لە ژێر گەرمەی ڕەهێڵەی ئاگر و دەسڕێژا دەرباز و بە سلامەت دەرچووبوو.

وتەکانی تاڵەبانی لە وڵامی پرسیاری هەواڵنێری ئیندیپێندێنتدا کە چۆنایەتی سەرهەڵدانەوەی دوژمنایەتی و شەڕەکانی لێ پرسی، ئەوەندێکی کە ڕەنگی خوتبەی لەخۆ گرتبوو، قەت هێندە هەڵگری ڕاستی نەبوو. ئەو ڕەخنەی لە ئەمریکاییەکان گرت کە گوێیان نەداوەتە ووریاییدانەکانی و پێشی پێشڕەوی هێزەکانی سەددام حوسێنیان بەرەو هەولێر نەگرتووە. گوتی: "هەل و هەڵکەوتێکی زێڕینیان بۆ تەفروتونا کردنی چوار لەشکری گاردی کۆماریی لە هەولێر لە کیس دا. ئەگەر وەوتۆیان کردبا هەر ئەمە خۆی دەبوو بە کۆتایی کاری سەددام حوسێن." فەڕانسەی لەبەر ئەمە کە دژایەتی تەمای هاوپەیمانانی کردبوو سەبارەت بە تێك‌کوتانی سەددام لە حەوارا، سەرکۆنە کرد و سوێندی خوارد کە یارمەتی لە "خودی شەیتانیش" وەربگرێ. دەستی بە جگەرەوە لە حەوادا ڕاوەشاند و زیادی کرد: "خۆم ناکوژم." هەروەها درێژەی دا کە تەمای وایە لەگەڵ ئاغای بارزانی نەك وەك کوردێك بەڵکوو چەشنی خائینێك درێژە بە شەڕ بدا. جارێکیان کە دەیویست بە تەلەفۆنی ماهوارەیی لەگەڵ پێلترۆ یان ڕابێرت دۆویچ (سەرۆکی کاروباری باکووری کەنداو کە دانوستانی سەبارەت بە ڕێککەوتنی ئاشتی بێ‌ئاکامی لە ئیرلەند لەتەکا کردبوو) قسان بکا و لە بیری چووبوو دەرگا پێوە دا، کۆتایی وتوویژەکەیمان بیست: پێیان‌گوتبوو کە ئاغایان کۆبوونەوەیان هەیە یان بە هەرحاڵ بە دەستەوە نین. بە گوتوبێژ لەتەك کاربەدەستێکی ژێرووتر ڕازی بوو کە ڕەنگە قسەکانی بەم ڕستەیە دەس پێکردبێ: "حاڵتان چلۆنە؟" یان شتێکی وەوتۆ و ئەو گوتی: "حاڵم باش نیە." بێگومان لای وابوو ئێمە گوێمان لە دەنگی نابێ.

ئەمە دەربڕینی هەڵسەنگاندنێکی دروست بوو لەسەر لێکهەڵوەشانی یەکێتی نیشتمانی. سێ ڕۆژ دواتر پارتی دێموکرات خێرایەکی پەنجا میلی لە ڕۆژهەڵاتی هەولێر پێشڕەوی کرد و بەرزاییەکانی "هەیبە سوڵتان"ی لە لای ڕۆژهەڵاتی کۆیە گرت و بەرەوڕووی بەرەنگارییەکی گرینگ نەبۆوە. ئەگەرچی تاڵەبانی لەم وەختەدا

تۆمەتی دەدایە پاڵ پارتی دێموکرات کە سەددام حوسێن بە تانـك و تۆپخانـە و چـەکە شیمیاییەکان یاریدەی دەدا، هیچ هێزێکی ئێراقی لـەم شـالاوەدا بەشـدار نـەبوو. ئـەم تۆمەتانەی دەگەڕانەوە سەر کەلك وەرگرتن لـە چەکە شیمیاییـەکان و ئەگـەر کاردانەوەیەکیشیان هەبوو بە باری تێکشکاندنی ورەی هێزەکانی یەکێتی نیشتمانـیدا شکانەوە کە لـە هەولێر پرژ و بلاو کرابوون. لـە ڕۆژی یەکشەمـمۆدا نیـشانەیەکی ئەوتۆی شەڕ و لێکدان لەسەر جادە وەبەرچاو نەدەهات. یەکێتی نیشتمانی تەواوی ئەم ڕێگایەی هەتا سلێمانی کە قەلایەکی تری بوو، جێهێشتبوو.

ڕۆژی دواتـر "کـورت شـورك" هـەواڵنێری ڕۆیتێـر و مـن لەسـەر گـەوەرە "چوارڕێیانێك" لـە لای ڕۆژهەلات، هەندێك لـەو لای هەڵلا و گرمەکە وێستابووین، لە کاتێکا پێشمەرگەکانی پارتی دێموکرات چاوەڕوانی فەرمان بوون. چێشتەنگاوێکی زۆر گەرم بوو. لـەپڕ لاوێك لەسەر ئوتۆمبیلێکی وانێتەوە هاواری کـرد: "کـێ دەیـەوێ بـە مفت بڕواتە سلێمانی؟" و دوو پێشمەرگە خۆیان هاویشتە سەر وانێتەکە. هەر کـە ئـەم دووە سوار بـوون، پێـشمەرگەکانی دیکـەی پـارتی دێمـوکرات کردیانـە تـەپوتۆز و هروژمیان برد و بەرەو بەنداوی دووکان کەوتنە ڕێ کە ئامانـجێکی بەرواڵەت نیزامیی بوو، چونکە یەکێتی نیشتمانی کە ئەم بەنداوەی بـە دەسـتەوە بـوو، کارەبـای تـەواوی پارێزگای هەولێری بە تۆڵەی گیرانەوەی ئەم شارە هەڵبـڕیبوو.

هێزی بێتـەکووز و نارێـكوپێکی پـارتی دێمـوکرات کـە وێدەچـوو پێـنج هـەزار کەسێکی تەمـەن خـوار و ژوور بـێ، بـە سـواری کۆمـەڵێك لـۆری و ئوتووبـووس و ئوتۆمبیلی دەس بەسەر داگیراو کەوتە ڕێ. "شورك" کە لـە ساڵی ١٩٩١ – ١٩٩٢دا بەر لـە چوونە "سارایەڤۆ" بە مەبەستی نووسین و کۆکردنەوەی ڕاپۆرت لەسـەر شـەڕی بوسنی بۆ ماوەی ساڵێك لـە کوردسـتان مـابۆوە و بـە سـاخی دەرچـووبوو، هـەروەك سەربازێکی پیادەی چاك لـە حەیفی بێپارێزی ئەم خەڵکە و گوێ نەدانە سەرەتاییتـرین ڕێوشوێنی سەربازی خۆی دەخواردەوە، منیش هەرواتر. بـەلام "شـورك" هـەوڵی دەدا کە ئێمە هەروا لـە نیزیکی جەمسەری ڕیزی هێرشبەران بین، ئـەو شـوێنەی کـەوا دوو کەس لـە کادرەکـانی پـارتی بـە نـاوی "ڕۆژ نـووری شـاوەیس" و "فـازل میرانـی" کـە

وەختایەك لە "ناش ویل" فرۆشەری ئوتۆمبیلی کۆنەونوێ بووە، جەماوەرە شێلگیرترەکەیان دنە دەدا کە برونە پێش و لێکدالێکدا دەیانگوت و چەنپاتییان دەکردەوە: "مام جەلال ڕایکردووە، با نەهێڵین ئەم دەرفەتە لە کیس بچێ، با تۆزی لێ بە با کەین!"

بە لای ڕستوورانێكدا کە چەند ڕۆژ پێشتر, ئەو کاتەی وا دەچوومە دیدەنیی تاڵەبانی و نیوەڕۆژم لێ کردبوو و ئێستا چۆڵ کرابوو، تێپەڕین. لە خوارتر، شریخ و هۆڕی دەسڕێژی چەکان لە گرد و تەپکی لێژ و هەڵەتی ڕۆژهەلاتی جادەوە کەوڵی ئاسمانی دادەڕی. تەنیا ئەو کاتی بوو کە پۆلی هێرشبەرانی پارتی تاقمێکی ناردە ئەم لاوئەولایان و ئەو دۆشکەیەی کە لەسەر وانێتێك دابەسرابوو, وە پێش دا. هەر قۆڵەی پێشمەرگەیەکی لێ کوژرا و خێرایەکی تەرمەکانیان خستنە وانێتەوە و لە مەیدان دووریان کردنەوە و ئاپۆرای هێرشبەران هەروا بەرەوپێش ئاژوای. نیو کاتەژمێر دواتر شورك و من و ڕانندە و دیلمانجە کوردەکە لەبەر تەقەی تاقتیرهاوێژێکی یەکێتی نیشتمانی بە ئەردەوە مەلاس بووین. ئەم تاقتیرهاوێژە ئەوەندە لێمانەوە نیزیك بوو کە فیشەك بەسەرماندا ویزەیان دەهات. شەڕکەرانی پارتی دێموکرات بۆ دۆزینەوەی پەنا و پەسیوێك هەر کام بۆ لایەکی تەقین. شورك لە خۆوە چاوەڕوان ما کە تەقە بوەستێ. ئاخرییەکەی خۆی پێ ڕانەگیرا: لەپڕ خۆی هاویشتە پشت فەرمان و ئاماژەی پێکردین کە سوار بین و بە دەستوبردی قاچاخچییەکی کە لە دەس پۆلیس ڕابکا, سەری ئوتۆمبیلەکەی بادایەوەو وەك تیژەی تفەنگێ دەرپەڕی و ئێمەی لە هەڵڵایە قوتار کرد. بەلام من ژان و ئێشێکی توند و تیژم لەسەر پشتم هەست پێکرد؛ بۆ تاوێك پێم وابوو بریندار بووم و لە خۆم تووڕە بووم کە هاتبوومە نێو جەرگەی شەڕێکی گومان لێکراو.

بۆم دەرکەوت کە زەرگەتە پێوەی داوم, لە ڕاستیشدا شەڕێکی واش نەبوو. مووشەكهاوێژی چەند لوول و تۆپی دژی ئاسمانیی کە لەسەر کامیۆنان دابەسترابوون, جارجارە بۆ ڕادانی جەماوەری یەکێتی نیشتمانی و چۆڵ کردنی سەنگەرەکانیان یان بێدەنگ کردنی قرمژنی چەکەکانیان تەقەیان لە کێوەکان دەکرد. شورك بێ پسانەوە لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "ئاخ! دەستەیەك خۆمپارە دەیتوانی تەواوی ئەم تاقمە

تێکهەڵشێلێ!" وا دیاربوو لە یەکێتی نیشتمانیش‌دا کەسێك لەسەر ئەم گومانە بوو: لە مەیدانی کایەکەدا گیرمان خواردبوو کە دە دوازە خۆمپارە لەم بەرەوبەری ڕێگاکە تەقینەوە؛ شەش کەسێك لە شەڕکەرانی پارتی دێموکرات برینـدار بوون, کە زۆر خۆڕاگرانە چاوەڕوان مانەوە هەتا ڕایانگوێزنە پشتی بەرە. پارتی دێموکرات ئەو ڕۆژە پێنج شەش کەسێکی لێ‌کوژرا و هەتا ئێوارەیەکی درەنگ پتر لە بیست میلێك پێشرەوی کرد و بەنداوی دووکانی گرت. بەڵام تەماشای کرد کە ڕۆژی پێشتر یەکێتی نیشتمانی بەرنامەی کامپیۆتێری بەرهەم هێنانی وزەی کارەبای دووکانی هەڵگرتووە و بردوویەتی.

بارزانی لە حاڵێکا بزەی لەسەر لێوی بوو, لەگەڵ گەورە یارانی وەدەرکەوت و لە ژێر سێبەری داران ڕۆنیشت. بێ‌گومان پارتی دێموکرات نەیدەویست لێرە — لە دووکان — بەری بگیرێ... تەنانەت ئەگەر بارزانیش ویستبای هێرشەکەی دژی دوژمنی ورە دۆڕاو کەم و کورت کاتەوە. ڕۆژی دواتر بە دزی پێی گوتم کە هێزەکانی لە هەڵەبجە, لە لای سنووری ئێران, پەلاماری سلێمانی دەدەن هەتا دنیا بزانێ وەختایەکی تاڵەبانی هاوار دەکا کە هێزەکانی ئێراقی لەم شەڕەی دواییدا بەشدارن, درۆی کردووە. لەگەڵ سەرئەندازیاری قیت و قۆزی بەنداو وامان قەرار دانا کە شەو لە شوێنی حەسانەوەی ئەو وەمێنین؛ وەختایەك گەیشتینییە سەرکردەکانی باڵای پارتی دێموکراتمان بینی کە لە سەوزەڵانی زەنوێری بارگای ئەوا کە سوار بوو بەسەر بەنداوەکەدا ڕونیشتبوون و ویسکییان دەخواردەوە. خانەخوێیەکەمان پێداگری کرد کە شێو میوانی بین و ئەم ڕووداوە بە خواردنی خۆراکی ماسی بکەینە جێژن.

لای سەعات نۆی شەو نەفەرێك هەواڵی گیرانی سلێمانییەی لە بوولێڵەی ئێوارەی ئەوڕۆژدا هێنا. هێزەکانی بنەگر لە هەڵەبجە تفەنگەکانیان لەسەر سەریان هەڵسووڕاندبوو و بە بێ هیچ تەقە و لێکدانێك شاریان گرتبوو. لەسەر سەوزەڵانی حەوشەی بارگای سەرئەندازیاری بەنداو لە ژێر تررووسکەی ئەستێراندا خەوتین؛ سەعات شەشی بەیانی کە لە خەو هەستاین, پارتی دێموکرات بۆ تەواو کردنی سەرکەوتنەکەی لە سلێمانی کەوتە ڕێ. ئێمە ڕوومان کردە سنوور, لە لای کلکەی

ڕێیە تووشی ئەندامانی پرژ و بڵاوی یەکێتی نیشتمانی بووین کە بە پێیان بەرەو ئێران دەیانکوتا. تووشی تاقمێکیش خەڵکی چینی مامناوەندی هاتین کە چلوهەشت سەعات پێشتر هەڵاتبوونە کێوان و ئێستا دەگەڕانەوە سلێمانی. زۆرێك لەم جەماوەرە ئەوەندە لە بازگەکانی سەر سنوور مابوونەوە کە ئێران خۆی لە کردنەوەیان دەپاراست, وەڕەز ببوون. ڕووداوەکانی ساڵی ۱۹۹۱ لە بازنەیەکی تەسکتردا دووپات بۆوە: کۆچ دیسان بە کۆمەڵ بوو, ئوتۆمبیل, لۆری, تراکتۆر و ئوتووبووس سەریان دەبەریەك نابوو و چاوەڕوانی گۆڕانی تەمای[ئێرانییەکان] بوون.

لە قەراخ شارۆچکەی کێوپارەی پێنجوێن تووشی سێ لاوی تەرپۆش هاتین کە بۆ ڕۆیشتن یا مانەوە هێشتا تەمایان ساخ نەکردبۆوە. هەرسێك زۆر چاکیان ئینگلیسی دەزانی. پیاوی ئەم تاقمە لە یەکێك لە ڕێکخراوە فریاڕەسانەکانی نێونەتەوییدا کاری دەکرد, دوو خوشکەکەی لە زانکۆی سلێمانی دەرسیان دەتگوتەوە. ئەم سێ‌کەسە دوو ڕۆژ پێشتر, ئەو کاتەی کە یەکێتی نیشتمانی دەستی کردبوو بە چۆل کردنی شار, ڕایان کردبوو؛ ئەم سێ کەسە, لەوەی کە خوشکەگەورە بە "خەیانەتی مەسعوود"ی دادەنا و هەروەها لە سەپینەوەی حکوومەتی بەعس تۆقیبوون, لێیان سوور بوو کە درێژەی ئەم شاڵاوە دەبێتە گەڕانەوەی خودبەخودی بەعس. لەوەی کە لە "ماڵەوە" چاوەڕوانیان بوو, زۆر تۆقیبوون. جا باشە ئەدی بۆچی ناچنە ئێران؟

***

ئەم پێداچوونەوە هیوابڕانەیە, دەرخستنی بارودۆخی ڕووحیی بەشی زۆری کوردانە پاش چارەگە سەدیەك زوڵم و چەوسانەوە بە دەس ئێراقییەکان و پێنج جار بشێوی و هەڵڵا و بگر و دڵەڕاوکە. بەڕاستی ئەمەی کە چلۆن کوردان توانیویانە ئەم ماوەیە ورەیان ڕابگرن, هیچ بڕوا ناکرێ. هەر لە سەرەتاوە هەر شتێکی کە بۆنی دارشتنی ئابوورییەکی خۆڕاگر و چەسپیوی لێدەهات, لە لایەن هاوپەیمانانی ڕۆژاوایی هەڵوەشێنرایەوە, ئەویش بەم بیانووە کە ئەگەر وا نەبێ تورکیا, واشینگتۆن و لەندەن پاریس بەمە تاوانبار دەکا کە دەیانەوێ وڵاتێك بۆ کوردان دامەزرێنن (و ئەم بیانوو یان "دەلیل"ە قەت بە زمانانەدا نەهات.) هەڵبەت سووریا و ئێران و ئێراقیش کەیفیان ساز

بوو کە کوردان ئاوا کەوتبوونە تەنگەژە. بە ڕەسمی بە کوردانی ئێراق دەگوترا کە فەرق و جیاوازی دانان بە قازانجی بەغدا دەبڕێتەوە و هەل بۆ هاوپەیمانانی دەڕەخسێنێ کە ئەو "نەرم کێشانە" بۆ ویش بخوازن.

کومیتەی گەمارۆکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئیزنی چوونی سووتەمەنی یان کەلوپەل و ئامرازی کەڵتەکردنەوەی نەدا هەتا بکرێ ئەو چەند کارخانەیەی لە باکووری ئێراق بوون بە پێوە ڕابگرن تەنانەت بە دژی چوونی دەزگا و کەرستە بۆ سازکردنی پاڵاوگەیەك بە مەبەستی بەرهەم هێنان و پاڵاوتنی ئەو برە نەوتەی کە بە دەس کوردانەوە مابوو, هەڵوێستی‌گرت. تورکیا ئیزنی نەدا کە "ڕێکخراوێکی ئینگلیسیی پسپۆڕ لە بواری دۆزینەوە و پووچەڵ کردنەوەی مین"دا ئامراز و دەزگای پێویستی ئەم کارە بەرێتە باکووری ئێراق, ئەویش لە ترسی وەی کە ئەم کارە لە باتی پووچەڵ کردنەوەی ئەو چەند میلیۆن مینەی کە لە شەڕی ئێران و ئێراق بەجێمابوون, یاریدەدانێکی پ.ك.ك. بێ. لەگەڵ ئەمەدا ئەم هەمووە پرکێشییەش بۆ پاراستنی ڕێوشوێن نەیتوانی ڕێ لەمە بگرێ کە گەمارۆکان بە شێوەیەکی بەربلاو هەڵوەشێنەوە. بەم شێوەیە بەڵگە هێنانەوەی "بەراوەژوو"ی ڕۆژاوا, ئیزنی دایە کوردان کە گەنم بە ئێراق بفرۆشن و بارانە لە بازرگانێتی پڕ بەهرەی سووتەمەنی دزێلیی نێوان دەوڵەتانی تورکیا و ئێراق وەربگرن و تەنانەت نرخی کارەبایەکی کە لە ئێراقیان دەکڕی, بە دۆلار بیدەن. بەلام ئیزنیان نەبوو کە ئامراز و کەرستەی پێداویستی ناوەندی تەلەفۆنی دهۆك بە بری ٤٠٠٠ دۆلار بکڕن و بیهێنن.

تەنیا سەرخۆشیی بەدیهاتوو لە ڕزگاربوون لە چنگ حکوومەتی ترس و خۆفی سەددام حوسێن ساڵگاران خەڵکی کوردی بە پێوە ڕاگرتبوو. یەکەم هەڵبژاردنی ئازادی کوردستان کە لە مانگی مەی ١٩٩٢دا بەرێوە چوو, شەپۆلی شادی و ئیفادەیەکی ئەوتۆی بزاوت کە کوردەکانی ئێراق بۆ ماوەیەکی درێژ بە بێ گلە و گازندە خۆیان لەبەر تەواوی تەنگ و چەڵەمەکان ڕاگرت. بەلام مخابن ئەم هەڵبژاردنە ناکۆکییەکانی نێوان بارزانی و تاڵەبانی پێهەڵابرد. بە گشتی بانگەشەی هەڵبژاردن لەبەر ئەمە بوو کە بارزانی لە دانوستانەکانیدا لەگەڵ بەغدا هیچ ڕێی

دەبەردا نەمابوو و دەیەویست بەر لە ئەنجامی مامەڵەكە شەرعییەتی سندووقەكانی هەڵبژاردنی لە پشت بێ. لەم بەینەشدا تاڵەبانی "داوی" قومارێ پێهەڵابردبوو و قان وداخوازی زیاتری لەو داخواز و قانانە هێنابووەگۆڕ كە لە ڕێككەوتنامەی خودموختاری ساڵی ١٩٧٠دا لە مابەینی سەددام حوسێن و مەلا مستەفا بارزانیدا ڕێككەوتنی لەسەر كرابوو و قەتیش بە تەواوی بەڕێوە نەچووبوو. ئەو ئێستا خوازیاری "فێدرالیزم"ێك بوو كە بە دروستی ڕوون نەكرابووە. لە گەرپانی هەڵبژاردنا — كە جەوهەریان لە ئاڵمانەوە بۆ هێنابوو و بە پێچەوانەی ئەوەی پروپاگەندەی بۆ كرابوو كە "پاك نابێتەوە" دەركەوت وا نیە, زۆری خەسار لێدا — بارزانی و تاڵەبانی هەركام لێیان سوور بۆوە كە ئەمیان سەركەوتووە و ئەوی تری بە گزیكاری هەڵبژاردن تاوانبار كرد. (حیزبە بچووكەكان, چونكە لە سەتا حەوتی دەنگەكانیان بۆ چوونە نێو پارلەمان وە دەس نەهێنا, وەلا كەوتن. دەستەیەك لە كوردان لایان وابوو كە ئەگەر ئەم حیزبانە چەند كورسییەكیان وە دەس هێنا با دەیانتوانی وەك بەرگێڕەوە وابن و ببنە بەرهەڵستی تێكهەڵچوونەكانی پاشەڕۆژ.)

تەنیا لە سایەی ڕێككەوتنێكی نەبەگە كە لە سێهەمین ڕۆژی پاش هەڵبژاردن لە نێوان دوو گەورەڕێبەری كوردا كرا, بەری شەڕ و لێكدان گیرا. زۆرێك لەو كوردانەی كە لەم توند و تیژییانە بێزرابوون, دواتر لێیان سوور بوو كە ئەگەر ئەم تەساڵحەیە نەكرابا شەڕ هەر ئەو دەم هەڵدەگیرسا. وێڕای تەواوی ئەمانە ورەكان بەرز بوون وبادەی سەركەوتن هەمووانی سەرخۆش كردبوو. گرێ و كۆسپی ڕابردوو هەرچی بوون یان دوودڵی سەبارەت بە داهاتۆوە هەرچەندێك بوو, پێشمەرگەكانی هەر دوولا بە شادمانی لە سەیتەرەكانی پشكنین كە بە ئالای زەردی پارتی دێموكرات و ئالای سەوزی یەكێتی نیشتمانی ڕازابوونەوە, وێكڕا ئەركیان بەڕێوە دەبرد.

زەختی دەرەوەش, بە تایبەت زەختی ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لەم تەساڵحەیەدا كاردانەوەی نواند. ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە پێی ڕێسا وەك هەمیشە لایەنگری هەڵبژاردن بوو, بەڵام لە ترسی وەی كە تاوانبار بە دنەدانی كوردان نەكرێ بۆ جیا بوونەوە, لە ڕۆژی هەڵبژاردنا چاوەدێرێكی نەنارده كوردستان.

(سەرهەنگ "ناب" لە جێژنێکدا کە تاڵەبانی بە بۆنەی بەڕێوەچوونی هەڵبژاردن پێکێهێنابوو هاتەوە سەرشانۆ و چاوەڕوان مایەوە هەتا فڕۆکەکانی شەڕکەری هاوپەیمان بەسەر سەری جەماوەرا فڕین. [لەم وەختەدا] گوتی: "ئەمەش جان میجێر و حاجی بووش کە دەنگی خۆیان خستە سندووقەکانەوە.") سەرەنجام پارتی دێموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەسەر دابەشینی دەسەڵات پێکهاتن: پارتی دێموکرات لە پارلەماندا چاوی لە کورسییەکی پۆشی هەتا هەرکام لەم دوو حیزبە گەورە یەکی پەنجا نوێنەریان بچێتە پارلەمان, بارزانی و تاڵەبانی ناڕاستەوخۆ خۆیان لە هەڵبژاردنی ڕێبەرایەتی پاراست, لە هەڵبژاردنێکا کە کرا ڕێبەرایەتی دێموکرات لە پێش بوو, بەڵام لە دەوری یەکەمدا لە سەتا پەنجای تەواوی وە دەس نەهێنا. لە ڕاستیدا بەرندەی ئەم هەڵبژاردنە تاڵەبانی بوو کە دژی هەر چەشنە مامەڵەیەك بوو لەگەڵ سەددام حوسێن و خوازیاری فێدرالیزم بوو, کە هەنگاوێك لە پێش ڕێککەوتنی خودموختاری ساڵی ١٩٧٠ بوو و خەباتی بۆ کردبوو.

ئەم "بەرژەوەندییە" حیزبییانە, لە چەند مانگی دەسپێکی کاری دەوڵەت و پارلەمانی هەرێم لە ژووئیەی ١٩٩٢دا, ڕەنگدانەوەیەکی ئەوتۆی نەبوو. بەڵام لە مانگی ژانویەدا خەڵك دەیانگوت کە ئەم پێکهاتنە "پەنجا بە پەنجا"یە بۆتە شێوازێك بۆ "ڕەوتێکی زنجیرەیی": وەزیرێك لە پارتی دێموکرات دەبوو ڕێوڕێ جێگرێکی لە یەکیەتی نیشتمانی بووبایە و وەزیری یەکێتی نیشتمانی دەبوو جێگرەکەی لە پارتی دێموکرات بوایە. دۆستێك دەیگوت: "هێندەی پێنەچوو کە ئەم شێوە و شێوازە تەنانەت پێشخزمەتە چاپەزەکانیشی گرتەوە." کاردانەوە و هەڵوێستەکانی دواتری ئەم ڕەوتە، بەتایبەت پاش ئەو تەقە و لێکدانانەی کە لە ١٩٩٤ەوە دەستیان پێکرد، بەگەرمەتر و توندتر خۆیان نواند. لە ماوەی سەردانێکی فێوریەی ١٩٩٦دا بۆ باکووری ئێراق، دۆستان سەفرەی دڵیان بۆ دەکردمەوە و دەرد و زووخاویان هەڵدەڕشت. "یۆنس موئەیید"ی ئاشنام گوتی: "لەو ناوچانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی پارتی دێموکرات دایە خەڵکی ئاسایی ڕقیان لە بارزانی دەبێتەوە و لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانی لە تاڵەبانی بێزراون."

پارتی دێموكرات و یەكێتی نیشتمانی وا لـە پێش چاوی خەڵك كەوتن كە هەر ئـەم جەماوەرەی ساڵی ١٩٩٢ بۆ دانی خوێن بە زامار و قوربانییەكانی تەقینەوەی بۆمبایـەك كە دەستەوبەستەی ئێراق لـە ئوتۆمبیلێكدا نابوویانەوە، جەلـلەیان دەبەست، ئێستا هەر گوێشیان نەدەدایە ئەو داخوازانەی پەیتاپەیتا لـە تەلـەفیزیۆنەوە بڵاو دەكرانـەوە و داوای یارمەتی و دانی خوێنیان دەكرد بۆ قڕكراوانی شەڕی نێوخۆ. گرانی، ئەستاندنی بارانەی زۆر لـە سەیتەرەكانی سەر ڕێوبانان و وەرگیرانی باج و پیتاكی دیكـە هێنـدە بـوو كـە وەك موئەیید دەیگوت: "هەركەس پێنسەد دۆلاری لـە گیفانیدا بێ دەیهەوێ لــە وڵات بڕوا، ئەگەریش خۆی نـەڕوا كوڕەكـەی بنێـرێ, كـە لــەوێ پـووڵ پەیـدا بكـا و بـۆ بنەماڵەكەی بنێرێتەوە." جەماوەری شارنشین لـە هەموان پتر تووشـی خەسـار هـاتبوون، چونكە درێژەی ژیان و مان بە "گەڕانەوە بۆ سەر مڵكوماشـــــە"وە بەستـــــرابۆوە. جـەماوەرێكی زۆر گەڕانــەوە گونـدە خـاپوور كراوەكـانی پێـشوویان، كـە ئێـستا بـە یارمەتییەكانی ئەیالـەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و وڵاتانی تری ڕۆژاوا سـازكرابوونەوە. سەدان كەس لـە پزیشكان و ئەندازیاران و مامۆستایانی زانكۆ و گەلـێ لـە پسپۆڕانی تر كە بوونیان یەكجار زۆر بـۆ وڵات پێویـست بـوو و هاتبوونـە ڕیـزی ئـەم جووڵانـەوە نەتەوایەتییە، ئێستا تووشـی بارودۆخێـك هـاتبوون كـە بـۆ درێـژەی ژیـان كەلوپـەلی ماڵەكانیان هەڕاج دەكرد, ئەم پۆلـە خەڵكە پاشی ماوەیەك نائومێد بوون و ڕێی كۆچیان گرتەبەر.

دڵتەزێنتر لـە هەموو شتێك كـردەوەی پێـشمەرگەكانی دوو تاقمەكـە بـوو كـە بـە حوكمی خۆیان خەڵكیان لـەسەر ماڵ و مڵكیـان هەڵدەقەنـد و ڕایانـدەماڵین. تەنانـەت سەددام حوسێنیش لـە شاراندا دەستی بەسەر ماڵی كەسدا نـەگرتبوو و وای بـە باشـتر زانیبوو كە حوكماتی پڕ ترس و خۆفی خۆی باوێتە نێـو گونـدان، كـە وە دەس گرتنـی دەسـەڵات لــەوێ دژوار بـوو. ڕێكخـراوی لێبـووردنی نێونەتـەوەیی نووسـی: "ئەمـە زوڵمێكی دزێوی ئاشكرایە, كوردان كەوا خۆیـان ماوەیـەكی دوور و درێـژ بـە بـاری پێخوست كرانی مافی مرۆڤەوە بە دەس هێزەكانی دەوڵـەتی ئێراقەوە چەوسانەوە، دیسان

دەبێ تووشی وەها زوڵم و زۆرێك ببنەوە، بەڵام ئەمجار لە لایەن ڕێبەرانی سیاسی خۆیانەوە." (ژوەنی ١٩٩٤ ڕێکەوتی ئەم ڕاپۆرتەیە.)

ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی لە ڕاپۆرتی ڕێکەوتی فێوریەی ساڵی داهاتووی خۆیا پارتی دێموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی بە "بەرپەرسی گشتیی" زۆربەی ئەم دەسدرێژییانە ناساند کە لە ئەشکەنجە و گرتنی خودبەسەرەوە بگرە هەتا کوشتنی موخالیفانی سیاسی و بەشداربوانی خۆپیشاندانی ئاشتیخوازانە و ئیعدامی پێشمەرگە بە دیل گیراوەکانی دەگرتەوە. ئەم ڕێکخراوە لە ڕاپۆرتەکەیدا دەیگوت: "وەبەر چاو نەگرتنی ڕێوشوێنە بنەڕەتییەکانی مافی مرۆڤ کە ڕێبەرایەتی کورد بە ئاشکرا خۆی لە ئاستیان بە بەڵێندار نواندبوو، زیاتر لەم ڕووەوە جێی داخ و کەسەرە کە ئەم ڕێوشوێنە هەر ئەوانە بوون کە دەوڵەتی ئێراق لەپەستا پێشێلی کردبوون و ئاکام و سەرەنجامی کارەکە بە لای ئازار و ئەشکەنجەی کوردانی ئێراقدا شکابۆوە." ئەم زوڵم و زۆرانە بێگومان چالاکانی مافی مرۆڤی ڕۆژاوای دڵپەرۆش کرد. لە لایەکی تر "نێرەڤانی مافی مرۆڤ" ماوەیەك بوو هەوڵی دەدا هەندێك لە دەوڵەتان دنە بدا کە ئێراق بە تاوانی "تۆوبڕ کردن" ڕاکێشنە بەردەمی دادگای جیهانی. ئەو ئومێدانەش کە وەختایەکی لەسەر هەقی دەستێوەردان لە قەیرانەکانی ترا خۆی دەنواند و بەهێزیش بوو، کاڵ بۆوە و "ناوچەی پارێزراو" بوو بە لەبزێکی دزێو: "ناوچەی یارمەتییەکانی ئینسانی" کە تیپەکانی فەڕانسەوی لە ژووئیەی ١٩٩٤دا لە باشووری ڕۆژاوی "ڕواندا" دایاننا, ئەویش ئەوەندە درەنگ بوو کە نە تەنیا ژیانی خەڵکی تووتسی ڕزگار نەکرد، بەڵکوو بە لای پشتیوانی کردن لە "کەڵەزەڕانی هووتوو"دا شکایەوە و لە ١٩٩٥دا لە بوسنی، لە "ناوچەی پارێزراو"ی سێربرێنیکا کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان باڵی بەسەرکێشابوو هەزاران کەس لە مسوڵمانان بە دەس سەربازانی سێرب کوژران.

لە کوردستان ئەوتۆ نەبوو کە بڵێین بارزانی و تاڵەبانی نازانن چیان لە دەورانپشتی دەبووری. لە ڕاستیدا هیچکامیان هەوڵی شاردنەوەی زوڵمەکانیان نەدەدا. بارزانی خۆی لە ١٩٩٦دا پێیگوتم: "شەڕی ئێمە و پێشێل کردنی مافی مرۆڤ خەسارێکی

لە ڕادەبەدەری لە جوولآنەوەی كورد داوە. من ئەوەنـدە لـە دیتنـی دۆسـتانی دەرەوە هەسـت بـە شـەرمەزاری دەكـەم كـە تەنانـەت بـەر لـە دەربڕینـی ڕەزامەنـدی بـۆ چاوپێكەوتنتان هەر لەسەری دوودڵ بووم." هیچ شـتێك بـە دەسـتەوە نـەبوو كـە لـە ڕاستی و دروستی وتەكانی شك هەڵمگرێ. بەڵام كوردستان كەتبووە سـەر دۆخێـك و تاڵ و گرژی وەهای سەرتێكنابوو كە تەنانـەت بێخەوشـترین دان پێـداهێنانیش ڕەنگـی تەقەلای خۆپەڕاندنەوەی لەخۆ دەگرت. بۆ ڕێبـەران ئاسـان بـوو كـە تـاوانی كارەكـە بـخەنە ئەستۆی یەكتر یان جیهانی دەرەوە بە تاوانباریان بزانێ و سەركۆنەیان بكا، بەڵام بارودۆخەكە وەها بوو كە دەتگـوت زەبروزەنگـی لـەپڕ و پـتر لـەخۆوە قـەت بنـەیان نەدەهات. كەسانێكی كە ڕەخنە لە كوردان دەگرن لەمێژە هاتوونە سەر ئەم باوەڕە كە ئەم زەبروزەنگە بەشێكە لە "سرشت"ی كوردان.[1] بەڵام كوردان و هەروەها خـەڵكانی تری ئێراق نیزیكەی سی سـاڵێكە كـە كەوتوونەتـە ژێـر ڕكێفـی حكوومـەتی چـەپەڵی بەعس و بە ناچار مۆركی ئەم زەبروزەنگەیان لەخۆ گرتووە. سەركوت، زەبر و زەنـگ و حكوومەتی چەقبەستوو، ڕوحـی هـەموانی تەزانـدووە و ژاكانـدووە و لـەم بەینـەدا كوردان پتر لە هـەموان ئـازار دراون و شـوێنەواری ئـەم جەزرەنـەیان لەسـەر ڕوح و دەروونی دیارە.

ئەو پۆلە كوردەی كە شانبەشانی بـارزانی و تاڵـەبانی و ڕێبـەرانی تـری نەتـەوەیی شەڕیان كرد، ساڵگارانی درێژ لە یەكێك لە سەخت و چڕترین هەرێمەكانی جیهانا لـە خەڵك تـاق بوونـەوە. پێـشمەرگەكان كـە بـۆ یەكـەم جـار لـە ١٩٩١دا كاروبـاری بەڕێوەبردنی شـارانیان گرتـە دەس، ڕاهـاتن و ئـەزموونێكیان لـە بـواری كـارگێڕی و بەڕێوەبەرایەتیدا نەبوو. ئەم جەماوەرە جگە لە ڕاهـاتنی سـەر بـە حیزبایـەتی خۆیـان و شەڕی پارتیزانی، ڕاهاتنێكی تریان نەبوو. ئەمانە لەبەر بزر بوونی دیـاردە بەنرخـەكانی كوردایەتی، كە لە چیا هەتا ئەوپەڕی دڵخوازیان پێهەڵابردبوو، داترووسكان. ئەم كـارە پتر بە مانای بڕانەوەی كۆمەڵی سوننەتیی ئەم خەڵكە گوندەكییە بوو: جەماوەرێكی كـە

---

١- Genetic. زەبروزەنگی ئەڵـمانییەكان یا هی ئەمریكاییەكانیش لە وێتنام بەم پێیە پاساو دەدران!

گوندەکانیان خاپوور کرابوو و ژیانی دێهاتییانەیان تێداچووبوو و لە شوێنی ئەو ژیانی "بێکەسایەتی" نێو "شارۆچکەکانی سەرکەوتن" بنەگر ببوو کە لە باتیان، کارەبا و چاوەدێری و پۆلیس و پەروەردەکرانی بەعسیی لە قوتابخانان وە پێش دێهاتییەکان دەکرد. ئەو کوردانەی کە لە دەرەوە خوێندبوویان و بەسەر ڕەوتی ڕووداوەکانی جیهانا ئاگادار بوون، ئیتر جگە لە بۆ دیدار نوێکردنەوەیەکی کورت نەگەڕانەوە کوردستان و زۆربەیان بوونە کلۆڵترین "ماڵ بە کۆڵان".

لە ماوەی سەردانی فێوریەی ١٩٩٦شمدا بۆ هەولێر، لە موئەییدم پرسی بۆچی وای لێهاتووە؟ وە بیری هێنایەوە کە ساڵی پێشوو باسی دیداری خۆم لەگەڵ "نزار حەمدوون" کردبوو. نزار حەمدوون باڵادەستێکی ئێراقی بوو کە لە مەودای شەڕی ئێران و ئێراقا وەك باڵوێزی سەددام حوسێن بەوپەڕی شێلگیری و کارزانییەوە لە واشینگتۆن کارەکانی ڕاپەڕاندبوو، پاشی ویش هەروا باڵوێزی ئێراق بوو لە ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. موئەیید گوتی: "ئەو بە ئێوەی گوت کە ساڵێك بێناچێ کە کوردان بە چۆکدا دێن و لەبەر خودا دەپاڕێنەوە کە سەددام حوسێن بگەڕێتەوە. ئەم قسەیە ئی ١٩٩٢یە و من ئەو کاتی سەرم سوڕما."

پرسیم، ئێستا چلۆن؟

بە ژاکاوی وڵامی داوە: "تاقە خەونێك دەبینم؛ دەبینم سەددام دەگەڕێتەوە، پێشمەرگەی کورد ڕادەماڵێ و پاشان دەگەڕێتەوە بەغدا کە خەڵکی کورد بتوانن خەریکی ژیانی خۆیان بن." تینی دەنگی ڕۆمرکا: "وتەکانم بە باری خراپدا لێکمەدەوە. من شانازی بەوەی دەکەم کە کوردم و دەوڵەتم هەیە. هیچ کوردێك لە ڕاستیدا ناخوازێ بچێتەوە ژێرسێبەری سەددام، بەڵام لام وایە ئەم خەونە بەم واتایەیە کە کوردان بە دەس ئەم دەوڵەتە پاراتیزانییە پەنجا بە پەنجایەوە زۆر جەزرەبە دراون و زۆر و کەم ئەشتەکیان وە دەس نەهێناوە."

هەر بۆ تاقیکردنەوە، ئەم خەیاڵەی "موئەیید"م بۆ باڵادەستانی پارتی دێموکرات و یەکێتی نیشتمانی گێڕایەوە. زۆر و کەم چاوەڕوان بووم دەرهەڵبن و بۆ داکۆکی لە

حکوومەتەکەیان وە جواب بێن. بەڵام نا، لە باتیان شانیان هەڵتەکاند. یەکێك لەوان پرسی: "چی دیکەم لە دەس دێ؟"

نرخاندن و پێداچوونەوەی زۆری لەم چەشنە وا دیارە لە ماوەی کەمتر لە سێ حەوتوو پاش شالاوی هەولێر، ئەو کاتەی کە پێلترۆ و بارزانی لە ئانکارا پێکەوە دیداریان کرد، لە گۆڕێدابوو. لەم دیدارەدا کە ئاکامی بێ ئەملاوئەولای لێنەکەوتەوە هەردك لا ئۆگریی خۆیان سەبارەت بە سنووردار کردنی تەنینەوەی خەسارەکان و پێشبینی کردن و تێڕاچوون بۆ سەر خواستەکانی داهاتووی لایەنەکەی تر دەربڕی. هەردك پێویستیان بە هەل و دەرفەتێکی لەبار بوو. دەوڵەتی ئەمریکا کە نیزیك دوو مانگێکی هەتا هەڵبژاردنی مانگی نوامبری سەرکۆمارێتی مەودا مابوو دەیەویست ئەم کاردانەوەیەی کە دەڵێ "هەموو شتێك لە کیس چووە" داشکێنێ، چونکە ڕەخنەگرانی سیاسەتی واشینگتۆن لە شایەتییەکانی کۆنگرەدا بارودۆخەکەیان لەگەڵ تێکشکانی "کەنداوی خوودگان" لە سەردەمانی سەرۆك "کێنێدی" لە ١٩٦١دا پێکەوە هەڵدەسەنگاند. لە وەزارەتی دەرەوەدا "برۆنز" ئێستا بارزانی وەك کەسایەتییەکی "زۆر گرینگ لە باکووری ئێراق" دادەنا و ئاماژەی بەم خاڵە دەکرد کە ڕەنگە بکرێ دەوڵەت بخرێتە سەر ئەم بڕوایە "ئەگەر بێتوو کوردێك بەرێوە بردنی باکووری ئێراق وە ئەستۆ بگرێ، ڕاپەڕاندنی کارەکان سادەتر دەبنەوە." یەکێك لە دیپلۆماتەکانی ڕۆژاوایی و دانیشتووی ئانکارا هەر ئەو وەختی گوتی: "بارزانی بە یارمەتی سەددام تەواوی کوردستانی قووت دا و ئێستا دەیەوێ ئێمە دیسانیش یاریدەی بدەین."

بارزانی نیازی بەمە بوو کە کوردەکانی ئێراق دڵنیا بنەوە کە ئەمریکاییەکان نەگەیشتوونە ئەم ئاکامە کە ئەو هەموو شتێکی بە سەددام حوسێن فرۆشتووە. یاریدەدەرانی گوتیان بێتوو واشینگتۆن چەکی قورسی وێبدا و کۆمەڵێك دەستەبەرایەتی بگرێتە ئەستۆ کە هەتا ئێستا هیچ دەوڵەتێکی ڕۆژاوایی بۆ کەسی وەباڵ نەگرتووە، ئەوێ دەمێ، بارزانی پێشوازی لە داگیرسانەوەی پێوەندی نیزیکی "کاران"

دەکاتەوە لـەگەڵ واشینگتۆن؛ ئەگینا بـارزانی بـە ناچـاری ئـەو وتوویژانـەی کـە لـە ۱۹۹۲دا لـەگەڵ بەغدا دابڕابوون، دەس پێدەکاتەوە.

بارزانی دەیەویست ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بدا. هەڵبژاردنێکی نوێی ڕاگەیاند، هـەتا شەرعییەتێك بە مەبەستی پاساو هێنانەوە بۆ کردارەکانی داهاتووی کە ڕاوێـژکارانی بـە پێویستیان دەزانی پەیدا بکا. ئەو بە ڕاگەیاندنی لێخۆش بوونی گشتیی ویستی لە توند و تیـژی ڕەخنـەکان کـەم کاتـەوە. ئـەم لێبوردنـە تاڵەبانیـشی دەگرتـەوە. بـارزانی، زیندانیکراوێکی گرینگی یەکێتی نیشتمانی، یانی "فوئاد مەعسووم"ی ئـازاد کـرد, ئـەو یەکەم سەرۆکوەزیری کورد بوو کە لـە ۱۹۹۲دا ئەم پلـەیەی درابوویـە و بـە پـەیامی ئاشتییەوە بۆ ڕێبەرانی یەکێتی نیشتمانی کە لـە ئێران دەژیان، گەڕاوە لایان. پارلـەمان بـە خۆی و بە ٦٩ نوێنەر لـە ۱۰۵ نوێنەری پێشوو دیسان کرایەوە و سەرۆکوەزیرێکـــی تازە لـە پارتی دێموکرات بۆ سەرۆکایەتی دەوڵەت دانرا.

بەڵام داخوا بارزانی کە سوێندی خواردبوو کە کوردستان بکاتە قەڵاتی دێموکراسی و کۆمەڵی فرەحیزبی, دەیتوانی — ئەگەریش ویستبای — کۆتایی بە دەس تێکەڵاو کردن لـەگەڵ ئێراق بێنێ؟ داخوا ئەگەر وا بوایە ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئـەمریکا "ناوەنـدی ڕێکخستنی نیزامیی" بە نیشانەی باوەڕ پێکردنی دووبارە بەو, دەگێڕایەوە کوردستان یان بەم بیانووە کە سەرکردەکانی "هاوپەیـمانان" و ئەو پاسەوانانەی کە دبوایە سـەرلـەنوێ لـە نێو خەڵکی خۆجێیی هەڵبژێرابانەوە, لـە ترسی وەی کە بکەونە بەر ویژەی پۆلیسی نهێنی سەددام حوسێن خۆ نادەنە ئەم کارە و بە ناچار دەبێ بە بـێ مـەیل و ڕەزامەنـدی خۆیان ئەم کارەیان پێبکرێ, خۆ لـەم کارە دەپارێزێ؟ داخوا ئەیالـەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا دەیتوانی پاساو بۆ درێژکردنەوەی مانەوەی ئەم "چەتری ئاســمانی"یـە بێنێتـەوە هەتا ساڵی ۱۹۹۷؟ داخوا تورکیـا ئێـستا تێدەگـەیی کـە ئـەو چـەتری ئاســمانییە بـە قازانـجی خودی وی ئامرازی زەخت دەکار کردنە بە سوودی وی؟

شەش حەوتە پاش پەلاماردانی هەولێر, یانی ئەو کاتە کە تاڵەبانی یەکێتی نیـشتمانی کوردستانی ڕێكوپێك کـردەوە و هێرشـی خـۆی لــە ناوچـە سـنوورییەکانی ئێرانـەوە دەسپێکرد و پارتی دێموکراتی کوردستانی هەتا "پایتەختی بەرپشتیوانی ئێـراق" تارانـد,

زۆرێك لەم پرسیارانە – بەڵام نەك هەموویان – وەك شتێکی زیادی و لە خۆوەیان لێبەسەر هات. خێرایی ئەم گەڕانەوەیە لە مانگی ئۆکتۆبردا, ڕەخنەگرانی تاڵەبانی حەپەساند, تەنانەت ئەگەر بیسەلمێنین کە ئەمە ئێران بوو کە لە زنجیرەشاڵاوێکی سنوورییدا چەكوچۆڵ و تەقەمەنی و تۆپخانەی قورسی دایە و هەر ئەمانە بوون وەی پارتی دێموکراتیان دابەزاند و سلێمانییان بێچۆل کرد. پاشی چەند ڕۆژان پارتی دێموکرات لە هەوڵێکی نائومێدانەدا بە مەبەستی گێڕانەوەی دەسەلاتی بۆ سەر تەواوی باکووری ئێراق دەستی دایە دژەهێرشێك, بەلام جگە لە کوژرانی سەدان شەڕکەر ئەشتەکی دیکەی لەم تێکۆشانە گیر نەکەوت. (گوترا کە یەکێتی نیشتمانی لەم ناوچانەی کە پێشتر بەجێی هێشتبوون و سەرلەنوێ دەستی بەسەردا گرتبوونەوە, دەستی داوەتە کوشتار و ڕق بێڕشتن و پارتی دێموکراتیش وەوتۆی کردووە... ئەمەش خۆی شاهیدێك بوو لەسەر هەڵسووڕاوی "دەزگای ئاساییشی" کوردان و تاقمەکانی خافڵکوژ و کاردانەوەی دزێو و شومی "مۆدێلەکانی" باوی سەددام و لاسا کردنەوەیان.)

داوای مەسعوود بارزانی لە سەر پاشایەتی کوردستان, بوو بە دووکەڵ و بە حەوادا چوو و کوردستان بە سەر قەڵمڕەوی دوو دەسەلاتا دابەش کرا: ئێران لە ڕۆژهەلات و بارزانی سەر بە ئێراق لە ڕۆژاوا. لە کۆتایی ئۆکتۆبرا "پێلترۆ" گەڕایەوە ئانکارا و سەبارەت بە ئاگربڕی نێوان دووقۆڵەکە لەگەڵ نوێنەرانی پلە دووهەمی هەردك تاقم دەستی کرد بە وتوویژ, بەم هیوایە کە بەشێك لە نفووزی ئەمریکا لە ژێر هەرەسەڕووخاوی بارودۆخەکە ڕزگار بکا. بەلام بە لە هەوێڵدا نەبوونی ڕێبەرانی هەر دوو تاقمەکە ئەم وتوویژە لە "شانۆ"یەك ویۆەتر نەبوو. (پێلترۆ لە ژانویەی ۱۹۹۷ بۆ ئەنجامی وتوویژی زیاتر گەڕایەوە تورکیا.)

***

لە نێوەڕاستەکانی مانگی سێپتامبردا, پاش ئەنجامی تەشریفاتێکی سەرسەرەکی کە کوردان بۆ پەڕینەوە لە سنوور و چوونە تورکیا دایاننابوو, چاوم بە تابلۆیەك کەوت کە ئاوای لەسەر نووسرا بوو: "بەخێر بێن بۆ کوردستانی ئێراق." لەبەر خۆمەوە گوتم تۆ

بڵێی ئەگەر ڕۆژێك بێیەوە ڕێزی هەنگاوت بگیرێ یا هەر بڵێی ئیزنی چوونە ژوورەوەت بدەنێ؟ لە سالآنی ڕابردوودا بارزانی و تاڵەبانی, هەر کام بە جیا پێیان گوتبووم کە باشتر وایە لۆرییەك تفەنگچی بە کرێبگرم هەتا لە بەرامبەر شالآوی پیاوەکانی ئێراقا بمپارێزن کە کەیفیان بەوە ساز دەبێ هەواڵنێرێکی ڕۆژاوایی بە نێچیر بگرن و ٧٠٠٠ دۆلار خەلآت وەربگرن. ئێراق بۆ کوشتنی ڕۆژاواییەکان خەلآتی دیاری کردبوو و ترکان هەر ڕۆژەی تەگەرە و تەنگەژەیەکی زیاتریان بۆ چوونی هەواڵنێرانی غەوارە لە تورکیاڕا بۆ ئێراق ساز دەکرد. ئەگەر ڕۆژایەکی ئێران و ئێراق پاپۆکەی دەسەلآتیان لەسەر باکوور کۆتایی پێهێنابا, داخوا دۆستانی ڕۆژاوایی وازیان لە دیداری کوردستان دەبوو؟ داخوا من ئەم مەترسییەم دەخستە سەرشانم کە بچم و ڕاپۆرت لەسەر شەڕێك بنووسم کە هەمیشە بە نوێنەرایەتی ئێران و ئێراق و تورکیا لە ناوچەدا لە گۆڕا بوو؟ داخوا ئەم دەرفەتەم بۆڕێدەکەوت؟ داخوا دەمویست؟ هەواڵنێران بە گوێرەی ڕێسایەك لایەنگری لە هیچکام لە لایەنەکانی شەڕ ناکەن و منیش ئەوپەڕی تەقەلای خۆم کردبوو کە لە ڕاپۆرتەکانمدا لانی هیچ تاقمێك نەگرم و هەر ڕووداوەکان وەگێڕم, چونکە هەرچۆنێك بێ داستان داستانە و تەنیا داستان.

سەرەڕای ئەمانەش, ئەو "ڕووحی قوماربازی"یەی کە لە دەروونی من دایە بە لای کورداندا شکابۆوە و پێمخۆش بوو لەم هەلومەرجەی کە لە ساڵی ١٩٩١دا ڕەخسا, شتێکیان وەگیر کەوتبایە. حەقیقەت ئەمەیە کە هیچیان وە دەس نەهێنابوو... ئێستا با زۆریش گوێ نەدەینە هۆ و هۆکاران کە هەمووشی دەستاوی خۆیان نەبوو. لە ماوەیەکی برێك پتر لە پێنج سالآن کە بەسەر یەکەم سەفەرمدا بۆ ئەو بەشەی ئێراقی ژێر دەسەلآتی کوردانا تێدەپەڕی, ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دە دوازدە ولآتێکی بە ئەندام وەرگرتبوو کە زۆربەیان کۆنە "ڕعێتی" یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بوون و تاقمێکیان لەم نیزیکانە, لە ئاسیای ناوەندیی و قەفقاز بوون؛ کەچی ئێستا نە تەنیا سەربەخۆیی بەڵکوو خودموختاریش بۆ کوردان خەیاڵێکی نەگونجاو بوو. ئەم خەڵکە تەنانەت خاوەنی هەلومەرجێکیش نین کە وەك "چاوەدێر" لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا حوزووریان هەبێ. تەنانەت فەلەستینییەکان خاوەنی ئەم هەلومەرجە

بوون. ئەو ڕێبەرە کوردانەی کە زەمانێکی بە ئاقڵمەندیان دەزانین, ئێستا یان مردبوون یان کوژرا بوون یان لە مەیدانیان وەدەر نابوون. ئەو ڕێبەرانەی کە مابوون و وەختایەکی وامدەزانی دەیانناسم و لە دیترانم پتر خۆش دەوێن — بارزانی و تاڵەبانی — ئێستە لەسەر بێوشوێنی باووباپیران و لە چنگی مەیل بە خۆکوژیدا تەنانەت لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئاقڵمەندانەی نیزیکترین کەسانی خۆیان نەدەسەلماند. زۆربەی ئەوانەی کە لە کوردستاندا چاوم پێیان کەوت تۆقیو و تێمابوون. لە نەبوونی ڕێبەرانی ئاقڵمەندا, تورکیا ئێستا وەك باشترین هیوای ناسیۆنالیزمی کورد خۆی دەنواند, ئەویش نەك لەبەر شەڕێکی توند و پتەو کە پ.ك.ك. لە مەیدانی تێکهەڵچوونا کەوتۆتە بێوشوێنی — ئەگەرچی گڕی ئەم شەڕە هەندێك ڕۆمرکاوە — بەڵکوو لەبەر وەی کە توانیویەتی هەستی بنچاغێکی کە لەمێژ بوو لە نێو کوردەکانی تورکیادا خەوی لێکەوتبوو, ببزێوێ و وەخەبەری بێنێ.

لە باژێری سەرسنووریی زاخۆ, شەودرەنگانێك بەر لە ڕۆیشتنم لە دووکانێکی کە لە پەنا "هوتێل بەغدا" موبایلی دەفرۆشت, ڕاستەوڕاست لە کوردێکی زەندەقچوو هەڵنەگووتم کە کاری بۆ یەکێك لە ڕێکخراوە فریارەسانەکان کردبوو. ئەو لێیسوور بوو ئەگەر بێتوو بچێتەوە ماڵی خۆی لە سلێمانی, دەکەوێتە بەر وێزەی پۆلیسی نهێنی ئێراق. بە هەر حاڵ ئەمە شتێك بوو کە گوتی. بەڵام من داخوا دەمتوانی بە "بە کرێ گرتنی" یارمەتی بدەم و لە ئێراقی دەربازکەم؟ بۆم شی کردەوە کە ئەو بەڵگەیەی من ئیمزای کەم لەبەر چاوی کاربەدەستانی یانەی "کۆچەران"ی ئەمریکا هیچ هورمێکی نابێ. ئەم شی کردنەوەیە قەناعەتی پێنەهێنا. هەوڵم دا لانی ڕێز و ئیحترام ڕابگرم, بەڵام زۆر شەکەت بووم؛ ڕەنگە ئەوەندەش کە دەکرا تێگەیشتنم نەنواندبوو. هەڵبەت من شتێکم پێنەدەگوت کە ئەو لە پێشدا نەیزانیبێ. بەڵام هەرچۆنێك بێ من غەوارەیەك بووم — ئەمریکاییەك — لە ڕاوێژم ڕا زانیبووی — چووزانی خودا چ دەکا, ڕەنگە شانس ڕووی تێکردبێ. ئەویش چەشنی زۆربەی کوردانی تر گوناهبارێك بوو کە وەبەر غەزەبی خودایەکی فرەدەسەلات کەوتبوو.

کوردێکی زۆرم دەناسین کە لە ماوەی چەند ساڵاندا نـەمامی ژیانیـان خاشـەبڕ کـرا و ئەمە کوردێکی دیکە بوو کە دەیەویست بژی.

کەوتـمەوە بیر دۆستەکەم عەبدورڕەحـمان قاسـملوو: قاسـملوو لـە کوردەکـانی ئێران بوو؛ پیاوێك بوو ئاشنا بـە داب و نـەریت و ڕێوشـوێنی جیهـان کـە لـە ١٣ی ژوونیەی ١٩٨٩دا تاقمێك پۆلیسی نهێنی ئێران, لە جلکی ئەندامانی دەسـتەیەکی وت وێژکاری سیاسی باڵادا, دایانە بـەر دەسـڕێژ و کوشـتیان. ئـەم کردەیـە بـۆ پیـاوێکی زیرەکی وەك ئەو, کردوەیەکی بێفکرانە بـوو. ئـەو دروسـت پـاش مردنـی ئایـەتوڵڵا خومەینی, بە هەڵە بە خۆی سەلـماندبوو کە تاران پێی‌خۆشە لەگـەڵ کـوردانی ئێـران ڕێك‌کەوێ. [قاسـملوو]کە زۆربە خۆی دەپاراست و ئەم کارەی بەلاوە گرینگ بـوو, وەك ئـادەمیزادێکی ناشـارەزا و کاربەکەیفـە ڕاکێـشرایە گـەرووی مەرگـەوە: لەبـەر پارێزنەکردن, ئەو پارێزەرانەی کە تاڵەبانی لە "خول"ەکانی پێشووی وتووێـــژا لـــە دێسامبری ١٩٨٨ و ژانویەی ١٩٨٩دا خستبوونییە بەردەستی "مەرەخەست"ی کردن. دروست دوو ڕۆژ بەر لەوە, لە ماڵەکەم لە پاریس, بە بۆنەی دەرچوونی یەکەم ویزای چوونە ئەمریکای بە بوتڵێك ویسکی کردبوومانە جێژن: لەمێژ ساڵ بوو وەك کەسـێکی مارکسیست و خرابکار لە لیستی ڕەشی ئەمریکادا بوو. شـەڕی سـارد – بـە خـۆی و تەواوی دمـارگری و بیرچـەوتییەکانیەوە, کـە پێداچوونەویەکیـشیان لەسـەر نـەکرا – خەریك بوو دەبڕایەوە. ئەو بە دانی کۆمەڵێك زانیاری دەربارەی بەدکرداری دەوڵـەتی ئێراق لەگەڵ کوردان یارمەتی باڵوێزخانەی ئـەمریکای دابـوو لـە بەغـدا. هـەر خـودا دەزانێ, ڕەنگە دواتر هێندێکی دەس لە کوردێتی وەکێشابێ.

وەهەرحاڵ بێ هەتا ئەو دەمەی ئاوا پارێزی وەلانـا هەمیـشە بـە بـڕوای مـن تـەنیا کوردێك بوو کە ئەوەندەی ئازایەتی و بۆیری [ لە وجوودیدا] هەبوو کە لەگەڵ هەر حکوومەتێك مامەڵە و پێکهاتنێکی شەرافەتـمەندانە و شیاو ئەنـجام بدا. تێگەیـشتنێکی کە لەسەر ڕەوت و گەڕیانـەکانی جیهـانی بـووی و دۆسـتایەتی و پێوەندگـەلێکی کـە لەگەڵ سیاسەتوانان و ڕۆژنامەنووسان و کەسانی زانستگایی ئورووپا و شوێنەکانی تـر هەیبوو, لایەنی ڕەسەن بوونی کردەوەی دەخـستە سـەر کەسـایەتی ئەوکـە بـارزانی و

ئۆجالان و تاڵەبانی و نوێنەرانی تازەکاری پارلەمانی تورکیا لێی بێبەری بوون. ژمارەیەك لە کوردان لێیان سوور بوو کە ئەگەر زیندوویایە کاری تەواوی کوردانی وەپێش دەخست, ئێستا ئەو یەکێکی تر لە شەهیدانی کورد بوو.

ئێستا کە, وردە وردە سەر و سۆراغی محەممەد جەعفەر سەحرارِوودی, کاربەدەستی دەزگای زانیاری ئێران کە گەلاڵەرێژی سەرەکی کوژرانی قاسملوو بوو و خۆی لەم کوشتارەدا بەشدار ببوو؛ لە کوردستانی ئێراق پەیدا بوو. ئەو لایەنی سەرەکی وتوویژ بوو لەگەڵ تاڵەبانی کە دەیان ساڵ شانازی بە دۆستایەتی لەتەك قاسملوودا کردبوو. (رێبەری پارتی دێموکراتی کوردستان (بارزانی) کۆمەڵێکی بەڵگەنامە نیشان دا کە دەریدەخست تاڵەبانی لەبەر پێخۆش بوونی سەحرارِوودی و ئەربابەکانی, تاقمێکی لە لایەنگرانی قاسملوو کە لە ساڵی ١٩٩٤دا هەوڵیان دابوو بچنە ئێران, گرتبوونی. ئەگەر ئەم چیرۆکە راست بێ, کە وابێ ئەم رەوتە "گۆڕانی ئامیان"ەکانی "دەق"ێکن, چونکە سی ساڵ پێشتر مەلامستەفا بارزانی رێبەرانی کوردی ئێرانی دابۆوە دەستی شا.) هیچ کوردێکی خاوەنبیر هەڵبژێرانی سەحرارِوودی بۆ وتوویژ لە بابەت خۆش کردنی نێوان لەگەڵ تاڵەبانی بە رووداوێکی بەهەڵکەوت نازانێ. ئەمە هەر ئەو شێوە سەرنجەی ئێرانییەکانە بۆ سەر "خاڵی ورد و باریك" کە بە درێژایی ساڵ و زەمانان بۆ وەبەرچاوگرتنیان بەناوبانگ بوون.

داخوا ئەمەش لەبەر پەرەگرتنی دەسەڵاتی ئێران بوولە نێو یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا کە لە هاوینی ١٩٩٦دا شێوەی ڕوخسارە وێنە کێشراوەکانی سەر دیواری سەرەڕیی هاتوچۆی ناوەندی شاری سلێمانی گۆڕا؟ ئەمانە کوردانی خاوەن ناو و ناوبانگ بوون, رێبەرانی جووڵانەوەی نەتەوەیی کورد بوون کە لە ماوەی ئەم سەدەیەدا گیانیان بەخت کردبوو. پاش ئاخرین سەردانم بۆ سلێمانی لە ١٩٩٣دا, نیگارخانەی شەهیدان هەر بەو رەنگە زەق و "هەڵپژاو"ەی کە کرێملین لە ساڵانی "گەشە"دا ڕوخساری کەسانی گومان لێکراوی پێ پاك دەکردەوە, تووشی گوڕان هاتبوو: شوێنەوارێك لە وێنەی قاسملوو نەمابوو؛ وێنەی مەلامستەفاش ببوو بە هەڵمەدووك. بە خۆم گوت داخوا بزر بوونی وێنەکەی رەنگدانەوەی ڕکەبەرایەتی

تاکەکەسی و بوغزاوی تاڵەبانی بوو یان وەرچەرخانێك بوو کە لە بیروڕای ئێرانی ئیسلامیدا بەدی هاتبوو, کە من تێی‌نەدەگەیشتم؟ جارێ تەنیا قازی محەممەد بوو کە لەسەر دیوارەوە دەیڕوانییە ڕێبواران و بینەران. قازی محەممەد خاوەنی کەسایەتی و ڕوخسارێکی پلە دووی خۆماڵی بوو؛ ئەو سەرۆکی کۆماری کەمتەمەن و بە ئاکام نەگەیشتووی مەهاباد بوو. مانەوەی وێنەکەی لەسەر ئەم دیوارە جێی سەرسوڕمان بوو. بەڵام داخوا بە لێکەوتنی شا و داکووژانی شەڕی سارد ئێستە هورمی قازی محەممەد خەوش‌وخاڵ هەڵنەگری دەنواند یان ئەمەی کە "قانوونێکی ناوچەیی, قانوونێکی نەنووسراو", ئیزنی شتێکی ئەوتۆی دەدا؟

ویلیام ئێنگلتۆن لە کۆتایی مێژووی کۆماری مەهابادەکەیدا دەگاتە ئەو ئاکامە کە ئەو کوردانەی وا لە ساڵانی ١٩٦٠دا شەڕیان بۆ بارزانی دەکرد, لە هێندێك بابەتاندا جگە لەم نەریتە کوردییەی کە لای وایە "شەڕ چاکترە لە بێکاری" بناغەیەکی فکریی ئەوتۆیان نەبوو. ئەم وتەیە بێگومان بۆ شی کردنەوەی بەشێکی بەرفرەوانی ئەم ڕووداوانەی کە منیان هێنایەوە سلێمانی, یاریدەر بوو. لانیکەم ئەمجار بە پێچەوانەی سەردەمی کی‌سینجێر واشینگتۆن دەرگاکانی خۆی لە ڕووی کوردان گاڵە نەدا و پەیتاپەیتا جێگری وەزیری دەرەوی بۆ ئەنجامی وتوویژ لەگەڵیاندا هەنارد. داخوا ئەمە بە بارێکدا پێشکەوتێك بوو؟ یا ئەمەی کە — زۆریش وێدەچێ — تەقەلایەك بوو بۆ کەم کردنەوەی شوێنەواری خەسارێکی کە وە شوێن کەوتنی سیاسەتێکی سەرنەکەوتوو بەدی هێنابوو, کە نەیتوانیبوو سەددام حوسێن تێکەوەپێچێ یان ئاشتییەك بخاتە نێوان ئیسرائیل و فەلەستینییەکان کە خۆی وادەیەکی نەگوتراو بوو کە ئەمریکا بە پاڵپشتی وی توانی پشتیوانیی عەرەبان لە هەڵمەتی "تۆفانی سارا"دا بۆ لای خۆی ڕاکێشێ؟

هەروەها ئێگلتۆن دەڵێ: "دەکرێ پێش‌بینی بکرێ کە هەر وەك چۆن لە کۆنەوە دەزانین, لە داهاتوویەکی نیزیکیشدا کوردان لە ناوچە پڕ دۆڵ و دەرەی دوورەدەست و شاخاوییەکانیاندا لایان لێ‌نەکرێتەوە یان لە بیران بچنەوە. ئەودەم بە تەماگرتن یان بە هۆی پیاوەتی و ئازایەتی, هێندێك لە چاوناسەکانی ساڵی ١٩٤٦ی مەهاباد و دیتران و لاوانێك کە ئەو دەمی لە مەهابادا نەناسرابوون, دیسان جارێکی تر سەرهەڵدەنەوە و

دەنگیان بگەیەننە گوێی خەڵکی جیهان." تەواوی هیوایەکی کـە مـن دەمتـوانی بـــمبێ ئەمە بوو کە کوردانی لاوتر و ئاقڵمەندتر دیسانیش بتوانن ئەشتەکێك لـە ژێر هەرەســی ئەم دەرفەتەی کە بۆ "ژیانەوە" زۆر لەباری دەنواند, قوتـار بکـەن. بـەڵام زۆرێـك لــە کوردان دەترسان کە سەردەمێکی نوێی داپڵۆسـین, لـە داهاتوویـەکی نەپـساوەدا, لــە لایەن وڵاتانی دەروجیرانەوە بێتە کایەوە: ئـەم دەرودراوسـێیانەی کـە ئەگـەر لــە هـیچ خاڵێکیش‌دا هاوبیر و هەست نەبن, لــە ڕق و دوژمنایەتییـەکی قـووڵدا سـەبارەت بـە کوردان و ناسیۆنالیزمی کوردا هاوبیر و هەستن. کوردان – ڕەنگە بە ڕەش‌بینییـــــەکی زۆرەوە – ئاوڕ و سەرنج وێنـەدانی ڕۆژاوایـان بـا ئێـستاش نەدرکانـدبێ, بـەڵام لــە داهاتوودا بە کارێکی ئاشکرا و بێ‌ئەملاوئەولایان دادەنا.

لە ئاخروئۆخری ئۆکتۆبرا, وەختایەکی کە لــە وەزارەتـی دەرەوە لــە نووسـینگەی کاری یەکێك لـە گەورە کاربەدەستەکاندا ڕۆنیشتبووم, لـە خۆم دەپرسـی: داخـوا ئـەم خەڵکە بەشەرەفە چ لــە وتـەکانی ئـەم کاربەدەسـتە پایەبـەرزە هەڵـدەکرێنن کـە زۆر پێداگرانە دەڵێ ئەو چەترە ئاســـمانییەی کـە کوردسـتان دەپـارێزێ, تەنانـەت ئەگـەر ئەیالـەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تاقیش بکەوێتـەوە دیـسانیش هـەر کـۆ ناکرێتـەوە!؟ دۆستە دیپلۆماتەکەم ئێراق و کـوردانی وەك "لـوبنـانی سـاڵانی دەیـەی ۱۹۹۰" بـاس دەکرد؛ ئەویش وێڕای تەواوی ئەم خەفەتانەی کـە ئـەو گێـرە و کێـشە دووورودرێـژ و پڕاوپڕ لـە زوڵم و زەبروزەنگ و ئاژاوەیەی ڕۆژهـەڵاتی مەدیتەرانـە بـە دوایـەوە بـوو. هەرچۆنێك بوو, من گومانـم لـەمەدا هەیە کە پێش‌بینی ڕابوونەوەی هەتاهـــەتایی, لـــەو ماوەیەدا کە توانای کارانـم ماوە, وەدی بێ. لێم‌ببوورن ئەگەر وەك هەواڵنێرێکی پیر و لەخۆبایی خەم دەخۆم, چونکە لـە ناخی دڵەوە ئاواتەخوازم کە ئەی خۆزگە ئـەو کـات لەوێ بووبایەم و هەواڵی ڕەوتی خەباتیانـم بڵاوکردبایەوە.

## ئەو هێزانەی کە لە ماوەی پاشەکشەی بارزانییەکان لە ئێراقەوە بۆ ئاراز بەشداری شاڵاوەکان بوون.

١– هێزەکانی دامەزراو لە بەرەگەی بەرگریی خۆی – قتوور
ئەلف – ٤ گوردانی پیادە کە بریتی بوون لە:
گوردانی ٣ی هەنگی ١٠
گوردانی ٢ی بەهادور
گوردانی ٢ی هەنگی ٣٢
گوردانی ٣ی هەنگی ئاهەن
ب – ئاگربارێکی تۆپی ٧٥ی چیایی ٤ قەبزە
ج – ئارەبانەی شەڕ ٤ دەزگا
د – بێتەل ١ دەزگا
٢– هێزەکانی شوێنگێڕ لە ستوونی تەرگەوەڕ کە بریتی بوون لە:
ئەلف: گوردانی ئیسفەهان
ب – گوردانی ئازەرپاد
ج – تۆپی ٧٥ی چیایی ٢ قەبزە
د – ئارەبانەی شەڕ ٢ دەزگا
هـ – بێتەل ١ دەزگا
٣– هێزەکانی پاشەکەوت و پشتیوان دامەزراو لە شاپوور (سەلْماس):
ئەلف – هەنگی سوارەی فەوزیە جگە لە پۆلەسوارێك
ب – ئاگربارێك تۆپی ٧٥ی چیایی ٤ قەبزە
ج – بێتەل ١ دەزگا
٤– ستوونی ماکۆ بریتی بوو لە:
ئەلف – گوردانی ١ی هەنگی ١٢ی کرمەشان

ب – گوردانی ٢ی هەنگی ٢٧

ج – دەستەیەك خۆمپارەهاوێژ ٢ قەبزە

هـ – بێتەل ١ دەزگا

٥– سیاچەشـمە:

ئەلف – گوردانێك لـە هەنگی بەهادور

ب – بێتەل ١ دەزگا

٦– قەرەزیائەددین:

ئەلف – گوردانی ٢ی هەنگی ١٢

٧– خۆی:

ئەلف – هەنگی سوارەی کوردستان جگە لە پۆلـەسوارێك [1]

٨– سەرجەمی ئەو پۆل و لکانەی نێردرابوونە بەرە:

ئەلف – ١٠ گوردانی پیادە (بە بێ قۆرخانەی پشتیوان)

ب – دوو هەنگی سوارە جگە لـە ٢ پۆلـەسوار

ج – ١٤ قەبزە تۆپی ٧٥ی چیایی

د – ٦ ئارەبانەی شەڕ

هـ – ٢ قەبزە خۆمپارەهاوێژ

و – ٥ دەزگا بێتەل

٩– ئەوانەشی بێتە سەر:

ئەلف – فڕۆکەکانی بنەگر لـە فڕگەکانی تەورێز و ڕەزائییە و ماکۆ

ب – جاشە چەکدارەکانی شکاك بە سەرکردایەتی سەرگورد سوڵحجوو – جاشە چەکدارەکانی ڕەشید بەگی هەرکی بە سەرکردایەتی سەروان زەررابی و بەکرێگیراوانی چەکداری سەرۆك عەشیرەتەکانی ماکۆ بە سەرکردایەتی سەرهەنگ زالتاش

ج – هێزەکانی ژاندرمە [2]

١- زەربەخت, مورتەزا, لە کوردستانی ئێراقەوە تا ئەوبەری چۆمی ئاراز, لاپەڕە ٨٣ - ٨٤, ڕاپۆرتی سەرهەنگ فیوزی سەرۆکی ناوەندی سەرکردایەتی لەشکری ٤ی ئازەربایجان.

٢- هەمان.

# یادداشتەکان

## بەشی ١

➢ "قەتڵی ڕێبەرانی کورد لە ئێراق", بڕوانە سیامەند عوسمان: "موتالا لە مێژووی پارتی دێموکراتی کوردستانی ئێراقا ١٩٤٦ – ١٩٧٠", کۆتاییناوەی بلاونەکراوەی خولی دوکتۆرای قوتابخانەی بالای موتالاکانی کۆمەلایەتی, پاریس ١٩٨٥, لاپەڕە ١١٥ و "سولحێکی کە کۆتایی بە هەموو سولحێک هێنا": "ڕووخانی ئیمپراتۆریتی عوسمانی و پێکهاتنی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستی نوێ." نیۆیۆرك ١٩٨٩, لاپەڕە ٤٢٢.

## بەشی ٢

➢ "هەزاران ئاخ..." ڕێنێ مووریە, "یا مەرگ یا کوردستان" پاریس ١٩٦٧, لاپەڕە١٥.

➢ ژمارەکانی زیادبوونی جەماوەر: دێیوید مەك داوڵ, "مێژووی هاوچەرخی کورد", لەندەن, لاپەڕە ٤٤١.

➢ بەراوردەکان پێشاندەری ئاستی مامناوەندی ئەو ژمێرانەن کە لە چەندین دەوڵەت و سەرچاوە نەتەوەییەکانی کوردەوە وەرگیراون. دەبێ بە پارێزەوە چاو لەم ژمارە و ڕێژە جەماوەرییە بکرێ. بۆ وێنە دەتوانین بە مەبەستی لەبەریەك ڕۆنان و پێکگرتن ئەمە بزانین کە کۆمەڵی نەتەوەکان لە ١٩٢٥دا جەماوەری کوردستانی بە سێ میلیۆن کەس قەبلاندووە کە نیوە لە تورکیا, ٧٠٠/٠٠٠ کەس لە ئێران ٥٠٠/٠٠٠ کەس لە ئێراق و ٣٠٠/٠٠٠ کەسیان لە سووریا دەژیان. بیست ساڵ دواتر وێڕای نەخشەیەکی کە لە سانفرانسیسکۆ درایە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارەی ٩ میلیۆن کەس هاتە گۆڕ, کە بێگۆمان ژمێرەیەکی بالا بوو. لە نێو ئەو کەسانەدا کە

لانی‌کەمیان دێنایە گۆڕ ویلیام لین وێستزمان دیارە کە لە بەرهەمەکەی خۆیا بە ناوی کاروباری دەرەوە (ژووئیەی ١٩٤٦) جەماوەری کوردی بە ٢/٤١٩/٠٠٠ کەس دا دەنا, بەمجۆرە: تورکیا و ئێران هەرکام ٧٠٠/٠٠٠ کەس, ئێراق ٤١٩/٠٠٠ کەس, یەکێتی سۆڤیەت ١٢/٥٠٠٠ کەس و سووریا ١٠٠/٠٠٠ کەس. مارتین وان برووئین سێن ئاگادار لەسەر کێشەی کورد لە ١٩٧٠دا ژمارەی جەماوەری کوردستان بەمجۆرە دەقەبلێنێ: تورکیا ٥/٧ میلیۆن, ئێران ٤ تا ٤/٥ میلیۆن, ئێراق ٢ تا ٢/٥ میلیۆن, سووریا ٥٠/٠٠٠ و ٦٠/٠٠٠ تا ١٠٠/٠٠٠ کەس لە یەکێتی سۆڤیەت. دێیوید مەك داولّ لە بەرهەمی خۆیا بە ناوی "کوردان, گەلێکی مافخوراو" (لەندەن ١٩٩٢, لاپەڕەی ١٢) سەرجەم کوردان بە ٢٢ میلیۆن کەس دەزانێ, بەمجۆرە: تورکیا ١٠/٨ میلیۆن یان لە سەتا ١٩ی جەماوەری ٥٧ میلیۆن کەسی ولاّت؛ ئێراق ٤/١ میلیۆن یان لە سەتا ٢٣ی جەماوەری ١٨ میلیۆنی ولاّت؛ ئێران ٥/٥ میلیۆن یان لە سەتا ١٠ی جەماوەری ٥٥ میلیۆنی ولاّت؛ سووریا ١ میلیۆن یان لە سەتا ٨ی جەماوەری ١٢/٥ میلیۆنی ولاّت. نیومیلیۆن لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و ٧٠٠/٠٠٠ کەس لە شوێنەکانی‌تر, بە لانی زۆر لە ئورووپای ڕۆژاوا.Mountainaus irrelevancy: بڕواننە کتێبی کوردان، نووسراوی مێهرداد ئیزەدی. واشینگتۆن و لەندەن ١٩٩٢، لاپەڕە ٤١.

– ژمارەی مردووەکان نیزیکەی ٤٠٠٠ کەس بوو؛ هەمان سەرچاوە.

⮘ ٧٠٠٠٠٠ کەس کە زۆر و کەم نیوەیان تێداچوون: سوورەییا بەدرخان "سکالاّی کوردان دژی تورکیا" پرینتێستێن، لاپەڕەکانی ٣٣ – ٣٤، بە گوێرەی گێڕانەوەی "کوردان و کوردستان" نووسراوی ئارشاك سێفراستیان، لەندەن، ١٩٤٨، لاپەڕە ٧٦. سەرچاوەکانی تر کوژران و تێداچوونی کوردان لە ماوەی شەڕا بە ٧٠٠٠٠٠ کەس دەقەبلێنن. بڕواننە نووسراوەی کەندالّ لە "خەلّکی بێ‌دەولّەت"دا، (ژرار شالیان).

⮘ "کوردستان نیشتمان بوو": ئیزەدی، "کوردەکان"، لاپەڕە ٥٩.

⮘ "سازکردنەوەی مێژووی کوردی": هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٣.

➢ "کــــوردان دەتـــــوانن ... بـــــیخەنە ڕوو": وێـــــسترمان؛ "کاروبـــــاری دەرەوە"، (ژووئیەی ١٩٤٦).

➢ گزنفۆن، "ئاناباسیس" (لەشکرکێشی سەرنەکەوتوو).

➢ "ژمارەیـــان ڕوو لـــە کـــەم بوونەوەیـــە": ئیـــزەدی، "کوردەکـــان"، لاپـــەڕەکانی ١٤٥ و ١٥٨.

➢ "دوژمنایەتییـــەکانی بنەماڵـــەیی": مـــارتین وان بـــرۆئین ســـێن، گۆڤـــاری گوزارشـــتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست (ژووئیە – ئووتی ١٩٨٦).

## بەشی ٣

➢ مالرۆ: "دارگوێزەکانی ئاڵتنبێرگ"، پاریس ١٩٤٥.

➢ "ئەگەر لە بیرتان چۆتەوە": واشینگتۆن پۆست، ٢٥ی ژانویەی ١٩٩١.

➢ نیزیکەی ٤٠٠ پیاوی بەعسی: وتوویژ لەگەڵ وشیار زێباری، سەلاحەددین، ٢٠ی فێوریەی ١٩٩٢. کەنعان مەککیە لە نووسراوەی خۆیا بە ناوی "دڵڕەقی و بێدەنگیی، شەڕ، زۆرکاری، شۆڕش و جیهانی عەرەب" ژمارەیەکی بالاتر، واتە دەڵێ ٧٠٠ کەس.

➢ "لە هەڵەبجە چیان کرد": بە گوێرەی نووسراوەی مەککیە، لاپەڕە ٨٩.

➢ "نیزیکەی ٣٠٠٠ کەس": وتوویژ لەگەڵ نۆشیروان مستەفا ئەمین، لەندەن، ٢٣ی نوامبری ١٩٨١ [١٩٩١].

➢ "چـرکەیەك": گـوین ڕابێـرتس – فیلـمێکـی بەڵگـەداری تەلـەفیزیۆنی بـە نـاوی: "ئەوخەیاڵەی خەیانەتی پێکرا"، ئاوریلی ١٩٩١، کەناڵی چواری لەندەن، بە گـوێرەی گێڕانەوەی مەککیە لە "دڵڕەقی و بێدەنگیی"دا، لاپەڕە ٨٩.

➢ "ئاکامی حەفتا ساڵ خەبات": کۆنفرانسێکی ڕۆژنامـەوانی، هـەولێر، ٢٤ی مارسـی ١٩٩١؛ بڕوانە ژمارەی ٢٧ی مارسی ١٩٩١ی واشینگتۆن پۆست.

➢ "من قەت وامنەدەزانی": وتوویژ لەگەڵ نۆشیروان مستەفا ئەمین، لەندەن، ٢٣ی نوامبری ١٩٩١.

➢ "ژمارەی تانکەکانی ئێراقی": ژمارەی ٢٥ی مارسی ١٩٩١ی نیۆیۆرك تایمز.

➢ "دەمانتوانی بمانبێ": نیۆیۆرك تایمز، ٢٥ی مارسی ١٩٩١.

➢ "شیاوی باس": گوزارشت لە ئیندیپێندنتی یەکشەممۆیاندا، ڕێکەوتی ٨ی دیسامبری ١٩٩١، جان بولاك لە زمان "ژێنێراڵ کالین پاوێل" سەرۆکی ناوەندی سەرکردایەتی هاوبەشەوە دەگێڕێتەوە کە لە ٢٥ی ئووتی ١٩٩١دا بە یەکێك لە ژێنێراڵەکانی گوتووە: "من تەنیا بیر لە کۆتایی کایەکە دەکەمەوە. ئێمە سەرەنجام لەگەڵ ئێراق چ دەکەین؟ ئێمە دەتوانین هیچیان بۆ نەهێڵینەوە. بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی لەتەك ئێرانا چیمان بە دەستەوە نیە. بە بڕوای من باشتر وایە لێیان گەڕێین سپایەکی ١٠٠٠٠٠ کەسی و نیزیکەی ١٠٠٠ تانکێکیان هەبێ."

➢ "پێنج ساڵ دواتر": وتوویژی ناوەندی وتە وەشاندنی پابلیك بروود کستینگ کووڕپووریێشن لەگەڵ دێیوید فراست، بە گێڕانەوەی لۆس‌ئانجلێس تایمز، لەگەڵ چاپی دووبارە لە ژمارەی ١٦ی ژانویەی ١٩٩٦ی ئینتێرنەشناڵ هرالد تریبیۆندا: "بووش گوتی دەبوو بیر لە لابردنی سەددام کرابایەوە ... من دروستم لێك نەدابۆوە، لام وابوو دەڕوا."

➢ "سەدان هەزار کەس لە کوردەکانی تورکیا": سەرهەنگ فرانسوا بووك واڵتێر، وابەستەی پێشووی نیزامیی فەرانسە لە تورکیا حیسابی کرد کە ٤٠٠٠٠٠ تا ٧٠٠٠٠٠ کورد ڕایانکرد. وتوویژ لەگەڵ نووسەر، پاریس، ١١ی نوامبری ١٩٩١.

## بەشی ٤

➢ سەری سوڕمابوو كە "ئەم خەڵكـە بۆچـی هێنـدە بـۆ كـوردان خۆیـان دەچـۆقێنن": وتوویژ لـەگەڵ یەكێك لـە كاربەدەستانی كۆشكی ئێلیزە كە زۆر پێـداگر بـوو نـاوی نەدركێ.

➢ "گریـمانەی تـاوانی مێـژوویی": وتوویـژ لـەگـەڵ دێیویـد گوربـووس، لـە یانـەی كاروباری دەرەوە و شەریكەقازانج، لەندەن، ٢٨ی نوامبری ١٩٩١.

➢ "منالّەكان جوانن": وتوویژی تەلـەفۆنی لـەگەڵ ئالێن پیـزی، ڕۆم، ١٤ی ژانویـەی ١٩٩١.

➢ ئێریك ڕۆلۆ: وتوویژ لـەگەڵ ڕۆلۆ، پاریس، ١٦ی ژوەنی ١٩٩٤.

➢ "فرۆشـتنی فڕۆكـەكانی هـانتێر"، وتوویـژ لـەگـەڵ بـاڵوێز "بێرنـار دووریـن"، باڵوێزخانەی فەڕانسە، لەندەن، ٢٧ی نوامبری ١٩٩١.

➢ "ڕاكردنی گالبریس لـە یەكشەمـمۆی جێژنی پاكدا": وتوویـــژ لـەگـــەڵ پیتێـــر گالبریس، واشینگتۆن دی.سی. ٢٩ی ژووئیەی ١٩٩١.

➢ "وەك خۆكوژیی سیاسی دەبوو": وتوویـژی تەلـەفۆنی لـەگـەڵ بـاڵوێزی ئـەمریكا "مورتۆن ئابراموویتێس، واشینگتۆن دی.سی. ٨ی ئووتی ١٩٩١.

➢ "كەلامی سێحراوی": وتوویژ لـەگەڵ پاتریش پاتۆلی، وەزارەتـی دەرەوە، پـاریس، ٢ی نوامبری ١٩٩١.

➢ "هەڕەشە لـە ئاشتی و تەناهی جیهان": وتوویژ لـەگەڵ تونگـای ئوزچـری بـاڵوێزی توركیا، بنكەی ناتۆ، برووكسێل، ٢٢ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢ Refoulement (گێڕانەوەی پەنابەران بۆ زێـد و نیـشتمانیان): پێـنج سـاڵ پـاش گێڕانەوەی بە زۆرەملی هووتووەكان لـە تانزانیـا و زەئیـرەوە بـۆ نیـشتمانیان (ڕوانـدا)، یەكێك لـە كارناسانی كاروباری پەنابەران باسی بڕیـارێكی كـرد كـە بـە گـوێرەی وی قەرار وابووە لـە ١٩٩١دا لـە بری وەی كوردان بچنە خاكی توركیـاوە، وەك پێـشەكی و دەسپێكێ بۆ كۆتایی هێنان بە پەنابەریی سیاسی بە جۆرێك كە لـە بەشـی هـەرە زۆری نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا لـەم لـەبزەوە دەردەكەوێ، لـە خاكی ئێراقا ڕاگیریان كەن. بەڵام ئەمە ڕەنگدانەوەی شێوە تێگەیـشتنێك بـوو كـە لــە برانــەوەی شـەڕی دووەمـی

جیهانییەوە بۆ ئەم لایە و لــە مـاوەی شەڕی ساردا بــرەوی هەبوو. لـەوان سەردەماندا لـەبری دابین کردنی یارمەتی و باڵ بەسەرکێشان بەسەر ئەم چەشنە پەنابەرانە لـە زێـد و نیشتمانیاندا، لـە وڵاتانی سێهەمدا وەك جەماوەری جیهانی وەردەگـیران و میوانـدارییان دەکرا.

➢ "نارەزامەندیی سەرەتایی دەوڵـەتی بووش سەبارەت بە گەڵاڵـەی ناوچـەی پـارێزراو": وتوویژ لـەگەڵ ئوزچـری، ٢٢ی ئۆکتـۆبری ١٩٩١. ئوزچـری گـوتی: "وەختایـەك ئوزەل یەکەم جار فکری دانانی "ناوچەی پارێزراو"ی لـەتـەك "بێیکێـر"دا هێنایـە گـۆڕ، بێیکێر سەری سوڕما و گوتی کە دەوڵـەتی ئەمریکا لـەگەڵ ئەم بیرە کـە بـە بـڕوای وی مەترسیدار و نائاسایی بوو ڕێكناکـەوێ و زیـادی کـرد واشـینگتۆن دەیـەوێ زۆر زوو هێزەکانی لـەم گەڕ و گەرداوە بەرێتە دەر نەك ئەمەی کە لـە باکووری ئێراق لـە شەڕیان وەردا.

➢ "لــە بابــەت نـاردنی یارمەتییــەکانی مــرۆڤدۆســتانەوە": ماریۆبتـاتی، مامۆسـتای کاروباری دەرەوە، زانکۆی پاریسوو (پاریسی باشووری)، لـە وتاری ژمارەی ڕێکـەوتی ١٤ی ئاوریلی ١٩٩١ی واشینگتۆن پۆستدا.

➢ "کارتێکردنی ڕۆڵۆ لـەسەر ئابرا موویتێس و هەناردنی دیپلۆماتەکانی ئـەمریکایی بـۆ سەر سنوور": وتوویژ لـەگەڵ مارك گروسـمەن، باڵوێزخانـەی ئـەمریکا لــە ئانکـارا، ٢ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "لوێچێك گەنـمەشامی باوێیە بەر پۆلـە کۆترێك": ئان دێـو ڕووی و مـوولی مـوور. واشینگتۆن پۆسـت. چـاپی سـەرلـەنوێ لــە ژمـارەی ڕێکـەوتی ٥ی ئـاوریلی ١٩٩١ ئینێتـرنەشناڵ هرالـد تریبیۆن.

➢ "گرینگایـەتی دیدارەکـەی بێیکێـر": وتوویـژ لـەگـەڵ ئـابراموویتێس، ٨ی ئـووتی ١٩٩١.

➢ "ڕەنگە باشترین دوازدە خولـەکێکی بەختکراو بـێ": لـەسـەر زمـانی دان کـرووم، کاربەدەستی بەرپرسی کاروباری پەنابەران، سەر بە باڵوێزخانەی ئەمریکا لـە ئانکارا، لـە وتوویژ لـەگەڵ نووسەراندا، ژنێڤ، ٣١ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "تەنیا شالاّوی نیزامیی": وتوویژ لەگەڵ جین هووارد، ئیدارەی کاروباری دەرەوە و شەریکەقازانج، لەندەن، ۲۱ی ژووئیەی ۱۹۹۱.

➢ کەلك وەرگرتن لە فڕۆکەی سی – ۱۳۰: ویکتۆر تاتێر. "شالاّوی بێ هاوتا، ئەو پەندانەی کە لە ۱۹۹۱دا فێریان بووین" ڕاپۆرتی ئینتێر تێکت، فرێدریك کۆنی، کە لە ماوەی چالاکی دابین کردنی ئاساییشدا ڕاوێژی بۆ هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا دەکرد.

➢ "ئەو حەوتە ترسناکانەی کەس لە پای تەلەفۆن نەبوو": وتوویژ لەگەڵ گوربووس، ۲۸ی نوامبری ۱۹۹۱.

➢ "ژمارە و ڕادەی تێداچووەکان": ناوەندی پێش‌گرتنی نەخۆشییەکان، ڕاپۆرتی حەوتانەی نەخۆشییەکان و مەرگ و نەمان، ٥ی ژووئیەی ۱۹۹۱، بەرگی ٤٠، ژمارەی ۲٦ بۆ سنووری تورکیا، وتوویژی بە تەلەفۆن لەگەڵ کۆمیسارییای بالاّی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کاروباری پەنابەراندا, ژنێڤ, ١٤ی دێسامبری ۱۹۹۳. سەبارەت بە ژمارەکانی پێوەندیدار بە ئێرانەوە, کاربەدەستێکی ئەمریکایی لە دەسپێکی ئاوریلا مەترسی گەورەی لە بلاّڤۆکاندا بلاّوکردەوە: "ڕۆژانە ۱۰۰۰ کەس دەمرن و ئێمە بە بەرپرسیار دەزانن" و هەروەها یەکێك لە کاربەدەستانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئێران کە گوتی ڕۆژانە ۲۰۰۰ کەس لەم ولاّتە دەمرن. ڕادەی مەرگ و نەمان بە پێی ڕاپۆرتی "ناوەندی پێش‌گرتنی نەخۆشییەکان" دابەزی, چونکە دوو بالّی زۆر ناسکی جەماوەر, یانی منالاّن و پیران, خێرا تێدا چوون و هەروەها لە سایەی خۆتێوەردانی خێرای پزیشکانی کلاّوشین لە سنووری تورکیا, کە خێرا باری ساخلەمییان بەرەو باشی برد, ئاوی خاوێنیان دابین‌کرد.

➢ "نەك تەنانەت دۆلارێك": وتوویژ لەگەڵ جەلال تالّەبانی, هەولێر, ۱۲ی فێوریەی ۱۹۹٦.

➢ "دەرفەتێك لە دەس نادا..." دێوید بروودێر, لە واشینگتۆن پۆست لە ئینتێرنەشنالّ هرالد تریبیۆن, ڕێکەوتی ۱۰ی ئاوریلی ۱۹۹۱.

➢ "ئەوانەی بردیانەوە...": ویلیام سافایر, لە نیۆیۆرك تایمز, لە "ئینتێرنەشنالّ هرالد تریبیۆن"ی ڕێکەوتی ۲ی ئاوریلی ۱۹۹۱دا.

➢ "کاربەدەستانی ئینگلیسی بڕوایان وا نەبوو ...": وتوویــــژ لەگــــەڵ دیپلۆماتــــە ئینگلــــسییەکان کــــە ویــــستیان ناویــــان نــــەبرێ – ئیــــدارەی کاروبــــاری دەرەوە و شەریکەقازانج, ٢٣ی ژووئیەی ١٩٩١.

➢ "لەسەرەخۆ سەری هەڵێنا..." وتوویژ لەگەڵ ڕیچارد هاس, واشینگتۆن دی.سی. ١٩ی دێسامبری ١٩٩١. هاس پێنج ساڵ دواتر دەستی لە کار هەڵگرت. کاتێك کوردان دایانە کێو, ئەو لە دۆزەکە نەگەیشت و دەولەتی بۆ خۆگنخاندن دنە دا. بە شێوەیەکی کە هیچ قسەیەکی بە بیسەر نەدەهێشت, گوتی: "هەڵەم کرد."

➢ "ڕاوێژیان لەگەڵ ئێمەدا نەکرد..." وتوویژ لەتەك یەکێك لە کورسینشینان کە پێیخۆش بوو بە نەناسیاوی وەمێنێ, وەزارەتی دەرەوە, واشینگتۆن دی.سی. ٢٨ی ژووئیەی ١٩٩١.

➢ "دوژمنایەتی خەڵك": وتوویژ لەگەڵ فیبیمار, واشینگتۆن دی.سی. ٢٨ی ژووئیەی ١٩٩١.

➢ "لە شوێنی خۆیان بنەگر ببوون": ئان دێو ڕووی و موولی موور, واشینگتۆنپۆست و چاپی سەرلەنوێ لە ئینتێرنەشناڵ هرالد تریبیۆندا, ١٥ی ئاوریلی ١٩٩١, دەربڕی کە ئەم بڕیارانە لە پایزی ١٩٩٠دا گیراون.

➢ "ئەگەر بێیکێرت دواندبا": وتوویژ لەگەڵ دیپلۆماتێکی باڵای ئەمریکا کە لەگەڵ بێیکێر یەکبوو و بەم مەرجە وتوویژی کرد کە ناوی نەدرکێ.

➢ "١٠٠٠٠ کەس": بە گوتەی ژێنێراڵ ئێچ. نۆرمەن. شوارتسکۆف لەم شەڕەدا ٢٨ کەس لە هێزە هاوپەیمانەکان کوژران. (شوێنێك بۆ قارەمانێتی نامێنێتەوە, نیۆیۆرك و لەندەن, ١٩٩٢, لاپەڕە ٥٦٤.) کوژراوانی ئەمریکایی بریتی بوون لە ١٤٨ کوژراو, بە پێی گوتەی تێئۆدۆر درییێر ٣٨ کەس بەر گوللە و دەسڕێژی هێزەکانی خۆیی کەوتن, توێژینەوەی کتێبی نیۆیۆرك, ٣٠ ژانویەی ١٩٩٢, لاپەڕە ٤٢.

➢ "لیزگەیەك بێئابروویی": ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ناوکی لە فێوریەی ١٩٩٦دا گوتی پتر لە دە دوازدوە دامەزراوەی ئورووپایی بۆ تەیار کردنی ئێراق بە چەکی ناوکی

پێكەوە كۆبەركێیانە؛ ئەو چەكانەی كـە وێدەچـێ لـە سـاڵی ١٩٩١دا دژی هێزكـانی ڕۆژاوایی دەكار كرابن. دەربڕینی ئەم مەبەستە دروست بەر لە بلاوكرانەوەی ڕاپۆرتی ئێسكات بـوو كـە سـەبارەت بـە كەترەخـەمی بـە ئانقەسـتی بریتانیـا، لەمـەڕ نـەدانی گوزارشت بە پارلەمان، پاش شەڕی ئێران و ئێراق، خەریكی كۆڵینـەوە و بێڕاگەیـشتن بوو؛ چونكە دەوڵەت لـەمـە ترسـابوو كـە ئـەم شـێوە مامەڵانـە لـە بـاری سیاسـییەوە سەرێشەی بۆ سـاز كـا. هـەروەها لـە ١٩٩٢دا كۆمیـسیۆنی كۆڵینـەوەی كاروبـاری سەبارەت بە وزە و بازرگانێتی پارلـەمان شایەدی كاربەڕێوەبەرانی دەوڵـەتی لـە بابـەت سیاسەتی ئەمریكاوە دەربـارەی ئێـراق گـوێ دایـە: نیۆیـۆرك تایـمز لـە ٨ی مارسـی ١٩٩٢دا بە وتەی گاری میلوولین، بەڕێوەبەری پرۆژەی چاوەدێری چەكە ناوكییەكان و یەسكانسین نووسی: "لـە مابـەینی سـاڵانی ١٩٨٥ و ١٩٩٠دا وەزارەتـی بازرگـانی ئەیالـەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا وەرەقەی نـاردنی كەلوپـەل و كەرەسـەی بارناسـكی ئیستراتژیكی بە بڕی ١/٥ میلیارد دۆلار بۆ ئێراق پەسند كرد. زۆرێك لەم كەرەسـە و كەلوپەلانە ڕاستەوخۆ بۆ ساز كردنی چەكی نـاوكی و شـیمیایی و دامـەزرانی بنكـەی هاویشتنی مووشەك دەكار دەكران." ڕاستەوڕاسـت دەقـی ئـەم مەبەسـتە لـە ژمـارەی ٢٥٠ی "میدێل ئیست ئینتێرنەشناڵ"ی ڕێكەوتی ١ی مارسی ١٩٩٦یشدا چـــــاپ كراوە.

➢ "یـەكێك لـە سەرچـاوەكانی بـانكی ناوەنـدیی ئێـراق": یـەكێك لـە دوورخـراوە كوردەكان كە زۆری نێوان لـەگەڵ ئەم بانكە خۆشـە، بـە مـەرجی نـاو نـەدركانی ئـەم زانیارییانەی وێدام، وتووێژ لـەگەڵ نووسەر، پاریس، ٢٥ی سێپتامبری ١٩٨٨.

➢ "ئورووپاییەكان شتی زیاتر بفرۆشن": وتووێژ لـەتـەك یـەكێك لـە كاربەدەسـتانی وەزارەتی دەرەوەدا، كە لە دەیەی ١٩٨٠دا لـە كەنداو كاری دەكـرد و بـە شـەرتێك ناوی نەدركێ وتووێژی كرد. ٢١ی دێسامبری ١٩٩١.

➢ "ئێـراق كـە بـە خـۆی و سـپایەكی یـەك میلیـۆن كەسـی لـە شـەڕ قوتـار بـووە". شوارتسكۆف: "شوێنێك بۆ قارەمانێتی نامێنێتەوە"، لاپەڕە ٣٤٦.

➢ "دەفتەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا، هێزەکانی تەواو لێ ڕاگوێزرابوو": وتوویژ لەگەڵ یەکێك لە کاربەڕێوەبەرانی نووسینگە، بە مەرجی ناو نەدرکانی؛ واشینگتۆن دی.سی. ٢٢ی دێسامبری ١٩٩٣.

➢ "کاری ئێمە لە ڕووی بینینەوە بوو": ڕابێرت دی.کاپلان: "لایەنگرانی عەرەبان: ڕۆمانسی یەکێك لە هەڵکەوتوانی ئەمریکا، نیۆیۆرك، ١٩٩٢، لاپەڕە ٢٧٤.

➢ "درایە دەس کارناسێکی خانەنشینی کاروباری کوردستان": وتوویژ لەگەڵ ئێگلتۆن، ویەن، ٢ی ژانویەی ١٩٩٢.

➢ "هەڕەشەیەك نەبوو بۆ سەر ئێمە": بە کوتەی دێو ڕووی و موور لە واشینگتۆنپۆستەوە لە ئینتێر نەشناڵ هرالد تریبیۆندا، ١٥ی ئاوریلی ١٩٩١.

➢ "تاڵەبانی لە وەزارەتی دەرەوە": وتوویژ لەگەڵ دیپلۆماتێك لە نووسینگەی کاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا کە سوور بوو لەسەر ئەمەی ناوی نەدرکێ، واشینگتۆن دی.سی. ٢١ی دێسامبری ١٩٩٢.

➢ "مەیلی سەبارەت بە ... فەرمانی بەڕێوەبەرایەتی لە لایەن سەرکۆمارەوە": وتوویژی تەلەفۆنی لەگەڵ شبلی مەلات، مامۆستای قوتابخانەی باڵای موتاڵای ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و ئەفریقا، لەندەن، ١٥ی فێوریەی ١٩٩٥.

➢ "پرسیارەکانی ئێوە سەرنجڕاکێشتر بوون": وتوویژ لەگەڵ کایا تویری، ئانکارا، ٣٠ ژانویەی ١٩٩١.

➢ "سێسەت چوارسەت لاپەڕەم خوێندەوە": وتوویژ لەگەڵ تورگوت ئوزەل، کۆشکی سەرکۆمارێتی، ئانکارا، ٦ی ژانویەی ١٩٩٣.

➢ "ئەو شتانەی هێشتا بیرمان لێ نەکردوونەوە": وتوویژی تەلەفۆنی لەتەك کامران قەرەداغیدا، لەندەن، ٢ی فێوریەی ١٩٩٤.

➢ "گەشتی چاندار بۆ لەندەن": وتوویژی تەلەفۆنی لەگەڵ چاندار، ئیستامبووڵ، ١٥ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "تکا دەکەم، تکا دەکەم ..." وتوویژ لەگەڵ قەرەداغی، لەندەن، ٢٩ی نوامبری ١٩٩١.

➢ "هێزەکانی ئێراقی دەکەوتنە خۆ" وتوویژ لەگەڵ پات trووس، جێگری سەرۆکی لیژنە، باڵوێزخانەی ئەمریکا، عەممان، ١٤ی مەی ١٩٩١.

➢ "پێکەنیون و پرسیویانە تۆ چیت لێ‌هاتووە ...": وتوویژ لەگەڵ ئابراموویتێس، ٨ی ئووتی ١٩٩١.

➢ "یەکەم دیداری ترکان و کوردان": زۆر دواتر تاڵەبانی گوتی کە گرینگترین دەسکەوتی ئەم دیدارە ئەمە بوو کە ئیتر تورکیا سەبارەت بە پێوەندی ڕاستەوخۆی نێوان ئەمریکا و کوردان ئیعترازی نەکرد. بڕواننە نووسراوەی مایکێل ئێم. گونتێر بە ناوی "کوردەکانی ئێراق"، تراژێدی و ئومێد"، نیۆیۆرک، ١٩٩٢، لاپەڕە ٥١، هەروەها وتوویژ لەتەك ئوزچری‌دا لە ناوەندی ناتۆ، برووکسێل، ٢٤ی ئۆکتۆبری ١٩٩١؛ ئوزچری وە بیری هێنایەوە کە ناوەندی سەرکردایەتی سپا لە تورکیادا بە دروستی تێکشکانی هێزەکانی سووکەڵەچەکی کوردی لە بەرامبەر سپای ئێراقا پێش‌بینی کردبوو: هەڵبەت نەك بەو شێوەیەش کە ئێراقییەکان لایان وابوو تەنیا گوردانێکی زرێدار بەس دەبێ.

➢ "زانیارییەکان ... دەنێردران بۆ ددانسازێکی کورد": وتوویژ لەگەڵ پیتێر گالبریس، زاگرێب، ٣٠ی ژوەنی ١٩٩٣.

➢ "ڕیچارد شیفتێر ... خۆی کەنار دا": وتوویژ لەگەڵ کەندال نزان، سەرۆکی ئەنستیتۆی کوردی پاریس، ١٨ی فێوریەی ١٩٩٤، نزان لە کۆبوونەوەکانی وەزارەتی دەرەوەدا ئامادە نەبوو.

➢ "هەر سەرنجێکیش ...": وتوویژی تەلەفۆنی لەگەڵ زال وی خالدزە، واشینگتۆن دی.سی. ٢١ی دێسامبری ١٩٩٣. جان کلی لە کۆبوونەوەکانی کومیتەی دەرەوەی مەجلیسی پیراندا کە دەبوایە هەڵبژێرانی وی بۆ باڵوێزێتی لە فنلاند سەلماندبا، لە پێشدا گوتی کە وەزارەتی دەرەوە بە گوێرەی پێشینەی بەردەس کوردانی وەرگرتووە و

چونکە سەناتۆر کلی بوورن پۆل و سەناتۆر ئالێن کرانستێن بە پرسیارگەلێکی وردتر تێیانهەڵپێچا، بە ناچار پێی لێنا کە وەزارەتی دەرەوە کوردانی لە ٢١ی ئاوریلا وەرگرتووە نەك پێشتر. بۆ زانیاری پتر لەمەڕ وردەکاری سیاسەتی دەرەوە لەم پێوەندییەدا بڕوانە: "شەڕی نێوخۆ لە ئێراق" کومیتەی پێوەندییەکانی دەرەوە، ڕاپۆرتی مەجلیسی پیران، ڕێکەوتی ١٩٩١.

➢ "سیاسەتی ئێمە خلاس بوونە لە دەس گەڕی سەددام حوسێن": لە "شەڕی نێوخۆی ئێراق"دا هاتووە.

➢ "واشینگتۆن تووشی ئالۆزی ... بێ ئەملاوئەولا بوو": وتوویێژ لەگەڵ فرێدریك کۆنی، پاریس، ١٠ی دێسامبری ١٩٩١.

➢ "٥٠٠٠٠ تا ١٠٠٠٠٠ پەنابەری ئێراقی": وتوویێژ لەگەڵ یەکێك لە لێپرسراوانی نووسینگەی ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا، کە بە مەرجی ناو نەدرکانی وتوویژی کرد. واشینگتۆن دی.سی. ٢٣ی دێسامبری ١٩٩٣.

➢ "لێپرسراوانی سعوودی پێشنیاریان کرد": "شەڕی نێوخۆی ئێراق".

➢ "پێویست ناکا لەمە پتر وەمێنێ": وتوویژی تەلەفۆنی لەگەڵ کامران قەرەداغی، ٨ی فێوریەی ١٩٩٤.

➢ "قەت بەڵێنی ئەوتۆمان نەداوەتە خەڵك": لەسەر زمانی دێو ڕووی و موور لە ئینتێرنەشناڵ هرالد تریبیۆندا، ١٥ی ئاوریلی ١٩٩١.

➢ "دیداری سێیەمی مارس": شوارتسکۆف؛ شوێنێك بۆ بوونە قارەمان ... لاپەڕە ٦٠٠.

➢ "دەقودۆغر بیلێم ...": بێیکێر لە بەرنامەی "مەتلەبی ڕۆژنامەکاندا"،١٧ی مارسی ١٩٩١ کە ڕاپۆرتەکەی لە ڕۆژنامەکانی ڕۆژی دواترا ڕەنگیدایەوە.

➢ "قەت هاودەنگی ئەو کارانە نیم کە سەددام حوسێن دەیکا": جۆزێف – فیچت، بە گوێرەی گێڕانەوەی ئینتێرنەشناڵ هرالد تریبیۆن، ٢٧ی مارسی ١٩٩١.

➢ "کردنەوەی سندووقچەی پاندۆرا": کریستیەن مووس هێلمز، بە گێڕانەوەی ئینتێرنەشناڵ هرالد تریبیۆن، ٢٠ی مارس ١٩٩١.

- "ڕاستییەكەی دەمانویست سەبر بكەین ...": بە گێڕانەوەی دێو ڕووی و موور لە ئینتێرنەشناڵ هرالد تریبیۆن، ٥ی ئاوریل ١٩٩١.
- "لەو شەوە تاریكەدا" نەزیلەی تەفروتونا بوون، لە زمان بارزانی و تاڵەبانییەوە، كوردستانی ئێراق، ئاوریلی ١٩٩١.
- "داستانی سەبراخان گرینگ": وتوویژ لەگەڵ گرینگ، ڕانیە، ٢٩ی ئاوریلی ١٩٩١.
- "ئەركی ئێوە ئەمەیە كە لە هەق ..." وتوویژ لەگەڵ كەنداڵ نزان، پاریس، ٨ی مارسی ١٩٩٦.
- "ئەم گشتە كوژراوە ..." وتوویژ لەگەڵ تاڵەبانی، ڕانیە، كوردستانی ئێراق، ٢٩ی ئاوریلی ١٩٩١.
- "وەختایەك گەڕانەوە واشینگتۆن چاوەڕوان مانەوە ...": وتوویژ لەگەڵ "دان كرووم"، ژنێڤ، ٣١ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.
- "ئەگەر دەتوانن كارێكی وا بكەن كە ئێراقییەكان ڕێگاتان بدەنە دهۆك": وتوویژ لەگەڵ كۆنی، پاریس، ١٠ی دێسامبری ١٩٩١.
- "سیاسەت پێویستی بە بەڕێوەبەرایەتی بەردەوام هەیە": یەكێك لە لێپرسراوانی نووسینگەی كاروباری ڕۆژهەڵاتی نیزیك و باشووری ئاسیا، ئەو بە مەرجێك ئامادەی وتوویژ بوو كە ناوی نەدركێ؛ واشینگتۆن دی.سی. ٢٢ی دێسامبری ١٩٩٣.
- لە "بیست ساڵی ڕابردوودا ..." هەمان.
- "بڕوانن ...": وتوویژ لەگەڵ دیپلۆماتێكی ئەمریكایی كە ویستی ناوی پارێزراو بێ. زاخۆ، كوردستانی ئێراق، ٢٣ی ژوەنی ١٩٩١.
- "بەراوردەكانی زێباری و سامی عەبدوڕڕەحمان": وتوویژ لەگەڵ زێباری و سامی عەبدوڕڕەحمان، سەلاحەددین، ١٠ی فێوریەی ١٩٩٦.

## بەشی ٥

➢ "خەباتی نەتەوەیی کورد": دێیوید مەك داوڵ، "کوردان، گەلێکی مافخوراو"، لەندەن ١٩٩٢، لاپەڕە ٢٠.

➢ "بەو هۆیەوە کە شەڕانی بوو": سێرمارك سایکس، هۆزە کوردەکانیئیمپراتۆریتی عوسمانی، گۆڤاری مەردمناسی پاشایەتی، ئەنستیتۆی بریتانیای گەورە و ئیرلەند، بەرگی ٢٨ و ٣٨، ژانویەی ١٩٠٨.

➢ "لە بەرمەمکانەوە بۆ زیندان ..." دانا ئادامز ئیسمیت، "سەفەر بە نێو دلێراندا"، بوستێن، ١٩٦٤، لاپەڕە ١٣٨.

➢ "تەنانەت لە هەڵدێرەوە خۆیان هەڵدەدێرن": مارتین وان برووئین سێن، ئاغا، شێخ و دەوڵەت، زانکۆی ئوترێخت، ١٩٧٨، لاپەڕە ٣١١.

➢ "هەرکام لە ئەندامانی بنەماڵەی بارزانی": وتوویژ لەتەك سامی عەبدوڕڕەحماندا، ڕەواندز، ١٠ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "دەتوانم هەموو وڵات ..." لەسەر زاری ڕێنێ مووریە، یان مەرگ یان کوردستان، پاریس ١٩٦٧، لاپەڕە ١٥٨.

➢ "کە وابێ عەداڵەت چی بەسەر دێ ..." وتوویژ لەگەڵ حەئیم لە واکۆف، تلاویو، ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "فیێڵ و تەڵەکەی ئەمیر نیزام ...": بازیل نیکیتین، "کوردان، پێداچوونەوەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی"، پاریس، ١٩٥٦، لاپەڕە ١٥٨.

➢ "دلڕەقی سمکۆ": ئارچی ڕۆزوێڵت، ئەوینی فێربوون، بیرەوەری ئەفسەرێکی دەزگای زانیاری، بوستێن ١٩٨٨، لاپەڕە ٢٥١. لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا سمکۆ، "مارشیمۆن بنیامین"ی نەوەد ساڵانە، ڕێبەری مەزەبیی ئاشووریانی خستە بۆسەوە و پاش کوشتنی خوێنەکەی خواردەوە. شوو لێهەڵکێشانی سمکۆ بۆ پیاوکوژی و نواندنی زوڵم و زۆر، کوردانی یەکجار شەمزاند. یەکێك لە

مێژوونووسانی کورد دەڵـێ: "پێـشینەی دڵڕەقییـەکانی دەیـخاتە ڕیـزی خوێنخـۆرانی مێژوو، دەیـخاتە ڕیزی کەسانێکی وەك ئـاتیلا و ئەگەرچـی هـەتا ئـەمڕۆ لـەبۆ ترکـان خاوەنی قەڵافەتێکی قارەمانانەی شازە، بەڵام لـەبۆ کوردان و ڕۆژاوایییـــــان بـــــە پێچەوانەیە. مێهرداد، ئیزەدی، "کوردان"، واشینگتۆن و لەندەن ١٩٩٢، لاپەڕە ٥٧.

➢ "نامەی عوبەیدیللا": کتێبی شینی دەوڵەتی بریتانیا، تورکیـا، ژمـارە ٥، ١٨٨١، بـە گوێرەی گوتەی دێرك کینان لــە "کـوردان و کوردسـتان"دا، واشـینگتۆن و لـەنـدەن، ١٩٦٤, لاپەڕە ٢٤.

➢ "لە دەرەوەی شارە گەورەکان شتێکی ڕواڵەتی بوو": ئیلی بانیسترسۆن، سـەفەر بـۆ دووچۆمان و کوردستان بە جلوبەرگی کەس نەناسەوە"، ١٩٢٦، لاپەڕە ١٢.

➢ "لۆرد کرۆزۆن، بە گوێرەی گوتەی ویلـسۆن ئـێن. هاوێـل، "یـەکێتی سـۆڤیەت و کوردان": پێداچوونەوەیەك بە کەمینەیەکی نەتەوەییدا، کۆتاییـنامـــــەی دوکتـــــۆرای بلاونەکراوە، زانکۆی ویرجینیا، ١٩٦٥، لاپەڕە ١٤٣.

➢ "دۆزینـــەوەی نـــەوت": بەڵگەنامـەی دەزگـای زانیـاری ناوەنـدیی (سـیا)، هێلانـەی سیخوڕی، "کێشەی کورد لـە داهـاتوودا"، پێداچـوونەوەیەکی توێـژەوانی، ٣٠ ژوەنـی ١٩٧٩.

➢ جەماوەری تێکەڵاوی کەرکووك کە بۆتە هۆی دووبەرەکی. تاقمێك لایان وایـە کـە زۆربـەی جـەماوەری وێ تورکمـانن، کـوردانیش گـەرەکێکی خۆیـان هەیـە، لـەگـەڵ کۆمەڵێك عەرەب و مەسیحی و جوولەکە.

➢ "لە سەتا ٧٥ی نەوتی ئێراق": فانینەشاڵ تایـــمز، ژمـارە ٢٠ی ئـووتی ١٩٧٤ بـە گوێرەی گێڕانەوەی ژرار شـالیان لــە "خـەڵکی بـێ دەوڵـەت"دا، لـەنـدەن، ١٩٨٠، بروو کلین ١٩٩٣، لاپـەڕە ١٦١. لـەگـەڵ بەرهـەم هـاتنی پـتری نـەوت لــە چـاڵاوە نەوتییەکانی بەسرە، بەرهەمهێنانی نەوتی کەرکووك بە هەمان ئەندازە کەم بۆتەوە.

➢ "پەیـماننامەی سـێڤر سـووکایەتی بـە شـوێنەوە بـوو": سەرچـاوە ژرار شـالیان لــە "خەڵکی بێ دەوڵەت"دا، لاپەڕە ٣٧.

➢ "٤٠٠٠٠ تـا ٢٥٠٠٠٠ وەرزێـر"، مـەك داوڵ، "كـوردان گـەلێكی مـافخوراو"، لاپەڕە ٣٧.

➢ "ڕەنگە میلیۆنێك": بازیل نیكیتین دەڵـێ كـە تـەنیا میلیۆنێـك كـورد دوا بـە دوای شكانی شۆڕشی شێخ سەعید دوورخراونەوە، "كوردەكان"، لاپەڕە ١٣٤.

➢ "ئیحـــساساتی كـــوردان زۆر لــــەگوڕبوو": ئارنوڵـــد ویلـــسۆن، "دووچـــۆمان ١٩١٧ – ١٩٢٠"، بە پێی گێڕانەوەی شـالیان لـە "خـەڵكی بێدەوڵـەت"دا، لاپـەڕە ١٩١. ویلسۆن كە ئەو زەمانی ئەفسەری بڵندپایەی سیاسـی بریتانیـا بـوو لـە بەغـدا، دەڵێ: "كوردان نە دەیانـەوێ بكەونـە ژێـر ڕكێفـی عوســـمانی و نـە ژێـر دەسـەڵاتی حكوومەتی دەوڵەتی ئێراق ... لـە كوردستانی باشووری لـە هەر پێنج كەسـان چـواریان پشتیوانییان لـە گەڵاڵەی شێخ مەحـموود دەكرد بۆ دامەزراندنی كوردستانی سەربەخۆ.

➢ "ڕاپۆرتی دەزگای زانیاری سپای بریتانیـا": یانـەی كۆلكـەوانی (بایگـانی) گـشتیی، كییۆ، ئینگلستان، ٤٥٣٣٤٠ e ٢١٩٩ ، ١٤ ژووئیەی ١٩٤٥.

➢ "دەوڵەتی مەحـموود و بەیاننامەی دەوڵەتی ئینگلیس كە پاشـی وی بڵاوكرایـەوە": سی.جی. ئێدمۆندز، "كوردان، تركان و عەرەبان – سیاسەت، سـەفەر و توێژینـەوە لـە باكووری ئێراق"، ١٩١٩ – ١٩٢٥، لەندەن، ١٩٥٧، لاپەڕە ٣٠١.

➢ كۆمیسێری باڵای ئێـراق، لــە نامـە گۆڕینـەوەی لـەگـەڵ وەزیـری كۆلـەدارییـەكان بوردلیۆن، كۆمیسێری بریتانیا، لـە ١٠ی فێوریەی ١٩٢٦دا هەروەها دەڵێ: "مـن ئـەم مەبەستە دەسەلـمێنم كە هەتا بەهاری ١٩٢٣ وا دەهاتە بەرچاو كە ڕەنگە پێویست بێ جۆرێك خودموختاری خۆجێیی بدرێتە كوردستانی ئێـراق؛ چـۆل كرانـی سـەربازگەی ڕەواندز لـە لایەن تركانەوە لـە كۆتایی ئـاوریلی ١٩٢٣دا ئـاڵوگۆڕێكی گـەورەی لــە بارودۆخەكەدا بەدی هێنا."یانەی كۆلكـەوانی گـشتیی، كییـۆ، ئینگلـستان، وەزارەتـی دەرەوە ٣٧١/١١٤٦٠١٣٢١١٢.

➢ "مامەڵەی ئاتاترك لەگەڵ بریتانیا": وان بـرووئین سـێن، "ئاغـا, شـێخ و دەوڵــەت", لاپەڕە ٢٦٣.

➢ "وریایی دانی سەرۆکوەزیری ئێراق": مەك داوڵ, "کـوردان, گـەلێکی مـافخوراو", لاپەڕە ٨٤.

➢ "تووڕەیی و هیوابڕاوی ئینگلسییەکان": "ئاخرییەکەی خـەڵکی ئینگلـیس بێـوو بـە وەی بزانن کە فڕۆکەکانی ئینگلیسی بۆ بەڕێوە بردنی بەرنامە پـڕ هەڵـەکانیان کـە لـە قاوەخانەکانی بەغدا ڕێکوپێك کـراون, عێـل و عەشـیرەتەکانی فـورات و کوردسـتان بۆمبـاران دەکـەن, دەرهەڵــدەبن." یانـەی کۆلکـەوانی گـشتیی, کییـۆ, ئینگلـستان, ڕاپۆرتەکانی نەهێنی, دۆلابچەی ٢٠١/٢٤ نوسخەی دووەم بە ژمارە ٣٣٨, فێوریـەی ١٩٢٩.

➢ "نامەی ڕێکەوتی ٣ی مارسی ١٩٣١ی شێخ مەحـموود بـۆ کۆمـەڵی نەتـەوەکان", سەرەچاوە: بازیل نیکیتین, "کوردەکان", لاپەڕە ٣٠٠.

➢ "هەر کە ئەو بارزانییە نەعاملاوانە ": "ویلیام ئێگلتۆن"ی "کـوڕ", کۆمـاری کـورد, ساڵی ١٩٤٦, لەندەن, ١٩٦٣, لاپەڕە ٥٠.

➢ "هەزاران کوردی خوێندەوار": عیسمەت شەریف وانلی وای لێکدەداتەوە کـە لـە مابـــەینی ١١ و ١٥ی مارســـی ١٩٧٤دا, دروســـت بـــەر لـــە هەڵگیرســـانەوەی تێکهەڵچوونەکان, سەتهەزار کوردی شارنشین ڕایانکردە کوردستانی ئـازاد. بڕواننـە شالیان, "خەڵکی بێ دەوڵەت", لاپەڕە ١٦٥.

➢ "مانگانە بێقابیلەتەکەی حکوومەتیی": ئەگەر دەوڵەتی ئێـراق هێنـدێك بـە دەسـتی ئاوەلاتر و نەرمتر لـەگەڵ مەلامستەفادا جوولاباوە ئەم گشتە پووڵـە و گیـانی هـەزاران مرۆ**ص** و ئابڕووی حکوومەت نەدەکەوتە مەترسی.

➢ ڕەخنـــەگری ئـــەمریکایی, ئێگلتـــۆن, "کۆمـــاری کـــورد": لاپـــەڕەکانی ٥٠ و ٥٤ دەربارەی بارزانی و لاپەڕەکانی ١٠٢ و ١٢٦ لەمەڕ پاشەکشەوە.

➢ "هەستی نەتەوایەتی کوردان": وتوویژ لـەگـەڵ موحـسین دزەیـی, لەنـدەن, ٢٨ی نوامبری ١٩٩١.

➢ "بە نێو مەزرای گوڵەبەڕۆژەدا": وتوویژ لەگەڵ سامی عەبدوڕڕەحـمان, ڕەوانـدز, ١٠ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "باسی دوور و درێژ سەبارەت بە مەهاباد": ئێگلتۆن, "کۆماری کورد", ئارچی ڕۆزوێڵت, "کۆماری کورد", گۆڤاری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست, بەرگی ١, ژمارە ٣, ژووئیەی ١٩٤٧.

➢ "تاوانبار کردن بە خەیانەت لە لایەن بارزانییەوە": وتوویژ لەگەڵ عەبدوڕڕەحمان قاسملوو, پاریس, ٣٠ سێپتامبری ١٩٨٨.

➢ درانەوەی ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە دەوڵەتی ئێران, هەمان.

➢ "کوردان شکستیان نەهێنا": سەرچاوە ئێگلتۆن لە "کۆماری کورد"دا, لاپەڕەی ١١٣ و لاپەڕەکانی دواتر.

➢ "کۆبوونەوەی بارزانی و وتەکانی بەرەوڕووی جەماوەرەکەی": وتوویژ لەگەڵ سامی عەبدوڕڕەحمان, ڕەواندز, ١٠ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "بیرەوەری یەکێك لە کۆنەپێشمەرگەکان دەربارەی پاشەکشە": میشێل هانژۆ لە Handelsblad سەر بە شووڕای نەتەوەیی لێکۆڵینەوە) ٢ی ئووتی ١٩٩١. ژمارەی سەرڕاستی هاوڕێیانی بارزانی لەم پاشەکشەدا و ماوەی ئەم پاشەکشەیە بە وردی دیاری نەکراوە, بارزانی خۆی بە "دانا ئادامز ئیسمیت"ی گوتووە کە ژمارەی ئەوانەی لە پاشەکشەدا بەشدار بوون ٤٩٦ کەس و ماوەی پاشەکشە ٥٣ ڕۆژ بووە.

➢ "تاڵەبانی و بارزانی لە مەسکەو": وتوویژ لەگەڵ تاڵەبانی, ١٩ی ژانویەی١٩٩٢.

➢ "ڕاپۆرتی جێبەجێ کراو لە لایەن ڕاوێژکاری تەناهی سەرکۆمار": ١٩٥١, سەرچاوە "هێلانەی سیخوڕی" لاپەڕە ٩٢.

➢ "من کومۆنیست نیم": મووریە, کوردستان, لاپەڕە ١٥٣, ئەو لە ١٩٦٢دا هەر ئەوەشی بە دانا ئادامز ئیسمیت گوت.

➢ "بارزانی و دیدارکەران": وتوویژ لەگەڵ تاڵەبانی, هەولێر, ١١ی فێوریەی ١٩٦٦.

➢ "ڕۆژانی ئارام": وتوویژ لەگەڵ "ئانتۆنی پارسونێز"ی باڵوێز, لەندەن, ٢١ی نوامبری ١٩٩١.

➢ "هیواکانی سەربەخۆیی": وتوویژ لەگەڵ عیسمەت شەریف وانلی, لۆزان, ٣١ی ئۆکتۆبری ١٩٩١, وتوویژ لەگەڵ سامی عەبدوررەحمان, ڕەواندز, ١٠ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "١٢٧٠ گوند خاپوور کرا", ڕابێرت دی. کاپلان. "لایەنگرانی عەرەبان: ڕۆمانسی یەکیك لە هەڵکەوتووەکانی ئەمریکا", نیۆیۆرك, ١٩٩٢.

➢ "٧٠٠٠ کومۆنیست": ماریۆن فارووق سلووگلێت و پیتێر سلووگلێت, "ئێراق لە ١٩٥٨ەوە بۆو لایە, لە شۆڕشەوە هەتا دیکتاتۆریەت", لەندەن, ١٩٨٧, بەگوتەی جان بولاك و هاروی مووریس, لە دەقی "جگە لە چیا هیچ دۆستێك نا, مێژووی پڕکارەساتی کوردان"دا, نیۆیۆرك, ١٩٩٢, لاپەڕە ١٢٤.

➢ "ڕێپێوانی نیزامیی": مووریە, "کوردستان", لاپەڕە ١٦٧.

➢ "تاڵەبانی غەیانەتکارە": بڕواننە تەلگرامی سپای ئێراق, لەسەر زمانی مووریە لە "کوردستان"دا, لاپەڕە ١٤١.

➢ "بەکرێگیراوی هەموو لایەك": بڕواننە "کێشەی کورد لە ئێراقدا", نووسراوی ئێدمۆند غەریب, سیراکوز, ١٩٨١, لاپەڕە ١٨١.

➢ زانیارییەکانی ئابووری, شالیان, "خەڵکی بێ دەوڵەت", لاپەڕەکانی ١٥٩ و ١٦٠.

➢ "فێڵ": ئیزەدی, "کوردەکان", لاپەڕە ٦٨.

➢ "عوبەیدیللا: ئەو قسەیەی کە لە ١٩ی ژووئیەی ١٩٧٤دا بە غەریبی گوت", چاپکراو لە "کێشەی کورد"دا, لاپەڕە ١٥٥. عوبەیدیللا لە سەرەتاکانی شەڕی ئێران و ئێراق و دوای دەمەقڕەیەکی لەگەڵ سەددام حوسێن کردی بە دەستی ئێراقییەکان کوژرا: ئەو لەم دەمەقڕەدا دەڵێ خۆ مەلامستەفا هەر نەبێ دەیزانی باوکی کێیە و ئاوای لەسەر وەجواب هات. (سەددام حوسێن بە ئیددیعای دژبەرانی دیار نیە باوکی کێیە.)

➢ "کوردەکانی ئێراق هیچیان نیە": وتوویژ لەگەڵ قاسملوو, پاریس, ٣٠ سێپتامبری ١٩٨٨.

➢ "سپای کورد": بڕواننە "کوردان", نووسراوی مەك داوڵ, لاپەڕە ٩٥.

➢ "بارزانی بۆ ئێمە وەك خودایەك وابوو": وتوویژ لەگەڵ ئەحمەد بامەڕنی, نوێنەری تاڵەبانی لە پاریس, ٢٥ی سێپتامبری ١٩٨٦.

## بەشی ٦

➢"بەرزەخی موتڵەق" ئەسەدوڵڵا عەلەم, "شا و من", دەفتەری یادداشتی ڕۆژانەی وەزیری بارگای ئێران, ١٩٦٩ – ١٩٧٩, لەندەن و نیۆیۆرك, ١٩٩٢, لاپەڕە ٢٢٤.

➢"وەختایەك ئەمیر ئەسلان ئەفشار": ویلیام شاكرووس, "ئاخرین خۆنواندنی شا, چارەنووسی هاوپەیمانێك", نیۆیۆرك و لەندەن, ١٩٨٨ , لاپەڕە ١٦٤.

➢"هەركە پێشوازیمان لە شا كرد": جۆرج دابلیو. باڵ,"مەسەلە و شوێنهاتەكانی قەیرانی ئێران", دێسامبری ١٩٧٨.

➢"وتەكە وەوتۆ بوو": ڕاپۆرتی كومیتەی پایك, ناتینگهام, ١٩٧٧, لاپەڕەكانی ١٩٥ و ٩٨ و ٢١٢ و ١٦.

➢نامیلكەی ڕوون كردنەوەكە بریتییە لە ٤٣ لاپەڕە, وەزارەتی دەرەوە, "لە سەردانی ڕیچارد نیكسۆن بۆ وڵاتی پاشایەتی ئێران", مەی ١٩٧٢, كۆلكەخانەی تەناهی نەتەوەیی, واشینگتۆن, بەڵگەی ژمارە ٠٠٧٦٧ – نیزیكەی چوار لاپەڕە لەم بەڵگەیە ڕەش كراوەتەوە, پاشان لە هێندێك شوێنان بە ناوی "نەهێنی" و "زۆر نەهێنی" دیاری كراوە و ئەوكات لە ڕیزی بەڵگەی تەبەقەبەندیكراو وەلا خراوە. نێوەرۆكی بەڵگەنامەكە وای لێوەدەرناكەوێ كە ئەم ڕەش كراوانە سەبارەت بە كوردان بووبێ.

➢ یەكێك لە ئەفسەرانی گرینگی دەزگای پاراستنی ئیسرائیل: دێیوید كیمچە: "دوایین هەڵبژاردە – پاش ناسر, عەرەفات و سەددام حوسێن, بە شوێن سوڵحەوە لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستا" لەندەن, ١٩٩١, لاپەڕە ١٩٤.

➢"بارزانی و كارۆلان": وتوویژ لەگەڵ ئەحمەد چەلەبی, لەندەن, ئووتی١٩٩٦.

➢"ئەو گشتە نەهێنكارییە": بڕوانە "گومانی دەسەڵات", سیاسەتی دەرەوە لە سالانی سەركۆماریێتی نیكسۆندا, نیۆیۆرك, ١٩٧٨, لاپەڕەكانی ٥٨٢ و ٥٨٥.

➢"چی ئەوتۆمان لەمەڕ كوردانەوە نەدەزانی": وتوویژ لەگەڵ هێنری كیسینجێر, مارتا وینیارد, ماسا چووسێت, ٢٣ی ئووتی ١٩٩٢.

➢"لەمەڕ كوردانەوە زانیاری پێویستمان هەبوو": وتوویژ لەگەڵ ریچارد هێلمز, واشینگتۆن دی.سی. ٢١ی دێسامبری ١٩٩١.

➢"كوردان تەنیا كەمۆكەیەك لە..."وتوویژ لەگەڵ مووریس درپێر, واشینگتۆندی.سی. ١٨ی دێسامبری ١٩٩١.

➢"پەراوێز": وتوویژ لەگەڵ ئەحمەد چەلەبی, ١٠ی ئووتی ١٩٩٦.

➢"تەنانەت پاشی مامەڵەكەش": عەلەم, "شا و من", لاپەڕە ٢١٥.

➢ڕۆژی پاش فرینی نیكسۆن بۆ ئەمریكا, هەمان, لاپەڕە ٢٢٥.

➢"ئیستراتیژی زۆر ڕوونی ئێمە": وتوویژ لەگەڵ كیسینجێر, ٢٣ی ئووتی١٩٩٢ .

➢"گوڵدامایەر... بە نەناسیاوی كەوتە یەكێك لە سەفەرەكانی": عەلەم, "شا و من", لاپەڕە ٢١٥.

➢سەرجەمی سەرمایەنانەوەی ئەیالەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ١٦ میلیۆن دۆلار بوو: كیمچە لە, "ئاخرین شۆڕش" لاپەڕە ١٩٤دا دەڵێ: "كرانەوەی نێوانی ئەمریكا و كوردان بە كەیخودایەتی تاران سەری گرت, ئەگەرچی ئەوتۆ نەبوو كە ئێمە چاوەڕوانیمان دەكرد."

➢هێندێكیان لە یارمەتییەكە پاشقول دا: نامەی ڕێكەوتی ٢٧ی ژانویەی ١٩٩٣.

➢"واشینگتۆن لە بنبەستا": وتوویژ لەگەڵ تامس كارۆلان, ئیستامبووڵ, ١٥ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢"زۆری سێودوو لێنەكرد..." وتوویژ لەگەڵ سامی عەبدوڕڕەحمان, ڕەواندز, ١٠ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢"لە قووڵایی دڵەوە ...": وتوویژ لەگەڵ سامی عەبدوڕڕەحمان، ڕەواندز، ١٠ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢دیداری ڕۆزوێڵت – بارزانی: ئارچی ڕۆزوێڵت: "دەمەویست بزانم: بیرەوەری ئەفسەرێكی دەزگای زانیاری", لەندەن, ١٩٨٨, لاپەڕە ٢٨٤.

➢"كوردەكانی تر": وتوویـژ لەگـەڵ عەبدوڕڕەحـمان قاسـملوو, پـاریس, ٦ی ژووئیەی ١٩٨٩.

➢"یان دەكەوتنە دژایەتی كردنی...": بارزانی, نامە بۆ نوێنەرانی كـۆنگرە و ئەنـدامانی مەجلیسی پیران, ٢٤ی فێوریەی ١٩٧٧.

➢"یەكتر نەگرتنەوە لەگەڵ بەرژەوەندییەكانی ئەمریكا": نامەی ڕێكەوتی ٩ی فێوریەی ١٩٧٧ی بارزانی بۆ سەرۆك جیمی كارتێر.

➢"دەوڵـەتی ئەیاڵەتـە یـەكگرتووەكانی ئـەمریكا هـیچ دەسـتەبەر بـوونێكی ڕەسـمی وێنەداین": بە پێی وتوویژ لەگەڵ جیم هۆگلەند, ٥ی نوامبری ١٩٩١.

➢"كاكی"، وتوویـژ لـەگـەڵ سـامی عەبدوڕڕەحـمان, ڕەوانـدز, ١٠ی ئۆكتـۆبری ١٩٩١.

➢هیچ كارێك نەكرا": وتوویژ لەگـەڵ موحـسین دزەیـی, لەنـدەن, ٢٦ی نـوامبری ١٩٩١.

➢"ژێنێراڵ بارزانی تەنیا بیری دەكردەوە": وتوویـژ لـەگـەڵ دوكتـۆر مەحـمـوود عوسـمان, سلێمانی, ١٢ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢"بە پێی ئەخلاق ئەركی سەرشانێتی": بارزانی، نامە بۆ سـەرۆك جیمـی كـارتێر، ٩ی فێوریەی ١٩٧٧.

➢"هیوادارم سەرەنـجامی كارەكەم بكەوێتە پێكەن": سەرچاوە: وتوویـژ لـەگـەڵ مـحەمـمەد دۆسكی, واشینگتۆن دی.سی. ٢٧ی ژووینەی ١٩٩١.

➢"نازانـم چ فەرقێكی دەكرد": وتوویژ لەتەك كیسینجێردا, ٢٣ی ئووتی ١٩٩٢.

➢"منالّی ڕیشدار": وتوویژ لەگەڵ هێلمز, واشـینگتۆن دی.سـی. ٢١ی دێـسامبری ١٩٩١.

➢"گرچـكۆ لـە بەغـدا": بڕوانـە نووسـراوی ویلیـام سـافایەر, لـە ژێـر سـەردێری "واشینگتۆن سـافایەر", نیۆیـۆرك, ١٩٨٠, لاپـەڕە ٨٥, ئـەو لـەم بەرهەمـەدا وتـاری ڕێكەوتی ١٢ی فێوریەی ١٩٧٦ی خۆی بە بەڵگە هێناوەتەوە كە لە نیۆیۆركتایـمزدا چاپ كراوە.

➢"ئێمە هێزدارترین لەوەی ئێوە لاتان وایە و بێتوو شەڕێك بقەومێ": ئالێن سیولینۆ, "دەوڵەتی قانوونشكێن": سەددام حوسێن بە شوێن وە دەس هێنانی دەسەلاتەوە و قەیرانی كەنداو, نیۆیۆرك, ١٩٩١, لاپەڕەكانی ٢٧٧ و ٢٧٨.

➢"بریتانیا و یەكاو": بریتانیا لەوە ترسابوو ئەگەر بێتوو ئێران لە شەڕی داهاتوودا بێلایەن وەمێنێ, ڕەنگە بەرەگە لە پاپۆرە شەڕكەرەكانی بریتانیا بگرێ بەرەو بەسرا. بڕواننە نووسراوەی كیمچە بە ناوی "دوایین هەڵبژاردە",لاپەڕە ١٩٣.

➢"ئەگەر بكەوینە تەنگەژەوە": سیولینۆ, "دەوڵەتی قانوونشكێن", لاپەڕەكانی ٢٧٧ و ٢٧٨.

➢"پێ لە جارێك": قەرەداغی, بە گوتەی ژرار شالیان, لە "خەڵكی بێ دەوڵەت"دا, لاپەڕە ٢٦٦.

➢"ژیان و مانەوەیان بە شێرەیەكەوە بەندە": وتوویژ لەگەڵ ئێریك ڕۆلۆ, پاریس, ٢٣ی ئۆكتۆبری ١٩٩٣.

➢"مووشەكە ڕاپیەرەكان لەسەر سنوور و تۆپخانەی ئێران": عەلەم, "شا و من", لاپەڕە ٤١٨.

➢"درەنگمان پێزانی": نامەی ڕێكەوتی ٩ی فێوریەی ١٩٧٧ی بارزانی بۆ سەرۆك كارتێر.

➢"لە سێپتامبری ١٩٧٤دا": عەلەم, "شا و من", لاپەڕەكانی ٣٨٧ و ٣٩١ .

➢"وەك شێر شەڕیان كردووە": هەمان, لاپەڕە ٤١١.

➢"چەند حەوتوو ڕاپانگرت": وتوویژ لەگەڵ دزەیی, لەندەن, ٢٨ی نوامبری ١٩٩١.

➢"پیلان گێڕان لە عەممان و قاهیرە": وتوویژ لەگەڵ دزەیی, لەندەن ٢٨ی نوامبری ١٩٩١ و لەگەڵ چەلەبی لە ١٠ی ئووتی ١٩٩٦دا.

➢"نامەی بارزانی بۆ كیسینجێر, ٢٢ی ژانویەی ١٩٧٥": وتوویژ لەگەڵ دۆسكی, واشینگتۆن دی.سی. ٢٧ی ژوونیەی ١٩٩١.

➢"کیسینجێر زۆر پێشتر "هەموو شتێکی" دەزانی": وتوویێــژ لـەگــەڵ مەحـــموود عوسـمان, سلێمانی, ٩ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢"ژێنێراڵ عەزیز": نامە؛ لە وتوویێژ لـەگەڵ دۆسکیدا, واشینگتۆن دی.سی.

➢"هەڵبژادەیەك بۆ شا" و گێڕانەوەکانی تر" وتوویێـــژ لـەگـــەڵ ویلیـــام ئـــی. کۆلبی,واشینگتۆن دی.سی. ٢١ی دێسامبری ١٩٩١.

➢"پێم وابوو واشینگتۆن پێیخۆشحاڵ دەبێ": وتوویێـژ لـەگـەڵ هێلمـز, واشـینگتۆن دی.سی. ٢١ی دێسامبری ١٩٩١.

➢" بۆ ئێمە یەکێ لـە دەگمەنترین ڕێبەران بوو ": کیسـینجێر, "سـاڵگارانی کۆشـکی سپی", نیۆیۆرك, ١٩٧٩, لاپەڕە ١٢٦١.

➢"ئێران وەك ئێمە": ڕاپۆرتی کومیتەی پایك.

➢"واقی بردەوە – بیر و بڕوای ئێمەی نەپرسی": وتوویێژ لـەگەڵ کیسـینجێر, ٢٣ی ئووتی ١٩٩٢.

➢وتوویێژ لـەگەڵ چەلـەبی, لـەندەن, ١٠ی ئووتی ١٩٩٦.

➢"شا و دیتـران": ئانتۆنی پارسونێز, باڵوێزی پێـشووی بریتانیـا لــە ئێـران و جێگـری وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا, لێپرسراوی کاروبـاری ڕۆژهـەڵاتی نێوەڕاسـت لــە دەیـەی حەفتادا دەریبڕی کە خۆڕاگری کوردان لـە ڕاستیدا لــە زسـتانی ١٩٧٤ – ١٩٧٥ڕا کۆتایی هاتبوو و شا ناچار بوو خۆ بداتە بەر تەسـاڵحە یـان ڕاسـتەوخۆ لـەگـەڵ ئێـراق بکەوێتە شەڕ, لـەندەن, ٢١ی نوامبری ١٩٩١.

➢"کێشەی کوردان و کۆتایی پڕ پەژارەی": کیسینجێر, "ساڵگارانی کۆشـکی سـپی", لاپەڕەی ١٢٦١.

➢"بڕیارەکان لـە ساڵی ١٩٧٥ ": هەمان لاپەڕە ١٢٦٥.

➢"کاتێك چەلـەبی وریایی دایە بارزانی": وتوویێژ, ٤ی دێسامبری ١٩٨٦.

➢"بڕیارێك بوو کە دەبوو شا بیدا": کیسینجێر, "ساڵگارانی کۆشـکی سـپی", لاپـەڕە ١٢٦١.

➢"چوار هەتا شەش حەوتوو": وتوویژ لەگەڵ کیسینجێر, ۲۳ی ئووتی ۱۹۹۲.
➢"دڵمان خوێن دەدەڵێنێ" بە گوێرەی ڕاپۆرتی پایك, لاپەڕەکانی ۲۱۵ و ۲۱٦.
➢"شالاوی پەنامەکی": ڕاپۆرتی کومیتەی پایك, لاپەڕە ۱۹۸.
➢"لاوازیی هەڵوێستەکەی": وتوویژ لەگەڵ دزەیی, لەندەن, ۲۸ی نوامبری ۱۹۹۱.
➢"دەزگای ناوەندیی... پێوەندی هەیە؟": ڕاپۆرتی کومیتەی پایك.
➢"سەرکەوتووترین": عەلەم, "شا و من", لاپەڕەکانی ٤۱۷ و ٤۱۸.
➢" ئێمە کارمان کراوە ": وتوویژ لەگەڵ دزەیی, لەندەن, ۲۸ی نوامبری ۱۹۹۱.
➢"بە توندی": وتوویژ لەگەڵ دزەیی, لەندەن, ۲٦ی نوامبری ۱۹۹۱.
➢"شا چاوپێکەوتنی لەتەك ئەوا وە دوا خست": کامران قەرەداغی, سەرچاوە, ژرار شالیان لە "خەڵکی بێ دەوڵەت"دا: "کوردان و کوردستان", لاپەڕە ۲۱۵.
➢"ئێستا ئێمە چ بە خەڵکەکەمان بڵێین؟" وتوویژ لەگەڵ مەحموود عوسمان, سلێمانی, ۹ی ئۆکتۆبری ۱۹۹۱.
➢"من دەزانم, چونکە بەڵگەنامە ڕەسمییەکانی دەوڵەتی ئێراقم دیوە": وتوویژ لەگەڵ دزەیی, لەندەن, ۲٦ی نوامبری ۱۹۹۱.
➢"ولاّمم دایەوە": عەلەم, "شا و من", لاپەڕە ٤۱۹.
➢"ئێوە دەتوانن خۆ بدەن بە دەستەوە": بە گوێرەی گوتەی جیم هۆگلەند, وتوویژ, پاریس, ٥ی نوامبری ۱۹۹۱.
➢"چۆڵەپێچ کراو و ورە دۆڕاو": عیسمەت شەریف وانلی, بە گوێرەی گوتەی شالیان, "خەڵکی بێ دەوڵەت", لاپەڕە ۱۷۳.
➢"بۆنی مالاّوایی": قەرەداغی, بە گوێرەی گوتەی شالیان, "خەڵکی بێ دەوڵەت", لاپەڕە ۲۱۵.
➢"یەکێك لە کوڕەکانت": وتوویژ لەگەڵ سامی عەبدوڕڕەحمان, ڕەواندز, ۱۰ی ئۆکتۆبری ۱۹۹۱.

➢"بێهوودە": عیسمەت شەریف وانلی, سەرچاوە, شالیان, "خـەڵکی بـێ دەوڵـەت": "کوردان و کوردستان", لاپەڕە ١٩٨ n.

➢"ئەم ڕەوتە و ڕووداوانە بارزانی دەهاڕێ": وتوویژ لـەگەڵ دەزیـی, لـەنـدەن ٢٨ی نوامبری ١٩٩١.

➢"ئەگەر بارزانی مابایەوە": وتوویژ لـەگەڵ یەکێك لـە گـەورە ڕێبـەرانی کـورد کـە نەیەویست ناوی بدرکێ, شەقلاوا, ١١ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢"بابەت و وێنەیەکی ترم وە بیر نایا": عیسمەت شەریف وانلی, لـە کتێبـی "خـەڵکی بێ دەوڵەت"دا, لاپەڕە ١٧٧.

➢"مەرگی عیسا سوار": وتوویژ لەگەڵ وشیار زێباری, سەلاحەددین, ١٨ی ژانویەی ١٩٩٢.

➢"درێژە کێشانی تۆڵە ئەستاندنەوەی ئێراق": قەرەداغی, لە "خەڵکی بێ دەوڵەت"دا, لاپەڕە ٢١٦.

➢"تۆوبرکردنی فەرهەنگیی": وتوویژ لـەگەڵ ویلیام ئیگلتۆن, ٢ی ژانویەی ١٩٩٢.

➢"ئەگەر بێتوو لێپرسراوانی باڵای ئەمریکا": بە گوێرەی ڕاپۆرتی کومیتەی پایك.

➢"وای زانی کە هۆگلـەند یەکێك لـە لێپرسراوانی دەوڵـەتی ئەمریکایە": وتووێـــــژ لـەگەڵ هۆگلـەند, پاریس, ٥ی نوامبری ١٩٩١.

➢"تووڕە ببوو": وتوویژ لـەگـەڵ دۆسـکی, واشـینگتۆن دی.سـی. ٢٧ی ژووئیـەی ١٩٩١.

➢"بێگومان هەوڵمان دەدا": وتوویژ لـەگەڵ کـۆلبی, واشـینگتۆن دی.سـی. ٢١ی دێسامبری ١٩٩١.

➢"ئێوە ئەوتان... کوشت": وتوویژ لـەگەڵ دۆسـکی, واشـینگتۆن دی.سـی. ٢٧ی ژووئیەی ١٩٩١.

➢"حەئیم لـە واکۆف": وتوویژ لـەگەڵ حەئیم لـە واکۆف, تلاویو, ٢٠ی ئۆکتـۆبری ١٩٩١.

➢"بە گومانی دریپێر": وتوویژ لەگەڵ دریپێر, واشینگتۆن دی.سی. ١٨ی دێسامبری ١٩٩١.

➢"شا تەلگرافێکی لێدا": وتوویژ لەگەڵ دۆسکی, ٢٧ی ژووئیەی ١٩٩١.

➢"دەتگوت ڕووداوی ڕێپێوانی گەورەی چینییەکان...": وتوویژ لەگەڵ دریپێر, واشینگتۆن دی.سی. ١٨ی نوامبری ١٩٩١.

➢"کیسینجێر وەها سوور بوو لەسەر..." جیمز ئێ. بیل. "هەڵۆ و شێر", نییو هی ون, کێنەتیکت, ١٩٨٨, لاپەڕە ٢١٩.

➢"چما چارەیەکی تریان هەیە؟": کیسینجێر، "ساڵگارانی کۆشکی سپی", لاپەڕە ١٢٦٥.

➢"بارزانی پێیخۆش بوو": وتوویژ لەگەڵ دزەیی, لەندەن, ٢٨ی نوامبری ١٩٩١.

➢"دۆستانێکی لە... هەبوو": وتوویژ لەگەڵ دریپێر, ١٨ی دێسامبری ١٩٩١.

➢"بڕوانە کەوتۆتە چ ڕۆژێك؟": بە گوێرەی وتوویژ لەگەڵ دۆسکی, ٢٧ی ژووئیەی ١٩٩١.

➢"من لە... ناترسم": بە گوێرەی گوتەی ڕۆزوێلت, "ئەوینی فێربوون", لاپەڕە ٢٨٤.

➢"دەترسن...؟" هەمان, لاپەڕە ٢٨٨.

➢"کارناسی لەسەرەخۆی کاروباری دەرەوە": وتوویژ لەگەڵ کیسینجێر, ٢٣ی ئووتی ١٩٩٢.

## بەشی ٧

➢"چلەی چڕ و پڕ": وتوویژ لەگەڵ حەئیم لە واکۆف, مناخیم ناوت و تسووری ساگۆیی, تلاویو, ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢"پایەبەرزێکی مووساد": وتوویژ لەگەڵ ئالووف هارۆین, ئوورشەلیم, ١٧ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢"ئەنگلۆساکسۆنەکان هەمیشە تامەزرۆی...": لە زمان ئارچی ڕۆزوێڵتەوە, "ئـەوینی فێربوون", بیرەوەری ئەفسەرێکی دەزگای زانیاری, بوستۆن, ١٩٨٨, لاپەڕە ٢٠٥.

➢"کوردێك بە خۆی و کولێرە جۆیەك و چەن سەلك پیواز...": وتوویـــژ لەگـــەڵ ساگۆیی, تلاویو, ١٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢"دژبەران وریایی‌یان دەدا": بڕواننە نووسراوەی "ئیان بلاك و بێنـی مـووریس, لــەژێر ســەردێڕی: "شــەڕی پەنامــەکی ئیــسرائیل: حیکایــەتی نەبێــژراوی دەزگــای زانیــاری ئسرائیل, لەندەن ١٩٩١, لاپەڕەکانی ٧٧ – ٧٨.

➢"سیاسەتی گەڕانگەڕی": بڕواننە نووسراوەکانی بـلاك و مـووریس و نووسـراوەکانی دان ڕایوو و یووسی ملمان", "هەر سیخوڕێك پاشـایەکە – مێـژووی کـاملی دەزگـای زانیاری ئیسرائیل"، بوستۆن, ١٩٩١, لاپەڕە ٢١.

➢"ترس لە..." دێیوید کیمچە, "دوایین هەڵبژاردە, پـاش ناسـر, عـەرەفات و سـەددام حوسێن, گەڕان بە شوێن سوڵحدا لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست", لەندەن ١٩٩١, لاپـەڕە ١٩٠.

➢"بەدرخان": شەڕی پەنامەکی ئیسرائیل, نووسراوی بلاك و مووریس و وتوویـــــــژ لەگەڵ جوویی بلاو, پاریس, ١ی ژانویەی ١٩٩٣, لە دەفتــەری یادداشـتی ڕۆژانــەی سەرگورد نۆئێل سەبارەت بە ڕاسپێراویی تایبــەتیی لــە کوردسـتانا کــە لــە ١٩٢٠ لــە لەنــدەن بــڵاو کرایــەوە. بــەدرخان دەڵــێ کــە بنەماڵەکــەی بــە جۆرێــك بــە لای عوسـمانییانەوە وەك کلکە نەفتینە ناسرابوو کە لە دەفتەری نەهێنییەکاندا, ڕەمزێکـــی تایبەتییان بۆ دانابوون.

➢"ڕۆژنامەنووسێکمان بە ڕێی کوردستان...": وتوویژ لەگەڵ برایم ئەحـمەد, ساتێن, ســاری, ئینگلــستان, ٢٥ی نـوامبری ١٩٩١. ڕاپــۆرتێکی تــر دەڵــێ کــە دوو بــە کرێگیراوی ئیسرائیلی کار پێسپێراو لە ئەلــمانی ڕۆژاوا, کە بە ناوی ڕۆژنامــەنووس کاریان دەکرد لەم گەڕیانەدا بوون. بڕواننە نووسراوەی سیامەند عوســمان بــە نــاوی "توێژینــەوە لەســەر مێــژووی پــارتی دێمــوکراتی کوردســتانی ئێــراق لــە ســالانی

١٩٤٦ – ١٩٧٠" كۆتاییـنامەی دوكتۆرا, قوتابـخانەی باڵای توێژینەوەی زانستەكانی كۆمەڵایەتی, پاریس, ١٩٨٥.

➢"ئیسرائیلییەكان پاروویەكی ئەوتۆ نەبوون": وتوویژ لەگەڵ سیامەند عوسمان, لەندەن, ٢٤ی نوامبری ١٩٩١.

➢"گەدای كوێر..." وتوویژ لەگەڵ كامران قەرەداغی, سەرنووسەری دەرەوەی "ئەلـحەیات", لەندەن, ٢٩ی نوامبری ١٩٩١.

➢"پیرتر لەوەی كە دەینواند": وتوویژ لەگەڵ ناوت, تلاویو, ١٨ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢"بیستهەزار دۆلار": وتوویژ لەگەڵ ناوت, تلاویو, ١٨ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢"لە یەكێك لە ڕۆژنامە نووسانی دەرەوە كە...": وتوویژ لەگەڵ ئالیكس ئێفتی لە ئاسۆشێتێدپرێس, نیكۆزیا, ٢١ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢"لە هەر شتێكا كە پێویست بە ڕێنوێنی بوو": وتوویژی تەلەفۆنی لەگەڵ ئێماتسیا بارام, ئیسرائیل, ١٥ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢"ڕووداوی پەیوەندیدار بە "ئێریك ڕۆلۆ"وە, وتوویژ لەگەڵ لە واكۆف, تلاویو, ٢٠ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢"ئەفسەرێكی ئسرائیلی... بە ئانقەست خۆی ئاشكرا كرد": ئەننوور, ڕۆژنامەی ئەحمەد – تاڵەبانی، كە لە دەورانی جیا بوونەوە لە بارزانی لە بەغدا بڵاو دەكرایەوە, لە ٢٩ی ژانویەی ١٩٦٩ ئەم پەیوەندییەی لە قاو دا.

➢"كوردان زەوییان چاك دەناسی": وتوویژ لەتەك "لە واكۆف"دا, ٢٠ی ئۆكتۆبری ١٩٩٦.

➢"هەركام بۆخۆی سەگوانێك بوو": وتوویژ لەگەڵ ساگۆیی, ڕامات گام, ئیسرائیل, ٨ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢"خوا لە بۆ شەڕ كردنی ئافراندووە..." وتوویژ لەگەڵ ساگۆیی, ١٨ی ئۆكتۆبری ١٩٩١.

➢"ژمارەی ئەوانەی ئەم سەرکەوتنەیان...": سیامەند عوسمان, نامە بۆ نووسەری ئەم کتێبە, ٢٧ی ژانویەی ١٩٩٣.

➢"گوزارشتی شەڕی هەندرێن و هەڵتەزینەوەی بارزانی": وتوویژ لەگەڵ ساگۆیی, ١٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩٣.

➢"ژمارەی کوژاوەکان": ڕێنێ مووریە, "یان مەرگ یان کوردستان", پاریس ١٩٦٧.

➢"گفتوگۆی نێوان ساگۆیی و ژێنێراڵ ئاهارۆن یاریو: دواندنی ساگۆیی, ڕەنگدانەوەی لە وتوویژی ١٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩١دا.

➢"ڕاکردنی فڕۆکەوان": ڕاویو و مێلمان, "هەر سیخوڕێك پاشایەکە", لاپەڕەکانی ١٤١ و ١٤٣.

➢"بە پشتیوانی شا": ئەسەدوڵلا عەلەم. "شا و من". بیرەوەرییەکانی عەلەم وەزیری بارگا ١٩٦٩ – ١٩٧٧, لەندەن ١٩٩١, نیۆیۆرك, ١٩٩٢, لاپەڕەکانی ٤١ و ٨٣ و ٨٤.

➢"پەلامارەکەی کەرکووك": وتوویژ لەگەڵ لە واکۆف و سامی عەبدوڕڕەحمان, ڕەواندز, ١٥ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢"ئێمە کۆسپێکین بۆ وان": وتوویژ لەگەڵ ناوت, تلاویو, ١٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢"ئەو لێپرسراوانەی...": وتوویژ لەگەڵ عیسمەت شەریف وانلی, لۆزان, ٣١ی ئۆکتۆبری ١٩٩١,

➢"دۆگۆڵ و نیکسۆنتان لەسەر کار وەلا دا": ماتی گولان, شیمۆن پرێز, لەندەن, لاپەڕە ١٥٠, بارزانی لە مەودای دیدارەکانی خۆیا زۆری ئیشتیا لێبوو چاوی بەو جوولەکانە بکەوێ کە سەردەمانی پاشەکشەی لە ئێرانەوە بۆ سۆڤیەت نانیان بۆ هێزەکەی کڕیبوو.

➢ "کیمچەی سەر بە مووسادیش ئەم گەڕیانەی داویشتە سەر ئەستۆی ئیسرائیل" کمیچە لە "دوایین هەڵبژاردە", لاپەڕە ١٩٤دا ئاماژە دەکاتە ئەم مەبەستە کە ئیسرائیل یارمەتی ئەم ئاڵوگۆڕە بنەڕەتییانەی دا. "کیسینجێر لە گەڕیانی هەوڵ و تەقەلاکانی ئێران و ئیسرائیل بە مەبەستی بەهێز کردنی کوردان ئاگادار کرابۆوە. پێمانسەلماند

کە بێتە ڕیزی ئێمە و سەرەڕای بەرژەوەندیی کارناسانی وەزارەتی دەرەوە بە ڕێبەرایەتی درێپێر پشتیوانی لە کوردان بکا. کارناسانی وەزارەتی دەرەوە بەڵگەیان دێنایەوە کە ئەمریکا بەم کردەیەی هیچ وە دەس ناهێنێ. کی‌سینجێر بە پێچەوانەی ئەم پێشنیارە تەمای گرت.

➢ "وتوویژە تەکوڵوێیەکان": ویلیام سافایەر, واشینگتۆن سافایەر, نیۆیۆرك, ١٩٨٠, لاپەڕە ٨٣؛ لە پێشدا لە ٥ی فێوریەی ١٩٧٦دا لە ڕۆژنامەدا بڵاو کرابۆوە.

"کوردان پێیانخۆش بوو دەس بەرن بۆ پەلامارێك کە هەم ئازادی بۆخۆیان بکاتە دیاری و هەم باری ئیسرائیل سووك بێ" بەڵام کی‌سینجێر لەو پەلامارەی پەژیوان کردنەوە. لە ١٦ی ئۆکتۆبری ١٩٧٣دا فەرمانی دا بە کۆلبی سەرۆکی سیا کە پەیامێك بۆ کوردان بنێری کە تێیدا ڕوون کرابێتەوە "کە ئێمە چەنپاتی دەکەینەوە ئەو ڕێ و پەلامارەی خستوویانەتە بەر دەمی ئێوە بەجێ و بە باشی نازانین." (گوزارشتی کمیتەی پایك دەڵێ مەبەست لە وڵاتی پێشنیاردەر ئیسرائیلە.)

➢ "بەڵام بارزانی ڕەزامەندی لەسەر ئەم کارە نەبوو": وتوویژ لەگەڵ مەحموود عوسمان, سلێمانی, ٨ ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ هێنری ئێ. کی‌سینجێر, "ساڵگارانی کۆشکی سپی", نیۆیۆرك, ١٩٧٩, لاپەڕە ١٢٦٥.

➢ "وردوپرد دەبن...": وتوویژ لەگەڵ کی‌سینجێر, مارتا وینیارد, ٢٣ی ئووتی ١٩٩٢.

➢ "تێگەیشتنی کی‌سینجێر لەم بابەتە" وتوویژ لەگەڵ کی‌سینجێر, ٢٣ی ئووتی ١٩٩٢.

➢ "نامەوێ کوردان وەك بەکرێگیراوی ئەمریکا و ئیسرائیل بناسرێن...": بە گوتەی عەلەم, "شا و من", لاپەڕە ٢٧.

➢ "ئەویش بە درۆ دەرچوو": وتوویژ لەگەڵ ساگۆیی, ١٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "گوردانێك تانکی تـەیار کـراو": گفتوگـۆی تەلـەفۆنی لەگـەڵ قـەرەداغی, ٢٨ی ژانویەی ١٩٩٤.

➢ "ساگۆیی واقی بردەوە": وتوویژ لەگەڵ ساگۆیی, ١٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "خەیانەت لە ڕیزی پێشمەرگەدا": گفتوگۆی تەلـەفۆنی لەگـەڵ قـەرەداغی, ٢٨ی ژانویەی ١٩٩٤.

➢ "کشانەوەی لەنـەکاوی دوو گـوردان و نیـو بـە بیـانووی جێگۆڕکـێ"" کیمـچە. "ئاخرین ئینتیخاب", لاپەڕە ١٩٥.

➢ "بە دەستووری لەپڕی ساواك": وتوویـــژ لەگـــەڵ ئیـــوری لـــوبرانی, وەزارەتـــی بەرگری, تلاویو, ١٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "واقی بردەوە": هەمان.

➢ لێپرسراوێکی بالادەستی ئێرانی: بڕواننە " دوایین هەڵبژاردە ", نووسـراوی کیمـچە, لاپەڕە ١٩٥.

➢ "لێپرسراوانی پایەبەرزی کورد ئەم مەبەستەیان سەلـماندووە": کامران قەرەداغی لە گفتوگۆیـەکی تەلـەفۆنی ڕێکـەوتی ٢٨ی ژانویـەی ١٩٩٤دا گـوتی کـە مەحـــموود عوسـمان کە ئەوان سەردەمان نزیکترین ڕاوێژکاری بارزانی بووە ئۆبـاڵی دەکێـشا کـە ڕێبەرایەتی کورد ئاگاداری پەیوەندی نێوان وەزیرانـی دەرەوەی ئێـران و ئێـراق بـووە. "تاوانی خۆمان بوو کە تێنەگەیشتین ئەو پێوەندگرتنانەی چەند مانگ درێـژەی کێـشاوە خەریکە دێتەبەر."

➢ "کیمچە حاشای لێکردووە": کیمچە, " دوایین هەڵبژاردە ", لاپەڕە ١٩٥.

➢ "بەلام مێژوونووسێکی ئیسرائیلی": وتوویژی تەلـەفۆنی لەگـەڵ ئوفرابنجبـو, لــە ناوەندی دایان, زانکۆی تلاویو, ئیسرائیل, ١٧ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

➢ "مەلامستەفا مەبەستی باسەکەی گۆڕی": وتوویـــژ لەگـــەڵ مـــووریس درییێـــر, واشینگتۆن دی.سی. ١٨ی دێسامبری ١٩٩١.

➢ ویلیام سـافایەر, مەقالـەی ڕێکـەوتی ٢٠ی ئـاوریلی ١٩٩١, ئینترنەشـناڵ هرالـد تریبیۆن, جیاوازییەکی ئەوتۆی مارلین فیتس واتێـر گوتـەبێژی کۆشـکی سـپی بەرچـاو

کەوت (گوزارشتی ٦ – ٧ی ئاوریل) و جۆزێف فیچت (١٠ی ئاوریلی ١٩٩١, ئینترنەشناڵ هرالد تریبیۆن.)

➢ "گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ قەرەداغی": پاریس, ٢٨ی ژانویەی ١٩٩٣, فرێدریك کۆنی ڕاوێژکاری هێزەکانی ئەمریکایی لە کاتی گەڕانەوەی پەنابەرانی کورد بۆ سەر ماڵوحاڵیان, بە ڕێکەوت لە نزیك شاری کوردنشینی دیانا تووشی سێ کەس هاتبوو کە بە عیبری دوابوون, بەڵام نەیتوانیبوو ڕوونی کاتەوە کە لەوێ لەچی گەڕاون, وتوویژ، پاریس, ١٣ی دێسامبری ١٩٩١.

➢ "هەتا پتر لە گەڕیانەکەوە دەچووی": وتوویژ لەگەڵ ویلیام ئی. کولبی, واشینگتۆن دی.سی. ٢٠ی دێسامبری ١٩٩١.

➢ "خەڵکی ساکاری ناوچە": وتوویژ لەگەڵ لوبرانی, ١٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩١.

## بەشە ٨

➢ سیمۆن وایزنتاڵ" وتوویژ, ویەن, ٣ی سێپتامبری ١٩٩٤.

➢ "کوشتاری ئەرمەنییەکان": بە پێی گوتەی لۆرد برایتس, لە زمان هوارد ئێمەوە. ساکۆ، لە "وەدیارکەوتنی ڕۆژهەڵاتینێوەڕاست"دا, ١٩١٤ – ١٩٢٤, نیۆیۆرك, لاپەڕەکانی ١٠٦ و ١٠٧؛ لەم قەڵاچۆکردنەدا نیزیکەی ١/٣٩٦/٠٠٠ ئەرمەنی کوژران. نەتەوەپەروەران لەسەر ئەم بڕوایەی کە نیزیکەی ٧٠٠/٠٠٠ کوردیش بە دەستی هێزەکانی عوسمانی کوژران یان لە ماوەی دوورخرانەوەدا لە برسان مردن. بۆ ڕوون بوونەوەی زیاتر لە بابەت بەشدار بوونی کوردانەوە لە قڕ کردنی ئەرمەنییەکاندا بڕواننە گوزارشتەکانی قونسوولەکانی ئەمریکا "جی.بی. جەکسۆن" و "لێزلی ئی. دێیویس" لە زمان مورگنتاوەوە, لە کتێبی "داستانی مورگنتاوی باڵوێزدا", گاردێن سیتی, نیۆیۆرك, ١٩١٨, لاپەڕەکانی ٢٦٣, ٢٧٣, ٣٨٣ و ٣٨٦.

➢ "تەما بە خاشەبڕ کردن؛ بورۆکراسی سەرکوت؛ دەوڵەتی ئێراق بە پێی گوتەی خۆی": نێرەڤانی مافی مرۆڤ, ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست, نیۆیۆرك, فێوریەی ١٩٩٤, لاپەڕە ١٠, یادداشتەکان, "ئەگەرچی نەخشەی گشتیی خاشەبڕ کردنی کوردان وە دەس نەکەوتووە, بەلام بەلگە و دیاردەکان بە ڕادەی پێویست و پتەو دەریدەخەن کە دەوڵەتی ئێراق تەمای لەسەر تەفروتونا کردنی ئەم خەلکە بووە." کۆنوانسیۆنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی بەرگرتن لە تۆوبڕکردن و سزادانی بەرێوەبەرانی ئەم جینایەتە لە دێسامبری ١٩٤٨دا مۆرکرا و لە ١٩٥١دا وەك قانوون بەرزکرایەوە. دەوڵەتی ئێراق لە ١٩٥٩دا مۆری کرد.

➢ "گوزارشتەکانی سەبارەت بە دەزگای پشکنینی بیروڕای ئیسپانیای خوێندەوە": بڕوانە "داستانی مورگنتاوی بالوێز", لاپەڕە ٢٦٦. تاقمێك لەم بارەوە دوودلییان نواندووە. هیس دابلیو. لوری، لە نووسراوەکەیدا بە ناوی "لە پشت داستانی مورگنتاودا", ئیستامبووڵ, ١٩٩٠, لای وایە ئەم داستانە تەبلیغاتێکی ئەمریکاییە و لەسەر ڕاسپاردەی لێپرسراوانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا, پاش ڕاگەیەندرانی شەڕی ئەمریکا دژی عوسمانی لە ١٩١٧دا نووسراوە. ئەولای وایە کە هاوکارانی نیزیکی مورگنتاو بۆ ڕێكوپێك کردنی ئەم بیرەوەرییانە هەم لە ئیستامبووڵ و هەم پاش گەڕانەوەی بۆ ئەمریکا، ئەم ئەرمەنییانە بوون کە بۆ ڕەش کردنی عوسمانی و دانانی پەیوەندی لە نێوان چالاکی و شالاوی ئەو دەوڵەتە و دەزگای پشکنینی بیروڕای ئیسپانیا بەلگە و بۆنەی خۆیان بە دەستەوە بووە.

➢ "بە بێ هیچ ڕوحم و بەزەیەك قڕیان کەن": سەرچاوە: نامەی هایك ئەرسەلانیان، ئینتێرنەشناڵ هرالد تریبیۆن، ٢٠ی ئۆکتۆبری ١٩٩٣.

➢ "زانیارییەکانی کامپیۆتێری": ئازاد عەونی، ئەو کوردەی کە لە وەختی پەلاماری ئاسمانیی بۆ سەربەغدا لە ژانویەی ١٩٩١دا لە زیندان ڕایکرد. ئەو گوتی کە بۆمبایەك وە بەندیخانەکەوت و ناوەندی کامپیووتێری لە ژووری بەندیخانە تەفروتونا کرد. وتوویژ لەگەڵ عەونی، هەولێر، ٢٢ی مارسی ١٩٩١.

➢ "ئیشتاسی": بڕواننە "بێسەروشوێنەکان و قەتڵە سیاسییەکان، قەیرانی مافی مرۆڤ لە ساڵانی دەیەی ۱۹۹۰دا"، ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی، لەندەن، ۱۹۹٤، لاپەڕە ۱۸.

➢ "لە بنەماڵەی خۆی": وتووێژ لەگەڵ وشیار زێاری، سەلاحەددین، ۱۲ی فێوریەی ۱۹۹۲.

➢ "پۆلیسی نهێنی": دەرمان مشك یەکێك لە فێڵ و تەڵەکە گڵاوەکانی گوێ لەمستانی ئێراق بوو. دوکتۆر مەحموود عوسمان و عەدنان موفتی لە وتووێژێکی ڕێکەوتی یەکی فێوریەی ۱۹۹۱دا، ڕووداوێکی کە خۆیان تووشی هاتبوون، گێڕایانەوە: لە ٢٤ی نوامبری ۱۹۸۱دا عوسمان، جێگری سەرۆکی حیزبی سووسیالیست و عەدنان موفتی یاریدەدەری و یەکێکی دی لە هاوکارانی، ئەو ماستەی کە ژاری تالیۆمی تێکرابوو، خواردیان و نەمردن. ژنێکی جوانی یەکێك لە گەورە پارێزەرانی تاڵەبانی ماستەکەی ئاوا لێکردبوو. ئەم ژنە بە بێ ئاگاداری عوسمان و دۆستەکانی دەستی دابوویە هاوکاریی پۆلیسی نهێنی هەتا شووەکەی لە بەندیخانە ڕزگار بێ. سێ کوردی تر پاش ڕشانەوە و دڵئێشەیەکی زۆر مردن. (نیشانەکانی بەرچاوی ئەم ژارە کزانەوە و گڕگرتنی گەدە و بلۆق دەرکردنی قاچ و قول و موو وەرینە.) زانیارییەکانی پزیشکیی عوسمان، یارمەتی دا کە خێرا لە دیاردەکانی دەرماناداو بوون حاڵی بێ. ئەو خۆی لە ئێراق مایەوە، سێ پیاوەکەی دیکەیان بە مەفرەشبار، لەسەر پشتی یەکسم ئاودیوی سنوور کرد و بە ئامبوولانس ناردیان بۆ تاران. لە سایەی سەری ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی دژەژاری ئەم ژارە بە ناوی پروشێن بلوو خێرایەکی لە ئەڵمانەوە نێردرا و ئەم کەسانە لە مردن خەلەستن. کۆمیسێری باڵای کاروباری پەنابەرانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کارێکی وای کرد کە ئەم تاقمە بۆ تیمار کران نێردرانە لەندەن و لەوێ باشتریان پێڕاگەیشتن. پێشمەرگەکان دژەژاریان بە قاچاخی لە بۆ عوسمان نارد. دەوڵەتی ئێراق مێردی ئەم خاتوونەی ئازاد کرد، بەڵام بەو مەرجە کاری بۆ بکا. لە ڕاپەڕینی ساڵی ۱۹۹۱دا ئەم

ژنه لـه سلێمانی گیرا و مـحاکەمە کرا و ئیعدامی بۆ بڕایه و ئیعدام کرا. مێردەکەشی بە جیا لـه دار درا.

➢ "دڕندایەتییەکی کە بە بۆنەی ئەوەوە ئێراق لـە ماوەی دوور و درێژی مێژووی خۆیـا ...": فریا ئێستارك، "تـۆز و غومـار لــه چـنگی شـێرا"، لەنـدەن ١٩٢٦، لاپـەڕەکانی ١٤١ و ١٤٢. تالکوت سـیلیه، دیپلۆمـاتی ئـەمریکاییش کـه ئـەزموونێکی دوور و درێژی دەربارەی جیهانی عەرەب هەبوو، گوتی: "ئێراقییەکان مەیلێکیان بـۆ دڕندایـەتی و زەبروزەنگ هەیە کە ناکرێ تەنیا لـه ڕووی دەسکرد بوونی دەوڵـەتی ئێراقەوە شیرۆڤە بکرێ." لـەسەر زاری ڕابێرت دی. کاپلان لـه کتێبی "لایەنگرانی عەرەباندا: ڕۆمانــسی یەکێك لـه هەڵکەوتووانی ئەمریکا"، نیۆیۆرك، ١٩٩٢، لاپەڕە ٢٥٢.

➢ "مەیل و ئیشتیای لاڕێیانه": یەکێك لــه ئەفـسەرانی دەزگـای ئاسایــشی ئێـراق کـه ڕایکرد بوویه عەرەبستانی سعوودی، گوتی چەند جارێکیان لـه ساڵی ١٩٨٥ و ١٩٨٦ ئەو و ئەفسەرانی پایەبەرزی ئاساییشیان بۆ کۆڕەکانی جێـژنێك لــه ســارای "سەڕســەڕ" بانگهێشتووە. پاش خواردن و خواردنـەوەی ئابــجۆ و ویـسکی چـەکیان داوەتـە دەس هەموان و دەستووریان پێداون کە تەقە لـه پۆلێك زیندانی دەس و چاو بەستراو بکـەن. قوربانییــەکان کەوتنــه ئــەو قوڵکانــەی کــه پێــشتر هەڵکەنــدرابوون و بۆلــدزێرەکان تەرمەکانیان داپۆشی. وتووێژ لـەگەڵ ئەحـمەد چەلـەبی، شـووڕای نەتـەوەیی ئێـراق، لەندەن، ١٠ی ئووتی ١٩٩٦.

➢ "٤٢٤٠ گوندی کوردان": وتووێژی تەلەفۆنی لەگەڵ شۆڕش ڕەسووڵ، لەندەن، ١٩ی نوامبری ١٩٩٤. "لـه ١٩٦١دا هێزەکـانی ئێراقـی نیزیکـەی ١٢٧٠ گونـدیان خاپوور کرد": کاپلان، "لایەنگرانی عەرەبان"، لاپەڕە ٢٥١.

➢ "ئەگەر ڕەوتەکه ئـاوا بـەرەوپێش بـاژوێ": وتووێـژ لـەگـەڵ مەسـعوود بـارزانی، دەمیشق، ٣ی دێسامبری ١٩٨٧.

➢ "خەباتێکی کەوا کەوتۆتە بەر ئافەریـمی تەواوی کۆمەڵانی جیهان": تۆوبڕکردن لــه ئێراقا: شاڵاوی ئەنفال دژی کوردان، نێرەڤانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست، نیۆیـۆرك، لاپــەڕە ١١١.

➢ "لـە داردانێل": مورگنتاو، "داستانی مورگنتاوی باڵوێز"، لاپەڕە ۱۹۷.
➢ "ئەگەر ئەوتۆ نەکەین ..." تۆوبڕکردن لـە ئێراقا، لاپەڕە ۳٤۷.
➢ "کێ دەیەوێ متەق بکا؟": هەمان، لاپەڕە ۳٤۷.
➢ "وایان چاوەڕوانی لێمە ..." هەمان، لاپەڕە ۳٥۲.
➢ "ئەم ژمارە پێهەڵابراوە یانی چی؟": بە پێی وتوویژ لـەتەك عەدنان موفتیدا، پـاریس، ۲۸ی ئۆکتۆبری ۱۹۹۱.
➢ "٦۰۰۰۰ هەتا ۱۱۰۰۰۰": وتوویژی تەلـەفۆنی لـەگەڵ شۆڕش ڕەسووڵ، ۱۹ی نوامبری ۱۹۹٤.
➢ "سەدان هەزار؛ بێسەروشوێنەکان و کوژراوانی سیاسی؛ قەیرانی مـافی مـرۆ**ڤ** لــە ساڵانی دەیەی ۱۹۹۰دا": بلاڤۆکی لێبووردنی نێونەتەوەیی، ۱۹۹٤، لاپەڕە ۱۷ باسی ئەو دژوارییانە دەکا کە بۆ وە دەس هێنانەوەی ژمارەی ڕاست و دروست دێنە سەرڕێ. بەڵام دەکرێ بەراورد بکرێ کە جگە لــەو بێسەروشـوێنانەی کـە ئیعـدام کـراون یـا کوژراون، لـە مەودای ساڵانی ۱۹۸۰دا سەدان هەزار کەسی تر هەروا بێ مـحاکەمە و لـەڕێوە ئیعدام کرابن.
➢ "بە ڕادەیەك بەربڵاو": گۆڤاری نەشناڵ جیۆگرافی، بەرگی ۱۸۲، ژمـارە ۲ ئـووتی ۱۹۹۲، لاپەڕە ٤٦.
➢ "لانی کەم شێست دێ": "تۆوبڕ کردن لـە ئێراقا" لاپەڕە ۳٥۹.
➢ "شاڵاوی تۆوبڕکردن": وتوویژ لـەگـەڵ ویلیـام ئێگلتـۆن، واشـینگتۆن دی.سـی. دێسامبری ۱۹۸٦.
➢ "کابرای سەر بە بارزانی": وتوویژ لـەگـەڵ غـازی زێبـاری، دەمیـشق، ٦ی مـەی ۱۹۸۷.
➢ مـحێدین مەعرووف، یاریـدەدەری سـەرکۆمار: لــە ئینتێرنەشـناڵ هرالـد تریبیـۆن، ۸ – ۹ی نوامبری ۱۹۸۸.

➢ "گلاسپی پێی گوتم": وتووێژ لەگەڵ ئیپریل گلاسپی, واشینگتۆن دی.سی. ٢٢ی دێسامبری ١٩٩٤.

➢ "بەرهەمەکانی سووکایەتی و پەستی": "تۆوبڕکردن لە ئێراقا", لاپەڕە ٢٩.

➢ "ئاگامان لێ نیە": "بورۆکراسی سەرکوت, دەوڵەتی ئێراق بە گوێرەی گێڕانەوەی خۆی", مافی مرۆڤ , نێرەڤانی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست, نیۆیۆرك ١٩٩٤.

➢ "لە دیداری مانگی ژوەنی ١٩٨٨دا": وتووێژ لەگەڵ تاڵەبانی لە پاریس, ٢١ی سێپتامبری ١٩٨٨.

➢ "بەغدا حاشای لەم بەڵگانە کرد": "بورۆکراسی سەرکوت, دەوڵەتی ئێراق بە گوێرەی گێڕانەوەی خۆی", نێرەڤانی مافی مرۆڤ, نیۆیۆرك ١٩٩٤, لاپەڕە ٢٣ ساختەکاری بە دوور و درێژی وە درۆ دەخاتەوە. لەگەڵ ئەمەدا کە نەخشەیەکی گشتیی وە دەس نەکەوتووە, بەڵام یەکسانی بەڵگە و بۆنەکان لە گەلێك پەروەندانەدا دانەبڕانی کارەکە دەسەلمێنێ و ئاخرییەکەی سەری دەگاتەوە خشتەیەکی پڕ گرێپووچکە.

➢ "خوارەکەو پێچەکە و وردەکارییەکانی مافی نێونەتەوەیی": وتووێژی تەلەفۆنی لەگەڵ [شۆڕش] ڕەسووڵ, لەندەن, ١٩ی نوامبری ١٩٩٤.

➢ "نیشانی دا کە بووز هەر دەخوا": ئوستوون دیك "داوەری هەڵە لە نورێنبێرگ", پێداچوونەوە بە کتێبی نیۆیۆرکا, ژمارە ١٦, ٧ی ئۆکتۆبری ١٩٩٣.

➢ "ڕەنگە لە داهاتوودا ببینین."

➢ "ناتوانن لە هەولێرەوە بچنە کەرکووك..." هەمان, لاپەڕە ٣٤.

➢ "خراپکاران": هەمان, لاپەڕە ٦٨.

➢ "ئەو دوو ئەفسەرە ئێراقییەی بە دیل گیرابوون...": وتووێژی تەلەفۆنی لەگەڵ [شۆڕش] ڕەسووڵ, لەندەن, ١٩ی نوامبری ١٩٩٤.

➢ "تاڵەبانی داوای لێکردم...": "تۆوبڕکردن لە ئێراقا", لاپەڕە ٣٤٩.

➢ "لانیکەم ٣٨٠٠ کورد تێداچوون": وتووێژ تەلەفۆنی لەگەڵ [شۆڕش] ڕەسووڵ, ١٩ی نوامبری ١٩٩٤.

➢ "سەرەڕای بوونی ئەم بەڵگانە": ئەم باسە لـە كتێبی شەڕی ئێران و ئێراق: پەرێـشانی لـە بۆشاییدا, نیۆیـۆرك, ١٩٩٢, بــە قەڵــەمی "ئێـستیفێن س. پلــە تییــەر"دا دووپـات كراوەتەوە. تاوانبار كردنی ئێران لـە لایەن "كارلایل"ەوە لـە هەڵەبـجەدا دەگەڕاوە سەر ئەوەی كە لێوی هێندێك لـە تەرمەكان ڕەشوشین هەڵگـەڕابوون و ئەمـەیان دەبـردەوە سەر شوێنەواری گازی سپانید كە ئێراق ئەو گازەی بە دەستەوە نەبوو. بەڵام لــە ٢٣ی مەی ١٩٩٣دا دوكتۆر هوارد هوو, مامۆستای ساخلەمی هاروارد و پزیشكی نێرەڤـانی مافی مرۆڤ گوتی كە ڕەشوشین بوونـەوەی دەم و لێـوان دەكـرێ هـی شـوێنەواری ماددەیەك بێ بـەناوی Acetylcholinesterase كـە كـار دەكاتـە سـەر دەمـار و دەبێتە هۆی شەلەل بوونی كۆئەندامی هەناسەكێشان. بڕواننە "تۆوبڕ كردن لــە ئێراقـا", لاپەڕە ٢٦.

➢ "خەڵك تۆقیون": وتوویژ لـەگەڵ دوكتۆر مەحـموود عوســـمان, دەمیـشق, ٢٣ی ئاوریلی ١٩٨٨.

➢ "تێكڕای كوردان دەیانزانی": وتوویــژ تەلــەفۆنی لـەگــەڵ [شــۆڕش] ڕەســووڵ, لەندەن, ١٩ی نوامبری ١٩٩٤.

➢ "یەكـجار جێی ڕێز, بەڵام..." وتوویـژ لـەگـەڵ عەبدوســسەلام بـارزانی, بـارزان, ئێراق, ٢٣ی ژوەنی ١٩٩٣.

➢ "یەكێك لـە بارزانییە بەختەوەرەكان": وتوویژ لـەگـەڵ فاتـــم مـحەمـــمەد سـاڵح, بارزان, ئێراق, ٢٣ی ژوەنی ١٩٩٣.

## بەشی ٩

➢ "هێزە نهێنییەكان": ڕەمزێكە بۆ هێـزە چـەكدارەكان و ئاسـاییش, یـاووز گوكمـەن, ٢٣ی دێسامبری ١٩٩٥.

➢ "خەرجوبەرجی شەڕ": بڕواننە هەواڵەکانی ڕۆژانەی تورکیا, ٢١ی ژانویە, ٢٥ی مارس و ١٦ی ژوەنی ١٩٩٦, ئەو دیپلۆماتە غەوارانەی کە من لە ئانکارا وتوویژم لەگەڵ کردن, خەرجی ساڵانەی شەڕی تورکیایان بە دە میلیۆن دۆلار دانا.

➢ ٣٠٠/٠٠٠ کەس, بەراوردی مەسعوود یەڵماز, سەردەمایەکی کە لە دەوڵەتا نەبوو, حوڕڕییەت, ١٦ی ئووتی ١٩٩٥.

➢ نیزیکەی ١٢٠٠ کوردێك بێسەروشوێنچوون. میللییەت لە دێسامبری ١٩٩٤دا ژمارەی کوژراوەکانی بە ٣٢٤٠ کەس دانا. تەواوی ئەم قەتلانە جگە لە ژمارەیەکی کەمیان لە پارێزگا کوردنشینەکاندا قەومان.

➢ "بێتوو مرۆص لە گوند بێ...": شێست خولەك, ١٤ی ژانویەی ١٩٩٥.

➢ "کردەوە ترۆریستییەکان": سەرچاوە, جومهوورییەت, ١١ی ئۆکتۆبری ١٩٩٤.

➢ "دریسم... گازە ژاراوییەکان": یەکێك لە مێژوونووسانی سەربازیی ترك کە لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٧٠دا ڕاپۆرتێکی لێكولەباری سەبارەت بە ڕاپەڕینەکانی کوردانی تورکیا لە مەودای نێوان دوو شەڕاندا لە گۆڤارێکا بڵاو کردەوە؛ بەڵام ئەم بەرهەمە خێرایەکی کۆکرایەوە. کۆژمارەیەکی گرینگ و بەرچاوی سەبارەت بە ڕادەی کوژراوان تێدا نەنووسرابوو, بەڵام سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوی فەرانسەوی وای دانا کە ٤٠٠٠ کورد لە ڕووداوەکانی دریسمدا تێداچوون؛ کە ڕەنگە زۆری پێوەنرابێ: لووسین ڕامبۆ, "کوردان و مافەکانیان", پاریس ١٩٤٧, لاپەڕە ٣٩.

➢ "تەنیا گەلی ترك": بە پێی نووسینی میللییەت, ٣١ی ژووئیەی ١٩٣٠, گوتەی وەزیری داد ڕوونتر بوو: "ئەوانەی کە لەم وڵاتەدا لە ڕەگەزی ترك نین, تەنیا خاوەنی هەقێك دەبن و ئەویش ئەمەیە کە خولام و کۆیلەی ترکان بن."

➢ "پێوست بوو": بە گوێرەی وتوویژ لەگەڵ هیدر گوتیاس, هەواڵنێری ڕۆیتێر, ئانکارا, فێوریەی ١٩٩٦.

➢ "کارتاژ خاپوور کەن": بۆ ماوەیەی چەند حەوتەیەك پلاقۆکانی ترك سروودی ڕزگار کرانی درسیمیان هۆندەوە و هاواریان بەرز کردەوە: ئیتر درسیم نەماوە؛ درسیم

خاپوورکرا! ئارشاك سێفراستیان: "کـوردان و کوردسـتان", لەنـدەن, ١٩٤٨, لاپـەڕە ٨٦, سێفراستیان جێگری کونسوولی بریتانیا بوو لـە بدلیس و لـەگەڵ ئەوەشدا کـــە ئەرمەنی بوو و ئەرمەنیش لـە ١٩١٥دا قەڵاچۆ کرابوون, هەروا دۆستی کوردان بوو.

➢ "ئەگەر باسی دەوڵـەت بکەن": عوسـمان متە, سوون پوسـتا, ئـاوریلی ١٩٤٨, بـە گوێرەی گێڕانەوەی کەندال نزان لـە "خەڵکی بێ دەوڵـەت"دا, ژرار شـالیان, لـەنـدەن, ١٩٨٠, لاپەڕە ٧٢.

➢ "باوکانی ئێمە کە لـە سەرکوت..." وتوویژ لـەگەڵ ئەحـــمەد تـرك, ئانکـارا, ٨ی فێوریەی ١٩٩٦.

➢ "وتەکانی گوکاڵپ": سەرەتا لـە "بنج و بنەڕەتەکانی تورکیسم"دا چاپکـرا, پاشـان لـە "کوچوك مەجـمووعە", ژمارە ٢٨, دیاربـەکر, ١٩٢٣, بـە گـوێرەی سەرچـاوەی "پان تورکیزم لـە تورکیادا", توێژینەوەیەك لـەسەر ئێردانتیزم (وێککەوتنی تەواوی ترکان پێکەوە), بە پێی نووسراوەی جاکوب ئێم, لاندۆ, لەندەن, ١٩٨١, بلاّو کرایەوە.

➢ "نێوانی ئوزەل لـەگەڵ نیزامییەکان": لـە ١٩٩١دا ئوزەل بە تووڕەیی بە نیزامییـەکانی گوت: بۆ گۆدەتا کردن و سازکردنی خانوو لـە بۆ ئەفسەران هیچ کەم و کورتییـەکتان نیە و ئیتر هیچ. نووسینگەکانی ڕۆژهەلاّت, ١٩٩٣, پاریس, لاپەڕە ١٥.

➢ "ئوزەل.. لای وابوو": وتوویژ لـەگەڵ دیپلۆماتێکی ڕۆژاوایی کە نەیویست نـاوی بدرکێ؛ ئانکارا, ٧ی فێۆریەی ١٩٩٦.

➢ "هەلی بۆ کەسانێکی وەك من دەڕەخساند...": وتوویژ لـەگەڵ مـحەمـمەد عـەلی بیراند, ئیستامبووڵ, ٨ی فێوریەی ١٩٩٦.

➢ "جێـژنی نـەورۆز": بەرپرسـێتی ڕاسـتەوخۆی کوژاروەکـانی نـەورۆز لـــە ئەسـتۆی نیزامییان و هێزەکانی پۆلیس بوو, نێرەڤـانی هیلـسینکی, بـەرگی ٤, ژمـارە٩, ژوەنـی ١٩٩٢, حیزبی سووسیال دێموکراتی گەل کە بەشداری دەوڵـەت بـوو, زەبروزەنگـی هێزەکانی ئاساییشی مەحکووم کـرد و وە بـیری هێنایـەوە کـە هێزەکـانی حکوومـەتی کەسیان تێدا نەچووە.

➢ "ئوزەل و چاندار": وتوویژ لەگەڵ گنجیز چاندار, ئیستامبووڵ, ١٨ی فێوریەی ١٩٩٦.
➢ "خەیاڵم وایە هەوڵێکی بدەم...": وتوویژ لەگەڵ ئەحمەد ترك, ئانکارا, ٨ی فێوریەی ١٩٩٦.
➢ "ئەگەر زیندوو بوایە و درێژەی ئەم ڕەوتەی دابا...": وتوویژ لەگەڵ بیراند, ئیستامبووڵ, ٨ی فێوریەی ١٩٩٦.
➢ نامەی ئوزەل" ئیندیپێندێنت, لەندەن, ١٣ی نوامبری ١٩٩٣.
➢ "تورکیا پێشبڕکەی حکوومەتە پاوانخوازەکانی داوەتەوە": نیۆیۆرك تایمز, ١٥ی مارسی ١٩٩٦.
➢ "لە ماڵەکەیاندا": وتوویژ لەگەڵ بنەماڵەی ئێریك, ئیستامبووڵ, ٧ی فێوریەی ١٩٩٦.
➢ "ئەو گرفتەی تووشی هات": وتوویژ لەگەڵ قەدری گورسێل, ئیستامبووڵ, ٥ی فێوریەی ١٩٩٦.
➢ "نەخۆشیی و لاوازی": کوردەکانی ئێراق کە لە ١٩٩٢دا لەگەڵ پ.ك.ك. پێکهەڵپڕژان, ئاشکرایان کرد کە پ.ك.ك. بریندارەکانی خۆی دەکووژێ کە نەکەونە دەس دوژمن. وتوویژ لەگەڵ نووسەری ئەم کتێبە, هەولێر, ١٤ی ژانویەی ١٩٩٣.
➢ "بنئاورە بۆ پ.ك.ك.": وتوویژ لەگەڵ کامران ئینان, ئانکارا, ٨ی فێوریەی ١٩٩٦.
➢ "بەم ئاکامە گەیشتبوو کە کوردان": کۆلکەخانەی گشتیی بریتانیا, کییۆ, بەڵگەی ژمارە ٣٧١/١١٥٥٧.

## بەشی ١٠

➢ "ئەگەر پێشتر نەمدەزانی..." وتووێژ لەگەڵ ئەحمەد چەلەبی, لەندەن, ٢٧ی سێپتامبری ١٩٩٥.

➢ "دوو میلیۆن دۆلار": بارزانی و تاڵەبانی پێشنیاریان کرد کە ئەوان نیوەی خەرجەکەی بدەن و واشینگتۆن تەنیا میلیۆنێك دۆلار بدا. وتووێژی تەلەفۆنی لەگەڵ وشیار زێباری, لەندەن, ٢٧ی ئۆکتۆبری ١٩٩٦.

➢ "سووتەمەنی دزێلیی ئێراق" سەرچاوە هەمە چەشنەکانی کوردی وایان دادەنا کە لە ١٩٩٦دا داهاتی رۆژانە ١٥٠/٠٠٠ تا ٢٠٠/٠٠٠ دۆلارە. کاربەدەستێکی باڵای وەزارەتی دەرەوە بڕی ئەم داهاتە بە ٢٥٠/٠٠٠ دۆلار دادەنێ. واشینگتۆن دی.سی. ٣٠ ئۆکتۆبری ١٩٩٦.

➢ "گوێی... نەدایە": چەند مانگان بێهوودە تاڵەبانیم وریا کردەوە کە دەس لە تیر و تانە و لاتار هەڵگرێ سەبارەت بە مەسعوود. گوتم بێتوو شەڕ بکەوێتە قۆپێ ئێران یاریدەی یەکێتی نیشتمانی نادا، هەتا یەکێتی نیشتمانی بەرەو سنوور ڕەپاڵدرێ و بە سەروبەرەوە بکەوێتە کۆشی ئێران." وتووێژ لەگەڵ چەلەبی, ٢٧ی سێپتامبری ١٩٩٥.

➢ پلاڤۆکی پارتی دێموکرات و وتووێژی تەلەفۆنی لەگەڵ بارزانی – پێلترۆ: وتووێژ لەگەڵ زێباری, لەندەن, ٢١ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ دەیانگوت ئەو هێزە یاریدەدەرەی کە ئێراق بۆ گرتنەوەی هەولێر ناردی, لە ١٢ی ئووتەوە لە تکریت, باژێری زاگەی سەددامەوە وەڕێ کەوتووە و ئەمە نیشانی دەدا کە شالاو بۆ سەر هەولێر پاش دەستێوەردانی ئێران لە مانگی ژووئیەدا پتر کەوتۆتە سەر دەور و دانوستانی بەگەرمەی نێوان بارزانی و ئێراق بە مانگێك پێشتر دەستی پێکردووە. وتووێژی تەلەفۆنی لەتەك چەلەبی‌دا, واشینگتۆن دی.سی. ١٥ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ "بەڵێنی بە نووسراوە": لە ١٩٩٢دا واشینگتۆن هەوڵی دەدا ڕێبەرانی پارتی دێموکرات و یەکێتی نیشتمانی بۆ چوونە پاڵ شووڕای میللی ئێراق پێمل بکا, وەختایەك بارزانی باسی خەیانەتی کی‌سینجێری کرد و ئێسکووکرافت پێی‌گوت کە "ئێمە پشتی ئێوە بەر نادەین."

بێیکێر بە نووسراوە بەڵێنییەکی وەوتۆی دا, وتووێژ لەگەڵ زێباری, سەلاحەددین, ٥ی فێوریەی ١٩٩٦. "گۆر", یەکێك لە پایەبەرزانی ئەمریکا, کە تەنیا کەسێکە بە ئاشکرا خوازیاری خاشەبڕ بوونی سەددامە, هەروەها "لیك"یش پشتیوانی ئەمریکایییانی بۆ کوردان و شیعان دووپات کردەوە: شایەتی دانی پۆل ولفۆ ویتس لە بەردەم کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی مەجلیسی پیراندا (سوو کومیتەی ڕۆژهەلاتی نیزیك و باشووری ئاسیا) ١٩ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ ئێسکووکرافت, نیووزویك, ٢٣ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ "سێسەت قەبزە تۆپ و ..." جان دۆویچ, سەرۆکی سیا, شایەتی دان لە بەر دەم کۆمیسیۆنی هەڵبژێراوی مەجلیسی پیراندا (تایبەتی زانیاری) ١٩ی سێپتامبری ١٩٩٧.

➢ "شەڕی نێوخۆی کوردستان": پێری، بە پێی نووسراوەی ئینتێرنەشنال هرالد تریبیۆن, ٩ی سێپتانبری ١٩٩٦.

➢ "کردەوەی بێمانا": ئەمریکاییەکان وادەیان دابوو بە کارمەندە کوردەکانیان کە نەخشەیەکیان هەیە لە بۆ ڕاگوێزتنیان, کە قەت وە کردەوە نەگەڕا. وتووێژ لەگەڵ موئەیید یۆنس, ٦ی فێوریەی ١٩٩٦.

➢ "لە بابەت ئەم خەیانەتەوە هەستیان بە شەرم و شوورەیی و سەرشوڕی نەدەکرد": سامی عەبدوڕڕەحمان ئیددیعای دەکرد کە پارتی دێموکراتی کوردستان تاقمی سەر بە شووڕای میلیلی ئێراقی لە ناوچە ڕاگوێزتووە, بەڵام بۆ ئەوانەی کە لە ناوچەی تاڵەبانی بوون ئەرکێکی لە ئەستۆ نەبووە. مەبەستی هەولێر و عەنکاوە بوو. وتووێژی ڕۆژنامەوانی, سەلاحەددین, ١٢ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ "کەندداوی خووگان": پۆل ولفۆ ویتس, شایەتی دان لە بەردەم کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی مەجلیسی پیراندا لە پێوەندەی لەگەڵ ڕۆژهەلاتی نیزیك و باشووری ئاسیا, ١٩ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ "ڕوونە..." دۆویچ, شایەتی دان لەبەر دەم کومیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی مەجلیسی پیراندا لەمەڕ زانیارییەکانەوە.

➢ "ئەگەر لە هەڵگیرسانی ئەم شەڕەدا بەرپرسایەتییەك هەبێ..." ئینتێرنەشنال هرالد تریبیۆن, ١٢ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ "ناوەندی ڕێکخستنی نیزامیی": لێپرسراوانی پارتی دیموکرات و یەکێتی نیشتمانی، بە جودا سوور بوون لەسەر ئەوەی کە ناوەندی ڕێکخستنی نیزامیی هەر ئەو دەم دەیتوانی بە هەنتەشی خۆی و سەرکۆنەی بارزانی و تاڵەبانی پێش بە هەڵگیرسانی شەڕی نێوخۆ بگرێ, وتوویژ لە کوردستانی ئێراق، فێوریەی ١٩٩٦.

➢ ٧٩٥ میلیۆن دۆلار, نزیکەی ٥٨٣ میلیۆن دۆلار لە ساڵی ماڵیی ١٩٩١دا درا؛ ئەو دراوەی دەدرا بێ نیوەبڕ لە ٧١ میلیۆنەوە بۆ ٢٢/٤ میلیۆن لە ١٩٩٦دا دابەزی. گوزارشتی ئاژانسی ئەمریکا بۆ پەرەی نێونەتەوەیی, ٥ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ "بڕیارە بەدرۆکان": وتوویژ لەگەڵ زێباری, لەندەن, ٢١ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ "بە شێوەیەکی وا کە بە تەرکەندە نەدەسەلمێندرا": سەرچاوە:نیۆیۆرك تایمز, ٢١ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ "ئەمە زوڵمێکی ئاشکرایە": ڕاپۆرتی لێوردنی نێونەتەوەیی, پێخوست کرانی مافی مرۆص لە کوردستانی ئێراق لە ١٩٩١ بۆو لایە, فێوریەی ١٩٩٥.

➢ "تاوانی تۆوبڕ کردن": نێرەڤانی مافی مرۆص, پاش خوێندنەوەی بەڵگەنامە بە خەنیمەت گیراوەکان لە ئێراق و ڕاگوێزرانی ئەم بەڵگەنامانە بۆ ئەیالەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا, بەم هیوایە کە دەوڵەتێك ئەم تاوانە لە دادگای نێونەتەوەیی لاهە بێنێتە گۆڕ پێوەندی بە چەند دەوڵەتەوە گرت. یادداشتی کنێس ڕووس, بەرپرسی کارگێڕێ, ٣٠ سێپتامبری ١٩٩٤.

➢ "شەڕی ئێمە": وتوویژ لەگەڵ بارزانی, سەلاحەددین, ١٣ی فێوریەی ١٩٩٦.

➢ "بارزانی تەواوی کوردستانی قووت دا...": دیلی تێلگراف, ١٨ی سێپتامبری ١٩٩٦.

➢ "ئێگلتۆن هەروەها لەسەر ئەم بڕوایە بوو": ویلیام ئێگلتۆن, "کۆماری کورد, ساڵی ١٩٤٦", لەندەن, ١٩٦٣, لاپەڕەکانی ١٣١ و ١٣٢.

# فەرهەنگۆك

(ئـ)

**ئادە:** جەزیرە.

**ئارا:** نێوان و دۆستایەتی.

**ئاراز:** ڕووبارێکی نێوان سنووری ئێران و ئازەربایـجان (رودارس).

**ئارام:** ناوچە, دەوروبـەر. *کـابرا هـەر لەو ئارامە نەماوە*.

**ئاسنڕفێن:** ئاسنفڕێن (آهن روبا).

**ئامیان:** هەوێن.

**ئاوەلـــــمە:** نەبەگــە, خۆنــەگرتوو, دەڵەمە ئاسـا, ئاولـــمە, بێـچووی نێـو زگ کە باش خۆی نەگرتووە.

**ئـــــۆقرەورووژێن:** ئۆقرەئـــــەنگێو (هیجان‌انگیز).

**ئۆینگێـــڕان:** فێڵوفـــرت کـــردن, جامبازی نوانـدن, گەمـە سـاز کـردن, مەکر و دۆڵاب نانەوە.

**ئەرباب:** خاوەن, ئاغا.

**ئەزمواو:** بەتاقی‌کراوە, ئیمتیحان‌کراو.

**ئەسکەملـە:** سکەملە, ملە کـردن بـە سکە, قوماری شێر و خەت.

**ئەڵڵابەختەکی:** گەللایی, ڕەشـۆکی, شانسەکی, کردنی کارێك بـێ ئـەوەی بناغە و ڕێوشوێنی لە پێشا بـۆ دیـاری کرابـێ. کردنـی کارێـك هـەر لەسـەر خودا نەك لەسەر لێکدانەوە و مەنتیق.

**ئەلــمان:** ئاڵمان, ئەڵـمان.

**ئـــەنگڕان:** لــــە ڕادەبـــەدەر و زۆر دەوڵەمەنـد بـوون, لــە خۆبـایی بـوون لـەبـــەر دەوڵەمەنـــدی و ســـامان, غللووری.

**ئەوســــەرێکەی:** ئەوپەڕێکـــەی, سەرئ‌ئەوسەری.

**ئیـــشکەڕن:** گاڵتـــەجاڕی گەمـــەی تەنافبازی (دلقك).

**ئینکەبـەری:** لاسـاری, گوێنەبیـستی (لـجبازی).

**ئیوهایە:** ئاوایە, وەوتۆیە.

(ب)

**باخی لەبەر**: باخی بە بەر, باخی بە میوە.
**بادی هەوا**: غللوور, قۆڕدەماغ, بەفیز.
**بازرە**: تەرەبوون, هەلاتن و ڕەوین و دەرپەڕین.
**باڵەخانە**: نهۆمی دووهەم, خانووبەرەی لە یەك نهۆم زیاتر.
**باڵەفڕ**: باڵگەرد, باڵسوور, باڵفڕفڕە (هلیکۆپتێر). *پێشنیاری خۆمە*.
**باندۆر**: کارتێکردن, شوێن لەسەر دانان.
**بانگێشتن**: بانگهێشتن, دەعوەت کردن, بانگ کردن بۆ میوانی.
**باوباوێن**: چاوچاوێنی بە دزی ئاشقە و ماشقە.
**باییس**: باحیس, سەبەب.
**بڕەمبڕەم**: کەڵەکەبڕێن, پاڵڕێکدانی جەماوەر بە شانەچرکە و بزووتن بەرەوپێش, بە پەلەپەل کار کردن.
**بزۆك**: هەر شتێکی بزووتن و جووڵەی هەبێ (متحرك).
**بۆندژی**: خراپ لە مەبەستێك حاڵی بوون (سوء تفاهم).
**بووکەڵە**: بووکی بچووك, بووکی دەسکرد بۆ منالان (عروسك).
**بە حاڵ ودووبەلا**: بە ئاستەم, بە حاستەم, زۆر بە کەمی.
**بەدەس گرتن**: هەڵگرتنی کچێنی کیژ, دەسدرێژی بۆ کردن.
**بەربەست**: بەربەس, گرێ و کۆسپ, تەگەرەی سەر ڕێگا (مانع).
**بەربەلا**: وەبەر بەلا هاتوو, بەلا لێدراو, قوربانی کراو.
**بە تەبیعالەم**: بە ئاشکرا, بە دەنگ و هەرایەکی ئەوتۆکە خەڵك پێبزانێ.
**بەردەباز**: پردەباز, ئەو ڕیزە کوچکەی لە بەرینایی شەقەجۆگە یا ڕووباری تەنکدا بۆ پەڕینەوە جەللە دەکرێن.
**بەرعۆدە بوون**: زەمانەت کردن, وە ئەستۆگرتن, دەسبەربوون.
**بەرگروانی**: زەمانەت, دەستەبەرێتی.
**بەرگە**: وەرەقە, وەرەقەی هاتوچۆ.
**بەرگریکار**: پارێزەر (مدافع).
**بەرهەڤ**: ئامادە, حازر.
**بەزێنە**: ڕقە و ملبەملە کردنی دوو یان چەند کەس پێکەوە بۆ بەزاندنی یەکتر. "چاوبەزێنە"ش هەیە, دووکەس چاو لە چاوی یەکتر دەبڕن و هەرکامێکیان زووتر چاو بترووکێنێ بەزیوە (رقابت).
**بەفیتی فلان کەس**: بە دەسیسەی فلان کەس, بە دەهۆی فلان کەس, هانە, دنە (تحریك).
**بە قەباڵ هەڵگرتن**: دەستەبەر بوون بۆ ئەنجامی کارێك بە دەمبڕ, پەیمانکاری, لەبڕ کارکردن.

**بەگەرمــە:** بــە پتــەوی, شــێلگیرانە, ســوور بــوون لەســەر مەبەســتێك, بــە جیددی.

**بـــە لێـــشاو:** یـــەگجار زۆر, زۆر و زەوەند.

**بەندیواری:** پێوەندی, پەیوەندی.

**بە هەشتاو:** بە شتاو, بە لەز, بە پەلە.

**بێبەروپشت:** کەسێکی جێی متمانــە و بــاوەڕ نــەبێ, وەك نیــسك وابــێ و بەروپشتی دیار نەبێ, بێ بەقا.

**بیبیجان:** بیبیجانخانــم (عروســك خیمەشببازی).

**بێتەل:** بێسیم.

**بێرەبێر:** دڵخورتە, دڵاودڵی.

**بیمە:** وە ئەستۆ گرتنی زەرەد و زیــانی گیانی و ماڵی کەس یــا کەســانێك یــان هــی بنکــە و دامەزراوەیــەك لــە لایــەن شەریکە یا بنکەی "بیمە"وە لە بەرامبەر وەرگرتنی هەقێکی دیاری کراوا, پــێش ڕوودانی زیان و زەرەر.

**بۆرەبەڵێنی:** وادەیەکی ســەرزارەکی و لەرزۆك, بۆرە قەول.

**بێونەبێ:** بێگومان, بێشك.

**(پ)**

**پا:** ئەندازەیەك بۆ پێوان و میتر کـردن. هەر "پا"یەك ٣٠/٤٨ سانتیمیترە.

**پارێزگا:** ئوستان.

**پارێزگار:** ئوستاندار.

**پارێزەر:** حەرەس, پاسدێر و پاســەوانی کەسێك یا شوێنێك.

**پاشقول دان:** کینایەیە لە حەشاردان, ماڵی کەسێك خواردن.

**پاوان:** قەدەغە, تایبەتدراو.

**پاڵـــەوپاڵ:** پاڵوێکـــداو, تـــەواو لێكجووت بوو, بە چڕی تێکبەزین.

**پرس:** قەزیە, مەسەلە.

**پرکە:** وردکە, کەمۆکە, پرتك.

**پرکێـــشی:** پــێ لـــێهێنان, شـــوو لــێهەڵکێشان، پێداگری یــەگجار زۆر لەسەر مەبەست.

**پسمام:** ئامۆزای نێرینە، کوڕەمام.

**پشت ڕاست کردنــەوە:** ئۆبــاڵ بــۆ کێشان و تەئید کردن.

**پووش بەسەر کــردن:** کینایەیــە لــە شاردنەوە، لە بەرچاوان ون کردن.

**پەرانپەران:** پەرەمپەرەم، لێكدابــڕان بە پۆل یان تاق و واز.

**پــــەرداخ:** زەرك، شــــەربە، لیــــوان, ئاوخۆری.

**پەژار:** خەمبار، پەژارەدار.

**پــــەرێش:** پەرێــــشان، پــــرشوبڵاو، نیگەران.

**پەیکەردەی:** شـوێن لــە دوو گێــڕان، دواکەوتن (تعقیب).

**پێتەویستی:** پێداویستی، پێویستی.

**پێداپێدا:** وردەوردە، بەرەبەرە.

**پێگۆڕکە:** ئەم تەختاییەی لە بادانەوەی پلیکاناندا باری هەوای پێی لێدەگۆڕدرێ (پاگرد). *ئەم وشەیەم لە شاعیری ناسك‌خەیاڵ "میرزا محەمەد نووری" بیستووە.*

(ت)

**تاقەتپرووکێن:** تاقەتبڕ، بڕستبڕ (طاقت فرسا).

**تانك:** دەبابە.

**ترکزەخواز:** سەر بە گێچەڵ (ماجراجو).

**تڕەکەڵەك:** کارێکی خۆنەگر کە هەر بە چووکترین هەڵکەوت تێك‌بچێتەوە. لەسەر یەکتر هەڵچنینی هەر شتێك بە شێوەیەکی ناشیانە، کاری ڕواڵەتیی و لەرزۆك (سرهم‌بندی بە صورت نیم‌بند).

**توخم:** ماك، تۆو (عنصر).

**تۆوبڕکردن:** بڕینەوەی تۆو، ڕەگەزکوژی، ژێنۆسایدی. *تێبینی:* پێم وایە چونکە ژێنۆساید زۆر لە ڕەگەزکوژی بەرفرەوانترە کە ئێستا لە ئەدەبیاتی سیاسیدا جێی کردۆتەوە، وەك ژێنۆسایدی فەرهەنگی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و ... "ڕەگەزکوژی" پڕ بە پێست نیە. بۆیە پێشنیارم وایە "تۆوبڕکردن" لە بری "ڕەگەزکوژی" دابندرێ. تۆوبڕکردنی فەرهەنگی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و ...

**تێکهەڵگلان:** تێکهەڵگلان، لەپڕ سەرەونخوون بوون، بەربوونەوە، وە حەرز کەوتن.

**تێی‌تەقاند:** هەڵات، بە پەلە تێپەڕی.

**تەتەڵە کردن:** هەڵتەکاندنی دەغڵ و تووتن بۆ پاك کردنەوە لە چێوك و قاچك و زێدەدەمار. کینایەیە لە لێك‌جودا کردنەوەی چاك و خراپ.

**تەراکتۆر:** تەراختۆن، تراکتۆر.

**تەرەکەمە:** بازرە، ڕاکردوو، خانەوڵانە جێ‌هێشتن لە ترسان، تەرە بوون، پەڕەوازە بوون.

**تەفرەدان:** هێنان و بردن و ئەو دەستەودەست پێکردن، چزاندن بە حەواڵە بە گەواڵە، جزیا دان.

**تەقیو:** تەرەکەمەبوو، بازرەبوو، هەڵاتوو.

**تەلەفیزیۆن:** تەلەویزیۆن، تلەیزوون، تەلەبزیۆن، تلفیزیۆن، تلەویزیۆن و ...

**تەناهی:** ئاسوودەیی، ئاساییش و هێوری و ئارامی، هێمنایەتی.

**تەنکەخەڵك:** ئەو شوێنەی وا خەڵکی کەم لێ بێ. *خەڵك تەنکەی کردبێ و ڕۆیبێ. ئەم تەرکیبەم لە رووی "تەنکەدار" ساز کردووە. میچێك کە پڕ دار نەبێ، یانی داری زۆر پێ ڕایەڵ*

*نەکرابێ "تەنکەدار"ە. یان باخێلک کە زۆر چڕ و چغور نەبێ پێیدەگوترێ "تەنکەدار".*

(ج)

**جگەزەرد:** جگی گۆڕین، جگی مەنشوور لە جگێندا. جگی هەرە باش، یەکەجگ.

**جوغز:** جغز، جەغز، هێڵی بازنەیی.

**جەڵتە:** خوێنی مەییو، خوێنی پندرەوەبوو, جەغەتە بەستوو.

(چ)

**چاکسازی:** چاک کردن، دەس پێداهێنان بۆ گۆڕین بەرەو باشی، هەنگاوی بەرەو ئاڵوگۆڕ بە باری چاکدا (اصلاحات).

**چاوناس:** مەشهوور، مەنشوور، بەناوبانگ، ناوبەدەرەوە.

**چاوەدزکە:** بە دزی ڕوانین بۆ کەسێ، چاوچاوێنی پەنامەکی, چاو حەشاردان.

**چرپانچرپان:** بەگەرمە و لێکدالێکدا و بە هەڵلا و گرمەوە بزووتن، سرپانسرپان, سمرسمڕ.

**چلووبڕ پێکردن:** چلەبڕ پێکردن، دەرکردن لە جەنگەی چلەی زستاندا، بە ڕۆژی تۆف و تاڵ و توون دەرپەڕاندن.

**چنگڵە:** چنگاڵ، قولاپ، قولاپە (قلاّب).

**چواربەندە:** چوار گەی سەرەکی قەڵافەتی ئینسان, تێکڕای ئێسقانی قەڵافەتی زیندەوەرێکی ئێسقاندار, کۆئێسقان (استخوان بندی – اسکلت).

**چەت:** لەمپەر، بەرهەڵست.

**چەندبنەکی:** چەن بنەکی، خاوەنی چەندین بنە. *ماڵی چەند بنەکی، بنەیەکی سەرەکی هەیە و ئەوانی دیکە نیمچە سەربەخۆن. "دەوڵەتی چەنبنەکی" پێشنیاری خۆمە بۆ "دولت نامتمرکز".*

(خ)

**خافڵکوژ:** غافڵکوژ، ترۆریست.

**خشتە:** جەدوەل.

**خوایینەخوایی:** بتهەوێ و نەتهەوێ.

**خوتخوتە:** خورتخورتە، دڵەخورتە، دڵنیگەرانی.

**خۆڕایی کردن:** بەڕەڵلا کردن، خۆ لێ بێخاوەن کردن.

**خۆشئاژۆ:** خۆشاژۆ، خۆشڕەو، تیژڕۆ.

**خویا:** خۆیا، خوویا، ئاشکرا، دیار، بەرچاو.

**خەمۆکی:** ژاکان بە خەم (افسردگی)، خەمۆك (افسردە).

(د)

**داخڵە:** کەشەوی مێز (کشو میز).

**دارولەلە:** ئەندازە، ڕادە. قەدیم بۆ پێوانی ئاستی ئاو داریان لە گۆلاو دەچەقاند و شوێنی ئاوەکەیان لەلە دەکرد تا بزانن داخوا کەم دەکا یان زیاد.

**دایە بەرەوە:** وەپێشی دا، خستیە پێشەوە.

**دژدین:** موخالیفی دین، نەحاواوە لەگەڵ ئاینی ئاسمانی.

**دوعاگیرابوون:** دوعاگرتن، قبووڵ بوونی پاڕانەوە.

**دووچۆمان:** نێوان چۆمان، میاندواو. *دوو چۆمان پێشنیارێکە پتر لە دەقەکانی مامۆستا "هەژار"دا دیومە بۆ "بین‌النهرین".*

**دووشك:** دوودڵ، دڕدۆنگ، بەشك.

**دەرزی گۆزەڵە:** سێرۆم (سرُم).

**دەس بەردانەوە:** دەس هەڵگرتن و تەسلیم بوون.

**دەس‌پیس:** دز، نائەمین.

**دەستەودەیارە:** دەستەودایەرە، تاقم، دەستەوبەستە، لایەنگرانی کەسێك.

**دەس شکاندنەوە:** کینایەیە لە پەژیوان بوونەوە، تاسووف خواردن.

**دەق:** مەتن (متن).

**دەقودۆغر:** ڕاستەوڕاست و بێ‌پێچ و پەنا (صراحتاً).

**دەگوشت:** دەکوشت.

**دە ناخێ ڕۆکردن:** ناشتن، لە خاك ڕاکردن، کینایەشە لە کوشتن.

**دی:** دیکە، تر.

**دیزە بە دەرخۆنە کردن:** کینایەیە لە حەشاردان، شاردنەوە.

**دیوە:** دیومە، دیتوومە. *ئەو کابرایەم دیوە.*

(ر)

**ڕابوونەوەی هەتاهەتایی:** هەستانەوەی یەکجارەکی و ئەبەدی و هەمیشەیی (رستاخیز جاوید).

**ڕاز هەڵێنانەوە:** نەهێنی هەڵێنانەوە، زانینی جوابی سوڕێکی دایدێنن، دۆزینەوەی مانای ڕاز.

**ڕاستەکی:** ڕاستییانە، هەر مەبەستێکی سەری بچێتەوە سەر ڕاستی.

**ڕاوە:** ڕاڤە، شەرح، مانا، تەفسیر.

**ڕەفحە:** ڕەف، تاقە، ڕوفحە.

**ڕەوشتەکی:** ئەخلاقی، هەر مەبەستێکی بچێتەوە ڕەوشت و ئاکار (اخلاقی).

**ڕەوگە:** شوێنی پێداڕۆیشتن (مسیر).
**ڕێژە ڕۆیشتن:** بەڕیز ڕۆیشتنی سپا بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بە مەبەستی مەشق پێکران یان خۆ نیشاندان لە بەرامبەر سەرکردەدا.
**ڕیازیات:** ڕیازی، ماتیماتیك.

(ز)
**زڕەچێرگ:** زڕەچرگ (هوبرە).
**زیوان:** جوولآن، تەکان خواردن.
**زێوان:** زێوەوان، ئاگادار و پاسەوانی گۆڕی کەسانی ماقووڵ.

(ژ)
**ژیانەکی:** ئەوەی بەسترابێتەوە بە ژین (حیاتی).

(س)
**ساختەکاری:** جەعل کردن، بە درۆ مەبەستێك هەڵبەستن.
**ساخلەمی:** ساخی و سلآمەتی و بێهداشت, تەندروستی.
**ساڵمەخەتە:** هەڵە، خەتا، لە جەغز دەرچوون، پەل بزاوتن لە جێیخۆ.
**سۆزە:** سۆراغ کردنی باس و هەواڵ، هەست بە مەبەستێکی نەدرکاو کردن, سووسە.
**سوکان:** فەرمانی ئوتۆمبیل.
**سەربادان:** مل بادان، بریتییە لە موخالیفەت کردن.
**سەرپشکایەتی:** سەربەشێتی، ئەولەوییەت پێبوون, سەرەتی, بەرێتی (اولویت).
**سەرڕەو:** پڕتاو، بە غار و هەڵەداوان هەلینگدان.
**سەرڕەوی:** پێشەنگایەتی، پێشڕەوێتی.
**سەرسووتان:** نابووت بوون و هیچ بە دەستەوە نەمان، تەواوی ماڵ و دەسمایە لە چنگ بوونەوە (افلاس).
**سەر وێهێنان:** پەنا بۆ بردن، خۆ وەژێر باڵدانی کەسێ.
**سەرتەقە:** کارکردن بە هەولێکی نەزۆر توند و پتەو, تێگەیشتنیکەم.
**سەرەدا:** سەرەتا، دەسپێك.
**سەرەك:** سەرۆك.
**سەرهەڵدان:** ڕاپەڕین، سەربزاوتن، جوولآنەوە و خەبات.
**سەگوان:** تیرهاوێژی سێرەڕاستی ئەنگێوە.
**سەمەد:** هۆ، سەبەب، مەیلێکی دەروونیی کە هانی مرۆڤ بدا (انگیزە).
**سێسووچ:** سێکوان، سێسووچە، سێگۆشە (مثلث).
**سێیەك:** لە سێ بەشان بەشێك (یكسوم).

(ش)

**شاری ئاواتەخواستە:** شاری پاکژ، بەئاژێری بە ئاوات خوازراو (مدینەی فاضلە).

**شالوولە:** لوولەی هەرە گەورە، بۆری ئەستوور.

**شانۆ:** سەکۆ و شوێنی هونەر نواندنی شانۆگەران (صحنە، صحنەی نمایش).

**شوێنکەوت:** ئەو مەبەستەی بە دوای کردە یان وتەیەکدا دێ، ڕەنگدانەوەی دوایی، ئاقیبەتی ڕەوت و ڕووداو (پیامد).

**شوێنکەوتە:** پەیڕەو، کەسێکی دەکەوێتە شوێن مەبەستێك و پەیڕەوی لێدەکا, وەشوێن کەوتوو.

**شەرکەوتنە قۆپی:** ئیدیۆمە و بریتییە لە کار کەوتنە جێی باریك و ئەستەم، کار کەوتنە ڕۆژی خۆی.

**شەڕوەنی:** شەڕەنگێزی، خراپە خوازی (شرانگیزی).

**شەریکە قازانج:** هاو قازانج، *لە هیچ شوێنێك نەمدیوە لە بری "مشترك‌المنافع" هاتبێ، پێشنیاری خۆمە بۆ مانای "مشترك المنافع"؛ "هاوبەرژەوەند"یش دەکرێ بێ.*

**شەیتانە بازاڕ:** بازاڕی ڕەش، ئەو بازاڕەی کە نرخ خوار و ژووری زۆرە و بە پەنامەکیش مامەڵەی تیا دەکرێ. *ڕەنگە هەمان "بازار سیاه" بێ.*

**شێرە:** ئامرازی کردنەوە و گرتنەوی لوولەی هەر شتێکی ئاوەکی.

(ع)

**عەداوەت:** دوژمنایەتی، دوژمنی.

(ف)

**فرسوار:** لە خۆبایی، مەغروور.

**فڕۆکە:** ڕفۆکە، تەیارە، بالآفڕی شەڕکەر یا هی موسافیربەر.

**فرهەڵدان:** قوم لێدان، بە قومێك شتی ئاوەکی خواردنەوە و هەڵقوڕاندن، پێداکردنی لێکدالێکدای مەشرووب.

**فیفی:** واز وازی، تۆتەکە نەگر.

(ق)

**قان:** دەرفەت و ئیمتیاز.

**قایمە:** سیایی، لیست، لیستە.

**قزە:** ترسەنۆك (ترسو، بزدل).

**قورمیشی:** ئەوەی بە قورمیش کار بکا (کوکی).

**قوژبنپشکن:** کەلێن و کاژێرپشکن (کنجکاو). *شاعیری نەمر "سوارە ئێلخانیزادە" سازی کردووە.*

**قەراروبڕی:** قەرار و بڕیار، پەیمان.

قەیتـەرقوو: قـووت دان، لـێس دان، خواردنەوە.

**(ك)**

**کار بەکەیفە:** کار کـردن هـەروا لـە ڕووی ئیـشتیاوە، کـاری نێوەنێـوە و جاروبـارە هـەر کـات مرۆڤـ کـەیفی لـێبوو، کەسـێکی کـار بـۆ سـەرقاڵی وەك شـتێکی لاوەکـی چـاو لـێ بکـا (متفنن).

**کاموس:** کابووس، سرنـجك.

**کلابوون:** کـل بـوون، تلاسـا بـوون، لادان.

**کۆلـەداری:** بـەردەداری، ئیستیعمارگەری، کویلەداری.

**کۆدەسەلات:** ناوەندیـخواز (متمرکز).

**کۆنەونوێ:** هەر شتێکی تـازە نـەبێ و کاری کردبێ، دەستی دوو.

**کەسـیرە بـوون:** سـڕ بـوون، ڕەق هەلاتن لە سەرمان.

**کەڵتـە کردنـەوە:** نوێسـازدانەوە، چاك کردنەوە (تعمیر کردن).

**کەڵکەڵە:** خولیا، خەیاڵ، وەسوەسە.

**کەڵەشاخ:** شـاخەکەڵ، کینایەیـە لـە ملهوڕی سەروەشێن.

**کەینەوبەینە:** تەگبیر کردنی پەنامەکی و ڕێکەوتن بە دژی کەسێ یا کەسانێ.

**کێـوی:** کێفـی، وەحـشی، دڕنـدە، دوڕندە.

**(گ)**

**گلدانـەوە:** گێڕانـەوە، دەس بەسـەر داگرتن.

**گۆدەتا:** کۆدەتا، کۆدیتا، کوودێتا.

**گەڕانگەڕ:** دەورانپشت، دەوروپشت، دەوروبەر (پیرامون).

**گەرداو:** گەرداڤ، کینایەیە لە بـەلاّ و گێرە و کێشە.

**گەرمەتەندوور:** نانی گەرمی تازە لـە تەندوور کراوە، نان و کولێرەی گـەرم و تازە. کینایەیـە لـە بـاس و هـەواڵ و مەبەسـتی زۆر نـوێ و تـازە لـە کـڵ دەرچوو.

**گەڕیان:** جەریان، سووڕیان (جریـان). *پێشنیاری کاك "ئەحـمەد قازی"یە.*

**(ل)**

**لاتار:** فڕ و لاتاو، تیر و تانە.

**لادەستە:** هەر شـتێکی کـە سـەرەکی نەبێ و بکەوێتە ئەملا و ئـەولا، لادەستەکی بـێ، وەك ڕێگـای لادەسـتە (راه فرعی).

**لامەلامە:** مەرایی، ڕیایی.

**لاوژۆ:** لاوە، گەنج، لاوژە.

**لۆسە:** مەڵغە، باری، لـۆس. لۆسـەی دەسەڵات (اهرم قدرت).
**لووت تێبوون:** ڕووی‌خـــــــۆش تێبوون، موافیق بوون.
**لەبەریەك گرتنەوە:** لە ڕووی یـەکتر وێنە و کـۆپی هەڵگرتنـەوە، لـە ڕووی یەك زەبت کردنەوە.
**لە پای سەری دان:** غەیبەت کـردن و بۆ تێچاندن، ژێر پێ‌کۆڵین.
**لەپەســـــتا:** یــــــەکبین، لەسەریەك‌لەســەریەك، بــێ وچــان و هەدا.
**لە پێ‌پەڕین:** لە پـێ کـەوتن، چـورتە لــێ‌بڕان.
**لەتەرکێن:** قەت قەت، هەرگیز.
**لــەزۆق:** بـە زۆق و شـەوق، شـاد و بەدەماخ.
**لـــە گـــڕی خۆدابـــوون:** لەوپـەڕی خۆشی دابوون، زۆر زۆر بـە کـەیف و شاد بوون.
**لێــك دەرکــردن:** تۆڵـە لـە یـەکتر کردنەوە, ڕق بە یەکدی ڕشتن.
**لێوەگر:** لـێ‌گیرەوە (مُسری، اپیدمی).

(م)

**متەق مردوو کردن:** متەق لــێ‌بڕین، فزە لــێ‌بڕین، وسکوت پێ‌هێنان.
**مراد مردوو:** ناکام، نامراد، بێ‌مراد.
**مسەوەدە:** بەڵا و نەهامەتی.
**معاش:** توێشەی بەڕێچوون، مانگانە.
**مەدار:** هێڵکـی بازنـەیی خـەیاڵیی لـە ڕێکی زەوی‌ڕا شانبەشان و هاوتـەریب لـەگەڵ هێڵی پشتێندەی ئوستوا، هێڵ.
**مەسەب:** مەزەب، مەزهەب.
**مەفرەشبار:** دوو تا باری پڕ لـە کا کـە لـە بارەبەر دەنـدرێ و نەخۆشـی تێـدا ڕادەکێشن بۆ گوێزانەوە.
**میتر:** مێتر, گەز.
**میل:** هەزار هەنگاو. میلـی ئینگلیـسی ۱۶۰۹ میتر و میلـی دەریـایی ۱۸۵۲ میترە.

(ن)

**ناچیزە:** پووچەکە, هیچ و پووچ.
**ناسەرســــــەنگی:** نـــــا بـــــەدڵی, سەرسەنگینی (اکراە).
**نردوو:** دەستەوارە, نان و کـولێرە یـا هەر شتێکی لەسەر یەك قـەد بکـرێ و هەڵبگیرێ. *کابرا نردوێکـی پـووڵ لــە باخەڵـی‌دایـــــە. (هەڵبـــــەت پـــــێ لـــێ‌هەڵێنانە)*. نردوێکـی قاقـەز لــە بـن هەنگڵی ناوە.
**نژم:** قەڵافەت, تـەرح و دیـدار, بیـچم (ریـخت و قیافە).

**نژیارڤانی:** ئەندازیاریی خانوان (مهندسی معماری). نژیارڤان: (مهندس معمار).

**نسحەت:** پەند, ئامۆژگاری, نسیحەت (نصیحت).

**نوشتاوە:** تا کراوە, قەد کراو.

**نەبەدی:** ون, بزر, نائاشکرا(نامرئی).

**نەهێنگا:** حەشارگە, شوێنی خۆ حەشاردان, جێگەی ماتە تێدا هەڵگرتن (مخفیگاه).

**نێرۆی:** ئاگادار و چاوەدێری جەماوەر (سرپرست).

**نێرەڤان:** دێرەوان, پاسەوانێ کە لە ڕوانگەوە دەڕوانێتە دەوروبەر (دیدەبان).

**نێرینە:** نێوەڕاستی ڕووبار, چەقی ڕێ, نێوەڕاست.

**وارگە:** شوێنی ژیان, شوێنی دامەزران و حەسانەوە (اقامتگاه – زیستگاه).

**واش:** ئاواش, *واش نەبێ هەر دەبێ.*

**وان:** ئاوان, وەوتۆن.

**وارووێخ:** چلۆنایەتی بوون و نەبوون (موقعیت). (وار و یۆخ) یانی هەیە و نیە؛ ترکییە. بەڵام لە کوردیدا ئاوای بەسەر هاتووە, ئەوێکی هەیە و نیە.

**وسکوت:** وسکت, بێدەنگی, کڕ و کپ.

**وڵوڵە:** گەرای نێوزگی مەل و پەلەوەری هێلکەکەر, وروورە.

**ونجرونجر:** لەتوپەت, لەتوکوت, تلێشتلێش.

**وە تەنگ هاتن:** تەنگ پێهەڵچوون, وە ئامان هاتن.

**وەچە:** تۆرەمە, ڕەگەز, نەسل.

**وەحشی:** دڕندە, کێوی, نەعاملاو.

**وەخۆکا:** نەیتارێنی, وەریگرێ, وەخۆی بخا.

**وە قلەهاتن:** وە کەیف هاتن, وە زۆق هاتن, وە هەیەجان هاتن.

**وەندووکە:** ئەوەندووکە, کەمۆکەیەك.

**وەندە:** ئەوەندە.

**وەوتۆ:** ئاوا, بەم شێوەیە, بەمجۆرە.

**وە وی:** وەك وی, چەشنی ئەو. وە وی دەچێ.

**ویشکەسوێ:** ئیشکەسوێ, زۆر تامەزرۆ, کەسێکی کە هەوا و هەوەسی زۆرە (بوالهوس).

**وێزە:** پەلاماری پەنامەکی, وە بەر وێزە هاتن: وەبەر پەلامار و سێرە هاتن. بە مانای تاقەت و تواناش هەیە.

**وێندەرێ:** ئەوێندەرێ, ئەو شوێنە, ئەوێ.

(هـ)

**هاتنەوەخۆ:** وە خۆ هاتنەوە.
**هاشا:** حاشا.
**هرس:** ئەزم, هەزم.
**هورم:** ئیحتوبار, جێ باوەڕی (اعتبار).
**هـــۆك و بـــەرهۆك:** هـــۆ و بـــەرهۆ (علت و معلول).
**هـــــەزارە و دوولا:** خوارەکـــــە و پێچەکەی کەروێـشك بـۆ شـوێنەونکە لەسەر بەفر, (زیگزاگ).
**هـــەس دانـــەوە:** بـــە دەم دادانـــەوە, گێرانەوەی پاتاڵ, بە دەمداهاتنەوە.
**هەڵـــمەدووك:** بۆخ, قەدەم (بـخار).
**هـــــەمێت:** گرینگـــی, گرینگایـــەتی (اهمیت).
**هەنتـــەش:** حـــوزوور: (حـــضور - محضر).

**(ی)**

**یا:** یان, یام.
**یەکبین:** بێپشوو, بێنێوبڕ, یەکپشوو.
**یەگدی:** یەکتر. *لە یەگدی بە بیانوون.*